# ئینسكلۆپیدیا
# پارێزگەها دهۆكێ

سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتێ

**موسەدەق تۆڤی**

هاریكارێ سەرنڤیسەری
خالد سالح

## بەرگێ ئێكێ
## جوگرافیا پارێزگەها دهۆكێ

۲۰۱۷ ز ۲۷۱۷ ك ۱٤۳۹ مش

# ناڤەرۆك

# پەیڤا رێڤەبەرییا گشتییا رەوشەنبیری و هۆنەری پارێزگەها - دهۆکێ

ئەیوب رەمەزان

هەر گەلەک ژ گەلێن جیهانێ کولتورێ خۆ یێ تایبەت هەیە، و ئێک ژ وان ئالاڤێن سەرەکی یە یێن گەللێن جیهانێ ژێک جودادکەت، کولتور ب هەمی پێکهاتا خۆ ئەو خۆدیکە یا هەر کۆمەلگەهەک خۆ تێدا دبینیت و پێناسەدکەت.

ل کوردستانێ کولتور بوویە جهێ پویتە پێدانێ چ ژلایێ سازیێن حکومەتێ ڤە یان رێکخراوێن جڤاکێ سڤیل. ل پارێزگەها دهۆکێ رێڤەبەریا گشتی یا رەوشەنبیری و هۆنەری ژ رۆژا دامەزراندنا خۆ ئەو بزاڤ کریە کولتورێ پارێزگەها دهۆکێ ب رێکێن جیاواز نیشابدەت و پارێزیت، د بیاڤێن هۆنەری و رەوشەنبیری دا ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ رێڤەبەریا گشتییا رەوشەنبیری و هۆنەری ب هەمی سازیێن خۆڤە شیایە خزمەتێ بکەت و یەک ژ رویدانێن هەری گرنگ یێن هۆنەری ل پارێزگەهێ فلمە فیستیڤالا دهۆک یا نێڤدەولەتی یە کو ب رێکا ڤێ فیستیڤالێ دهۆک شیایە بەرێ گەلەک کەسانێن بیانی ژ فلم ساز و بەرهەمهێنەرێت سینەمایی بینیتە دهۆکێ دیسان تا رادەیەکی بیاڤێ بەرهەم ئینانا فلمێن سینەمایی ل دهۆکێ گەشەکریە و پێشکەفتن ب خۆڤە دیتینە. سالانە ساخکرنا رۆژا پارێزگەهبوونا دهۆکێ ب شێوێ کەرنەڤالێ جەماوەری ئەڤ کەرنەڤالەژی بوویە دەرگەهەک بۆ داهێنەرێن دهۆکێ کوحەزا داهێنانێ ل دەف وان زێدە دکەت و ئەڤ کەرنەڤالە بوویە ئالاڤەک کو هەر تاکەکێ پارێزگەهێ خۆ تێدا دبینیت و حەزا بەشداریێ ل دەف پەیدادکەت.

بیاڤێ شانویێ ژی ژوان بیاڤێن هەری گرنگە ل دەف مە سەرەرای نەبوونا ژێرخانا پێدڤی بۆ وەرارا بیاڤێ شانویێ ل پارێزگەها دهۆکێ لێ ئەڤە نەبوویە ئەگەر کو ئەڤ بیاڤە پاشبکەڤیت بەلکی سالانە رۆژانێن شانویێ ل دهۆکێ هاتینە ئەنجام دان و شانوکارێت خۆدان شیان و ئاست بلند ئەڤرۆکە دبینین دناڤ شانوکارێن دهۆك دا و ئالوگورێن هۆنەری دناڤبەرا هەرێم و وەلاتێن جیهانی دا بەردەوامە و دیسان ئەرشیف کرنا شانویێ ژ لایێ بەرێز (رفعت رجب) ڤە گرنگیا هۆنەرێ شانویێ ل دهۆکێ دسەلمینیت.

هۆنەرێ مللی ب خۆشحالی ڤە ل سەر ئاستێ هەرێما کوردستانێ تیپا دهۆك یا هۆنەرێ مللی دیسان تیپا شاریا و نهێل ئەڤرۆکە پێشەنگن و خۆدان چەندین تابلویێن ناڤدارن و بوینە ئێک ژ سیمایێن دهۆکێ.

رێڤەبەریا گشتیا رەوشەنبیری و هۆنەری زێدەباری ڤان بیاڤێن هاتینە بەحسکرن پویتە بیاڤێ گرافیک دایە هەنەرێ گرافیک یا دهۆك ل سەر ئاستێ هەرێمێ بێ رکابەرە و رۆلەکێ کارایە و رولێ کاک (عونی) ئەساسی یە ل سەر ئاستێ جیهانی

ژی و بیاڤێ شێوەکاری شیایە چەندین شێوەکارێن خۆدان شیان لێک خرڤەکەت و سالانە ب رێکا خۆلێن گەلەری بەرهەم و تابلوێن وان پیشانی خەلکی بدەت

دبیاڤێ موزیکێ ژی دا دامەزراندنا تیپا (رباد و دهۆک و بەهدینان) و گەلەک تیپێن دی یێن موزیکێ کو ژ کۆمەکا گەنجێن موزیک ژەنێن دهۆکێ پێکهاتینە و ئەڤ تیپە نها بووینە ئێک ژ جهێن سەربلندیێ ل پارێزگەها دهۆکێ. و زۆربەیا هەری زۆرا هەلکەفت و ئاهەنگێن فەرمی ژ لایێ ڤان تیپان ڤە دهێنە جێبجێکرن، و ب دەهان بەرهەم هاتینە چێکرن ژ ئالیێ (رێڤەبەریا موزیکێ)ڤە.

گرنگی دانا مە ب چالاکیێن ویژەیی بەشەکێ دی یێ وێ گرنگی یێ ئەوا دهێتە دان ب ڤی بیاڤێ کولتوری چ برێکا کونسێرتێن هەلبەستخواندنێ بۆ هەلبەستڤانێن دێرینێن پارێزگەها دهۆکێ و ئەرشیفکرنا وان و بەلاڤکرن وەک بەرهەم ل سەر کەنالێن تەلەڤزیونی یانژی دیدارێن هەلبەستێ مینا دیدارا نەوروز یا هەلبەستێ کو هەلبەستڤانێن بیانی ژی بەشداری دکر دیسان فیستیڤالا ئەدەبێ بەرخۆدانێ و ئەنجامدانا پێشبێرکێیان دبیاڤێ شعر و چیرۆک و دەقەێن ئەدەبی و رۆمانێ دا.

زێدەباری ڤێ چەندێ مە گرنگی دایە ئەرشیفکرنا بیاڤێن جودا یێن کولتوری و دیکومێنتکرنا وان چ ب شێوێ نڤیسین یان تومارکرن ب شێوێ ڤیدیو کو ل پاشەرۆژێ مفایەکێ باش دێ ژ ڤی ئەرشیفی هێتە وەرگرتن، و ب تایبەتی سترانێن گەلەری کو پتر ژ (١٠٠٠) دەمژمێرێن دەنگ و رەنگ د پاراستینە.

ئەڤە و چەندین بیاڤێن دی یێن جهێ گرنگی یێ ل دەف مە وەک گێرانا فیستیڤالێن کولتوری و رەوشەنبیری و ئەدەبێ زارۆکان و ساخکرنا رۆژێن جیهانی یێن سەما و لیبورین و موزیک و شانو و لاوان و زمانێ دایک....هتد و ساخکرنا هەلکەفتێن نەتەوی و نیشتیمانی یێن کوردستانێ، و کۆر و سمینارێن ل دور ئاڤاکرنا کومەلگەکێ ساخلەم دور ژ توندو تیژیێ و هاندان و پاراستنا مروڤایەتیێ ب رەنگەکێ بەردەوام.

هەلبەت د پلانێن مەدابو ژ ئەڤا مە گوتی زێدەتر پێشکێش بکەین و ئەنجام بدەین و خزمەتێ بکەین د بیاڤێ کولتوری یێ پارێزگەها دهۆکێ لێ یا خۆیایە ل دەسپێکا سالا ٢٠١٣ و سەرهلدانا قەیرانا دارایی ل هەرێما کوردستانێ بوونە ئەگەر کو گەلەک ژ پرۆژێن مە وەکو پێدڤی نەهێنە ئەنجامدان و پلانا مە نەهاتە جێبەجێکرن وەکو مە دخواست مینا چاپکرنا ئەدەبێ کلاسیک و ئەرشیفکرنا هەمی بیاڤێن کولتوری مینا شانو و موزیک و هۆنەرێ مللی و سینەما و ئەدەب......هتد.

ئینسکلوپیدیا پارێزگەها دهۆکێ ئێک ژوان ئارمانجێن هەری گرنگ یێن سازیامە بوو کو د پرۆژەکێ ٤ سالی دا هاتبوو پلانکرن و مە دخواست مێژویا پارێزگەها دهوکێ د گشت بیاڤان دا خرڤەکەین و دڤێ ئینسکلوپیدیایێ دا پێشکێشبکەین بۆ بزاڤا کاروانێ کلتوری یێ پارێزگەها دهۆکێ، ئەڤرۆکە ئەڤ پرۆژە ب دوماهیک هات و دێ بیتە ژ وان بەرهەمێن هەری گرنگ و مفادار بۆ پارێزگەها دهۆکێ، هەلبەت ژ بەر گرنگی و نازکیا ڤی پرۆژەی چونکی ماندیبوون و شارەزایەکا زور دڤێت داکو بێ کێم وکاسی ئەڤ پرۆژە ب دووماهیک بهێت ئەڤ پرۆژە ژ پێشنیازێن بەرێز (موسەدەق توڤی) بوویە و ژبەر گرنگیا پرۆژەی و خەمخۆریا بەرێز (موسەدەق) مە رازیبوون دەربری. چونکە ئەم پشت راست بووین ناڤبری حەزا وی و خەمخۆریا وی دێ پرۆژەی گەهینیتە ئەنجام، دیسان وەکو وەزارەتا رەوشەنبیری و لاوان ئێکەم جارە کو ئینسکلوپیدیا بارێزەکی ب ستویێ خوڤە بگریتن و ل(هەڤلێر و سلێمانیێ) هندەک لایەنێن دیتر پێ رابوینە.پرۆژەی گرنگیا خۆ هەیە ژ بو ڤەکولەرا و خەلکێ بیانی ژی کو پتر دیڤچوون و سەرهلبوونا هەمی بیاڤێن پارێزگەهێ ببن.

ب ئومێدین پشتی چاپا کوردی کو ژ (٩) بەگان پێک دهێتن و پتر ژ (٤٥٠٠) لاپەران بگەهیتە قوناغا چاپێ و ل پاشەرۆژێ بهێتە ڤەگوهاستن بو زمانێن (ئینگلیزی و عەرەبی ) و گەلەک زمانێن دی.

ئەم ب ناڤێ رێڤەبەریا رەوشەنبیری و هۆنەری دەستخۆشیێ ل وان دکەین پشت راستین د نها و پاشەرۆژێ پارێزگەها دهۆکێ دا دێ مفایەکێ زۆر ژڤێ ئینسکلوپیدیایێ هێتە وەرگرتن و دێ بیتە وەک رێبەر و رێ نیشاندەر د هەمی بیاڤان دا.

# چما و چاوان
# من ئەڤ کارە ب ستۆیێ خۆڤە گرت

**موسەدەق تۆڤی**
**سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتی**

ئەڤ ئینسکلۆپیدیا نها ل بەردەستێن خواندەڤانان نە کارەك ب ساناهی بوو، نە ژی کارێ کەسەکی یان دووان بوو، نە ژی کارەك بوو ب وان شیانێن دراڤی و کارگێری و تەکنیکی یێن ل بەردەستێن مە ب رێڤەبچیت و هوسان ب ڤی رەنگی بکەڤیتە بەردەستێن هەوەیێن بەرێز.

هەموو ئەڤ سەروبەرە د ئەڤێ پێشەکیێدا دێ هێنە رۆهنکرن، لێ بەری ئەڤێ رۆهنکرنێ دێ بەرسڤا ڤێ پرسیارێ دەم: چما و چاوان من ئەڤ کارە ب ستۆیێ خۆڤە گرت؟ د بەرسڤا چمادا دێ بێژم عەشقا من بۆ دهۆکێ دهۆکا باژێر دهۆکا پارێزگەهـ، عەشقا من بۆ رەوشەنبیری و هەرکارەکێ رەوشەنبیریێ د وێ دەرگەهی را خزمەتەکا دهۆکێ بکەم ئەز پالدام هەموو شیانێن خۆ بۆ ڤی کاری بمەزێخینم هەتا ب ڤی رەنگی و ب ڤی قەبارەی بکەڤیتە بەردەستێن هەوە. عەشقا من بۆ دهۆکێ د زڤریتەڤە بۆ دەسپێکا سالێن شێستان ئانکو سالێن بەراهیێ یێن شۆرشا ئەیلوولێ، دوورنابینم سالا ١٩٦٢بیت دەمێ ژبەرکاودانێن سەخت و دژوارێن بامەرنێ و نەخوشیا بابێ من ب ناچاری ئەم ژ بامەرنێ چووینە سلێمانیێ و ل بەر سیبەرا برایێ منێ مەزن ئەنوەر تۆڤی کو مامۆستا بوو ل وێرێ ڤەحەویاین، چوونا مە د دهۆکێ را و ڤەمانا مە یا دو سێ رۆژی ل دهۆکێ هند دهێتەبیرا من دهۆکەکا بچویك و جادەك و چەند ترومبێلەك بوو، ل دهۆکێ ئەم مێڤانێن مالا رەحمەتی عەلی حەجی ئادەم مامۆستایێ دێرین بووین، ئەو مال دکەڤتە د ئاڤاهیێ نها دکەڤیتە ب رەخ پەرتووکخانا دهۆك بەرامبەری ئامادەییا کاوە یا نها، ب ئاڤاهیێ (طەلوی) دهاتەناڤکرن، د وان دو سێ رۆژاندا من تشتەك ژ دهۆکا وی سەردەمی دیت یان نە...؟ تنێ ئەو مالە و جادا بەردەرێ وێ دهێتە بیرا من، دا چیرۆك درێژ نەبیت ئەم گەهشتینە سلێمانیێ، ل وی باژێری بنەجهبووین، هەتا داوییا سالێن حەفتییان ژیانا من ما ل وی باژێری، ژیانەکا نوی، خەلکەکێ نوی، شێوەزارەکێ نوی، باژێرەکێ ب چاڤ دهۆکا وی سەردەمیڤە گەلەك گەلەك مەزنتر، باژێرەکێ ب هەررەنگەکی پەسنا وی بکەم نکارم دەرحەقی بەژنا وی دەرکەڤم، لێ تنێ هندە دبێژم باژێرێ رەوشەنبیر و کوردپەروەران، هەرکەسەکی د وی سەردەمیدا بەرێ وی کەتبا وی باژێری و بۆ دەمەکی لێ ڤەمابا، بێ گومان دا ئاستێ وی یێ رەوشەنبیری و هەستا وی یا نەتەوەیی و وەلاتپارێزی چەند جارکی مەزنتر

و بەرفرەهتر بیت، زێدەباری ڤێ چەندێ ژی باژێرەکێ مێڤان پەروەریوو و ریزەکا تایبەت بۆ مێڤانان دگرت و ب رەنگەکی هەمبێزدکرن خۆ ل وێ باژێری غەریب نەبینن، ئەڤ مێڤانپەروەریا خەلکێ وی باژێری بۆ خەلکێ دەڤەرا بەهدینان- بادینان کو وی دەمی هەموو بەهدینانی ب بارزانی ناڤدکرن هێژ مەزنتر بوو، ئەمێن بامەرنی ب مالە بارزانییەکە ناڤدکرین، رێزەکا تایبەت ل مە دگرت، مێڤانپەروەریا خەلکێ سلێمانیێ و رێز و عەشقا وی خەلکی بۆ بارزانی و بارزانییان سەرەرای کاودانێ سەختێ وی سەرەدەمی یێ باژێری و سەرەدەریا توند و دژوارا حکومەتا عیراقێ و لەشکەرێ وێ دگەل خەلکێ باژێری ئێکا وەسان کربوو ئەمێن بامەرنی زوو ل سلێمانیێ هەست ب تەناهی و ئارامیێ بکەین و سلێمانیێ ب وارێ خۆ بزانین.

پەسنەکا دی یا خەلکێ سلێمانیێ ئەو بوو زۆر زۆر حەز ژ باژێرێ خۆ دکەن و ئەڤ حەزژێکرنەژی هندەك جاران ژ ئاستێ پێدڤی دەرباز دبوو، لێ ڤێ حەزژێکرنا وان بۆ باژێرێ وان، هاندانا خەلکەکێ دی دکر ئەو ژی مینا وان حەزژ باژێرێ خۆ بکەن... گەلۆ ئەگەر ئەز حەز ژ باژێرەکی بکەم.. حەز ژ کیژ باژێری بکەم..؟ بامەرنێ هندی من دیتی گوند بوو نە باژێر، ب تایبەت د وان سالاندا ئانکو سالێن شێستان گوند ژی نەمابوو و هاتبوو بەردان، تاکە باژێرێ هەیی و من ب یێ خۆ دزانی دهۆك بوو، هەرچەندە د وێ قوناغێدا دهۆك ب خۆ باژێرکەك بچویك و پاشڤەمای بوو و من ب خۆ ژی تشتەك ژ دهۆکێ نە دزانی.

هەروەك ل پێشیێ من ئاماژەپێکری هەرکەسەکێ د وی سەردەمیدا ل سلێمانیێ ژیابا دا بەرەف خۆ رەوشەنبیرکرنێ چیت و هەستا وی یا نەتەوەیی و وەلاتپارێزی دەولەمەندتر لێ هێت و د هەمان دەمدا دا حەزەکا تایبەت ژی بەرامبەری باژێرێ خۆ هەبیت، ب بۆرینا دەمی و ل دەسپێکا سالێن هەفتییان حەزا کارکرنێ د مەیدانا رەوشەنبیری و ئەدەبیاتێدا ل جەم من خۆرت بوو، من دەست ب نڤیسینا هندەك هەلبەستان کر، لێ وەك دەسپێك من ڤیا ب ناڤێ خۆ بەلاڤ نەکەم و ناڤەکێ دی بۆ خۆ هەلبژێرم، ئەرێ چ ناڤ بۆ خۆ هەلبژێرم حەزژێکرنا من بۆ دهۆکێ و د وان سالاندا دهۆك ببوو پارێزگەهـ ئەز پالدام ناڤێ دهۆکی هەلبژێرم و بکەم بەرهەمێ خۆ د رۆژناما هاوکاری دا ب ناڤێ سەردار عەبدولرەحمان دهۆکی من بەلاڤکر[1] ، پشتی وی ژی چەند بەرهەمێن دی هەر ب وی ناڤی من د هەمان رۆژنامەیێدا بەلاڤکرن[2] ، هەتا من دەست ب نڤیسینێ ب ناڤێ خۆیێ دروست مصدق تۆڤی کری.

ل نیڤا دووێ ژ سالێن شێستانڤە سالانە جارەکێ دووان ل دهۆکێ دبوومە مێڤان، د هەر سەرەدانەکێدا دهۆك پتر ل نك من عەزیز دبوو و من هزر ل وێ چەندێ دکر تشتەکی بۆ دهۆکێ بکەم، بەلێ د وی تەمەنیدا ب چ رەنگان من چ شیان نەبوون تشتەکی بۆ دهۆکێ بکەم شوین تبلێن من پێڤەدیار بن. هوسان ژ دەسپێکا سالێن هەفتییان بەرەف ژوور دهۆك د هزر و ئاشوپا مندا گەلەك مەزنتر بوو، ژ قەبارێ خۆ کو هێژ باژێرکەکێ بچویك بوو، من بهیستبا ل هەرجهەکی هەربەریەرەکی تشتەك، نڤیسینەك، زانیارییەك دەربارەی دهۆکێ چ باژێر یان پارێزگەهـ هەیە ب بەز ئەز بەرەف وی جهی دچووم ل وی بەریەری دگەریام، د هەمان دەمدا ل هەر ژێدەرەکی دەقەك تێکستەك ب کرمانجی (یا ژووری) هەبا یان هاتبا بەلاڤکرن بلەز من دەست خۆ د ئێخست و چاڤێن خۆ پێ رۆهندکرن، ل بیرا منە دەمێ من پەرتووکا (الاکراد فی بهدینان)[3] چاپا ئێکێ د چەکەمەچەیێن پەرتووکخانەیا گشتیا سلێمانیێ دا دیتی من باوەرنەکر فەرمانبەرێ بەرپرس ژ دانا پەرتووکان دێ وێ پەرتووکێ نیشا من دەت، هەر ل وێ پەرتووکخانەیێ بۆ یەکەمین جار من کۆڤارا (رۆناهی) یا حافز قازی دیت ئوهۆ ئەم خودان کۆڤارین، بلەز وەرگرە و بخوینە و چاڤێن خۆ ب نڤیسینێن کرمانجی رۆهنبکە. ب ڤی رەنگی ئەز و نڤیسین ب کرمانجییا ژووری و دهۆکا باژێر و پارێزگەهـ بووینە یەکگیان.

سالا ۱۹۷۲- ۱۹۷۳بۆ خواندنا قوناغا ئامادەیی ژ سلێمانیێ هاتمە زاخۆ، ژ نوو ب بەرفرەهی دگەل

خەلکێ سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ ئاشنابووم، ل هەر دەڤەرەکێ ل هەر قەزایەکێ من هندەك نیاسین، هێدی هێدی دگەل کتا کێما نڤیسەران و مامۆستایێن زمانێ کوردی ل زاخۆ و دهۆکێ ئاشنابووم و بەردەوام ژی چاڤێ من ل وێ رۆژێ بوو ئەز ژی تشتەکی بۆ پارێزگەها خۆ بکەم، ژ دەسپێکا هەفتیان هەتا دەسپێکا سالێن هەشتییان ب بەلاڤکرنا چەند دەق و نڤیسین و ڤەکولینەکا ل نك دلێ خۆ من تشتەك بۆ دهۆکا خۆ و خەلکێ وێ دکر، بەلێ نە سەردەمێ هاریکاربوو و نەژی شیانێن من د هاریکاربوون، ئەوا من دڤیا بۆ پارێزگەها دهۆکێ بکەم تشتەکێ کێم ژی ژێ بکەم.

ل داویا سالا ١٩٧٨ێ ب یەکجاری زڤریمەڤە دهۆکێ و وەك فەرمانبەر هاتمەدامەزراندن، . یا من هەردەم خەون پێڤە دديت بجههات بوومە دهۆکی، یەکەم پێنگاڤا من ل دهۆکێ هاڤێتی بوومە ئەندام د ئێکەتیيا نڤیسەرێن کورد- تایێ دهۆکێ کو سەرژنوو د وان رۆژاندا هاتبوو دامەزراندن، دبيت دەسپێکا ١٩٧٩ێ بيت بوومە ئەندامێ دەستەکا کارگێرییا تایی دهۆکێ یێ ئێکەتیيا نڤیسەرێن کورد، د ناڤبەرا ١٩٧٩- داویا ١٩٨١ێدا ل دووڤ شیان و پێچێبوونا خۆ من رۆلێ خۆ د چالاکیێن ئێکەتیيا نڤیسەراندا گێرا، ب تايبەت د بەلاڤکرنا هژمارا ئێکانەیا کۆڤارا (پەیڤ)دا ئەوا ل سالا ١٩٨٠ێ هاتییەبەلاڤکرن[٤] ، لێ ژ سالا ١٩٨١ێ بەرەڤ ژوور کاودانەك سەخت و دژوار ب سەر دەڤەرێدا هات، ب ناچاری ئەز و گەلەکێن دی ژ چالاکیێن رەوشەنبیری دووركەتین.

سەرهلدانا ١٩٩١ێ ب سەردا هات و دەلیڤەیێن هاریکار هاتنەپێش، ڤوناغا پشتی سەرهلدانێ دگۆت: ئەڤرۆ رۆژا کاریيە، کەسێ دەستێ مێرا نەگرتییە، یی بڤێت بلا بێتە مەیدانێ، گەلەك ژ نڤیسکار و رەوشەنبیرێن دەڤەرێ هەرئێکی د مەیدانەکێدا دەسپێکر، هندی پەیوەندی ب منڤە هەی، من وەك نڤیسکار د کۆڤارا مەتین دا و وەك دەستەکا نڤیسەران د رۆژنامەیا پەیمان دا دەسپێکر، پشکەك ژ وێ ئەوا من دڤیا بکەم من ئەنجامدا، بەلێ ئەوا من دڤیا هێژ پتر بوو، و دەسپێکا دروستا ئەوا من دڤیا بکەم و پێشکەشبکەم ل کۆڤارا دهۆك بوو.

ل سالا ١٩٩٧ێ بوو دەمێ سەرۆکێ باژێرڤانییا دهۆکێ یێ وی سەردەمی ئەندازیار یونس عەبدولعەزیزی پێشنیازا بەلاڤکرنا کۆڤارەکێ ژ ئالیێ باژێرڤانیێ ڤە بۆ من بەرچاڤکری، وەك پاشتر من زانی د بنیاتدا ئەو پێشنیازە ژ ئالیێ د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی ڤە هاتبوو بەرچاڤکرن بۆ سەرۆکێ باژێرڤانیێ، خەونەك بوو و من باوەرنەکر دێ بجهـ هێت، هەرزوو مە دەسپێکر و هژمارا ئێکێ یا کۆڤارێ ل ئەیلوولا ١٩٩٧ێ مە بەلاڤکر[٥] ، هەتا هژمار ٧ د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی وەك سەرنڤیسەر و ئەز وەك سکرتێرێ نڤیسینێ و ژ هژمار ٨ڤە ئەز وەك سەرنڤیسکار[٦] .

کۆڤارا دهۆك دەرگەهەك مەزن ل بەر من و ئەز دبێژم ل بەر گەلەکێن دی ڤەکر، ئەوا من دڤیا و من هیڤی دکر رۆژەکێ ژ رۆژا بۆ دهۆکێ وەك باژێر و پارێزگەهـ بکەم بجهبینم، من دەستێن خۆ هەلکرن، وەك نڤیسکار و سکرتێرێ نڤیسینێ و سەرنڤیسەر ب هاریکارییا یەکەمین سەرنڤیسکاری و سەرۆکێن باژێرڤانیێ و هەموو ئەو بەرێزێن پشکداری د بەرپەرێن کۆڤارێدا کری، خزمەتەك بەرچاڤ بۆ مێژوو و جوگرافی و کەلتۆر و رەوشەنبیرییا تەبایی پارێزگەها دهۆکێ بکەین، بۆ یەکەمین جار چەند لایەنێن مێژووا ڤێ پارێزگەهێ ل سەر بەرپەرێن ڤێ کۆڤارێ هاتنەبەلاڤکرن، چەندین وێنە و دیکیۆمێنت و زانیاریێن دیرۆکی یێن پەیوەندیدار ب پارێزگەهێڤە ل سەر بەرپەرێن وێ کۆڤارێ بەلاڤکرن، کورت و کرمانجی ئەوا ل سەر بەرپەرێن کۆڤارا دهۆك بۆ دهۆکێ هاتییەکرن هەتا وی سەردەمی کەسێ نەکربوو و گەلەك ژێ ب هزرا کەسەکیدا نەهاتبوو، مە ل کۆڤارا دهۆك ب بەرفرەهی دەرگەهێ ڤەکولینان ل سەر پارێزگەها دهۆکێ ڤەکر، ئەو دەرگەهە رۆژ ل دووڤ رۆژێ بەرفرەهتر لێ دهات هەتا کەتییە د مەیدانا ئەکادیمیدا و هەتا نها چەند نامەیێن ئەکادیمی ل سەر مژارێن جودایێن پەیوەندی ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە هەی هاتینەنڤیسین و کۆڤارا دهۆك ژی ژ ژێدەرێن

سەركی یێن وان نامەیانە. د دەمێ دەهسالاندا ب ٣٤ هژمارێن كۆڤارا دهۆك ب هەردو زمانێن كوردی و عەرەبی مە بەردەوامی ب خزمەتا پارێزگەها خۆ دا و ب شانازیڤە دبێژم گەلەك ژ وێ ئەوا من دڤیا بۆ دهۆكێ بكەم ل سەر بەرپەرێن كۆڤارا دهۆك د دەهـ سالاندا ئەنجامدا.

بەلێ وەك دیار هەموو جاران سەروبەر ل دووڤ ڤیانا مرۆڤی نابیت د قوناغا بەرهەڤێدا بووم بۆ بەلاڤكرنا هژمارا ٣٤ ژ كۆڤارێ، ب چەند دەستەكێن رەش پیلانەك دژی كۆڤارێ هاتەگێران، كۆڤار هاتەگرتن، ئەو كۆڤارا دەهـ سالان و د ٣٤ هژماراندا مەزنترین خزمەت بۆ رەوشەنبیریا كوردی ب گشتی و بۆ دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی پێشكەشكرین كرنە قوربانی و ب یەكجاری دەرگەهێ وێ گرتن، بێی كو دلێ كەسەكی ب كۆڤارا دهۆك ڤە بیت و ئەوا كۆڤارێ بۆ سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ كری بەرچاڤ وەرگریت، كۆڤارا دهۆكێ ل سێدارێ دا، ئارمانجێ سەرەكی ژ پیلانێ ئەز بووم. هەرچەندە بریارا راوەستاندنا كۆڤارا دهۆك خەونەكا من بنئاخكر، لێ هەروەك د یەكەمین رۆژا من قەلەم گرتییەدەست من بریاردای ل دووڤ شیان و پێچێبوونا د خزمەتا گەلێ خۆدابم، ل هەرجهەكێ دەرگەهـ ل من بێتەگرتن، ئەز د دەرگەهەكێ دیرا بچمە ژوور بەردەوامیێ ب رێكا خۆ بدەم، د رۆژێن بەراهیێ یێن دائێخستنا دەرگەهێ كۆڤارا دهۆك، من هزر ل چەند پرۆژەكێن دی بۆ خزمەتا دهۆكێ كر، ب وەرگێرانا پەرتووكا وەلاتێ هەكاری[٧] یا د. دەروێش یوسف هروری ژ عەرەبی بۆ كوردی دەسپێكر، وێ پەرتووكا پەیوەندییەكا راستەوخۆ ب قوناغەكا دیار ژ دیرۆكا دەڤەرا بەهدینانڤە هەیە، ب هزرا من وەرگێرانا وێ پەرتووكێ بەردەوامیدان بوو ب وێ پەیامێ یا د یەكەمین هژمارا كۆڤارا دهۆك مە دایە خواندەڤانێن دەڤەرێ.

هەر د وێ هەیامێدا دەرگەهەكێ دی ژ بۆ خزمەتا دهۆكێ ل بەر من ڤەبوو، دەمێ بەرێز دكتور فازل عومەر (وی دەمی سەرۆكێ جڤاتا پارێزگەها دهۆكێ بوو) ل دووڤ داخوازا بەرێز تەمەر كۆچەر پارێزگارێ دهۆكێ یێ وی سەردەمی ژ من و برایێ نڤیسكار ئیسماعیل بادی خواستی كار بۆ بەرهەڤكرنا رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ بكەین، دەملدەست مە دەسپێكر، د ناڤبەرا ٢٠٠٩-٢٠١٠یدا مە رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ ئامادەكر، ل داوییا ٢٠١٠ێ رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ د ٤٠٤ بەرپەراندا كەتە بەردەستێن خواندەڤانان. پشتی چاپبوونا (رێبەرێ پارێزگەها دهۆكی)[٨] ب پتر ژ سالەكێ ل رۆژا ٢٠١٢/٤/٤ پارێزگارێ دهۆكی بۆ دەربرینا سوپاسییا بۆ كارێ مە د ئامادەكرنا (رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ)دا ئەم مێڤانكرینە دیوانا خۆ، پشتی دانوستاندنەكێ دەربارەی (رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ) پێشنیازا پرۆژێ بەرهەڤكرنا ئینسكلۆپیدیا پارێزگەها دهۆكێ من بۆ بەرێزێ پارێزگار بەرچاڤكر، دجهدا هێژای هزر وەرگرت و داخواز كر پرۆژەی د راپۆرتەكێدا دگەل ڤەدیتنەكێ ب پێدڤیاتی و خەرجییێن پرۆژەی بەرهەڤبكەین و بۆ نڤیسینگەها وێ بلندكەین، پشتی ب داویهاتنا وێ روونشتنێ من پرۆژە بەرهەڤكر و نیشا هەڤكارێ خۆ ئیسماعیل بادی دا وی ژی پەسەند كر و ل رۆژا ٢٠١٢/٤/٦ پرۆژە مە بۆ نڤیسینگەها هێژایێ پارێزگار بلندكر. ژ بەر هەر ئەگەرەكی بیت، چ بەرسڤ ل سەر پرۆژەی نەهاتن، بەلێ وەك ل ڤێ داویێ بەرێز دكتور فازل عومەری بۆ من دیاركری د وێ قوناغێدا رەوشا دارایی ل پارێزگەهێ تێكچۆ بوو پارەیەكێ هەژی پرۆژەیەكێ هۆسا مەزن بەردەست نەبوو.

ل داوییا ٢٠١٢ێ بەرێز ئەیوب رەمەزان وەك رێڤەبەرێ گشتیێ رەوشەنبیری و هۆنەری ل پارێزگەها دهۆكێ دەست ب كار بوو، د سەرەدانەكا مەدا ب مەرەما پیروزباهیێ بۆ رێڤەبەریا گشتی هێژای داخوازكر هەركەسەكێ پێشنیازەك یان پرۆژەك بۆ پێشڤەبرنا سەروبەرێ رەوشەنبیری و هۆنەری هەی ئەز حەز دكەم هاریكارییا مە بكەت و مە پێ ئاگاداركەت. د وێ رۆژێدا من بریاردا پرۆژێ خۆیێ پێشتر ئامادەكری بۆ هێژای بلندكەم، پشتی من راوێژ دگەل بەرێز ئیسماعیل بادی كری و وی ژی ئەڤ هزرە پەژراندی ل دەسپێكا ٢٠١٣ێ بوو د سەرەدانەكێدا بۆ رێڤەبەریا

گشتی من پرۆژە دا دەست بەرێز ئەیوب رەمەزانی، وی ژی ب دلفرەهی ژ من وەرگرت و ژڤان دا زوو بخوینیت و بۆچوونا خۆ ل سەر دیاركەت، چەند رۆژەكێن كێم ب سەرڤە نەچوون، هێژای د رێكا هێژا هەلگورد قەهارێ رێڤەبەرێ چالاكیێن وێژەیی ل رێڤەبەریا گشتی ئەز ئاگاداركرم كو بەرهەڤیان بۆ كاری و دابینكرنا پێدڤیێن پرۆژەی ژ جهی و ناڤمالی و كارمەندان بكەین.

بەری هەرتشتەكێ دو سێ ژوورێــن ئاڤاهیێ ئەمنا بەرێ (سەر ب زانكۆیا دهۆكێ)ڤە بوو مە وەك نڤیسینگەها ئینسكلۆپیدیا پارێزگەها دهۆكێ دابینكرن، ل رۆژا ٢٠١٣/٢/١٤ ب هەڤكاری دگەل رێڤەبەریا گشتی مە كۆمبوونەك بەرفرەهـ دگەل دەهان ژ مامۆستایێن زانكۆیێ و رەوشەنبیر و نڤیسكار و هۆنەرمەندێن پارێزگەهێ ل ئوتێلا ژیان یا دهۆكێ ئەنجامدا و د وێ كۆمبوونێدا من و ئیسماعیل بادی پرۆژە بۆ ئامادەبوویان بەرچاڤكر و وان ژی ب بەرفرەهی بۆچوون و تێبینیێن خۆ ل سەر پرۆژەی و چەندین پێشنیاز بۆ دەولەمەندكرنا پرۆژەی بەرچاڤكرن و د ئەنجامدا هەموو ل سەر وێ چەندێ د پێكهاتیبوون كو پێدڤییە پرۆژێ ئینسكلۆپیدیا پارێزگەها دهۆكێ بێتەئەنجامدان و بۆ ئەنجامدانا وێ ژی چەند لیژنە ژ كەسانێن تایبەتمەند بێنەدانان، پشتی چەند رۆژەكان مە چەند لیژنەك دانان و مە هێلا لیژنە ب خۆ بریارێ ل سەر چاوانییا ئەنجامدانا كاری بدەن و ئەز و ئیسماعیل بادی وەك هەڤكار ب ئەركێ تەنسیقێ دناڤبەرا واندا رابین یا پێدڤی بۆ سەركەتنا كاری بكەین.

## ئاستەنگێن بەراهیێ:

ل دەسپێكا كاری ئەز و هەڤكارێ خۆ ئیسماعیل بادی پێكهاتین چەند هەڤالەكێن دی بینینە دگەل خۆ و پێكڤە كاربكەین و مە ل بەرهوو پتر ژ ناڤەندێن زانكۆیێ بن، مە دگەل چەند هەڤالان ئاخفت لێ ژبەر هەر ئەگەرەكێ هەبیت كەسەكی خۆ د بەررا نەبر، د ئەنجامدا مە بریاردا ب هاریكاریا لیژنەیان كارێ خۆ بریڤەببەین، بەلێ یەكەمین ئاستەنگا كەتییە د رێكا كاریدا لیژنە ب خۆ بوون، پتریا ئەو هەڤالێن د كۆمبوونا رۆژا ٢٠١٣/٢/١٤یدا پێشنیازا دانانا لیژنەیان كری، ئامادەنەبوون پشكدارێ د لیژناندا بكەن، هندەك ژ ئەوێن هاتینە یەكەمین كۆمبوونا لیژنان هەر د وێ كۆمبوونێدا خۆ ژبەر كاری هاڤێت، ئەوێن مایین ژی تنێ یەكەم كۆمبوون بوو ئێدی مە نەدیتنەڤە و نە كەسێ دووڤچوونا بریارێن كۆمبوونێن خۆ و كۆنڤیسێ كۆمبوونان كر (ژبلی ئەندامێن لیژنا جوگرافیایێ)، ب كورتی ئەم ژ كارێ لیژنەیان بی هیڤی بووین.

دووەمـیــن ئاستەنگا بەرسنگێ من گرتی دەستبەردانا بەرێز ئیسماعیل بادی بوو ژ كاری، ژ نشكەكێڤە و هێژ ئەم د دو سێ هەیڤێن بەراهیێ یێن كاریدا بووین د قوناغا بەرهەڤی و پەیوەندی و دابینكرنا پێدڤییان و كۆمبوونێن لیژناندا بووین هەڤكارێ من دەستبەردانا خۆ ژ كارێ پێشكەشكر، د ئەنجامدا ئەز مامە ب تنێ و من دیت پشتی هەر پشتی یێ من، وەك چاوا ئەز خودانێ هزرێ و پێشنیازا بەرهەڤكرنا ڤێ ئینسكلۆپیدیایێ بووم، من بریاردا دەست ژ هزرا خۆ بەرنەدەم ب هەر رەنگەكێ هەبیت بەردەوامیی پێ بدەم، ئەو بوو من پەیوەندی ب نڤیسكار خالد سالح ڤە كر كو بێتە دگەل من بۆ ئەنجامدانا كاری، هێژای ل بەراهیێ بەرهەڤییا خۆ دیاركر و دگەل من دەست بكار بوو و هەتا رۆژێن داویێ یێن كاری سەرەرای مژوولبوونا وی وەك مامۆستا و هاریكارێ رێڤەبەرێ خواندنگەهەكا بنەرەتی و هندەك كاودانێن سەختێن ل سالا داویێ یا كاریدا ب سەری هاتین وەك هەڤكار و هەڤالەكێ دلسۆژ بۆ كاری و كارێ خۆ ئەنجامدا.

دەســبــەردانــا هەڤكارەكـی ژ كــاری مــن ب هەڤكارەكێ دی من پر كرەڤە، بەلێ دەستبەردانا نە راگەهاندییا لیژنان (ژبلی لیژنا جوگرافی) ژ كاری دێ چاوان پركەمەڤە...؟ ئەو بوو من بریاردا ب پەیوەندیێن خۆیێن كەسایەتی دگەل مامۆستایێن ئەكادیمی و نڤیسكار و هۆنەرمەند و رەوشەنبیرێن پارێزگەهێ و دەرڤەی پارێزگەهێ كارێ خۆ ئەنجام بدەم، بۆ ڤێ

چەندێ ژی هندەك مامۆستایێن هێژا وەك راوێژكار و پشتەڤان گەلەك هاریكاریا مە كر كو پاشتر دێ ئاماژە ب رۆلێ وان كەین، ب دەهان داخوازنامەیێن فەرمی بۆ چەندین مامۆستایێن زانكۆیان و نڤیسكار و رەوشەنبیرێن دی هەرئێكی ل دووڤ تایبەتمەندیا وی هنارتن و مە چەندین سەرەدان بۆ وان ئەنجامدان و د هەمان دەمدا داكو ژ سنوورێن بازێری دەركەڤین مە سەرەدانا رێڤەبەریێن رەوشەنبیری ل هەریەك ژ ئامێدیێ، زاخۆ، شێخان و ئاكرێ كر، ب هاریكاریا وان رێڤەبەریان دگەل هژمارەكا زۆرا رەوشەنبیرێن وێ دەڤەرێ كۆمبووین و مە بیرۆكا ئینسكلۆپیدیا پارێزگەها دهۆكێ بۆ وان بەرچاڤكر و وان ژی ب بەرفرەهی دانوستاندن ل سەر پرۆژەی كر، ڤان پەیوەندی و سەرەدان و كۆمبوونێن مە هەتا مەها خزیران و تیرمەها سالا ٢٠١٣ێ ڤەكێشا.

هەر ل ڤێرێ پێویستە ئامەژە ب ئاریشێن مە د قوناغا دیزاینێدا بكەین، هەروەك ل بەراهیێ مە دیاركری، ستافێ مەیێ كاری تنێ ئەز و هەڤالێ خۆ خالد سالح بووین، ئەڤ بەرهەمێ نها ل بەردەستێ هەوە ئەنجامدانا هەمی كار و پێدڤیاتیێن وی تنێ خەما مەبوون، لێ هەر ژ بەراهیا كاری ئەم دگەل رێڤەبەریا گشتی پێكهاتبووین كو ئەم تنێ بەرپرسین ژ نڤیسكاری یێ و بەرهەڤكرنێ هەتا دگەهیتە قوناغا دیزاینێ، رێڤەبەریا گشتی دابینكرنا دیزاینەری و پێدڤیاتیێن وی دێ ب خۆڤەگریت و ئەم دێ سەرپەرشتیێ لێ كەین.. ل دەسپێكا ٢٠١٦ مە كارێ نڤیسكاری یێ گەهاندە وێ قوناغێ كو داخوازا بەرهەڤكرنا دیزاینەری یان دیزاینەران ژ رێڤەبەریا گشتی بكەین، ئەو ژی ل دووڤ داخوازا مە هاتن دیزاینەرەك دەسنیشانكر و مە ژی ئەو دیزاینەر پەژراند، دانوستاندنان د ناڤبەرا دیزاینەری و رێڤەبەریا گشتی دەسپێكر، پشتی پتر ژ دو هەیڤێن ئینان و برن و ئەڤرۆ نە سۆبەهێ دیزاینەری ل دووڤ دلێ خۆ خۆ ڤەكێشا. رێڤەبەریا گشتی كەسەك دی دەسنیشانكر وی ژی پتر ژ دو هەیڤان دەم بۆراند هەتا دگەل رێڤەبەریا گشتی ل سەر حەقدەست و مافێن خۆ پێكهاتی و دەست بكاری كر، پاشتر دو سێ هەیڤ برن هەتا نیڤبەرگەك بۆ مە دیزاینكری، پشتی ئیناى و مە ژی هەلسەنگاندی و تێبینیێن خۆ بۆ دیاركرین، پشتی دەمەكی وی ژی خۆ ژبەر كاری ڤەكێشا و چیرۆكا مە دگەل ڤی برای ژی كو پێنج هەیڤەكان ڤەكێشای ب داویهات، ب ڤی رەنگی ٧-٨ هەیڤێن سالا ٢٠١٦ێ ژبەر دیزاینەران ژ مەچوون و كارێ مە گیروو بوو. ڤێ جارێ مە بریار دا ئەم ب خۆ ل دیزاینەران بگەرین، مە دەسپێكر، كەتینە بازاری و دانوستاندنان، دیارە بەردەستتەنگیا مە ژی هۆكارێ سەرەكی بوو زوو ب زوو دیزاینەران دگەل مە كار نە دكر، د ئەنجامدا ل مەها چریا دووێ ٢٠١٦ێ ئەم دگەل ڤان سێ دیزاینەران بێن ناڤێن وان هاتین پێكهاتین، لێ وان ژی ئاریشێن خۆ هەبوون، یا سەرەكی ژی نە د تەرخانكری بوون تنێ بۆ دیزاینا ئینسكلۆپیدیایێ، هەرئێكی پێگیری دگەل سازی یان فەرمانگەهەكا دی هەبوو، دیارە وەك كارمەندێ وان دێ پتر دەمێ خۆ بۆ وان تەرخانكەت و ڤێ ژی كاریگەریا خۆ هەبوو ل سەر گیروو بوونا دیزاینا ئینسكلۆپیدیایی، لێ د ئەنجامدا كار ب دویهات، ئەز دكارم بێژم سەرەرای دەستەنگیا مە و سەروبەرێ ئاماژەپێكرینێ وان هەر سێیان ب دلسۆزی كارێ خۆ ئەنجامدا و د هەڤكاربوون دگەل مە د ئەنجامدانا كاری و چەندین ڤەكولین نە تنێ دوجاركی بەلكی چەند جاركی ل دووڤ داخوازا مە ب سەروبەركرینەڤە و سەرژنوو راستكرینەڤە و ئەو دیزاینە هەلوەشاندییە و سەرژنوو دیزاینكرینەڤە، دێ بێژم و بێژمە ڤە هەرسێ ل وی ئاستینە بێژم هەژینە ببنە نموونە بۆ كەسێن دلسۆز د كاریدا، هەر ل ڤێرێ پێدڤییە ئاماژە ب رەنجا خانم نازدار جزیری بكەم كو د یەكدەمدا كارێ دیزاینێ دكر و سەرپەرشتیا دیزاینا خۆ و هەڤالێن دی بێن دیزاینەر دكر.

## چاوا هاریكاری دگەل مە هاتەكرن..؟

ناهێتە ڤەشارتن ئەڤ نەهـ بەرگێن ئینسكلۆپیدیایێ كو ل بەردەستێن هەوەنە بەرهەمێ رەنج و ماندیبوونا مە یە د كاودانەكێ سەخت و دژواردا

و ب شیانێن كێم، لێ د هەمان دەمدا ژی بەرهەمێ هاریكاری و پشتەڤانییا بەرێز ئەیوب رەمەزانێ رێڤەبەرێ گشتیێ رەوشەنبیری و هۆنەری یە، كو گەلەك جاران هاریكارییا مەعنەوی یا هێژای و رێزگرتنا وی بۆ مە و كارێ مە پتر هاندانا مە كریە بۆ كاری و جهێ نەبوونا پشتەڤانییا (مادی) د سەردەمێ قەیرانێدا گرتییە، بەلێ بەری ڤێ هەموویێ ئەڤ بەرهەمە ب ڤی قەبارەی بەرهەمێ هەموو وان مامۆستا و ئەكادیمی و نڤیسكار و وەرگێر و هۆنەرمەندانە یێن هەریەكی ل دووڤ تایبەتمەندییا خۆ پشكداری د بەرێرنا وێ دا كری، هەر پەیڤەكا هەریەك ژ وان بۆ مە نڤیسی جهێ شانازی و رێز و سوپاسییا مە یە و كورت و كرمانجی دبێژم: ئەگەر هاریكارییا وان هێژایان نەبوایە چەند جاركی ڤێ رەنج و ماندیبوونا مە ئەڤ بەرهەمە ب دەستڤە نە دهات.

بەلێ چاوان ئەز ئاماژە ب هاریكارییا هەركەسەكی دكەم یێ هاریكارییا مە كری، دڤێت ئاماژە ب نەهاریكاریكرنێ و هندەك جاران ژی دژایەتیكرنێ بكەم، بەری هەر تشتەكی د سەرەدانێن خۆ دا بۆ رێڤەبەریێن رەوشەنبیری ل قەزایان و كۆمبوونێن مە ل وێرێ دگەل كەسانێن پەیوەندیدار مە چ ب دەستڤە نەئینا، گەلەكان د وان كۆمبووناندا پێشنیازا دانانا لیژنەیان بۆ كاری ل وان جهان كر، بەلێ كەسێ ئامادە نەبوو پشكدارییێ د لیژنەیاندا بكەت، گەلەكان ژڤان دانە مە بەلێ كەسێ ژڤانا خۆ بجهنەئینا، گەلەكان ژی پاشتر پەیوەندیێن خۆ دگەل مە برین و بەرسڤا پەیوەندیێن مەژی نە ددا، گەلەكان (ئەڤرۆنە سوبەهی) ب مە كر و ب باشە و سەرچاڤان ئەم مژوولكرین و هەتا قوناغا داویێ یا ئینسكلوپیدیایێ ئەم گیروكرین و چ نەكر. هندەك هەڤالێن قەزا ئاكرێ پتر ژ یێن دی ئەڤە دگەل مە كر، و ژ ئەنجامێ ڤێ سەرەدەرییا وان بادەكا قەزا ئاكرێ گەلەك درەنگ هاتەبەرهەڤكرن و بەرهەڤكرنا وێ ژی نە ل دووڤ ڤیانا مەیە، نەخاسمە ئاكرێ رۆلەكێ بەرچاڤ د مێژوویا دەڤەرێ و پارێزگەهێدا هەبوو و هەیە.

ب رەنگێ كۆمبوونێن مە ل قەزا هندەك ڤەكولەر و نڤیسكاران ژی هەمان سەرەدەری دگەل مە كر، هندەكان هەر ل بەراهیێ ب شێوازەكێ جوان داخوازا لێبوورینێ كر و هەرئێكی ب رەنگەكێ دیاركر كو ئەو نەشێت هاریكاریێ بكەت و ئەڤ سەرەدەرییا وان جهێ رێزگرتنێ یە، هندەكێن دی هەر ل بەراهیێ ب رەنگەكێ نە ل ئاستێ وان و وەك ژخۆ نەگرتن و خۆ ب مەزنتر زانینێ راگەهاند كو ئەو د بەرهەڤ نینن بۆ پرۆژەكێ وەك یێ مە بنڤێسین، لێ هەرزوو و دەمێ دیتین ئەم درژدین ل سەر كاری و پرۆژەیێ ئینسكلۆپیدیایێ یێ دبیتە راستی و بێی وان ژی دێ هێتەئەنجامدان هندەك ژ وان هێژایان ل خۆ زڤرینەڤە و پشكداری د بەرێرنێ ئینسكلۆپیدیایێدا كر و پشكدارییا وان جهێ رێزگرتنا مەیە.

هندەكێن دی هەر ل بەراهیێ بازار دگەل مە كر و خۆ و قەلەمێ خۆ نە ل ئاستێ وی پاداشتی دیت یێ ل بەراهیێ مە بۆ هەر ڤەكولینەكێ تەرخانكری، لێ یا پتر ئەم ئێشاندین سەرەدەرییا پێنج مامۆستایێن زانكۆیا دهۆكێ بوو (چوارهەلگرێن باوەرناما دكتورایێ و ماجستێرەك)، د دەسپێكا قوناغا كاریدا بوو یەك ژ وان مامۆستایێن دكتور كو پێشتر وەك هەڤال و هەڤكار و پێكڤەكاركرنێ پتر ژ یێن دی مە هەڤدو دناسی، سەرەدانا مە كر و ب نڤیسین ژ پێش مامۆستایێن هەڤالێن خۆ داخواز كر كو ئەو ئامادەنە بادەكەكێ د چەند ڤەكولینەكاندا ل سەر جیولوجی و ئاخ و رووەك و سەقایێ پارێزگەها دهۆكێ بۆ ئینسكلۆپیدیایێ ئامادەكەن و مە ژی ب نڤیسین و زاردەڤ بەرسڤا وان دا و پێشوازییا پێشنیازا وان كر، ئەم ماینە ل هیڤیێ و بەردەوام مە پەیوەندی دگەلدا دكر بۆ كاری، پشتی چەند هەیڤەكان ئەو مامۆستایێ هەڤال ئەم ئاگاداركرین كو ڤەكولین ب داویهاتینە و وی ب خۆ ژ پێش هەڤالێن خۆڤە سەرەدانا مە كر و د وێ روونشتنێدا ئەم ل سەر پاداشتێ پێنج ڤەكولینان (كو ئەو ب خۆ چوار ڤەكولین بوو، ئێكا هەڤپشك بوو د ناڤبەرا دو ڤەكولەراندا) و پاداشتێ وەرگێرانێ و پاداشتێ تایپكرنێ پێكهاتین، هەتا ڤێرێ

ئاسایی بوو و ل دەسپێکا کاری ب پێکهاتن دگەل رێڤەبەریا گشتی مە بریاردابوو هەرڤەکولەرەکی، نڤیسەرەك یان وەرگێرەکێ بەرامبەری کارێ وی پاداشتەکی بدەینێ، هەرمەزاختنەك ژی دڤێت ب پسووله و ئیمزاکرن بیت. رۆژا پاشتر دو ژ وان مامۆستایان هاتن و ڤەکولینێن خۆ دانە دەست مە، مە ژی ب خوشحالیڤە ژێ وەرگرتن و پێشوازی ل وان و ڤەکولینێن وان کر، لێ دەمێ مە پسوولێن پاداشتی بەرهەڤکرین و ژێ خواستی پاداشاتێ خۆ وەرگرن، رەنگە ئالووزبوون و نەرازیبوونەك ب هەردو مامۆستاینڤە دیاربوو و پاداشتێن خۆ وەرنەگرتن گۆتن هەتا دگەل هەڤالێن خۆ د ئاخڤین و چوون، رۆژا پاشتر دانێ سپێدێ بوو ئەو مامۆستایێ هەڤال تەلەفونکر و بەری هەرتشتەکی گۆتە من: هەڤال دبێژن تە هەستا مە برینداركرییە..!! بەرێزان بۆچی من هەستا هەوە برینداركرییە..؟؟ ئاخفتن ب تەلەفونێ بێ ئەنجام بوو، ئەم پێکهاتین رۆژا پاشتر ئەو هەرپێنج مامۆستا و ئەز و هەڤالێ خۆ پێکڤە روونین و ل دور بابەتی بئاخڤین و ئەم پێکهاتین ئەز بچمە جەم وان، پاشتر ئەو مامۆستایێ هەڤال تەلەفون کر و گۆت ئێڤاری ئەم دێ هێینە جهێ هەوە، باشە هوین بخێربێن، ئێڤاری هەرپێنج مامۆستا هاتن و پشتی بخێرهاتنێ مە دەست ب ئاخفتنێ کر، هەروەك د ناڤبەرا خۆدا پێکهاتبن پتر مامۆستایەکێ ب تەمەن ژ یێن دی مەزنتر و ئەو مامۆستایێ هەڤال ژ پێش وانڤە د ئاخفتن، دانوستاندنێ دەمەك درێژ ڤەکێشا و وان هێژایان پتر ژی مامۆستایێ ب تەمەنی ژ یێن دی مەزنتر زێدە ژ پێدڤی ل دوور ڤەکولینێن خۆ و ئاستێ ڤەکولینان، ڤەکولین ل ئاستێ چەندێ نە و چەندێ دئینن و پێدڤییە چەند بۆ بێتەخەرجکرن و هندەك جاران ژ بابەتی دەردکەفتن و دچوونە بابەتێ خەرجکرنێ ل جهێن دی و ل جەم کەسێن دی، پشتی بگروڤەکێشەکا درێژ ئەو مامۆستایێ هەڤال داخوازا مەبلەغەکێ خەیالی کر بۆ وان هەرچوار ڤەکولینان و ئاخفتن ڤەبری و گۆت: ئەگەر هندێ نەدەی دێ ڤەکولینێن خۆ ڤەکێشین و هەتا سوبەهی دەم دا من و خاترا خۆ خواست. رۆژا پاشتر ل دوور بابەتی و وی مەبلەغێ خواستی من پرسیارا رێڤەبەرێ گشتی کر، بەرسڤا وی ژی ئەو بوو: تویێ ئازادی و دەستەلات بۆ تە ئەگەر تە بڤێت بدەی.. بدێ، لێ ژ ئەنجامێ ئاخفتنێن وان مامۆستایان یێن رۆژا پێشتر، ئەز گەهشتمە وێ باوەریێ بێژمێ: هوین بخێر و ئەم سلامەت، ڤەکولینێن خۆ ڤەکێشن و ئینسکۆلپیدیا نە تنێ ب هیڤیا هەوە ڤەیە و ئەم ژی تێرا خۆ هەینە.. گەلەك جاران، رەفتارا هندەك کەسان دبتە هاندەر کو مرۆڤ کارێن ژ شیانێن خۆ مەزنتر بکەت، ب کریار ژی مە سەلماند هەمان مژارێن وان بۆ مە نڤیسین ژ ئالیێ هندەك ڤەکولەرێن دیتر هاتنەنڤیسین.

ژ ئاریشەیێن دیترێن ئەم ئێشاندین هندەك هێژاییێن دیتر بوون یێن هندەك ڤەکولین ب خۆڤە گرتین و گەلەك ژ دەمێ مە کوشتی و چەندین جاران ئەڤرۆ نە سوبەهی و ڤێ حەفتیێ نە حەفتیا بهێت ب مە کری و د ئەنجامدا چ نەکری کو ب راستی ژی ئەز دبێژم ئەڤە ترانەکرنا وان کەسان بوو خۆ بخۆ و نیشانا وێ چەندێ یە کو نە ل ئاستێ وێ باوەرنامێ نە یا وان وەرگرتی.

هەر ژ ئاریشەیێن بەرسنگێ مەگرتی دروست ژی ئەم ئێشاندین هندەك ژ وان هێژایان کو هەڤالێن نێزیکێن ڤەکولینێن بەرکەتی بۆ مە نڤیسین و ئەم شانازیێ پێ دکەین و پاداشتێ خۆ ژی ب دلێ خۆ وەرگرت، بەلێ ب مخابنیڤە هێژ ئینسکلۆپیدیا ب داوینەهاتی و نەهاتییەچاپکرن وان ئەو ڤەکولینە د جهێن دیتردا بەلاڤکرن یان دگەل بەرفرەهکرنێ وەك پەرتووك چاپکرن، ب هەر هەلسەنگاندنەکێ بیت ئەز ڤێ چەندێ ب کریارەکا نەباش دبینم و یا دی بلا بۆ خویندەڤانان بیت.

ژ ئاریشەیێن دیترێن بووینە ئەگەرێ گیروبوونا کارێ مە، بی سەرەبەریا هندەك ڤەکولینان (نا بێژم لاوازیا وان) بوو، خودانان ڤەکولینێن خۆ دئینان، لێ ژبەر هەرئەگەرەکی بیت، هند د بی سەروبەرێبوون کو بۆ بەلاڤکرنێ دەست نەددان، ژبەر گرنگییا وان ڤەکولینان بۆ ئینسکلۆپیدیایێ و دەولەمەندیا

ناڤەرۆکێ وان ئەم نە دکارین دەست ژێ بەردەین، ناچار بووین ئەم ب خۆ (ئەز و هەڤکارێ خۆ خالد سالح) دەمەکێ درێژ ب سەروبەرکرنا وانڤە مژوول ببین، هندەك جاران ژی ب هەڤکاری و روونشتن دگەل ڤەکولەری ب خۆ ڤێ چەندێ ئەنجامبدەین.

وەرگێران ئاستەنگا هەرەسەرکی بوو د کارێ مەدا، پرانییا ڤەکولین و بابەتێن بۆ مە هاتین ب عەرەبی بوون، ئەم ناچار بووین بکەینە کوردی، د ڤی واریدا پشکەکا مەزنا وەرگێرانێ من و هەڤکارێ خۆ ئەنجامدا، بەلێ هێشتا ئەم پێدڤی ب هاریکارییا هندەك وەرگێرێن دی بووین، مە پەیوەندی ب گەلەکانڤە کر، هندەکان خۆ د بەررا نەبر، هندەکان خۆ د بەررا بر، بەلێ دەمێ وەرگێرانێن خۆ ئینایین، گەلەك د لاواز و بێ سەروبەر و دوور ژ رامانا بابەتی بوون، ب هەر رەنگەکی بیت مە رێز ل وان هێژایان گرت، هندەکان ب رێزگرتنڤە مە وەرگێرانێن وان وەرنەگرتن، هندەکان مە پاداشتێ ماندیبوونا وان دایێ و ب پێکهاتن دگەل وان، من ب خۆ پێداچوونا وەرگێرانێن وان کر و سەرژنوو ب بەراورد دگەل دەقێ عەرەبی من دارشتنەڤە و وەرگێرانەکا نوو ژێ چێکر و ب رەزامەندییا وان ب خۆ هەر ب ناڤێن وانڤە بەلاڤکرن. هەر د مژارا وەرگێرانێدا پێدڤییە ئاماژە ب هەردو هێژایان سالح یوسف سوفی و دیان جەمیل بکەم کو ب راستی خوەدی شیانن د وەرگێرانێدا و رۆلەکێ بەرچاڤ د هاریکارییا مە دا گێرایە و ب چەندین وەرگێرانان ئەڤ پرۆژەیە دەولەمەندکریە و دڤێت وێ ژی بێژم د دو سالێن داویێ و د قوناغا دەستکورتییا ئینسکلۆپیدیایێدا هەردو هێژایان بێ بەرامبەر وەرگێران بۆ ئینسکلۆپیدیایێ کریە.

## پرۆژێ بادەکا بازێر و گوندان

د یەکەمین پرۆژێ مە بۆ ئینسکلۆپیدیا پارێزگەها دهۆکێ بەرهەڤکری بادەکا بازێر و گوندان، قەزا و ناحیان د بەرنامێ مە دا نەبوو، بەلێ د قوناغا خۆ بەرهەڤکرنێ بۆ ئەنجامدانا کاری ئەڤ هزرە ل جەم مە دروستبوو، ب راوێژ دگەل رێڤەبەریا گشتییا رەوشەنبیری و هونەری و هندەك هەڤالان مە بریاردا بکەینە پشکەك ژ ئینسکلۆپیدیایێ و ئەز باوەرم پشکەکا گرنگا ئینسکلۆپیدیایێ ژێ دروستبوو و دێ بیتە ژێدەرەك باش بۆ پاشەرۆژێ، بەلێ دڤێت بێژم پتر ژ هەموو پشکێن دی یێن ئینسکلۆپیدیایێ ئەز ماندی کریمە و دەمێ مە کوشتییە و هندەك جاران ئەز ناچار کریمە بێژم خوزی مە خۆ ب ڤ کاریڤە نەکربا، هوون دشێن رەوشا مە بزانن و بیننە بەرچاڤێن خۆ د دوا قوناغا دیزانێدا ل مەها نیسانا ٢٠١٧ێدا بادەکا سنوورێ ناحیەکێ گەهشتییە مە، ئەو پتر ژ سێ سالان بوو مە هێژایەك بۆ ئەنجامدانا وێ بادەکێ راسپاردی، د قوناغا داویێ یا دیزانێدا ل مەها حزیرانا ٢٠١٧ێدا مە دیت گەلەك کێماسی د بادەکا ناحیەکێدا هەنە، ناچار بووین بلەز ل دۆر مژارێ مە پەیوەندی ب رێڤەبەرێ ناحیێ کر، وی ژی هەر بلەز د دو سێ رۆژاندا ب هاریکارییا هندەك فەرمانبەرێن کارگێرییا ناحیێ زانیارییێن پێویست ل دۆر ناحیێ کۆمکرن و بۆ مە هنارتن و مە ژی سەرژنوو بادەکا ناحیێ دارشتەڤە و بادەکەکا نوو ژێ بەرهەڤکر.

ئەگەر پرسیار بێتەکرن بۆچی..؟ د بەرسڤێدا دبێژم نەبوونا کادرەکێ پسپور ل سنوورێ پتریا قەزا و ناحیان و نە هاریکارییا خەلکەکی دگەل مە ئەگەرێن سەرەکی بوون، وەك مە ئاماژە پێدای مە پەنابرە بەر رێڤەبەرێن رەوشەنبیری ل سنوورێ قەزایان (ژبلی قەزا سێمێلێ و بەردەرەش) و ئەم دگەل هژمارەك ژ رەوشەنبیر و نڤیسکار و رۆژنامەڤانێن وان روونشتین، لێ کەسێ نە بۆ بادەکا قەزا و ناحیان و نە بوو ڤەکولینێن دیتر هاریکارییا مە نەکر، مە داخوازا هاریکاریێ ژ هندەکێن دیتر، وانژی خۆدبەررا بر و هندەکان خۆ پێڤە وەستاند، هەرچەندە مە پلان بۆ ئەنجامدانا بادەکا هەرقەزایەکێ، ناحیەکێ و گوندەکی دانابوو و مە دابوو دەست وان هەڤالان، بەلێ هندەك ژ وان ژبەر هەر ئەگەرەکی بیت نەشیان پێگیریێ ب بەرنامەی بکەن و د ئەنجامدا پێدڤی بوو سەرژنوو کارێ وان دارێژینەڤە و سەروبەربکەین و پێگیریێ ب بنەمایێن زانستی و ڤەکولینان د

نڤیسینێن واندا بکەین، مژارێن زێدە لادەین و بێن کێم پرکەینەڤە. ل هندەك ناحیان پشتی گیرووبوونەکا درێژ کەسێ خۆ د بەررا نەبر، یان ئەوێن خۆ د بەررابری د خۆرا نە دیت و دەست ژێ بەردان و هندەکان ژی ژ ئەنجامێ هندەك پرسگرێکێن کەسایەتی دەست ژێ بەردا، ئەم ژی ناچار بووین هەوارا خۆ ببەینە بەرهندەك رێڤەبەرێن ناحیان ئەو بۆ مە کەسەکێ خودان شیان ب تایبەت د وارێ لێکەریان و دووفچوونێدا بۆ مە دەسنیشانکەت دا ب ڤی ئەرکی رابیت، هاریکاریا هندەك رێڤەبەرێن ناحیان د ڤی واریدا جهێ رێزگرتنێ یە، و ژ ئەنجامێ هاریکاریا وان هندەك کەسان هاریکاریا مە کر و دەست ب کاری کر، هەرچەندە کەسێ ژ وان چ ئەزموون د وارێ نڤیسینێ و ڤان رەنگە کاران نەبوون، بەلێ ژ دلسۆزیا وان بۆ دەڤەرا وان ئەرکێ خۆ ئەنجامدا، هندەکان زانیارێن باش و دەولەمەند بەرهەڤکرن و ئەم ب ئەرکێ دارشتنەڤە و سەربەرکرنا وان رابووین، هندەکان ژی هەرچەندە خۆ ماندیکربوو، بەلێ کارێ وانێ نیڤەرۆ و کێم زانیاری بوو دگەل دارشتنەڤە و سەربەرکرنێ زانیارێن وان پێدڤی دەولەمەندکرن و بهێزکرنێ و بارگرانییەکا دیتر ل سەر مە زێدەکر، هندی پەیوەندی ب ڤان بادەکانڤە هەی مژارا وێنەیانە، کتەکا بەرهەڤکارێن وان تێرا بادەکێ و پتر ژی وێنەدگەلدا ئامادەکربوون، بەلێ پتریا وان د بێ وێنەبوون و ئەم ناچارکرین ب دەهان پەیوەندییان دگەل وان ب خۆ و خەلکەکێ دیتر بکەین هەتا هندەك وێنەیان بۆ بادەکێن وان دابین بکەین. ب هەر رەنگەکێ هەبیت بادەکا قەزا و ناحیان پشکەك مەزن ژ دەمێ مە بر و پتر ژی ئەگەری گیرووبوونا ئینسکلۆپیدیایێ بوو و پتر ژی ئەم ماندیکرین، بەلێ ئەم شانازیێ پێڤەدکەین کو یەکەمین جارە هوسان ب بەرەفرەهی زانیاری ل سەر باژێر و باژێرك و گوندێن بەهدینان دهێنەکۆمکرن و دەستخوشیێ ل هەرکەسەکی دکەین یێ ب رەنگی پشکداری تێدا کری.

## ناڤکرنا ئینسکلۆپیدیایێ و سنوورێ وێ

بەری هەرتشتەکی هزر ل ناڤکرنێ و سنوورێ وێ هاتەکرن، بەلێ پتریا بۆچوونان ل سەر وێ چەندێ پێکهاتی بوون ئینسکلۆپیدیا سنوورێ کارگێریێ پارێزگەها دهۆکێ یێ نها ڤەگریت و ب ئینسکلۆپیدیا پارێزگەها دهۆکێ بێتەناڤکرن، ژبەرکو ئەم د وێ باوەرێدانە د چەند ڤەکولینااندا ژی ئەو چەند هاتییەسەلماندن سنوورێ نها یا پارێزگەها دهۆکێ هەمان سنوورێ دیرۆکی یێ میرگەها بادینان-بەهدینانە یێ د دوسێ سەدساڵیێن داویێ یێن ژیێ میرگەهێ دا، ئانکو ئەگەر مە ب ئینسکلۆپیدیا بەهدینان ژی ناڤکربا دا (کێم زێدە) هەمان سنوورێ جوگرافی ڤەگریت، زێدەباری ڤێ چەندێ چەند ئینسکلۆپیدیایەك ل بەر دەستێ مە هەبوون کو ب سنوورێ جوگرافی هاتبوونە ناڤکرن.

پێدڤییە ئاماژە ب مژارەکا دی بکەم ئەوژی پەیڤا (بەهدینان- بادینان) کو ب هەردو گۆتنان ل ڤێرێ هاتییەبکارئینان، (ڤەکولینەك ژی د ڤێ ئینسکلۆپیدیایێ هاتییەبەلاڤکرن پتر ئاماژە ب ڤێ بابەتی دکەت)ب کورتی ئەز د وێ باوەرێدا هەردو پەیڤ د بنیاتدا یەك پەیڤن، ل دووڤ جهـ و دەڤەر و بهوژێن د دو پیتاندا هاتییەکرن و هەردەڤەرەك ب ئاوایەکی بلێڤ دکەت، ئەگەر نڤیسینەك یان پەرتووکەکا من ب خۆ با دا پەیڤا بەهدینان بکارئینم، بەلێ ئەز وی مافی نادەمە خۆ رایا خۆ ل سەر خەلکەکێ دی ب سەپینم و ب مخابنیڤە ل ناڤەندێن مە یێن رەوشەنبیری ژی پێکهاتنەك ل سەر ڤێ پەیڤێ نینە، لەوما من هێلا هەرکەس ئازاد بیت د نڤیسینا ڤێ پەیڤێدا و چاوان نڤیسین و ڤەکولین گەهشتینە مە، مە بادینان- بەهدینان وەك خۆ هێلان.

مژارەکا دی یا هەژی ئاماژە پێکرنێ رێنڤیسارا ئینسکلۆپیدیا پارێزگەها دهۆکێ، ڤەشارتی نینە و ب مخابنیڤە ئەز دبێژم مە ل بەهدینان د نڤیسینا کرمانجییا ژووریدا هەتا نها رێنڤیسەك یەکگرتی نینە، چەند جڤین و روونشتن ل دور ڤێ مژارێ هاتنەکرن، نە ل سەر تشتەکی پێکهاتن و نە کار بۆ

رەنگە پێکهاتنەکێ ل سەر رێنڤیسەکا یەککرتی هاتەکرن، گەلۆ پا ئەم چ بکەین..؟ هەرئێکی ب رێنڤیسەکێ بۆ مە نڤیسییە، ئەم ناچار بووین رێنڤیسارا ئینسکلۆپیدیایێ هەتا ئاستەکی یا یەککرتی بیت، دبیت ب دلێ هندەکان نەبیت، هندەك ژی دگەل مە بن، لێ مە ڤیا رێنڤیسارا مە هەتا ئاستەکی یا یەککرتی بیت، دگەل هندێ ژی مە رێز ل رێنڤیسارا هندەك هەڤالان گرت یێن شارەزایی د وی واریدا هەی و خەم ژێ خواری و مە هند خۆ ل رێنڤیسارا وان نێزیك نەکر، بەلکی مە یا خۆ و هندەکێن دی ژی نێزیکی یا وان کر، کتەکا هەڤالان ژی داکوکی ل سەر وێ چەندێ کر کو دڤێت ب هیچ رەنگەکی دەست ل نڤیسینا وان نەهێتەدان و وەسان بیت وەك وان نڤیسی، هەتا ئاستەکی مە رێز ل بۆچوونا وان ژی گرت.

ل داویێ بۆ دیرۆکێ پێدڤییە ب کورتی ژی بیت ئاماژەکێ ب کارێ خۆ د ڤێ ئینسکلۆپیدیاییێدا بکەم و دبیت هندەك کەس ژ نێزیکڤە ئاگادار بن ژێ، بەری هەرتشتەکی دێ بێژم ئەڤ رەنگە پرۆژەیە کارێن تەبایی نە، کۆمەکا کەسان د دەزگەهەکی یان سازییەکێدا  و ب شیانێن دراڤی و تەکنیکی یێن مەزن پی رادبن و هەرئێك یان هەرچەند کەسەك پشکەکا کاری وەردگرن، بەلێ مخابن ئەڤ هەموو سازی و دەزگەهێن مە ل پارێزگەها دهۆکێ هەین د سەردەمێ بەرفرەهییێدا ئانکو بەری قەیرانێ هزر ل ڤێ چەندێ نەکر، نە تنێ خۆ ل کارەکێ پێدڤیێ وەك ئینسکلۆپیدیایێ نەکرە خودان بەلکێ د بنیاتدا کەسێ ژی ئەو هزرە نەکریە، لەوما یەکەمین هزر لێکرن یا مە بوو و یەکەمین پێشنیاز و پرۆژە بۆ بەرهەڤکرنا ئینسکلۆپیدیا پارێزگەها دهۆکێ یا من بوو، وەك ل پێشیێ من ئاماژە پێکری ژ بلی نڤیسکار (خالد سالح)ی کەسێ خۆ د بەررا نەبر وەك کارمەندەکێ بەردەوام رۆژانە هاریکاریا من بکەت، لەوما پشتی یێ مەزن کەتە سەر ملێن من، دەمێ رێڤەبەرێ گشتیێ رەوشەنبیری ژ ئالیێ هاریکاریێ ڤە خۆ ل پێشنیازا مە کریە خودان، مە ژی بریاردا ئەوا د شیانێن مەدا بیت رەنجێ دگەل ڤی پرۆژەی بدەین دا کۆ ڤێ خزمەتێ بۆ پارێزگەها خۆ پێشکەش بکەین. د سالا بەراهیی یا کاریدا ب وێ پێشینەیا بۆ دەمێ سالەکێ بۆ مە هاتییە مەزاختن، ژ ئالیێ دراڤی ڤە کار ب باشی ب رێڤە چوو، د سالا دوویێدا ژی خراب نەبوو و مە خۆ ب بەرمایکێن سالا پێشتر برێڤەبر، لێ دسالێن پاشتر و هەتا ئەڤرۆ کو خویندەڤان ڤێ ئینسکلۆپیدیایێ چاپکری ل بەردەستێن خۆ دبینن قەیرانەکا پڕ دژوار بەرۆکا مە گرت، لێ هەر د سالا بەراهییێدا مە رەنگە ئابووریکرنەك و دەست پێڤەگرتنەك د وی دراڤیدا کر یێ وەك پێشینە بۆ سالەکێ بۆ مە هاتییەخەرجکرن، د ئەنجامدا گۆژمەیەك ما ل بەردەستێن مە، ب رەنگەکێ خۆبەخش و ئابووریکرنێ د هەرتشتەکیدا و دەستبەردان ژ گەلەك تشتان کو پێدڤی خەرجی بوون و ب هاریکارییەکا زۆر کێما رێڤەبەریا گشتی ئەم شیاین کارێ خۆ بگەهینینە قوناغا داویی.

ب کورتی ئەو کارێ د شیانێن دەزگەهەکی یان سازییەکێدا من ب هاریکاریا هەڤکارێ خۆ ئەنجامدا، ب ئەرکێ سەرنڤیسکاریێ و سەرپەرشتییا گشتییا پرۆژێ ئینسکلۆپیدیایێ رابووم، من نڤیسین دکر، ب چەند ڤەکولین و وەرگێڕانەکان من پشکداری تێدا کریە، پتریبا ڤەکولین و بابەتێن د ئینسکلۆپیدیاییێدا هاتین بەرهەمێ تێکەلی و پەیوەندیێن کەسی یێن منن دگەل خودانان، چەند جارکی من پەیوەندی ب چەند ڤەکولەر و نڤیسکاران کرییە، هەتا ئامادەبووین پشکداریێ د پرۆژەیێ مەدا بکەن، هندەکان تەلەفونێن خۆ ل مە گرتینە و بەرسڤا پەیوەندییێن مە نەداینە، بەلێ مە سەرەدانا وان کرییە و تێئێخستینە هاریکاریێ بکەن بەلێ د ئەنجامدا ڤەکولینەکا باش بەرهەڤکرییە، هەر نڤیسین و ڤەکولینەکا هاتی چەند جارکی من خواندییە و پێداچوویمەڤە و رێنڤیسارا وێ راستڤەکرییە و راوێژ دگەل خودانی کرییە، هەر وەرگێڕانەکا بۆ مە هاتییەکرن، من پەیوەندی ب وەرگێڕیڤە کرییە و پاشتر دووڤچوونا وی کرییە هەتا گەهشتییەدەست و پاشتر دگەل دەقی عەرەبی بەراورد کرییە و ئەگەر پێدڤی

بوو من بۆ وەرگێری ڤ‌ڤرانديیەڤە و تێبینی داینێ و ل بەر رۆناهیا وان تێبینییان سەرژنوو پێداچوویەڤە و دواجار مە دایە دەست ڤەکولەری یان نڤیسکاری و وی ب خۆ ژی دگەل دەقێ خۆیی عەرەبی بەراورد کریە و ئەگەر تێبینییەك هەبیت مە پێگیری ب تێبینیا وی کریە.

بۆ بادەکا باژێر و گوندان ژی هەر ب وی رەنگی مە پەیوەندی ب خەلکەکیڤە کریە و سەرەدانا قائیمەقام و رێڤەبەرێن ناحیان کرییە، گەلەك جاران ژی مە ژێدەر و پەرتووکێن پەرتووکخانا خۆ دانابنە بەردەستێن وان هەتا بادەکێن خۆ بەرهەڤکرین، ژ ئالیێ کارگێری و پێویستییێن کارگێری ژی هەر ئەز ب خۆ پێ رابوویمە و ئەوا پێدڤی من ئەنجامدایە. ب کورتی د ڤان چوار پێنج سالاندا ب تایبەت د قوناغا ڤەبرانێدا ئەگەر هەر فەرمانبەرەکی سێ یان چوار رۆژان دەوام کریبیت، مە شەش رۆژان د هەفتییێدا دەوام کریە و پرانیا وان رۆژان ژی من دو دانان سپێدە و ئێڤاری دەوام کرییە، و دانێ سیێ ژی من ل مال بەرداوامی پێدایە، دڤێت وێ ژی بێژم ژ بلی هەردو جەژنێن رەمەزان و قوربانێ و جەژنا نەورۆزێ ل هەموو رۆژێن پشوو و بێنڤەدان ژی مە دەوام کریە هەتا ئەڤ بەرهەمی ب ڤی رەنگی کەتیە بەردەستێن هەوە.

ئەگەر ئەڤە مە کریبیت دڤێت ئاماژە ب هندەك هێژایێن دیتر بکەین یێن پشتەڤانیا مە کری و هاندەرێن سەرەکی بوونە بۆ ئەنجامدانا کاری، بەری هەموویان ژی بەرێز ئەیوب رەمەزان رێڤەبەرێ گشتی کو هاندان و پشتەڤانیا وی یا مەعنەوی پتر ژ پشتەڤانیا مادی هاریکاربوویە بۆ مە کو ژ دل و ب گیانەکێ خۆ بەخش کارێ خۆ ئەنجام بدەین، د هەمان دەمدا هێژایێن دەستەکا راوێژکار یێن ناڤێن وان هاتین هەر ئێکی ب رەنگەکی و د دەرگەهەکی را هاریکاریا مە کریە و رێك ل بەر مە خوشکریە بۆ ئەنجامدانا کاری، ل بەراهیا وان ژی دێ ئاماژە ب پ. د عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی کەم یێ هەر د قوناغا بەراهیێدا و هێژ پرۆژە د هزرا من دا بەرهەڤیا خۆ بۆ هەر هاریکارییەکێ دیارکری و دەمێ مە دەست پێکری ژی ژ دل هاریکاریا مە کری و هەتا داویێ ژی د هاریکاریێدا بەردەوام بوویە، هەر وی هێژای بەرنامێ بادەکا دیرۆکا هەڤچەرخ بۆ مە دانایە و ب راوێژ دگەل وی مە ڤەکولەرێن وێ بادەکێ دەسنیشانکرینە.

هەر د وارێ هاریکارییێدا دڤێت ئاماژە ب هاریکاریا سەرۆکاتییا زانکۆیا دهۆکێ و خۆدێ سەرۆکێ زانکۆیی بکەم کو پشکەك ژ ئاڤاهیێ خۆ ل گرێ باسێ دایە ڤ مە و ئەم ژ ئاریشا خانی و کرێیا خانی رزگارکرین، د هەمان دەمدا هاریکاریا سەنتەرێ ڤەکولینێن کوردی و پاراستنا بەلگەنامەیان (سەنتەرێ بێشکچی یێ نها) یێ سەر ب زانکۆیا دهۆکێ ڤە ناهێتە ژبیرکرن چ دەمێ ئەو ل ئاڤاهیێ گری باسی و چ پشتی ڤەگوهاستینە ناڤ حەرەمێ زانکۆیا دهۆکی، وی سەنتەری د سەردەمێ هەر سێ بەرپرسێن خۆ (پ.د عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی، پ.د محەمەد بەکر و پ.د نەشوان شوکری) و ب هەموو کارمەندێن خۆڤە د چەندین واراندا گەلەك هاریکاریا مە کریە. د هەمان دەمدا هاریکاریا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەت رێڤەبەرێ وێ بەرێز چیاڤان عەبدولرەزاق و بەرێزان سابر یاسین سالح ئاکرەیی شارەزایێ ئامارێ و ئەندازیار زیاد ئەحمەد ناهێتەژبیرکرن کو د وارێ بەرهەڤکرنا نەخشە و ئامار و زانیاریاندا هاریکارییەکا هەژی دگەل مە کریە و گەلەك ژ وێ ڤالاهیا مە نەخشە و ئامار و زانیاریاندا هەی بۆ مە پڕکرییەڤە.

هەر ل ڤێرێ پێدڤییە و ب ئەرك دزانم سوپاسیا هەڤژینا خۆ گەلاوێژ ئەحمەد عاسم بکەم کو د ڤان چوار پێنج سالاندا من هەمی دەمێن خۆ بۆ ئەنجامدانا ڤی کاری تەرخانکرین وێ هاریکاری و پشتەڤانیا من کری و رێك ل بەر من خوشکری هەتا بکارم ڤی پرۆژەی بگەهینمە ڤێ قوناغێ کو نها خواندەڤان دبینن، کو د راستیدا هەرکەسەکی ئەگەر سەقایەکێ ئارام و هاریکار و پشتەڤان د ناڤ مالا خۆدا نەبیت نکاریت خۆ ب کارێن مەزنڤە بکەت مینا ڤی کاری.

دبیت هندەك بێژن ئەڤ پێشەکییە ب خۆ

گۆتنە یا زێدە بوو، لێ ئەز ب مافێ خۆ دزانم بێژم ئەڤ كارێ خەلكەك ب دەزگەهان و شیانێن مەزن ئەنجامددەت، مە دو كەسان ب كێمترین شیانێن ل بەردەستێ مە مە ئەنجامدا و پێشكەشی گەلێ خۆ كر، مە ئەو چەندە سەلماند كو ئەگەر مرۆڤ یێ كاركرنێ بیت و باوەری ب خۆ هەبیت دێ كارێن مەزن ب هژمارەكا كێما كەسان و شیانێن مادیێن كێم هێنەئەنجامدان.

دبیت پرسیارەك بێتەكرن: ئەرێ ڤێ ئینسكلۆپیدیایێ هەموو مژارێن پەیوەندی ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە هەی ب خۆڤە گرتینە.. د بەرسڤێدا دبێژم: نەخێر ... ژبەركو هەركەسەكێ هزرا خۆ ل كارەكێ ب ڤی رەنگی بكەت، دبیت هندەك تشت ب هزرا وی دا بهێن یێن ب هزرا مە یان مامۆستایێن مە دەستەكا راوێژكاردا نەهاتین... د هەمان دەمدا هندەك هزرێن دی مە هەبوون، ژ ئەنجامێ نەبوونا هاریكاریێ و كێمیا دەمی ئەم نەشیاین ئەنجامبدەین، بۆ نموونە مە پێدڤی دديت چەند ڤەكولینەكێن دی ل سەر مێژووا دهۆكێ پشتی سەرهلدانێ مە هەبن، مە داخواز ژ گەلەك مامۆستا و تایبەتمەند و ئەكادیمیان كر بەلێ كەسی خۆ د بەررا نەبر، مە بخۆژی هند دەم نەبوو ب وی كاری رابین، وەك نموونە: مە پێدڤی دديت مە ڤەكولینەك دەربارەی دیرۆك و رۆل و چالاكیێن رێكخراو و كۆمەلەیان ل سنوورێ پارێزگەها دهۆكی هەبیت مە پەیوەندی ب چەند كەسەكانڤە كر، لێ كەسی هاریكاری نەكر، مە حەزدكر چەند ڤەكولین د وارێ سایكولوژی هەبن هندەكان بەرهەڤیا خۆ دیاركر بەلێ د ئەنجامدا ئەم گیرووكرین و چ نەكرن، ب درێژیا سالێن كارێ مە ئەم ل هیڤیا هندەك هەڤالان بووین نڤیسینەكێ ل سەر دیرۆكا سینەمایی ل دهۆكێ بەرهەڤكەن، گۆت بەلێ و چ نەكر، مە ل بەربوو بەرگەكێ یان پتر بۆ كەسایەتیێن دەڤەرێ تەرخانكەین، بەلێ ژ ئەنجامێ كێمیا دەمی و مژوولبوونا مە بكاری و نەبوونا شیانێن دیتر و نە هاریكاریا خەلكەكی مە ب خۆ دەست ژێ بەردا، ب وی هیڤیێ د دەلیڤەكا دی ئەم بكارین وی كاری ئەنجامبدەین، ب كورتی نە ئینسكلۆپیدیایێ سنوورەك دیاركری هەیە و نە ژی ب داوی دهێت، ئەڤا مە ئەنجامدای ئەو بوو یا ل دووڤ شیان و زانین و بۆچوون و دەمێ ل بەردەستێن مە مە كری، ئەڤە یەكەمین ئینسكلۆپیدیا پارێزگەها دهۆكێ و یەكەمین پرۆژێ رەوشەنبیرییە ب ڤی قەبارەی ب كوردی ل سەر پارێزگەها دهۆكێ دهێتەكرن، ب وێ هیڤیێ د پاشەرۆژێدا پرۆژێن مەزنتر د ڤی واریدا بێنەئەنجامدان و دهۆك ژی هەژی كارێن گەلەك مەزنترە.

ل داویێ ئەڤە مە كارێ خۆ ئەنجامدا و ئەو پرۆژێ مە بخۆ هزر لێكری و پێشنیازكری مە ب شیانێن خۆ و هاریكاریا وان هێژایان یێن ناڤێن وان د نەهێ بەرگێن ئینسكلۆپیدیایێدا هاتین ب داوی ئینا و كەتە بەردەستێن خوێندەڤانان. من باوەری هەیە هەرنڤیسنەك هند مولكێ مرۆڤی یە هندی ل جەم مرۆڤی و هێژ نەكەتییە سەر كاغەزا چاپكری، دەمێ دكەڤیتە سەر كاغەزا چاپكری دبیت مولكی هەركەسەكی، ئەڤ ئینسكلۆپیدیایە ژی ئینسكلۆپیدیا پارێزگەها دهۆكێ یە ئانكو هەموو خەلكێ پارێزگەها دهۆكێ ماف هەیە هەروەك ئەو ب باش دزانن هەلسەنگینن و بریارێ ل سەر بدەن، بەلێ وەك خانی دبێژیت:

**مەئمول ئەوە ژ ئەهلێ رازان**
**ئەو دێ نە كرن ب من تنازان**

**ئەز پیلەوەرم نە گەوهەریمە**
**خود رستەمە، ئەز نە پەروەریمە**

**كرمانجم و كوهی و، كناری**
**ڤان چەند خەبەرێد كوریەواری**

**ئیمضا بكرن ب حوسنێ ئەلطاف**
**ئیصغا بكن ئەو ب سەمعێ ئینصاف**

**ئەصحابێ غەرەض كو گوهـ بدێرن**
**عەیبا ب كەرەم ل مە ڤەشێرن**

**ئاڤا رویێ شاعیری نە رێژن**
**گەر مومکنە ئێکە قەنج ببێژن**

**سەهو و غەلەطان نەکەن تەعەججوب**
**تەئویل بکن ژ بۆ تەعەصصوب[9]**

ل داوییا داویێ ژی ئەڤە بەرهەمێ مە ئینسکلۆپیدیا پارێزگەها دهۆکێ مە کرە دیاری بۆ پارێزگەها دهۆکێ ب تەبایی خەلکێ کوردستانێ لێ بەری هەموویان ژی دیاریە پێشمەرگەیێن کوردستانێ و شەهیدێن کوردستانێ ئەگەر بەرخۆدان و قوربانییا وان نەبایە ئەو ئارامییە دەست مە نەدکەت ل ژێر سیهوانا وێ ب کارین ڤی کاری ئەنجام بدەین و سوپاسی بۆ خودایێ دلوڤان و میهرەبان ئەو تەمەن دایە مە ئەم ڤی کاری تێدا ئەنجام بدەین... بەرەڤ دهۆکەکا ئاڤەدان و پێشکەتی و کوردستانەکا سەربەخۆ و ئازاد.

٢٠١٧/٦/١٠

## ژێدەر و پەراوێز:


١. رۆژناما هاوکاری بەغدا هژمار ٤ سالا ١٩٧٠ێ
٢. مستەفا نەریمان، بیبلوگرافیا چوار سالەی رۆژنامەی هاوکاری، بەغدا – ١٩٨٥، بپ ٢١٦
٣. انور المایی، الاکراد فی بهدینان، بحث تاریخی اجتماعی عن منشا الاکراد و عقائدهم، و عاداتهم طبائعهم و ادابهم، مطبعة الحصان، الموصل- ١٩٦٠.
٤. کۆڤارا پەیڤ، ١٩٨٠ێ
٥. بۆ پتر زانیارییان ل سەر کۆڤارا دهۆك و چاوانییا بەلاڤبوونا وێ بنێرە، ئیندێکسێ کۆڤارا دهۆك سالێن ١٩٩٧- ٢٠٠٣ ژمارێن (١- ٢١)، بپ ٤-٥، دهۆك- ٢٠٠٤.
٦. وی دەمی د. عەبدولفەتاح عەلی راگرێ کولیژا ئاداب یا زانکۆیا دهۆکێ و سکرتێرێ کۆڤارا زانکۆیێ بوو، د هەمان دەمدا ل کۆڤارا دهۆك و مەتین کار دکر، ئەگەرێ دەستبەردانا وێ ژ کۆڤارا دهۆك ئەو بوو کو سەرۆکێ زانکۆیێ یێ وی دەمی دگۆتێ مادێ چەند کاران کەی و مەرەما وی کارکرن بوو ل کۆڤارا دهۆك و مەتین، هەروەکی ئەو ب خۆ دبێژت بۆ رازیکرنا سەرۆکێ زانکۆیێ دەست ژ کۆڤارا دهۆك بەردا، بۆ پتر زانیارییان بنێرە، کۆڤارا دهۆك: هژمار ٨- کانوونا ئێکێ ١٩٩٩، بپ ٥١.
٧. د. دەرویش یوسف حەسەن هروری، وەلاتێ هەکاری ٩٤٥- ١٣٣٦ز، وەرگێران موسەدەق تۆڤی، دهۆك- ٢٠١٠.
٨. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی (بەرهەڤکرن)، رێبەرێ پارێزگەها دهۆکێ، (دهۆك- ٢٠١٠).
٩. ئەحمەدێ خانی، مەم و زین، ئامادەکردن و پەراوێز نووسینی: هەژار، (پاریس- ١٩٨٩)، بپ ٣٢- ٣٣.

# كورتە مێژوویا ئینسكلۆپیدیایێ

د. فازل عومەر

## پێناسە

ئینسكلۆپیدیا وەكو پتریا فەرهەنگێن ئنگلیزی پێناسە دكەن، دبێژنە ئەوی بەرهەمی یان پرتووكێ یا هەمی بیاڤێن ژیانێ ب خوەڤە بگرت یان ب بەرفرەهی لدۆر مژارەكێ پێزانینان بدەت و ئەو پێزانینە؛ یان ب ئاوایێ پەیڤان و ب ئەلیفبێتكی هاتینە رێزكرن، یان ژی كۆمەلەكا گوتارانن[1].

ئەڤجا، دو جۆرێن ئینسكلۆپیدیا و دو جۆرێن رێزكرنا پێزانینان هەنە: ئینسكلۆپیدیا گشتی كو بزاڤێ دكەت هەمی زانست و پێزانین تێدا بن و ئینسكلۆپیدیا بابەتەكی كو لدۆر ئێك بیاڤێ یان زانستی مەزنترین ئەندا پێزانینان ددەت. ئو ئاوایێ رێكرنا ئەوان پێزانینان ژی ب دو جۆرانە؛ یان وەكو فەرهەنگەكا بەرفرەهە، پەیڤ ب ئەلیفبێتكی هاتینە رێزكرن و شرۆڤەكرن یان كۆمەكا بەرفرەها گوتارانە چ لدۆر هەمی بیاڤ و زانستان یان زانستەكی[2].

هەروەسا، پەیڤا ئینسكلۆپیدیا Encyclopedia بۆ گەلەك تێگەهێن ژی هاتییە گۆتن. ئێك ژ ئەوان؛ فەرهەنگا دەولەمەندە، هەر فەرهەنگەكا پەیڤان و ناڤان وەلات و مللەت و باژێر و مژارێن زانستی و مێژوویی و جوگرافی...هتد، ب بەرفرەهی شرۆڤە بكەت، پەیڤا ئینسكلۆپیدیا بۆ دهێتە گۆتن.

## ئەتیمۆلۆجی

پەیڤا ئینسكلۆپیدیا پەیڤەكا نوویە د زمانێ كوردی دا، ژبێ ڤێ پەیڤێ د فەرهەنگێن كوردی دا ژ دو یان سێ دەهسالییان دەرباز نابت. د بنیاتدا ئینسكلۆپیدیا Encyclopedia ژ دو پەیڤێن گریكی پێكهاتییە و ب خەلەتی ب رێكا زمانێ لاتینی دەربازی زمانێن جیهانێ بوویە. ب گریكی گۆتینە ἐγκύκλιος παιδεία (ئێنكویكلیۆس پێدایا: چەرخێ فێركرنێ) ئانكو فێركرن یان پەروەردەیا گشتی، ئەڤە د بنەكۆك دا، پێكهاتییە ژ ئێنكویكلیۆس ئانكو گرۆڤەر، وەرچەرخان، گشتی یان سەرانسەری (خڕ) و پێدایا ئانكو فێركرن، پەروەراندن، رەوشەنبیركرن[3].

ئەڤ هەردو پەیڤە وەختێ دەربازی زمانێ لاتینی بووین، نڤیسەرێن وی وەختی، پێكڤە نڤێسینە یان وەكو ئێك پەیڤ سەرەدەری دگەل كرینە و هەردو پەیڤ بووینە ئێك پەیڤ Encyclopaedia. پاشی ژ زمانێ یونانی دەربازی زمانێن ئەوروپی بوویە، ئو ژ وان بۆ پڕانییا زمانێن جیهانێ بەلاڤە بوویە[4].

د زمانێ عەرەبی دا، ب (موسوعە و دائرە المعارف) هاتییە وەرگێڕان، ئێك ژ بەرفرەهی یێ (موسوعە- وسع) و یا دی وەرگێڕانەكا نێزیكی پەیڤا گریكی یە ἐγκύκλιος (دائرە) و παιδεία (تربیة، معرفة)

و پێکڤە دبنە (دائرة المعرفة). وەکی پەیڤا ئینسیکلۆپیدیا Encyclopedia ب ڤی رەنگی د عەرەبیدا هاتیە وەرگێران و د فەرهەنگێن کوردیدا ل شوونا پەیڤا (دائرة)یا عەرەبی خەلەك یان بازنە و چەرخ و گەز و کەمەر و دۆرمانۆر هەنە و ل شوونا پەیڤا (المعرفە) یا عەرەبی زانین هەیە، ب ڤی رەنگی رامانا فەرهەنگیا (دائرة المعارف) د کوردیدا دێ بتە خەلەکا زانینێ یان بازنەیا زانیاریان، ئەگەر ب رامانەکا بەرفرەهتر ببێژین؛ دێ بیتە کۆما زانیاریان یان کۆمبەندا زانیاریان و پەیڤا ئینسکلۆپیدیا Encyclopedia ب کوردی دێ ب هەمان رامان هێتە شرۆڤەکرن. ب گۆتنەکا دی، هەکەر مە بڤێت وەکو ئەرەبان، ئەڤێ پەیڤێ بکوردینین، پێدڤییە ئەم ژی هەمان رێکێ بگرین یان رێکەکا کوردانەتر بگرین و ب (زانیارستان، چەرخا زانینێ، کۆمبەندا زانیاریان، ...) وەرگێرین.

هۆسا، تێگەهێ بنەرەتی یێ ئینسیکلۆپیدیایێ، گەر یان چەرخا فێرکرن و پەروەردەکرنێ یە.

## مێژوو

مێژوویا ئینسیکلۆپیدیا نڤیسینێ، ب دروستی ناهێتە زانین، لێ ئێکەمین ئینسیکلۆپیدیا هێشتا مای، پرتووکا Naturalis Historia یا پلینی یێ مەزنە، ئەڤە ل ئێکەمین سەدسالیا زایینی هاتییە نڤیسین. و بەری وی، یان ل هەمان وەخت، مارکۆس تێرێنتیۆس ڤارۆی Varro پەرتووکەك ب ناڤێ (نەهـ پرتووکێن پشکێن زانستی) نڤیسی بوو، و تێدا ب بەرفرەهی، نەهـ زانستێن وی سەردەمی رێزکربوون. ئەڤ بەرهەمە دهێتە ناسین؛ ئێکەمین ئینسیکلۆپیدیا یان مەستەرە بۆ هەمی بەرهەمێن پاشی هینگێ.

پاشی مارتیانۆس کاپێلا ل سەدسالیا ٤ و ٥، پەرتووکەك ئینسکلۆپیدیایی ب ناڤێ De nuptiis Mercurii et Philologiae نڤیسی و تێدا هەر هەفت زانستێن ناڤدار ل وەختێ خوە باسکرینە.

ئێك ژ کەڤنەپرتووکێن ئینسکلۆپیدیایی ل ئۆرۆپا پرتووکا پیر ئیسیدۆرێ سڤیلی (ئەشپیلی Saint Isidore of Seville) ب ناڤێ Etymologiae (بنەکۆك) ل کنار سالا ٦٣٠ ز. نڤیسی یە. ئەڤە پێکهاتییە ژ ٢٠ پرتووکان و ٤٤٨ دەرگەهێن جودا جودا لدۆر زانستێن وی سەردەمی و یێن دێرین[٥].

ل رۆژهەلاتا ناڤین د سەردەمێن ئیسلامیدا ئەم دکارین ئاماژە ب چەند کارەکێن ب ڤی رەنگی بکەین، وەکو:

- پەرتووکا (عیون الاخبار) یا ئەبو محەمەد عەبدوللا بن موسلم ناڤدار ب (ابـن قتیە الدینوری) یەکەمین پەرتووکا ئەدەبی یە دشێین پەسنا ئینسکلۆپیدیایێ بدەینێ، ئەو د بنیاتدا پەرتووکا نووچە و چیرۆك و سەرهاتی و ڤەگێران و دەقێن بژارەیە، نڤیسەرێ وێ ب مەرەما فێرکرنێ و رەوشەنبیرکرنێ سەرکەتییانە ئەو مژار کۆمکرینە و پۆلێنکرینە، نڤیسکاری ئەڤ پەرتووکا ڤەبارە مەزن ل سەر دەە پەرتووکان دابەشکریە، هەرپەرتووکەك ژ وانا چەند مژارێن لاوەکی هەمبێزدکەت، (دار الکتب المصریة) د ناڤبەرا ١٩٢٤- ١٩٣٠یدا د چوار بەرگاندا چاپکریە.
- هەروەسان پەرتووکا (رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء) یەکەمین کارێ بەرفرەهە ب رەنگێ ئینسکلۆپیدیایێ ژ ئالیێ چەند نڤیسکارەکانڤە کو ناڤ و کەسایەتییێن وان نەهاتینەزانین هاتییەبەرهەڤکرن، ئەڤ کارە ژ پێنجی و دو نامەیان پێکهاتییە، زانستێن بیرکاری، سروشتی، فەلسەفی، شەریعەت و ئایینان ب خۆڤە دگریت، یەکەم جار ل سالا ١٣٠٥مش/ ل بۆمبای هاتییەچاپکرن و جارا دووێ ل سالا ١٣٤٧مش/١٩٢٨ز ل قاهیرە هاتییەچاپکرن[٦].
- هەروەسان پرتووکا رازی (الحاوی) ئێکەمین ئینسیکلۆپیدیایا نۆشدارییە.

ل هـنـدسـتـانـێ، کەڤنترین بـەرهـەمـێ ئینسیکلۆپیدیایی ڤەدگەرێتە سەدسالیا شەشی زایینی، ڤەراهەمەهیرا Varāhamihira ب ناڤێ

Brihat-Samhita نڤیسیە.

ل چینێ، دەستپێكا ئینسكلۆپیدیانڤێسینێ ڤەدگەرتە Sòng sì dà shū (هەرچار مەزنە پرتووكێن سۆنگی) ئەڤە چار بەرهەمێن ئینسكلۆپیدیایینە و بەرهەمێ سەردەمەكێ درێژ و گەلەك نڤیسەرانن. ل سەدسالییا ١٠ێ لی فانگی (٩٢٥-٩٩٦ ز.) دەستپێكرییە و ل سەدسالییا ١١ێ خلاسبوویە و پاشی ئەڤ ناڤە لێ هاتییە كرن[٧].

پەیڤا Encyclopedia ل سەدسالییا ١٥ ژ خراب خواندنا ἐγκύκλιος παιδεία ئەوا پلۆتارخی بكارئینای، هاتە دارێشتن و ب ئەڤی تێگەهێ نهۆ بەلاڤە بوو[٨].

ل سەدسالێ بێن ١٨ و ١٩ ل ئۆرۆپا، هونەرێ ئینسكلۆپیدیا نڤێسینێ پێشكەڤتنەكا مەزن ب خوە ڤە دیت و بوونە دەستپێكا نڤێسین و چاپكرنا ئینسكلۆپیدیایێن ناڤدار، نەخاسمە ب زمانێ فرەنسی و ئنگلیزی، هەر بۆ نموونە Encyclopédie méthodique par ordre des matières ل سالێن ١٧٨٢ تاكو ١٨٣٢ێ هاتە بەرهەڤكرن و چاپكرن، و بەرگێن چاپێن وێ گەهشتنە ٢١٦ بەرگان.

ئینسایكلۆپیدیا بریتانیكا Encyclopædia Britannica ئەڤە ل سالێن ١٧٦٨ تاكو ١٧٧١ێ هاتییە نڤێسین و د سێ بەرگان دا بەلاڤە بوویە. ئیرۆ و نووترین چاپا ٢٠١٠ ژ ٣٢ بەرگان پێكدهێت، و ئەڤە د ٣٢,٦٤٠ بەرپەڕان دا چاپبووینە. ستافێ كاری ژ ١٠٠ كەسێن كارمەند و ٤,٠٠٠ پشكداران پێك دهێت. ١١٠ هەلگرێن خەلاتێ نۆبلی بۆ نڤێسی یە[٩].

ئینسكلۆپیدیایا ئیسلامی كو چاپا وێ یا عەرەبی ب "دائرة المعارف الاسلامیة" هاتییەناڤكرن، ل جەم مە پتر هاتییەنیاسین و بوویە ژێدەر بۆ چەندین ڤەكۆلەران، هەتا نها ب دو چاپان د ناڤبەرا سالێن ١٩١٣- ١٩٣٨ و ١٩٥٤- ٢٠٠٥ێ ژ ئالیێ كۆمپانیا بریل یا هولەندی ڤە هاتییەبەلاڤكرن. ئەو ب خۆ ب زمانێن ئینگلیزی و فرەنسی و ئەلمانی هاتییەبەرهەڤكرن و ل سالا ١٩٣٣ دەست ب وەرگێڕانا وێ بۆ زمانێ عەرەبی و د ١٥ بەرگاندا هاتییەچاپكرن.

ئینسكلۆپیدیا ئیرانێ (IRANICA ENCYCLOPEDIA) ب هەردو زمانێن فارسی و ئینگلیزی د چەندین بەرگاندا هاتییەچاپكرن.

هەروەسان سەرێ چەند سالەكانە ل ئیرانێ كار د بەرهەڤكرنا ئینسكلۆپیدیا ئیسلامییا مەزن (دائره معارف بزرگ اسلامی- دائره المعارف الاسلامیه الكبری) ب زمانێن فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی دهێتەكرن و هەتا نها چاپا فارسی پتر ژ ٤٠ بەرگان ژێ هاتینەچاپكرن.

ب ڤی رەنگی ژی ل تركیا كار د بەرهەڤكرنا ئینسكلۆپیدیایەكا ئیسلامییا مەزن مینا یا ئیرانی دهێتە كرن.

ل وەلاتێ سوریێ ژی ئینسكلۆپیدیایەك مەزن د ١٨ بەرگاندا د ناڤبەرا سالێن ١٩٩٨- ٢٠٠٧ ب ناڤێ (الموسوعة العربیة) ژ ئالیێ (هیئة الموسوعة العربیة) یا سەر ب سەرۆكاتییا كۆمارێ سوریێ هاتییەبەرهەڤكرن و چاپكرن[١٠].

## ویكیپیدیا Wikipedia

لسەر دەمێ كۆمپیوتەری و ئنتەرنێتێ، جۆرەكێ دی یێ ئینسكلۆپیدیایان پەیدا بوو ئەو ژی ئینسكلۆپیدیا یێن ئەلكترۆنینە. ب دەهان پرۆژە ل سەرانسەری دنیایێ هەنە و رۆژانە پرۆژەیێن نووتر پەیدا دبن، دبت، نووترین و بەرفرەهترین ئینسكلۆپیدیایا ئەلكترۆنی، ویكیپیدیا Wikipedia بت. ویكیپیدیا وەكو هزر و وەكو پرۆژە، د دو ڤۆناغان را بۆری یە:

١ ڤۆناغا ١٩٩٤-٢٠٠١: ل دەستپێكێ مالپەرەك ب ناڤێ WikiWikiWeb كەڤتە بەردەستێ كاربەران و وەكو مالپەرەكێ گشتیێ زانیاریان بوو ب زمانێ ئنگلیزی. ئەڤ مالپەرە رۆژ بۆ رۆژێ زەنگین بوو و جهەك بۆ خوە پەیدا كر... لێ ل سالێن ١٩٩٨-٢٠٠٠ ئارێشەیێن ناڤخوەیی بوونە باگوردانێ بەفرێ و زندە و گران بوون، لاوازی ئێخستنێ و كۆمەكا خەلكێ دی بزاڤا چێكرنا ئینسكلۆپیدیایێن دی دا. لێ هەمی؛ ئەوێن ماین و ئەوێن بهوژین، بوونە هێڤێنێ ویكیپا پاشی هاتی.

٢ قۆناغا ٢٠٠١ تاكو نهۆ: ل ئەڤێ قۆناغا، ویكیپیدیا وەكو ئینسكلۆپیدیایەكا هەركەسی، رۆژ بۆ رۆژێ وەراركر. ویكیپیدیا وەكو ئینسكلۆپیدیایەكا جیهانی، ب دو ئاراستەیان، بەردەوام خوە زەنگین دكەت: ١ ناڤەرۆك یان قەبارەیێ بەرهەمێ كەڤتییە تێدا. ٢ زمانێن پشكدارییێ تێدا دكەن.

هەر بۆ نموونە: ویكیپیدیا و خوشكەمالپەرێن وێ ب پتر ژ ٢٥٠ زمانان دهێنە وەشاندن و پشكا ئنگلیزی ٥,٤٥٤,١٠٤ گوتار تێدانە و رۆژانە كنار ٧٥٠ گوتارێن نوو دهێنە تێكرن[١١].

پشكا كوردی، دگەل لاوازیێ لێ رۆژ بۆ رۆژێ زەنگین دبت و چونكی كارەكێ كۆمبەندە، دێ بتە ئێكەمین و بەرفرەهترین ئینسكلۆپیدیایا كوردی.

## كورد و ئینسكلۆپیدیا

ئەڤ پەیڤە هندەك جاران بەری نها د زمانێ كوردی دا بۆ هندەك فەرهەنگ یان پرۆژەیێن رەوشەنبیریێن بەرفرەهـ هاتییە بكارئینان، هەر جارێ یان هەرچەند جارەكان ب رەنگەكی ئەڤ پەیڤە هاتییە بلێڤكرن وەك:

- فەرهەنگی زانیاری (قاموس الاعلام) ئەنیسكلۆپیدیای كورد، عەبدولقادر بەرزنجی، سلێمانی- ١٩٧١.
- كورد لە ئینسكلۆپیدیای ئیسلامیدا، حەمە كەریم عارف، هەولێر- ١٩٩٧.
- كەڤنە دینێن ئیرانی و كوردی د ئینسكلۆپیدیا بریتانیكا دا، وەرگێران فازل عەمەر، دهۆك- ٢٠٠٤.
- كورد و كوردستان لە یەكەم ئەنسیكلۆپیدیای توركی لە مێژوودا، وەرگێران ژ زمانێ توركی ئەحمەد تاقانە، هەولێر- ٢٠٠٨.
- ئینسكلۆپیدیای مێژوونامە، بەرگی یەكەم، هەولێر- ٢٠٠٩، بەرگی دووەم، هەولێر- ٢٠٠٩، بەرگی سێیەم، هەولێر- ٢٠٠٩، بەرگی چوارەم، هەولێر- ٢٠٠٩.
- كورد لە ئینسایكلۆپیدیای ئیسلامیدا، ئیسماعیل فەتاح قازی، وەرگێران ژ فارسی حەمە كەریم عارف، سلێمانی- ٢٠٠٩[١٢].
- ئینسكلۆپیدیای هەولێر، دەهـ بەرگ، لوبنان- ٢٠٠٩.
- ئینسكلۆپیدیای ئابووری، فەیسەل دەباغ، هەولێر ٢٠٠١.
- ئینسایكلۆپیدیای گشتی، یاسین سابر سالح، ٢٠٠٥.
- ئینسكلۆپیدیای ئەلقاعیدە، زنار تەها ٢٠٠٦.

مە ژی هەمان پەیڤا ئینسكلۆپیدیا بۆ ڤی پرۆژەیێ تایبەت ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە هەلبژارت.

هندی پەیوەندی ب زمانێ كوردی ڤە هەی، مە ئاماژە پێكر كو ئینسكلۆپیدیایەك ب ناڤێ "ئینسكلۆپیدیای مێژوونامە" ل سالا ٢٠٠٩ێ ل هەولێرێ هاتییەچاپكرن، هەروەسان "ئینسكلۆپیدیای هەولێر" ل هەولێرێ هاتییەبەرهەڤكرن و ل سالا ٢٠٠٩ێ ل لبنانێ هاتییەچاپكرن، هەروەسان ل سلێمانیێ ژی كار د بەرهەڤكرنا ئینسكلۆپیدیا سلێمانیێ دا دهێتەكرن.

چاوا بت، ب گشتی، پەیڤا ئینسیكلۆپیدیا بۆ دو جۆرێن بەرهەمان هاتییە گۆتن؛ یان ئەو بەرهەمێن گشتی و سەرانسەری، ئانكو ئەوێن بزاڤ كرین هەمی زانیاریێن بەردەست د پەرتووكەكێ دا كۆم بكەن چ شێوەیێ گوتار یان پەیڤ، وەكو ئینسیكلۆپیدیا بریتانیكا، یان ژی گۆتینە ئەو پرتووكا هەمی پێزانین ل بیاڤەكێ یان زانستەكی كۆمكرین... وەكو ئینسیكلۆپیدیایا نۆشداری یان یا فیلۆسۆفی یێ.

ئەڤ پێنگاڤە، بەرهەڤكرنا ئینسكلۆپیدیایا پارێزگەها دهۆكێ، ئێكەمین پێنگاڤە ل ئەڤێ دەڤەرێ دهێتەهاڤێژتن، بەرهەمێ هزر و پێشنیاز و پرۆژەیێ موسەدەق توڤی و بەرهەمێ رەنجا دو بەرهەڤكارانە (موسەدەق توڤی و خالد سالحی)، هەلبەت ب هاریكاری و پشكداریا وان رێزدارێن ڤەكۆلەر و نڤیسەر و وەرگێر یێن ناڤێن وان د بەرپەرێن ئینسكلۆپیدیایێدا هاتین.

ئەڤ بەرهەمە، وەكو گاڤا ئێكێ لسەر رێیەكا

دریژ، بێ کێماسی نابت، لێ هەمی شوێلێن مەزن ب هزرەکێ دەست پێدکەن و وەکو باگوردانێ بەفرێ هندی بچت، مەزنتر لێ دهێت، ئیسکلۆپیدیایا دهۆکێ ژی ژ هزرەکێ و هاریکاریەکێ، باگوردانەکێ بەفرێ چێبوو و نهۆ هاتە گرۆلکرن... راستە دێ گەلەك تشتان ب خوەڤە گرت، لێ بەفر دێ ژ هەمیان پتر بت و هەوجەی دوبارەکرنەکا سالانە بت.

هیڤییە، زانکۆیا دهۆکێ یان پارێزگەهـ ب رێ
رێڤەبەریا گشتیا رەوشەنبیری و هونەری، خ
ل ئەڤێ پرۆژەی بکەتە خودان و ستافەکێ بەردەو
بۆ دانت؛ هەم بۆ نووژەنکرنێ هەم بۆ زێدەکرنێ،
دێ باش بت، پرۆژەیەکێ ئەلکترۆنیێ خوشك ژی
بهێتە دان کو هەر کەسەك بشێت زێدەهییان ا
بکەت و زەنگین بکەت.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. https://en.oxforddictionaries.com/definition/encyclopedia

- https://www.merriam-webster.com/dictionary/encyclopedia

٢. http://skil.stanford.edu/module٢/encyclopedias.html

٣. رەگێ ئەڤان هەردو پەیڤان د کوردی دا وەکو خرخال κύκλιος و پز یان پس παιδ- هێشتا مانە... ئانکو گەرا دەرسێن فێرکرنا زارۆکان.

٤. بنێرە: https://en.wikipedia.org/wiki/Encyclopedia

٥. بنێرە: https://en.wikipedia.org/wiki/History_of_encyclopedias

٦. یاسین صلاواتی، الموسوعة العربیة المیسرة و الموسعة، المجلد الاول، (بیروت- ٢٠٠١)، ص ١٥

٧. بنێرە: https://en.wikipedia.org/wiki/Four_Great_Books_of_Song

- https://en.wikipedia.org/wiki/History_of_encyclopedias

٨. بنێرە: https://en.wikipedia.org/wiki/History_of_encyclopedias

٩. بنێرە: https://en.wikipedia.org/wiki/Encyclop%C3%A6dia_Britannica

١٠. زانیاری دەربارەی وان ژ چاپێن وان ب خۆ هاتینەوەرگرتن.

١١. بنێرە: https://en.wikipedia.org/wiki/Wikipedia:Statistics

١٢. بوار نورەدین، بیبلوگرافیای پەرتووکی کوردی، (سلێمانی- ٢٠١٦).

# وەرارا کارگێری
# یا جهی و رووبەری

**پ.د. نەشوان هروری**
**زانکۆیا دهوك - کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: دیان جەمیل**

ڤەکۆلینێن ل دۆر هەر جهەکی دهێنەکرن پشکا شێری ژ ڤەکۆلینین جوگرافی[1] پێکدئینن ژبەرکو جهی باندۆرا خۆ ل سەر دیارترین ساخلەتێن سرۆشتی و مرۆڤی یێن دیاردا جوگرافی هەیە، ژبەرکو دەستنیشانکرنا جهێ هەر خاڵەکێ یان دەڤەرەکێ ل سەر ڕوویێ عەردی دناڤ دەڤەرەکا جوگرافی دا گەلەك پێزانینان ل دۆر تایبەتمەندییا جوگرافییا وان هەرێمان دیاردکەت و دیارترین تایبەتمەندییێن سرۆشتی و مرۆڤی یێن وان دەستنیشاندکەت.

سەرەرای جوداهییا نیشانێن جهی د ڤەکۆلینێن جوگرافی دا، لێ تێکەهێ وێ یێ سەرەکی هێمایێ دکەتە سەر پەیوەندیێن هەرێمایەتی ژبۆ دیاردەیا جوگرافی دناڤ چارچۆڤێ جهی دگەل دیاردەیێن دی[2]. پتریا جاران ژی د ڤەکۆلینێن جوگرافیێن هەرێمایەتیدا جوداهی دناڤبەرا جهێ جوگرافی و جهێ فەلەکی دا دهێتەکرن.

## • وەرارا کارگێری

پارێزگەها دهۆکێ ژلایێ کارگێریڤە پێشکەفتنەکا بەرچاڤ ب خۆڤە دیتیە هەر ژ ڕۆژا دامەزراندنا وێ ئەوا ل دووڤ بریارا ژمارە (١١) ڕێکەفتی (٢٧ گولانا ١٩٦٩)ێ دەرکەفتی، ئەوژی ژبەر وان کاودان و پێشکەفتنێن سیاسی و ئابووری و جڤاکی یێن پارێزگەهێ هەر ژ ڕۆژا دامەزراندنا وێ هەتا سەردەمێ ئەڤرۆکە ب خۆڤە دیتین. دهۆك بەری ببیتە پارێزگەهـ ب هەرسێ قەزایێن، خۆڤە (دهـۆك، زاخۆ، ئامێدی) سەر ب مووسل ڤەبوو. پاشی ل دووڤ فەرمانەکا کۆماری یێ ژمارە (١٠٦٦) ل سالا (١٩٦٩)ێ و ل دووڤ بڕیارا بەری هینگێ، دهۆك بۆ پارێزگەهـ پشتی هینگێ ناحیا مزووری هاتە سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە کو بەری هینگێ سەر ب قەزا شێخان ڤەبوو، هەردیسان قەزا ئاکرێ ژی ژ مووسل هاتەڤەکرن و هاتە سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە لێ ئەڤ چەندە نەچوو د بوارێ پراکتیکی دا[3].

ب شێوەیەکێ گشتی پارێزگەها دهۆکێ هەر ژ دامەزراندنا وێ ژ ڤان قەزایان پێك دهات "دهۆك، زاخۆ، ئامێدی و ئاکرێ" ئەوژی ب وان سنوورێن کارگێری یێن وی سەردەمی ژبۆ ڤان قەزایان هاتینە کێشان.

د ماوەیێ پێنج دەهسالکێن (عقود) بووری دا، پارێزگەها دهۆکێ هندەك گوهۆرینین بەرچاڤ د هژمارا یەکەیێن کارگێری یێن سەر ب پارێزگەهێڤە بخۆڤە گرتینە هەروەکی د خشتەیێ ژمارە (١)

و نەخشەیێن ژمارە (١) و (٢) دا هاتینە دیارکرن. هەتا دەستپێکا سالێن حەفتێیان ژ چەرخێ بووری پارێزگەها دهۆکێ بتنێ ژ چوار قەزایان پێکدهات، هەتا سالا (١٩٧٧)ێ[٤]، ژنوی سێمێل بوو قەزا و هاتە سەر ب پارێزگەهێ ڤە، هەردیسان ل وی سەردەمی قەزا ئاکرێ سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەنەبوو بەلکو ژ لایێ پراکتیکی ڤە سەر ب پارێزگەها نەینەوا ڤەبوو. هەرچەندە ل دووڤ فەرمانا کۆماری یێ ژمارە (١٠٦٦) یێ سالا (١٩٦٩)ێ یێ تایبەت ب دامەزراندنا پارێزگەها دهۆکێ کو ئاکرێ ژی ئێك ژ قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ بوو. لێ بەندێن ڤێ بریارێ نەچوونە د بوارێ پراکتیکی دا و ئەڤ چەندە پشکەك بوو ژ سیاسەتا تەعریبکرنێ ل هەرێما کوردستانا عیراقێ، لێ پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ ژنوی گەلەك بەشێن قەزایێن شێخان و ئاکرێ ژ لایێ کارگێریڤە هاتنە سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە.

هەردیسان دناڤبەرا ڤی ماوەی دا گوهۆرینێن بەرچاڤ د هژمارا ناحیێن سەر ب پارێزگەهێ ڤە هاتنەکرن ب رەنگەکی هژمارا وان ژ (١٧) ناحیان ل سالا (١٩٦٩)ێ هاتنە کێمکرن بۆ (١٢) ناحیان ل سالا (١٩٨٧)ێ، (هەڤبەرکرنێ دناڤبەرا خشتەیێ ژمارە (١) دگەل نەخشەیێ ژمارە (١) بکە). نەهێلانا هندەك ناحیان و لادانا هندەك ناحیێن دی یێن سەر پارێزگەهێ ڤە د ڤی ماوەیی دا بەشەك بوون ژ سیاسەتا تەعریبکرنێ کو بەری هینگێ بەرنامە ژ لایێ حکومەتا عیراقێ یا هینگێ بۆ هاتبوو دانان ژێخەمەت گوهۆرینا ژیوارێ نیشتیمانی و دیموگرافی ل پارێزگەهێ.

پشتی سەرهلدانا بهارا (١٩٩١)ێ، ئێدی پارێزگەها دهۆکێ گەلەك گوهۆرین و پێشکەفتنێن ئابووری یێن مەزن ب خۆڤەدیتن ب رەنگەکی پەیکەرێ کارگێری یێ پارێزگەهێ دووبارە هاتەدانان و هژمارا یەکەیێن وی یێن کارگێری زێدەبوون (قەزا و ناحیە)، هژمارا قەزایێن وێ ل سالا (١٩٩٧)ێ بوونە (٦) قەزا و ل سالا (٢٠٠٦) و (٢٠١٤)ێ بوونە (٧) قەزا ئەوژی پشتی کو ل دەستپێکا سالا (٢٠٠٦)ێ[٥] بەردەوش بوویە قەزا، هەردیسان ژمارا ناحیێن وێژی زێدەبوو ب رەنگەکی کو ل سالا (١٩٩٦)ێ بتنێ (٢٠) ناحیە بوون لێ ل سالا (٢٠١٤)ێ بووینە (٢٨) ناحیە.

**خشتەیێ (١)**
**زێدەبوونا هژمارا قەزا و ناحیێن پارێزگەها دهۆکێ**

| سال | قەزا | ناحیە |
|---|---|---|
| ١٩٦٩ | ٤ | ١٧ |
| ١٩٧٧ | ٤ | ١٣ |
| ١٩٨٧ | ٤ | ١٢ |
| ١٩٩٦ | ٦ | ٢٠ |
| ٢٠٠٦ | ٧ | ٢٨ |
| ٢٠١٤ | ٧ | ٢٨ |

**ژێدەرێن پشت بەستن ل سەر هاتییەکرن:**

**١- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للإحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، بغداد، ١٩٧٣.**

**٢- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للإحصاء، نتائج التعداد العام للسكان(محافظة دهوك) لسنة ١٩٧٧، بغداد، ١٩٧٨.**

**٣- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للإحصاء، نتائج التعداد العام للسكان(محافظة دهوك) لسنه ١٩٨٧، بغداد، ١٩٨٨.**

**٤- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للإحصاء، المجموعه الاحصائية السنوية ١٩٩٠، بغداد.**

**٥- اقليم كوردستان العراق، وزارة التخطيط، هيئة احصاء الاقليم، نتائج تحديث وحصر المباني و الاسر لسنة ٢٠٠٩ محافظة دهوك، بيانات غير منشورة.**

**٦- الخارطة الادارية لمحافظة دهوك بمقياس(١٩٠٩٢٩٤٣: ١).**

## • جهێ فەلەکی

دەڤەرا فەلەکی یانژی هندەك جاران دبێژنێ دەڤەرا وەرزشی، مەرەم ژێ ئەو دەڤەرە یاکو دووڤ تۆرەکا هێلێن درێژاهی و هێلێن فرەهیێ دهێتەدیارکرن ژبەرکو ئەڤ هێلە بەرپرسیارن ژ دەستنیشانکرنا دەڤەرێن جوداجودا ل سەر روویێ عەردی. هەرچەندە ڤان هێلان

**نەخشەیێ(١)**

**پێشکەفتنا کارگێڕی ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٦٩-١٩٩٦)**













گرنگییەکا مەزن ژ لایێ جهی - جوگرافی نینە. لێ گرنگییا وان بۆ هندێ دزڤریت کو کارتێکرنەکا ڕاستەوخۆ ل سەر دیارکرنا تایبەتمەندیێن سەقای (کەشوهەوای) ژبۆ هەرێمێن جوداجودا یێن ل سەر ڕوویێ عەردی هەیە ئەوژی ژبەر جوداهییا درێژاهییا شەڤ و ڕۆژان دناڤبەرا وەرزێن هاڤین و زڤستانێ دا، زێدەباری گرنگییا ڤان هێلان ژبۆ دەستنیشانکرنا دەمێ (وەختێ) هەر دەڤەرەکێ ل سەر نەخشەیێ دەمی یێ عەردی.

ژلایێ فەلەکیڤە، پارێزگەها دهۆکێ دکەڤیتە دناڤبەرا هێلێن درێژاهیێ(٣٦، ٢٠، ٤٢) و(٣٨، ١٨، ٤٤) ل ڕۆژهەلاتا هێلا گرینچ. هێلا ئێکێ دناڤ دەڤەرێن ڕۆژئاڤای یێن پارێزگەهێ ڕا دبۆریت و پترین درێژبوونا خو بەرەڤ ئاراستەیێ ڕۆژئاڤایی ل دەڤەرێن ڕۆژئاڤایێ گوندێ "پێشابیرێ" ل سەر ڕووبارێ دیجلەی دەستنیشان دکەت.

لێ هێلا دووێ دەڤەرێن د ڕۆژهەلاتی پارێزگەهێ ڕا دبۆریت هەتا ڕۆژهەلاتێ گوندێ "چەمێ بیکێ" و پاشی خواردبیت هەتا ڕووبارێ "زێ مەزن" و بەرەڤ ئاراستەیێ پارێزگەها هەولێرێ دچیت، ب ڤی ڕەنگی سنوورەکی دناڤبەرا پارێزگەهێن دهۆک و هەولێرێ دا دەستنیشاندکەت و ئەڤ چەندە مەزنترین بەرفرەهبوونا پارێزگەهێ د ڤان پارچەیان دا دیاردکەت، بەرفرەهبوونا هێلا فرەهیێ "پانیێ" یا عەردێن پارێزگەهێ ل سەر ڤان هێلان ناڤبرەکا دەمی دروست دکەت ب تێکەهێ سیستەمێ پلەیان کو دبیتە نێزیکی (١) پلە و (٥٨) خولەك و (٢) چرکە، لێ ناڤبرا دەمی ب تێکەهێ فەلەکی دبیتە نێزیکی (٧) خولەك و (٥٢)

**نەخشەیێ (٢)**

**پێکهاتنا کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ (٢٠٠٦-٢٠١٤)**




چرکە. ل سەر وێ چەندێ کو رۆژ "خۆر" هەر پلەیەکێ د چوار خۆلەکان دا دبڕیت، و ئەگەر ئەڤ ناڤبرە هاتە گوهۆرین بۆ ئێك ژ یەکەیێن دووریێ "مەودایی" دێ گەهیتە نێزیکی (١٧٩کم). پارێزگەهـ ژێ دناڤبەرا هەردوبازنەیێن فرەهیێ (٣٦، ٠، ٣٦، ١) و (٣٧، ٢٣، ٢٤) دا ل باکوورێ هێلا کەمەرەیی بەرفرەهـ دبیت، بازنەیا ئێکێ د پارچەیێن باشووری یێن پارێزگەهێ را دبۆریت و ل پارچەیێن باشووری مەزنترین بەرفرەهیێ ب خۆڤە دبینیت بەرەڤ باشوورێ گوندێ (کولە بۆر) سەر ب ناحیا کەلەك ڤە ل سەر کنارێ رۆژئاڤایی یێ رووبارێ زێ یێ مەزن تاکو باشوورێ بازێرکێ کەلەك نێزیکی (٦,٥کم).

لێ بازنەیا دووێ مەزنترین بەرفرەهی یا عەردێن پارێزگەهێ ب خۆڤە دبینیت بەرەڤ باکووری ڤە و نێزیکی (٣ کم) د پارچەیێن باکووری را دبۆریت ل گوندێ (سناتێ) کو گوندەکە سەر ب ناحیا دەرکارێ ڤەیە ل قەزا زاخۆ، ب ڤێ چەندێ ناڤبرٍ ب تێگەهێ سیستەمێ پلەیان دناڤبەرا مەزنترین بەرفرەهی یا عەردێن قەزایێ دناڤبەرا باکووری و باشووری دا دبیتە (١) پلە و (١٣) خۆلەك، و ئەگەر ئەڤ ناڤبرە هاتە گوهۆرین بۆ ئێك ژ یەکەیێن دووریێ دێ گەهیتە نێزیکی (١٥٠کم) (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٣) بکە) و ئەڤە نە مەودایەکێ مەزنە کو دبیتە فاکتەرەکێ گرنگ د چێکرنا جوداهیێن سەقایی و

نەخشەیێ (٣)
جهێ فەلەکی یێ پارێزگەها دهۆکێ




بایۆلۆژی دناڤبەرا پارچەیێن پارێزگەهێ دا، بەلێ پا فاکتەرێ بلنداهیێ ب ئاوایەکێ ب هێز دبیتە ئەگەرێ دروستکرنا هندەک جوداهییان د ساخلەتێن ناڤهاتی دا. ب ڤی جهی پارێزگەهـ پارچەیەکێ ژ عەردی داگیردکەت کو دکەڤیتە دناڤبەرا پشکا باشووری ژ دەڤەرا مام ناڤنجی یا باکووری و باکوورێ هێلا کەمەرەیی دا ئانکو د چوارچوڤێ بازنەیێن بەرفرەهیێ دا یێن خودان سەقایێن گەرم ب شێوەیەکێ رێژەیی ژبەرکو ئەڤ بازنە ژ بازنەیێن بەرفرەهیێ یێن مام ناڤنجی پتر د نێزیکی هێلا کەمەرەیی نە بەرەڤ ئاراستەیێ جەمسەرێ باکووری.

## • جهێ جوگرافی

پارێزگەها دهۆکێ هژمارەکا پارچەیێن عەردی ل نیڤا باکوورێ رۆژهەلاتێ تەپا عەردی بخۆڤەدگریت، ئەوژی دناڤ بەشێن باشووری ل دەڤەرا ناڤنجی یا باکووری ل بەشێ باشوورێ رۆژئاڤایێ کیشوەرێ ئاسیا، هەردیسان ژ پشکا ناڤین ل دەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤین. ژبەر ڤێ چەندێ ئەڤ پارێزگەهە هژمارەکا پارچەیێن عەردی یێن ڤەگوهێزەر ئەڤێن دکەڤنە دناڤبەرا چیایێن ئیرانێ و چیایێن ئەنادۆل ل بەشێن باکووری و باکوورێ رۆژهەلاتێ یێن خودان سرۆشتەکێ چیایی یێ ئالۆز، هەردیسان دناڤبەرا دەڤەرا نیڤگزیرتا عەرەبی

(شبه الجزيرة العربية)و دەشتێن دناڤبەرا هەردو رووبارانداا ل بەشێن باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایی کو د سرۆشتێ خۆ دا ڤان دەڤەران ساخلەتێن کەمەریی و پێلان هەنە. ئەڤی جهی وە ل پارێزگەها دهۆکێ و پارێزگەهێن هەولێر و سلێمانیێ کریە هندەك ساخلەتێن چیایی یێن جۆراوجۆر دناڤبەرا دەشتێن بەفرەهـ و چیا و گرك و چیایێن گەلەك بلند و ئاسێ هەبن.

دەربارەی هەرێمێن فیزیوگرافی یێن سەرەکی ل عیراقێ، پشکا هەرە مەزن ژ رووبەرێ پارێزگەهێ (٦٤٠٦.٥ کم٢) ب رێژەیا (٥٩.٣٪)ێ دکەڤیتە دناڤ دەڤەرێن چیایی یێن ئاسێ دا. پشکا مایی کو رووبەرێ وێ دگەهیتە (٤٤٠٢.٥ کم٢) ب رێژەیا (٤٠.٧٪)ێ ژ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ پارێزگەهێ دکەڤنە دەڤەرێن بانی (هضاب) و گرکان کو دهێنە نیاسین ب دەڤەرێن نیمچە چیایی (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٤) بکە).

دەربارەی رووبەرێن ئاڤی ژی، دەریا رەش دکەڤیتە باکوورێ پارێزگەهێ ب دووراتییا (٤٦٠کم) و دەریاچا (گۆلا) وانێ ب دووراتییا (١١٠کم)، ل باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ ژی دەریا (قەزوین- خەزەر) ب دووراتییا (٤٤٥کم) و دەریاچا ئورمیێ (١١٥کم) هەیە، هەردیسان پارێزگەها دهۆکێ ژ ئاراستەیێ باشووریڤە نێزیکی (٨٠٠کم) ژ کەنداڤێ عەرەبی یا دوورە و ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە نێزیکی (٦٠٠کم) ژ دەریا سپی یا دوورە (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٥) بکە).

**نەخشەیێ (٤)**

**جهێ جوگرافی یێ پارێزگەها دهۆکێ ژ لایێ دەڤەرێن دەوروبەر ڤە**



ئەڤ ساخلەتێن جهێ جوگرافی یێ پارێزگەهێ ژ لایێ هشکاتی و رووبەرێن ئاڤیڤە بووینە ئەگەر پارێزگەهێ کەشوهەوایەکێ ناڤنجی هەبیت کو وەکی کەشوهەوایێ دەریا سپی یا ناڤەراستە.

دەربارەی جهێ ناڤخۆیی یێ پارێزگەهێ، دهۆك بەشێ باکووری عیراقێ و بەشێن باکووری رۆژئاڤایێ هەرێما کوردستانێ پێکدئینیت، ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەر پشکەکێ ژ سنووری عیراقێ و هەرێما کوردستانێ ل باکووری دگەل کۆمارا ترکیا پێکبینیت. لێ ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە یا هەڤسنوورە دگەل پشکەکا عەردێ وەلاتێ سۆریێ و ل باشووری و باشووری رۆژئاڤایی یا هەڤسنوورە دگەل پارێزگەها نەینەوا. لێ ل لایێ رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی ژی یا هەڤسنوورە دگەل پارێزگەها هەولێرێ (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٦) بکە).

ساخلەتێن جهێ پارێزگەها دهۆکێ وەلێکرینە هژمارەکا دیاردەیێن جوگرافی یێن جۆراوجۆر لێ هەبن و ڤێ چەندێ ژی کەسایەتییەکا جوگرافی یا تایبەت یا دایێ. درێژاهییا سنووری وێ یێ باکووری دگەل باکووری کوردستانێ (ترکیا) دگەهیتە (٢١٧،٨ کم) ئانکو ب رێژەیا (٢٨،٧٪)ێ ژ سەرجەمێ درێژترین سنووری پارێزگەهێ ژ چیایێن ئاسێ و دۆڵ و نهاڵێن

**نەخشەیێ (٥)**
**جهێ جوگرافی یێ پارێزگەها دهۆکێ ژ لایێ هشکاتی و رووبەرێن ئاڤێ ڤە**



نەخشەیێ (٦)
جهێ جوگرافی یێ پارێزگەها دهۆكێ ل هەرێما كوردستانێ




كوور كو رەنگە ب هزارەها مەتران ژ ئاستێ گوپیتكا چیایان نزمترین.

رووبارێ "هیزل" كو ئێكە ژ لقێن رووبارێ خابووری پشكەكا سنوورێ رۆژئاڤایێ پارێزگەهێ ب درێژاهیا (٤٤،٥كم)، پێكدئینیت، هەردیسان رووبارێ "زێ یێ مەزن" و لقێ وێ یێ سەرەكی "روویێ شین" سنوورەكێ سرۆشتی ژبۆ پارێزگەها دهۆكێ دگەل پارێزگەها هەولێرێ دروست دكەت ب درێژاهیا (٢٦٣،٢كم) ئانكو ب رێژەیا ژ سەرجەمێ درێژترین سنوورێ وێ.

ژلایێ رۆژئاڤایێ ڤە، رووبارێ دیجلە و دەریاچا سكرێ مووسل ب درێژاهیا (١٣٤كم) پارێزگەها دهۆكێ ژ پارێزگەها نەینەوا جودا دكەت، لێ ژ لایێ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ ڤە ب درێژاهیا (١٤٤،٩كم) سنوورێ خۆ دگەل پارێزگەها نەینەوا دپارێزیت هەتا خالا داویێ یا پارێزگەها دهۆكێ ل گوندێ "كولەبۆر" و بۆ باشوورێ سەنتەرێ ناحیا كەلەك ب درێژاهیا (١٤كم). ب ڤێ رەنگێ سەرجەمێ گشتێ یێ درێژاهیا سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ دگەل پارێزگەها نەینەوا دگەهیتە (٢٧٨،٩كم) كو مەزنترین رێژەیێ پێكدئینیت ب رێژەیا (٣٦،٧٪)ێ ، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٤) و خشتەیێ ژمارە (٢) بكە.

**خشتەیێ (٢)**
**درێژاهی و رێژەیا سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ دگەل دەڤەرێن دەوروبەر**

| دەڤەر | درێژاهیا سنووری (كم) | ٪ |
|---|---|---|
| كوردستانا تركیا | ٢١٧,٨ | ٢٨,٧ |
| پارێزگەها نەینەوا | ٢٧٨,٩ | ٣٦,٧ |
| پارێزگەها هەولێرێ | ٢٦٣,٢ | ٣٤,٦ |
| سەرجەم | ٧٥٩,٩ | ١٠٠ |

**ژێدەر: داتایێن جوگرافی یێن پارێزگەها دهۆكێ دناڤ پروگرامێ (ArcGIS١٠,١)**

**خشتەیێ (٣)**
**پێشكەفتنا رووبەرێ پارێزگەها دهۆكێ ب هەڤبەركرن دگەل رووبەرێ عیراقێ (١٩٦٩-٢٠١٤)**

| سال | رووبەر كم٢ | ٪ێ ژ رووبەرێ عیراقێ |
|---|---|---|
| ١٩٦٩ | ٩١١٣ | ٢,١ |
| ١٩٧٧ | ٦٠٣٩ | ١,٤ |
| ١٩٨٧ | ٦٠٣٩ | ١,٤ |
| ١٩٩٦ | ٨٨١٣ | ٢,٠ |
| ٢٠١٤ | ١٠٨٠٩ | ٢,٥ |

سروشتێ جوگرافی یێ جهێ پارێزگەها دهۆكێ كەسایەتییەكا جوگرافی یا تایبەت یا دایە ڤێ پارێزگەهێ چ ژ لایێ سروشتی یان مرۆڤی ئەوژی ژبەر وان دیاردەیێن جوگرافی یێن جۆراوجۆر دناڤبەرا چیا و بان و دۆل و نهاڵ و گركان و د هەمان چەندین رووبارێن مەزن دناڤ خۆدا هەمبێز دكەت وەك رووبارێ زێ مەزن و خابوور و هیزل و رووبێ شین، زێدەباری سنوورێ وێ دگەل سكرێ مووسل، ژ لایێ مرۆڤی ژێ ڤە پارێزگەها دهۆكێ دكەڤیتە دناڤ هەرێمەكا جوگرافی ڤەگوهازتی (انتقالی) دناڤبەرا ئابووری یێن دەشت و چیایان پێكڤە، زێدەباری سنوورێ وێ دگەل ئێك ژ گرنگترین وەلاتێن پێشكەفتی د بوارێ ئابووری دا كو ئەوژی وەلاتێ تركیایە، هەردیسان جهێ وێ ل سەر درێژاهیا رێكا ناڤدەولەتی یا ژمارە (٢) و د هەمان دەمدا دهێتە هژمارتن دەرگەهێ سەرەكی یێ عیراقێ و هەرێما كوردستانێ دگەل جیهانا دەرەكی ب رێكا دەرگەهێ خابوور یێ سنووری.

## • رووبەر

رووبەر ئێكە ژ بنەمایێن هەرە سەرەكی یێن هەر رەهەندەكا جهی یا هەر هەرێمەكا جوگرافی ب رەنگەكی كو مەزنی و بچویكاتییا ڤی رووبەری كارتێكرنەكا راستەوخۆ دكەتە سەر كەسایەتییا جوگرافی یا وێ هەرێمێ ژ لایێ سرۆشت و مرۆڤی ڤە. ئەو گوهۆرینین كارگێری و كاودانێن ئابووری و جڤاكی یێن مەزن یێن سەر ب پارێزگەها دهۆكێ دا هاتین هەر ژ رۆژا دامەزراندنا وێ و هەتا نوكە كاریگەرییەكا بەرچاڤ ل سەر جوداهیا رووبەرێ ڤێ پارێزگەهێ ژ ماوەیەكی بۆ ئێكی دی هەبوویە، هەردیسان ل سەر جوداهیا پێكهاتنا رێژەیی یا هەر قەزایەكێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ گشتی یێ پارێزگەهێ ئەوژی ل دووڤ زێدەبوون و كێمبوونا ڤی رووبەری دناڤبەرا ماوەیەكی بۆ ئێكێ دی دا.

**ل دووڤ وان داتایێن د خشتەیێن ژمارە (٣-٥) دا هاتین كو دەربرینێ ژ بەلاڤبوونا رێژەیی یا رووبەرێن یەكەیێن كارگێری یێن پارێزگەها دهۆكێ دكەت، ئەڤ دەرئەنجامە بۆمە خۆیابین:-**

١. دناڤبەرا سالێن ١٩٦٩ و ٢٠١٤ێ رووبەرێ پارێزگەها دهۆكێ رووبەرەكێ نە بنەجهـ بوو دناڤبەرا (٦٠٠٠-١٠٠٠٠كم٢)دا ، هندەك زێدەبوون یان كێمبوون د رووبەرێ پارێزگەهێ دا پەیدابوویە ب تایبەت ل سالێن ١٩٧٧ و ١٩٨٧ ئەوژی ژ ئەنجامێ كاودانێن سیاسی و ئەمنی و سیاسەتێن تەعریبكرنێ ئەوێن ب سەر ڤێ پارێزگەهێ دا هاتین.

٢. بتنێ زێدەهییەكا سادە ل سەر رێژەیا رووبەرێ

**خشتەیێ (٣)**

**پێشکەفتنا رووبەرێ (کم٢) یەکەیێن کارگێری (ناحیة) ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٦٩-١٩٩٦)**

| قەزا | ناحیە | ١٩٦٩ | ٪ | ١٩٧٧ | ٪ | ١٩٨٧ | ٪ | ١٩٩٦ | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | دهۆك | ١٠٧ | ٥,٧ | ١٠٧ | ١٠,٩ | ١٠٧ | ١٠,٩ | ١٠٧ | ١٠,٩ |
| | مانگێشك | ٤٥٤ | ٢٤,٣ | ٤٥٤ | ٤٦,٣ | ٤٥٤ | ٤٦,٣ | ٤٥٤ | ٤٦,٣ |
| | زاویتە | ٤٢٠ | ٢٢,٥ | ٤٢٠ | ٤٢,٨ | ٤٢٠ | ٤٢,٨ | ٤٢٠ | ٤٢,٨ |
| | سێمێل | ٥٨٧ | ٣١,٤ | - | - | - | - | - | - |
| | ئەتروش | ٣٠٠ | ١٦,١ | - | - | - | - | - | - |
| | | ١٨٦٨ | | ٩٨١ | | ٩٨١ | | ٩٨١ | |
| زاخۆ | زاخۆ | ٢٩٥ | ١٦,٠ | ٢٩٥ | ٢٨,٥ | ٢٩٥ | ٢٨,٥ | ٢٩٥ | ٢٨,٥ |
| | باتیلێ | ٨١١ | ٤٤,٠ | - | - | - | - | - | - |
| | دەرکارێ | ٥٣١ | ٢٨,٨ | ٥٣١ | ٥١,٤ | ٥٣١ | ٥١,٤ | ٥٣١ | ٥١,٤ |
| | باتیفا | ٢٠٨ | ١١,٣ | ٢٠٨ | ٢٠,١ | ٢٠٨ | ٢٠,١ | ٢٠٨ | ٢٠,١ |
| | | ١٨٤٥ | | ١٠٣٤ | | ١٠٣٤ | | ١٠٣٤ | |
| ئامێدی | ئامێدی | ٩٣ | ٣,٥ | ٩٣ | ٣,٥ | ٧٠١ | ٢٦,٧ | ٩٣ | ٣,٥ |
| | کانی ماسێ | ٦٠٨ | ٢٣,٢ | ٦٠٨ | ٢٣,٢ | - | - | ٦٠٨ | ٢٣,٢ |
| | دێرەلۆك | ١٠٠٧ | ٣٨,٣ | ١٠٠٧ | ٣٨,٣ | ١٠٠٧ | ٣٨,٣ | ١٠٠٧ | ٣٨,٣ |
| | سەرسنك | ٩١٨ | ٣٥ | ٩١٨ | ٣٥ | ٩١٨ | ٣٥,٠ | ٩١٨ | ٣٥ |
| | | ٢٦٢٦ | | ٢٦٢٦ | | ٢٦٢٦ | | ٢٦٢٦ | |
| ئاکرێ | ئاکرێ | ٧٣٤ | ٢٦,٥ | - | - | - | - | ١٤٥ | ٥,٢ |
| | بجیل | ٢٩٨ | ١٠,٧ | - | - | - | - | ٢٩٨ | ١٠,٧ |
| | دینارتە | ٩٧٦ | ٣٥,٢ | - | - | - | - | ٩٧٦ | ٣٥,٢ |
| | گردەسین | - | - | - | - | - | - | ٥٨٩ | ٢١,٢ |
| | بەردەرەش | ٧٦٦ | ٢٧,٦ | - | - | - | - | ٧٦٦ | ٢٧,٦ |
| | | ٢٧٧٤ | | - | - | - | - | ٢٧٧٤ | |
| سێمێل | سێمێل | - | - | ٣٠٦ | ٢١,٩ | ٣٠٦ | ٢١,٩ | ٣٠٦ | ٢١,٩ |
| | باتیلێ | - | - | ٨١١ | ٥٨,٠ | ٨١١ | ٥٨,٠ | ٨١١ | ٥٨,٠ |
| | فەیدێ | - | - | ٢٨١ | ٢٠,١ | ٢٨١ | ٢٠,١ | ٢٨١ | ٢٠,١ |
| | - | - | - | ١٣٩٨ | ٢٣,١ | ١٣٩٨ | ٢٣,١ | ١٣٩٨ | ١٥,٩ |
| سەرجەم | | ٩١١٣ | | ٦٠٣٩ | | ٦٠٣٩ | | ٨٨١٣ | |

**ژێدەر: سەرژمێریێن ئاکنجیان ل سالێن ١٩٤٧، ١٩٥٧، ١٩٦٥، ١٩٧٧، ١٩٨٧ و تەخمینکرنا ئاکنجیان ل سالا ١٩٩٦.**

پارێزگەها دهۆکێ ب هەڤبەرکرن دگەل سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عیراقێ دا هەر دەستپێکا دامەزراندنا وێ ل سالا (١٩٦٩)ێ و هەتا نوکە پەیدابوویە، لێ مەزنترین رێژەیا زێدەبووی ل سالا (٢٠١٤)ێ پەیدابوویە ئەوژی نێزیکی (١٠٧٧٧کم٢) بوو ئانکو ب رێژەیا (٥,٢٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عیراقێ.

٣. چ گوهۆرینێن مەزن ل سەر رووبەرێن یەکەیێن کارگێری (ناحیە) یێن پارێزگەها دهۆکێ دا د ماوەیێ ناڤبەرا (١٩٦٩-٢٠١٤)ێ پەیدانەبووینە بتنێ ناحیێن دێرەلوک، سەرسنك، کانی ماسێ، ئاکرێ و بەردەرەش نەبن و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ دامەزراندنا یەکەیێن کارگێری یێن نوی دزڤریت.

٤. گوهۆرینەکا مەزن د رووبەرێ هندەك یەکەیێن کارگێری (قەزا) یێن پارێزگەهێ دا د ماوەیێ ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان پەیدابووینە ب تایبەت ل قەزا زاخۆ و ئاکرێ، ئەوژی ژبەر پیڤانا رووبەرێ وان ب شێوەیەکێ شاش، لێ ل قەزا ئاکرێ پەیدابوونا ڤان گوهۆرینان ژبەر دامەزراندنا قەزا بەردەرەش چێبوون کو بوو ئەگەر رووبەرەکێ مەزن یێ عەردێ ژ عەردێ ڤێ قەزایێ بێتە ڤەکرن.

٥. ل سالا (١٩٦٩)ێ هەڤسەنگیەکا بەرچاڤ د رووبەرێن قەزایێن پارێزگەهێ دا هەبوو، قەزا ئامێدیێ مەزنترین رێژەیا رووبەرێ پارێزگەهێ پێکدئینیت بتنێ ل سالێن (١٩٦٩ و ١٩٩٦)ێ نەبیت کو وی دەمی پێشەنگی ژبۆ قەزا ئاکرێ بوو ژبۆ پێکئینانا رێژەیکا مەزن ژ رووبەرێ پارێزگەهێ.

٦. رووبەرێ قەزا ئامێدیێ پتر ژ چارێکا سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٤)ێ پێکدئینیت، رووبەرێ ڤێ قەزایێ دگەل یێ قەزا ئاکرێ پتر ژ (٤٠٪)ێ ژ رووبەرێ پارێزگەهێ پێکدئینینت، لێ د هەمان دەمدا رووبەرێ قەزا دهۆکێ تنێ نێزیکی (٩.٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێن قەزایێن پارێزگەهێ یە.

٧. بچوکترین ناحیێن پارێزگەها دهۆکێ ژ لایێ رووبەری ڤە ل سالا (٢٠١٤)ێ هەردو ناحیێن (ئاکرێ و ئامێدی) بوون ب رووبەرێ (٨٦کم٢) و (٩٤,٣کم٢) ب رێژەیێن (٧,٦٪)ێ و (٣,٤٪)ێ ل دووڤ ئێك ژ سەرجەمێ رووبەرێ قەزایێن وان، لێ مەزنترین ناحیێن پارێزگەهێ ژ لایێ رووبەری ڤە ل سالا (٢٠١٤)ێ ناحیا دێرەلووك بوو ب رووبەرێ (٩٨٨,٥کم٢) کو دبیتە رێژەیا (٣٥,٩٪)ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ قەزایێ و ب رێژەیا (٩,١٪)ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ گشتی یێ پارێزگەهێ.

خشتەیێ (٤)

پێشکەفتنا رووبەرێ (کم٢) یەکەیێن کارگێری (قەزا) ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٦٩-٢٠١٤)

| قەزا | ١٩٦٩ | ٪ | ١٩٧٧ | ٪ | ١٩٨٧ | ٪ | ١٩٩٦ | ٪ | ٢٠١٤ | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ١٨٦٨ | ٢٠,٥ | ٩٨١ | ١٦,٢ | ٩٨١ | ١٦,٢ | ٩٨١ | ١١,١ | ١٠٠٥,١ | ٩,٣ |
| زاخۆ | ١٨٤٥ | ٢٠,٢ | ١٠٣٤ | ١٧,١ | ١٠٣٤ | ١٧,١ | ١٠٣٤ | ١١,٧ | ١٤٤٢,٤ | ١٣,٤ |
| ئامێدی | ٢٦٢٦ | ٢٨,٨ | ٢٦٢٦ | ٤٣,٥ | ٢٦٢٦ | ٤٣,٥ | ٢٦٢٦ | ٢٩,٨ | ٢٧٥٥,٤ | ٢٥,٣ |
| ئاکرێ | ٢٧٧٤ | ٣٠,٥ | - | - | - | - | ٢٧٧٤ | ٣١,٥ | ١٨١٣,٦ | ١٦,٨ |
| سێمێل | - | - | ١٣٩٨ | ٢٣,١ | ١٣٩٨ | ٢٣,١ | ١٣٩٨ | ١٥,٩ | ١٢٦٣,٨ | ١١,٧ |
| شێخان | - | - | - | - | - | - | - | - | ١٣٩٥,٦ | ١٢,٩ |
| بەردەرەش | - | - | - | - | - | - | - | - | ١١٣٣ | ١٠,٥ |
| سەرجەم | ٩١١٣ | ١٠٠ | ٦٠٣٩ | ١٠٠ | ٦٠٣٩ | ١٠٠ | ٨٨١٣ | ١٠٠ | ١٠٨٠٩ | ١٠٠ |

**خشتەیێ (٥)**

**پێشكەفتنا رووبەرێ (كم٢) یەكەیێن كارگێری (ناحیە) ل پارێزگەها دهۆكێ ٢٠١٤**

| دهۆك | | | ئامێدی | | | زاخۆ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ١٠٣,١ | ١٠,٣ | ئامێدی | ٩٤,٣ | ٣,٤ | زاخۆ | ١٢,٣ | ٠,٨ |
| مانگێشك | ٤٨٥,٦ | ٤٨,٣ | كانی ماسێ | ٧٥٢,٦ | ٢٧,٣ | دركار | ٥٥٠,٤ | ٣٨,٢ |
| زاویته | ٤١٦,٥ | ٤١,٤ | دێرلوك | ٩٨٨,٥ | ٣٥,٩ | باتیفا | ٥١٨,٦ | ٣٦,٠ |
| | | | سەرسنك | ٢٤٨,٦ | ٩ | رزگاری | ٣٦١,١ | ٢٥,٠ |
| | | | بامەرنێ | ٢٣٨,٩ | ٨,٧ | - | - | - |
| | | | چەمانكێ | ٤٣٢,٥ | ١٥,٧ | - | - | - |
| | ١٠٠٥,١ | | | ٢٧٥٥,٤ | | | ١٤٤٢,٤ | |
| ئاكرێ | | | سێمێل | | | شێخان | | |
| ئاكرێ | ١٢٣,٦ | ٦,٨ | سێمێل | ٣٤٠,٠ | ٢٦,٩ | ئەتریش | ٤٧٠,١ | ٣٣,٧ |
| بجێل | ٢٨٢,٩ | ١٥,٦ | باتێلێ | ٦٥٧,٩ | ٥٢,١ | باعەدرێ | ١٢٢,١ | ٨,٧ |
| دینارته | ٨٣٦,٦ | ٤٦,١ | فەیدێ | ٢٦٥,٩ | ٢١,٠ | ئێسفنێ | ١٧٦,٨ | ١٢,٧ |
| گردەسێن | ٥٧٠,٤ | ٣١,٥ | | | | قەسروك | ٣١٣,٨ | ٢٢,٥ |
| | | | | | | زیلكان | ٣١٢,٨ | ٢٢,٤ |
| | ١٨١٣,٦ | | | ١٢٦٣,٨ | | | ١٣٩٥,٦ | |
| بەردەرەش | | | | | | | | |
| بەردەرەش | ٨٦,٠ | ٧,٦ | | | | | | |
| رۆڤیا | ٣١٠,٠ | ٢٧,٤ | | | | | | |
| دارەتوو | ٤١٨,٩ | ٣٧,٠ | | | | | | |
| كەلەك | ٣١٨,١ | ٢٨ | | | | | | |
| | ١١٣٣,٠ | | | | | | | |

تێبینی، ئەڤ رووبەری ب رێكا پروگرامێ هاتینە دەرئێخستن لەورا دبیت ئەڤ ژمارە پێچەكێ ژ خشتەیێ بەری نوكە د جودابن.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. جمال حمدان، جغرافیة المدن ، القاهرة، ١٩٧٢، ص ٤٢٧.

٢. عبد الله عطوی، جغرافیة المدن، دار النهظة العربیة،ج١، بیروت، ٢٠٠١، ص ص٣٧-٤٠. جمال حمدان ، المصدر السابق ، ص ص ٤٢٧-٤٣٤.

٣. محافظة دهوك ، دهوك بعد الحادی عشر من اذار، مطبعة دهوك، دهوك، ١٩٧٣، ص ص ١-٣.

٤. محافظة دهوك، دلیل محافظة دهوك، مطبعة الادیب، بغداد، ١٩٨٥، ص ١٥.

٥. مصدق توڤی، ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهوك، چاپخانا هاوار، دهوك، ٢٠١٠، بپ ١٥١.

# پێکهاتەیا جیولوجی یا پارێزگەها دهۆکێ☆

**پ.هـ. ئیبراهیم خشمان هسام**
**زانکۆیا دهوك- کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: کۆڤان ئیحسان یاسین**

پتریا ئەردێ هەرێما کوردستانا عیراقێ، دهێتە چارچۆڤەکرن دناڤ کەمەرا پەسار و کەلشتەیێن (فوالق) ئەردی دا، ئەڤێن ب پەسارێن گونجایی دهێتە راڤەکرن، توخیبێن باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایی دەسپێدکەن ژ رەخێ پەسارێن خوار، ب درێژاهییا زنجیرا چیایێن دیتر ژ رۆژئاڤا بەرەڤ رۆژهەلات (چیایێ سپی و دهۆك و ئێسفنێ و ئاکرێ و پیرمام) ڤە دچن. ئەڤ زنجیرا چیان دهێنەناسکرن وەك ئاستێ هەرەنزمێ ڤێ کەمەرێ کو ژ باکوورڤە دەست ب بلندبوونێ دکەت تا دگەهتە پتر ژ (٣٠٠٠م) ل سەر ئاستێ دەریایی، توخیبێن وی یێن باکووری پشکەکا مەزن ژ باکوورێ پارێزگەها دهۆکێ ڤەدگرن، نەخاسمە توخیبێن وێ دگەل وەلاتێ تورکیا[١].

ڤەکۆلینێن پێکهاتەیا فسیوگرافییا (سروشتی) روویێ ئەردێ عیراقێ دگەل دەڤەرا چێبوونا کەلشتەیێن خشیایی (الفوالق الزاحفة) پۆلیندکەن، ل دووڤ سەخلەتێن تەکتونی یێن تایبەت، زێدەباری دیرۆکا جیولوجییا ئەردی، ئەڤە دبنە خۆدیکا دەستوداری چێبوون و ستراکچەر و نشتەیی ل دەڤەرێ[٢]، ئەڤەژی د کەمەرا پەسارێن بلند دایە دناڤبەرا دەڤەرا زاخۆ و توخیبێن ترکیا ل پشکا باکوورێ رۆژئاڤایی، بەرەڤچوونا وێ هەتا دگەهنە دەڤەرا دەربەندیخان و هەلەبچە و هەتا توخیبێن ئیرانێ ل باشوورێ رۆژهەلاتی. ستووریيا ڤی چارچۆڤەی (٢٥کم)، بەلێ ل هندەك جها دگەهیتە (٥٠کم) نەخاسمە ل جهێ ژ هەمیا پەحنتر. ئەڤ دەڤەرە هاتییە کارتێکرن ب پارستێن پەحن (الكتل المستعرضة)، ژبەرکو ئەڤ دەڤەرە کەفتییە بەر کریارێن بڕین و بلند بوونێ، نەخاسمە ل چەرخێ کریتاسی و بالیوجینی، دیسان کەڤتنە بەر کریارێن تێکدانەکا ب هێز ل داوییا دەمێ تەرشری. ئەڤ چارچۆڤە پشکەکە ژ گۆما (حوض) مولاسا بالیوجینی[٣]. دەڤەرا پێکهاتەیا ڤێ یەکا جیولوجی (کەمەرا پەسار و کەلشتەبوونێ) دناڤ پارێزگەها دهۆکێ دا درێژ دبیت ژ توخیبێن ترکیا دەسپێدکەت نەخاسمە دەڤەرا دناڤبەرا رووبارێ دیجلە و زێیێ مەزن دا. ژ سەخلەتێن ڤی کەرتی گەلەك چەماندنێن جیولوجیێن دژوار تێدا هەنە، زێدەباری هەڕفینا پشك و رووبەرێن مەزن ژ کەڤرا، نەخاسمە کو ئێك ب سەر یێ دی دکەڤیت، ژبەر هێزا لڤینا تەکتونی ئەڤا دهێتە پالدان ژ رەخێ باکوورێ رۆژهەلاتی ڤە، هەتا کو گەلەك پەسار ئێخستینە سەر ئێکدا[٤].

## رێزكرنا جیولوجی یا پارێزگەها دهۆكێ

پێكهاتەیێن سەرڤە و ژ ناڤدا یا ئەردی، زانایێن جیولوجی بخۆڤە مژوول كرینە، هزرێن وان ل سەر پێشكەفتن و قۆناغێن دەستپێكا چێبوونا عەردی و هەتا نوكە دزڤرن (ملیون سالێن داوییێ) تێدا بووری. پتریبا ڤەكۆلینێن جیولوجی یێن وان دهمبز بوون ل سەر كەڤرێن نیشتەی (رسوبی) دناڤ دەریاچە و رووباران دا، كو تێبینی دهێتەكرن تەخێن نیشتەیێن نوی مینا تەخان ئێك ل سەر یا دی یە. تەخێن سەری كەڤنترن ژ یێن خوارێ، ئەڤێ چەندێ كلیلكا زانینا تەخێن ئەردی یێن جیولوجی دیار و روهنكرن، ژبەركو گەلەك ب بەربوویی (المتحجرات) دناڤ تەخێن كەڤری دا هەنە، هاریكاریبا زانا كر كو دەمێ ژێ رێژەیی یێ كەڤری بزانن[٥]، پاشی زانایێن جیولوجی ئەڤ چەرخە پشككرنە سەر چەرخ و چەرخا (دهور و عصور)ن، پاشی هەر ئێك ژ وان پشككرە سەر دەمێن كێمتر، پاشی پشككرە سەر چەند دەورەكا، ناڤێ وان چەرخ و چەرخان ژ ناڤی گیانەوەرا هاتە وەرگرتن ئەڤێن دناڤ ڤان تەخا دا ژیاین. هوسا شیان جوداهیەكێ بێخنە دناڤ تەخێن ئەردی دا[٦].

دیرۆكا پێكهاتەیا جیولوجیبا پارێزگەها دهۆكێ، یا گرێدایە دگەل وەرارا جیولوجیبا هەرێما كوردستانێ ب رەنگەكێ تایبەت، و وەرارا تەكتون و لڤینا پلێتا (صفیحة) عەرەبی و ئیرانی ب رەنگەكێ گشتی. بۆ جارا ئێكێ ئەڤ دەڤەرە چێبووی ڤەدگەریتە چەرخێ (پالیوزویك Paleuzoic) بەری پتر ژ (٢٠٠٠) ملیون سالا. ل وی چەرخی ئەڤ دەڤەرە ل ژێر دەریا (تیشس) بوو، ل ڤێرە كەڤرێن شەنگستا پلێتا عەرەبی و ئیرانی دەست ب چێبوونێ كر، ژبەر گەرماتیێن مەكمانی ئەڤێن ب سەر دەریایێ كەفتین، كو بەری وی چەرخی هەردو پلێت ئێك تلپە (كتلة) بوون نەخاسمە ل چەرخێ كامبری[٧].

دیرۆكا جیولوجیبا چێبوونا ئەردی پشك دبیتە سەر دو چەرخێن درێژ، ئەو ژی پێكدهێن ژ پێنج چەرخێن (دهور) كورتتر. هەر ئێك ژ وان وەكی مە بەحس كری پشكدبن سەر چەند چەرخەكا، چەرخێ درێژێ ئێكی ژهەمیا كەڤنترە، كو دبێژنێ چەرخێ ژیانا ڤەشارتی (Cryptozoic Eon)، پتریبا جارا ژ كەڤرێن ئاگری و گوهۆری پێكدهێن. ئەڤ كەڤرە ل پارێزگەها دهۆكێ هاتینە دیتن، دناڤ كەرتێ پالدان و كەلشتەیێن خشیای دا، ب رەنگەكێ گشتی ناڤەگەرنە سەر چەرخێ ژیانا بەرزە. بەلێ بۆ چەرخێ ژیانا ئاشكرا ڤەدگەرن، ژبەركو چ بەرماییێن ژیانێ تێدا نینن، پتریبا جارا دبێژنێ چەرخێ بەری كامبیری (Precambrian). چەرخێ درێژێ دووێ دبێژنێ چەرخێ ژیانا ئاشكرا یان بەرچاڤ (Phanerozoic Eon)، پێكدهێن ژ هەمی كەڤر و نیشتە ئەڤێن كەفتینە بەر ب بەربوونیێ (تحجر)، زێدەباری بەرماییێن هەبێن زیندی[٨].

## ئێك: چەرخێ درێژێ ژیانا بەرزە چەرخێ بەری كامبری (Cryptozoic Eo Precambrian)

ئەڤ چەرخە ژ هەمی ژێێن ئەردی كەڤنترە، ل دەوروبەرێن (٤٥٠٠) ملیون سالا دەستپێكریبە. د ڤی چەرخیدا عەردی دەسپێكا دروستبوونا دەریا و سەقایی و دەركەفتنا ژیانا سادە وەكی چێبوونا هندەك بۆنەوەرێن بچویك و پاشی وەراربوون ب خۆڤە دیت[٩]. د رێكا ڤەكۆلینێن جیولوجی دا دیار دبیت، كو ئەو كەڤرێن ئاگری و گوهۆری ئەڤێن هاتینە دیتن ل دەمێ پالدان و كەلشتەیێن خشیایی، ل دەڤەرا كێستە، نا ڤەگەرن بۆ ڤی چەرخی، بەلكو بۆ چەرخێن نویتر ڤەدگەرن. ئەگەر ئەم نێرینەكێ ل نەخشەیێ جیولوجیبا هژمارە (١) بكەین، دێ بینین ئەڤ پێكهاتە بتنێ ل جهەكێ بچویك دیار دبیت، ئەو ژی ل باكوورێ رۆژهەلاتێ ناحیا دێرەلۆكێ و باكوور و رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ و باكوورێ ناحیا سندی ل پارێزگەها دهۆكێ.

## دو: چەرخێ درێژێ ژیانا ئاشکرا (Phanerozoic Eon)

### ١- چەرخێ ژیانا کەڤن (پالیوزویك Paleuzoic).

پێکهاتەیا پالیوزیك ئەڤێن هاتینە دیتن ل پارێزگەهێ (دەڤەرا کەلشتەیێن خشیای) ستووریا وان نێزیکی (٢٠٠٠م)، ب رەنگەکێ گشتی سەخلەتێن ژینگەها دەریایی روهن دکەن، نیشتەیێن نوی یێن پرت پرت و جیری تێدا هەنە، پێکهاتەیا بەرەسپیکی نەخاسمە پشکا ستوونیا تەخێن خـوارێ، دبنە نیشتەیێن کیشوەری یێن نوی و ئێکانە. پێکهاتەیا چەلکێ ژی پێکهاتەیا ئێکانەیە کو کەڤرێن شووشەیی (بلوری -کەڤرێن روهن) تێدا دبەربەلاڤ.

پارچا نیشتەیا بالیووزوی ل سێ خۆلێن جودا دیار دبیت، دبیت ئەو گۆمێن نیشتەی یێن جودا جودا بن، هاتبنە ژێکڤەکرن ب رێکا رێژەیەکا دابڕینێن مەزن، لڤینا ئەردی و پەیدابوونا چیایان دسەلمینیت، ئەو ژی لڤینا کالیدونی و هیرسینیە، ئەو خولە ژی ئەڤەنە:

أ- خۆلا کامبیری ئوردەفیشی- سیلیوری

ب- خۆلا دیڤونی (دیڤونیا گیروبووی) هەتا کاربونیێ خوارێ.

ت- خۆلا کاربونێ سەری و هەتا پێرمی[10].

### أ- خۆلا کامبیری ئوردەفیشی- سیلیوری:

پێکهاتەیا خابووری یا تەقنی وکوارتزی، پێکهاتەیێ ئێکانەیە ل ئەڤێ خۆلێ هەی. پێکهاتەیا بەرسپیکی و چەلکێ، دبیتە پێکهاتەیا خابووری یا کوارتزی، هندەك د دانە دناڤ ڤێ خۆلێ دا، ڤەدگەرینە چەرخێ دیڤونی[11]. کەسێ ئێکێ یێ ئەڤ پێکهاتە زانی ویتزل بوو ل سالا (١٩٥٠)یێ، پێکدهێت ژ کەڤرێن خویزی و کوارتزی، کەڤرێن وێ دناڤ تەخا دا دجهگۆرن، ستووریا ڤێ پێکهاتەیێ دگەهیتە (٨٠٠م) نەخاسمە ل پارچەیا نموونەیی یا چەماندنا پەسارا[12].

گەلەك شوینوارێن گیانەوەرێن سێ پشك هەنە، ژ رەنگێ سەرڤە رەق و ژناڤدا نەرم (مفصلیات)، دبێژنێ (کروزیانا)، بەرێ کوارتز ژ ناڤێ وێ هاتییە، یان دبێژنێ کوارتزین کروزیانا. دەستوداریێ تێدا نیشتەیێن خابووری چێبووین، دەستوداریێ دەریایەکا نە یا کوور بوون، هوسا نیشتە هێدی هێدی چێبوون، هەتا داویا ڤی چەرخی کو تێدا ڤولکانەك هاتییە قەیدکرن، ژ بەرمایێن وێ تێکهەلەیا سۆر یا سۆتنا ڤولکانی، ئەڤا ل سەر پێکهاتەیا خابووری دا گرتی، دبێژنێ (**بەرسپیك و چالکی**)، ئەو پێکهاتەیا خابووری دنخێڤن ب تەخەکێ وەکی ئێك[13]، پێکهاتەیا بەرسپیك ئەم ل گوندێ ئۆرە دبینین، دیتزل پشك دکەتە سەر چوار رەنگێن کەڤری[14]:

١- **پشکا سەری:** ستووریا وی (٣٣م)، پێکدهێت ژ کەڤرین خویزی و ئاخەکا سۆر و کەڤرێن ئاخێ (سلتیە)، دەمێ دهێنە شکاندن وەکی مەحارێ ئاڤێ لێ دهێن.

٢- **پشکا دکەڤیتە بن پشکا سەری:** ستووریا وێ (٢٤م)، ئەڤ تەخە ب رەنگەکێ گشتی ژ کەڤرێن کوارتزی پێکدهێت، دیاربن کو تەخێن ژێك ڤەبووینە. بەلێ ڕوویێ وانا ژ دەرڤە یێ کونە، ئەم چەند بەرەڤ خوارێ ڤە بچین، دێ بینین پێکهاتە ژ کەڤرێن کوارتزی بۆ کەڤرێن خویزێ سۆر دهێتە گوهۆرین، هندەك ژی رەنگێ وان مۆرە لێ دهێت یان وەکی تەقنێ دهێتە گوهۆرین.

٣- **پشکا ناڤەراست:** ژپێکهاتێڤە ستووریا ڤێ پشکێ (١٦م)ن، ژ کەڤرێن خویزی پێکدهێت، کو ب رەنگەکێ رێکخستی دەردکەڤن، رەنگێ وان یێ قەهوائی زەرە، و هندەك رهێن کەڤزەکا سۆرا ژەنگی ب سەردا گرتییە.

٤- **پشکا شەنگستەی ژ پێکهاتەیێ:** ستووریا وێ (١٠م)، پێکدهێت ژ کەڤرێن سلتی، وەکی مەحارەکا شکەستی دەردکەڤن، رەنگێ وی یێ قەهوائی یە، پشکەك ژێ ل ژێر باندۆرا سەقای رەنگەکێ رصاصی یان کەسك ب خۆڤەگرتییە.

بەلێ پێکهاتەیا چەلکێ ژ کەڤرێن تەقنێ وسلتی

بێن ڤەبووی پێکدهێت، رەنگێن وێ دناڤبەرا رصاصی و کەسك و سۆر و سپی نە، هەردو رەنگێن داویێ (سۆر و سپی) دیاردکەن، کو ڤەرێژا چێبوونا وێ ژ کەڤرێن باسلتێ زەیتونی هاتینە گوهۆرین بۆ تەخەکا دی، ستووریا وێ (٢-٥م)، رەنگێ کەڤرا دیار دکەن کو ستوورن، زێدەباری گوهۆرینا بەرمایێن ڤولکانێ کو ژ بەرێ سلتێ نەرم و بەرێن غەزاری پێکدهات، رەنگێ وان سۆرەکێ تەیسۆك بوو[١٥].

هندەك دبینن کو چەرخێ خشیان تێدا روی نەدای، چەرخێ درێژێ سلیوری بوو (نێزیکی ٤٥ ملیون سالا). هندەك زانایێن جیولوجی نێزیکی لڤینا کالیدونی دکەن، ئەڤا ژ بەراهیا چەرخێ کامبیری دەسپێدکەت هەتا دوماهیا چەرخێ سلیوری، کو لڤینا چێبوونا ئەردی د دژوارترین دەمێن خۆدا دبووری. دووڤ ئێك هاتنا تەخێن کەڤری و پێکهاتەیێ وان و ژیێ وان یێ جیولوجی د خشتەیێ هژمارە (١) دا دیار دبیت[١٦].

**خشتەیێ (١)**
**رێزکرنا تەخێن پێکهاتەیێن کەڤری**

| پێکهاتە | چەرخ |
|---|---|
| چیا زێرێ (دگەل هەلما ساتینا) نەرێکخستی | پێرمی |
| - هرۆرا جیری<br>- کەڤزا ئۆرە<br>- کێستە نەرێکخستی | کاربون – داوییا دیڤونی ؟ |
| - تەخێن بەرسپیکی سۆر دگەل کەڤرێن ئاگری ل چەلکێ<br>- خابوور | ئوردفیشی |

**نەخشەیێ (١)**
**گرنگترین پێکهاتەیێن جیولوجی روهندکەت دابەشکرنا جوگرافی ل پارێزگەها دهۆکێ**




ژێدەر: نشوان شکری عبدالله، ابراهیم خشمان هسام، اختیار الموقع الامثل لصناعة الاسمنت فی محافظة دهوك باستخدام GIS، مجلة جامعة دهوك، المجلد ١٥، العدد ٢، ٢٠١٢، ص ٢٦٥.

### نەخشەیێ (٢)
### پێکهاتەیا جیولوجییا قەزا ئامێدییێ ل دووڤ رێزکرنا دەمی و جهێن بەلاڤبوونێ.

| چەرخێن درێژ | | ژیێ وان ب ملیون سالا | چەرخ و دەم و چەڤەنگێن وان | گرنگترین پێکهاتە | جهێن بەلاڤ بوونێ |
|---|---|---|---|---|---|
| CENOZOIC ژیانا نوی | TERTIRY تێرشەری | ٢٥ | پلایوسین pc | - بەختیاری | پێکهاتەیێن وێ ل دەشتا سندیا ل قەزا زاخو- دیار دبن ، زندەباری دەشتا ئاکرێ ل پتریا پشکێن باشووری یان ئەڤا دبێژنێ ناڤکور و هندەك پشکێن کەلەکێ. |
| | | | مایوسین MCUF | - فارسێ سەری | - ل دەڤەرێن پەسارێن چەماندی و پتریا دەڤەرێن دەشت ل پارێزگەهێ هەبە زندەباری گۆمێن رووبارا بنێرە خەریتا جیولوجی. |
| | | ٢٥ | مایوسین MCLF | - فارسێ خوارێ | - ل بەراهیا زنجیرا چیایا هەیە زندەباری لێڤێن رووبارا ل هەمی پارێزگەهێ. |
| | | ٦٠ | ئەیوسین Ec | - ئەلیجی + شنکار+ خورمال + کولوش | - پتریا پشکێن ناحیێن ( بامەرنێ و سەرسنکێ و کانی ماسێ و چەمانکێ ) فەدگریت زندەباری رووبەرێن کێمتر ژ ناحیا دێرەلۆکێ و ناحیا ناڤەندا ئامێدیێ و زنجیرا چیایێ گارەی و مەتینی و زنجیرا چیایێن ناحیا گولی و سندی و زنجیرا چیایێ بێخێری و زنجیرە چیایێن دهۆکێ و چیایێ زاوا و ئەترووش و شیرمان و زنجیرا چیایێن ئاکرێ و باکرمان. |
| | | ٧٠ | پالیوسین EP | جدالە + أڤانە + پیلاسبی + جرکس | - ل ناحیێن گولی و سندی ل قەزا زاخۆ و ناحیا مانگیشکێ ل قەزا دهۆکێ و ناحیا باتێل و سێمیلێ ل قەزا سێمیلێ و ناحیا ئەترووش ل قەزا شێخان. دیسان ل ناحیێن بجێل و گردەسین و ئاکرێ ل قەزا ئاکرێ زندەباری ناحیێن قەزا بەردەرەش. |
| MESOZOIC ژیانا ناڤەراست | | ١٣٥ | کریتاسی CR | - لایمستوونێ ئاکرێ عقرە (بەرێ جیری + کلس)<br>- شەرانش. بەرێ جیری + کلس<br>- هدینە ، بەرێ جیری + کلس<br>- بێخمە. بەرێ جیری + کلس<br>- میرکی.حجر جیری + کلس<br>- گومیتان. بەرێ جیری + کلس<br>- Qamchuqa (بەرێ جیری + کلس)<br>- بالمبو<br>- Sarmord<br>- Garaqu | -گەلی زەنتە ، بێخمە ، دزە ، زنبار ، چەلکێ ، ئامیدی و هدینە<br>- مەتین و گارە و چەلکێ و هدینە<br>- متین و گارە وشرانش و پیرس<br>- دناڤبەرا هدینە وئورە<br>- کەمەرا پەسارێن بلند متین و گارە<br>- کەمەرا پەسارێن بلند متین و گارە<br>- کەمەرا پەسارێن بلند متین و گارە<br>- کەمەرا پەسارێن بلند متین و گارە<br>- پتریا دەڤەرێن پێکهاتەیا گریتاسی.<br>- دەڤەرا رنکان<br>- پتریا دەڤەرێن گریتاسی. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ١٨٠ | جوراسی JU | - چیاێ گاره<br>(پشكا سەری ژ پێكهاتەیا<br>گریتاسی)<br>- Barsarin<br>بەرێ جیری - Naokelekan<br>Sargelu –<br>- دولومایت Sehkaniyan<br>- سارکێ | - زڤرۆكا چەماندیا چیایێ گارەی.<br>-چیایێ پیرس ل ناحیا دینارتە<br>- چەماندنیا چیایێ گارە و دەڤەرێن بانێ و چەلكێ<br>- چەماندیا چیایێ گارەی<br>ـدەڤەرا بناڤی ل چەماندنا ئۆرە و چەماندنا كێستە ل دەڤەرا چەلكێ و هرۆرێ.<br>ـدەڤەرا بناڤی ل چەماندنا ئۆرە و چەماندنا كێستە ل دەڤەرا چەلكێ و هرۆرێ.<br>- زڤرۆكا چەماندی یا و پشكا سەری ژ پەسارێن كێستە<br>- دەڤەرا كەلشتەیێن خشیایی د كەمەرا پەسارێن بلند. |
| | ٢٢٥ | تریاسی TR | Baluti Shale -<br>كەڤرێن ئاخێ– Baluti Shale<br>Kurra chine –<br>- گلی خانە<br>- بێدوهی ، كەڤرێن ئاخێ<br>- مێرگا مێر بەرێ<br>جیری،مارل+كەڤز | - دەڤەرا چیازنرە و دەڤەرا چیاگارە<br>- پشكا باكوورێ پەسارا ئۆرە ونزدۆر وزنجیرا  هرۆر وگەلیسارکێ<br>-  باكوورێ گوندێ ئۆرە<br>- گوندێ بێدوهی باكوورێ چارچوڤێ كەلشتەیێن خشیایی<br>- زڤرۆكا ئۆرە یا چەماندی. |
| | ٢٧٠ | پێرمی PM | - چیازنری (سەرزنری)<br>بەرێ جیری + كلس | زنجیرا چیایێن دەست پێ دكەن ژ گوندێ پێدوهێ و ئۆرە هەتا گوندێ كێستە و بۆ گوندێ قومرێ نەخاسمە ل رەخێ باشووری و ژ رەخێ باكووری  بۆ گوندێن (ئەدنێ ، تشیش ، سەرەرو)، و ل داوییا باكوورێ ناحیا دێرەلۆكێ و رۆژهەلاتا ناحیا سندیا نەخاسمە ل دەوروبەرێن پێكهاتەیا جیولوجییا بەری وێ. |
| PALEOZOIC ژیانا كەڤن | ٣٥٠ | كاربونیCb | - هرۆر، بەرێ جیری + كلس<br>- ئۆرە، بەرێ جیری + كلس | - گوندێ هرۆر<br>- زڤرۆكا ئۆرە یا چەماندی ئەوا دكەڤیتە دەڤەرا باكوورێ كەلشتەیێن خشیایی. |
| | ٤٠٠ | بەراهیا یڤونی CD | - كێستە | - گوندێ كێستە ل پشكا باكوورێ دەڤەرا كەلشتەیێن خشیایی. |
| | ٥٠٠ | بەراهیا ئۆردوڤیشی | - بەرسپیكی Pirispiki Red Beds | - ناحیا كانی ماسێ ل باكوورێ رۆژئاڤایێ گوندێ كێستە |
| | ٦٠٠ | كامبری CD | -  پێكهاتەیا چەلكی یا ڤۆلكانی<br>- خابوور، بەرێ ئاخێ وكوارتز | -  باكوری گوندێ ئۆرە _باكوورێ رۆژهەلاتێ دێرەلۆكێ و باكوور و رۆژئاڤایێ كانی ماسێ و باكوورێ ناحیا سندی. |
| بەری كامبیری Pre-Cambrian | ٤٦٠٠ | بەری كامبری PC | - كەڤرێن ئاگری و گوهۆری | باكوورێ گوندێ ئۆرە |

**ژێدەر: ژ بەرهەڤكرنا ڤەكۆلەرانە، پشت بەستن ل سەر نەخشە و ژێدەرێن جیولوجی یێن خواندنێ.**

ژ نەخشەیێ جیولوجیيا هژمارە (١) دیار دبیت، کو پێکهاتەیا ڤێ خۆلا دەمیانە گەلەك یا بچویکە و ل دەڤەرێن بچویك دیار دبیت، وەکی مە ئاڤری دایێ پشکا باکووریێ رۆژئاڤایێ ناحیا دێرەلۆکێ و باکوور و باکووریێ رۆژهەلاتا ناحیا کانی ماسێ، دیسان ل باکووریێ رۆژهەلاتێ ناحیا سندییا دەردکەڤیت.

**ب- خۆلا دوماهیيا دیڤونی- دەستپێکا کاربونی**

ڤێ هەیامێ بەری (٤٠٥) ملیون سالا دەستپێکرییە، کو(٦٠) ملیون سالا ڤەکێشایە، د ڤی چەرخی دا ماسی بەلاڤبوون و زێدەبوون نەخاسمە د ئاڤا دەریا دا. بەلێ چەرخێ کاربونی بەری (٣٦٥) ملیون سالا دەستپێکرییە و بۆ چەرخێ (٦٥) ملیون سالا ڤەکێشایە، د ڤی چەرخی دا -گۆم (مستنقعات) و دەریایێن شێلێ دەرکەفتن[17].

هندەك دبینن کو پێکهاتەیا (بەرسپیکی، چالکی) ل چەرخێ دیڤونی نشتەبووینە، ژبەرکو رەنگێ بەرێن خویزی یێن سۆر ل هەمی دنیایێ وەکی ئێکن، نەخاسمە هەکە ئەم هەڤبەریکەین دگەل تەخێن چێبوونا (بەرسپیك و چەلکێ)[18]. جیولوجی دبینن کو ئەردێ عیراقێ یێ بلند بوویی، ژ ڤەرێژا کۆمەکا چیا و دەشتا چێبوویە، نەخاسمە ل بەراهیيا چەرخێ سلیوری هەتا داوییا چەرخێ دیڤونی (٩٥-١٠٠) ملیون سالا، ژبەر ڤێ چەندێ ئەو ڤان هەردو پێکهاتەیا ڤەدگەرینە سەر نشتەبوونا پێکهاتەیێن چەرخێ ئۆردەفیشی[19]. بەلێ چەرخێ کاربونی ئەم ژ پێکهاتەیێن (کێستە و ئۆرە و هرۆرێ) دبینین، ئەڤ پێکهاتە ل سەر تەخێن چەرخێ ئۆردەفیشی دا دگرن، دناڤبەرا وان دا روویەکێ نە رێکخستی هەیە[20]. دبیتە چەرخەك سەر ب چەرخێ سلیوری و دیڤونی ڤە، ژ سەخلەتێن کەڤرێن ڤی چەرخی پتریا جارا ژ کەرەستەیێن جیری و کەڤزێ پێکدهێن، زێدەباری هەبوونا هژمارەکا مەزنا کەلشتەیێن زێدە بچویك (مجهری) کو هاریکار بوویە بۆ دەرێخستنا ژیێ وان تەخا[21]. ژ گرنگترین پێکهاتەیێن دیارێن ڤی چەرخی:

**١- پێکهاتەیا کێستە،** بۆ جارا ئێکێ ئەڤ پێکهاتە ژ لایێ (ویتزل و مورتنی) ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتییە زانین، ل گوندێ کێستە پشکا باکووریێ دەڤەرا کەلشتەیێن خشیایی ل سەر رووبارێ خابووری، نەخاسمە ل سەر لێڤا رۆژهەلاتێ باکووریێ پارێزگەها دهۆکێ. ئەڤ پێکهاتە پشککرییە سەر دو پشکان:

أ- پشکا خوارێ کو ستووریيا وێ دگەهیتە نێزیکی (٣٥م)، ژ کەڤرێن سلتێن ئورجوانی پێکدهێن، پشکا مەزن ژ ڤان کەڤرا ژ رەنگێ کەسکێ، زێدەباری دەرکەفتنا سلتێ هشك دگەل تیڤەرێزەکا کوارتزی. ب رەنگەکێ گشتی تەخێن ژێك دابڕایی دناڤ دا هەنە.

ب- پشکا سەری ستووریيا وێ نێزیکی (٣٠م)، ژ سەخلەتێن ڤێ پشکێ دەرکەفتنا پرتێن بەرێ جیری یێ هشك ئەوێن رەنگێن ژێکجوداکەر هەین، ژ ڤەرێژا سەدەمێن سەقایی چێبووینە، قەبارەیێ حەپکێت وێ وەکی پەیسکا دەردکەڤن (ژ یێن بچویك بۆ مەزن یان بەروڤاژی) و بەرەڤ خوارێ ڤە دچن، وەکهەڤییەکا دناڤبەرا تەخێن سلتێ هشك و کەڤرێن خویزی دا هەی، هندەك چاڤکێن تەنك یێن کەڤرێن خویزی د بەرێ جیری دا هەنە.

هەبوونا کەڤرێن رەدایی (المدملکة) د شەنگستەیێن پێکهاتەیێ دا، دەرکەفتنا بەرێ جیری هەرچەندە نەیێ ڤەبرە، ڤێ چەندێ ژیێ ڤی پێکهاتەی نێزیکی دوماهیيا دیڤونی هەتا دەستپێکا کاربونی دیار کرییە.

**٢- پێکهاتەیا نیسەکا ئۆرە ura (کەڤرێن هشك)**

بۆ جارا ئێکێ ئەڤ پێکهاتە ژ لایێ (ویتزلی) ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتییە زانین، د چەپێن ئۆرەدا ئەڤێن دکەڤنە پشکا باکووریێ دەڤەرا کەلشتەیێن خشیایی، نێزیکی گوندێ ئۆرە ل ناحیا کانی ماسێ و نێزیکی توخیبێن ترکیا ل پشکا باکووریێ پارێزگەها دهۆکێ هاتینە دیتن. ئەڤ پێکهاتە ژ بەرێن هشکێن جیرێ یێن رەڤێن رەش پێکدهێت، کو کەڤرێن سەرەکینە د ئەڤی توخمی دا، زێدەباری دەرکەفتنا کەڤرێن سلتی

و مارلی و هەبوونا كەڤرێن ئەندامی نەخاسمە ژ رەگەزێ جێری، دیسان كەڤرێن خویزی یێن ژحەپكێن هویر چێببووین دیاردبن[22].

**٣- پێكهاتەیا هرۆر یا جیری یا Hirur**

بۆ جارا ئێكێ ئەڤ پێكهاتە ژ لایێ (ویتزل ومورتنی) ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتییە زانین[23]. ئەڤ پێكهاتە یا ل ناحیا كانی ماسێ گوندێ هرۆرێ هەی. پەسنا (وەسفا) ڤێ پێكهاتەیی هاتییەكرن، كو ژ كەڤرێن نوی یێن جیری و ئەندامی پێكدهێن، رەنگێ وان یێ رەشە، وەكی تەخێن بەروڤاژی نەدگەل كەڤرێن هشكێن رەق، ل پشكێن سەری و خوارێ. ستووریيا ڤی پێكهاتەی یا جودایە ژ جهەكی بۆ ئێكێ دی، ل دەڤەرێن نموونەیی دگەهیتە (٦٢م)، بەلێ ل هندەك دەڤەرێن دی ل عیراقێ دگەهیتە (١٠٠م). كاودانێ نیشتەبوونا وان دزڤریت بۆ نیشتەبوونێ ل ژینگەهێن كنارێن دەریای كو ئەو ژی گەلییان چێدكەت و هندەك ژ وان گەلیێن دەركەتینە، و یا هەڤدەمە دگەل تەخێن خوارێ ژ پێكهاتەیا ئۆرە[24].

ئەڤ پێكهاتە ل وان گوندان بەلاڤدبن یێن ب ناڤێن وان هاتینەناڤكرن ل پارێزگەها دهۆكێ، بۆ میناك پێكهاتەیا كێستە ل گوندێ كێستە هەیە، ئەڤا دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ ل سەر لێڤا خابووری یا هەڤتوخیب دگەل قەزا زاخۆ. پێكهاتەیا ئۆرە ژی ل باكوورێ گوندێ ئۆرە هەیە، ئەڤا دكەڤیتە نێزیك توخیبێن تركیا ل باكوورێ رۆژئاڤایێ قەزا ئامێدیی. دیسان پێكهاتەیا هرۆر یا جێری ئەڤا دكەڤیتە گوندێ هرۆرێ. هەمی پێكڤە دكەڤنە ناحیا كانی ماسێ.

**ت- خۆلا كاربونێ سەری- دوماهییا پێرمی:**

ئەڤ خۆلە ژ داوییا چەرخێ كاربونی دەستپێدكەت هەتا دگەهتە داوییا چەرخێ پێرمی، چەرخێ پێرمی بەری (٢٨٠) ملیون سالا دەستپێكرییە، بۆ دەمێ (٥٠) ملیون سالا ڤەكێشایە، دڤی چەرخی دا هندەك گیا و كێز دەركەفتن زێدەباری مار و ماسی و دەینەصورا[25]. ل داوییا چەرخێ كاربونی و بەراهییا چەرخێ پێرمی، ئەرد بلند بوو ڤێ چەندێ تێكهەلا نیشتەیا نەهێلا، پاشی ئەرد هێدی هێدی نزم بوو، هەتا كەفتییە دبن ئاڤا دەریایێ دا، جارەكادی ب رەنگەكێ رێكخستی و ل داوییا ڤی چەرخی، كریارا نیشتەبوونێ ل عیراقێ دەستپێكر[26]. هندەك پێكهاتەیێن دەركەفتی ل باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ- قەزا ئامێدیێ دیاربوون، نەخاسمە زنجیرا چیایێ هەڤتوخیب دگەل توركیا، دەستپێكا گوندێ بێدوهێ و ئۆرە هەتا گوندێ كێستە، پاشی بۆ رەخێ باشووری بەرەڤ گوندێ قومرێ، پێكدهێن ژ چیایێن هنداڤی گوندێن (ئەدنێ و تشتیشێ و سەرەرۆ). دیسان ل باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا دێرەلۆكێ و رۆژهەلاتێ ناحیا سندی، نەخاسمە ل دووڤ پێكهاتەیا جیولوجی ئەڤا بەری وێ هەی (نەخشەیێ هژمارە ١).

دبێژنە ڤێ پێكهاتەیێ پێكهاتەیا چیا ژێری، ستووریيا وێ ل هندەك جها پتری (٨٠٠م)، زێدەباری پێكهاتەیا زناری، ئەڤا بەربوونا ڤیوسلندی تێدا، تەخەكا تێدا ستووریيا وێ ژ بەرێن جیری دبیتە (٦٥م)، كو پشكا خوارێ یە ژ پێكهاتەیا چیا ژێری[27]. پێكهاتەیا چیا ژێری بۆ جارا ئێكێ ژ لایێ (ویتزل و مورتنی) ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتییەزانین، ل پشكا باكوورێ چەمیانا ئۆرە. ئەڤ پێكهاتە پشككرە سەر سێ پشكێن سەرەكی:

١- **پشكا سەری:** ستووریيا وێ (٣٣٨م)، سەخلەتێن سەرەكی یێن كەڤرێن وێ پرتێن كەڤرێن جێری ب رەنگێ شینەكێ تاری. ب رەنگەكێ گشتی كەڤرێن ئەندامی دگەل كۆمەكا كەڤرێن جێری یێن رەق، تەپلكەكا رەق پێكدئینن، ئەڤێن ل دەڤەرێن چیایی یێن بلند هەین، ل ڤێ پشكێ بەرێ ئاگری و گرانێتی (الصوان) هەیە، ستووریيا ڤێ پشكێ ژ بەرێ خویزی وێ (٢٥م).

٢- **پشكا ناڤەند:** ئەوا دبێژنێ (ئەندامێ ساتینایێ هەلمبووی)، ب رەنگەكێ سەرەكی ژ دولومایتی پێك دهێت، زێدەباری بەرێ بریشیای یێ بەستكری و تەپلكێن مارلی یێن بەستكری، دگەل تیڤەرێژێن بەرێن جیری، ئەڤێن دناڤ شەنگستێن ڤێ پشكێ دا هەین.

**٣- پشكا خوارێ:** ستووربیا وێ (٤٣٢م)، پێكدهێت ژ ئەندامێن بەرێ جیری یێ نوی، رەنگێ وی شینەكێ تاری یە، ژ حەپكێن هویرێن نیسەك دگەل كۆمەكا بەرێن جیری یێن سلتیێن رەق، كو لێڤێن تیژێن چیای چێدكەن، دگەل دەركەڤتنا تەختەكا كەڤرێن مەرجانی ل ناڤەراستا ڤێ پشكێ، ل ڤێرە هندەك تەختێن بەرێن هشك و رەق دهێنە دناڤدا، نەخاسمە ل شەنگستێن ڤێ پشكێ كو ستووربیا وان (٢٥م). ستووربیا نموونەیی یا پێكهاتەی (٨١١م)، بەلێ ل چەمیانا كێستە دبیتە (٥٠٠م)، ئەڤ گوهۆرینا د ستووربیا ڤێ پشكێ دا دەردكەڤیت، دبیت بۆ كەلشتەكا ئاسوویی (افقی) ڤەگەریت بەلێ ب رەنگەكێ ئاشكرا یا دیار نینە[٢٨].

### ٢- چەرخێ ژیانا ناڤەراست میزوزویك (Mesozoic).

پێكهاتەیا ڤی چەرخی دەڤەرێن بەرفرەهـ ژ باكوور و باكوورێ رۆژهەلاتێ عیراقێ (هەرێما كوردستانێ) ڤەدگرتن. نەخاسمە دەڤەرێن كەمەرا پەسارێن بلند و دەڤەرێن كەلشتەیێن خشیای[٢٩]. ئەڤ چەرخە دهێتە پشكرن بۆ ڤان دەمێن ل خوارێ:

**أ- دەمێ ترياسی:**

ئەڤ دەمە بەری (٢٣٠) ملیون سالا بوو، نێزیكی (٤٩) ملیون سالا ڤەكێشایە. ژ سەخلەتێن وێ چێبوونا دەریایا و دەریاچا، بەلێ كووراتیيا وان یا كێم بوو. ژیانا گیا و گیانەوەرا تێدا وەرارەكا مەزن كرییە[٣٠]. كەڤر و سەخلەتێن ڤی دەمی ل گەلەك جها ل پارێزگەها دهۆكێ ب رەنگەكێ تایبەت هاتینە دیتن، ل عیراقێ ژی ب رەنگەكێ گشتی، دیاردەكا (ظاهرة) بەربەلاڤە ل گەلەك جهێن پارێزگەهێ. پێكهاتەیا ڤی دەمێ جیولوجی، جوداهییەكا مەزنا د پشككرنا جوگرافی دا هەیە. بنێرە نەخشەیێ جیولوجیێ هژمارە (١). دیار دبیت، بەرفرەهترین دەڤەرێن وێ دكەڤنە دەڤەرێن (نێروە و رێكان) ل داوییا پشكێن باكوورێ رۆژهەلاتێ توخیبێن هەرێمێ، زێدەباری دەركەفتنا وێ ل ناڤەندێن زنجیرا چیایێ مەتینی ل ناحیا دێرەلۆكێ، دیسان دەست بدەركەفتنێ دكەت، ل (ناڤەندەكا) چیایێ گارەی باشوورێ ناحیا سەرسنكێ. دیسان دبیتە پشكەك ژ جیولوجییا ناحیا كانی ماسێ، نەخاسمە ل دەڤەرێن توخیبی، دەستپێك ژ باكوورێ گوندێ ئۆرە هەتا دگەهیتە باكوورێ گوندێ كێستە، دیسان زنجیرا چیایێ زناری ژی ڤەدگریت.

بەرچاڤترین كەڤرێن ڤەدگەرنە ڤی چەرخی، پێكهاتەیا (مێرگامێرە)، پێكهاتەیا وی ب رەنگەكێ گشتی بەرێ جیریێ مارلی دگەل كەڤز و بەرێ جیریێ یێ ئوتولیتی، سەخلەتێن وێ وەكی پێكهاتەیا بێدوهێ یە، ئەڤێ دكەڤیتە بن دا. بتنێ دناڤبەرا وان دا رێژا بەرێ جیری یان كەرەستەیێن ئاخێ جودانە[٣١]. ژ بەرچاڤترین پێكهاتەیێن ڤی كەڤری و ل دووڤ رێزكرنا دەمی:

**١- پێكهاتەیا مێرگامێر(Mirga Mir)**

بۆ جارا ئێكی ویتزلی ل سالا (١٩٥٠)ێ ئەڤ پێكهاتەیا زانی. ئەڤا دكەڤیتە دەڤەرا ئۆرە باكوورێ كەمەرا كەلشتەیێن خشیای، ستووربیا وێ ل كێمترین تلپێ وێ (٢٠٠م)، پێكهاتەكا كەڤری یە ژ بەرێ جیری و ب رەنگێن رصاصی و زەر[٣٢]. كەڤرێ مارلی ژ رەنگێ هشك و رەق و بریشایا و تەختێن خشیایی یە. پشتی هەلشكافتنا بەربوونا وێ هاتییەكرن، ئەڤ پێكهاتە ڤەدگەریتە چەرخێ ترياسێ خوارێ. كاودانێن نشتەبوونا وێ مینا پەسنێن كاودانێن دەریایی یە[٣٣].

**٢- پێكهاتەیا بێدوهێ (Beduh) (كەڤرێن رەق).**

بۆ جارا ئێكێ ویتزلی ل سالا (١٩٥٠)ێ ئەڤ پێكهاتە دیت. ل نێزیكی گوندێ بێدوهێ باكوورێ چارچۆڤێ كەلشتەیێن خشیایی[٣٤]. ستووربیا ڤێ تەخێ دناڤبەرا (٦٠-٧٠م)[٣٥]. ستووربیا وێ چەند ئەم بەرەڤ لایێ رۆژئاڤایڤە بچین زێدە دبیت، ل (دەرارێ) دگەهتە (١٠٠م). ئەڤ پێكهاتە گەلەك یا بەرچاڤە

ژ بەر وان رەنگێن تێدا هەین، وەكی قەهوائی و سۆر و بنەفشی، پێكدهێت ژ بەرێن جیری یێن هشك و بریشی، دیسان بەرێ جیری یێ بەلۆری ژی دگەل دایە، رەنگێ وی یێ رصاصی یە. ژێ ڤێ پێكهاتەیێ ل دووڤ ڤەكۆلینا بۆ تریاسێ خوارێ ڤەدگەریت. كاودانێن نیشتەبوونا وێ سەخلەتێن دەریایی یە[٣٦].

## ٣- پێكهاتەیا گەلی خانە (Geli Khana)

ژێ ڤێ پێكهاتەی ل عیراقێ ب رەنگەكێ گشتی، ڤەدگەریتە سەر تریاسێ ناڤەراست. بۆ جارا ئێكێ ویتزلی ل سالا (١٩٥٠)ێ دیار كرییە، ل باكوورێ گوندێ ئۆرە، باكوورێ دەڤەرا كەلشتەیێن خشیایی[٣٧]. ئەڤ پێكهاتە بۆ دو ئەنداما هاتییە پشككرن:

أ- ئەندامێ سەری: تێكهەلەكە ژ كەڤرێن جیری دلومایتی و كەڤرێن جیری یێن نەرم و ستوور، پێكهاتەیا لێڤێن چیایێ وان دتێژن، زێدەباری بەرێ جیریێ مارلی و گرانێتی.

ب- ئەندامێ خواری: دهێتە پشككرن بۆ سێ پشكا.

**پشكا خوارێ:** ژ كەڤرێن جیری یێن نیسەك ب رەنگێ زەر و رصاصی پێكدهێت، زێدەباری بەرێ جیری یێ بەلۆری برەنگێ قەهوائی، دیسان كەڤرێن هشك دگەل كەڤرێن خویزی.

**پشكا ناڤەراستێ:** ژ بەرێ جێری پێكدهێت، رەنگێ وی یێ رصاصی یە بەرەڤ زەری ڤە دچیت، كێم جار ژ كەڤرێ دلومایتی یان سلتی تێدا دیار دبیت.

**پشكا سەری:** ژ بەرێ نیسەكێ سلتی پێكدهێت، كێم جارا بەرێ مایكایی یە، رەنگێ وی یێ رەشە و هندەك جارا رصاصی بەرەڤ كەسكی ڤە.

## ٤- پێكهاتەیا كورا چینە (Kurra chine)

ویتزلی ل سالا (١٩٥٠)ێ ئەڤ پێكهاتە ل باكوورێ زڤرۆكا ئۆرە یا چەماندی دیتییە[٣٨]. ڤەرێژا ڤێ پێكهاتەیێ ل داوییا چەرخێ سیێ دەستپێكرییە، هندەك پشكێن وێ دبەرچاڤن، وەكی پەسارا باكوورێ ئۆرە و نزدۆرێ و زنجیرا چیایێ هرۆر و گەلی سارکێ[٣٩]. پێكهاتەیێن كەڤرێن وێ بەردەوام دكەڤنە بەر گوهۆرینا، نەخاسمە ب لڤینێن ستوونی و ئاسوویی. ئەو ژی كەڤرێن جیری یێن رەشن و سەر ب رەنگێ قەهوائیێ تاریڤە دچن، وەكی تەخێن پەحن و ستوورن دچنە دناڤێكرا دگەل كەڤرێن دولومایتی یێن ستوور، بێهنا وان گەلەكا نەخۆشە. هەردیسان كەڤرێن نیسەك و خوار ئەڤێن دكەڤنە باكوورێ زڤرۆكا كێستە یا نزمبووی، پشكا باشووری رۆژهەلاتی تەپلكێن دولومایتێ رەق پێكدهێن، بەلێ پشكا سەری كەڤرێن جیری و هشك پێكدهێن. پشكا رۆژئاڤایێ چەماندنا كێستە یا نزمبووی، هندەك تەخ تێدا دیاردكەن، وەكی ل خوارێ:

لایێ باكوری ژ پشكا خوارێ، پێكهاتەیا وێ بەرێن جیری یە، دولومایتێ وێ دحەلییت و چەند شكەفت چێكرینە كو نە ب شێوەیێ تەخانە. پشكا سەری ژ دولومایت و بەرێ جیری پێكدهێت، بەلێ ل ڤێرە تەخێن وان گەلەك دپەحنن و ستوورن، رەنگێ رصاصی بۆ رەشی د سەردا گرتییە.

پێكهاتەیا كوژیێ باشووری، ژدولومایتێ سپی و رصاصی پێكدهێت، زێدەباری كو تەخێن كەڤری گەلەك دپەحنن، ستووریا پێكهاتەیێ ژ جهەكی بۆ ئێكێ دی یا جودایە، ل جهێن نموونەی دگەهیتە (٨٣٤م)، ل هندەك جها ژی دگەهتە (٤٠٠م)، ل هندەك جها، نەخاسمە جهێن ناڤەراست دگەهیتە (١٢٠٠م)، گەلەك ژ دەڤەرا كەلشتەیێن خشیایی دگریت[٤٠].

## ٥- پێكهاتەیا بەلیتێ (Baluti)

بۆ جارا ئێكێ ویتزلی ل سالا (١٩٥٠)ێ ئەڤ جهە دیار كر، پاشی مورتنی ل سالا (١٩٥١)ێ بەحسێ وێ كرییە، ئەوا دكەڤیتە دەڤەرا چیایێ گارەی[٤١]. پشتی پێكهاتەیا بەری خۆ ل ستوونا جیولوجی دهێت، ژ سەخلەتێن وێ دەركەفتنا كەڤرێن تەقنێ، بەلێ ئەو تەخێن دكەڤنە بەر كاودانێن سەقای ل چیا ژێری ل پارێزگەها دهۆكێ، رەنگێ وان یێ زەیتوینی و كەسكە زێدەباری دەركەفتنا رەنگێ زەر، هندەك تەخێن تەنكێن بەرێ جیری و دولومایتی یێن هەین دچنە دناڤرا، ستووریا وان تەخا ژ (١٠سم) نابووریت، زێدەباری هەبوونا تەخێن تەنك ژ كەڤرێ برێشا بەلۆری،

گرۆڤەكە بۆ هەبوونا تەخا ئنهادارێت ژ كەڤندا[42]. ستووریا ڤێ تەخێ جوداهییەكا هەی ژ جهەكی بۆ ئێكێ دی، دگەهیتە دناڤبەرا ( ٤٣×٥٠م) ژ كەرتێن ژ سەرڤە، بەلێ كەرتێن ژناڤدا دناڤبەرا (٢٥×٨٠م)[43].

## ب_ دەمێ جۆراسی

ئەڤ دەمە ڤەدگەریتە بەری (١٨٠) ملیون سالا، بۆ دەمێ (٤٥) ملیون سالا ڤەكێشایە، جوداهییەك دناڤبەرا رەنگ و قەبارەیێ ژیانا گیانەوەرا و پێكهاتەیا جیولوجی دا هەبوویە[44]. ئەڤ دەمە خۆلا سیێ یە ژ رژیانا تێكهەلا دەریا تیشس. ئەڤ دەمە هاتییە پشككرن بۆ چەند قۆناغەكا، ئەوژی جوارسیێ زوی، پێكدهێت ژ كۆمەكا بەرێن جیری و كەڤزێ، ڤێكرا دهێن، داكو پشكا خوارێ ژ ڤی دەمی دروست بكەن، بەرچاڤترین پێكهاتەیێن وێ، پێكهاتەیا (سارکێ_ Sarki و سێكانیان Sehkanian ). ژ سەخلەتێن جوراسیێ ناڤەراست، دەركەفتنا كەڤرێن جیری و دگەل ڤیر و دولومایت و كەڤزێ، بەرچاڤترین پێكهاتەیا وێ (پێكهاتەیا سەرگەلو Sargelu) یە. جوراسیێ سەری ژ دو تەخێن بەربەلاڤ ل ژێر ئەردی دیار دبن، یا ئێكێ ژ كەڤرێن جیری و خویزی پێكدهێت، یا دووێ ژ كەڤرێن جیری و دلومایتی_كەڤزی، بەرچاڤترین پێكهاتەیا وێ (پێكهاتەیا ناوكلیكان_ Naokelekan) و باسارین (Basarin) و چیایێ گارە[45] (Chia Gara). پتریا ڤان پێكهاتەیان ب ناڤكرنا خۆ گرێداینە دگەل دەڤەرێن دكەڤنە پارێزگەها دهۆكێ.

پشككرنا جوگرافییا ڤان پێكهاتەیا ل ڤی چەرخێ جیولوجی جوداهییەكا مەزن یا هەی (بنێرە نەخشەیێ هژمارە ١)، دەڤەرا نێروە و رێكان بەرفرەهترین دەڤەرێن بەلاڤبوونا وێ نە، نەخاسمە ل پشكا باكوورێ رۆژهەلاتی ئەڤا هەڤتوخیب دگەل توركیا، دچارچۆڤێ ناحیا دێرەلوكێ دا. دیسان ل گەلەك دەڤەرێن زنجیرا چیایێ بشیشی و سەرێ ئامێدیێ هەتا گەلیێ رەشاڤا دهێنە دیتن، ل رۆژهەلاتی و ل هنداڤی بامەرنێ ژی دهێتە دیتن. دیسان ل زنجیرا چیایێ گارەی ژی دەردكەڤیت، نەخاسمە ل هەردو ناحیێن سەرسنك و چەمانكێ. دیسان پشكەكە ژ جیولوجییا دەڤەرا كانی ماسێ، ژ باكوورێ رێكا دچیتە ناڤ ناحیێ دا، زێدەباری كو دەركەفتنا وێ ل زنجیرا چیایێ پیرسی ل ناحیا دینارتە. بەرچاڤترین پێكهاتەیێن ڤی چەرخی ل دووڤ رێزكرنا دەمی ئەڤێن ل خوارێ نە:

### ١- پێكهاتەیا سارکێ (Sarki )

ل سالا (١٩٥٢)ێ بۆ جارا ئێكێ بەحسێ ڤێ تەخێ هاتییەكرن، ب رەنگەكێ بەرفرەهـ ل دەڤەرێن كەلشتەیێن خشیایی دەردكەڤیت، نەخاسمە ل پەسارێن بلند[46]. پشك دبنە سەر دو پشكا نەخاسمە ژ لایێ پێكهاتەیا وێڤە:

ا_ پشكا خوارێ، ژ پرتێن كەڤرێن جیری یێن دولومایتی پێكدهێن، تێكهەل دبن دگەل كەڤرێن نیسەك ستووریا وان (١٢٢م).

ب_ پشكا سەری، پێكدهێت ژ بەرێ جیری و كەتییە بەر گوهۆرینێ ژ لایێ كیماویڤە و بووینە شكەفت، دیسان پێك دهێت ژ بەرێ جیری یێ دولومایتی، ستووریا وێ ل جهێن نموونەیی (١٨م)، هەكە ئەم بەرەڤ رۆژئاڤایی ڤە بچین دبیتە (١٢٠م)[47].

### ٢- پێكهاتەیا سێكانیان (Sehkanian )

بۆ جارا ئێكێ ئەڤ پێكهاتە ژ لایێ (واتزل و مورتنی) ل سالا (١٩٥٠)ێ هاتییە دیتن، ل دەڤەرا پەسارێن نزم ل سۆرداشێ ل چیایێن چەماندی[48]. پشكا سەری و خوارێ ژ بەرێن دولومایت و دولومایتێ جیری پێكدهێن، زێدەباری بەرێ بریشیا. بەلێ پشكا ناڤەراستێ چەند كەلشتەیێن كەڤرێن جیری یێن ئەندامی تێدا هەنە، پشكا داویا بەلیتێ تێدا هەیە، رەنگێ وێ دناڤبەرا شینی بۆ رصاصییەكێ تارییە. د پشكا خوارێ یا چەماندنا ئۆرە یا نزمدا هەیە، زێدەباری چەماندنا كێستە یا تێك ئالیایی. چەند ئەم بۆ لایێ رۆژئاڤایی بچین ستووریا وێ پتر لێ دهێت، دگەهیتە (٩٠م) ل گوندێ بناڤیێ، ل ناڤەراستا دەڤەرا چەلكێ دگەهیتە (١٤٠م)[49].

### ٣- پێکهاتەیا سەرگەلۆ (Sargelu)

ئەڤ پێکهاتە ل چەرخێ جوراسی یا ناڤەراست رژیایە، ژ سەخلەتێن وی هەڤسەنگیەك د پێکهاتەیا کەڤری دا هەیە. ژ هندەك پرتێن رەشێن بەرێ لایمستوونێ ئەندامی و پرتێن شیلی (بۆیاغەکا کەسکە ژ چیکێن سفرێ ترش چێدبیت_ وەرگێر) پێکدهێت، زێدەباری هێلێن نەرم ژ جیرێ رەش، نەخاسمە ل پشکا سەری[٥٠]. ستووریا وی ل دەڤەرا بناڤیێ دناڤبەرا (٦٠-١٠٠م)، بەلێ ل دەڤەرێن نموونەیی ستووریا وی پتر لێ دهێت هەتا دگەهیتە (١١٠م). ل تەخا خوارێ ژ بەرێ جیری پێکدهێت، ل دەڤەرا بناڤیێ و پەسارا ئۆرە، زێدەباری تێکئالیایا کێستە، ل بنی دولومایتێ تاری هەیە ئەڤا ل دەڤەرا چەلکێ و هرۆرێ بەربەلاڤ.

### ٤- پێکهاتەیا ناوکلیکان (Naokelekan)

ل جهێ نموونەیێ تێکئالیانا چیایێ گارەی دەردکەڤیت، ئەڤ پێکهاتە ژ سێ پشکا پێکدهێت:

أ- پرتێن بەرێ جیری یێ هشك، تێکهەل دبیت دگەل کەڤرێ هشکێ ڤیری و کەڤرێ جیری یێ هویر.

ب- بەرێ جیری یێ دولومایتی، ژ بەرێن هویر کو گەلەك کەلشتە تێدا هەنە پێکدهێت، دبێژنە ڤێ پشکێ تەخ.

ت- دولومایت و بەرێ جیری کو ژ ناڤدا گەلەك ڤیر هەیە، تێکهەل دبیت دگەل ئاخەکا رەش، پتریا جارا دبێژنێ (تەخا رەژیێ). ل دەڤەرێن نموونەیی ستووریا وێ دگەهیتە (٣٠م)، نەخاسمە ل دەڤەرێن تێکهەلی و کەلشتەیێن خشیایی، دبیت نشتەبووینە ژینگەهەکا ژەهرکری[٥١].

### ٥- پێکهاتەیا بەرسیرین (Barsarin)

جیولوجیناس دبینن کو نیشتەبوونا ڤێ پێکهاتەیێ، د بنیاتدا دووڤچوونا تەخێن جیری کیمایی و دولومایتی دگەل تەخێن ئنهایداریت. بەلێ نیشتەبوونا خوێ بۆ ئەگەرا شکەستنا ڤان بەرێ جیری ئەڤێن دیار، نەخاسمە پشتی کو خوێ حەلیایی[٥٢]. ستووریا ڤێ پێکهاتەیێ (٢٠م)، پشکا خوارێ ژ ڤێ پێکهاتەیێ دبیت مە بەتە سەر تەخێن هویرکێن ئاسنی[٥٣]. ئەڤ پێکهاتە ل پاریزگەها دهۆکێ ل هەردو دەڤەرێن بانکا و چەلکێ یا هەی[٥٤].

### ٦- پێکهاتەیا چیایێ گارەی (Chia Gara)

ئەڤ پێکهاتە بتنێ پشکا سەری یا چەرخێ جوراسی نینە، بەلکی دچیتە دناڤ بەراهیيا چەرخێ کریتاسی ژیدا. کەڤرێن وێ ژ رەنگێ کەڤزی و کلسی نە، نەخاسمە کو بەربووون ب سەر دا هاتییە[٥٥]. بۆ جارا ئێکێ پەسنا ڤێ پێکهاتەیێ ل ڤەچەمیانا چیایێ گارەی هاتییە دیتن، نەخاسمە ل دەڤەرێن بلندێن تێك ئالیایی، پشك دبیتە:

أ- پرتێن بەرێن جیری یێن ب تەخێن کێم دگەل کلسی کو ناڤەرۆکا وان کۆمبوونا قەلپیچکێن دەریایی نە.

ب- بەرێ جیری یێ سۆتی و تێکهەلبوونا سۆتنێ دگەل بەرێن هشك، تەخێن سەری هندەك جارا ژ بەرێن هشکێن خویزی پێکدهێت، ستووریا پێکهاتەیێ دگەهیتە (٢٣٠م)[٥٦]. ئەڤا ل خوارێ ستوونێ تەخێن جیولوجی یە ل ئێك ژ دەڤەرێن پاریزگەها دهۆکێ (خشتەیێ هژمارە ٣).

### ت- دەمێ کریتاسی

دبێژنە ڤی چەرخی (تەباشیری) ژبەر هەبوونا رێژەکا بلند ژ نشتەیێن کلسی تێدا، نەخاسمە ئەوێ دبێژنێ تەباشیری ل گەلەك دەڤەرێن دنیایێ، ئەڤ دەمە بەری (١٣٥) ملیون سالا دەستپێکرییە، بۆ چەرخێ (٧٠) ملیون سالا ڤەکێشایە، ژ سەخلەتێن ڤی دەمی سەرداگرتنا دەریا ل سەر هشکاتیێ، ژبەر ڤێ چەندێ گەلەك نشتەیێن دەریایی بەلاڤبوون، زێدەباری تێکهەلێن کیشوەرا. بەری ب داوی هاتنا ڤی دەمی، گەلەك لڤینێن ئەردی چێبوون، بۆ ئەگەرێ بلندبوونا تێکهەلێن دەریایی و شیان گۆمێن دەریایێ تژی بکەن، ژبەر ڤێ چەندێ چیا چێبوون[٥٨]. ئەم ئاڤری دکەین ژ نەخشەیێ جیولوجی یا هژمارە (١)، پێکهاتەیا ڤی چەرخی پتریا دەڤەرێن ناحیا دێرەلۆکێ ڤەدگریت، نەخاسمە دەڤەرا نێروە و رێکان، ئەم ب روهنی ل زنجیرا چیایێ مەتینی ل ناحیا بامەرنێ دبینین، زێدەباری هەردو رەخێن چیایێ گارەی

**خشتەیێ هژمارە (٣)**

**ستوونێن تەختێن بەری ل دەڤەرا بانکا (ناحیا بامەرنێ) قەزا ئامێدیێ ل پارێزگەها دهۆکێ[٥٧]**

| چەرخێ درێژ (الحقبة) | چەرخ (العصر) | دەم (الفترة) | پێکهاتە (التكوين) | پەحنی (السمك) | پەسنا کەڤری (الوصف الصخري) |
|---|---|---|---|---|---|
| MESOZOIC | Cretaceous | Valangian | Garagu | ٢٥ | رەنگێ وێ وەکی HCL پێکدهێت ژ خرڤەبوونا سلیکا و تێکهەل نابن دگەل ئاخەکافەکریە |
| | | | | | تەختێن پەحن ژ لایمستوونی ئەڤێ رێژەکا بلند ژ مەتالێ لیمونایتی تێدا و پێکدهێت ژ کووراتیێن جیری و برەنگێ زەر_ پرتەقالی. |
| | | | | | تەختێن پەحن ژ ساندستوونێ ئاسنی و ب رەنگێ سۆرێ ڤەبووی. |
| | | | | | تەختێن پەحن ژ لایمستوونی ئەڤێ رێژەکا بلند ژ مەتالێ لیمونایتی تێدا و پێکدهێت ژ کووراتیێن جیری و ب رەنگێ زەر_ پرتەقالی. |
| | | Berriasian | Chia Gara | ١٢٢,٥ | ژ بەرێ جیری یێ گەلەك رەق پێکدهێت کو چەند مەتال دناڤدانە رەنگێ وێ یێ قەهوایی یە بەرەڤ رصاصی ژ بەر هەبوونا کەرەستەیێن خویزی تێدا. |
| | | | | | دولومایت پێکدهێت ژ کۆمەکا کەرەستەیێن ئەندامی ب رەنگێ رصاصی. |
| | | | | | مارلێ رصاصی ب بەربوویی دناڤدایە هەنە و دژوار دگەل HCL تێکەل دبیت ئەو ژ سەنگا تلپێن بلندە |
| | | | | | بەرێ جیری یێ رەنگ قەهوایی کو ڤێ دناڤدایە زێدەباری بەربوونێ و کەرەستەیێن ئاخێ و تەختەکا حەپکێن سلتی و کەڤرێ جیری یێ رصاصی کو گەلەك تێکهەلی ڤیری بوویە. |
| | | | | | مارلەکێ رەنگ رصاصی ژ ب بەربوویان پێکدهێت. |
| | | | | | تەختێن بەرێ جیری ب رەنگێ رصاصیەکێ گرتی و تەختێن کەرەستەیێن ئەندامی و شیل |
| | | | | | بەرێ جیری یێ رەش و تێکهەل دگەل کەرەستەیێن ئەندامی یێ رەق و ئێککرتی و دگەل تەختێن شیلی و کەرەستەیێن ئەندامی یێن رەنگێ رەش. |
| | Jurassic | Tithonian | Basarin | ١٣ | دولومایتێ رصاصی یێ گرتی و ژ تلپێن بلند. |
| | | | | | بەرێ جیری یێ رصاصیێ گرتی و پویچەك ژ کەرەستەیێن ڤیری و خودان دێمەکێ زڤرە و نیڤ رەقە و پێك دهێت ژ کەرەستەیێن ئەندامی |
| | | Oxforddian | Naokelekan | ١٩ | بەرێ جیری یێ دلومایتی کو تێکهەلە دگەل هندەك کەرەستەیێن ئاخێ و دولومایتێ تێکهەل دبیت دگەل HCL و رەنگێ وی یێ رصاصی یە |
| | | | | | بەرێ جیری یێ رەش دگەل رەژێ و ب دژواری تێکهەل دبیت دگەل HCL |
| | | Bathonian | Sargelu | ٦٠ | دولومایتێ رصاصی یێ گرتی و تێکهەل نابیت دگەل HCL یان ژ هندەك تەختێن جیری پێك دهێت و مەتالێ بارایت تێدا هەیە |

ڤەدگریت، دەڤەرێن باشووریٚ ناحیا چەمانكیٚ، ل سەر رووبەرێن بچویكتر ل دەڤەرێن ناڤەراست و باكووریٚ رۆژهەلاتا ناحیا كانی ماسیٚ. زێدەباری ڤیٚ چەندیٚ دهێتە دیتن ل ناحیێن سندی و گولی ل قەزا زاخۆ، ل زنجیرا چیایێ شەرانش و زنجیرێن نێزیكی ویٚ دهێتە دیتن، دیسان ئەڤ چەرخە ل زنجیرا چیایێ پیرسی و ئاكریٚ و باكرمان و زاویتە ژیٚ دەردكەڤیت. بەرچاڤترین پێكهاتیێن ڤی چەرخی:

**١- پێكهاتەیا گەرەگو Garagu**

بۆ جارا ئێكی پەسنا ڤیٚ پێكهاتەیێ ژ لایێ (ویتزل)ی ل سالا (١٩٥٠)یٚ هاتییەكرن، كو دكەڤیتە كەمەرا پەسارێن بلند ل هەرێما كوردستانا عیراقیٚ، نەخاسمە ل پەسارێن چەماندیێن چیایێ گارەی[59]. ژ بەریٚ جیری یێ زڤر دگەل مارلی پێكدهێت، كەڤریٚ مارلی و خویزی ژ سەرڤە، دگەل بەریٚ جیری یێ نوی و ئەندامی ل ناڤەراستیٚ. ستووریا ڤیٚ پێكهاتەیێ دناڤبەرا (٢٠٠-٢٣٠م).

**٢- پێكهاتەیا سارمورد Sarmord**

پێكهاتەیا ویٚ وان كەڤرا ڤەدگریت، ئەڤێن ژ ژینگەهەكا سەرڤە بۆ ژینگەهەكا ئاڤێن كوور چێبووی، ل چەرخیٚ دناڤبەرا بریاسی هەتا ئەبیتیانی. (بوادی_دیارە ئەو كەسە یێ ئەڤ پێكهاتە ڤەكولای) پێشنیاركرییە كو ببیتە سارمورديٚ سەری و خواریٚ، ئەو ژ ئاخەكا شین یا سەر ب رەنگیٚ قەهوایی ڤە دچیت، دگەل هاتنە ناڤا كەڤریٚ جیری یێ نرتی[60].

**٣- پێكهاتەیا بالمبو Balambo**

ناڤیٚ ویٚ ژ چیایێ بالمبو ئەڤیٚ ل دەڤەرا قەزا هەلەبچە هاتییە. ژ كەڤرێن ستوورێن كلسی پێكدهێن، زێدەباری تەخێن ئاخیٚ و كەڤزیٚ و چەندین ب بەربووویان ژوانا فورامنفیرا و رادیولاریا[61]. هاتییە پشككرن بۆ دو پشكا، پشكەك پێك دهێت ژ كەڤرێن جیری و مارلیٚ رەنگیٚ شینیٚ گرتی و شیلی، پشكا سەری ژ كەڤرێن جیری پێك دهێت. پێكهاتەیا ویٚ ل دەڤەرا رێكانییا دهێتە دیتن[62].

**٤- پێكهاتەیا قەمچوقە Qamchuqa**

پشكەكا مەزن ژ ئەردیٚ عیراقیٚ و هەرێما كوردستانیٚ ڤەدگریت، بەرچاڤترین دیاردەیا (ظاهرة) ئەردی یە و پێكهاتەیا كەڤرێن ویٚ قەلپیچكیٚ (قشرة) پتریا چیایێن گرنگ پێكدئینیت، ژبیٚ وی بۆ ناڤەراستا چەرخیٚ گریتاسی ڤەدگەریت[63]. ژ پەسارێن دژوارێن كەڤرێن دولومایتی پێك دهێت، كەڤرێن ویٚ د رەق و پەحنن، ل پتریا دەڤەرێن بەلاڤبوونا ویٚ لێڤێن پەسارێن زنجیرا چیایا پێكدئینن، نەخاسمە وان زنجیرا چیایا ئەڤێن بۆ ڤی چەرخی ڤەدگەرن[64].

**٥- پێكهاتەیا كومیتان Kometan**

بەرفرەهترین پێكهاتەیا تیورونیانە ل هەرێما كوردستانا عیراقیٚ بەربەلاڤ. بۆ جارا ئێكیٚ ژ لایێ (دومینكتونی) ل سالا (١٩٥٣)یٚ هاتییە بەحس كرن، پێكهاتەیا ویٚ ژ تەخێن جیری و كسلی چێبوویە، ئەڤ پێكهاتە یا هاتییە چارچۆڤەكرن ل نێزیك گوندیٚ كومیتان، نەخاسمە ل داوییا چارچۆڤیٚ پەسارێن بلند دەستنیشانكرن[65].

**٦- پێكهاتەیا مێرگیٚ Mergi**

ئەڤ پێكهاتە بۆ ژبیٚ تورونیانی ڤەدگەریت. ژ بەری جیری و كسلی پێكدهێت، دگەل پێكهاتەیا بێخمە و شەرانش تێكهەل دبیت نەخاسمە ل هندەك دەڤەرێن كەمەرا پەسارێن بلند ل هەرێما كوردستانا عیراقیٚ[66].

**٧- پێكهاتەیا بێخمە Bekhma**

ئەڤ پێكهاتە ژ تەخێن ستوورێن جیری و پاشی كەڤریٚ مارلی و مارلی یێ لایمستوونی پێكدهێت، دگەل هەبوونا كڤان و تیڤەرێزەكیٚ ژ جیری. ئەڤا ل پشكا خواریٚ دهێتە دیتن، ژ لایمستوونیٚ بەرهەڤ بۆ رەڤبوونیٚ پێكدهێت، تەخێن تەنك ستووریا وان یا ناڤەراستە، باندۆرا كریارێن پەسارێن بچویك ل سەر دیارە، ستووریا ڤیٚ پێكهاتەیێ نێزیكی (٢١٠م)[67]. ئەڤ پێكهاتە ل ناڤەندا پەسارێن چەمیایی ژ زنجیرا چیایێ گارەی و مەتینی هەیە. ژ سەخلەتێن كەڤرێن ویٚ گەلەك د رەڤن زێدەباری رەنگیٚ وان یێ رصاصی

یان رصاصیێ ڤەبووی[68]. دیسان ژ سەخلەتێن وێ دەركەفتنا ب بەربوویێن (متحجرات) فورامنفیریێن مەزن یێن ب بلافتوزیا هاتینە ناڤكرن كو چەندین كەرەستەیێن ڤیری تێدا هەنە، نەخاسمە ل تەخێن سەری، بەرێ جیری یێ ڤێ پێكهاتەیێ وەكی تلپە پێكدهێت، دیسان شكەفت ژی تێدا هەنە، ژبەر ڤێ چەندێ ژ لایێ هێدروجینی ڤە دبێژنێ[69](Kardtic Formation).

## ٨- پێكهاتەیا هدێنە Hadiena

پێكهاتەیا وێ بۆ چەرخێ كریتاسێ سەری ڤەدگەریت، ژ بەرێن گرۆڤرێن جیری و هیماتایتی پێكدهێن. ل دەڤەرێن ناڤەراستا گوندێ هدێنە و ئۆرە ل ڤەزا ئامێدیێ بەرچاڤ دكەڤیت، ئەڤ پێكهاتە دهێتە گوهۆرین چەند ئەم بەرەڤ پێكهاتەیا چەلكی و بانكا ڤە بچین كو دبیتە پێكهاتەیا شەرانش[70].

## ٩- پێكهاتەیا شەرانش Shiranish

ئەڤ پێكهاتە بەربەلاڤترین پێكهاتەیا خۆلا كامبانیێ سەری ماسترختی یە ل عیراقێ. ستووریا وێ دناڤبەرا (٥٠-١٠٠م)، ژ دو پشكێن سەرەكی پێكدهێت، پشكا خوارێ ژ تەخێن ستوورێن تەنك و ناڤەراست یێن بەرێ جیری و مارلی پێك دهێت، رەنگێ وان یێ سپی یە بەرەڤ رصاصیەكێ ڤەبووی، كریارێن رهیان و سەقای ب سەردا دهێن، ژ سەخلەتێن وێ تەخێن وێ گەلەك د رێكخستی نە زێدەباری دەركەفتنا چەند جها ئەڤێن دێ كەڤنە بەر شكەستنێ و هەبوونا كڤانێن ئاسنی. بەلێ پشكا سەری ژ تەخێن هشكێن مارلێ لایمستوونی و مارلێ رەنگ شین پێكدهێن، رەنگێ وان رصاصیبەكێ گرتییە، پتریا جارا هندەك تەخێن تەنك ژ كەڤرێ هشكاتی تێدا هەیە[71]. دهێتە دیتن ل دەڤەرێن پەسارێن بلند ل زنجیرا چیایێ (گارە و مەتین)ی، دیسان ل زنجیرا چیایێ شەرانش و پیرسی بەرچاڤ دكەڤیت[72].

## ١٠- پێكهاتەیا ئاكرێ Aqra

ئەڤ پێكهاتە بۆ ماسترختیێ ناڤەراست_ ماسترختیێ سەری ڤەدگەریت، دهێتە دیتن ل پەسارێن چەماندیێن زنجیرا چیایێ (گارە و مەتین)ی، ژ كەڤرێن جیری یێن رێكخستی پێكدهێت، ستووریا وان گەلەكە بەرەڤ تلپەبوونێ ڤە دچن. ژ سەخلەتێن كەڤرێن وێ گەلەك درەڤن و رەنگێ وان یێ رصاصی یە بەرەڤ رصاصیەكێ ڤەبووی دچیت، چەماندنا وێ دگەهیتە (٨٠نمرا) ل باهرا پتر ژ پەسارا. حەپكێن پێكهاتەیا وێ دنەرمن، ستووریا وێ ل دەڤەرێن نموونەی دگەهیتە (٣١٥م)[73]. ئەڤ پێكهاتە ل گەلەك دەڤەرا یا بەلاڤە ژ وان گەلی زەنتە و بێخمە و دزە و زێبارێ و زێدەباری چەلكێ و ئامێدیێ و هدێنە[74].

## ١١- پێكهاتەیا ئنجانە یا كەڤن

ئەڤ پێكهاتەیا نوی، ڤۆناغا ڤەگوهاستنێ یە ژ ژینگەها توخیبكریا دەریایی بۆ ژینگەها كیشوەری. ژ پێكهاتەیێن كەڤری یێن ژێك جودا پێكدهێت، پتریا وان كەڤرێن ئاخێ یێن رەنگێ سۆرن یان رەنگێ خەلوزی یێ ئاخێ، یان كەڤرێن تەڤنی یان كەڤرێن رەملی یێن سۆر، ستووریا ڤێ پێكهاتەیێ یا ژێك جودایە، ل هندەك دەڤەرێن پێكهاتیێن ڤێ ڤۆناغێ ل پارێزگەهێ دگەهیتە (٨٠٠م)[75].

## ٣- چەرخێ درێژێ ژیانا نوی CENOZOIC

ئەڤ چەرخە پشك دبیتە سەر دو پشكێن سەرەكی، یێ ئێكێ تەرشری یە(Tertiary) و یێ دووێ چواری یە[76] (Quaternary). چەرخێ تەرشری ژی ب خۆ ژ چەند دەمەكا پێكدهێت، ژ وان بالیوسینی كو بۆ دەمێ (٥) ملیون سالا ڤەكێشایە، چەرخێ ئایوسینی كو بۆ دەمێ (٢٢) ملیون سالا ڤەكێشای، چەرخێ ئولیگوسین كو بۆ دەمێ (١١) ملیون سالا ڤەكێشای، چەرخێ مایوسینی ئەڤێ نێزیكی (١٢) ملیون سالا ڤەكێشای، چەرخێ بلوسینی ئەڤێ نێزیكی (١٣) ملیون سالا ڤەكێشای و دبێژنێ دەمێ سیێ، بەلێ یێ چوارێ دەمێ بەستی (جلیدی) یێ پلاستیوسینی و دەمێ نوی یێ هلیوسینی پێكدئینیت. ڤێ چەرخی بەری نێزیكی ملیون سالا دەست پێ كرییە[77]. ژ نەخشەیێ جیولوجیێ هژمارە (١) دیار دبیت، كو پێكهاتەیێ ڤان هەردو چەرخا ل گەلەك

دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ دیار دبن، نەخاسمە پشکێن مەزن ژ ناحیێن (بامەرنێ و سەرسنکێ و کانی ماسێ و چەمانکێ) پێکدئینیت، زێدەباری رووبەرێن کێمتر ل ناحیا دێرەلۆکێ و ناحیا ناڤەندا ئامێدیێ و زنجیرا چیایێن مەتینی و گارەی، دیسان ل زنجیرا چیایێن دکەڤنە ناحیا گولی و سندیا بەرچاڤ دکەڤن، دیسان ل زنجیرا چیایێ بێخێر و سپی و زنجیرا چیایێن قەزا دهۆکێ و چیایێ زاوا و چیایێ ئەتریش و شێرمان و زنجیرا چیایێ ئاکرێ و باکرمانێ. ژ بەرچاڤترین ڤان پێکهاتەیا ئەڤێن ل خوارێ نە:

## أ - دەمێ بالیوسینی:

دگەل دەستپێکرنا ڤی دەمی، ئاڤا دەریایێ ب سەر هشکاتیێ کەفت و ئەرد بن ئاڤ کر، ژبەر نزمبوونا دژوارا هندەك پشکێن هەرێما کوردستانا عیراقێ، ژ ئەگەرێ لڤینێن ستوونی ئەڤێن ژ قەلپیچکێ ئەردی دا چێبووین. لڤێرە تەخێن تێکهەلا بەرڤ نیشتەبوونێ ڤە چوون بۆ دەڤەرێن ئاڤێ گرتین[78]. ل دووڤ نەخشەیێ جیولوجیێ هژمارە (١) پێکهاتەیا ڤی دەمی ل ناحیێن (گولی و سندی و زاخۆ) ل قەزا زاخۆ دەردکەڤن، زێدەباری ناحیا مانگێشکێ ل قەزا دهۆکێ و ناحیا باتێل و سێمێلێ ل قەزا سێمێلێ بەرچاڤ دکەڤن، دیسان ل ناحیا ئەترووشێ ل قەزا شێخان ژی دیار دبیت، دیسان ل ناحیێن بجێل و گردەسین و ئاکرێ ل قەزا ئاکرێ دەردەکەڤیت، هەر دیسان ل ناحیێن قەزا بەردەرەش ژی دیار دبیت. ژ بەرچاڤترین پێکهاتەیێن وێ:

### ١- پێکهاتەیا کولوش Kolosh

وەکی تیڤەرێزەکێ ل باکوورێ رۆژئاڤای بەرەڤ باشوورێ رۆژهەلاتی دەردکەڤیت، ل دووڤ تیڤەرێزا کەمەرا زنجیرا چیایی دچیت، ل گەلەك جها دهێتە دیتن ژ هەمیا بەرچاڤتر دەڤەرا بانکا یە، ستووریا ڤێ پێکهاتەیێ (٤٥٠م). ب رەنگەکێ گشتی ژ تەخێن رەشێن دووڤ ئێکدا پێکدهێت، نەخاسمە ژ کەڤرێن سلت و خویزی و هشك، زێدەباری دەرکەڤتنا چەند کەڤرێن جیری ل سەرێ ڤێ پێکهاتەیێ. د ڤێ پێکهاتەیێ دا چەند دیاردەك یان پێکهاتەیێن تێکهەلێن نیشتەیی بەرچاڤ دکەڤن، نەخاسمە ل هندەك تەخێن وێ وەکی تەپکێن خویزی و پێکهاتەیێن درێژ دیار دبن[79].

### ٢- پێکهاتەیا خۆرمالە Khurmala

ئەڤ پێکهاتە ڤەدگەریتە بەرمایێن داویا چەرخێ گریتاسی، ژ تێکهەلێن لیڤێن دەریایا چێبووینە[80]. ئەڤ پێکهاتە ل هندەك دەڤەرێن پەسارا دهێتە دیتن. ژ سەخلەتێن وێ ستووریا وێ یا ژێکجودایە، ژبەر لڤینێن لایەکی، ژ بەرێ جیری ل دەڤەرێن ستووریا وانا کێم پێکدهێت، بەلێ ل دەڤەرا ستووریا وان پتر وەکی تلپەکی دەردکەڤیت ژ حەپکێن بەری و بەرێ گرۆڤر[81].

### ٣- پێکهاتەیا شنگارێ Singar

بۆ جارا ئێکێ (کلر)ی ل سالا (١٩٤١)ێ بەحسێ ڤێ پێکهاتەیێ کریە، نەخاسمە ل چیایێ شنگارێ کو گەلەکا بەربەلاڤە. ژبەرێ جیری پێکدهێت، ژ سەخلەتێن کەڤرێن وێ دیمێ کەڤزێ و دیمێ ئیغونی یێ لولەیی ل هندەك پشکێن وێ دیار دبیت، پاشی بووینە کەڤرێن گرۆڤر، ستووریا وێ دناڤبەرا (١٠٠_٢٠٠م)، بەربوونێن رەنگێ فورانفیرا یێن مەزن لێ دیار دبن، زێدەباری کەڤزێ و پتریا جارا ل سەر پێکهاتەیا شەرانش ل دەڤەرێن چیایی دەردکەڤیت.

### ٤- پێکهاتەیا ئەلیجی Aaliji

ئەڤ پێکهاتەیا کۆما کەڤری ژ هەمی پێکهاتەیێن خۆلا بالیوسینی و ئایوسنی بەربەلاڤترە ل عیراقێ. پێك دهێت ژ ئاخەکا رەنگ خولیکی(رەمادی) کو رەنگێ وێ قەهوایەکێ ڤەبوویە دگەل بەرێ جیری یێ ئاخا هشك[82]. ئەو ب رەنگەکێ نەرێکخستی دکەڤیتە سەر پێکهاتەیا شەرانش، بەلێ پێکهاتەیا وێ ژ تێکهەلێن نیشتەیێن دویری لیڤێن دەریا بالیوسینی و بەراهیا ئەیوسینی یە. بەربوویێن رەنگێ فورانفیرا تێدا هەنە، زێدەباری تێکهەلبوونا ڤێ پێکهاتەیێ و پێکهاتەیا شنگارێ[83].

**ب- دەمێ ئایوسینی**

پێكهاتەیا ڤی دەمی دەڤەرێن بەرفرەهـ ژ دهۆكێ ڤەدگرن (بنێرە نەخشەیێ جیولوجی)، نەخاسمە پشكێن مەزن ژ ناحیێن (بامەرنێ و سەرسنكێ و كانی ماسێ و چەمانكێ)، رووبەرێن كێمتر ژ ناحیا دێرەلوكێ و ناحیا ناڤەندا ئامێدیێ، زێدەباری زنجیرا چیایێ گارە و مەتینی و زنجیرا چیایێن ناحیا گولی و سندیا، دیسان زنجیرا چیایێ بێخێری و سپی و زنجیرا چیایێن قەزا دهۆك و زاوا و چیایێ ئەتریش و شێرمان و چیایێن ئاكرێ و باكرمان. بەرچاڤترین پێكهاتەیێن وێ:

**١- پێكهاتەیا پلاسپی Pilaspi**

ژ سەخلەتێن ڤێ پێكهاتەیێ، گەلەك گەلیێن بلند لێ هەنە كو كومتێن چیایا چێدكەن، ژبەر دژواریا رەقاتیا كەڤرێن وێ، پێكدهێت ژ كەڤرێ جیری یێ رەق زێدەباری كەڤرێ جیری یێ تەباشیری و دولومایتی، ستووریا ڤێ پێكهاتەیێ (٤٠٠م)[٨٤]. دهێتە دیتن ل چیایێ شێخان و چیایێن هنداڤی دهۆكێ، زێدەباری چیایێ بێخێر[٨٥].

**٢- پێكهاتەیێ جركسی Gercus**

ژبەر لڤینا ئایوسینی ئەڤ پێكهاتە دكەڤیتە كوما نیشتەی ل باكوورێ عیراقێ، ل پارێزگەها دهۆكێ ژی یا هەی كو دبێژنێ (تەخێن سوورێن دهۆكێ). پێكدهێت ژ كەڤرێن هشكێن سوور و كەڤرێن ئرجوانی و زێدەباری كەڤرێن ئاخێ یێن خویزی و دگەل حەصو و خویزی و كەڤرێن گرۆڤر و چاڤكێن بچویكێن گێچێ، ستووراتیا ڤێ پێكهاتەیێ ل دەڤەرێن نموونەیی (٤٥٠م)[٨٦]. دگەل هەبوونا تەخێن كونكلومرایتی و تەخێن گێچێ، وەكی ئەزمانا دیاردبن و بڤان تەخا دهێتە جوداكرن دگەل پێكهاتەیا پلاسپی[٨٧].

**٣- پێكهاتەیا ئاڤانە Avanah**

وەكی برگەكا نموونەی ژ كەڤرێن جیری پێكدهێت و پتریا جارا د زڤرن یان د گرۆڤرن، تێكهەل دبن دگەل كەڤرێن سوورێن جیری، د ئەزمانێن ڤێ پێكهاتەیێ دبنە پێكهاتەیا پلاسپی[٨٨]. ئەڤ پێكهاتە ل هندەك دەڤەرێن پارێزگەهێ هەیە، ژ كەڤرێن جیری یێن نیڤ رەق پێكدهێن، رەنگێ وێ رەمادیەكێ ڤەكریە و گەلەك د رێكخستینە[٨٩].

**٤- پێكهاتەیا جدالە Jadalah**

كەڤرێن ڤێ پێكهاتەیێ ل دەڤەرێن نموونەی ژ كەڤرین جیری و تەباشیری و مارلی دگەل ئاخێ پێكدهێن، هندەك جارا تەخێن تەنكێن جیری دچنە ژناڤدا (ددانێن ئاڤانە)، هندەك جارا تەخێن تەنكێن بەرێ گرانێتی دچنە دناڤدا، كو گەلەك بەربوون تێدا هەنە، ژیێ وێ ڤەدگەریتە ئایوسینێ خوارێ[٩٠].

**ت - دەمێ مایوسینی**

ل بەراهیا ڤی دەمی جارەكادی دەریایێ ب سەر ئەردی دا گرت، نەخاسمە جهێ هەمان دەڤەرێ گرتەڤە دەمێ ئولیگوسین پەیدابووی، وەكی ئەم دبینین كو تیڤەرێژا ڤێ دەریایێ ژ لایێ باكوورێ رۆژئاڤایی بۆ باشوورێ رۆژهەلاتی دچیت[٩١]. ئەم ژ نەخشەیێ جیولوجیا هژمارە (١) دبینین، كو پتریا پێكهاتەیا ڤی دەمی (فارسێ خوارێ و سەری) دهێنە دیتن ل دەڤەرێن پەسارێن چەماندی یێن كوور ل پارێزگەها دهۆكێ، نەخاسمە ل دەڤەرێن دەشت، تایبەت ل دەڤەرێن گۆمێن رووباری و سەر لێڤێن رووبارا، وەك (زێیێ مەزن و صپنێ رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی، بەدرەدینی و خابووری و نهنهكی و خازر و گوملی). بەرچاڤترین پێكهاتەیێن ڤی دەمی:

**١- پێكهاتەیا فارسێ خوارێ Lower Faris**

ئەڤ پێكهاتە ب رەنگەكێ بەرتەنگ ل دەوروبەرێن پێكهاتەیا فارسا سەری دەردكەڤیت، نەخاسمە ل پەسارێن چەماندی یێن كوور ژ گۆمێن رووبارا دگەل تیڤەرێژا زنجیرێن چیایێن پارێزگەها دهۆكێ. دەسپێدكەتن ژ دەڤەرا گەلیێ دیهێ "دهێ" (گوندەكە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا بامەرنێ_وەرگێر) هەتا رووبارێ رویێ شین ل سەر توخیبێن رۆژهەلاتا قەزا ئامێدیێ. دیسان وەكی تیڤەرێژەكێ ل سەر لێڤێن گۆمێن رووبارێن (زێیێ مەزن و صپنێ رۆژهەلات و رۆژئاڤایی) دیار دبن، زێدەباری لێڤێن رووبارێ نهنهكی

ل ناحیا کانی ماسێ، دیسان ل هندەك دەڤەرێن بچویك ل دەڤەرا نێروە و رێکان ل ناحیا دێرەلۆکێ دهێتە دیتن، دیسان ل پشکا باکووری زنجیرا چیایێن بێخێر و ئەتریش و ئاکرێ ژی دەردکەڤیت، لێڤێن باشووری ژ زنجیرا چیایێن پیرس و ئاکرێ و باکرمان و زاوە و شێخان ژی دیاردبیت. ل دەڤەرێن دەشت و چەپوچیر ژی دیاردبیت نەخاسمە ل ناحییێن فایدە و سێمێلێ هەتا دگەهتە سەر لێڤێن رووبارێ دیجلە. بنێرە نەخشەیێ جیولوجی.

ئەڤ پێکهاتە ل پترین پشکێن وێ ژ نیشتەیێن پرت پرت پیکدهێت، دگەل هەبوونا تەخێن تەنك ژ کەڤرێ جیری یێ ئەندامی، ب رەنگەکێ ستوونی دهێتە گوهۆرین بۆ بەرێ جیری یێ حەپکی، ل داویێ ژی دبیتە کەڤرێ تەقنێ و مارل. ژ سەخلەتێن ڤێ پێکهاتەیێ دەرکەفتنا کەڤرێن مارلی و سلتی و تەقنا سۆر و ستووراتییا ڤێ پێکهاتەیێ ژ جهێ بۆ ئێکێ دی یا جودایە[۹۲].

**۲_ پێکهاتەیا فارسێ یا سەری Upper Faris**

ئەڤ پێکهاتە ل دەڤەرێن پەسارێن چەماندیێن کوور دەردکەڤیت، زێدەباری دەڤەرێن دەشت و گۆمێن رووبارا، وەکی تیڤەرێزەکێ ل زنجیرا چیایێن دهۆکێ ژی دیار دبیت. دهێتە دیتن ل دەڤەرێن رۆژهەلاتێ توخیبێن قەزا زاخۆ بۆ رۆژهەلاتێ قەزا سێمێلێ و ل سەر زێیێ مەزن ب داوی دهێت، داکو هەمی قەزا و ناحییێن پارێزگەهێ ڤەگریت. بنێرە نەخشەیێ جیولوجی.

ژبەر بلندییا ب هێزا چیایا ل پشکا باکووری رۆژهەلاتێ عیراقێ، ئەوا کەفتییە بەر لڤینا ئەلبی کو تێدا کەرەستەیێن نیشتەیێن هویرن و هاتینە رژیان بۆ ناڤ ئاڤا دەریایێ و ل داویێ پێکهاتەیا فارسی یا سەری پەیدابوویە[۹۳]. ژیێ ڤێ پێکهاتەیێ ڤەدگەریتە دەمێ مایوسینێ سەری، ژ گەلەك رەنگێن کەڤرێن هویر و پرت پرت پێکدهێت، وەکی کەڤرێن خویزی و ئاخێ و تێکهەل، کەڤرێن خویزی ب رەنگێ خۆ یێ رەمادی ل پشکا سەری و ناڤەراستێ دەردکەڤن، بەلێ رەنگێ سۆر ب سەر پشکا خوارێ دا گرتییە. توخیبێن دناڤبەرا فارسێ خوارێ و سەری ل سەر نشتەیێ تێکهەلەی و ژینگەها نیشتەیا وێ ژینگەهەکا ڤەگوهاستییە.[۹٤] کو ئەوژی نیشتەیێن کیشوەری و نیمچە کیشوەری نە کو ژ بەرێن مارل و سلت و خویزی پێکدهێن، هندەك کێم جاران بەرێ جیری ئەڤێ دناڤ ئاڤێن بێ خوێ دا چێبووی دیار دبن[۹۵]. بنێرە نەخشەیێ جیولوجی

**۳_ پێکهاتەیا بەختیاری**

نویترین پێکهاتەیا دەڤەرێ یە کو ڤەدگەریتە دەمێ پلایوسینی. توخیبێ دناڤبەرا ڤێ تەخێ و تەخا فارسی یا سەری، تەخێن بەرێ خویزی نە کو گەلەك جارا حەصو دناڤدایە، ل هندەك جارا بتنێ حەصو دەردکەڤیت. ڤێ پێکهاتەیێ ئەم ل دەشتا سندیا ل زاخۆ دبینین، زێدەباری دەشتا ئاکرێ کو ئەم پتر ل پشکێن باشووری دبینن، نەخاسمە ئەو جهێ دبێژنێ ناڤکورێ. هندەك پشکا ژ ناحیا کەلەکێ ل قەزایا بەردەرەشێ پێکدهێت ژ تەخێن خویزی و خویزێ زڤر و حەصوی، ل پشکا سەری کەڤرێن گروڤرێن ستوور دەردکەڤن[۹٦]. بنێرە نەخشەیێ جیولوجی.

## ژێدەر و پەراوێز:

* ژ پەرتووکا ئامێدیێ یا سالا ۲۰۱۳ هاتییە وەرگرتن (هندەك زێدەکرن ل سەر هاتییەکرن)

1. Saad Z..Jassim and Jeremy C,Golf –Geology of Iraq Published by Dolin ,Prague and Moravan Museum – Brno – 2006 –P75.

٢. عبدالله السياب وأخرون، جيولوجيا العراق، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٢، ص ١٨

3. Saad Z..Jassim and Jeremy C,Golf –Geology of Iraq,OP, cit, p75.
٤. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، جيولوجية شمال العراق، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٧٧، ص٢٠.
٥. عادل حاتم جوزي، الجيولوجيا للجميع، دار الرشيد للطباعة والنشر، العراق، بغداد، ١٩٨٠، ص ١٤.
٦. طه الهاشمي، مفصل جغرافية العراق، مطبعة دار السلام، بغداد، ط١، ١٩٣٠، ص ٨.
٧. التكوين الجيولوجي لأقليم كوردستان. http://the best geo.hooxs.com.
٨. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٦٣-٦٥.
٩. عادل حاتم جوزي، المصدر السابق، ص ١٧.
١٠. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٥٤.
11. Saad Z..Jassim and Jeremy C,Golf –Geology of Iraq,OP, cit,p96.
١٢. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر نفسه، ص ٥٥.
١٣. سهل السنوي، وأخرون، الجيولوجيا العامة الطبيعية والتاريخية، مطبعة كلية العلوم، جامعة بغداد، ط١، ١٩٧٩، ص ٥٧٧.
١٤. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر نفسه، ص ٥٧.
١٥. عبدالله السياب، واخرون، المصدر السابق، ص ٨٤.
١٦. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٦٩ - ٧١ .
١٧. عادل حاتم جوزي، المصدر السابق، ص ١٨-١٩.
١٨. سهل السنوي، وأخرون، المصدر السابق، ص ٥٧٨.
١٩. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٦٩.
٢٠. سهل السنوي، وأخرون، المصدرنفسه، ص ٥٧٨.
٢١. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٧٠.
٢٢. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٦٠-٦١.
23. Saad Z..Jassim and Jeremy C,Golf –Geology of Iraq,OP, cit,p100.
٢٤. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٦٢-٦٣.
٢٥. عادل حاتم جوزي، المصدر السابق، ص ٢٠.
٢٦. سهل السنوي، وأخرون، المصدر السابق، ص ٥٧٩.
٢٧. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٧١-٧٢.
٢٨. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٦٣-٦٤.
29. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy &paleogeography ,Baghdad, 1980 ,p49.
٣٠. عادل حاتم جوزي، المصدر السابق، ص ٢١.
٣١. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٧٥.
32. Saad Z..Jassim and Jeremy C,Golf –Geology of Ira,OP, cit,p107
٣٣. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٦٦-٦٧.
34. Saad Z..Jassim and Jeremy C,Golf –Geology of Iraq,OP, cit,107.
35. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy &paleogeography, OP, cit ,p53.
٣٦. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر نفسه، ص ٦٧-٦٨.
37. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy &paleogeography , OP, cit p54.
٣٨. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٧١.

٣٩. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٧٨.
٤٠. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر نفسه، ص ٧١-٧٢.
41. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy &paleogeography , OP, cit p65.
٤٢. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٧٩.
٤٣. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٧٣.
٤٤. عادل حاتم جوزي، المصدر السابق، ص ٢١.
٤٥. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر نفسه، ص ٨٠-٨٤.
46. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy &paleogeography , OP, cit p81.
٤٧. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٧٤.
48. Saad Z..Jassim and Jeremy C,Golf –Geology of Iraq, OP, cit,p 116.
٤٩. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر نفسه، ص ٧٧-٧٨.
٥٠. هڤال عبدالحافظ، وأخرون، تقرير حول المسح الجيولوجي لمعدن البارايت في قرية بانكي، دون ذكر السنة، ص ٩.
٥١. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٧٩-٨٤.
٥٢. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٨٤.
٥٣. هڤال عبدالحافظ، وأخرون، المصدر السابق، ص١٠.
٥٤. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر نفسه، ص ٨٥.
٥٥. سهل السنوي، وأخرون، المصدر السابق، ص ٥٨٢.
٥٦. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر نفسه، ص ٨٥-٨٦.
٥٧. هڤال عبدالحافظ، وأخرون، المصدر السابق، ص١٠.
٥٨. عادل حاتم جوزي، المصدر السابق، ص ٢٢.
59. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy
٦٠. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ٩١-٩٣.
٦١. سهل السنوي، وأخرون، المصدر السابق، ص ٥٨٢.
62. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy &paleogeography,OP, cit , ,pp123-125.
٦٣. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ٩٦.
٦٤. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، تقرير حول التحري عن الفحم في شمال زاخو، ص ١١.
65. Tibor Buday,The Regional Geology Of Iraq Stratigraphy &paleogeography ,p173-174.
٦٦. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر نفسه، ص ١٠٥.
٦٧. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، المسح الجيولوجي لشرق طية بيخير، سنة ٢٠٠٦، ص ٦.
٦٨. أقليم كوردستان العراق، وزارة الثروات الطبيعية، تقرير عن أستطلاع الصخور الكلسية والطينية الصالحة لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك ، ص ١٠.
٦٩. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، تقرير عن دراسة صخور شرانش وصلاحيتها لصناعة الاسمنت في منطقة بەرئاش، سنة ٢٠٠٤ ، ص ١٢.
٧٠. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ١٠٦.
٧١. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، المسح الجيولوجي لشرق طية بيخير، المصدر السابق، ص ٦.
٧٢. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، تقرير عن دراسة صخور شرانش وصلاحيتها لصناعة الاسمنت في منطقة بەرئاش، المصدر السابق، ص ١٢.
٧٣. أقليم كوردستان العراق، وزارة الثروات الطبيعية، تقرير عن أستطلاع الصخور الكلسية والطينية الصالحة لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك ، المصدر السابق، ص ١٠.

٧٤. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر نفسه، ص ١٠٨.
٧٥. أقليم كوردستان العراق، وزارة الثروات الطبيعية، تقرير عن أستطلاع الصخور الكلسية والطينية الصالحة لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك ، المصدر السابق، ص ١١.
٧٦. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ١١٧.
٧٧. عادل حاتم جوزي، المصدر السابق، ص ٢٢.
٧٨. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ١١٧.
٧٩. أقليم كوردستان العراق، وزارة الثروات الطبيعية، تقرير عن أستطلاع الصخور الكلسية والطينية الصالحة لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك ، المصدر السابق، ص ١٠.
٨٠. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ١١٨.
٨١. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، المسح الجيولوجي لشرق طية بيخير، المصدر السابق، ص ٧.
٨٢. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ص ١١٨-١١٩.
٨٣. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ص ١٢٠-١٢٢.
٨٤. أقليم كوردستان العراق، وزارة الثروات الطبيعية، تقرير عن أستطلاع الصخور الكلسية والطينية الصالحة لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك ، المصدر السابق، ص ١١.
٨٥. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر نفسه، ص ١٢٦.
٨٦. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ١٢٥.
٨٧. أقليم كوردستان العراق، وزارة الثروات الطبيعية، تقرير عن أستطلاع الصخور الكلسية والطينية الصالحة لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك ، المصدر السابق، ص ١٠.
٨٨. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ١٢٢.
٨٩. أقليم كوردستان العراق، وزارة الثروات الطبيعية، تقرير عن أستطلاع الصخور الكلسية والطينية الصالحة لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك ، المصدر السابق، ص ١١.
٩٠. عبدالله السياب، وأخرون، المصدر السابق، ص ص ١٢٣-١٢٤.
٩١. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ١٣٤.
٩٢. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، المسح الجيولوجي لشرق طية بيخير، المصدر السابق، ص ٩.
٩٣. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ١٣٨.
٩٤. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، التقرير النهائي للمسح الجيولوجي والتحري عن المواد الأولية المستخدمة في صناعة السمنت في منطقة خيرافا، ٢٠٠٥، ص ١٠.
٩٥. فاروق صنع الله العمري، علي صادق، المصدر السابق، ص ١٤٢.
٩٦. مديرية المسح الجيولوجي في دهوك، تقرير عن دراسة صخور شرانش وصلاحيتها لصناعة الاسمنت في منطقة بەرناش، المصدر السابق، ص ١٣.

# تۆپۆگرافیا
# پارێزگەها دهۆكێ

**پ.د. ئەحمەد عەلی حەسەن بەبەواتی**
**زانكۆیا دهوك- كولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: دیان جەمیل**

## پێشەكی

گومان تێدا نینە كو خۆرستیيا روویێ عەردی رۆلەكێ سەرەكی یێ د دەستنیشانكرنا كەسایەتیيا جهی دا هەی، تۆپۆگرافیا هەر دەڤەرەكێ ژی رەنگڤەدانا پێكهاتنا جیولوجی یا وێ دەڤەرێ دكەت زێدەباری وان لڤینێن تووشی وێ دەڤەرێ بووین و فاكتەرێن بەرپرس ژ دروستبوونا وێ ب تایبەت فاكتەرێن ناڤخۆیی یێن پەیوەندی ب سرۆشتێ كەڤری ڤە هەی یان ژی پێكهاتنا وێ یا جیولوجی، زێدەباری فاكتەرێن دەرەكی یێن كارتێكرنێ دكەنە سەر دیمەنێ وێ یێ گشتی.

خۆرستیيا روویێ عەردی رۆلەكێ كاریگەر یێ هەی ل سەر كەشوهەوایی و توخمێن پەیوەندی پێڤە هەی وەك پلا گەرماتی و شێداریێ، بۆ نموونە بلنداهی كارتیكرنێ ل سەر نزمكرنا پلەیێن گەرماتیێ و زێدەبوونا بارینا بارانێ و بەفرێ دكەت، زێدەباری كارتێكرنا چیایان یا كاریگەر ل سەر ئاراستەیێن بای و تیشكا رۆژێ.

خۆرستیيا روویێ عەردی دهێتە هژمارتن ئێك ژ گرنگترین فاكتەرێن سرۆشتی یێن دبنە ئەگەرێ دەستنیشانكرنا گەلەگ دیاردەیێن جوگرافی، ب رەنگەكی كو رۆلێ وێ ب شێوەیەكی سەرەكی رەنگڤەدانێ ل سەر باژێران دكەت و رووبەرێن عەردی یێن گونجایی ژبۆ چاندنێ دەستنیشان دكەت، هەردیسان كارتێكرنێ ل سەر تۆرێن رێكان و پەیوەندی و ڤەگوهاستنێ دكەت، ژبەر ڤێ گرنگیێ ل ڤێرێ دێ بزاڤێ كەین ڤەكۆلینێ ل سەر كەتوارێ خۆرستیيا روویێ عەردێ دەڤەرێ كەین بێی كو ئەم بچینە دناڤ هویركاریاندا.

ل دووڤ دابەشبوونا فیزیوگرافی یا روویێ عیراقێ، روویێ پارێزگەها دهۆكێ دكەڤیتە دناڤ دەڤەرەكا چیایی یا وەرگەریایی یا سادە و دەڤەرەكا چیایی یا وەرگەریایی یا ئالۆز دا ب رەنگەكی كو بلنداهیيا روویێ وێ دناڤبەرا (٣٥٠-٢٥٠٠) مەتر ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی دایە. ئەڤ جوداهیيا دبلنداهیيا وێ دا هەی كارتێكرنێ دكەتە سەر توندیا كریارێن دروستبوونا بلنداهیێن چیایی یێن نوی دروستبووین و یێن سەر ب بزاڤا ئەلبی ڤە.

روویێ پارێزگەها دهۆكێ دهێتە نیاسین ب روویەكێ دناڤبەرا خۆرستییەكا توند ل بەشێن

باكووری و خۆرستییەكا پێلدار (المتموج) ل دەڤەرێن ناڤەراست و خۆرستییەكا ڕاست و ڕێك ل دەڤەرێن باشووری و سەرنشیڤیەكا تەمام هەر ژ باكووری هەتا باشووری ل سەر زاڵ دبیت، ئانكو ڕوویێ پارێزگەها دهۆكێ هەرچەند بەرەڤ باكوور و باكوورێ ڕۆژهەلاتی و باكوورێ ڕۆژئاڤایی ڤە بچیت هێدی هێدی بلند دبیت، ئانكو بەرەڤ ئاراستەیێ سنووری دناڤبەرا عیراق و تركیا دا، ئەڤ بلنداهییە ڕەنگڤەدانێ ل سەر سروشتێ جیولوجی یێ ئالۆز دكەت ئەوژی ژبەر نێزیكبوونا وێ ژ دەڤەرا ڤێكەفتنێ (پشتینەیا تورۆس) یا دناڤبەرا پلێتا عەرەبی (پێشیا وێ ل عیراقێ) و یا توركی، ئەڤ هێزا ڤێكەفتنێ بوویە ئەگەرێ خواربوونا ڕوویێ تەخێن وێ و لێكبادانا وێ یاكو چیایێن عیراقێ بەرەڤ ئاراستەیێ ڕۆژهەلات-ڕۆژئاڤا پێكئینای ل دووماهیا سەردەمێ جیولوجی یێ دووێ و دەستپێكا سەردەمێ جیولوجی یێ سیێ لێ ئەڤ ڤێكەفتنا پشتی هینگێ دناڤبەرا پلێتا عیراقی و توركی بوویە ئەگەر ئاراستەیێ چیایان خوار بیت ژ باكوورێ ڕۆژئاڤایی-باشوورێ ڕۆژهەلاتی، ئەڤ چەندە دێ بۆ مە خۆیابیت ل دەمێ ئەم ڤەكۆلینێ ل سەر چیایێن دەڤەرێ دكەین. نەخشەیێ ژمارە (١) و خشتەیێ ژمارە (١) سروشتێ ڕوویێ پارێزگەها دهۆكێ پتر ڕۆهن دكەن و ئەڤ دەرئەنجامە ژێ بۆمە دیار دبن:

١. زالبوونا عەردێن دەشتی یێن بلنداهیا وان كێمتر ژ (٤٥٠م) ل سەر ئاستێ ڕوویێ دەریایی كو ڕێژەیا وان دگەهیتە (٤٢،٥٪)ێ ژ ڕووبەرێ پارێزگەها

**نەخشەیێ (١)**
**پلەبەندییا خۆرستییا ڕوویێ عەردێ پارێزگەها دهۆكێ**




پشتگەرم ب DEM یێ پارێزگەهێ و ئەنجامێن Arc GIS

دهۆکێ، ئەوژی بەشێن باشووریێ پارێزگەهێ ب خوڤە دگریت کو پێکدهێن ژ دەشتا سلێڤانەی (سێمێل) و شێخان و بەردەرەش و بەشەك ژ دەشتا سندیان ل دەڤەرا زاخۆ.

**خشتەیێ (١)**
**تەخێن خۆرستیبا روویێ عەردێ پارێزگەها دهۆکێ**

| بلنداهی | رووبەر / کم | ٪ |
|---|---|---|
| کێمتر ژ ٤٥٠ | ٤٤٦٥,٥ | ٤١,٥٤ |
| ٤٥٠ ـ | ٣١٠٣,٣ | ٢٨,٦٤ |
| ٧٥٠ - | ١٩١٧ | ١٧,٨٥ |
| ١٠٠٠- | ٩٨٢,٤ | ٩,١٥ |
| ١٢٥٠- | ٢٧٥ | ٢,٦٢ |
| پتر ژ ١٥٠٠ | ١٧,٥ | ٠,٢٠ |
| سەرجەم | ١٠٧٦٠,٧ | ١٠٠,٠٠ |

پشتکەرم ب DEM یێ پارێزگەهێ و ئەنجامێن Arc GIS

٢. زالبوونا عەردێن بلنداهیا وان دناڤبەرا (٤٥٠-٧٥٠م) ل سەر ئاستێ روویێ دەریایێ کو رێژەیا وان دگەهیتە (٢٨,٦٪ێ) ژ رووبەرێ پارێزگەها دهۆکێ، ئەوژی بەشێن باکووری یێن دەشتێن باشووری ب خوڤە دگریت، زێدەباری دەشتێن ناڤەراستا پارێزگەهێ وەك دەشتا مەمانێ، سپنەیێ رۆژهەلاتی، سپنەیێ رۆژئاڤایی و بەشێن رۆژهەلاتێ دەشتا سندی.

٣. عەردێن بلنداهیا وان دناڤبەرا (٧٥٠-١٠٠٠م) ل سەر ئاستێ روویێ دەریایێ کو رێژەیا وان دگەهیتە (١٧,٨٪ێ) ژ رووبەرێ پارێزگەها دهۆکێ، ئەوژی پتریبا دەڤەرێن بەر سینگێ چیایان بخوڤە دگریت و هندەك دەڤەرێن نزم و بلندن، ئەوژی ژبەر کریارا رامالینا ئاخێ یا چالاك، ئەڤ عەردە بەهرا پتر یا هەردو ئالیێن چیایێن پارێزگەهێ بخوڤە دگریت.

٤. ئەو عەردێ، بلنداهیا وان دناڤبەرا (١٠٠٠م) یان پتر، رێژەیا وان دگەهیتە (١٢٪ێ) ژ ڤێ رێژێ ژی نیزیکی (١١,٧٪)ێ ژوان عەردان بخوڤە دگریت یێن بلنداهیا وان دناڤبەرا (١٠٠٠-١٥٠٠م) ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی و پتریبا چیایێن دەڤەرێ بخوڤە دگریت وەك چیایێ بێخێر، پیرس، سپی، ئاکرێ، دهۆك، مانگێشك، شەرانش و دەڤەرێن بەرفرەهـ ژ زنجیرا چیایێن گارە و مەتینی (ژبلی هندەك گوپیتکێن بلند کو بلنداهیا وان ژ ١٥٠٠(مەتران پترە)، لێ دەڤەرێن بلنداهیا وان ژ (١٥٠٠م) پتر رێژەیا وان ژ (٠,٢٪ێ) نابووریت کو ئەوژی هندەك گوپیتکێن بلند یێن چیایێن گارە و مەتینی ب خوڤە دگریت زێدەباری هندەك چیایێن بەشێن باکوور و باکوورێ رۆژئاڤای ل نیزیکێ سنوورێ دناڤبەرا عیراق و ترکیا دا .

## تایبەتمەندیێن سەرنشیڤیا روویێ پارێزگەها دهۆکێ

یا دیارە کو تایبەتمەندیێن سەرنشیڤیا عەردێ هەر دەڤەرەکێ د گرێداینە ب فاکتەرێن دەستنیشانکەر یێن سروشتی ل وێ دەڤەرێ زێدەباری تایبەتمەندیێن پێکهاتن و خۆرستیا روویێ عەردێ وێ دەڤەرێ، سەرنشیڤیا روویێ عەردی ژ پیڤەرێن سەرەکی دهێتەهژمارتن د پتریا پرۆژەیێن پلاندانانێ و د پتریا بواران دا، ژبەر ڤێ چەندێ دەستیشانکرنا تایبەتمەندیێن سەرنشیڤیا عەردی نەك تنێ پێدڤی ڤەکۆلینا وێ جهی یە ل سەر بنیاتێ ئاراستەیێن گشتی یێن سەرەکی بەلکو پێدڤی ب کێشانا ئامادەکرنا نەخشەیەکێ تایبەت هەیە، هەروەکی د خشتەیێ ژمارە (٢) دا هاتییە ویێنەکرن کو پشتبەستن ل سەر ڤاڤارتنا زنکی (Zink) هاتییەکرن کو ڤاڤارتنەکا هەرەمی یا زنجیرەدارە و ژ پێنج ئاستێن ڤاڤارتنێ پێکدهێت دگەل زێدەکرنا بژاندنێ ل ئاستێن بلند، ئەڤ ڤاڤارتنە دهێتە ب کارئینان بۆ دەستنیشانکرنا خۆرستیبا شێوێن عەردی ل سەر ئاستێ سەرنشیڤیا عەردی، خشتەیێ ژمارە (٢)، ل

نەخشەیێ (٢)
پلەیێن سەرنشیڤیێ یێ روویێ پارێزگەها دهۆكێ ب پشت بەستن ل سەر ڤاڤارتنا زینكی




پشتکەرم ب DEM یێ پارێزگەهێ و ئەنجامێن Arc GIS

دەمێ بجهئینانا ڤێ ڤاڤارتنێ ل سەر روویێ پارێزگەها دهۆكێ یێ ڤەكۆلین ل سەر هاتییە ئەنجامدان دیاربوو كو ئەڤ سیستەمێن خۆرستی هەنە:

**١. بیاڤێ عەردێن راست:**

ئەڤ عەردە دهێنە نیاسین ب دووركەفتنا هێلێن كەنتوری ئەوژی ژبەر تایبەتمەندییا راست یا عەردی و نەبوون یان كێمبوونا سەرنشیڤیێ و عەردێن سەرنشیڤییا وان كێم بخۆڤە دگریت كو پلا وێ دناڤبەرا (٠- ١,٩) پلەیاندایە، بەهرا پتر دەشتێن ئافرابووی و دەڤەرێن دناڤبەرا گەلی یا دا بخۆڤەدگریت، رێژەیا وێ دگەهیتە (٥٢٪ێ) ب رووبەرێ (٥٧٣٤,٨)كم٢. ئەڤ چەندە ب شێوەیەكێ بەرفرەهـ ل دەڤەرێن باشووری و باشووری رۆژئاڤایی و رۆژئاڤایی پارێزگەهێ هەنە ب تایبەت ئەو دەڤەرێن دەشت لێ هەین.

**٢. بیاڤێ عەردێن پلەداریەكا سادە هەی:**

ئەڤ عەردە وان جهان بخۆڤەدگریت یێن تێكرایێ سەرنشیڤییا وان دناڤبەرا (٢-٧,٩ ) پلەیاندا و دەشتێن ئافرابووی ل سەر رویێ رووبارێن خابوور و دیجلە و زێ مەزن بخۆڤە دگریت زندباری دەڤەرێن بەر سینگێ چیایان، رێژەیا وێ دگەهیتە (٢٥٪ێ) ب رووبەرێ (٢٧٢٤ ) كم٢ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ پارێزگەهێ.

**٣. بیاڤێ عەردێن سەرنشیڤ:**

ئەڤ بیاڤە گركێن نزم بخۆڤە دگریت یێن پلا سەرنشیڤییا وان دناڤبەرا (٨- ١٥,٩) پلەیاندا كو

**خشتەیێ (٢)**
**رووبەر و رێژەیێن سەدی یێن روویێ پارێزگەها دهۆکێ ل دووف ڤاڤاتنا زینکی**

| Slope degree | area km² | % |
|---|---|---|
| 0 -1.9 | 5734.8 | 52 |
| 2 - 7.9 | 2724 | 25 |
| 8 - 15.9 | 1680.1 | 15 |
| 16 - 29.9 | 765.8 | 7 |
| 30 < | 83 | 1 |

- ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ ژمارە (٢).

دهێنە نیاسین ب دەڤەرێن سەرنشیڤیەکا سادە هەی و نێزیکی (١٦٨٠,١) کم٢ کو دبیتە رێژەیا (١٥٪)ێ ژ سەرجەمی گشتی یێ رووبەرێ پارێزگەهێ و دەڤەرێن بەر سینگێ چیایان بخۆڤە دگریت.

**٤. بیاڤێ عەردێن پارچەکری،**

ئەڤ بیاڤە گرکێن بلند بخۆڤە دگریت کو ژبەر ئەگەرێ راماڵینا ئاڤێ ژێکڤەبووینە و بووینە تۆرێن پارچە پارچە ژ گەلی و نهالان و پلا سەرنشیڤیا وان دناڤبەر (١٦-٢٩,٩) پلەیاندایە کو رووبەرێ وان دگەهیتە (٧٦٥,٨)کم٢ و رێژەیا (٧٪)ێ پێکدئینن و گرکێن بەربەلاڤ ل پارێزگەهێ بخۆڤە دگریت و عەردێ ڤێ دەڤەرێ بۆ مەرەمێن چەراندنێ دهێتە ب کارئینان.

**٥. بیاڤێ عەردێن پارچەبووی ب پلەیەکا بلند،**

ئەڤ بیاڤە وان دەڤەران بخۆڤە دگریت یێن پلا سەرنشیڤیا وان پتر ژ (٣٠) پلەیان و رووبەرێ وان دگەهیتە (٨٣)کم٢ کو دبیتە رێژەیا (١٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ پارێزگەهێ، ئەڤ بیاڤە دەڤەرێن کەڤری یێن گەلەك تیژ بخۆڤە دگریت.

## یەکەیێن تۆپۆگرافیێن سەرەکی یێن روویێ عەردی ل پارێزگەها دهۆکێ

### یەکەم: یەکەیا بلنداهییان:

یەکەیا بلنداهییا ناڤکرنەکا گشتی یە دهێتە دانان ل سەر چیا و بانی و گران، ژ داتایێن نەخشەیێ ژمارە (٣) و خشتەیێ وێنەیێ (١) بۆ مە دیاردبیت کو جوداهیەکا خۆرستی یا مەزن دناڤبەرا پارچەیێن ویدا هەیە ب تایبەت دناڤبەرا بەشێن وێ یێن باکوور و باکوورێ رۆژهەلات و باکوورێ رۆژئاڤایی، ب رەنگەکی کو هندەك بلنداهی تا (٢٥٠٠م) هاتینە توومارکرن کو پتریا دەڤەرێن سنووری دگەل وەلاتێ ترکیا ب خۆڤە دگریت، لێ ژ لایەکێ دیڤە بلنداهییا بەشێن باشووری ژ روویێ پارێزگەهێ ژ (٤٠٠م) بلندتر نابیت ب تایبەت بەشێن دکەڤنە سەر سکرێ مووسل و بەشێن بەرفرەهـ ژ عەردێ ڤەزا بەردەرەش.

ئەم دشێین بێژین کو ئەڤ جوداهیا هەی د خۆرستیا عەردی دا رەنگڤەدانا فاکتەرێن بەرپرسیارە ژ دروستبوونا وێ دکەن، ل دەستپێکا وان ژی لڤینێن دروستبوونا روویێ عەردێ عیراقێ و روویێ هەرێما کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ. هەژی گوتنێ یە لڤینێ کو حالەتێ لێکدانێ ئەوا دناڤبەرا پلێتا عەرەبی ل عیراقێ و پلێتا تورکی پەیدابووی بووینە ئەگەرێ لێکبادانەك د تەخێن روویێ عەردی ب شێوەیەکێ مەزن دا پەیدابیت و بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا چیایێن هەرێما کوردستانا عیراقێ ب تایبەت چیایێن پارێزگەها دهۆکێ، ئەڤ چەندە ژی ل داویا چەرخێ جیولوجی یێ دووێ و دەستپێکێن چەرخێ جیولوجی یێ سیێ رویدایە کو ب ڤێ چەندێ ژی هندەك چیا ل ئاراستەیێ رۆژهەلات- رۆژئاڤا دروستبووینە لێ حالەتێ ڤێکەفتنا ل دووفدا دگەل پلێتا ئیرانی بووینە ئەگەرێ لادانا ئاراستەیێ چیایێن هەرێما کوردستانێ بەرەڤ ئاراستەیێ باکوورێ رۆژئاڤایی- باشوورێ رۆژهەلاتی،

**نەخشەیێ (٣)**

**جهێ چیایێن سەرەكی ل پارێزگەها دهۆكێ**




**وێنەیێ (١)**

**سروشتێ تۆپۆگرافیێ روویێ عەردێ پارێزگەها دهۆكێ**







- Google earth ٢٠١٥

كو ئەوژی ئاراستەكێ زاڵ یێ پتریبا چیایێن بلند یێن دەڤەرێ یێ ل هەرێمێ ژبلی هندەك چیایێن باشووری دەڤەرێ كو ئاراستەیێ رۆژهەلات- رۆژئاڤا یێ ل سەر زاڵە ب تایبەت چیایێن زاوا و ئەلقوش، ئەڤ چەندەژی یا گرێدایە ب فاكتەرێ دووراتیا دەڤەرێ ژ دەڤەرا ڤێكەفتنێ (پشتینەیا زاگرۆس تورۆس) دناڤبەرا پلێتێن بەری نها مە بەحس كری، هەردیسان ژ ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی كێم بلنداهییا چیایێن ناڤەراست و باشووری پارێزگەهێ و هەبوونا دەڤەرێن دەشتی یێن بەرفرەهـ.

هەردیسان ئەم دشێین رۆلێ هەردو كریارێن رامالینا ئاخێ و سەرێك خرڤەبوونا ئاخێ د وی ماوەی دا هەتا سەردەمێ نها ل سەر زێدە بكەین كو بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا نویترین گوهۆرینێن بنەرەتی د كەتوارێ خۆرستییا روویێ عەردێ پارێزگەهێ دا د بوارێ برینا زنجیرەیێن چیایی دا، هەردیسان گەلی و رێكێن ئاسێ دناڤبەرا چیاییاندا ژ ئەنجامێ سەرێك خرڤەبوونا ئاخێ ل دەڤەرێن دناڤبەرا زنجیرەیێن چیاییاندا دروست بووینە.

ئاماژە كرن ب ئەڤا بەری نها و ل دووڤ جوداهییا خۆرستییا عـەردی، ئەم دشێین روویێ پارێزگەها دهۆكێ ل سەر دو هەرێمێن خۆرستی دابەش بكەین ئەوژی ل دووڤ وان جهێن هەردو جوگرافیناسێن عیراقی (جاسم محمد خلف و شاكر خصباك) چووینێ، هەردیسان ل دووڤ وان جهێن جوگرافیناس (كورن هستد ل سالا ١٩٤٨)ێ چووینێ كو بەحسێ وێ د پەرتووكا خۆدا یا بناڤێ (بنەمایێن سرۆشتێ جوگرافییا عیراقێ) كرییە، ئەوژی هەرێما چیایی و هەرێما نیمچە چیایی (دەڤەرا بان و گران) كو ل دەڤ هندەك ڤەكۆلەران ب دەڤەرا پێلدار (المنطقة المتموجة)دهێتە نیاسین، بەری ئەم ب درێژاهی ل سەر ڤان هەردو دەڤەران راوەستین دێ ئاماژەیێ دەینە هندەك تایبەتمەندیێن گشتی یێن خۆرستییا روویێ عەردێ پارێزگەها دهۆكێ و چیایێن وێ، ژ گرنگترین وان تایبەتمەندییان:

١. نەبوونا لێكگونجانێ (التجانس) تایبەتمەندیا هەرە بەرچاڤە د روویێ عەردێ دەڤەرێ دا سەرەرای هندێ كو دەڤەرێن دەشتی پتر ژ نیڤا رووبەرێ پارێزگەهێ پێكدئینن.

٢. تێكراییێ بلنداهییا دەڤەرێن باشوور و باشووری رۆژئاڤا و باشووری رۆژهەلاتی ل پارێزگەهێ دناڤبەرا (٣١٠-٤٠٠م) دایە ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی، و هەر چەند پتر بەرەڤ دەڤەرێن باكوور و باكووری رۆژئاڤایی ڤە بچین ئەڤ بلنداهیە زێدەتر لێ دهێت ب رەنگەكی بلنداهییا وان ل هندەك جهان دگەهیتە پتر ژ (٢٥٠٠م) ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی.

٣. ل سەر روویێ پارێزگەها دهۆكێ چەند بەرەڤ ئاراستەیێ باشووریڤە بچین سەرنشیڤیەكا گشتی زاڵ دبیت كو یا هەڤتەریبە دگەل پتریبا جۆ و جۆبارێن ئاڤێ زێدەباری دو سەرنشیڤێن دی بەرەڤ لایێ رۆژئاڤایی و یا دی بەرەڤ لایێ باشووری رۆژهەلاتی.

هەردیسان ئەم دشێین تێبینیا ڤان تایبەتمەندییان ژی ل سەر چیایێن پارێزگەهێ بكەین:

١. ئاراستەیێ باشووری رۆژهەلاتی- باكووری رۆژئاڤایی یێ زاڵە ل سەر پتریبا زنجیرا چیایێن سەرەكی ل دەڤەرێ.

٢. چەند ئەم پتر ژ ئاراستەیێ باشوور و باشووری رۆژهەلاتیڤە بەرەڤ ئاراستەیێ باكوور و باكووری رۆژئاڤایی و باكوور و باكووری رۆژهەلاتیڤە بچین زنجیرا چیایان بلندتر لێ دهێن.

٣. زنجیرەیێن چیایی یێن بەرەڤ باشووریڤە دچن درێژتر و رێكخستی ترن لێ چەند بەرەڤ باكووریڤە بچین ئەڤ زنجیرە دێ كورتتر و نەرێكخستی تر و بلندتر لێ هێن.

## ١. دەڤەرێن چیایی

هەرێما چیایی دكەڤیتە دەڤەرێن باكوور و باكووری رۆژهەلات و باكووری رۆژئاڤایێ پارێزگەها دهۆكێ. ئەڤ هەرێمە یا بەرنیاسە ب چیایێن بلند و زۆربیا گوپیتكێن چیایی یێن ئاسێ و سەرنشیڤیێن دژوار،

هەردیسان هندەك نهالێن گەلەك تەنگ وان ژێکڤە دکەن. بلنداهییا عەردێ ڤێ هەرێمێ دناڤبەرا ٤١٥م ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی دەستپێدکەت ب تایبەت ل دەڤەرێن رۆژئاڤایێ دەشتا سندی بۆ پتر ژ ٢٥٠٠م ل چیایێ ستونیا[1]. هندەك زنجیرەیێن چیایی ل ڤێ هەرێمێ ژ هەرێما نیمچە چیایی جودا دکەن کو بەرەڤ ئاراستەیێ باکوورێ رۆژئاڤا- باشوورێ رۆژهەلاتیڤە درێژ دبن و چیایێن بێخێر، سپی و ئاکرێ بخۆڤە دگریت.

ب بەرچاڤ وەرگرتنا جوداهیا دروستبوونا جوگرافی و بلنداهییا چیایان ل ڤێ دەڤەرێ، ئەم دشێین دابەشکەینە دو بەشان:

١. چیایێن لێکبادایی یێن ئالۆز

٢. چیایێن لێکبادایی یێن سادە

## ١. چیایێن لێکبادایی یێن ئالۆز:

ئەڤ دەڤەرە دکەڤیتە باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتی یێ دەڤەرا چیایی دناڤبەرا سنوورێ هەرێمێ (دهۆك) دگەل وەلاتێ ترکیا کو دەستپێدکەت ژ "رووبارێ هێزل بۆ رووبارێ زێ مەزن (رووبارێ رووبێ شین) کو ل سەر شێوەیێ کڤانەکی یە و سەنتەرێ وی بەرەڤ لێکبادانا سەرەکی ل چیایێ زاگرۆس دچیت کو دهێتە نیاسین ب لێکبادانا خۆ یا ئالۆز و نەبوونا چ سیستەمێن تایبەت ب لێکبادانێ ڤە[2].

ئەڤ دەڤەرە ژ لایێ پێکهاتنێ ڤە دەڤەرەکا ئالۆزە، ئەوژی ژبەر توندیا کریارێن دروستبوونێ کو تووشی وێ بووینە ژبەر نێزیکبوونا وێ یا رێژەیی ل دەڤەرا ڤێکەفتنا پلێتا عەرەبی دگەل ترکی ل باکووری و ئیرانێ ل رۆژهەلاتی. تێکراییێ بلنداهییا چیایێن ڤان دەڤەرا دناڤبەرا ١٧٠٠- ٢٠٠٠ مەتراندایە ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی و ئەڤ بلنداهییە کارتێکرنێ دکەنە سەر کەشوهەوایێ بالادەست ل دەڤەرێ ب رەنگەکی بارینا بارانێ ل ڤان جهان ژ هەمی دەڤەرێن دی یێن هەرێمێ پترە. ژ ئەنجامێ جوداهییا خۆرستییا رووبێ عەردی یا مەزن دناڤبەرا بەشێن وێ دا، ئەم دشێین بکەینە دو هەرێم:

١. هەرێما باکووری:

ئەڤ هەرێمە دکەڤیتە دەڤەرا سنوورێ عیراقێ و ترکیا ل لایێ رۆژئاڤایی (رووبار هێزل) و باکووری، لێ ژ لایێ وێ یێ باشووریڤە دگەهیتە چیایێن کیرا و دیرا، زنجیرا چیایێ مەتین و ئامێدیێ. هەردیسان ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە دگەهیتە رووبار رووبێ شین. رووبەرێ ڤێ هەرێمێ دگەهیتە نێزیکی (٣٠٠٠)کم٢ کو رێژەیا (٢٨٪)ێ ژ رووبێ پارێزگەها دهۆکێ پێکدئینیت. تەماشەی خشتەیێن ژمارە (٣) و (٤) و نەخشەیێن ژمارە (٢) و (٣) بکە.

ل ڤێ دەڤەرێ خۆرستییەکا عەردی یا توند دهێتە دیتن ئەوژی ژبەر توندیا لێکبادانا تەخێن وێ کو ژ ئەنجامێ نێزیکبوونا وێ ل دەڤەرا ڤێکەفتنا (پشتینەیا زاگرۆس تورۆس) کو دئەنجامدا هندەك چیایێن گەلەك بلند پەیدابووینە ب رەنگەکی بلنداهییا وان دناڤبەرا (١٧٠٠-٢٥٠٠م) ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی لێ دگەل هندێ ژی چیایێن وێ چ ئاراستەیێن دەستنیشانکری نینن و پتریا جاران ژی گەلەك د درێژ نینن. ژبەرکو ئەڤ چیایە گەلەك نێزیکی ئێکن لەورا هندەك دەشت و گەلی یێن تەنگ دناڤبەرا واندا دروستبووینە کو فرەهییا وان ژ (١٠٠٠م) نابووریت هەروەکی دەشتا نهالا ئیستیبلان و رووبار نینك.

گرنگترین چیایێن ڤێ دەڤەرێ مە دابەشکرینە ل سەر سێ بەشان:

**أ. چیایێن بەشێ رۆژئاڤایی (دناڤبەرا رووبارێ هێزل و رووبارێ خابووری دا).**

ئاراستەیێ ڤان چیایان ژ باکووری بەرەڤ باشووری درێژ دبیت و بلنداهییا وان دناڤبەرا (١٧٠٠- ٢٠٠٠م) و ناڤدارترین چیایێن وان ژی، چیایێ دەرشیش (١٦٨٢م)، چیایێ قاهیرە (١٦٠٠م) و چیایێ خەمتیر (١٦٨٨م).

**ب. چیایێن بەشێ ناڤەراست (دناڤبەرا رووبارێن خابوور و زێ مەزن دا):**

ب چیایێن دەڤەرا بەرواری بالا دهێنەناڤکرن زنجیرە چیایێن کورتو و ژ لایێ تۆپۆگرافیاییڤە ئالۆزن و هندەك درێژبوونێن نەرێکخستی یێن هەین کو

**خشتەیێ (٣)**
**رووبەر و رێژەیا یەکەیێن خۆرستیا رووبێ عەردی ل پارێزگەها دهۆکێ ل دووڤ هەرێمان**

| یەکەیا خۆرستیا عەردی | دەڤەرا چیایی | | | | دەڤەرا نیمچە چیایی | | رووبەرێ گشتی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | هەرێما باکووری | ٪ | هەرێما ناڤنجی | ٪ | هەرێما باشووری | ٪ | رووبەر | ٪ |
| چیایی | ٢٣٥٠ | ٧٦,٦ | ١٨٦٠ | ٤٦,٥ | ١١٠٠ | ٢٩,٦ | ٥٣١٠ | ٤٦,٨ |
| دەشتی | ٦٥٠ | ٢٣,٤ | ٢١٤٠ | ٥٣,٥ | ٢٦١٥ | ٧٠,٤ | ٥٤٠٥ | ٥٣,٢ |
| گشتی | ٣٠٠٠ | ٢٨ | ٤٠٠٠ | ٣٧,٣ | ٣٧١٥ | ٣٤,٧ | ١٠٧١٥ | ١٠٠,٠ |

**خشتەیێ (٤)**
**رێژەیێن رووبەرێن چیایی و دەشتی ل دووڤ هەرێمێن خۆرستیا رووبێ عەردی ل پارێزگەها دهۆکێ**

| دەڤەر | چیایی | ٪ | دەشتی | ٪ | گشتی | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باکووری | ٢٣٥٠ | ٤٤,٢١ | ٦٥٠ | ١٢,٠٢ | ٣٠٠٠ | ٢٨,٠٠ |
| ناڤەراست | ١٨٦٠ | ٣٥,٠٨ | ٢١٤٠ | ٣٩,٦٠ | ٤٠٠٠ | ٣٧,٣٣ |
| باشووری | ١١٠٠ | ٢٠,٧١ | ٢٦١٥ | ٤٨,٣٨ | ٣٧١٥ | ٣٤,٦٧ |
| گشتی | ٥٣١٠ | ١٠٠,٠٠ | ٥٤٠٥ | ١٠٠,٠٠ | ١٠٧١٥ | ١٠٠,٠٠ |

هندەك جاران دچنە دناڤێکرا و بەرەڤ ئاراستەیێن ژێکجودا دچن. ئەڤ چیایە دگەل سنوورێ ترکیا ب درێژاهییا ٣٥ کیلومەتران دناڤبەرا رووبارێ خابوور و زێ مەزن دا درێژ دبیت. بەرنیاسترین چیایێن ڤێ دەڤەرێ چیایێ (کێلا سپی کو درێژاهییا وی ٢٣٩٦م ) و چیایێ (گلیڤلیندەر) کو ل سەر شێوەیێ زنجیرەکا چیایی ب درێژاهییا (١٧) کیلومەتران دگەل سنوورێ ترکیا درێژدبیت و دکەڤیتە باشووری چیایێ کێلا سپی. لێ چیایێ (ستوینا کو درێژاهییا وی ٢٥٥٩م) سنوورەکێ سیاسی دناڤبەرا هەرێما کوردستانا عیراقێ و ترکیا ب درێژاهییا ٢٠ کیلومەتران دروست دکەت و گوپیتکا چیایێ ستوینا دهێتە هژمارتن بلندترین گوپیتکا چیایی ل پارێزگەها دهۆکێ، هەردیسان هەردو چیایێن (گرێ زێری ب درێژاهییا ٩,٥ کیلومەتران) و (چیایێ سەفوکێ ب درێژاهییا ٩ کیلومەتران) دکەڤنە ڤێ دەڤەرێ[٣].

**ج- چیایێن بەشێ رۆژهەلاتی (رۆژهەلاتێ رووبارێ زێ مەزن)[٤]:**

ئەڤ چیایە دکەڤنە بەشێن باکوورێ رۆژهەلاتێ پارێزگەها دهۆکێ هەتا باکووری ل دەڤ زنجیرا چیایێن لینك و رۆژهەلاتێ رووبارێ زێ مەزن، ئەم دشێن ڤان چیایان دابەش بکەین بۆ سەر دو گرووپان:

١- چیایێن رۆژهەلاتی کو دکەڤنە دناڤبەرا رووبارێ رووبێ شین و سنوورێ پارێزگەها هەولێرێ ژ لایەکی و سنوورێ هەرێمێ دگەل ترکیا ژ لایەکێ دیڤە. ژ گرنگترین چیایێن وێ، چیایێ (دینیك ب درێژاهییا ١٢,٥ کم) و چیایێ (سپی ب درێژاهییا ٤,٥ کم) و بلنداهییا بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە (١٩٩٣) مەتران، هەردیسان چیایێ (هەمبیا ب درێژاهییا ٨,٥کم). گرنگترین و بلندترین گوپیتکا چیایی، گوپیتکا چیایێ سەرێ بەرۆژی یە کو بلنداهییا وی دگەهیتە (٢١١٥) مەتران.

**وێنەیێ (٢)**

**رووبەر و رێژەیێن یەکەیێن خۆرستیا رووییێ عەردی ل پارێزگەها دهۆکێ ل دووڤ هەرێمان**




**وێنەیێ (٣)**

**رێژەیێن رووبەرێن چیایی و دەشتی ل دووڤ هەرێمێن خۆرستیا رووییێ عەردی ل پارێزگەها دهۆکێ**



٢. چیایێن رۆژئاڤایی كو زنجیرا چیایێن دۆرماندوری گوندێ (بێبو)ی ل ناحیا نێروه و رێكان یا بەرێ بخۆڤە دگریت و تا رادەبەكێ وەكی چیایێن رۆژهەلاتییە ژ لایێ نەرێكخستنا زنجیرەیێن وێ لێ وەك زنجیرەیێن چیایی یێن روهن و دیار خۆیادكەن، دیارترین و درێژترین زنجیرا چیایی، زنجیرا باشووری یە، زنجیرا هۆرێ كو درێژاهییا وێ نێزیكی ١٥,٥ كم و گرنگترین گوپیتكا چیایێ ژی گوپیتكا چیایێ رەشكێ یە كو بلنداهییا وی نێزیكی ٢١٤٦ مەترانە و گوپیتكا چیایێ سەرێ هۆرێ كو بلنداهییا ویژی نێزیكی ١٩٨٣ مەترانە. زنجیرا چیایێ كوكە درێژاهییا ویژی ٧,٨ كم و دیارترین گوپیتكا ویژی بلنداهییا وێ ٢٢٤٨ مەترن.

بەری ئەم داویێ ب ڤێ هەرێمی بینین دێ ئاماژێ دەینە دەهان گوپیتكێن چیایی یێن دیار د خشتەیێن ژمارە (٥) دا. لێ گرنگترین زنجیرەیێن چیایێن هەرێما باكووری یێن دەڤەرا چیایی یێن بلند، وان زنجیرەیێن چیایی بخۆڤە دگریت یێن دكەڤنە باشوورێ وێ كو ژ رۆژهەلات بۆ رۆژئاڤایی درێژ دبن و د خشتەیێ ژمارە (٦) دا هاتینە دیاركرن، ئەو زنجیرەیێن چیایان ژی ئەڤەنە:

**خشتەیێ (٥)**

**هندەك گوپیتكێن چیایان ل پارێزگەها دهۆكێ**

| گوپیتك | بلنداهی | گوپیتك | بلنداهی |
|---|---|---|---|
| سەرێ ئورە | ٢٤٠٢ | ریسفوكێ | ٢٣٣٥ |
| زرك | ٢٣٠٠ | لینك | ٢٢٤٩ |
| رەشك | ٢٠١٧ | شكیرا | ٢١٣٠ |
| باجزافا | ٢١٤٢ | دیرشیش | ١٦٨٢ |
| مەرابی | ٢٠٤٥ | قاهیرە | ١٦٠٠ |
| بیرمان | ٢١٦٩ | مانكێش | ١٤٣٤ |
| سەرێ ئامێدی | ١٩٤٥ | بێخێر | ١٣٨٠ |
| باسار | ٢١٤٩ | تیادیرا | ١٤١٠ |
| هشكێ | ٢٠١٠ | شبانێ | ١٣٦٦ |
| شەرانش ئیسلام | ١٩٩٨ | سەرێ دیرێ | ١٣٦٥ |
| ساركی حسێن ئاغا | ٢٠٤٠ | كالكهر | ١٣٦٢ |
| كوكا رەش | ١٨٨١ | تامباف | ١٣٢٩ |
| كامەر | ١٧٠٧ | مام سین | ١٣٠٠ |
| میركشیش | ١٧٣٠ | جابانكێ | ١٢٤٧ |
| خەمتیر | ١٦٨٨ | كیماكە | ١٢٤٤ |
| كێلا سپی | ٢٣٩٦ | سەرێ ئاكرێ | ١٥٤٨ |
| سەری سفوكێ | ٢٣٣٥ | برویسیێ | ٢١٣٠ |
| گرێ مەهندا | ٢١٩٠ | دەریكا | ٢١١١ |
| باشخوركا | ١٩٢٧ | كیزێ مەرانێ | ٢٠٠٦ |
| دووبراك | ٢٠٧٣ | دەریێ ئافوكێ | ١٨٨٧ |
| جارجە | ٢٠٣٤ | شكیرا ئاسنكەرا | ٢١٣٠ |
| بالولك | ١٧٠٥ | جلەرەش | ١٨٢٨ |

- Google earth 2015
- نشوان شكری، وأخرین، جغرافیة محافظة دهوك، دراسة فی الخصائص الطبیعیة والبشریة، السلسلة الأولی قضاء ئامیدی،٢٠١٣.

**١. زنجیرا چیایێ كیرە:**

زنجیرەكا چیایی یە ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە ژ رووبارێ هیزل درێژ دبیت تا دگەهیتە لایێ رۆژهەلاتی بۆ رێكا شەرانشێ ب درێژاهیا ١٦,٥ كیلومەتران، ل رۆژئاڤای ژ رووبارێ هیزل دەستپێدكەت و ل گەلیێ شەرانشێ ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ب داوی دهێت، بلندترین گوپیتكا وی دگەهیتە ١١٦٢م ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی لێ گوپیتكا وی ل لایێ رۆژئاڤایی ل سەر رووبارێ هیزلی ژ ٧١٣م نابووریت. تێكراێن بلنداهیێن چیایی دناڤبەرا (١٠٥٠-١١٠٠م) و نهالا باشووری یا ئیستیبلان رادبیت ب هەركاندنا ئاڤا بنارێ باكووری یێ چیایێ كیرەی.

**٢. زنجیرا چیایێ دێرە:**

ئەڤ زنجیرە ژی دەربرینێ ژ درێژبوونەكا سروشتی یا زنجیرا چیایێ بەری نها دكەت كو ژ گەلیێ شەرانش دەستپێدكەت و بەرەڤ رۆژهەلاتی درێژدبیت هەتا گەلیێ زریزە، لێ ئەڤ زنجیرە كورترە ژ زنجیرا دی و درێژاهیا وی بتنێ ١١ كیلومەترن و تێكراێن بلنداهیێن وی دناڤبەرا (١٢٥٠-١٣٥٠م) لێ بلندترین گوپیتكا وی دگەهیتە ١٤١٠ مەتران ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی.

**٣. زنجیرا چیایێ مەتین:**

زنجیرا چیایێ مەتین دهێتە هژمارتن گرنگترین و درێژترین زنجیرا چیایی ل قەزا ئامێدیێ و پارێزگەها دهۆكێ، تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١) بكە. ڤێ زنجیرێ ئاراستەیەكێ گشتی یێ باكوورێ رۆژهەلاتی-باشوورێ رۆژئاڤایی یێ هەی كو درێژاهیا وی دگەهیتە ٧١ كیلومەتران دناڤبەرا رووبارێ رۆبێ شین ژ لایێ رۆژهەلاتی هەتا رووبار خابووری ژ لایێ رۆژئاڤایی، ئەڤ زنجیرە ژ چوار چیایێن سەرەكی پێكدهێت[٥]:

أ. گرێیا چیایێ (حەسارا هاجنسا ١٩٣٠م) و دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ ب نێزیكی ٦,٥ كم و ژ سێ زنجیرێن چیایی پێكدهێت ئەوژی زنجیرا (ئیسفا) كو ب درێژاهیا ١٩,٥ كم درێژدبیت هەتا رووبارێ خابووری.

ب. زنجیرا دوێ دهێتە ناڤكرن ب زنجیرا (بشێش) كو ب درێژاهیا ٢٠ كم بەرەڤ رۆژئاڤایی هەتا رووبارێ زێ مەزن درێژدبیت هەتا جهێ تێرابوورینا وی د گەلیێ رەشاڤا و پاشی بەرەڤ باكووری دچیت تا دەڤەرا دێرەلوكێ.

ت. زنجیرا سیێ دهێتە ناڤكرن ب چیایێ (زەرك) كو ب درێژاهیا ٢١كم بەرەڤ باكوورێ رۆژهەلاتی درێژدبیت تا دگەهیتە لایێ رۆژئاڤایێ رووبارێ زێ مەزن و بلنداهیا دیارترین گوپیتكا چیایێ زەرك دگەهیتە ٢٣٠٠ مەتران كو بلندترین گوپیتكا چیایی یا زنجیرا چیایێن مەتینی یە.

**خشتەیێ (٦)**
**زنجیرەیێن چیایی یێن سەرەكی (هەرێما باكووری) ل پارێزگەها دهۆكێ**

| زنجیەرێن چیایی | درێژاهی\ كم | تێكرایێ فرەهیێ/كم | تێكرایێ بلنداهیێ/ مەتر | بلندترین خالا بلنداهیێ/ م | جهـ |
|---|---|---|---|---|---|
| چیایێ كیرە | ١٦,٥ | ٢ | ١٠٠٠ـ ١١٠٠ | ١١٦٢ | ژ رووبار هیزل ـ بۆ رێكا شەرانشێ |
| چیایێ دێرە | ١١ | ١,٧ | ١٢٥٠ ـ ١٣٥٠ | ١٤٠٥ | ژ رێكا شەرانشێ بۆ گەلیێ زریزە |
| مەتین | ٧١ | ٦ | ١٧٠٠ـ ٢١٠٠ | ٢٢٥٥ | دناڤبەرا رووبارێن خابور و زێ |
| كومارك | ١٦ | ٤ | ١٣٠٠ ـ ١٤٠٠ | ١٥٩٠ | ناڤەراستا حەوزا نینك |
| كانی سارك | ٩,٥ | ١,٥ | ١٦٠٠ـ ١٧٠٠ | ١٨٦٢ | باكوورێ حەوزا نینك |

وێنەیێ (١)
بناریێ باشووری یێ چیایێ مەتین کو هاتییەگرتن ل دەڤەرا دێرەلوکێ



- ڤەکۆلینەکا مەیدانی ل رۆژا ٢٠١٢/٣/١٠

پ. گرێیا چیایێ (لینك) کو ژ زنجیرەکا چیایی یا سەرەکی پێکدهێت و دەستپێدکەت ژ گەلیێ رەشاڤا ژ لایێ رۆژئاڤایی و باشی بەرەڤ رۆژهەلاتی دچیت هەتا رووبارێ روویێ شین ب درێژاهیا ١٦,٥کم، ڤێ زنجیرێ هندەك گوپیتکێن چیایان هەنە وەك گوپیتکا چیایێ لینك (٢٢٤٩م) کو دووەم بلندترین گوپیتکا زنجیرا چیایێ مەتینی یە.

٤. چیایێ کومارك:
ئەڤ چیایە دکەڤیتە ناڤەراستا حەوزا نینك هەتا باکووری دگەهیتە چیایێ مەتین و درێژاهیا وی ١٦کم. تێکرایێ بلنداهیا وی دگەهیتە (١٣٠٠-١٤٠٠م) و بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە (١٥٩٠م).

٥. چیایێ کانی سارك:
ئەڤ چیایە دکەڤیتە بەشێ باکووریێ حەوزا نینك هەتا باکووریێ چیایێ مەتین و درێژاهیا وی دگەهیتە ٩,٥ کم و تێکرایێ بلنداهیا ویژی دگەهیتە (١٦٠٠مم-١٧٠٠م) و بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە ١٨٦٢ مەتران.

## ٢. چیایێن لێکبادایی یێن سادە:

ئەڤ چیایە ب هندێ دهێنە نیاسین کو ئەو ژ چیایێن لێکبادایی یێن ئالۆز نزمترن، و کێمتر کەفتینە بن کارتێکرنا لڤینێن عەردی، تێکرایێ بلنداهیا وان دناڤبەرا ١٠٠٠- ٢٠٠٠ مەتران ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی یە و هندەك ئاراستەیێن دیار هەنە ژ باکووریێ رۆژئاڤایی بەرەڤ باشووریێ رۆژهەلاتی و ئەڤ دەڤەرە ژ دو زنجیرێن چیایێن هەڤتەریب پێکدهێت کو گەلیەکێ تەنگ وان ژێکڤە دکەت. رووبەرێ ڤێ دەڤەرێ نێزیکی ١٨٦٠کم٢ کو دبیتە رێژەیا ٣٥٪ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ چیایێن پارێزگەها دهۆکێ، تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٤) بکە.

ئەڤ دەڤەرە دگەهیتە دو هێلێن زنجیرێن چیایی ئەوژی هێلا باشووری ژ دەڤەرا چیایێن بلند (چیایێن کیرە و دیرە و مەتین)، لێ هێلا باشووری چیایێن بێخیر، چیایێ سپی، چیایێ باکرمان و چیایێ ئاکرێ[٦] بخۆڤە دگریت، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٣) و خشتەیێ ژمارە (٧) بکە.

ل ڤێ دەڤەرێ دو هێلێن زنجیرێن چیایی هەنە ئەوژی ئەڤەنە:

**یەکەم: هێلا باکووری:**

ئەڤ هێلە پێکدهێت ژ چیایێن (شرین، گارە، پیرس و مانگێشك) و بلنداهیا وان دناڤبەرا ١٤٠٠-٢١٠٠ مەتران دایە، دیارترین چیا ژی ئەڤەنە:

**١. چیایێ شرین:**

ئێکەم زنجیرەیە ل هێلا باکووری ژ دەڤەرا چیایی یا هەرێما ناڤەراست، ئەڤ زنجیرا چیایی دەستپێدکەت ژ گەرویا بەخمە ل لایێ رۆژهەلاتی و بەرەڤ رووبارێ خازر ل لایێ رۆژئاڤایی ب درێژاهیا ٢٥کم و فرەهیا ٧کم درێژدبیت، تێکرایێ بلنداهیا وی دناڤبەرا ١٤٠٠-١٥٠٠ مەتران دایە لێ بلنداهیا بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە ١٧٢٤ مەتران.

**٢. چیایێ پیرس:**

ئەڤ زنجیرا چیایی ژ چیایێ شرین ل لایێ رۆژهەلاتی دەستپێدکەت و بەرەڤ چیایێ کارۆك بۆ لایێ رۆژئاڤایی ب درێژاهیا ٢٧کم و فرەهیا ٦کم درێژدبیت، تێکرایێ بلنداهیا وی دناڤبەرا ١٣٠٠-١٥٠٠ مەتراندایە لێ بلنداهیا بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە ١٧٤٨ مەتران.

**٣. زنجیرا چیایێ گارە:**

زنجیرا چیایێ گارەی دهێتە هژمارتن دووەم گرنگترین و درێژترین زنجیرا چیایی پشتی زنجیرا

**وێنەیێ (٢)**
**لایەکێ بنارێ باکووری یێ چیایێ گارە**



ڤەکۆلینەکا مەیدانی ل رێکەفتی ٢٠/ ٤/ ٢٠١٣

**خشتەیێ (٧)**
**چیایێن دەڤەرا ناڤەراست ل پارێزگەها دهۆکێ**

| زنجیرا چیایی | | درێژاهی/ کم | تێکرایێ فرەهیێ/ کم | تێکرایێ بلنداهیێ/ متر | بلندترین بلنداهی/ متر | جهـ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هێلا باکووری | شرین | ٢٥ | ٧ | ١٤٠٠ ـ ١٥٠٠ | ١٧٢٤ | دناڤبەرا رووبارێ خازر و زێ مەزن |
| | پیرس | ٢٧ | ٦ | ١٣٠٠ ـ ١٥٠٠ | ١٧٤٨ | دناڤبەرا چیایێن کاروك و شرین |
| | گارە ژێری | ٤٠ | ٤ | ١٥٠٠ ـ ١٨٠٠ | ٢١٧٧ | ژ سوارەتیکا هەتا رووبارێ خازر |
| | گارە ژۆری | ٥٥ | ٥ | ١٤٠٠ ـ ١٦٠٠ | ١٨٣٥ | ژ ئاشەوا هەتا زێ |
| هێلا باشووری | قەندیل | ٢٥ | ٤ | ١٣٠٠ ـ ١٤٠٠ | ١٥٩٣ | دناڤبەرا گەلیێن زەنتە و بەخمە |
| | ئاکرێ | ٣٠ | ٥,٥ | ١١٠٠ ـ ١٣٠٠ | ١٥٤٨ | دناڤبەرا ریبارێن خازر و گەلی زەنتە |
| | مانگێشك | ١٣,٥ | ١,٤ | ١٠٠٠ ـ ١٢٠٠ | ١٤١٢ | ژ رێکا باگێرا هەتا گەلیێ مانگێشکێ |
| | کەمەکا | ٣٥ | ٢ | ١٠٠٠ ـ ١١٥٠ | ١٣٦٠ | ژ کانیکێن رۆژئاڤایی یێن حەوزا گەلیێ دهۆکێ هەتا رۆژهەلاتێ زاویتە |
| | سپیرێز | ٦ | ٤ | ١٠٠٠ ـ ١١٠٠ | ١١٠٠ | ناڤبەرا سکرێ دهۆکێ ل رۆژئاڤا و گوندێ بەربهارێ |
| | سپی | ٢٨ | ٤ | ٨٠٠ ـ ٩٠٠ | ١١٨٠ | ژ کانیکێن رۆژئاڤایی یێن حەوزا گەلیێ دهۆکێ هەتا گەلیێ بێسرێ |
| | بێخێر | ٤٠ | ٤ | ٩٥٠ ـ ١٠٥٠ | ١٣٨٠ | ژ فیشخابوور هەتا حەوزا گەلیێ دهۆکێ |

ـ Google earth ٢٠١٥

چیایێ مەتینی ل قەزا ئامێدیێ و پارێزگەها دهۆکێ (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٢ بکە)، لێ ئەگەر هەڤبەر بکەین دگەل زنجیرا چیایێن دەڤەرا بەرواری بالا و مەتین و نێروە و رێکان دێ بینین کو کێمتر یێ ئالۆزە و نە هند یێ لێکدبادایە د تەخ و سرۆشتێ سەرنشیڤیا خۆدا.

ئەڤ زنجیرە ژ لایێ درێژاهیێ ڤە دهێتە دابەشکرن بۆ دو بەشان، ئەوژی بەشێ و درێژاهیا وی دگەهیتە ٥٥کم و فرەهیا ٥کم و دەستپێدکەت ژ لایێ رۆژئاڤایی ل ئاشەوا و بەرەڤ لایێ رۆژهەلاتی هەتا رووبارێ زێ مەزن درێژدبیت. تێکرایێ بلنداهیێن وی دناڤبەرا ١٤٠٠-١٦٠٠ مەترانداپە و هژمارەکا گوپیتکێن بلند هەنە وەك گوپیتکا چیایێ (زۆما کری ١٨٣٥م) یێ دکەڤیتە گەلیێ شێرانەیی ل لایێ رۆژهەلاتی. بەشێ باشووری یێ ڤێ زنجیرا چیایی دهێتە نیاسین ب چیایێ گارەی ژێری و درێژاهیا وی نێزیکی ٤٠کم و دەستپێدکەت ژ لایێ رۆژئاڤایی ل ئاشەوا و هەتا لایێ رۆژهەلاتی ل رووبار خازر درێژدبیت. ئەڤ بەشە پتر یێ ئالوز و

بلندە. بلنداهیا بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە ٢١٧٧مەتران. ئەڤ زنجیرا چیایی دهێتە پارچەکرن ب هژمارەکا گەلی و نهالێن تەنگ و کوور وەك ئاشەوا و گەرەگو و هەڤەندکا[٧] و زێوە (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٣ بکە) و دێرەش ل بنارێ باکووری و چەمانکێ ل بنارێ باشووری.

هەردیسان هندەك چیایێن دی د هەمان درێژبوونا چیایێ گارەی دا هەنە وەك چیایێ سەرتاشیك (١٣٠٥)م ل نێزێکی ئاشەوا و چیایێ سەر حەسەن (١٣٠٨)م و چیایێ سوارەتیکا (١٤٣١)م .

**دووەم: هێلا باشووری**

ئەڤ هێلە چیایێن (قەندیل، ئاکرێ، باکرمان، سپی و بێخێر)ی بخۆڤە دگریت و ژ لایێ رۆژهەلاتی بەرەڤ رۆژئاڤایی درێژدبیت. تێکرایێ بلنداهیا وان دناڤبەرا ١٠٠٠- ٢٠٠٠ مەتراندایە و دهێتە نیاسین ب هێلا باکووری یا دەڤەرا نیمچە چیایی و گرنگترین چیایێن وێ ئەڤەنە:

**١. چیایێ قەندیل:**

ئەڤ زنجیرا چیایی دەسپێدکەت ژ گەرویا بێخمێ ژ لایێ رۆژهەلاتی هەتا گەلیێ زەنتە ل لایێ رۆژئاڤایی ب درێژاهیا ٢٥کم و فرەهیا ٤کم و تێکرایێ بلنداهیا وی دناڤبەرا (١٣٠٠-٢٤٠٠) مەتراندایە لێ بلنداهیا بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە (١٥٩٣) مەتران ل سەر ئاستێ ڕوویێ دەریایی.

**٢. زنجیرا چیایێ ئاکرێ:**

زنجیرەکا چیاییە ژ رووبار زێ مەزن دەستپێدکەت و دناڤ باژێرێ ئاکرێ را دەرباز دبیت و پاشی بۆ رۆژئاڤایێ رووبارێ خازر دچیت و دهێتە دابەشکرن بۆ چەند چیایان ئەوژی ئەڤەنە:

أ. چیایێ ئاکرێ: ئەڤ چیایە ژ گەلیێ زەنتە ل رۆژهەلاتی درێژدبیت هەتا رووبارێ خازر ل روژئاڤایی و درێژاهیا وی دگەهیتە ٣٠کم و فرەهیا وی ٥کم و بلندترین خالا گوپیتکا وی دگەهیتە

وێنەیێ (٣)

گەلیێ زێوە (سێ پرکا) چیایێ گارەی



- ڤەکۆلینەکا مەیدانی ل رێکەفتی ١/٨/ ٢٠١٥

(١٥٤٨) مەتران ل هنداڤ باژێرێ ئاكرێ و ژ چەند چیایێن دی پێكدهێت ئەوژی ئەڤەنە:

ب. چیایێ سەرێ ئاكرێ: ئەڤ چیایە دكەڤیتە سەر باژێرێ ئاكرێ و بلنداهیا بلندترین گوپیتكا وی دگەهیتە (١٥٤٨) مەتران، ئاراستەیێ وی ژ باكوورێ رۆژئاڤایی بەرەڤ باشوورێ رۆژهەلاتی درێژدبیت و ژ هندەك بەرێن كلسی پێكدهێت و بنارێ وی سەرنشیڤیەكا دژوار یا هەی لەورا دیاردا كەفتنا كەڤران لێ رویدەت.

ت. چیایێ گەلی: دكەڤیتە باكوور و باكوورێ باژێرێ ئاكرێ و ئەڤ چیایە درێژاهیا چیایێ بەری نهایە لێ بلنداهیا وی دگەهیتە (١٠١٠) مەتران.

پ. چیایێ سەرێ سادا: دكەڤیتە رۆژهەلاتێ باژێرێ ئاكرێ و درێژاهیا وی دگەهیتە (١٢٤٥) مەتران.

ج. چیایێ باكرمان: ئەڤ ناڤە دهێتە گۆتن بۆ بەشێ رۆژئاڤایی یێ چیایێ ئاكرێ هەتا رووبارێ خازر و بلندترین گوپیتكا وی دگەهیتە (١٠٤٤) مەتران.

**٣. چیایێ سپی:**

ئەڤ چیایە بەشەكی ژ زنجیرا چیایێ بێخیری پێكدئینیت و دەستپێدكەت ژ دەڤەرا دابەشكرنا زنجیرا چیایێ بێخێر بۆ هەردو بەشێن باكووری كو دبێژنێ چیایێ سپی و درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٨كم و فرەهیا وی ٤كم و بلنداهیا وی دناڤبەرا (٨٠٠-٩٠٠) مەتران دایە و بلندترین گوپیتكا وی دگەهیت (١١٨٠) مەتران.

**٤. چیایێ كەمەكا:**

ئەڤ چیایە سنوورێ باشووری یێ حەوزا رۆكەرم و سنوورێ باكووری یێ حەوزا گەلیێ دهۆكێ بخۆڤە دگریت و درێژاهیا وی دگەهیتە ٣٥كم و فرەهیا ٢كم هەتا دگەهیتە دەڤەرا زاویتە، تێكرایێ بلنداهیا وی دگەهیتە ١٠٠٠-١١٠٠ مەتران و بلنترین گوپیتكا وی دگەهیتە ١٣٦٠ مەتران (كانیكێن رۆژئاڤایی یێن حەوزا گەلیێ دهۆكێ).

**٥. چیایێ سپیرێز:**

زنجیرەكا چیایا كورتە، دكەڤیتە ناڤبەرا چیایێ كەمەكا ل باكووری و چیایێ بەرۆشكێ ل باشووری، ب درێژیا ٦كم و پانیا ٤كم، تێكرایێ بلندیا وی د ناڤبەرا ١٠٠٠- ١١٠٠ مەترانداپە.

**٦. چیایێ بێخێر:**

دهێتە هژمارتن گرنگترین و بلندترین چیا ل پارێزگەها دهۆكێ، ئەڤ چیایە ژ لایێ رۆژئاڤایی ل گوندێ دێرەبوینێ ل سەر شێوەیێ زنجیرەیەكا درێژ دەستپێدكەت و بەرەڤ ئاراستەیێ باشوورێ رۆژهەلاتیڤە دچیت هەتا دگەهیتە سنوورێ باژێرێ دهۆكێ و درێژاهیا وی دگەهیتە ٤٠كم، هەر دیسان لایێ باكووری یێ حەوزا دەشتا سلێڤانەیان بخۆڤەدگریت كو تێكرایێ بلنداهیا وی دگەهیتە ١٠٠٠-١٢٠٠ مەتران لێ بلندترین گوپیتكا وی دگەهیتە ١٣٥٨ مەتران ل نێزیكی گوندێ كێڤلا. بنارێ وی یێ باشووری كێمتر یێ سەرنشیڤە ژ بنارێ وی یێ باكووری كو تێكرایێ وی ژ ٣٥ پلەیان پتر لێ ناهێت لەورا ئەڤ چەندە بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا رووبەرێن بەرفرەهـ یێن عەردی و دەركەفتنا چەندین كانیكێن ئاڤێ ب تایبەت ل گوندێ هاجیا.

## ٣. چیایێن هەرێما باشووری:

ئەڤ هەرێمە ل لایێ باكووری دگەهیتە چیایێن بێخێر، سپی، ئاكرێ و قەندیل و دهێتە نیاسین ب هێلا باكووری یا دەڤەرا نیمچە چیایی، هەردیسان ل لایێ رۆژئاڤا و باشوورێ رۆژئاڤایی دگەهیتە رووبارێ دیجلەی، و ل لایێ باشووری دگەهیتە بلنداهیێن باشیكێ و مەقلوب و ل لایێ رۆژهەلاتی ژی دگەهیتە رووبارێ زێ مەزن. رووبەرێ ڤێ هەرێمێ دگەهیتە ٣٧١٥كم٢ كو دبیتە رێژەیا ٣٤,٦٪ێ ژ سەرجەمێ چیایێن پارێزگەها دهۆكێ كو رووبەرێن وێ یێن چیایی دگەهنە ١١٠٠كم٢ ب رێژەیا ٢٠,٧٪ێ ژ سەرجەمێ چیایێن پارێزگەهێ. تەماشەی خشتەیێن (٣) و (٤) و وێنەیێن (١) و (٢) بكە. ل ڤێ هەرێمێ ئەم دشێن تێبینیا عەردێن راست ل گەلەك دەڤەرێن وێ بكەین

ئەوژی ژبەر بالادەستیا عەردێ دەشتێ ب تایبەت دەشتا سلێڤانەیا و دەشتا ئاکرێ.

سەرەرای هەبوونا رووبەرێن بەرفرەهـ یێن دەشتێ، لێ تێکرایێ بلنداهیا وێ دگەهیتە (٥٠٠-١٠٠٠) مەتران، (تەماشەی خشتەیێ ژمارە ٨ بکە)، دیارترین چیایێن وێ ئەڤەنە:

### أ. چیایێ زاوا:

ئەڤ زنجیرا چیایی دکەڤیتە باشوورێ باژێرێ دهۆکێ و درێژاهیا وی دگەهیتە ١٩کم کو هەر ژ زالگەها ئالۆکا دەستپێدکەت هەتا دگەهیتە لایێ رۆژهەلاتی ل نهالا گەلی کورتکی، تێکرایێ بلنداهیا وی دناڤبەرا (٧٥٠-٨٥٠) مەترانداینە لێ بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە (١٠٢٠) مەتران[8]. جوداهیا هەی دناڤبەرا خۆرستیبا عەردی یا بنارێ وێ یێ باکووری و بنارێ وی یێ باشووری و ئەڤ چەندە رەنگڤەدانێ ل سەر پلا سەرنشیڤیا ڕوویێ دەڤەرێ دکەت ب تایبەت ل دەڤەرا دناڤبەرا دومیز- فەیدیێ- شاریا. ل بنارێ وی یێ باشووری کانیکێن نەهالا شاریا پێکدئینیت و بنارێ وی یێ باکووری دکەڤیتە بەرامبەر باژێرێ دهۆکێ.

### ب. داکا:

هندەک بلنداهیێن نە گەلەک بلندن کو دناڤبەرا ٤٥٠(-٥٠٠) مەتران دانە و درێژاهیا وان دگەهیتە ٩,٣کم ژ لایێ رۆژئاڤایی ل فەیدیێ دەستپێدکەت هەتا رووبارێ بێداوە ل رۆژهەلاتی و بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە (٥٣٢) مەتران.

### ت. ئەلقۆش:

بلنداهیەکە درێژاهیا وێ دگەهیتە ١٩کم و ژ رووبارێ بێداوە دەستپێدکەت ل رۆژئاڤایی هەتا دگەهیتە گەلیێ باعەدرێ ل رۆژهەلاتی و هندەک جاران دهێتە ناڤکرن ب چیایێ ئەلقۆش، هەرچەندە بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە ٩٤٥ مەتران لێ تێکرایێ بلنداهیا وی دناڤبەرا ٥٠٠-٨٠٠ مەتران دایە.

### پ. بلنداهیێن شێخان:

درێژاهیا ڤان بلنداهییان دگەهیتە ٩کم و ل لایێ رۆژئاڤایی ل گەلیێ باعەدرێ دەستپێدکەت هەتا دگەهیتە گەلیێ لالش و باژێرکێ باعەدرێ دکەڤیتە سەر بنارێ وی یێ باشوورێ رۆژئاڤایی و شێخان دکەڤیتە سەر لایێ وی یێ باشوورێ رۆژهەلاتی و تێکرایێ بلنداهیا وی دناڤبەرا ٤٥٠-٥٠٠ مەترانداینە لێ بلندترین گوپیتکا وی دگەهیتە ٥٢٢ مەتران.

## ٣. بانی و گر:

ل سەر ڕوویێ پارێزگەها دهۆکێ هژمارەکا گر و بانییان هەنە کو دکەڤنە بەر بنارێ چیایێن دەڤەرێ

**خشتەیێ (٨)**

**چیا و بلنداهیێن دەڤەرا پێلدار (باشوورێ پارێزگەهێ)**

| زنجیرا چیایی | درێژاهی /کم | تێکرایێ فرەهیێ/ کم | تێکرایێ بلنداهیێ/ متر | بلندترین بلنداهی/ متر | جهـ |
|---|---|---|---|---|---|
| زاوا | ١٩ | ٣ | ٧٥٠ _ ٨٥٠ | ١٠٢٠ | ژ ئالۆکا هەتا گەلی کورتکی |
| داکا | ٩,٣ | ١,٥ | ٤٥٠ _ ٥٠٠ | ٥٢٣ | دناڤبەرا فەیدیێ و رووبارێ بیداوە دا |
| ئەلقۆش | ١٩ | ٣,٥ | ٥٠٠ _ ٨٠٠ | ٩٤٥ | ژ رووبارێ بێداوە هەتا باعەدرێ |
| شێخان | ٩ | ٢,٥ | ٤٥٠ _ ٥٠٠ | ٥٢٢ | ژ گەلیێ باعەدرێ هەتا رێکا لاش |

_ Google earth ٢٠١٥

و پتریا جاران ژ ئەنجامێ کریارا ڕامالینا ئاڤێ ل گەلییان ل بنێ چیاییان پەیدابووینە و ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەرێ پارچەبوونا وان بۆ گرك و بانییان کو بلنداهییا وان دناڤبەرا (٥٥٠-٧٥٠) مەتران دایە ل سەر ئاستێ ڕوویێ دەریایێ ل دەڤەرێن لێکبادانا وان یا سادە لێ ل دەڤەرێن چیایێن بلند و لێکبادانا ئالۆز بلنداهییا وان دگەهیتە پتر ژ (١٠٠٠) مەتران.

ل سەر ڤان گران ئەم دشێن تێبینیا هەبوونا هندەك درێژبوونان بکەین دگەل زنجیرەیێن چیایی کو هەمان سیفەتێن زنجیرەیێن چیایی هەنە لێ بلنداهی و سەرنشیڤییا وان کێمترە، ئەڤ گرە دگەل دروستبوونا زنجیرەیێن چیایان پەیدابووینە لەورا دبێژنێ گرێن جیولوجی زێدەباری هەبوونا هندەك کرگێن دی دبێژنێ گرێن شینواران کو گەلەك د بلند نینن و دهێنە لێکبادان هەروەکی گرێ مالتایێ ل باژێرێ دهوکێ کو ڤەدگەریتە چاخێن بەری دیرۆکێ و شێوەیێ وی یێ گروڤر نیشانێ دکەتە سەر هندێ کو ژ ئەنجامێ بەرمایکێن جڤاکێن مرۆڤایەتی یێن کەڤن پەیدابوویە.

## ١. بانی:

بانی ژ دەشتان بلندتر و پێلدارترن لێ ئاڤێن هەرکی و ڕووبار و نهالێن کوور ئەو پارچە پارچە کرینە و دبیت بانی ل هەمان سەردەمێ جیولوجی دورست ببن یێن کو چیایێن پارێزگەهێ لێ دروستبووین. بانی ل هندەك جهێن دەستنیشانکری یێن ڕوویێ پارێزگەها دهۆکێ هەنە کو بلنداهییا وان دناڤبەرا (٥٥٠- ٩٠٠) مەتراندایە لێ بلنداهییا هندەکێن دی دناڤبەرا (٩٠٠-١٨٠٠) مەتران دایە ب تایبەت ل دەڤەرێن چیایی یێن بلند، دیارترین بانێن پارێزگەهێ ئەڤەنە:

### أ. بانیا کواندە:

دکەڤیتە باکوورێ قەزا ئامێدیێ و بلنداهییا وێ د ناڤبەرا (٢١٠٠-٢٤٠٠) مەتران و دهێتە هژمارتن گرنگترین بانی ژ لایێ سرۆشتی ل دەڤەرێ و ژ پێکهاتەکا کەڤری پێکدهێت و هندەك بنارێن گەلەك ئاسێ و تیژ هەنە کو یا ب زەحمەتە مرۆڤ بشێت سەرکەڤیت، هەردیسان ب درێژاهییا وەرزێن زڤستانێ و بهارێ بەفر لێ دباریت[٩].

### ب. بانیا سەرسنکێ:

ئەڤ بانی یە پشکا ناڤەراست دناڤبەرا چیایێ مەتینی ل باکووری و چیایێ گارە ل باشووری داگیردکەت کو ڕووبەرەکێ عەردی یە ژ عەردێ دەوروبەری خۆ بلندتر لێ دهێت. بلندترین ڕوویێ وی دگەل ڕێکا (سەرسنك، ئینیشکی و قەدشێ) ئێکدگریت و بلنداهییا وی دگەهیتە ٩٠٠-١٠٠٠ مەتران، ل سەر ڕوییێ وی دو سەرنشیڤی یێن سەرەکی هەنە ئێك ژوان دکەڤیتە لایێ ڕۆژهەلاتی کو کانیکێن گەلیێ سپنەیێ ڕۆژهەلاتی لێ هەنە و یێ دی دکەڤیتە لایێ ڕۆژئاڤایی کو کانیکێن گەلیێ سپنەیێ ڕۆژئاڤایی لێ هەنە، ئەڤ هەردو گەلی یە بووینە ئەگەرێ پارچەکرنا ڕوویێ ڤێ بانیێ ئەوژی ب هاریکاریا چالاکیێن ڕامالینێ ل سەر ڕوویێ وی کو د بنەرەتدا ژ کەڤرێن خیزی پێکدهێت.

تێکرایێ فرەهییا وی ل ناڤەراستا بانیێ دگەهیتە ٦کم دگەل هەبوونا هندەك زێدەگاڤیێن فرەهیێ یێن تەنگ دگەل بنارێ باکووری یێ چیایێ گارەی و بنارێ باشووری یێ چیایێ مەتینی (دەڤەرا بەرلێڤێن چیایی)، ئەڤ درێژبوونە بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا سەنتەرێن شارستانی یێن پێشکەفتی وەکی قەدش و بامەرنێ. هەژی گوتنێ یە کو گەلیێن فرەهـ یێن سەرنشیڤ ل بنارێ باکووری یێ چیایێ گارەی (گەرەگو هەڤەندکا و دێرەش....) و بنارێ باشووری یێ چیایێ مەتینی (گەلیێ سیلاڤێ، ئەرەدنا، ئینیشکێ، داودیێ، گەلیێ دیهێ ....) بووینە ئەگەرێ پارچەبوونا ڕوویێ ڤێ بانیێ کو ببیتە دەڤەرەکا خۆرستییا ڕامالینا توند.

### ت. بانیا بەرواری بالا[١٠]:

ئەڤ بانی یە بەشێ ناڤەراست یێ دەڤەرا بەرواری بالا داگیردکەت، ژ لایێ باکووریڤە سنوورێ وی دهێتە دەستنیشانکرن ژ لایێ زنجیرەکا سادە یا چیایێن

دەڤەرا بەرواری بالا ل نێزیك گوندێن (ئورمەداودا) و (دەرگەلکا سەیدا) دگەل زنجیرا چیایێن بارۆخی و کوزنا و زنجیرا چیایێ (گەلیکی)، لێ سنوورێن وی یێن باشووری دگەل بناری باکووری یێ چیایێ مەتین درێژدبیت بتایبەت دگەل زنجیرا چیایێن (سەر دۆلا) هەتا دگەهیتە رووبارێ خابووری و ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە دگەهیتە زنجیرا چیایێن (کابنێرك).

دیارترین سیفەتێن بانیا بەرواری بالا ئەوە نە گەلەك یێ ئالۆزە و ژ لایێ تۆپۆگرافییایێ ڤە یێ سادەیە، ب تایبەت هەکە دگەل بانیا سەرسنکێ هەڤبەر بکەین، هەردیسان هژمارەکا دەشتێن بەرفرەهـ لێ هەنە وەك دەشتا چەقەلا و گرێ سۆر و بناڤیکێ، درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٦کم و فرەهیا وی ٦کم و بلنداهیا وی دگەهیتە ١٠٥٠م و رووبەرێ وی دگەهیتە ١١٢کم٢.

## ٢. گر:

ل سەر عەردێ رووبێ پارێزگەها دهۆکێ هژمارەکا مەزن یا گران هەنە کو هەمی ژی دکەڤنە بەر سینگێ چیایێن دەڤەرێ کو ئەوژی ژ ئەنجامێ رامالینا ئاڤێن گەلیێن کوور ئەڤێن دکەڤنە بنارێن چیایان دروستبووینە و ئەڤ رامالینە بوویە ئەگەرێ هندێ بنارێ چیایان ببنە گر کو بلنداهیا وان دناڤبەرا ٥٥٠-٧٥٠ مەتران دایە، لڤێرێ مە دو جۆرێن گران یێن هەین.

### أ. گرێن بنارێن چیایان:

زنجیرەکا درێژ یا گرێن پارچە پارچە بووینە کو ژبەر گەلیێن سەرنشیڤ یێن بنارێن چیایێن دەڤەرێ پەیدابوونە و پتریا جاران ب چیایانڤە دهێنە گرێدان و بلنداهیا وان دناڤبەرا (٦٥٠- ٧٠٠) مەترانە ل دەڤەرێن نیمچە چیایی و دەڤەرێن چیایێن نە گەلەك بلند. ئەڤ گرە پتریا جاران بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا گوندان و دەڤەرێن شارستانی یێن پێشکەفتی وەك بازێرێ دهۆك و زاخۆ و ئاکرێ ئەوژی ژبەر زەنگینیا وان ب ژێدەرێن ئاڤا ژێرعەرد و نێزیکیا وان ژ دەشتێن کو ئاخەکا ب زاخ بۆ چاندنێ هەین.

ل ڤێرێ مە چەند گر هەنە دێ ئاماژێ پێ دەین[11]:

- **گرێ ئاکرێ**، دکەڤیتە نێزیك چیایێ سەرێ گارەی و بلنداهیا وان دگەهیت ٧٣٦ مەتران.
- **گرێ سەرێ ئاکرێ**، ئەڤ گرە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ بازێرێ ئاکرێ و بلنداهیا وی دگەهیتە ٦٨٠ مەتران.
- **گرێ تۆپا**، گرەکێ مەزنە دکەڤیتە لایێ رۆژهەلاتی یێ بازێری و بلنداهیا وی دگەهیتە ٨٢٩ مەتران.
- **گرێ باشقال**، ئەڤ گرە دکەڤیتە لایێ باشوورێ رۆژهەلاتێ بازێری و بلنداهیا وی دگەهیتە ٦٠٥ مەتران.

### ب. گرێن تاك:

هندەك گرن ل سەر شێوەیێ یەکەیێن ژێکڤەبوویی خۆیا دکەن یانژی دناڤ هندەك کۆمێن بچویك دا ل ڤێرێ و وێراهە دناڤبەرا زنجیرە و گوپیتکێن چیایان یانژی دناڤ بانی و دەشتێن دەڤەرێ دا، هندەك ژوان هاتینە دروستکرن و هندەك ژوان ژی د مێژوویینە کو ڤەدگەرنە چاخێن دیرۆکی یێن کەڤن و شێوەیێ وان یێ بازنەیی هێمایێ دکەتە سەر هندێ کو ئەو ژبەرمایکێن شارستانییێن کەڤن پەیدابوونە، هندەك ژی ئەگەرێ دیاردا رامالینا ئاڤێ ل نهال و گەلیێن دناڤبەرا چیاياندا پەیدابووینە، ب شێوەیەکێ گشتی بلنداهیا وان دناڤبەرا ٤٠٠-٤٥٠ مەتراندایە، دیارترین گر ل دەڤەرێ گرێ (نیسکا) یە ل ل باشوورێ سەنتەرێ قەزا سێمێلێ و گرێ (بەلەك) ل سەنتەرێ ناحیا باتێلێ کو بلنداهیا وی دناڤبەرا ٤٨٠-٥٠٠ مەتراندایە و گرێ (داری) کو بلنداهیا وی دناڤبەرا (٥٠٠-٥٢٠) مەتران دایە [12].

هەردیسان گرێ ناتۆرا (١٢٣٥م) و گرێ رۆمارایا (١١٠٨م) ل نێزیکی گوندێ ئەرەدنا و گرێ کەچەل (١٠٥١م) ل نیڤا رێکا دناڤبەرا بازێرێن سەرسنك و قەدشێ دا، ژ گرێن دی ل بەشێن رۆژئاڤایی ژ بانیێ گرێ هاجیا (٩١٧م ) ل نێزیکی گوندێ سەیداڤا و

گرێ غلبیش (٩٠٨م) و گرێ عەجوا (٨١٢م) دناڤبەرا گوندێن تەحلاڤا و هەمزا دا، هەردیسان ل باشوورێ دێرەلوکێ هندەك گر هەنە وەكی گرێ قایدا (٧٦٤م) و گرێ پاسێ (٨٥٧م)[١٣].

## دووەم: دەشت

دەشت ئەو دەڤەرا ڕاستە یا ژ ئەنجامێ كریارێن سەرئێك خرڤەبوونا ئاخێ پەیدابووین دگەل هەبوونا جوداهیا فاكتەرێن بووینە ئەگەرێن دروستبوونا وان ڤێجا چ دەشتێن ئاڤی بن وەكی ئەڤێن ل بنارێن چیایان یانژی دەشتێن دناڤبەینێ دا (دەشتێن دناڤبەینا چیایاندا) بن، دەشتێن ئاڤرابوونان ئەوێن ل بەر لێڤێن رووباران پەیدابوون، دەشتێن ژ ئەنجامێ رابوونا بای پەیدابووین وەكی دەشتێن بیابانێ یانژی دەشتێن كناری یێن ژ ئەنجامێ پێلێن دەریایی پەیدابووین.

گرنگیا دەشتان د ژیانا مرۆڤاندا بۆ هندێ دزڤریت كو ئاخەكا ب پیت و نوی و راست لێ هەیە لەورا دهێنە نیاسین باشترین دەڤەرێن چاندنێ و هەبوونا ژێدەرێن ئاڤێ یێن بەردەوام ب تایبەت ئەو ئاڤێن بەردەوام د وەك رووباران هەرِكن. لەورا ئێكەم ئاكنجیبونێن مرۆڤان و گەشەكرنا وان ل جهێن دەشت پەیدابووینە و ڤێ چەندێ ڕەنگڤەدان كرییە سەر دروستبوونا باژێران ل وان جهان.

ل دەڤەرا ئەڤ ڤەكۆلینە ژێدگریت دیاربوویە كو یەكەیا عەردێن دەشتی رووبەرێن بەرفرەهـ یێن رووبێ پارێزگەهێ بخۆڤەگرتینە و مەزنترین رووبەر ژێ دكەڤیتە بەشێن وی یێن باشووری لێ چەند بەرەڤ باكوور و باكوورێ رۆژهەلاتیڤە بچین رووبەرێ ڤان دەشتان كێمتر لێ دهێت. هەژی گوتنێ یە كو پتریا دەشتێن دەڤەرێ ژ ئەنجامێ كریارێن سەرئێك خرڤەبوونا وان بەرمایكان پەیدابووینە یێن ژ ژووردانیێن چیایان هاتینە خوارێ و ل بنارێ چیایی سەرئێك خرڤەبووین یانژی ئەو بەرمایكێن ئاڤێن رووبارێن دگەل خۆ ئینایین و ل هندەك جهان سەرئێك خرڤەبووین و دەشت پەیداكرین، ئەم دشێین دەشتێن پارێزگەهێ ل سەر ڤان جۆران دابەش بكەین:

### ١. دەشتێن ئاڤرابوونان:

دەشتێن ئاڤرابوونان ئەو عەردێن ڕاستن یێن دكەڤنە لایەك یان هەردو ئالیێن رووباران و تژی بووینە ژ بەرمایكان كو پێكدهێن ژ كەرەستەیێن خیزی و هەرِێ و تەقنێ و دبیت جوداهیا فرەهیا ڤان دەڤەران پشت بەستنێ بكەتە سەر وێ قۆناغا رووبار یان گەلی تێرا دبووریت، ب ڕەنگەكی رووبار ل دەستپێكا قۆناغا دناڤبەرا كەڤرێن ئالۆز دا دهێتە دۆرێچكرن ب ڕەنگەكی كو دەشتێن ئاڤرابوونان دناڤبەرا هەرِكینا ئاڤێ و لێڤێن گەلیاندا دروست دبیت و دەمێ ئەڤ رووبارە دگەهیتە قۆناغێن درێژتر ناڤخۆیا نهالا وێژی فرەهـ دبیت ئەو ژی ژ ئەنجامێ تاشینا ئالیێن وێ و خواربوونا ئاراستێن وێ كو دبیتە ئەگەرێ پالدانا لێڤێن رووباری یێن دوور ژ هەرِكینا ئاڤێ و ب ڤێ چەندێ دێ هندەك رووبێن كەڤری یێن ڕاست دروست بوون و دێ د ئامادەبن بۆ هندێ بەرمایك ل دەمێ ئاڤرابوونان ل سەر خرڤەبن[١٤]. ئەڤ چەندە چێدبیت ب رێكا رابوونا ئاڤا رووباری ل سەر هەردو ئالیێن وی و دەمێ ئاڤا رووباری ژ سنوورێن خۆ یێن هەرِكینێ دەردكەڤیت لەزاتیا وێژی كێمتر لێ دهێت و هوسا تەخەكا وان بەرمایكێن ئاڤا رووباری نەشێت هەلگریت دێ ل سەر هەردو ئالیێن رووباری كەڤنە سەرئێك وەكی كەرەستەیێن هەلگرتی و ژ ئەنجامێ دووبارەبوونا ڤێ كریارێ دەشتێن ئاڤرابووی پەیدادبن، ب شێوەیەكێ گشتی دینامیكا دروستبوونا دەشتێن ئاڤرابووی د سێ قۆناغان را پەیدادبیت ئەوژی ل ئەنجامێن[١٥] (Bunnett١٩٦٥):

١. قۆناغا فرەهبوونا گەلی ب رێكا تاشینا ئالیێن وێ.
٢. سەرئێك خرڤەبوونا كەرەستەیان ل هەردو ئالیێن رووباری كو هاریكاریا دروستبوونا شریتێ، خاڵ (Point bar) دكەت و پشتی هینگێ دبیتە بەشەك ژ دەشتێن ئاڤرابووی.
٣. قۆناغا سەرئێك خرڤەبوونا خیزی و هەری و تەقنێ ل سەر عەردێ گەلی.

پتریا جاران فرەهبوونا دەشتێن ئاڤرابووی پشت بەستنێ دکەتە سەر قۆناغا جیومورفۆلۆژی یا رووباری، هەرچەند رووبار د قۆناغا جیومورفۆلۆجیدا دەربازبیت (ئانکو بەرەڤ ئاراستەیێ پیراتیێ) دێ فرەهیا وێ زێدەتر لێ هێت، ئەڤ دەشتە ب هندێ دهێنە نیاسین کو هندەك ئاستێن نزمن کو تا رادەیەکی نێزیکی ئاستێ بنکێ رامالینێ یە و دبیت پلەیا وێ ژ (٣) نەبووریت، ل پارێزگەهێ بەلاڤبوونا دەشتێن ئاڤرابووی پەیوەندی ب وان رووبارانڤە هەیە یێن بەردەوام ئاڤا وان د هەرکیت زێدەباری گەلیێن ئاڤا وان ب شێوەیەکێ وەرزی د هەرکیت (وەك رووباران) لێ ب شێوەیەکێ کێمتر، دیارترینێن وان ژی ئەڤەنە:

**أ. رووبارێ دهۆکێ:**

ئەڤ رووبارە ل هندەك رووبەرێن عەردی یێن بچویك دیار دبیت کو رەنگە فرەهیا وان ژ ٥٠ مەتران نەبووریت لێ ل دەڤەرێن ئالۆزبوون و لێکبادانێن رووباری فرەهتر لێ دهێت و رێژەیا کەرەستەیێن سەرێك خرڤەبووی ژی ل لایەکێ وێ پتر لێ دهێت و هوسا دەشتەکا ئاڤرابووی دروست دبیت. ب شێوەیەکی گشتی ئەڤ دەشتە بۆ مەرەمێن چاندنێ دهێنە بکارئینان و هندەك جهان ژی بۆ مەرەمێن گەشتوگوزاری و دروستکرنا گازینویان دناڤ سنوورێ باژێرێ دهۆکێ دا هاتینە بکارئینان ب تایبەت دەڤەرێن دناڤبەرا رێڤەبەریا تاپۆیێ ل دهۆکێ و چاریانا کورەك، ئەڤ چەندەژی بوویە ئەگەرێ کێمبوونا گرنگیا دەشتا ئاڤرابووی یا پەیوەندی ب رووبارێ هشکەرویی ڤە هەی و کێمتر دهێتە بکارئینان.

**ب. دەشتا خازر:**

ئەڤ دەشتە دکەڤیتە سەر لێڤێن رووبارێ خازری و دەوروبەرێن وێ، ب رەنگەکی ئەڤ دەشتە درێژبوونەکە بۆ دەشتا ئاکرێ یا دکەڤیتە رۆژهەلاتێ وێ، تێکرایێ فرەهیا وێ دناڤبەرا ٥٠-١٠٠ مەترانداپە و تێکرایێ سەرنشیڤیا عەردێ وێ دناڤبەرا (١-٣) پلەیاندا لێ ئەڤ سەرنشیڤیە ل جهێن باکووری پتر لێ دهێت تا دگەهیتە (٧) پلەیان. ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ دەشتە بۆ چاندنا بەروبوومێن دانودکاکی دهێتە بکارئینان زێدەباری چاندنا دارێن فێقی.

**ت. رووبارێ زێ مەزن:**

باشترین دەڤەرێن دەشتی هینگێ پەیدادبن دەمێ رووبار دناڤ دەڤەرەکا چیایی یا ئالۆز دا دەردکەڤیت، ئەو دەشتەی دەست ب فرەهبوونێ دکەت دەمێ نێزیکی باژێرکێ دێرەلوکێ دبیت کو فرەهیا وێ دگەهیت (٦٠- ١٥٠) مەتران، پتریا عەردێ وێ دهێتە چاندن بۆ دارێن فێقی زێدەباری بۆ مەرەمێن وەبەرهێنانێ ل دەڤەرێن باشوورێ دێرەلوکێ یێن دکەڤنە سەر ڤێ دەشتێ و بووینە جهێن گوزاری.

**پ. دەشتا رووبارێ خابووری:**

دەمێ رووبارێ خابووری دهێتە دناڤ سنوورێن عیراقێ دا و پاشی دگەهیتە پارێزگەهێ ل دەڤەرەکا خۆرستیا ئالۆز، شیانێن رووباری بۆ فرەهکرنا دەشتا ئاڤرابووی یا ل رەخێن وێ پتر لێ دهێت، ل دەڤەرا بێکوڤا فرەهیا ڤێ دەشتێ دگەهیتە ١٥٠ مەتران و تا دگەهیتە دەڤەرا پاسێ ئەڤ فرەهیە دگەهیتە ٣٥٠ مەتران، ئەڤ دەشتە ب درێژاهیا خۆ ژ لایێ وان گوندێن دکەڤنە سەر رووباری بۆ مەرەمێن چاندنا دارێن فێقی دهێتە ب کارئینان لێ دیارترین فرەهیا وێ ل وی دەمی پەیدادبیت دەمێ دگەهیتە رووبار دیجلەی ل دەڤەرا سێکوشەیا عیراقی کو نێزیکی ٥٠٠ مەتران فرەهـ دبیت[١٦]. باژێرێ زاخۆ دهێتە هژمارتن گرنگترین باژێرێ دکەڤیتە سەر ڤی رووباری و پتریا ئالیێن ڤی رووباری بۆ مەرەمێن گوزاری هاتییە ب کارئینان وەك دروستبوونا باخچە و گازینو و خارنگەها زێدەباری چاندنێ.

**ج. دەشتا رووبارێ دیجلە:**

ژ دەمێ ئەڤ رووبارە دگەهیتە سنوورێ عیراقێ دەڤەرێن دەشتی ل سەر ئالیێن وی دروست دبن هەتا دگەهیتە دەریاچا سکرێ مووسل، لێ فرەهیا وێ ژ

جهەکی بۆ جهەکێ دی یا جودایە کو دناڤبەرا (١٠٠-٣٥٠) مەتراندایە و ئەڤ چەندە ڤۆناغا گەشەکرنا رووبارێ دیجلەی دیاردکەت ب تایبەت ل دەڤەرا فێشخابوور و ل دووڤدا فرەهییا ڤێ دەشتێ ل نێزیکی گوندێ بەغلوجە پتر لێ دهێت تا دگەهیتە ٥٠٠ مەتران[17] و پتریا رووبەرێن وێ ل دەڤەرا فیشخابۆر بۆ مەرەمێن چاندنێ دهێتە بکارئینان ئەوژی ژبەر راستیا عەردێ وێ و باشی و پیتیا ئاخێ و هەبوونا ئاڤێ.

## ٢. دەشتێن خڕڤەبووی:

ئەڤ دەشتە ژ ئەنجامێ سەرێك خڕڤەبوونا وان کەرەستەیان پەیدابووینە یێن ژ ژێهەلیێن چیایان دهێنە خوارێ و ل بنارێ چیایی کۆم بووین ئەوژی ل دووڤ سەرنشیڤیا روویێ وی عەردی. لڤێرێ شیانێن ئاڤێ بۆ هەلگرتنا کەرەستەیێن خۆ کێمتر لێ دهێت لەورا دندکێن هویر وەکی یێن خیزی و تەڤنێ دێ ل ڤان دەڤەران سەرێك خڕڤەبن و پشتی چەند هزار سالان دێ دەشتێن خڕڤەبوویی ل بنارێ چیایان دروستبن کو ئاخەکا نەرم هەیە و دهێتە هژمارتن باشترین جۆرێ ئاخێ بۆ کریارێن چاندنێ، هندەك جاران بەشێن وێ یێن سەری ب هندەك بەرمایکێن زڤر و هندەك جاران ژی ب کەڤرێن نەرم دهێتە نخافتن کو ئەڤ چەندە ژی ستویراتی و نەرماتیا وێ زێدەدکەت، ئەم دشێن ڤان دەشتان ل سەر ڤان جۆران دابەش کەین:

أ. دەشتێن هەرێما باکووری (ئیستیبلان، نینك)

ب. دەشتێن هەرێما ناڤنجی (زێ، ئامێدی، بامەرنێ، سندی، زێبار، نەهلە، مەمانێ)

ت. دەشتێن هەرێما باشووری (ئاکرێ، باعەدرێ، سلێڤانەیی)

### أ. دەشتێن هەرێما باکووری (ئیستیبلان، نینك)

دەشتێن ڤێ دەڤەرێ ب هندێ دهێنە نیاسین کو ئاخا وێ یا زەنگینە ب کەرەستیەیێن ئەندامی (مواد عضوية)، ژبەرکو دکەڤنە دناڤبەرا دو چیایاندا (ناڤ گەلیاندا)، هەردیسان ژبەرکو رووبەرێ وان یێ بچویکە و فرەهییا وان یا کێمە و درێژاهییا وان یا درێژە ئەڤ چەندە ژی ڤەدگەریت بۆ سروشتێ خۆرستی یێ ئالۆزێ وێ دەڤەرێ، لەورا ل ڤێرێ دێ بەحسێ دو دەشتێن ڤێ هەرێمێ کەین:

#### ١. دەشتا حەوزا ئیستیبلان:

دەشتا ئیستیبلان دکەڤیتە دووماهیا باکوورێ رۆژئاڤایێ قەزا زاخۆ و دگەهیتە چیایێن کیرە و دیرە ل لایێ باشوورێ دگەهیتە گەلیێ دەشتتاخ و ل لایێ رۆژئاڤایی دگەهیتە رووباری هیزل و ل لایێ باکووری دگەهیتە چیایێن شەرانشن ئەڤ حەوزە بەشەکێ ئالۆز یێ دەڤەرێ پێکدئینیت.

ئەڤ دەشتە یا تەنك و درێژە ئاراستەیێ وێ ژ رۆژهەلاتی بۆ رۆژئاڤایی ب درێژاهییا ١٩کم و فرەهییا دناڤبەرا ٣٠٠م هەتا کیلومەترەکێ فرەهـ دبیت، ئەڤ دەشتە رادبیت ب هەرکاندنا ئاڤا گەلیێ ئیستیبلان دا برێژیتە رووبارێ هیزلی ل لایێ رۆژئاڤایی ب بلنداهییا ٥٦٠م، فرەهترین خالا ڤێ دەشتێ دکەڤیتە نێزیکی گوندێ قەسرۆکێ ب فرەهییا ١کم و پاشی بەرەڤ رۆژهەلاتی تەنگ دبیت هەتا دبیتە ٣٠٠م. هەرچەندە رووبەرێ ڤێ دەشتێ یێ بچویکە لێ ئاخا وێ یا زەنگینە ب کەرەستەیێن کیمیایی و ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ بۆ مەرەمێن چاندنا دارێن فێقی[18] دهێتە بکارئینان، (تەماشەی وێنەیێ ژمارە (٤) بکە.

#### ٢. دەشتا نینك[19]:

دەشتەکا تەنگ و خودان رووبەرەکێ بچویکە و سروشتەکێ خۆرستی یێ پارچە پارچە یێ هەی، ئەڤ دەشتە ل لایێ باکووری دگەهیتە چیایێ مەتینی (لایێ رۆژئاڤایێ چیایی) و لایێ باکوور و باکوورێ رۆژئاڤایی دگەهیتە چیایێ کومارك (١٥٩٠م) و ڤێ دەشتێ سەرنشیڤییەکا گشتی ژ لایێ رۆژهەلاتی بۆ رۆژئاڤایی یێ هەی و رادبیت ب هەرکاندنا ئاڤا رووبارێ نینك ب درێژاهییا ٣٨کم و هێدی هێدی فرەهییا ل بەشێن رۆژهەلاتی زێدەدبیت تا دگەهیتە ٣کم ل بلنداهییا ١٢٠٠ مەتران، لێ ل لایێ رۆژئاڤایی فرەهییا

وی کێم دبیت بۆ ٥٠٠ مەتران دەمێ دگەهیتە رووبارێ خابووری ب بلنداهیا ٥٧١ مەتران. ل سەر روویێ ڤێ دەشتێ گەلەك گوند هاتینە ئاڤاكرن وەك گوندێن (سەرگەلێ، كانی سارك، چەم سەیدا، خشخاشا و بازێ).

## ب. دەشتێن هەرێما ناڤەراست:

ئەڤ دەشتە ب هندێ دهێنە نیاسین كو كێمتر د سەرنشیڤن و فرەهترن ژ دەشتێن هەرێما باكووری ل پارێزگەها دهۆكێ (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە ٣ بكە)، دیارترین دەشتێن ڤێ هەرێمێ:

### ١. دەشتا زێ مەزن (دەشتا زێ):

ئەڤ دەشتە دكەڤیتە دناڤبەرا رووبارێ روویێ شین و زێ مەزن ل لایێ رۆژهەلاتی و رووبارێ سپنەیێ رۆژهەلاتی ل لایێ رۆژئاڤایی، هەردیسان دناڤبەرا چیایێ لینك ل باكووری و چیایێ پیرس ل باشووری. ئەڤ دەشتە ب هندێ یا بەرنیاسە كو یا زەنگینە ب ژێدەرێن ئاڤا سەر عەرد و ئاڤا ژێر عەرد و ئاخا وێ ژی یا باش و ب پیتە و رێكێن هاتن وچوونێ ل سەر هەنە لەورا بوویە ئەگەر گەلەك جۆرێن چاندنێ لێ بێنە چاندن، زێدەباری گرنگیا ئاكنجیبوونێ ژبەركو گەلەك كۆمەلگەهێن ئاكنجیبوونێ ل سەر ڤێ دەشتێ پەیدابووینە وەك كۆمەلگەها سیرێ و شیلادزێ و دێرەلوكێ[٢٠]، ئەڤ دەشتە ب درێژاهیا (١٧)كم و تێكرایێ پانیا وی (٢,٥)كم و رووبەرێ ب (٤٢)كم٢ دهێتە تەخمینكرن، ڤێ دەشتێ سەرنشیڤیەكێ گشتی یا هەی ژ ئاراستەیێ باكوور بەرەڤ باكوورێ رۆژئاڤایی و ژ ئاراستەیێ باشوور بەرەڤ باشوورێ رۆژهەلاتی، ئاخا ڤێ دەشتێ رەنگەكەكێ قەهوایی یێ تاری یێ هەی و یا زەنگینە ب كەرەستەیێن ئەندامی ئەوژی ژ ئەنجامێ چریا شینكاتی و كەشوهەوایەكێ باش ل وێ دەڤەرێ.

وێنەیێ (٤)
دەشتا ئیستیبلان ل رۆژئاڤایێ زاخۆ




- وێنە ژئالیێ ڤەكۆلەریڤە ل ٢٠١٣/٨/٢٠ هاتیەگرتن.

**٢. دەشتا ئامیدیێ:**

ئەڤ دەشتە دکەڤیتە عەردێ دناڤبەرا چیایێ گارەی ل باشووری و چیایێ مەتینی ل باکووری و بازێرێ دێرەلوکێ ل رۆژئاڤایی و رێکا سەرسنك- ئینیشکێ ل رۆژهەلاتی، و ئاڤێ ژ گەلیێ سپنەیێ رۆژهەلاتی وەردگریت، ئەڤ دەشتە ل هندەك بەشێن وێ یێن باکووری هندەك بلندی و نزماتی ل دەڤ دیاردبن ب رەنگەکی بلنداهییا وێ دگەهیتە ١٠٠٠م ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی و ب ڤی رەنگی پلا سەرنشیڤییا وێ بەرەڤ ئاراستەیێ دێرەلوکێ کێم دبیت تا دگەهیتە ٦٥٠ مەتران.

درێژاهییا ڤێ دەشتێ دگەهیتە ٢٥کم و فرەهییا وێ دگەهیتە ٤کم و رووبەرێ وێ کێمترە ژ ١٠٠کم٢ و عەردێ وێ گەلەك بلندی و نزمی لێ هەنە لێ ل هندەك دەڤەرا عەردێ وێ راست دبیت ب تایبەت ئەو جهێ دکەڤیتە سەر لایێ گەلیێ سپنەی کو ئاخەکا رەنگ تاری لێ هەیە. ل سەر ڤێ دەشتێ گەلەك جهێن ئاکنجیبوونێ یێن گرنگ پەیدابووینە وەك ئامێدیێ و دێرەلوك و قەدشێ، هەردیسان گەلەك سەیرانگەهێن دلڤەکەر ژی ل سەر هاتینە دروستکرن وەك سەیرانگەها سەرسنکێ و ئاشەوا ل لایێ وێ یێن باشووری و سەیرانگەهێن ئینشك و سویلاڤ و کەلا ئامێدیێ ل لایێ وێ یێ باکووری، هەردیسان هژمارەکا سکران ژی ل سەر هاتینە دروستکرن وەك سکرێ تاخێ ئازادی و سکرێ بهاری.

**٣. دەشتا بامەرنێ (دەشتا سپنەیێ رۆژئاڤا):**

ئەڤ دەشتە ب ڤی ناڤی هاتییەناڤکرن چونکی دکەڤیتە ناحیا بامەرنێ و د راستی دا ئەڤ دەشتە تەمامکەرا دەشتا ئامیدیێ یە لێ سرۆشتێ خۆرستییا عەردێ وێ کێمترە و پتر یا بەرفرەهە، ئەڤ دەشتە بەرەڤ رۆژئاڤایی ب درێژاهییا ٣٣کم و فرەهییا ٤کم درێژدبیت و رووبەرێ وێ دگەهیتە ١٣٢کم٢. ئەڤ دەشتە ژ رێکا دناڤبەرا (سەرسنك- ئامێدی) دەستپێدکەت، بەرەڤ رۆژئاڤایی درێژدبیت هەتا دگەهیتە دەشتا ئاڤرابووی یا رووبارێ خابووری نێزیکی گوندێ دوکەرێ، لێ کانیکێن بلند یێن گەلیێن سەرنشیڤی یێن چیایێن گارە و مەتینی بووینە ئەگەر عەردێ وێ تووشی بلندی و نزماتییان بیت، لێ




نەخشەیێ (٣)
دەشتێن هەرێما ناڤەراست ل پارێزگەها دهۆکێ

رووبەرێن وێ یێن دەشتی هێدی هێدی بەرفرەهتر لێ دهێن دەمێ نێزیکی سەروکانیێن گەلیێ سپنەی و رووبارێ خابووری دبن (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٥ بکە). ژبەر باشیا عەردێ وێ ئەڤ دەشتە دهێتە هژمارتن ئێك ژ دەڤەرێن چاندنێ یێن گرنگ ل قەزا ئامێدیی و ل سەر روویێ وێ هژمارەکا سکران هاتینە دروستکرن وەك سکرێن (شێخ مەما، گولێ، شرتی، ئاشەوا، و سپنە٢)، بامەرنێ و شرتی دیارترین ئاکنجیکەهێن خەلکێ ل ڤێ دەشتێ[٢١].

**٤. دەشتا سندی:**

دەشتا سندی دکەڤیتە نێزیك زنجیرا چیایێن شەرانش (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٦ بکە) و ئەڤ چیایە دبنە سنوورێ وێ یێ باکووری و ب تێکراییێن بلنداهیێ دناڤبەرا (١١٠٠-١٢٠٠)م دایە، چیایێ بێخیری ژی دبیتە سنوورێ وێ یێ باشووری ب تێکراییێن بلنداهیێ دناڤبەرا (١٠٠٠- ١١٠٠) مەتران، زێدەباری بلنداهیێن زاخۆ ب تێکراییێن بلنداهیێ دناڤبەرا (٧٠٠-٧٥٠) مەتران، ڤێ دەشتێ شێوەیەکێ سێگوشەیی یێ هەی ب ڕەنگەکی بنکێ وێ بەرەڤ ئاراستەیێ رووبارێ هیزل و سەرێ وێ بەرەڤ گوندێ ئاڤگەنیێ یە. درێژاهیا ڤێ دەشتێ دگەهیتە ٢٩کم و فرەهیا وێ ٦ کم و رووبەرێ وێ ژی نێزیکی ١٤٠کم٢[٢٢].

ل سەر روویێ ڤێ دەشتێ سەرنشیڤەکا گشتی یا هەی کو ژ ئاراستەیێ باکووری بەرەڤ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایی درێژدبیت، زێدەباری سەرنشیڤیا وێ ژ رۆژهەلاتی بەرەڤ رۆژئاڤایی ئەوا هەڤتەریب دگەل ئاڤا گەلیێ سندی هەتا درێژتە رووبار خابووری. ئەڤ دەشتە دهێتە هژمارتن ئێك ژ گرنگترین دەشتێن پارێزگەها دهۆکێ ئەوژی ژبەر راستیا عەردێ وێ و ئاخا وێ یا ڕەنگ قەهوایێ تاری بەرەڤ ڕەنگێ ڕەش. ل سەر ڤێ دەشتێ گەلەك گوند و کۆمەلگەهێن ئاکنجیبوونێ پەیدابووینە وەك باژێرێ زاخۆ و دەرکار و هیزاوا.

وێنەیێ (٥)
دەشتا ئاڤرابوویی یا گەلیێ سپنەیێ رۆژئاڤایی بەری بکەهیتە رووبارێ خابووری ب ٣ کیلومەتران




- وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل ١٧ /٣/ ٢٠١٠ هاتییەگرتن.

**وێنەیێ (٦)**
**دیمەنەكێ ل ئەسمانی بۆ حەوزا دەشتا سندی ل قەزا زاخۆ هاتییەگرتن**




ـ احمد علی حسن، التعریة المائیة فی حوض سهل السندی ـ زاخو، مجلة جامعة دهوك، المجلد(١٢)، العدد(٢)، لسنة ٢٠٠٩، ص٣٢٧.

**٥. دەشتا زێبار:**

ئەڤ دەشتە ب ڤی ناڤی هاتییە ناڤكرن چونكی گوندێن زێبارێ دكەڤنە سەر ڤێ دەشتێ و دهێتە هژمارتن ئێك ژ دەشتێن تەنگ چونكی فرەهییا وێ دناڤبەرا ٥٠٠م - ٣كم دایە. ئەڤ دەشتە دكەڤیتە دناڤبەرا چیایێن شرین ل باكووری و قەندیل ل باشووری و باشی ژ لایێ رۆژئاڤایی ل رۆژهەلاتێ گەلیێ زەنتە درێژدبیت بەرەڤ لایێ رۆژهەلاتی تا دگەهیتە گەلیێ بەخمە ب درێژاهییا ١٨كم، ڤێ دەشتێ سەرنشیڤیەكا گشتی ژ رۆژئاڤایی ب بلنداهییا ٩٤٠ هەتا رۆژهەلاتی ب بلنداهییا ٥٥٠ مەتران یا هەی تا دگەهیتە دەشتا ئاڤرابووی یا رووبارێ زێ مەزن. ئەڤ دەشتە ب هندێ یا ناڤدارە كو گەلەك داروبار و دارستان ل سەر هەنە و كەشوهەوایەكێ باش هەیە (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٧ بكە).

**٦. دەشتا ئاكرێ یا باكووری (دەشتا نەهلێ):**

ئەڤ دەشتە دكەڤیتە دناڤبەرا چیایێ پیرس و زنجیرا چیایێن ئاكرێ ل نێزیكی سنوورێ ناحیا دینارتێ و عەردێ وێ دهێتە ب كارئینان بۆ چاندنا برنجی و دارێن فێقی یێن جۆراوجۆر، هەردیسان ئێكە ژ دەشتێن تەنك چونكی فرەهییا وێ دناڤبەرا ٢,٥-٣كم بتنێ دایە و درێژاهییا وێ دگەهیتە ٣٦كم و ئێكە ژ دەشتێن زەنگین بۆ چاندنێ ب تایبەت چاندنا فێقی و كەسكاتی زێدەباری زەنگینیا وێ ب كانیك و ژێدەرێن ئاڤێ كو بوویە ئەگەر خەلك ل سەر ئاكنجی بیت ب تایبەت ل ناحیا دینارتێ و نەهلە و گوندێن بەزناز و زانە.

**وێنەیێ (٧)**
**دەشتا زێبارێ ل نێزیك گوندێ بەخمە**




ـ وێنە ژ لایێ ڤەكۆلەریڤە ل ٢٠١٥/٤/٢٥ هاتیبەگرتن.

**٧. دەشتا مەمانێ:**

ئەڤ دەشتە ب ڤی ناڤی هاتیە ناڤكرن چونكی گوندێ مەمانێ دكەڤیتە سەر ڤێ دەشتێ، ژ لایێ جوگرافی ڤە ئەڤ دەشتە دكەڤیتە دناڤبەرا چیایێ مانگێشكێ ل باكووری و سپیرێزێ ل باشووری و سنوورێ وێ یێ رۆژهەلاتی ژ گوندێ كورێت گاڤانا دەستپێدكەت و درێژدبیت بەرەڤ رۆژئاڤایی هەتا دگەهیتە گەلیێ مانگێشكێ و گەلیێ رۆگەرم بەری بگەهیتە رووبارێ خابووری، درێژاهیا ڤێ دەشتێ ١٦كم و فرەهیا وێ ٥كم و رووبەرێ وێ ژی دگەهیتە ٨٠كم٢. ل سەر رووبێ وێ سەرنشێڤیەكا سادە یا هەی لێ بلنداهیا پتریا عەردێ وێ دگەهیتە ٨٠٠م ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی و ل هندەك ئالیێن رۆژئاڤایی دگەهیتە ٧٠٠ مەتران[٢٣]. هەردیسان ئێكە ژ دەشتێن بەرنیاس بۆ چاندنێ ب تایبەت چاندنا دانودكاكی ژبەركو عەردێ وێ یێ گونجایە بۆ چاندنا گەلەك بەرهەمێن چاندنێ.

**٨. دەشتا مانگێشكێ:**

تایبەتمەندیێن ڤێ دەشتێ ژی وەكی یێن دەشتا مەمانێ نە ب تایبەت راستیا عەردێ وێ و ئاراستەیێ وێ بەرەڤ رۆژئاڤایی، سنوورێن وێ دكەڤنە دناڤبەرا چیایێ بەروشكێ ل باكووری و چیایێ مانگێشكێ ل باشووری لێ دەشتەكا تەنگە كو فرەهیا وێ ژ ٢كم نابووریت و درێژاهیا وێژی دگەهیتە ١٣كم و رووبەرێ وێ دگەهیتە ٢٦كم٢. بلنداهیا پتریا عەردێ وێ دناڤبەرا ٩٠٠-٩٥٠ م ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی.

## ت. دەشتێن هەرێما باشووری:

ئەڤ دەشتە دهێنە هژمارتن ژ گرنگترین دەشتێن پارێزگەها دهۆكێ (تەماشەی وێنێ ژمارە ٤ بكە) ئەوژی ژبەر رووبەرێ وان یێ بەرفرەهـ و راستیا عەردێ وان لەورا ژی گرنگترین ناڤەندێن چاندنا بەروبومێن دانودكاكی ب تایبەت گەنم و جەهی هەنە، ئەڤ

هەریمە بەشێن باشووریٚ پاریزگەهێ و هندەك بەشێن باكووری یێی دەڤەرا نیمچە چیایی ب خۆڤە دگریت و گرنگترین دەشتێن وێ ئەڤەنە:

**١. دەشتا ئاكرێ:**

ئەڤ دەشتە پتریا عەردێ باشووریٚ قەزا ئاكرێ و باكووریٚ قەزا بەردەڕەش پێكدئینیت و ژ لایێ جوگرافیڤە ل لایێ باكووری دگەل زنجیرا چیایێن ئاكرێ و چیایێ باكرمان و ل لایێ رۆژهەلاتی دگەل رووبارێ زێ مەزن و ل لایێ باشووری دگەل بلنداهیێن بەردەڕەش و چیایێ مەقلوب و ل لایێ رۆژئاڤایی دگەل بلنداهیێن شێخان ئێكدگریت. شێوەیێ ڤێ دەشتێ ژی وەكی سێگوشەكێ یە كو بنكێ وێ دكەڤیتە باكووری ب درێژاهیا ٦٥كم و سەرێ وێ بەرەڤ ئاراستەیێ قەزا بەردەڕەش درێژدبیت ب درێژاهیا ٢٩كم. سەرنشیڤیا ڤێ دەشتێ ژ باكووری بەرەڤ باشووری ب درێژاهیا ٣٥كم درێژدبیت و رووبەرێ وێ دگەهیتە نێزیكی ١٦٤٥كم٢. بلنداهیا بەشێن وێ یێن باكووری دگەهیتە ٦٠٠- ٦٥٠ مەتران لێ بەشێن وێ یێن باشووری دگەهنە ٣٠٠ مەتران[٢٤].

ئەڤ دەشتە رادبیت ب هەركاندنا ئاڤا هژمارەكا گەلیان بەرەڤ ئاراستەیێ رووبارێن زێ و رووبارێ زەنتە و رووبارێ خازر، رووبێ ڤێ دەشتێ ب هندەك سەرێك خرڤەبوییێن تەڤنێ و خیزی و هەریێ دهێتە نخافتن زێدەباری بەرێن بچویك. ئەڤ دەشتە ب شێوەیەكێ باش بۆ مەرەمێن چاندنێ ب تایبەت چاندنا دانودكاكی هاتینە بكارئینان ئەوژی ژبەر عەردێ وێ یێ ب زاخە. هەردیسان ئەڤ دەشتە د زەنگینن ب ژێدەرێن ئاڤا ژێرعەرد چونكی هژمارەكا كریارێن جیولوجی ل ڤێ دەڤەرێ بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا عەمبارێن ژێرعەرد یێن باش بۆ هەلگرتنا ئاڤێ لەورا ژی هژمارەكا باش یا ئاڤێن بەفر و باران لێ دهێنە عەمباركرن زێدەباری ئاڤا رووبارێن زێ مەزن و خازری[٢٥]. ژ ئالییەكێ دیڤە هندەك رووبارێن وەرزی ل سەر رووبێ وێ د هەرِكن كو هندەك حەوزێن بچویك یێن ئاڤێ دروست دكەن و دبنە ژێدەرەكێ باش بۆ ئاڤا ژێرعەرد.

**٢. دەشتا باعەدرێ**

ئەڤ دەشتە دهێتە هژمارتن تەمامكەرا دەشتا ئاكرێ و د گەلەك تایبەتمەندییێن بەرهەم ئینان و سرۆشتێ بەروبومێن چاندنێ و جۆرێ ئاخێ دا د وەكهەڤن زێدەباری پلا راستیا عەردی و ئاراستەیێ سەرنشیڤیا وێ. ئەڤ دەشتە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ دەشتا ئاكرێ و ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە دگەهیتە قەزا شێخان (٤٠٠-٤٣٠م) و ل باكووری دگەهیتە بلنداهیێن شێخان یێن باكووری (٥٠٠- ٧١٤م) و چیایێ ئەلقۆش (٤٨٠-٩٥٠م).

**٣. دەشتا سلێڤانەی:**

دەشتا سلێڤانەی دكەڤیتە قەزا دهۆكێ و سێمێلێ و ئاراستەیێ وێ ژ باكووریٚ رۆژئاڤا بەرەڤ باشووریٚ رۆژهەلاتە. ژ لایێ جوگرافیڤە ل لایێ باكووری دگەهیتە زنجیرا چیایێن بێخێر و سپی و ل لایێ رۆژئاڤا و باشووریٚ رۆژئاڤایی دگەهیتە رووبارێ دیجلە و ل لایێ باشووری دگەهیتە سكرێ مووسل و ل لایێ رۆژهەلاتی دگەهیتە گوندێ (تاخێ) ئێتیتی ل بازێرێ دهۆكێ و ل لایێ باشوور و باشووریٚ رۆژهەلاتی دگەهیتە چیایێن داكا و ئەلقۆش (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٥ بكە).

ل سەر رووبێ ڤێ دەشتێ گەلەك گەلی و نهال هەنە كو ئاراستەیێ هەمیان ژ باكوور و باكووریٚ رۆژهەلاتی بەرەڤ باشوور و باشووریٚ رۆژئاڤاینە و گرنگترینێن وان ئەڤ گەلییەنە ژ رۆژهەلاتی بۆ رۆژئاڤایی (شاریا، دهۆك، مام شڤان، تل زێر، نەقب، ئاڤگەهان، كشكان و كركل)[٢٦].

درێژترین درێژاهیا ڤێ دەشتێ دگەهیتە ٨٠كم و تێكراییێ فرەهیا وێ ژی دگەهیتە ٢٠كم. ل بەشێن وێ یێن ناڤەراست هندەك سەرنشیڤێن سڤك هەنە لێ ئەڤ سەرنشیڤیە چەند بەرەڤ چیایێ بێخێری ل باكووری و رووبار دیجلەی ل رۆژئاڤا و باشووریڤە بچن ئالۆزتر لێ دهێن. ئەڤ دەشتە یا بەرنیاسە ب چاندنا بەروبۆمێن دانودكاكی و ژ گرنگترین بازێرێن دكەڤنە سەر ڤێ دەشتێ بازێرێ دهۆكێ یە ل بەشێ باشووریٚ

نەخشەیێ (٤)
دەشتێن باشوورێ پارێزگەها دهۆکێ




رۆژهەلاتی و باژێرێ سێمێلێ و باتێلێ ل ناڤەراستا دەشتێ و دۆمیز و فەیدێ ل بەشێن وێ یێن باشووری، زێدەباری هژمارەکا کۆمەلگەهێن ئاکنجیبوونێ یێن مەزن وەکی خانکێ و شاریا.

ل ڤێرێ یا گرنگە ئەم ئاماژێ بدەینە جهێ باژێرێ دهۆکێ ل گۆشەیا باکوورێ رۆژهەلاتێ دەشتا سلێڤانەیان دناڤبەرا چیایێ زاوا ل باشووری و چیایێ سپی ل باکووری. هەژی گوتنێ یە کو ئەڤ دەشتە ژ ئەنجامێ راماڵینا و هاتنە خوارێ یا بەرمایکێن ژ چیایان هاتینەخوارێ دروستبوویە و ئەڤ دەشتە ب دەشتێن خرڤەبووی دهێنە ناڤکرن ئەوژی ژبەر پڕبوونا بنێ گەلیێن دکەڤنە بنارێ چیایان ب بەرمایکێن ژ چیایان دهێنە خوارێ.

## سێیەم: گۆمێن ئاڤێ (الاحواض المائية)

ئەڤ یەکە دناڤ هەردو یەکەیێن بەری نها دا مە بەحسکرین د بەربەلاڤن ئەوژی هەردو یەکەیێن بلنداهی و دەشتان، پێکدهێت ژ تۆرەکا هەرکینا ئاڤێ یێن ژ ئەنجامێ فاکتەرێن دروستبوون و کەشوهەوایی پەیدابووین و سیفەتا سەرنشیڤیێ رۆلەکێ مەزن هەیە د دروستبوونا وان دا و رەنگڤەدانێ ل سەر کەتوارێ سەرنشیڤیا عەردێ پارێزگەهێ دکەت. ل دووڤ تێبینیێن نەخشەیێ ژمارە (٦) ئەم دشێن کەتوارێ تۆرا ئاڤێ ل پارێزگەها دهۆکێ ل سەر دو جۆران دابەش کەین ئەوژی ئەو رووبارێن بەردەوام ئاڤا وان دچیت و ئەو رووبارێن ئاڤا وان د هندەك وەرزێن ساڵ دا دچیت.

### ١. رووبارێن بەردەوام ئاڤا وان دچیت:

ئەو رووبارن یێن ب درێژاهیا ساڵێ ئاڤا وان د هەرکیت و گرنگترین ئەو رووبار ژی ژ رۆژهەلاتی بەرەڤ رۆژئاڤایی دچن ئەڤەنە:

#### أ. رووبارێ هێزل:

هێزل ئێکە ژ گرنگترین لقێن سەرەکی یێن رووبارێ خابووری و کانیکێن وی دکەڤنە دناڤ ئاخا وەلاتێ ترکیا دا و پاشی دهێنە دناڤ سنوورێن عیراقێ دا نێزیکی گوندێ دەشتاخ دناڤ هندەك رێکێن چیایی یێن تەنگ دا کو هندەك گەلی و نهالێن کوور دروست دکەن و دهێتە هژمارتن سنوورێ سرۆشتی یێ دناڤبەرا عیراق و ترکیا دا هەتا درێژتە دناڤ رووبارێ خابووری دا ل دەڤەرا ئیبراهیم خەلیل ل باشوورێ

باژێرێ زاخۆ ب دووراتییا ١٠كم.

هیزل ئێكە ژوان رووبارێن ئاڤا وی بەردەوام د هەرکیت، ئاڤا وی ژ كانیێن بنارێ باشوورێ رۆژئاڤایێ چیایێن (مللی مامەند) یێن دناڤ ئاخا تركیا و چیایێن شەرانش و چیایێن كامتیرا (١٦٨٨م) و چیایێ دیرە (١٤١٠م) و چیایێ مێرگەشیش (١٦٩٧م) و چیایێ دێرشیش (١٩٩٠م) و خانتۆر[٢٧] دزێت، زندەباری گەلەك چیایێن دی. درێژاهییا رووبارێ هیزل ل دەمێ هاتنا وی بۆ ناڤ ئاخا عیراقێ هەتا درێژتە دناڤ رووبارێ خابووری دا دگەهیتە ٣٩كم و رووبەرێ وی دگەهیتە ٤٩٠كم٢. ژ گرنگترین وان گەلیێن ئەڤ رووبارە تێرا دچیت دناڤ عەردێ عیراقێ گەلیێن (گەلیێ سەنات، ئیستیبلان، هاورێژ، كەندەلیس و كوركیف). هەرچەندە ئەڤ رووبارە بەردەوام دهەرکیت لێ برا هەرکینا ئاڤا وی ژ وەرزەكی بۆ ئێكی دی یا جودایە، هەردیسان دروستكرنا هندەك سكرێن بچویك و ناڤنجی ژ لایێ تركیاڤە بوویە ئەگەر برا ئاڤا وی كێم بیت ب تایبەت دوماهیك سكرێ ل سەر هاتییە چێكرن بەری بێتە دناڤ سنوورێ عیراقێ دا ب دووراتیا كیلومەترەكێ ل رۆژئاڤایێ گوندێ دەشتاخ یێ عیراقی.

**ب. رووبارێ خابووری:**

رووبارێ خابووری ژ بلنداهیێن شەریفان محمدان و دەریا نواغ ل باشوورێ رۆژهەلاتێ تركیا ب بلنداهیێن (٣٠٠٠- ٣٢٥٠)م[٢٨] دزێت و هندەك ئاماژێ ب هندێ ددەن كو كانیكێن وی ژ بنارێ چیایێن هەرەگول و جۆدی[٢٩] دزێن و ئێكەم رووبارە درێژتە رووبارێ دیجلەی پشتی دهێتە دناڤ سنوورێن هەرێما كوردستانا عیراقێ دا، ئەڤ چیایە ژی زنجیرەكا چیایێن ئالۆزن و تێكرایێ بلنداهییا وان دگەهیتە ٣٣٠٠م سەر ئاستێ

**نەخشەیێ (٥)**

**پلەبەندیا خۆرستییا روویێ عەردێ دەشتا سلێڤانەی ل قەزا سێمێلێ یا پارێزگەها دهۆكێ**




ـ احمد علی حسن، السدود الصغيرة في قضاء سميل، دراسة في تقانة حصاد المياه، المؤتمر العلمي السادس والدولي الثاني، كلية التربية الأساسية، مجلة أبحاث التربية الأساسية، جامعة الموصل، ٢٠١٤.

**نەخشەیێ (٦)**
**رووبارێن سەرەكی ل پارێزگەها دهۆكێ**




رووبێ دەریایێ. رووبارێ خابووری ل نێزیك گوندێ جالیك دهێتە دناڤ هەرێما كوردستانێ دا. ل لایێ رۆژهەلاتیڤە ئاڤا گەلیێ سرار و ل باكوورێ چیایێ مەتین درێژتە سەر و ل لایێ باشووری ئاڤا گەلیێ سپنەیێ رۆژئاڤایی درێژتە سەر، پاشی دناڤ گەلیەكێ لێكبادای را دەرباز دبیت و دگەهیتە بازێرێ زاخۆ و پاشی بەرەڤ رۆژئاڤایی دچیت هەتا دگەهیتە رووبارێ هیزل ل رۆژئاڤایێ بازێری ب دووراتیا ٩,٥كم و پشتی هینگێ هەرکینا وی فرەهـ و بلەز دبیت هەتا ل باكوورێ گوندێ فیشخابووری[٣٠] درێژتە سەر رووبارێ دیجلەی. درێژاهیا رووبارێ خابووری دناڤ هەرێما كوردستانا دا نێزیكی ١٦٠كم و رووبەرێ حەوزا وی ٦٢٦٨ كم٢ و ئاڤا وی نێزیكی ٢,٢١٪ێ ژ سەرجەمێ ئاڤا رووبارێ دیجلەی پێكدئینیت. ب رەنگەكی كو سەرجەمێ گشتی یێ حەوزا وی دگەهیتە ٥٧٠٠كم٢ و ژ ڤێ چەندێ ژی نیزیكی ٣٤٠٥,٠كم٢ ب رێژەیا ٥٩,٧٪ێ ژ رووبەرێ حەوزا وی دكەڤیتە دناڤ سنوورێ كوردستانا تركیادا و یا مای ژی ٢٢٩٤,٥ كو دبیتە رێژەیا ٤٠,٣٪ێ دكەڤیتە دناڤ سنوورێن هەرێما كوردستانێ دا.

**ت. رووبارێ زێ مەزن:**

كانیێن وی یێن سەرەكی دكەڤنە دناڤبەرا دەریاكێ وانێ ل تركیا و دەریاكێ ئورمیێ ل ئیرانێ[٣١]. ئەڤ رووبارە ل رۆژئاڤایێ گوندێ چال ئەوێ دكەڤیتە رۆژهەلاتێ قەزا ئامێدیێ سنوورێ ناڤبەرا تركیا و عیراقێ دبڕیت و دهێتە دناڤ هەرێمێ دا. پشكا هەرە مەزن یا حەوزا وی دكەڤیتە دناڤ عیراقێ دا كو رووبەرێ وی یێ گشتی دگەهیتە ٢٦٤٧٣كم٢ كو نێزیكی ١٦٦٠٠كم٢ ب رێژەیا ٦٤٪ێ دناڤ عیراقێ دا و ٩٢١٠كم٢ ب رێژەیا ٣٦٪ێ دناڤ تركیا دا، درێژاهیا وی دگەهیتە ٣٩٢كم و تێكرایێ هەرکینا ئاڤا وی یا سالانە دگەهیتە ١٣,٢١ ملیار مەترێن سێجا

یێن ئاڤێ کو نێزیکی ٢٦,٧٪ێ ژ ئاڤا رووبار دیجلەی پێکدئینیت، لێ تێکرایێ هەرکینا وی ل ئێزگەهێ کەلەك دگەهیتە ٤٢١مەتر٣/چرکە، و بلندترین تێکرایێ وی ل سالا ١٩٦٩ هاتبوو توومارکرن ئەوژی ٩٧١٠مەتر٣/چرکە بوو. دناڤ عیراقێ دا هژمارەکا لقێن[٣٣] دی درێژنە سەر وەك:

- لقێ سپنەیێ رۆژهەلاتی
- لقێ شەمدینان
- لقێ رۆکوچك
- لقێ رەواندۆز
- لقێ پاستوره جای

**پ. رووبارێ رووبێ شین:**

کانیکێن سەرەکی یێن رووباری رووبێ شین دکەڤنە بنارێ چیایێن (بایاز و ئیکیالی و یۆرۆل) ل دەڤەرا هەکاری ل باکوورێ کوردستانێ و د بنەرەتدا ژ دو لقێن سەرەکی پێکدهێت ئەوژی رووباری (شەمدینان)ە کو کانیکێن وی دکەڤنە بەشێن باشوورێ رۆژهەلاتێ ترکیا ل نێزیك دەڤەرا سێگوشەیی یا سنوورێ دناڤبەرا ترکیا و عیراق و ئیرانێ دا و درێژاهیا وی دگەهیتە ٦٠کم. لقێ وی یێ دووێ رووبارێ (ئاڤا مارکی) یە، ئەڤ رووبارە پشتی ژ گەلیێ بالندا دەرباز دبیت ب دووراتیا کێمتر ژ ١,٥ کم دگەهیتە رووبار زێ مەزن[٣٤].

درێژاهیا رووبارێ رووبێ شین دگەهیتە ١٠٢,٤کم و نێزیکی ٤٣,٧کم ب رێژەیا ٤٢,٧٪ێ دکەڤیتە دناڤ سنوورێن باکوورێ کوردستانێ دا و بەشێ مایی کو دبیتە ٥٨,٧کم ب رێژەیا ٥٧,٣٪ێ دکەڤیتە دناڤ سنوورێن هەرێما کوردستانا عیراقێ دا. ئەڤ رووبارە بەشەکی ژ سنوورێ کارگێری یێ دناڤبەرا پارێزگەها دهۆك و هەولێرێ دا پێکدئینیت. رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٢٧٧٣,٣کم٢ و ژ ڤی رووبەری نێزیکی ١٩٨٩کم٢ ب رێژەیا ٧١,١٪ێ دکەڤیتە دناڤ سنوورێن هەرێما کوردستانا ترکیا دا[٣٥].

**ج. رووبارێ بەدرەدین (چەمانکێ)[٣٦]:**

کانیکێن سەرەکی یێن زانا ڤی رووباری دکەڤنە بنارێ باشوورێ رۆژئاڤایی یێ چیایێ گارەی و ئەڤ رووبارە ئاراستەکێ گشتی ژ باکووری رۆژئاڤایی بەرەڤ باشوورێ رۆژهەلاتی ب درێژاهیا ٣٠کم دبڕیت. رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٧٢٠,٩کم٢. ئەڤ رووبارە بەشەکی ژ کانیێن بلند یێن رووبار خازری پێکدئینیت کو ئێکە ژ لقێن سەرەکی یێن رووبارێ زێ مەزن و تێکرایێ بلنداهیا حەوزا وی دگەهیت ٤٨٠-١٨٠٠م ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایێ.

**ح. رووبارێ خازر:**

خازر ئێکە ژ لقێن رووبارێ زێ مەزن و کانیکێن وی ژ بنارێ بلنداهیێن ئامێدیێ دزێن، ئەڤ رووبارە دناڤ هندەك گەلی و نهالێن کوور و ئالۆز را دبۆریت کو هندەك بلنداهیێن چیایی دکەڤنە هەردو رەخێن وی و بلنداهیا وان دگەهیتە ١٠٠٠-٢٠٠٠ مەتران (چیایێ ئاکرێ ١٥٤٨م و چیایێ باگرمان ١٠٤٤م). ئاڤا ڤی رووباری ژ دو ژێدەران دهێت، ژێدەرێ ئێکێ ژ دو لقان پێکدهێت کو ئێك ژوان ژ گوندێ کانیا ل ناحیا دینارتە (قەزا ئاکرێ) دەستپێدکەت و دبێژنێ گەلیێ بارەشاور، لقێ دووێ (رووبارێ بەدرەدین) ل ناحیا چەمانکێ یا سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە دزێت و ئەڤ هەردو لقە ل نێزیکی گوندێ باکرمان دگەهنە ئێك و رووبارێ خازری پێکدئینن و پاشی ئەڤ رووبارە بەرەڤ باشووری دچیت و دناڤ کۆمەلگەها قەسرۆکێ را دبۆریت و هەتا دگەهیتە رووبارێ ئەتروش وهەتا ڤێرێ درێژاهیا وی دگەهیتە نێزیکی ١٤٥کم و باشی درێژتە دناڤ رووبارێ زێ مەزن دا ل باشوورێ رۆژئاڤایێ کەلەکێ ب دووراتیا ٢٠کم[٣٧].

**خ. رووبارێ زەنتە:**

ئەڤ رووبارە نێزیکی ١٢کم ژ باژێرێ ئاکرێ یێ دوورە و کانیکێن وی ل بنارێ باکووری یێ چیایێ ئاکرێ دزێن و پێکدهێن ژ گەهشتنا ئاڤا گەلیێن میرك و کویسکە کو هەردوژی ژ چیایێ (سەرێ سادا) دزێن

کو دکەڤنە باکوور و رۆژهەلاتێ وی و چیایێ (سەرێ کیسکی) ل باکوور و باکوورێ رۆژئاڤایی، پاشی بەرەڤ رۆژهەلاتی دچیت هەتا دگەهیتە گەلیێ زەنتە و پاشی بەرەڤ باشووری دچیت و ل دووڤدا باشوورێ رۆژهەلاتی هەتا دڕێژتە دناڤ رووبارێ زێ مەزن دا و درێژاهیا وی دگەهیتە ٣٠کم.

**د. رووبارێ ڕێکان:**

کانیکێن سەرەکی یێن رووبارێ ڕێکان دکەڤنە دناڤ چیایێن باشووری یێن دەڤەرا هەکاری ل باکوورێ کوردستانێ، بلنداهیا ئەو دەڤەرێن ئەڤ رووبارە لێ دزێت دگەهیتە (٢٠٠٠-٣٥٠٠)م ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی و ژ دو لقێن سەرەکی پێکدهێت، لقێ رۆژئاڤایی دبێژنێ (مازی) و لقێ رۆژهەلاتی دبێژنێ رووبارێ ڕێکان و ئەڤ رووبارە ل نێزیکی گوندێ (تەتەم) دهێتە دناڤ سنوورێن هەرێما کوردستانێ دا، درێژاهیا وی دگەهیتە ٤٧کم کو ١٨کم دکەڤنە باکوورێ کوردستانێ و ٢٩ کم دکەڤنە دناڤ باشوورێ کوردستانێ دا ل پارێزگەها دهۆکێ، رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٤٧٠,٧کم٢ کو ٢٤٦,٥کم٢ ب رێژەیا ٥٢,٤٪ێ دکەڤنە دناڤ سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ دا[٣٨].

**ژ. رووبارێ نینکی:**

ئێکە ژ رووبارێن بەردەوام ئاڤا وی دهەرکیت ئەڤ رووبارە رادبیت ب هەرکاندنا ئاڤا بەشێ باشوور و ناڤەراستێ دەڤەرا بەرواری بالا، بلنداهیا حەوزا وی دگەهیتە ٢١٠٠م ل بەشێن باکووری و پاشی ئەڤ بلنداهییە نزم دبیت تا دگەهیتە ٧١٥م ل دەمێ دڕێژتە دناڤ رووبارێ خابووری دا و رووبەرێ وی دگەهیتە ٢٧٢,٦کم٢ و درێژاهیا وی دگەهیتە ٣٨,٧کم (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٧ بکە).

**وێنەیێ (٧)**

**حەوزا رووبار نینك (بنارێ باکووری یێ چیایێ مەتین)**



- وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل ١٨/ ٥ /٢٠١٥ هاتیبەگرتن.

ر. رووبارێ کەشانێ:

ئێکە ژ رووبارێن بەردەوام ئاڤا وی د هەرکیت و درێژاهیا وی دگەهیتە ٣٤,٦کم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١٣٦کم٢، پێکدهێت ژ گەلیێن (هەستین و میشخونی)، کانیکێن وی یێن باکووری بەشەکی ژ سنوورێ دناڤبەرا عیراق و ترکیا دا پێکدئینن و ئەڤ کانیکە چ چیایێ سارکێ و حەسەن ئاغا و کیری دزێن.

## ٢. رووبارێن وەرزی:

ئەڤ جۆرە وان رووباران ب خۆڤە دگریت یێن ئاڤا وان د هندەك وەرزێن سالێ دا د هەرکیت ب تایبەت ل وەرزێن زڤستان و بهارێ لێ ل هندەك وەرزێن دی هشك دبن ب تایبەت ل هاڤینێ و پائیزێ، ئاڤا بەفر و بارانێ ژێدەرێ سەرەکی یێ ڤان رووبارایە، گرنگترین رووبارێن دناڤ پارێزگەهێ دا ئەڤەنە:

### یەکەم: حەوزێن باکووری:

**أ. حەوزا ئیستیبلان:**

ئەڤ حەوزە دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ قەزا زاخۆ و رووبەرێ وێ دگەهیت ١٧٤,٣کم٢، ژ لایێ جوگرافیڤە ل لایێ باشووری دگەهیتە چیایێ شەرانش و ل لایێ رۆژئاڤایی دگەهیتە حەوزا دەشتاخ و رووبارێ هیزل و ل لایێ باکووری دگەهیتە سنوورێ دناڤبەرا عیراق و ترکیا و ل لایێ رۆژهەلاتی دگەهیتە حەوزا رووبارێ خابووری. ئەڤ حەوزە بەشەکی ژ دەڤەرا پێکهاتەیا وێ یا ئالۆز (دەڤەرا چیایێن بلند) پێکدئینیت و روویێ وێ خۆرستییەکا توند یا هەی ئەوژی ژبەر بلنداهیا وێ کو دگەهیتە ٢٠٠٠م ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی. گەلیێ ئیستیبلان ب درێژاهیا خۆ کو دبیتە ٢٨کم پێکدهێت ژ گەلیێن شەرانش و مرسیس و کوزێ و مێرگەشیش، پاشی ئەڤ گەلیە بەرەڤ رۆژئاڤایی درێژدبیت هەتا دگەهیتە رووبارێ هیزل (سنوورێ دناڤبەرا عیراق و ترکیا دا).

**ب. حەوزا روی سۆرك[39]:**

ئاڤا وی ژ ئاڤا بەشێن باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتێ دەڤەرا بەرواری بالا یە و پاشی بەرەڤ ئاراستەیێ دناڤبەرا باکوورێ رۆژئاڤا و باشوورێ رۆژهەلات درێژدبیت دناڤ دەڤەرکا چیایی یا ئالۆز را دەربازدبیت کو بلنداهیا دەڤەرێن دکەڤنە دۆرماندوری کانیکێن وێ یێن باکووری دگەهیتە (٢٠٠٠- ٢٣٠٠)م ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی لێ هێدی هێدی کێم دبیت هەتا دگەهیتە (١٠٠٠- ٧٥٠)م، درێژهیا ڤی رووباری دگەهیتە ٢٤,٥کم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١٩٢,٣کم٢.

### دووەم: حەوزێن دەڤەرا ناڤەراست:

**أ. حەوزا سپنەیێ رۆژهەلاتی:**

ئێکە ژ گەلیێن ئاڤا وی ب شێوەیێ وەرزی د هەرکیت، دکەڤیتە دناڤبەرا چیایێ گارەی ل باشووری و مەتینی ل باکووری (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٨ بکە) و ل لایێ رۆژئاڤایی دگەهیتە بلنداهیێن دناڤبەرا سەرسنك و ئینیشکێ دا و ل لایێ رۆژهەلاتی دگەهیتە باژێرێ دێرەلوکێ، رووبەرێ وی دگەهیتە ٣٧٢کم٢. ئەڤ حەوزە ژ رۆژهەلاتی درێژدبیت تا دگەهیتە رووبارێ زێ مەزن ل نێزیکی دێرەلوکێ ب درێژاهیا ٤٢,٥کم[40].

**ب. گەلیێ سپنەیێ رۆژئاڤایی:**

ئەڤ گەلییە دکەڤیتە دناڤبەرا زنجیرا چیایێن مەتینی ل باکووری و زنجیرا چیایێن گارەی و مانگێشکێ ل باشووری و سەیرانگەها سەرسنکێ و ئینیشکێ ل رۆژهەلاتی و رووبارێ خابووری ل رۆژئاڤایی و درێژاهیا وی دگەهیتە ٤٣,٥کم هەتا درێژتە رووبارێ خابووری ل نێزیکی گوندێ دوکەرێ و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٣١٥کم٢.

**ت. حەوزا گەلیێ رۆکەرمی[41]:**

ئەڤ حەوزە دکەڤیتە ناحیێن زاویتە و مانگێشکێ (باکوورێ رۆژئاڤایێ قەزا دهۆکێ)، ژ لایێ جوگرافیڤە ل لایێ باکووری دگەهیتە چیایێ مانگێشکێ و ل لایێ رۆژئاڤایی دگەهیتە رووبارێ خابووری و ل لایێ رۆژهەلاتی دگەهیتە گەلیێ زاویتە و ل لایێ باشووری دگەهیتە چیایێ سپیرێز. ڤێ حەوزێ شێوەیەکێ

وێنەیێ (٨)
ڤێككەهشتنا گەلیێ سپنەیێ رۆژهەلاتی رووبارێ زێ مەزن



- ڤەكۆلینەكا مەیدانی ل رێكەفتی ٢٠١٢/٣/١٠

لاكێشەی یێ هەی و روویێ وی خۆرستییەكا توند یا هەی كو بلنداهییا وی دگەهیتە ١٥٠٠م ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی، ئەڤ حەوزە ژ ڤێككەهشتنا هەردو گەلیێن مانگێشك و شاوریكێ پێكدهێت و پاشی هەردو پێكڤە بەرەڤ رۆژئاڤایی دچن ل كێمترین خالا حەوزێ ب بلنداهییا ٥٩٨م درێژتە رووبارێ خابووری، درێژاهییا گەلیێ دگەهیتە ٤٢كم و رووبەرێ وی دگەهیتە ٣٤٠كم.

**پ.گەلیێن حەوزا دەشتا سندی (زاخۆ)[٤٢]،**

١. **گەلیێ (جەلالێ) شازی،** ئەڤ گەلییە رادبیت ب هەركاندنا كوژیێ باكوورێ رۆژئاڤایێ گەلی ل دەڤەرێ و درێژاهییا وی دگەهیتە ١٠,٢كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٣٠كم٢.

٢. **گەلیێ (جەلالێ) بەرزۆر،** درێژاهییا وی دگەهیتە ١٥كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٢٣كم٢ و بلنداهییا كانیكێن وی یێن بلند دگەهیتە ٨٨٠م و پاشی ئەڤ رووبارە بەرەڤ باشووری دهێت هەتا درێژتە رووبارێ خابووری ل رۆژئاڤایێ باژێرێ زاخۆ ب دووراتیا كیلومەترەكێ.

٣. **گەلیێ در جەلالی،** كانكێن وی ژ بنارێن باشوورێ رۆژئاڤایێ چیایێ شەرانش ب بلنداهییا ١١٠٠م دزێت و پاشی بەرەڤ باشووری ب درێژاهییا ١٦كم دهێت و باژێرێ زاخۆ دبڕیت و ل دووڤدا درێژتە دناڤ رووبارێ خابووری دا، رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٣٩كم٢.

٤. **گەلیێ سندی،** دهێتە هژمارتن ژ گرنگترین گەلییان ل دەڤەرێ و پێكدهێت ژ هژمارەكا گەلیێن بچویك وەك گەلیێ میركی و بێرسیڤێ و دەركار، كانیێن وی ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ شەرانش ل بلنداهییا دناڤبەرا ١١٠٠-١٣٥٠م دزێن، ڤی گەلی سەرنشیڤییەكا توند یا هەی ژ رۆژهەلاتی هەتا رۆژئاڤا و باشوورێ رۆژئاڤایی درێژدبیت و درێژاهییا وی دگەهیتە ٢٨كم و

رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١١٨كم٢.

٥. **گەلیێ حەسەن ئاڤا:** درێژاهیا وی دگەهیتە ٩كم و ژ بنارێ باكووری یێ چیایێ بێخیر دزێت ل بلنداهیێن دناڤبەرا ٩٠٠-١٠٠٠م و پاشی ل نێزیكی باژێرێ زاخۆ درێژتە دناڤ رووبارێ خابووری دا و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١٨كم٢.

## سێیەم: حەوزێن باشووری:

### أ. گەلیێ بارەشۆر:

پێكدهێت ژ هژمارەكا جۆكێن ئاڤێ ئەوێن ژ بنارێ باكوورێ رۆژئاڤایی یێ چیایێ حەمە بەكر دزێن پاشی دگەل ئێك هەڤدگرن و گەلیێ بارەشۆر پێكدئینن و پاشی بەرەڤ ئاراستەیێ زێ ب درێژاهیا ٥٤٨م دهێت هەتا دگەهیتە رووبارێ گوملی و رووبارێ خازری پێكدئینن، درێژاهیا وی دگەهیتە ٧كم.

### ب. گەلیێ شێخ عەبدولعەزیز:

كانیێن وی دكەڤنە باكوورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ ئاكرێ یێ كەڤن و پاشی دناڤ باژێرێ ئاكرێ یێ نوی را دبۆریت و بەرەڤ ئاراستەیێ باشوورێ رۆژهەلاتی دچیت هەتا دگەهیتە رووبارێ زەنتە و درێژاهیا وی ژ دەستپێكا زانا وی هەتا رێژتنا وی بۆ ناڤ رووبار زەنتە دگەهیتە ١١كم.

### پ. حەوزا شاریا:

ژ بلنداهیا ٩٥٠م ژ ئالیێ ژێریێ چیایێ زاوا دزێن و بەرەڤ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤای د هێنەخوار هەتا درێژینە سەر سكرێ مووسلێ، ب درێژیا ٢١كم و رووبەرێ ٨٢,٥كم٢.

### ت. حەوزا دهۆكێ:

كانیێن وی یێن سەرەكی ژ چیایێ زاوا دزێت ب بلنداهیا ١٠٠٠م و پاشی بەرەڤ باكوور و باكوورێ رۆژئاڤایی دچیت و پشتی دناڤ سنوورێن باژێرێ دەردكەڤیت بەرەڤ باشوورێ رۆژئاڤایی دچیت هەتا درێژتە دناڤ سكرێ مووسل دا و درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٥,٥كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١٢٥كم٢.

### ث. حەوزا مام شڤان:

ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ بێخیر ل بلنداهیا ٩٠٠م دزێت و پاشی بەرەڤ باشووری دهێت هەتا درێژتە سكرێ موسل و درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٥كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٩٧,٥كم٢.

### ج. حەوزا تل زێر:

ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ بێخیر ل بلنداهیا ١٣٠٠ م دزێت و پاشی بەرەڤ باشووری دهێت هەتا درێژتە سكرێ مووسل و درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٧,٨كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١٤٢,٥كم٢.

### ح. حەوزا نەقەب:

ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ بێخیر ل بلنداهیا ١١٤٠ م دزێت و پاشی بەرەڤ باشووری دهێت هەتا درێژتە سكرێ مووسل و درێژاهیا وی دگەهیتە ٣٠,١كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١٤٠كم٢.

### خ. ئەفكەهان:

ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ بێخیر ل بلنداهیا ١٠٢٠ م دزێت و پاشی بەرەڤ باشووری دهێت هەتا درێژتە سكرێ مووسل و درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٦,٨كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١٠٢,٥كم٢.

### د. كەشكان:

ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ بێخیری ل بلنداهیا ١٠١٦ م دزێت و پاشی بەرەڤ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایی درێژدبیت هەتا درێژتە رووبارێ دیجلەی و درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٠,١كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ١١٢,٥كم٢.

### ذ. كركل:

ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ بێخیر هەتا رۆژئاڤایێ گەلیێ زاخۆ ل بلنداهیا ٨٢٠م دزێت و پاشی درێژتە رووبارێ دیجلەی و درێژاهیا وی دگەهیتە ٢٠كم و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە ٦٢,٥كم٢.

## ژێدەر و پەراوێز:

1. Google Earth .2015

٢. نشوان شكري عبدالله، وأخران، جغرافية محافظة دهوك، دراسة في الخصائص الطبيعية والبشرية، السلسلة الأولى قضاء ئاميدي،٢٠١٣.

٣. المصدر نفسه، ص٦٧.

٤. المصدر نفسه، ص.

٥. المصدر نفسه، ص ٧٠.

٦. شاكر خصباك، العراق الشمالي، دراسة في نواحيه الطبيعية والبشرية، بغداد، ١٩٧٣، ص ٢٧

٧. الدراسة الميدانية، بتاريخ ١/٨/ ٢٠١٥

8. Google Earth .2015

٩. شاكر خصباك، العراق الشمالي، دراسة الطبيعية والبشرية، مطبعة شفيق، بغداد،١٩٧٣، ص ٢٩-٣٠.

١٠. نشوان شكري عبدالله، مصدر سابق، ص ٨٢.

١١. بيداء محمود الكوران، اشكال السفوح في جبل ئاكرى، رسالة ماجستير (غير منشورة)، كلية الآداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠١٣، ص٤٤.

١٢. الدراسة الميدانية ٢٠١٤/٤/٤.

١٣. نشوان شكري عبدالله، مصدر سابق، ص٨٦.

١٤. صلاح الدين البحيري، اشكال الأرض، دار الفكر، دمشق، ط١، ١٩٧٩، ص١٥٦.

١٥. احمد علي حسن، حوض وادي العجيج في العراق، أطروحة دكتوراه (غير منشورة) جامعة بغداد، ١٩٩٥، ص١٢٥.

16. Google Earth .2015

١٧. الدراسة الميدانية بتاريخ ٢٠١٣/٣/٢

١٨. الدراسة الميدانية بتاريخ ٢٠١٣/٨/٢٠

19. Google Earth .2015

٢٠. عبد الكريم فندي وآخرون، دليل محافظة دهوك، مطبعة كلية الشريعة، دهوك،١٩٩٥، ص ٢٠.

٢١. الدراسة الميدانية، بتاريخ ١٧/ ٢٠١٠/٣

22. Google Earth .2015

23. Google Earth .2015

24. Google Earth .2015

٢٥. زیرەك عزیزخان احمد عقراوی, بارودخی ئاو لە هەرێمی كوردستانی عیراقدا بە تایبەتیش پارێزگای دهۆك , گوڤاری سەنتەری برایەتی , ژمارەی تایبەت (١٨) بە كونفرانسی زانستی ئاو لە (١٤-١٥) شوبات , هەولێر , ٢٠٠١ , ل ١٥١ .

٢٦. احمد علي حسن، السدود الصغيرة في قضاء سميل، دراسة في تقانة حصاد المياه، المؤتمر العلمي السادس والدولي الثاني، كلية التربية الأساسية، مجلة أبحاث التربية الأساسية، جامعة الموصل، ٢٠١٤.

٢٧. احمد علي حسن، حوض وادي استبلان، بحث مقبول للنشر بمجلة جامعة دهوك، من وقائع المؤتمر الجغرافي الدولي الأول، فاكلتي العلوم الإنسانية، جامعة دهوك، المنعقد للفترة من (٦ـ٢٠١٤/٥/٧).

٢٨. قصي عبد الوهاب السهيل، احتمالية تردد الفيضانات والجفاف لنهر الخابوور في زاخو، رسالة ماجستير (غير منشورة) كلية العلوم، جامعة بغداد،١٩٩٠، ص١.

٢٩. كۆمەلێك ماموستای زانكۆیا صلاح الدين، جیوگرافیای هەرێمی كوردستانی عیراقی، چاپخانە پەروەردەی هەرێمی كوردستانی عیراقی ١٩٩٨، ل ١٢٣.

30. Google Earth .2015

٣١. قصي عبد الوهاب السهيل، مصدر سابق، ص٢.

٣٢. جلال امين بەك، جوكرافیای كوردستان، چاپكردن ئوفیسی روون وەمەلبندی سوران،١٩٩٨، ل ١١٣.

٣٣. خصباك، شاكر، العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعة والبشرية، مطبعة شفيق،١٩٧٢، ص ١٣.

٣٤. عبدالله غفور، جوكرافيا كوردستان، چاپخانەی وزارەتی پەروەردە، ج٢، هەولێر،٢٠٠٠، ل ٨٩.

٣٥. نشوان شكري عبدالله، مصدر سابق، ١٢٩.

٣٦. المصدر نفسه،١٣٥.

37. Google Earth .2015

٣٨. نشوان شكري عبدالله، مصدر سابق، ص ١٣٦.

٣٩. نفسه، ص١٤٥.

٤٠. خارطة عمادية الطوبوغرافية، مقياس ١:١٠٠,٠٠٠ بغداد, ١٩٨٩

٤١. احمد علي حسن ـ انشاء أطلس جغرافي لحوض وادي روكرم، بحث مقبول للنشر بمجلة جامعة دهوك، من وقائع المؤتمر الجغرافي الدولي الأول، فاكلتي العلوم الإنسانية، جامعة دهوك، المنعقد للفترة من (٦ـ٢٠١٤/٥/٧).

٤٢. احمد علي حسن، التعرية المائية في حوض سهل السندي ـ زاخو، مجلة جامعة دهوك، المجلد(١٢)، العدد(٢)، لسنة ٢٠٠٩، ص٣٢٨.

# ئاڤ و هەوا
# ل پارێزگەها دهۆکێ

**پ.هـ.د. فاتن خالد عەبدولباقی**
**وەرگێران: ئیسماعیل تاها شاهین**

## پێشگۆتن:

ئاڤ و هەوا ژ وان هۆکارێن سروشتییە، ئەوێن ب جهێ خولگەیی (الموقع الفلكي) ڤە گرێدایی، کو کار ل وەرارا پێکۆل و بزاڤ و پێشکەڤتنا مرۆڤی دکەت، ژ بەر کو کارلێکرنا خۆ ل سەر ستوونەماکێن (مقومات) دی یێن سروشتی و مرۆڤی هەیە[1].

هەر وەسا ئاڤ و هەوا ئەگەرێ سەرەکییە ل پشت گوهۆڕینا دەڤەرێن ئاڤ و هەوایی (التغيرات الموضعية المناخية) ئەوێن د چارچۆڤێ گشتییێ بەرگێ گازیدە (الغلاف الغازي) چێ دبن. هەر وەسا کارلێکرنا خۆ ل سەر ژیانا وان هەمی زیندەوەرێن د بەرگێ ژیواریدا (الغلاف الحيوي) و ل سەر ڕوویێ ئەردی دژین هەیە. دیسا کارلێکرنەکا مەزن و ئێکسەر د ژین و ژیارا مە یا ڕۆژانەدا، ژ هەمی ئالییانڤە هەیە. کار ل ئاڤێ و بایی و خوارنێ و وزە و گەهاندن و ڕاگەهاندن و ساخلەمییێ دکەت، کو ڕەگەزێن سەرەکییێن ژیانێنە. ژ بەر هندێ گەشەکرنێن (تطورات) ئابووری یێن پاشەڕۆژێ ل هەر جهەکێ جیهانێ، پشتا خۆ ب وان گەشەکرن و گوهۆڕینان گرێددن، ئەوێن د ئاڤ و هەوایدا چێ دبن، و کار ل پاشەڕۆژا وان جڤاکان دکەن، ئەوێن ئەم تێدا دژین.

ئارمانج ژ ڤێ ڤەکۆلین ئەوە، وێنەیەکی گشتگیر بۆ سالوخەتێن ڕەگەز و هۆکارێن وی ئاڤ و هەوایی بێتە بەرچاڤکرن، ئەوێن دەستەکی درێژ هەیە، د پێکئینانا ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆکێدا، ب ڕێکا دوکیۆمێنتکرنا پێزانین و توومارکرنێن تێبینیکرێێن ئێستگەهێن ئاڤ و هەوایی بۆ تیژك و تیرەکا تاڤێ، پلەیا گەرمێ، پەستا هەوایی، هورەبایان، هەلمبوونێ (تبخر)، شەها ڕێژەیی و دابارینێ (التساقط)، ل جهێن ئێستگەهێن ئاڤ و هەوایی و چاندنێ، ل وان هەمی ناوچە و قەزایێن سەر ب پارێزگەها دهۆکێڤە.

ئەڤ ڤەکۆلینە، ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، یا ئێکێیە د ڤی واریدا کو شیایی هندەك شێوازێن سەرژمێری (أساليب إحصائية) و پرۆگرام و سیستەمێن پێزانینێن جوگرافی وەکی (GIS) ب کاربینت ژ بۆ پێکئینان و بەردەستکرنا نەخشە و وێنەیێن ژ شرۆڤەکرنا تایبەتمەندییان هاتینە وەرگرتن، ئەوێن گرێدایی ب ڕەگەزێن ئاڤ و هەواییڤە، ل پارێزگەها دهۆکێ.

جهێ کەڤتنا پارێزگەها دهۆکێ د ناڤبەرا ڤان بازنەیێن پانییێدا (٣٦,١٩,٢٤) و (٣٧,٢٢,٥٥) ژئالییێ

باکووریڤە، و د ناڤبەرا هەردو هێلێن درێژییێدا (٤٢°,٢٠',٥٥") و (٤٤°,١٨',١٥") ژ ئالییێ رۆژهەلاتێڤە، ژ هۆکارێن کارلێکەرە د پێکئینانا ئاڤ و هەوایێ پارێزگەهێدا، ژ بەر کو ئەو چەنداتییا تیژك و تیرەکا تاڤێ ئەوا دگەهتە هەر ئێستگەهەکێ کۆنترۆل دکەت. دیسا کارلێکرنا خۆ هەیە، ل سەر گۆشەیا هاتنەخوار و کەڤتنا تیرۆژکا چاڤێ رۆژێ و درێژاهییا رۆژێ، ب هندێ کار ل وێ گەرمێ دکەت، ئەوا ل قەزایێن پارێزگەهێ پەیدا دبت، دیسا جهێ خولگەیێ، هژمار و جوونێن وان بارستەیێن هەوایی ڤەدبڕت، ئەوێن ب سەر پارێزگەهێدا دئێن، د گەل جوونێن هورەبایان و کۆمپەستانێن (المنظومات الضغطية) قەست دکەنێ.

پارێزگەها دهۆك ژ ئالییێ جوگرافیڤە، دکەڤتە باکوورێ رۆژئاڤایا هەرێما کوردستانێ، ژووریێ وێ وەلاتێ ترکیایە و رۆژئاڤایێ وێ وەلاتێ سووریایە و رۆژهەلات ژێ پارێزگەها هەولێرێیە، و د بندە ژێ ل ئالییێ باشووری، پارێزگەها مووسلە. دهۆك ب ڤی جهێ خۆ ئێك ژ پارێزگەهێن سەر سنوورییە. سنوورێن وێ د گەل وەلات و پارێزگەهێن جیران، بارا پتر، سنوورێن سرۆشتینە، وەکی چیا و رووباران، هەر ژ بەر هندێ بلنداییا دەڤەرێن ژووریێن پارێزگەهێ ژ (٣٥٠٠ – ٣٠٠٠ م) د سەر ئاستێ دەریاییێرایە، هەر چەند هندەك دەڤەرێن دی ژێ هەنە، بلنداییا وان ژ ئاستێ دەریایێ ژ (٤٠٠ م) نابوورت.

ب ئاوایەکی گشتی، ئەردێ پارێزگەهێ، هندی ئەڤرازترە، نەمازە ل ئالییێ باکووری و رۆژهەلاتێ باکووری بلندترە و هندی بەرژێرترە دادکەڤت و نزمتر لێ دئێت. ئێستگەها (ئامێدی)یێ یا ئاڤ و هەوایی، کو ل ئالییێ باکوورە، بلنداهییا وێ دگەهتە (١٢٠٢ م). و ئێستگەها (بەردەڕەش) کو ل ژێریێ پارێزگەهێیە، بلنداهییا وێ ژ (٣٧٩ م) دەرباز نابت.

**نەخشەیێ هژمار (١)**
**جهێن ئێستگەهێن ئاڤ و هەوایی ل پارێزگەها دهۆکێ**




ژێدەر: هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا نەخشەکێشان و سەرژمێرییێ، پارێزگەها دهۆکێ.

## تایبەتمەندییێن جهێ پارێزگەها دهۆکێ:

ئاوا و فۆرمێن پانکرنێ (التسطح) ژ رواڵەتێن ژیواری یێن سرۆشتییە، کو ئاڤ و هەوایی ل سەر روویێ ئاخا هەرێمێ پێکدئینت، و بلنداهی ژ ئاستێ روویێ دەریایێ ژ هۆکارێن سەرەکییە ل پشت هەمەرەنگیا ئاڤ و هەوایێ. ئاڤ و هەوایێ دەشتان جودایە ژ ئاڤ و هەوایێ چیایێن بلند ئەوێن بەرهنگاری هورەبایان دبن، دیسا جودایە ژ ئاڤ و هەوایێ پیاک و بەرینییێن بەرەبا و بەرۆژ و نە وەکی ئاڤ و هەوایێ پیاک و بەرینییێن نزار و پشتەبایا.

دەمێ ئەم بەرێ خۆ ددەینە پشککرنا جوگرافییا جهێن ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ، ئەم دبینن کو ئێستگەهێن ژێگۆتی، دکەڤنە هندەك جهـ و ژیوارێن بلند و نزمێن جوداجودا، کو ئەڤە ئێك ژ سالۆخەتێن سەرەکییێن ڤاڤارتنێیە د ناڤبەرا واندا، ئێستگەها ئامێدییێ (١٢٠٢ م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە، لێ ئێستگەها بەردەرەش ل دەشتەکێیە (٣٧٩ م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە.

ئاوا و فۆرمێن روویێ ئەردێ ئێستگەهێن قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ نەوەکهەڤ و جودانە، و بلنداهییا وان ژێ وەك هەڤ نینە، لەو بار و دۆخێن ئاڤ و هەوایێ ڤان ئێستگەهان، رەنگڤەدانا جودایی و نەوەکهەڤییا وانە، کۆمەکا زنجیرە چیایان ل سەر سنوورێ ترکیا و سۆریا هەنە، هەر ژ ژوورییێ رۆژئاڤا هەتا ژێرییێ رۆژهەلات، و دەشت ژێ د ناڤدە هەنە، و ئێستگەهێن تێبینیکرنێ (محطات الرصد) ل ڤان هەمی ژیواران بەلاڤن.

## جهێن ئێستگەهێن تێبینیکرنا ئاڤ و هەوایی ل پارێزگەها دهۆکێ:

ژ بۆ زانینا ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆکێ، پشت ب چەند ئێستگەهەکێن ئاڤ و هەوایی ل جهێن جودا جودا ل پارێزگەهێ هاتە گرێدان کو تایبەتمەندییێن جهێن وان، ب ئاوایەکی باش، رەنگڤەدانا جودایی و نەوەکهەڤییا تایبەتمەندییا ئاڤ و هەوایێ وان جهانە ئەوێن ئێستگەهـ لێ کو ئەڤەنە: زاخۆ، باتێل، سێمێل، دهۆك، زاویتە، سەرسنگ، ئامێدی، ئاکرێ، ئەتریش ل شێخان، بەردەرەش.

### ١- ئێستگەها زاخۆ:

ئەڤ ئێستگەهە ل دەڤەرەکا دەشتە و دکەڤتە رۆژئاڤایێ پارێزگەها دهۆکێ. ئێك ژ کەڤنترین ئێستگەهێن ئاڤ و هەواییە ل دەڤەرێ. سالا (١٩٧٢)ێ هاتییەدامەزراندن. هەمی ئالاڤێن پیڤانا رەگەزێن ئاڤ و هەوایی لێ هەنە. جهێ وێ، دکەڤتە د ناڤبەرا ڤێ هێلا درێژبییێدا (٤١' :٤٢°) بۆ ملێ رۆژهەلاتێ، و ڤی بازنەیێ پانییێدا (٠٨' :٣٧°) بۆ ملێ باکووری. ئێستگەها ژێگۆتی دکەڤتە ژێریێ دەشتەکا راست و د ناڤبەرا دو زنجیرە چیایێن درێژدەیە، زنجیرا ژووری دبێژنێ (جۆدی). ئەڤ ئێستگەهە (٤٤٣,٨ م) ژ ئاستێ دەریایێ بلندە.

### ٢- ئێستگەها باتێلێ:

دکەڤتە رۆژئاڤایا پارێزگەهێ، کو جهەکی دەشت و پان و بەرەڤ نشێڤییە هندی بەر ب ئالییێ ژێریڤە بچین. سالا (٢٠٠٠)ێ ژ بەرێ رێکخراوا ڤاو یا چاندنێڤە هاتییەدانان و ئێستگەهـ ب خۆ ژێ سەر ب رێڤەبەریا دهۆکێ یا چاندنێڤەیە. دکەڤتە د ناڤبەرا ڤێ هێلا درێژبییێدا (٠٠': ٤٢°) و ڤی بازنەیێ پانییێدا (٥٠': ٣٦°)، و (٥٦٩ م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە، و دبت ڤێ بلندایێ شۆپەکا ئاشکەرا هەبت ل سەر پەیدابوونا جودایی و نەوەکهەڤییان د وارێ دیاردەیێن ئاڤ و هەواییدا. دیسا هۆکارێ راستەهییا جهێ وێ، ئێك ژ هۆکارێن هاریکارە بۆ بزاڤا هاتن و چوونا بایان، بێ کو ئاستەنگ بکەڤنە د رێکا خوەشچوونا واندا، هەر وەسا دەڤەر هێلاییە ڤەکری د روویێ کارلێکەرێن بزاڤتنێدا (المؤثرات الحركية)، نەمازە پەستانێن نزم (المنخفضات الجوية)، ئەوێن دەشتا باتێلێ و دەشتا سێمێلێ کرییە رێبارەکا ب سانەهی بۆ وان پەستانێن نزم کو بەر ب دەڤەرێن دیڤە بچن.

**٣- ئێستگەها سێمێلێ:**

ئەڤ ئێستگەهە ل پەرەكی بازاری دهۆكێیە، د ناڤبەرا هێلا درێژیێ (٣٤'، ٤٢°) بۆ ملێ رۆژهەلاتێ و بازنەیێ پانییێ (٤٥'، ٣٦°) بۆ ملێ ژووریدایە. (٤٧٣ م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە. سالا (١٩٩٩)ێ هاتییەدانان. ئەڤ ئێستگەهە سەر رێڤەبەریا چاندنێڤەیە ل باژێرێ دهۆكێ و دكەڤتە رۆژئاڤایا سەنتەرێ باژێری. ئێستگەهـ د نیڤا ئەردەكی دەشتی ڤەكریدایە، كێم ئاڤاهی ل دۆرانێن وێیە، ژ بلی كۆلیجا چاندنێ كو ئێستگەهـ ب خۆ تێدایە. ئێستگەهـ (١٦ كم) ژ باژێرێ دهۆكێ دوورە، دكەڤتە سەر جادەیا دەولەتی ئەوا د ناڤبەرا دهۆك و زاخـۆدا. ژ بەر كو ئەرد و ئاقارێ قەزایێ (مەبەست سێمێلە) دەشتە، سنوورێ ئێستگەهێ ژ ئالییێ ژووریڤە چیایە و ب هندێ دبتە ناڤبر د ناڤبەرا ئێستگەهێ و دەڤەرا چیایی.

**٤- ئێستگەها دهۆكێ:**

ئەڤ ئێستگەهە دكەڤتە د نیڤەكا باژێریدا و ژ ئێستگەهێن كەڤنە. سالا (١٩٧٤)ێ هاتییە دانان. ل سەر گرەكی بلند و ڤەكرییە، بەرانبەری نەخوەشخانەیا ئازادی ژ ئالییێ رۆژهەلاتێڤە. (٥٦٩ م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە. ڤێ بلنداهییێ جودایی د ناڤبەرا وێ و ئێستگەهێن دیدا پەیدا كرییە ژ ئێكا پیڤانا پلەیێن گەرمێ و داباربن و دیاردەیێن ئاڤ و هەواییێن دیدا. ئەڤ ئێستگەهە دكەڤتە د ناڤبەرا هێلا درێژیێ (٠٠'، ٤٣°) بۆ ملێ رۆژهەلاتێ و بازنەیێ پانییێ (٥٠'، ٣٦°) بۆ ملێ ژووریدایە. هەمی رەگەزێن ئاڤ و هەوایی د ڤێ ئێستگەهێدا دئێنە تێبینیكرن و چاڤدێریكرن. رووئاڤەك (مسطح مائی) كو (سكرێ دهۆكێ)یە دكەڤتە ژوورێ ئێستگەهێ، و (سكرێ مووسل) ژی دكەڤتە ژێرێ وێ. لێ د گەل هندێ ژی، كارلێكرنا وان ل سەر نە گەلەكە. ژ ئالییێ رۆژئاڤاڤە ژی رووبارێ دەشتەكا چاندنێ یا بەرفرەهـ دبت كو (دەشتا سێمێلێ)یە.

**٥- ئێستگەها زاویتەیێ:**

ئەڤ ئێستگەهە دكەڤتە ژوورێ رۆژهەلاتێ بازارێ دهۆكێ، و (١٦كم) ژ سەنتەرێ باژێری دوورە. د ناڤبەرا هێلا درێژیێ (٠٩'، ٤٣°) بۆ ملێ رۆژهەلاتێ و بازنەیێ پانییێ (٥٤'، ٣٦°) بۆ ملێ ژووریدایە. (٩٨٠م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە. ئەڤ بلنداهییە كار ل رەگەزێن ئاڤ و هەوایی دكەت كو ژ یێن ئێستگەهێن دی جودابن، نەمازە د پلەیێن گەرمێ و داباریێدا. سالا (١٩٧٩)ێ هاتییەدانان، و هندەك ئالاڤ تێدا هەنە بۆ پیڤانا باران و پلەیێن گەرمێ و تیرۆژكا رۆژێ و شەها رێژەیی (الرطوبة النسبية) و هەلمبوونێ (التبخر). ئێستگەهـ ل سەنتەرێ زاویتە ب خوەیە ل سەر رێكا د ناڤبەرا سەنتەرێ پارێزگەها دهۆكێ و ئامێدییێ دا.

**٦- ئێستگەها سەرسنگێ:**

(٣٠ كم) ژ باژێرێ دهۆكێ دوورە. دكەڤتە سەرێ چیایێ گارە، ب بلندیا(١٠٤٦م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە. د ناڤبەرا هێلا درێژیێ (٢١'، ٤٣°) و بازنەیێ پانییێ (٠٣'، ٣٧°) بۆ ملێ ژووریدایە. سالا (١٩٧٠)ێ ل دەڤەرەكا چیایی كو سەر ب فەرمانگەها چاندنا سەرسنگێڤەیە، هاتییە چێكرن. هەمی ئالاڤێن پیڤانا باران و پلەیێن گەرمێ و تیرۆژكا رۆژێ تێدا هەنە.

**٧- ئێستگەها ئامێدییێ:**

ل سەر كەلایەكا سرۆشتییە كو (١٢٠٢م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە. (٧٠ كم) د سەر باژێرێ دهۆكێرایە. د ناڤبەرا هێلا درێژیێ (٢٩'، ٤٣°) بۆ ملێ رۆژهەلاتێ و بازنەیێ پانییێ (٠٥'، ٣٧°) بۆ ملێ ژووریدایە. سالا (١٩٧١)ێ ژ ئالیێ رێكخراوا (فاو)ڤە هاتییەدانان. هندەك ئالاڤێن چاڤدێریكرن و تێبینیكرن و پیڤانا رەگەزێن ئاڤ و هەوایی تێدا هەنە.

**٨- ئێستگەها ئاكرێ:**

ئەڤ ئێستگەهە دكەڤتە ژێرێ رۆژهەلاتێ بازارێ دهۆكێ، د ناڤبەرا هێلا درێژیێ (٥١'، ٤٣°)

بۆ ملێ رۆژهەلاتێ و بازنەیێ پانییێ ( ٤٣: ٣٦°) بۆ ملێ ژووریدایە. (٦٣١ م) د سەر ئاستێ دەریاییێرایە. ئەڤ ئێستگەهە چاڤدێریا رەگەزێن ئاڤ و هەوایی دكەت و بەردەوام (بۆ دەمێ ٢٤ دەمژمێران) تێبینیا وان گوهۆرینان دكەت ئەوێن د رەگەزێن هەوایدا چێ دبن، وەكی پلەیێن گەرمێ، پەستانا هەوایی، شەها رێژەیی، بایێن رووئەرد (الرياح السطحية)، تیرۆژكا رۆژێ، باران و هەلمبوونێ.

**٩- ئێستگەها ئەتریش ل شێخان:**

ئەڤ ئێستگەهە ل ناوچەیا ئەتریشە كو دكەڤتە ژێریێ باژارێ دهۆكێ. بۆ جارا ئێكێ سالا (٢٠٠٠)ێ هاتییەڤەكرن. ڤێ ئێستگەهێ هندەك تایبەتمەندییێن جوگرافی یێن تایبەت هەنە. (٨٧٠ م) د سەر ئاستێ دەریاییێرایە. د ناڤبەرا هێلا درێژییێ (٢٠: ٤٣°) بۆ ملێ رۆژهەلاتێ و بازنەیێ پانییێ (٥٠: ٣٦° ) دەیە. (٣٣ كم) دووری سەنتەرێ باژێرێ دهۆكێیە. سرۆشتێ ئەردێ ئەتریش چیاییە و گەلەك دارستان لێ هەنە و هندەك ئەردێن دەشت لێ هەنە.

**١٠- ئێستگەها بەردەرەش:**

ئەڤ ئێستگەهە دكەڤتە ژێریێ پارێزگەهێ، د ناڤبەرا هێلا درێژییێ (٣٥: ٤٣°) بۆ ملێ رۆژهەلاتێ و بازنەیێ پانییێ (٣٠: ٣٦°) دەیە. دەڤەرا لێ رووبەرێن بەرفرەهـ و زەڤییێن چاندنێ یێن تێرزاخ لێ هەنە، و ئەردێ وێ بۆ ملێ ژێری و رۆژئاڤا سەرنشیڤ دبت. (٣٧٩ م) د سەر ئاستێ دەریاییێرایە. سالا (٢٠٠٢)ێ هاتییەدانان و سەر ب رێڤەبەریا دهۆكێ یا چاندنێڤەیە. ئێستگەهـ ل سەر جادەیا سەرەكییە ئەوا د ناڤبەرا كەلەك و باژێرێ دهۆكێدا.

## تیرۆژكا تاڤێ:

مەبەست ژ تیرۆژكا تاڤێ ئەو هێزا تاڤێیە ئەوا ژ رۆژێ بەرەڤ هەمی جهێن دی ئاراستەدبن و هەمی هەسارەیێن سەر ب رۆژێڤە گەرما روو و سەقایێ خۆ ژێ وەردگـرن[٢]، و جهێ فەلەكی و گۆشەیا داكەڤتنا تیرۆژكا چاڤێ رۆژێ و درێژیا رۆژێ و رێژەیا ساهییاتی و عەوربوونا ئەسمانی و سەمتا چیایان و پەیسكا نشیڤی و ژووردانییا وان، ئەڤە هەمی كارلێكەرن ل سەر وێ تیرۆژكا دگەهتە روویێ ئەردی، دیسا دەمێ هەتاڤدانا تیۆری (السطوع النظري)، كو دەمێ د ناڤبەرا رۆژهەلاتن و رۆژئاڤابوونێدایە، جودایە ژ هەتاڤدانا كریاری (السطوع الفعلي) كو وی هەمی دەمی دگرت، ئەوێ چاڤێ رۆژێ تێدا ب ئاشكەرایی دئێتە دیتن.

باراپتر دەمێ هەتاڤدانا كریاری ژ دەمێ هەتاڤدانا تیۆری كێمترە، ژ بەر گرتنا بەرێ رۆژێ ب عەوران یان ب تۆزێ و دەمێ دنیا ساهی بت، هەردو تەمەت ئێكن.

دەمێ تێبینیكرنا ڤێ چەندێ ل پارێزگەها دهۆكێ، دیار دبت كو دەڤەرێن ژێریێ پارێزگەهێ ژ یێن ژووری رۆنترن، و هەلم لێ پترە، و رۆژێن ب عەور ژی پترن، لێ ب ئاوایەكی گشتی، هەژمارا دەمژمێرێن هەتاڤدانا رۆژێ یا كریاری، ل دەڤەرێن ژێریێ پارێزگەهێ پترن ژ یێن دەڤەرێن ژووریێ پارێزگەهێ، ئەڤە ژی دوباری بۆ هندێ ڤەدگەرت كو دەڤەرێن ژووری پتر ب عەورن و رۆژ لێ كورتترن.

گەلەك ئاسایی و سرۆشتییە كو تیرۆژك و هەتاڤ ل پارێزگەهێ، ژ دەڤەرەكێ بۆ ئێكا دیتر جودابت، و ئەڤە ژی د خشتەیێ هژمار (١) یێ خوارێدا دیار دبت، كو تێكراییێ گشتییێ دەمژمێرێن هەتاڤدانا كریاری ل ئێستگەها زاخۆ (٧,٠١) دەمژمێرن و ل ئێستگەها باتیلێ (٧,٤٣) دەمژمێرن، و ل ئێستگەها دهۆكێ (٧,٥٦) دەمژمێرن، و ل ئێستگەها ئاكرێ (٧,٨٠) دەمژمێرن، كو د مەها كانوونا دووێ كێمترین تێكراییێن مەهانە بۆ دەمژمێرێن هەتاڤدانا رۆژێ یا كریاری هاتینە تۆماركرن، ل ئێستگەها زاخۆ (٣,٠٩) دەمژمێرن و ل ئێستگەها باتیلێ (٤,٤٠) دەمژمێرن و ل ئێستگەها دهۆكێ (٤,٤٢) دەمژمێرن و ل ئێستگەها ئاكرێ (٤,٣٣) دەمژمێرن. لێ د مەها تیرمەهێدا كو گەرمترین مەهە د سالێدا، بلندترین تێكراییێن مەهانە بۆ دەمژمێرێن هەتاڤدانا رۆژێ یا كریاری هاتینە تۆماركرن، ل ئێستگەها زاخۆ (١١,٢)

**خشتەیێ هژمار (١)**

**تێکرا و هەژمارا دەمژمێرێن هەتاڤدانا ڕۆژێ یێن کریاری (دەمژمێر/ڕۆژ)**

| مەهـ / ئێستگەه | [illegible] | شوبات | ئادار | نیسان | گولان | خزیران | تیرمەه | تەباخ | ئیلون | چری ١ | چری ٢ | کانوون ١ | تێکرایێ سالانە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ٣,٠٩ | ٣,٩٩ | ٥,١١ | ٥,٥١ | ٨,٧٧ | ١٠,٤٨ | ١١,٠٢ | ١٠,٥٧ | ٩,٢١ | ٦,٧٣ | ٥,٣٢ | ٤,٣٣ | ٧,٠١ |
| باتیل | ٤,٤٠ | ٤,٧٨ | ٥,٩٩ | ٦,٣١ | ٨,٥٨ | ١٠,٦٤ | ١١,٨٠ | ١٠,٨٦ | ٩,١٤ | ٦,٧٨ | ٥,٣٧ | ٤,٥٦ | ٧,٤٣ |
| دهۆک | ٤,٤٢ | ٤,٢٦ | ٥,٩٠ | ٥,٩٩ | ٨,٩٩ | ١١,٢٤ | ١١,٦٨ | ١٠,٩٢ | ١٠,٢٢ | ٦,٨٢ | ٥,٨٨ | ٤,٤٦ | ٧,٥٦ |
| ئاکرێ | ٤,٣٣ | ٣,٨٩ | ٦,١٦ | ٥,٠٤ | ١١,٠٦ | ١١,٩٥ | ١١,٩٥ | ١١,٧٤ | ١٠,٥ | ٦,٩ | ٥,٨٢ | ٤,٣٤ | ٧,٨٠ |
| تێکرایێ گشتی | ٤,٠٦ | ٤,٢٣ | ٥,٧٩ | ٥,٧١ | ٩,٣٥ | ١١,٠٧ | ١١,٦١ | ١١,٠٢ | ٩,٧٦ | ٦,٨٠ | ٥,٥٩ | ٤,٤٢ | ٧,٤٥ |

ژێدەر: ڕێڤەبەریا کەشناسی ل پارێزگەها دهۆکێ، پشکا ئاڤ و هەوایی، پێزانینێن بەلاڤنەکری.

دەمژمێر و ل ئێستگەها باتێلێ (١١,٨٠) دەمژمێر، و ل ئێستگەها دهۆکێ (١١,٦٨) دەمژمێر، و ل ئێستگەها ئاکرێ (١١,٩٥) دەمژمێر هاتینە توومارکرن.

جوداهی د هەژمارا دەمژمێرێن هەتاڤدانێدا د ناڤبەرا ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێدا، گرنگییا جوداهییا بلندی و نزمییان دیار دکەت، کو دەورەکێ مەزن د جوداهییا چەنداتییا وێ تیرۆژکا ڕۆژێدا هەیە ئەوا دگەهتە ڤێ دەڤەرێ یان ئەوا هەی، ئاراستەیا بەرینییێن چیایان و ژ نشیڤییا وان، کار ل تێکڕایێ وێ تیرۆژکا ڕۆژێ دکەت، ئەوا دگەهتە وان جهـ و دەڤەرێن مامناڤنجی ئەوێن تیرۆژکەکا خوار دگەهتێ کو دوورن ژ تیرۆژکا ڕۆژێ یا ئێکسەر، کو تنێ تیرۆژکا بەلاڤ و شکەستی ژ روویێن بەرانبەر دگەهتێ، ژ بلی وان چیایێن بلند و بەرینییێن گەلەك ژووردانی و نشیڤی ئەوێن گۆشەیا داکەڤتنا (سقوط) تیرۆژکا ڕۆژێ ل سەر وان ڕاست و چەك کو تیرۆژکا دگەهتێ ژ دەڤەرێن نزمتر پتر لێ دکەت. و ئەڤە ل سەر ئێستگەها ئاکرێ دئێتە دانان کو مەزنترین چەنداتییا تیرۆژکا ڕۆژێ وەردگرت، گاڤا دئێتە هەڤبەرکرن ب ئێستگەهێن دیتر. ب هندێ جهـ و دەڤەرێن جوگرافی و دەرێن رووباری تیرۆژکا ڕۆژێ چ جهەکی بلندبت، چ ژی نزمی بت، ئەو پتر تیرۆژکێ وەردگرت ژ پشك و پارچەیێن ژووری و ژووریێ ڕۆژئاڤا.

و هندی گۆشەیا داکەڤتنا تیرۆژکا ڕۆژێیە، نەخشەیێ هژمار (٢) تێکڕایێن هەیڤانە و سالانە یێن گۆشەیا داکەڤتنێ ل سەر هندەك ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ دیار دکەت، و دیار دکەت کو ئێستگەهێن روویێ وان ل کەمەرەبازنەیێ (دائرة الاستواء)، گۆشەیا داکەڤتنا تیرۆژکا ڕۆژێ لێ پترە ژ وان ئێستگەهێن روویێ وان دوورتر ژ کەمەرەبازنەیێ وەکی ئێستگەها زاخۆ و سەرسنگی و ئامێدییێ ل سەر بازنەیێ پانییێ (٣٧°) کو (٥٣:٣٣) و (٤٦:٦٩) و (٤٦:١١) لێ هاتینە توومارکرن، هەڤبەری ئێستگەهێن باتێل و دهۆك و ئاکرێ ئەوێن دکەڤنە سەر بازنەیێ پانییێ (٣٦°)، کو تێکڕایێ گۆشەیا داکەڤتنا تیرۆژکا ڕۆژێ لێ (٥٣:٩١) و (٥٣:٩١) و (٥٣:٩٨)یێە.

و تێکڕایێ سالانە یێ گشتی یێ گۆشەیا داکەڤتنا تیرۆژکا ڕۆژێ دەمێ وەرگرتنێ یێ هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ گەهشتە (٥٣,٧٨°)، دیسا ئێستگەها زاخۆ تێکڕایەکی سالانە بۆ گۆشەیا داکەڤتنا تیرۆژکا ڕۆژێ توومارکر گەهشتە (٥٥,٣٣°) و ل ئێستگەها باتێل (٥٣,٩٥°) و ل ئێستگەها ئامێدییێ (٤٦,١١°) و ل ئێستگەها ئاکرێ (٥٣,٩٨°) هاتنە توومارکرن.

**نەخشەیێ هژمار (٢)**

**تێکرا و هەژمارا دەمژمێرێن هەتاڤا دورست (دەمژمێر/ ڕۆژ)**




ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەرییە ب پشتگرێدان ب ئەنجامێن (معطیات) د نەخشەیێ هژمار (١)دا.

ل وەرزێ هاڤینێ کو هەژمارا تێکرایێن هەیڤانە یێن دەمژمێرێن هەتاڤدانێ (ساعات السطوع) دگەهنە بلندترین هژمار و ب تایبەتی ل مەها خزیرانێ ژ بەر زێدەبوونا درێژیا ڕۆژێ و کێمیا عەوران، هەڤبەری وەرزێن دی، کو کار ل زێدەبیا چەنداتیا وێ تیرێژکێ دکەت ئەوا دگەهتە ڕوویێ ئەردی. زاخۆ د وەرزێ هاڤینێدا (١٠٦٩) دەمژمێر و باتێلێ (١١٠١) دەمژمێر و دهۆکێ (١١٠٢٨) دەمژمێر تووماركرن و ئاكرێ كو بلندترین تێكرایێ وەرزی ل هاڤینێ تووماركر گەهشتە (١١٠٨٨) دەمژمێران، ئەڤە هەمی ژ بەر كێمیا عەوران و هشكاتییا هەوایی و داكەڤتنا تێكرایێ ڕەوایێ.

ل وەرزێ بهارێ كو گۆشەیا داكەڤتنا تیرۆژكا ڕۆژێ ئاسۆیی یان مامناڤنجییە (معتدلة)، ئێستگەها زاخۆ تێكرایێ وێ یێ وەرزی گەهشتە (٦,٤٦) دەمژمێر و یێ باتێلێ (٦,٩٦) دەمژمێر و یێ دهۆكێ (٦,٩٦) دەمژمێر و ل ئێستگەها ئاكرێ بلندترین تێكرایێ دەمژمێرێن هەتاڤا وەرزی هاتنە تووماركرن، كو (٧,٤٢) دەمژمێر بوون، و ئەڤە هەمی ژ بەر جوداهیا جهی، كو ئێستگەها زاخۆ دكەڤتە سەر بازنەیێ (٣٧,٠٨°) یێ پانییێ، و ئاكرێ ل سەر بازنەیێ (٣٦,٤٣°)ە، كو هەژمارێن تیرۆژكا ڕۆژێ زێدە دبن، ژ بلی تێكرایا هەژمارا دەمژمێرێن هەتاڤێ ئەوێن هاتینە تووماركرن، هندی مرۆڤ بەر ب نشیڤتر بچت.

ل وەرزێ پاییزێ، زاخۆ (٧,٠٨) دەمژمێر و باتێلێ (٧,٠٩) دەمژمێر و دهۆكێ (٧,٦٤) دەمژمێر تووماركرن، لێ بەلێ ل دەڤەرێن ڕاست و دەشتی، تێكرایێن تیرۆژكا ڕۆژێ نێزیكی هەڤن، ژ بەر كو كاودانێن ئاڤ و هەوایی ل وان جهان وەكهەڤن و ب هندێ هەژمارا دەمژمێرێن هەتاڤدانا دورست (فعلی) بهاران كێم دبن و پاییزان زێدە دبن، ئەگەرێ ل پشت ژێ، زێدەبیا هەژمارا ڕۆژێن عەور و بارانییە.

جودایی د گۆشەیا داکەڤتنا تیرۆژکێدا د ناڤبەر هاڤین و زڤستانێدا ل جهێن جوداجودایێن پارێزگەها دهۆکێ دبتە ئەگەرێ چەندجارکرنا (مضاعفة) مەودایێ سالانەیێ تیرۆژکێ، و جودابیا درێژیا شەڤ و رۆژان کارلێکرنا خۆ ل سەر نەوەکهەڤیا چەنداتیا تیرۆژکا دگەهت هەیە، دیسا د بەرهەمهێنانا گەرما (الانتاج الحراری) هەر دەڤەرەکێدا. ل پارێزگەها دهۆکێ زێدەبوونا پچپچەیا تێکڕایێ درێژیا رۆژێ ل مەها ئادارێ ب (١١,٤٥) دەمژمێران دەست پێ دکەت، و ئەڤ هژمار دگەهتە گوپیتکا بلندبوونێ دەمێ تیرۆژك ل (٢٢ خزیرانێ) ژۆردا دادکەڤت، هنگێ تێکڕایێ درێژیا رۆژان ل ئێستگەهان (ل مەهێن خزیران و تیرمەهـ و تەباخێ) پچپچە بەرژێر دبت، هەر ژ مەها ئیلۆنێ، چریا پێشێ و چریا پاشی، پاشێ دگەهتە نزمترین سنوور د هەمی مەهێن زڤستانێدا، مەها کانوونا ئێکێ نزمترین بها (٩:٣٠:٤٤) دەمژمێر، برێنە خشتەیێ هژمار (٢) د گەل تێبینیکرنا هندێ کو هەژمارا وان هەیڤێن کو درێژیا رۆژێ یا تیۆری ژ تێکڕایێ سالانە زێدە دکەت، هەتا شەش مەهان (١٢,٠١) دەمژمێرن.

و ب ئاوایەکی گشتی، پشك و پارچەیێن ژووری ژ دەڤەرا ڤەکۆلین ژێ دگریت تەنکترە (أقل شفافیة) ژ پشك و پارچەیێن ژێری کو ناڤەرۆکا بەرگێ گازی (محتوی الغلاف الغازی) لێ ژ هەلما ئاڤێ زێدەتر دبت، دیسا رۆژێن عەور ژی زێدەترن، هەر وەسا دەمژمێرێن هەتاڤدانێ ژی ل دەڤەرێن ژێری زێدەترن ژ یێن دەڤەرێن ژووری. هەژمارا دورست یا وان دەمژمێران د ناڤبەرا (٢٣٠٠ - ٤٤٠٠) دەمژمێرانە د سالێدا.

**خشتەیێ هژمار (٢)**

**تێکڕایێ درێژیا رۆژان ب دەمژمێر و دەقیقە و چرکەیان ل هندەك ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ**

| ئێستگەهـ مەهـ | زاخۆ | باتێل | دهۆك | سەرسنك | ئامێدی | ئاکرێ | تێکڕا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ك٢ | ٩:٤٥:٣٧ | ٩:٤٨:٢٩ | ٩:٤٨:٢٩ | ١٠:٠٣:١٣ | ١٠:٠٣:٢٢ | ٩:١٣:٠٨ | ٩:٤٧:٠٣ |
| شوبات | ١٠:٣٦:٤٦ | ١٠:٣٨:٢٣ | ١٠:٣٨:٢٣ | ١٠:٤٨:٣٦ | ١٠:٤٨:٤١ | ١٠:١٧:١٠ | ١٠:٣٨:٠٠ |
| ئادار | ١١:٤٥:٠٢ | ١١:٤٥:٢٧ | ١١:٤٥:٢٧ | ١١:٤٧:٣٢ | ١١:٤٧:٣٣ | ١١:٤١:٢٤ | ١١:٤٥:٢٤ |
| نیسان | ١٢:٥٨:٠٠ | ١٢:٥٦:٣٤ | ١٢:٥٦:٣٤ | ١٢:٥٠:١٠ | ١٢:٥٠:٠٦ | ١٣:١١:٠٦ | ١٢:٥٧:٠٥ |
| گولان | ١٣:٥٩:٢٧ | ١٣:٥٦:٣٤ | ١٣:٥٦:٣٤ | ١٣:٤٣:٥٢ | ١٣:٤٣:٤٤ | ١٤:٤٨:٢٩ | ١٤:٠٢:٢٥ |
| خزیران | ١٤:٣٠:٣١ | ١٤:٢٧:١٧ | ١٤:٢٧:١٧ | ١٤:١١:٣٢ | ١٤:١١:٢١ | ١٥:٠٦:٠٤ | ١٤:٢٩:٠٠ |
| تیرمەهـ | ١٤:١٦:٢٢ | ١٤:١٣:٠٧ | ١٤:١٣:٠٧ | ١٣:٥٨:٢٥ | ١٣:٥٨:١٥ | ١٤:٤٨:٢٩ | ١٤:١٤:٣٨ |
| تەباخ | ١٣:٢٣:٢٠ | ١٣:٢١:١٢ | ١٣:٢١:١٢ | ١٣:١١:١٧ | ١٣:١١:١١ | ١٣:٤٢:٢٥ | ١٣:٢١:٤٦ |
| ئیلۆن | ١٢:١٢:٥٠ | ١٢:١٢:٠٧ | ١٢:١٢:٠٧ | ١٢:١٠:٢٣ | ١٢:١٠:٢٢ | ١٢:١٥:٠٩ | ١٢:١٢:١٠ |
| چ ١ | ١١:٠٠:٣٧ | ١٢:٠١:٠٠ | ١٢:٠١:٠٠ | ١١:٠٧:٥٢ | ١١:٠٧:٥٦ | ١٠:٤٦:٢٧ | ١١:٢٠:٤٩ |
| چ ٢ | ٩:٥٩:٠٢ | ١٠:٠١:٠١ | ١٠:٠١:٠١ | ١٠:١٤:٣٧ | ١٠:١٤:٤٥ | ٩:٣٠:١٨ | ١٠:٠٠:٠٧ |
| ك١ | ٩:٢٩:٢٤ | ٩:٣٢:١٩ | ٩:٣٢:١٩ | ٩:٤٨:٢٠ | ٩:٤٨:٣١ | ٨:٥٣:٣١ | ٩:٣٠:٤٤ |
| تێکڕا | ١١:٥٩:٤٥ | ١٢:٠٤:٢٧ | ١٢:٠٤:٢٧ | ١١:٥٩:٣٩ | ١١:٥٩:٣٩ | ١٢:٠١:٠٨ | ١٢:٠١:٣٦ |

ژێدەر، رێڤەبەریا ئاڤ و هەوایی ل پارێزگەها دهۆکێ، پشکا ئاڤ و هەوایی، پێزانینێن بەلاڤنەکری.

دەمژمێرێن هەتاڤدانێ ل ئێستگەها زاخۆ (٤٣٦٧) دەمژمێرن د سالێدا و ل یا باتیلێ (٤٠٩٢) دەمژمێرن د سالێدا و ل دهۆكێ دەمژمێرێن ژ هەمییان كێمتر هاتنە توومارکرن کو (٣٦٦٧) دەمژمێرن د سالێدا، لێ هەژمارا دەمژمێرێن هەتاڤدانا ژ هەمییان پتر ل ئاكرێ هاتە توومارکرن کو (٤٣٨٤) دەمژمێرن د سالێدا، ژ بەر کو پشك و پارچەیێن ژێری و جهێن رۆژهەلاتی ئەڤێن ب رۆژ وە لێ دكن کو پتر تاڤێ وەربگرن، ژ بلی هندێ کو پارێزگەها دهۆكێ ب خۆ كێم عەورترە و رۆژا وێ ل پشك و پارچەیێن وێ یێن ژێری درێژترە ژ یا پشك و پارچەیێن وێ یێن ژووری.

## پلەیێن گەرمێ:

پلەیێن گەرمێ كار ل توخمێن دی یێن ئاڤ و هەوایی دكەن وەك پەستانا هەوایی (الضغط الجوی)، هورەبا، هەلم، رەوا و چڕی ب هەمی ئاوایانڤە، هەر وەسا كار ل چەنداتییا وان بارانان ژی دكەت ئەوێن دبارن[٣].

و سەروبەرێ گشتیێ یا گەرمێ ئەنجاما ڤێككەڤتنا كۆمەكا ئەگەر و هۆكاران ئاڤ و هەواییە (ضوابط مناخیة) ژ وان جهێ فەلەكی ئەوێ كارلێكەر ل سەر دەستنیشانكرنا گۆشەیا داكەڤتنا تیرۆژكا رۆژێ ئەوا كارلێكەر ل سەر چەنداتییا گەرما دگەهتە رووبێ ئەردی کو دبتە ئەگەرێ ژ دەستدان و وەرگرتنا گەرمێ ل دووڤ درێژاهییا دەمژمێرێن شەڤ و رۆژان کو جهێ فرێتێ (الموقع الاحداثی) ڤەدبڕت.

و ل سەر ڤی بنیاتی، ئاڤ و هەوایێ هەر دەڤەرەكێ ئەنجاما كۆمەكا كریارێن پێككگوهارتن و ڤەگوهازتنا گەرمێنە، ئەو ئەنبارکرنا گەرمایا وێ دەڤەرێ ڤەدبڕت[٤]، و ئەڤ هەمی گوهۆڕینە ب رێكا بەلاڤكرنا رۆژانە و سالانەیا پلەیێن گەرمێ دئێتە جهئینان، و ئەڤ هەمی گوهۆڕینە ژی سالێ هەمییێ ژێك جودانە د بن كارلێكرنا لڤینا بەرچاڤا رۆژێ نە د هەر چار وەرزاندا[٥].

و سالۆخەتێن كەتوارێ گەرمێ (الواقع الحراری) یێ هەر دەڤەرەكێ ب كارێ هندەك هۆكاران دئێتە ڤەبرین وەكی: بازنەیێن پانییێ یێن جهی و ئاوایێ روویێ ئەردی و جهێ ئێستگەهێ و دووراتییا وێ ژ رووئاڤان (المسطحات المائیة)، و جودایی د هێزا كارئینانا ڤان هۆكاراندە دبتە ئەگەرێ نەوەكهەڤییا پلەیێن گەرمێ ژ دەڤەرەكێ بۆ ئێكا دی و هەر ژ بەر هندێ، هاڤینا پارێزگەها دهۆكێ گەرمە و زڤستانا وێ سارە، و مەودایێ سالانە و وەرزییێ پلەیێن گەرمێ ل جهێن نزم مەزنە، و ئەڤ مەودایە، ل دووڤ زێدەبوونا پلەیێن پاناتییێ زێدەتر لێ دئێت.

ژ بەر هندێ گەلەك ئاسایی و سروشتییە جودایی هەبت د ناڤبەرا تێكراییێن سالانەیێ توومارکری یێن پلەیێن گەرمێ ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ، ئەڤە ژ بەر جوداییا سالۆخەتێن وان یێن سروشتی، ئەڤە دیارە دەمێ ئەم ل دووڤ خشتەیێ (٣) دچن، و وان جوداییان د تێكراییێن سالانەیێن پلەیێن گەرمێدا، ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێدا دبینن، کو ب ئاوایەكی گشتی هوونكن، و تێكرایێ سالانەیێ گشتی یێ پلەیێن گەرمێ ل ئێستگەهێن دهۆكێ (١٨,٥٨ م°)، لێ ئێستگەهێن تێكراییێن وان بلندتر ژ تێكرایێ گشتی لێ هاتینە توومارکرن ئەڤەنە: باتێل (٢١,١٨ م°)، زاخۆ (٢٠,٥١ م°)، دهۆك (٢٠,٣٥ م°)، بەردەرەش (١٩,٢٧م°)، ئاكرێ (١٩,١٢م°)، ئەتریش (١٩,٠٨م°) و سێمێل (١٨,٩٦ م°).

و هندەك ئێستگەهـ هەنە، هندەك تێكرایی لێ هاتینە توومارکرن كێمترن ژ تێكرایێ گشتییێ پلەیێن گەرمێ، ئەو ژی ئەڤەنە: ئێستگەها زاویتە (١٥,٧٩م°)، سەرسنگ (١٦,٣٥ م°) و ئامێدیێ یا (١٥,١٥ م°)، و ئەڤ جوداییە ئەنجامێ چەند هۆكارەكانە هندەك ژێ خۆجهییەنە، وەك بلندی و نزمی ژ ئاستێ دەریایێ و هورەباییێن خۆجهی (الریاح المحلیة) كێمترین ناڤنجییێن سالانە (المتوسطات السنویة) یێن پلەیێن گەرمێ ل ئێستگەها ئامێدییێ هاتینە توومارکرن (١٥,١٥م°)یــە، و ئەڤە ژی بۆ هۆكارێ بلندییێ ژ ئاستێ دەریایێ ڤەدگەڕت، چونكو ئێستگەها ئامێدییێ دكەڤیتە بلندی (١٢٠٢ م) د سەر ئاستێ دەریایێرایە، و ل ئالییەكی دی، ناڤنجییێ

**خشتەیێ (٣)**

**تێکڕایێ هەیڤانە و سالانەیێ پلەیێن گەرمێ ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ بۆ (٢٠٠١ – ٢٠١١).**

| ئێستگەه | ک٢ | شوبات | ئادار | نیسان | گولان | حزیران | تیرمەه | ئاب | ئەیلول | ت١ | ت٢ | ک١ | تێکڕایێ سالانە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ٨,٠٥ | ٩,٣ | ١٣,٩ | ١٧,٠ | ٢٣,٨ | ٣٠,٤ | ٣٤,٢ | ٣٣,٧ | ٢٨,٩ | ٢٢,٦ | ١٤,٦ | ٩,٧ | ٢٠,٥١ |
| باتێل | ٩,٦ | ١٠,٨ | ١٤,٨ | ١٨,٨ | ٢٤,٨ | ٣٠,١ | ٣٣,١ | ٣٢,٦ | ٢٩,٠٥ | ٢٣,٤ | ١٦,١ | ١١,٠٧ | ٢١,١٨ |
| سێمێل | ٦,٩ | ٩,١ | ١١,٨ | ١٦,٦ | ٢٢,٦ | ٢٨,١ | ٣١,٥ | ٣١,٥ | ٢٦,٦ | ٢١,٧ | ١٣,١ | ٨,١ | ١٨,٩٦ |
| دهۆك | ٧,٣ | ٩,٢ | ١٣,٥ | ١٧,٦ | ٢٣,٧ | ٣٠,٢ | ٣٤ | ٣٣,٢ | ٢٨,٥ | ٢٢,٨ | ١٤,٦ | ٩,٧ | ٢٠,٣٥ |
| زاویتە | ٤,٢ | ٥,٠٧ | ٩,٢ | ١٣,٣ | ١٩,٢ | ٢٥,٠٥ | ٢٨,٣ | ٢٨,٧ | ٢٣,٨ | ١٨,٢ | ٩,٣ | ٥,٢ | ١٥,٧٩ |
| سەرسنگ | ٢,٣ | ٤,٥ | ٩ | ١٣,٠ | ١٩,٨ | ٢٦,٣ | ٣٠,٧ | ٣٠,٧ | ٢٥,٦ | ٢٠,٢ | ٩,٦ | ٤,٦ | ١٦,٣٥ |
| ئامێدی | ١,٨ | ٢,٥ | ٦,٧ | ١١,٩ | ١٨,١ | ٢٥,٤ | ٢٩,٣ | ٢٩,٧ | ٢٤,٨ | ١٨,٦ | ٩,٢ | ٣,٨ | ١٥,١٥ |
| ئاکرێ | ٥,٧ | ٦,٧ | ١٢,٤ | ١٦,٢ | ٢٣,٥ | ٢٩,٤ | ٣٢,٧ | ٣٢,١ | ٢٨,٢ | ٢١,٧ | ١٢,٨ | ٨,٠٧ | ١٩,١٢ |
| ئەترۆش | ٦,٦ | ٧,٧ | ١٢,٣ | ١٦,٠ | ٢٢,٠ | ٢٩,٣ | ٣٣,٥ | ٣٢,٨ | ٢٧,٣ | ٢٠,٩ | ١٢,٣ | ٨,٨ | ١٩,٠٨ |
| بەردەڕەش | ٤,٦ | ٦,٣ | ١١,٠٥ | ١٤,٢ | ٢٢,٩ | ٣٠,٥ | ٣٣,٦ | ٣٤,٨ | ٣٠,٤ | ٢٢,٩ | ١٢,٢ | ٧,٩ | ١٩,٢٧ |
| تێکڕایێ گشتی | ٥,٧٠ | ٧,١١ | ١١,٤٦ | ١٥,٤٦ | ٢٢,٠٤ | ٢٨,٤٧ | ٣٢,٠٤ | ٣٢,٠٧ | ٢٧,٣١ | ٢١,٣ | ١٢,٣٨ | ٧,٦٩ | ١٨,٥٨ |

ژێدەر: ڕێڤەبەریا کەشناسی و بیڤەلەرزان، ل پارێزگەها دهۆکێ، پێزانینێن بەلاڤنەکری

سالانەیێ پلەیا گەرمێ ل ئێستگەها باتێلێ بوو (٢١,١٨م°) ژ بەر کارلێکرنێن جهێ فرێتێ (الموقع الاحداثی)، هندی ئەم بەر ب پشك و پارچەیێن ژووری بچن، پلەیێن گەرمێ دادکەڤن، و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی هۆکارێ بلندی و نزمیا ئەردییە. کارلێکرنا دووراتی ژ دەریایێ و بلنداهی ژ ئاستێ وێ و درێژبوونا بلندی و نزمییان (التضاریس) و پلەیێن پاناتییێ ل بەلاڤکرنا تێکڕایێن سالانە یێن پلەیێن گەرمێ دیاردبت، زێدەباری زێدەبوونا تێکڕایێن پلەیێن گەرمێ ل وەرزێ هاڤینێ هندی ئەم ژ ژووری داکەڤنە ژێری یان نشیڤ، هەر وەسا تێکڕایێ پلەیێن گەرمێ یێ سالانە ل ئێستگەها بەردەڕەش ئەوا دکەڤتە ژێریێ پارێزگەهێ بلند دبت، و ئەڤە ژی بۆ پلەیا پاناتییێ یا دەڤەرا بەردەڕەش ڤەدگەڕت، کو ڕۆلەکێ گرنگ هەیە د کێمکرنا کارلێکرنا دەریایا ناڤەڕاستەدە، ب ڕێکا خوەشکرن و هوونکرنا گەرما هاڤینێدا کو دبتە ئەگەرێ بلندبوونا بهایێن (قیم) تێکڕایێ سالانە یێ پلەیا گەرمێ، ئەوێ دگەهتە (١٩,٢٧م°)، سەرباری هۆکارێن گوهۆڕێن ئاڤ و هەوایی (العوامل المناخیة المتغیرة)، جوداییا ڕێژەیا دوبارەبوونا بارستێن هەوایی یێن خولگەیی و جەمسەری (الکتل الهوائیة المداریة والقطبیة) د ناڤبەرا ئێستگەهێن ژووری و ژێریدا، ل جوداییا تێکڕایێ سالانەیێ پلەیێن گەرمێ د ناڤبەرا ئێستگەهێن ژووری و ژێریدا دیاردبت، هەتا وێ ڕادەیێ کو تێکڕایێ سالانەیێ ئێستگەها ئامێدییێ بوو (١٥,١٥م°) و یێ ئێستگەها بەردەڕەش بوو (١٩,٢٧ م°)، هەر وەسا کارلێکرنا هۆکارێ بلندییێ ژ ئاستێ دەریایێ و ڕووبەرێ شینکاتییێ یێ ئێستگەهێن سەرسنگ و ئامێدییێ ئەوێن دکەڤنە دەڤەرێن ژووری و نیڤەکێ د وەرگرتنا کێمترین تێکڕایێن گەرمێدا

دیاردبت. هەر وەسا ئێستگەها دهۆکێ تێکڕایەکی سالانەیێ پلەیا گەرمێ توومارکر گەهشتە (٢٠,٣٥م°) و ئەڤە ژی بۆ هندێ ڤەدگەڕت، کو سەنتەرێ باژێری ژ کۆمەکا مەزنا ئاڤاهییێن ب شێوە و قەبارەیێن جوداجودا و ب گەلەك فۆرم و ڕەنگان پێکهاتییە، کۆنکریت و بلۆك و کەرپیچ و جادەیێن قیرکری تێدا هاتینە کارئینان، ژ بلی سۆتنا داردوویێ ژ بۆ گەرمکرن و هوونکرنێ دئێتە کارئینان و زێدەباری کێمیا رووبەرێ شینکاتی (الغطاء النباتی)، و ئەڤە هەمی کەرەستەیێن خوەشوەرگرن بۆ گەرمێ، د دەمەکێدا کو ئێستگەهێن دۆرماندۆرا باژێرێ دهۆکێ، زەڤییێن ڤەکری و ئەردێن چاندنێ و هورەباییێن خوەش لێ هەنە، کو هەمی پلەیا گەرمێ ل ئێستگەهێن دۆرماندۆر نزم دکەن و دئیننە خوارێ.

## تێکڕاییێن هەیڤانەییێن پلەیێن گەرمێ:

ژ نەخشەیێ (٣) یێ تێکڕاییێن هەیڤانەییێن پلەیێن گەرمێ ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ دیار دبت کو مەها کانوونا دووێ ژ هەمی مەهێن سالێ سارترە، تێکڕاییێن گەرمێ ب ئاوایەکی مەزن د ڤێ مەهێدا دادکەڤن کو دگەهنە ڤی تێکڕایێ گشتی (٥,٧٠م°) و ئەڤە ڤەدگەڕتە کارلێکرنا بارستێن هەوایی یێن جەمسەری ئەوێن د ڤێ مەهێدا گەلەك دوبارە دبن، و بلندیا ئەردی ژی ڕۆلەکی ئاشکەرا د داکەڤتنا تێکڕاییێن گەرما ڤێ مەهێدا هەیە، و ل هەمی ئێستگەهان ناگەهنە پلەیا قەرسینێ، ژ بلی ئەوێن دکەڤنە دەڤەرێن چیایی کو پلەیا گەرما

**نەخشەیێ هژمار (٣)**
**تێکڕایێ سالانەیێ گەرمێ یێ ئێستگەهێن دهۆکێ**



**ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەرییە پشتگرێدانێ ب پێزانینێن نەخشەیێ هژمار (٣) یێن ڕێڤەبەریا کەشناسی و بیڤەلەرزان، پارێزگەها دهۆکێ، پێزانینێن بەلاڤنەکری.**

وان دادکەڤتە پلەیا قەرسینێ ل پرانییا رۆژێن مەها کانوونا دووێ و سوباتێ، چونکو پارێزگەها دهۆکێ د مەهێن زڤستانێدا بەرهنگاری هندەك بارستێن کیشوەری یێن گەلەك سار دبت کو ژ نیڤەکا ئاسیا یان ئەوروپا دئێن.

ل هەمی ئێستگەهان، بلندترین پلەیێن گەرمێ د نیڤا گەرمدا ژ سالێ دئێنە توومارکرن، کو تێکراییێن وان دبنە (٣٢,٠٤م°) و نێزیکاتییەك د ناڤبەرا پلەیێن گەرمێ ل ژووری و ژێریێ پارێزگەهێ دیار دبت ل مەها تیرمەهێ، و ئەڤە ژی بۆ هندێ دزڤرت کو گەلەك جوداهییێن مەزن د ناڤبەرا دەمێ درێژاهییا رۆژێ ، ل ژووری و ژێریێ پارێزگەهێ نینن، ئەڤە یا بچووکاتییا رووبەرێ دەڤەرێیە، ئانکو دەمێ وەرگرتنا (اکتساب) گەرمێ ل ژووری گەلەك نێزیکی دەمێ وەرگرتنا گەرمێیە ل ژێری، لێ کارلێکرنا هۆکارێ بلندییێ ژ ئاستێ دەریایێ جوداهییان د ناڤبەرا ئێستگەهێن پارێزگەهێدا پەیدا دکەت، ئێستگەها زاخۆ د مەها تیرمەهێدا بلندترین تێکراییێن هەیڤانەیێن گەرمێ توومارکرن کو گەهشتنە (٣٤,٢م°)، لێ ئێستگەها زاویتە کێمترین تێکرا توومارکر کو گەهشتە (٢٨,٣م°) و ئەڤە ب پلەیەکا مەزن بۆ جوداهییا هەمبزی و چڕییا رووبەرێ شیناهییێ ڤەدگەڕت، چونکو پێکهاتێن رووبێ ئەردی کارلێکرنەکا ئاشکەرا هەیە ل سەر بەرهەمئینانا گەرمێ (إنتاج الحرارة) هەر وەکی ل ئێستگەها زاویتە بەلی و دیار، کو کراسەکێ شیناهییێ یێ هەمبز و تێکرا لێ بەلاڤە دبتە ئەگەرێ خوەشکرنا هەوایی و نزمکرنا پلەیێن گەرمێ، لێ ئەگەرێ بلندبوونا تێکراییێن گەرمێ بۆ کارلێکرنا وان زنجیرەچیایان ئەوێن د ناڤبەرا رۆژئاڤا و رۆژهەلاتێ پارێزگەهێدا، وەکی چیایێ دێرا (١٥٣٠م) و شەرانش (٢٠٥٢ م) و کیرا (١١٩٥م) و رەشۆنی (٢٠٢٣م) و مەهرنار (٢١٣٣ م)، ئەڤ چیایە دبنە ئاستەنگ د رێکا بزاڤا بارستێن هەواییدا و ناهێلن بگەهنە دەشتێن بنداتر ئەوێن دکەڤنە ژێریێ وان، سەرباری هندێ کو چیایێن ژێکۆتی دکەڤنە د بن کارلێکرنا سیستەمێ گەرما دەشتێ و جهێن داکەڤتی و نشیڤ بەرەڤاژی جهێن وان ئێستگەهێن ل جهێن بلند کو دکەڤنە د بن کارلێکرنا کۆیێن چیایاندە هەر وەکی ئێستگەها ئامێدییێ.

پارێزگەهـ د مەهێن بهارێدا بەرهنگاری کارلێکرنا نشیڤێ وەرزیێ هندستانێ (منخفض الهند الموسمی) و ئەڤرازێ ئاسیایێ (المرتفع الآسیوی) دبت و ئەڤ تێکچوونێن هەوایی ل هەمی بەرۆکێن نەوەکهەڤ، هندەك جاران د مەهێن ژێکۆتیدا ل پلەیێن گەرمێ دیار دبن[٦].

و تێکراێ پلەیێن گەرمێ یێن هەمی ئێستگەهان ژ سەرێ مەها ئاداری پچپچە بلند دبن و دگەهنە (١١,٤٦م°) و د مەها نیسانێدا خوەشتر لێ دئێن دگەهنە (١٥,٤٦م°)، هنگێ هەوا هوونك دبت و رۆژ بێژە هەمی دەمان دەرکەڤتییە و هەر ژ بەر هندێ پلەیا گەرمێ ل داوییا مەها گولانێ نێزیکی یا هاڤینێ دبت و دگەهتە (٢٢,٠٤م°) و ئەگەرێ ڤێ چەندێ بزاڤ و لڤینا رۆژێ یا پێشچاڤە کو د مەها ئادارێدا بەر ب هێلا یەکسانیڤە دچت، ڤێجا بەربەر رۆژ درێژ دبن و شەڤ کورت دبن و گەرم بلند دبت هەر وەکی ژ تێکراییێن پلەیێن گەرمێ دیار ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ.

و دیار دبت کو بلندترین تێکراییێن گەرمێ ل دەڤەرا باتێلێ کۆم دبن، و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ئەوە کو دەڤەرا ژێکۆتی دەشتە و چیا لێ وەرهاتینە، وێ ژ کارلێکرنا بارستێن هەوایی یێن سار، ئەوێن بهاران قەستا دەڤەرێن دەشتی دکن دپارێزن، دیسا کارلێکرنا هۆکارێ بلندییا ئەردی (عامل الارتفاع التضاریسی) ل پشت توومارکرنا کێمترین تێکراییێن گەرمێیە ل وێ دەڤەرا بلند ئەوا ئێستگەها ئامێدییێ لێ. هەر وەسا د مەهێن پاییزێدە لڤین و بزاڤا رۆژێ بەردەوام بەر ب خولگەیێ کارکێڤە (مدار الجدی) دچت، ڤێجا تێکراییێن پلەیێن گەرمێ بەربەر دادکەڤن و نزم دبن هەر ژ مەها تەباخێ و ئەڤ نزمبوونە د مەهێن پاییزێدە گەلەك ئاشکەرایە، تێکرایێ داکەڤتن و نزمبوونێ ل هەمی ئێستگەهان د ناڤبەرا مەها ئیلۆن و چڕیا دوویدا (١٤,٩٣م°)یە، و ئەگەرێ داکەڤتنا پلەیێن گەرمێ د ڤان مەهاندە، بچووکاتییا گۆشەیا

گەهشتنا تیرۆژكا رۆژێ و كورتییا دەمێ رۆژێ (قصر طول النهار) ب خوەیە، زێدەباری كارلێكرنا زێدەبوونا هەژمارا رۆژێن عەور ژ بەر چالاكییا نشیڤێن هەوایی (المنخفضات الجوية)، و بلندترین تێكراییێن پلەیێن گەرمێ ل ئێستگەها باتێلێ د مەها چریبا دوویدا دگەهتە (١٦,١م°)، لێ ئێستگەها ئامێدییێ، تێكراییێن پلەیێن گەرمێ یێن كێمتر توومار دكەت، كو دگەهتە (٩,٢م°) و ئەڤە ژی كارلێكرنا بلنداهییێن ئەردییە و رۆلێ وانە د سڤككرنا كارلێكرنا پلەیێن گەرمێدا.

## وەرزێ زڤستانێ:

ئێك ژ سالۆخەتێن ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆكێ ئەوە كو هەرچار وەرز تێدا بەرچاڤن، بەلێ درێژاهییا وان ژ دەڤەرەكێ بۆ ئێكا دی جودایە، زڤستان و هاڤین تێدا درێژن بەرانبەری وەرزێن بهار و پاییزێ ئەوێن هندی ئەم بەر ب دەڤەرێن ژووریێ پارێزگەهێ دچن ئاشكەراتر دبن و ئەڤ سالۆخەتە بۆ جهێ فرێتێ (الموقع الإحداثي) و جوداهییا بلندییا دەڤەرێ ژ ئاستێ دەریایێ ڤەدگەرێت. د ڤی وەرزیدا پلەیێن گەرمێ دگەهنە نزمترین ئاست ژ بەر ڤارێببوونا نیكەتیڤا تیرۆژكێ وەك ئەنجام بۆ بزاڤ و لڤینا رۆژێ بەر ب خولگەیێ كاركێڤە (مدار الجدي)، و تێكراییێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزن د وەرزێ زڤستانێدا مەهـ بۆ مەهـ جودانە، و تێكرایێ وەرزییێ پلەیێن گەرمێ یێ مەزن دگەهتە (١٠,٦٧م°) و ئەڤ تێكرایە د ناڤبەرا (١٥,٩م°) ل ئێستگەها باتێلێ و (٥,٠٩م°) دەیە ل ئێستگەها ئامێدییێ.

## وەرزێ هاڤینێ:

د هەر سێ مەهێن هاڤینێدا و ژ بەر خوەجهییا هەوایی و كەڤتنا ئاڤ و هەوایێ پارێزگەهێ د بن بارێ كارلێكەرێن هەوایێ خولگەییێ گەرم و درێژاهییا رۆژێ سەرباری داكەڤتنا تیرۆژكا رۆژێ یا ستوونی و نەبوونا عەوران و هشكاتییا هەوایی و ئاخێ تێكراییێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزن ل هەمی ئێستگەهان گەلەك بلند دبن. و تێكرایێ هەیڤانە و وەرزییێ پلەیا گەرمێ یا مەزن د مەهێن هاڤینێدا بلندە و نێزیكی ئێكە ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەهێ، و جودایە ژ وەرزێ زڤستانێ، چونكو هند جودایی د تێكرایێ پلەیێن گەرمێ یێن مەزندا نینە د ناڤبەرا ئێستگەهێن پارێزگەهێدا.

ئەڤ وەرزە ژ مەها خزیرانێ دەست پێ دكەت و دوماهییا مەها تەباخێ كوتا دبت، و دبت هندەك جاران ئەڤ وەرزە درێژ ببت، گاڤا هەتا دوماهییا مەها چریبا ئێكێ تووماركرنا پلەیێن گەرمێ یێن مەزن بەردەوام دبن. بلندترین تێكراییێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزن ل وەرزێ هاڤینێ ل پشك و پارچەیێن ژووریێ رۆژئاڤایا پارێزگەهێ دئێنە تووماركرن كو ئێستگەهێن زاخۆ، باتێل، سێمێل دگرت، ئەوێن ئەڤ پلەیە لێ هاتینە تووماركرن: (٤٠,٢٤م° ، ٤٢,٩٦م° ، ٤٠,٤م°). و پلەیێن گەرمێ یێن مەزن د وەرزێ هاڤینێدا بەربەر بلند دبن، تێكراییێن وان یێن رۆژانە ل ئێستگەها ئامێدییێ و د مەها خزیرانێدا ژ (٣٠م°) كێمتر نینن، و دگەهنە ئاستەكی گەلەك بلند (٤٤,٣م°) د مەها تیرمەهێدا ل ئێستگەها باتێلێ. بلندترین تێكراییێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزن د مەها تیرمەهێدا ل هەمی ئێستگەهان دئێنە تووماركرن، ژ بلی ئێستگەها زاویتە و ئامێدییێ و ئەتریش، كو بلندترین تێكرایێ پلەیێن گەرمێ یێن مەزن د مەها تەباخێدا هاتینە تووماركرن. نزمترین تێكراییێن وەرزییێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزنێن وەرزێ هاڤینێ، ل ئێستگەها ئامێدییێ (٣٣,٣٦م°) هاتییە تووماركرن، چونكو بلندترین ئێستگەهە د سەر ئاستێ دەریایێ‌ڕە.

## وەرزێ بهارێ:

وەرزێ بهارێ مینا پرەكێیە د ناڤبەرا سەرمایا زڤستانێ و گەرما هاڤینێدا، و ئێك ژ سالۆخەتێن بهارێ ئەوە كو پلەیێن گەرمێ تێدا ناڤنجینە و گەرم د ناڤبەرا داكەڤتن و بلندبوونێدایە د هەردو وەرزێن زڤستان و هاڤینێدا ژ بەر كێشڤەكێشا (صراع) مەلبەندێن پەستانێ یێن جودا (مراكز الضغط

المختلفة) ل سەر هەرێمێ و ژ وان ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ، و ب سەردەهاتنا بەردەواما زالبوونا پێلێن هەوایی و بەرۆکێن گەرم و سار[7].

و د گەل هاتنا مەها ئاداری، تێکڕاییێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزن بەربەر بلند دبن، و د مەها نیسان و گولانێدا و ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەهێ بەردەوام دبن د بلندبوونێدا، ژ خشتەیێ (٤) دیار دبت کو پلەیێن گەرمێ یێن مەزن د وەرزێ بهارێدا، ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ ب ئاشکەرایی زێدە دبن و د گەل پەیدابوونا هندەك جوداهییان د تێکڕاییێن واندە. تێکڕایێ زێدەبوونا پلەیێن گەرمێ یێن مەزن بێ ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ د ناڤبەرا مەها ئاداری و گولانێدا گەهشتە (١٢,٣٧م°).

هەروەسا ئەم دبین نکو تێکڕایێ گشتی یێ پلەیێن گەرمێ یێ مەزن ل ئێستگەهێن پارێزگەهێ د وەرزێ بهارێدا (٢١,٨٧م°) و بلندترین تێکڕایێ وەرزی یێ پلەیا گەرمێ یا مەزن، ئێستگەها باتێلێ توومارکر (٢٧,٦٨م°)، بەلێ کێمترین تێکڕا ژی ل ئێستگەها ئامێدییێ هاتیە توومارکرن (١٦,٠٦م°).

## وەرزێ پاییزێ:

د وەرزێ پاییزێدە دیار دبت کو تێکڕایێ پلەیا گەرمێ یا مەزن بلندترە ژ تێکڕایێ گەرمێ یێ مەزن ل وەرزێ بهارێ ژ بلی ئێستگەها باتێلێ، ئاشکەرابوو کو تێکڕایێ گشتی یێ پلەیا گەرمێ یا مەزن د وەرزێ پاییزێدە (٢٦,٦٣م°) وەك تێکڕایەکی گشتی بۆ هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ. هەر وەسا ئێستگەها باتێلێ بلندترین تێکڕایێ پلەیا گەرمێ یا مەزن د وەرزێ پاییزێدە و د مەها ئیلۆنێدا توومارکر (٣٩,٣م°). هەر وەسا ئێستگەها ئامێدییێ کێمترین تێکڕاییێن پلەیا گەرمێ یا مەزن د هەر سێ مەهێن وەرزێ پاییزێدە توومارکر (٢٩,٨م°) و (٢٢,٩م°) و

**خشتەیێ (٤)**

**تێکڕاییێن هەیڤانە و وەرزی و سالانەیێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزن ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ ژ (٢٠٠١-٢٠١١)ێ**

| ئێستگەهـ | ک١ | ک٢ | سوبات | تێکڕایێ وەرزێ زڤستانێ | ئادار | نیسان | گولان | تێکڕایێ وەرزێ بهارێ | حزیران | تیرمەهـ | تەباخ | تێکڕایێ وەرزێ هاڤینێ | ئیلون | ت١ | ت٢ | تێکڕایێ وەرزێ پاییزێ | تێکڕایێ سالانە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ١٤,٦ | ١٢,٦ | ١٣,٩ | ١٣,٧ | ١٩,٤ | ٢٠,٦ | ٣٠,٧ | ٢٣,٥ | ٣٨,٠ | ٤١,٦ | ٤١,١ | ٤٠,٢٤ | ٣٦,٣ | ٢٨,٩ | ٢٠,٥ | ٢٨,٥٦ | ٢٦,٥ |
| باتێل | ١٧,١ | ١٤,٣ | ١٦,٣ | ١٥,٩ | ٢٢,٠ | ٢٦,٦ | ٣٤,٤ | ٢٧,٦ | ٤١,٣ | ٤٤,٣ | ٤٣,٣ | ٤٢,٩٦ | ٣٩,٣ | ٣٢,٩ | ٢٤,٤ | ٣٢,٢ | ٢٩,٦ |
| سێمێل | ١٠,٧ | ١١,٣ | ١٣,٦ | ١١,٨ | ١٨,٣ | ٢٤,٢ | ٣١,٣ | ٢٤,٦ | ٣٨,١ | ٤١,٦ | ٤١,٥ | ٤٠,٤ | ٣٦,٥ | ٢٩,٩ | ١٩,٦ | ٢٨,٦٦ | ٢٦,٣ |
| دهۆك | ١٤,٢ | ١١,٥ | ١٣,٦ | ١٣,١ | ١٨,٥ | ٢٢,٦ | ٣٠,١ | ٢٣,٧ | ٣٧,٤ | ٤١,٥ | ٤٠,٣ | ٣٩,٧٣ | ٣٥,٣ | ٢٨,٩ | ١٩,٦ | ٢٧,٩٣ | ٢٦,١ |
| زاویتە | ١٠,٣ | ٨,٠ | ٩,١ | ٩,١٣ | ١٤,١ | ١٨,٦ | ٢٦,١ | ١٩,٦ | ٣٣,٨ | ٣٧,٣ | ٣٨,١ | ٣٦,٤ | ٣٢,٩ | ٢٥,٥ | ١٥,٢ | ٢٤,٥٣ | ٢٢,٤ |
| سەرسنگ | ٧,٧ | ٥,٣ | ٧,١ | ٦,٧ | ١٣,٢ | ١٧,٦ | ٢٥,٥ | ١٨,٧ | ٣٢,٨ | ٣٧,٥ | ٣٧,٤ | ٣٥,٩ | ٣١,٢ | ٢٥,٣ | ١٣,٥ | ٢٣,٣٣ | ٢١,١ |
| ئامێدی | ٦,٠٨ | ٣,٩ | ٥,٣ | ٥,٠٩ | ٩,٩ | ١٥,٦ | ٢٢,٧ | ١٦,٠ | ٣٠,٣ | ٣٤,٥ | ٣٥,٣ | ٣٣,٣٦ | ٢٩,٨ | ٢٢,٩ | ١٢,٧ | ٢١,٨ | ١٩,٠ |
| ئاکرێ | ١٠,٦ | ٩,٤ | ١٠,٨ | ١٠,٢ | ١٧,٤ | ٢١,٠ | ٢٩,٩ | ٢٢,٧ | ٣٦,١ | ٤٠,٣ | ٣٩,٧ | ٣٨,٧ | ٣٥,١ | ٢٧,٢ | ١٧,٥ | ٢٦,٦ | ٢٤,٥ |
| ئەترۆش | ١١,٣ | ٧,٣ | ٩,٠ | ٩,٢١ | ١٢,٤ | ١٧,١ | ٢٧,٥ | ١٩ | ٣٥,٣ | ٣٨,٦ | ٤٠,١ | ٣٨,٠٢ | ٣٥,٣ | ٢٧,١ | ١٥,٧ | ٢٦,٠٥ | ٢٣,٠ |
| بەردەرەش | ١٢,٧ | ١٠,٣ | ١٢,٤ | ١١,٨ | ١٧,٨ | ٢٢,٦ | ٢٨,٥ | ٢٢,١ | ٣٦,٣ | ٤٠,٨ | ٤٠,٠ | ٣٩,٠٤ | ٣٤,٣ | ٢٧,٧ | ١٨,١ | ٢٦,٧ | ٢٥,١ |
| تێکڕا | ١١,٥ | ٩,٣٩ | ١١,١ | ١٠,٦ | ١٦,٣ | ٢٠,٦ | ٢٨,٦ | ٢١,٨ | ٣٥,٩ | ٣٩,٨ | ٣٩,٦ | ٣٨,٤٧ | ٣٤,٦ | ٢٧,٦ | ١٧,٦ | ٢٦,٦٣ | ٢٤,٤ |

ژێدەر: ڕێڤەبەریا کەشناسی و بیڤەلەرزان، ل پارێزگەها دهۆکێ، پێزانینێن بەلاڤنەکری

(١٢,٧م°) د مەهێن ئیلۆنێ و چریا ئێکێ و چریا دوویدا و ل دووڤ ئێك.

مەها ژ هەمییان بلندتر پلەیا گەرمێ یا مەزن ل ئێستگەهێن پارێزگەهێ توومارکری، مەها ئیلۆنێیە (٣٤,٦م°) پشتی وێ چریا ئێکێ (٢٧,٦٣م°) پاشێ چریا دووێ (١٧,٦٨م°) کو پلەیێن گەرمێ دەست ب نزمبوون و داکەڤتنێ دکن د هەردو مەهێن پاشیدە.

و ژ بەر هندێ دیار دبت کو هۆکارێ بلندی و نزمیا ئەردی و هۆکارێن جهێ جوگرافی و لڤینا هورەبایان ل پارێزگەها دهۆکێ رۆلەکی مەزن هەیە د بەلاڤکرنا تێکراییێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزندا، و وەرزێ هاڤینێ ژ هەمی وەرزان پتر پلەیا گەرمێ یا مەزن لێ هاتییە توومارکرن و ل سەر ئاستێ هەمی ئێستگەهان، وەرزێ پاییزێ پشتی هنگێ دئێت، پاشێ وەرزێ بهارێ، لێ وەرزێ زڤستانێ کێمترین تێکراییێن وەرزی یێن پلەیێن گەرمێ یێن مەزن توومارکرینە.

## تێکراییێن سالانەیێن پلەیێن گەرمێ یێن بچووك ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ:

پلەیێن گەرمێ یێن بچووك رەوشا گەرما دەمژمێرێن شەڤێ دیار دکەت و کێمترین پلەیێن گەرمێ یێن رۆژانە د ناڤبەرا داوی بەردان و ئێکەمین وەرگرتنا گەرمێ ژ بەرێ ئەردیڤە توومار دکەت، کو نزمترین پلەیا گەرمێیە، ئێستگەهێن ئاڤ و هەوایی ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ د رۆژێدا توومار دکەن.

وەك دئێتە دیتن، نزمترین تێکراییێن پلەیێن گەرمێ یێن بچووك ل دەڤەرا چیایی ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە توومارکرن، ل دەڤەرێن زاویتە، سەرسنگ و ئامێدیێ نە، ئێستگەهێن وان ئەڤ تێکرایە توومارکرینە: (٩,٢٠ م°٣، ١١,٤٣ م°٥، ١٢,٢٩ م°٥)، و بۆ زانین ژی، ئەڤ دەڤەرە د وەرزێ زڤستانێدا بەفرگرتی

نەخشەیێ (٤)

هێلێن تێکراییێن گەرمێ یێن مەزن ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ




ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەرییە ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٤)

دبن، نەمازە د مەها کانوونا دوویدا.

هەر چەندە ئێستگەها ئامێدیێ گەلەك ژ یا زاویتە بلندترە، لێ د گەل هندێ ژی، ئێستگەها زاویتە نزمترین تێکراپێن پلەیا گەرمێ یا بچووك ب خوەڤە دبینت و ئەڤە ژی بۆ هندەك هۆکارێن خۆجهی ڤەدگەڕت کو دبنە ئەگەر تێکراپێن بلندێن پلەیێن گەرمێ یێن نزم لێ نەئێنە توومارکرن وەکی رووبەرێ شینکاتی ئەوێ ل بەر ڤێ دەڤەرێ کو وێ وەکی نشیڤەکێ لێ دکەن، هندەك زنجیرە چیایێن بلندێن بەفرگرتی ژ چەند جهەکان لێ وەرهاتینە[٨].

## وەرزێ زڤستانێ:

جهێ جوگرافییێ پارێزگەهێ ل پشك و پارچەیا ژووریێ رۆژئاڤایا هەرێما کوردستانێ کارەکی مەزن ل داکەڤتن و نزمبوونا تێکراپێ پلەیا گەرمێ یا بچووك د وەرزێ زڤستانێدا دکەت، هەتا وێ رادەیێ کو تێکراپێ پلەیا گەرمێ یا بچووك ل هەمی ئێستگەهان دگەهتە (٢,٧٥م°) ئەڤە ژی ژ بەر کارلێکرنا بارستێ جەمسەرێ کیشوەرییێ سار ئەوێ دبتە ئەگەرێ داکەڤتنا تێکراپێن پلەیێن گەرمێ. سەرباری کارلێکەرێن روویێ ئەردی ئەوێن کار ل نزمبوونا تێکراپێ پلەیێن گەرمێ یێن بچووك ل پارێزگەهێ دکەت. ئێستگەها سەرسنگ نزمترین پلەیێن گەرمێ یێن بچووك د ڤی وەرزیدا توومارکرن کو گەهشتە (٠,٣٥م°) ل دەڤەرێن چیایی یێن بلند، لێ ئێستگەها زاخۆ بلندترین تێکراپێن پلەیێن گەرمێ یێن بچووك توومارکرن کو گەهشتە (٤,٣٣م°) و ئەڤە ژ بەر بلندییا وێ ژ ئاستێ دەریایێ، لێ هەر وەك تێکراپێن وەرزی ل ڤان ئێستگەهان د سەر پلەیا (سفر)رانە ژ سەدێ، لێ د گەل هندێ ژی د ڤی وەرزیدا، نەمازە د مەهێن کانوونا دووێ و سوباتێدا، ل ئێستگەهێن سەرسنگ و ئامێدییێ، دادکەڤتە د بن (سفر)ێدا ژی، برێنە خشتەیێ (٥).

و ئەگەرێ ڤێ داکەڤتن و نزمبوونا پلەیا گەرمێ یا بچووك ل ڤان ئێستگەهان، بچووکاتییا گۆشەیا داکەڤتنا تیرۆژکا رۆژێیە (سقوط الأشعاع الشمسی) و کورتییا دەمژمێرێن رۆژێ و زێدەبوونا هەژمارا رۆژێن عەور، و تێکراپێن پلەیێن گەرمێ یێن بچووك د وەرزێ زڤستانێدا ل هەمی ئێستگەهان ژ هەڤ جودا و نەوەکهەڤن، و ئەڤە ژی بۆ جوداهییا رێژەیا دوبارەبوونا بارستا هەوایێ جەمسەرێ کیشوەری یێ سار ڤەدگەڕت، ئەوێ د سەر پارێزگەهێرا دەرباز دبت، زێدەباری کارلێکرنا هۆکارێن خومالی ل دەڤەرێ.

## وەرزێ بهارێ:

تیرۆژکا رۆژێ ل دەستپێکا نیڤا دووێ ژ مەها ئاذارێ (٣/٢١) دبتە ستوونکی ل سەر هێلا یەکسانییێ (خط الاستواء) تێکراپێن گەرمێ یێن بچووك ب ئاوایەکی گشتی بەربەر بلند دبن، ل هەمی ئێستگەهان جودایی دکەڤتە تێکراپێن پلەیا گەرمێ یا بچووك و ب ئاوایەکی سڤك، د ناڤبەرا (٨,٢٥م°) ل ئێستگەها زاویتە کو ژ دەڤەرێن چیایی دئێتە هژمارتن و (١٢,٨٦م°) ل ئێستگەها سەنتەرێ بازێرێ دهۆکێ، دیار دبت کو جودایی د ناڤبەرا تێکراپێن پلەیێن گەرمێ یێن بچووك ل هەمی مەهێن بهارێ ل دەڤەرێن چیایی پیچەکە، ئەگەر ب دەڤەرێن ئێستگەهێن دی بێنە هەمبەرکرن، پێدڤی گۆتنییە کو تێکراپێن گەرمێ یێن بچووك د مەهێن بهارێدا ژ نشکەکێڤە بلند دبن، د مەها ئاذارێدا (٣,٣١م°) زێدەتر ژ مەها سوباتێ بلند دبت، هەر وەسا زێدەیی ب هندەك تێکراپێن مەزنترە د مەهێن نیسان و گولانێدا.

## وەرزێ هاڤینێ:

نزمترین تێکراپێن گەرمێ یێن بچووك د وەرزێ هاڤینێدا ل دەڤەرێن چیایی هاتنە توومارکرن و گەهشتە (١٨,٢٣م°) ل ئێستگەها زاویتە و (٢٤,١٦م°) ل ئێستگەها ئاکرێ، تێکرا ژ ژێریێ ئێستگەهێن پارێزگەهێ کێمتر لێ دئێت هندی ئەم بەر ب ژووریێ وان بچن، ئێستگەها بەردەرەش بلندترین تێکراپێ وەرزی توومارکر چونکو دکەڤتە ژێریێ پارێزگەهێ کو گەهشتە (٢٨م°) و ئەڤە ژ بەر کارلێکەرێن جهێ جوگرافی و هۆکارێن خومالی و بلندبوونا پلەیا گەرما بارستا هەوایی ئەوا ژ چیایێن

**خشتەیێ (٥)**

**تێكراییێن هەیڤانە و وەرزی و سالانەییێن پلەیێن گەرمێ یێن بچووك ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆك ژ (٢٠٠١-٢٠١١)ێ**

| ئێستگەهـ مەهـ | زاخۆ | باتیل | سێمێل | دهۆک | زاویتە | سەرسنگ | ئامێدی | ئاکری | ئەترووش | بەردەرەش | تێکرایێ ئێستگەهان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ك ١ | ٤,٨ | ٣,٤ | ٢,١ | ٥,٢ | ٠,١٩ | ١,٦ | ١,٥ | ٤,٣ | ٣,٢ | ٦,٣ | ٣,٢٥ |
| ك ٢ | ٣,٤ | ٢,٩ | ٢,٥ | ٣,٢ | ٠,٣ | -٠,٦ | -٠,٣ | ١,٩ | ٢,٩ | ١,٩ | ١,٨١ |
| سویات | ٤,٨ | ٤,٤ | ٣,٦ | ٤,٩ | ١,٠٤ | ٠,٠٦ | -٠,٢٣ | ٣,٤ | ٣,٠٢ | ٣,٥ | ٣,١٩ |
| تێکرایێ وەرزێ زڤستانێ | ٤,٣٣ | ٣,٥٦ | ٢,٧٣ | ٤,٤٣ | ٠,٥١ | ٠,٣٥ | ٠,٦ | ٣,٢ | ٣,٠٤ | ٣,٩ | ٢,٧٥ |
| ئادار | ٨,٥ | ٧,٥ | ٥,٨ | ٨,٥ | ٤,٣ | ٤,٦ | ٣,٥ | ٧,٥ | ٦,٨ | ٨,٠ | ٦,٥ |
| نیسان | ١٢,٥ | ١١,٠٧ | ٩,٠٢ | ١٢,٧ | ٨,٠٦ | ٨,٣ | ٨,٢ | ١١,٥ | ٩,٤ | ١١,٣ | ١٠,٢٠ |
| گولان | ١٧,٠٥ | ١٥,٢ | ١٣,٩ | ١٧,٤ | ١٢,٤ | ١٤,٢ | ١٣,٥ | ١٧,٢ | ١٥,٣ | ١٨,٣ | ١٥,٤٤ |
| تێکرایێ وەرزێ بهارێ | ١٢,٦٨ | ١١,٢٥ | ٩,٥٧ | ١٢,٨٦ | ٨,٢٥ | ٩,٠٣ | ٨,٤ | ١٢,٠٦ | ١٠,٥ | ١٢,٥٣ | ١٠,٧١ |
| خزیران | ٢٢,٩ | ١٨,٩ | ١٨,٢ | ٣٣,٠٩ | ١٦,٣ | ١٩,٩ | ٢٠,٥ | ٢٢,٨ | ٢٢,٤ | ٢٥,٨ | ٢١,٠٧ |
| تیرمەهـ | ٢٦,٨ | ٢١,٩ | ٢١,٤ | ٣٦,٥ | ١٩,٣ | ٢٤,٠٩ | ٢٤,٢ | ٢٥,١ | ٢٥,٣ | ٢٨,٦ | ٢٤,٣١ |
| تەباخ | ٢٦,٤ | ٢٢,٠٣ | ٢١,٦ | ٢٦,٢ | ١٩,٤ | ٢٤,١ | ٢٤,٢ | ٢٤,٦ | ٢٥,٦ | ٢٩,٦ | ٢٤,٣٧ |
| تێکرایێ وەرزێ هاڤینێ | ٢٥,٣٦ | ٢٠,٩٤ | ٢٠,٤ | ٢٥,٢٦ | ١٨,٣٣ | ٢٢,٦٩ | ٢٢,٩٦ | ٢٤,١٦ | ٢٤,٤٣ | ٢٨,٠ | ٢٣,٢٥ |
| ئیلۆن | ٢١,٦ | ١٨,٨ | ١٦,٨ | ٢١,٧ | ١٤,٨ | ٢٠,٠١ | ١٩,٨ | ٢١,٣ | ٢٠,٤ | ٢٥,٦ | ٢٠,٠٨ |
| چ ١ | ١٦,٤ | ١٤,٠٥ | ١٣,٥ | ١٦,٧ | ١٠,٩ | ١٥,٢ | ١٤,٣ | ١٦,٣ | ١٤,١ | ١٨,٧ | ١٥,٠١ |
| چ ٢ | ٨,٨ | ٧,٩ | ٦,٦ | ٩,٦ | ٣,٥ | ٥,٨ | ٥,٨ | ٨,١ | ٦,٦ | ٨,٧ | ٧,١٤ |
| تێکرایێ وەرزێ پاییزێ | ١٥,٦ | ١٣,٥٨ | ١٢,٣ | ١٦ | ٩,٧٣ | ١٣,٦٧ | ١٣,٣ | ١٥,٢٣ | ١٣,٧ | ١٧,٦٦ | ١٤,٠٧ |
| تێکرایێ سالانە | ١٤,٤٩ | ١٢,٣٣ | ١١,٢٥ | ١٤,٦٤ | ٩,٢٠ | ١١,٤٣ | ١٢,٢٩ | ١٣,٦٦ | ١٢,٩١ | ١٥,٥٢ | ١٢,٧٧ |

ژێدەر: رێڤەبەریا كەشناسی و بیڤەلەرزان، ل پارێزگەها دهۆكێ، پێزانینێن بەلاڤنەكری

## نەخشەیێ هژمار (٥)

## تێکراپێن گەرمێ یێن بچووک یێن وەرزێ زڤستانێ ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ


ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەرییە ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٥)

## نەخشەیێ هژمار (٦)

## هێلێن یەکسانییێ یێن تێکراپێن گەرمێ یێن بچووک ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ د وەرزێ بهارێدا.


ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەرییە ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٥)

دۆرماندۆر دادکەڤت، کو کار ل بلندکرنا تێکڕایێن پلەیا گەرمێ یێن بچووك دکەت هەتا دگەهتە نزمترین پلە ل ئێستگەها زاویتە، ئەو ژی ژ بەر کارلێکەرێن بلندی و نزمییا ئەردییە، و بلندترین تێکڕایێن پلەیا گەرمێ یێن بچووك ل وەرزێ هاڤینێ و ل مەها تەباخێ توومار دکەت کو دگەهتە (٢٤,٣٧م°) و ل پرانییا ئێستگەهێن پارێزگەهێ.

## وەرزێ پاییزێ:

وەرزێ پاییزێ تێکڕایێن گەرمێ ل دەڤەرێن بلند نزم دبن، ئێستگەها زاویتە (٩,٧٣م°) توومارکر و ئێستگەها ئاکرێ (١٥,٢٣م°) توومارکر و هۆکارێ بلندی و نزمییا ئەردی ل پشت ڤێ چەندێیە. بلندترین تێکڕایێ پلەیا گەرمێ یا بچووك ل وەرزێ پاییزێ ل ئێستگەها بەردەڕەش ل ژێریێ پارێزگەهێ هاتە توومارکرن (١٧,٦٦م°)، هندی دەڤەرێن رۆژهەلاتینە، ئێستگەها ئاکرێ (١٥,٢٣م°) توومارکر و ل دەڤەرێن رۆژئاڤا ئێستگەها زاخۆ (١٥,٦م°) توومارکر، و ل دەڤەرێن ژ ناڤدا ژی ئێستگەها زاویتە (٩,٧٣م°) و ئێستگەها سەنتەرێ باژێرێ دهـۆك (١٦م°) توومارکر.

و ئەڤ ڤێکنەکەڤتنا د تێکڕایێن پلەیێن گەرمێ یێن بچووکدا بەرچاڤ ل وەرزێ پاییزێ ژ ژێری بۆ ژووری و ژ رۆژئاڤا بۆ رۆژهەلات ژ بەر وان کارلێکەرێن بلندی و نزمییا ئەردینە ئەوێن پێشتر هاتینە رۆنکرن.

## پەستانا هەوایی:

پەستانا هەوایی ئێك ژ توخمێن ئاڤ و هەوایی یێن گرنگ و کارلێکەرە، نەمازە د لڤین و بزاڤ و سەمت و لەزا هورِ و بایاندا و ب رۆلێ رێکوپێککەرێ زەبتکرنا لڤینا (الضوابط الحركية) ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆکێ رادبت، هەر وەسا رەوشا ئاڤ و هەوایی ددەتە هەر جهەکی دی ل جیهانێ[٩].

**نەخشەیێ هژمار (٧)**

**هێلێن یەکسانییێ یێن تێکڕایێن گەرمێ یێن بچووك ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ ل وەرزێ هاڤینێ.**




ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەری ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٥)

**نەخشەیێ هژمار (٨)**
**هێلێن یەکسانییێ یێن تێکراییێن گەرمێ یێن بچووك ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆك ل وەرزێ پاییزێ**



ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەری ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٥)

هەر وەسا ب پلەیێن گەرمێ و بلنداهییێ ژ روویێ دەریایێ و بەلاڤییا ئاڤ و بەژێ و جهێ ل دووڤ بازنەیێن پانییێ کار ل پەستانا هەوایی دئێتە کرن.

هەر وەسا جوداهییێن پەستانا هەوایی کار ل لەز و سەمتا هور و بایان و بەلاڤکرنا بارانان دکەن، و ب ئاوایەکێ گشتی، ل پشکا ژێریێ رۆژئاڤایا کیشوەرا ئاسیا، چوار بنگەهـ و سەنتەرێن پەستانا سڤك ل هنداڤێ دەریایا ناڤین و دەریایا رەش و دەریایا قەزوین و کەنداڤێ عەرەبی جهگیر دبن، هەر وەسا و د هەمان دەمیدا، سێ بنگەهێن پەستانا بلند ل هنداڤی بانییا ئەنەدۆلێ و بانییا ئیرانێ و نیڤگزیرتەیا عەرەبی سەردەست دبن، و ل دووڤ ڤێ چەندێ عیراق دکەڤتە د چارچۆڤێ دەڤەرا گەهشتنا نزمدا[١٠].

پارێزگەها دهۆکێ ب سیستەمێن پەستانا هەوایێ دەریایا ناڤین داخبار دبت، وەك بنگەهێن پەستانا بلندا ئازۆری و سیبیری، هەر وەسا داکەتۆکێن (منخفضات) دەریایا ناڤین و داکەتۆکێ ئەتلەسی ب ئاوایەکی ئێکسەر و نەئێکسەر کار لێ دکەت، لێ کارلێکەرێ ئاشکەرا ب ئاوایەکی مەزن د پەیدابوونا جوداهییێن پەستانێ د ناڤبەرا دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێدا، بلنداهییا جودایە ژ ئاستێ دەریایێ. پەستانا هەوایی ب گوهۆرینا وەرزێن سالێ دئێتە گوهۆرین. زڤستانێ زێدە دبت و هاڤینێ کێم دبت، و بهایێن پەستانا هەوایی (قیم الضغط الجوی) د ناڤبەرا ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێدا ل دووڤ جهـ و وەختی ژێك جودا دبن، و ب دیتنا خشتەیێ (٦) یێ پەستانا هەوایی، ئەوێ تێکراییێن سالانە و هەیڤانەیێن پەستانا هەوایی یێ ئێستگەها زاخۆ و دهۆك ئەوێن تۆمارێن پەستانا هەوایی لێ هەیین و نەتوومارکرنا وان ل ئێستگەهێن دی، ژ ڤان تووماران دیارە کو جوداهییەك د بهایێن پەستانا هەواییدا هەیە د ناڤبەرا هەردو ئێستگەهاندە (زاخۆ و دهۆك)، کو تێکرایێ سالانەیێ پەستانا هەوایی ئەوێ ل ئێستگەها زاخۆ هاتییە توومارکرن (١٠١٠,٩٠ ملی بار)ە، لێ ئەوێ

ل ئێستگەها دهۆك هاتییە توومارکرن (١٠٠٩ ملی بار)ە، و ب هندێ نزمترین و کێمترین بهایێن پەستانا هەوایی کو سالانە هاتینە توومارکرن، و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی هۆکارێ بلنداهییێیە ژ ئاستێ دەریایێ، کو پەستان ب زێدەبوونا وێ بلنداهییێ کێم دبت، ئەڤە سەرباری هندێ کو سرۆشتێ ئێستگەها دهۆکێ یێ بەردایی و ڤەکری ل دەڤەرەکا بلند، کار ل توومارکرنا هندەك بهایێن گەرمێ کرییە و بوویە ئەگەر کو کێمترین ژ یێن ئێستگەها زاخۆ یا دەشتی، ئەڤە ژ بەر کێماتیا (تناقص) ستوونێ هەوایی ل دهۆکێ ل بەر یێ ئێستگەها زاخۆ.

هەر وەسا ل وەرزێ زڤستانێ ئەم دبینن کو تێکرایێ وەرزی یێ بهایێن پەستانا هەوایی ل ئێستگەها دهۆکێ ژ تێکرایێ وەرزییێ ئێستگەها زاخۆ (٠,٥ ملی بار)ێ کێمتر دبت، ئێستگەها زاخۆ (١٠١٩ ملی بار) توومارکرن، لێ ئێستگەها دهۆکێ (١٠١٨ ملی

**خشتەیێ (٦)**

**کرایێن هەیڤانە و وەرزانە یێن بهایێن پەستانا هەوایی (ملی بار) یێن ئێستگەها زاخۆ و دهۆك ل پارێزگەها دهۆکێ ژ (٢٠٠١-٢٠١١)ێ**

| ئێستگەهـ / هەیڤ | دەمێن توومارکرنێ | زاخۆ | دهۆك | تێکرا |
|---|---|---|---|---|
| کانوونا پاشی | ٢٠٠١-٢٠١١ | ١٠١٩,٥ | ١٠٢٠,٢ | ١٠١٩,٨ |
| سوبات | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠١٧,١ | ١٠١٦,٦ | ١٠١٦,٨ |
| ئادار | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠١٤,٦ | ١٠١٣,٣ | ١٠١٣,٩ |
| نیسان | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠١١,٣ | ١٠٠٩,٦ | ١٠٠٩,٦ |
| گولان | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠٠٨,١ | ١٠٠٥,٧ | ١٠٠٦,٩ |
| خزیران | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠٠٢,٣ | ٩٩٩,٩ | ١٠٠١,١ |
| تیرمەهـ | ٢٠١١-٢٠٠١ | ٩٩٧,٧ | ٩٩٥,٩ | ٩٩٦,٨ |
| تەباخ | ٢٠١١-٢٠٠١ | ٩٩٩,٨ | ٩٩٧,٥ | ٩٩٨,٦ |
| ئیلۆن | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠٠٥,٩ | ١٠٠٣,٦ | ١٠٠٤,٧ |
| چریا پێشی | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠١٢,٨ | ١٠١٠,٧ | ١٠١١,٧ |
| چریا پاشی | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠١٧,٩ | ١٠١٦,١ | ١٠١٧ |
| کانوونا پێشی | ٢٠١١-٢٠٠١ | ١٠٢٠,٦ | ١٠١٨,٩ | ١٠١٩,٨ |
| تێکرایێ سالانە | - | ١٠١٠,٦ | ١٠٠٩,٠ | ١٠٠٩,٨ |
| تێکرایێ وەرزێ زڤستانێ | - | ١٠١٩,٠ | ١٠١٨,٥ | ١٠١٨,٧ |
| تێکرایێ وەرزێ بهارێ | - | ١٠١١,٣ | ١٠٠٩,٥ | ١٠١٠,٤ |
| تێکرایێ وەرزێ هاڤینێ | - | ٩٩٩,٩ | ٩٩٧,٧ | ٩٩٨,٨ |
| تێکرایێ وەرزێ پاییزێ | - | ١٠١٢,٢ | ١٠١٠,١ | ١٠١١,١ |

**ژێدەر: ڕێڤەبەریا گشتییا کەشناسی و بیڤەلەرزان ل پارێزگەها دهۆکێ، پشکا پێزانینێن ئاڤ و هەوایی، پێزانینێن بەلاڤنەکری.**

بار) توومارکرن، و ئەڤ داکەڤتن و کێمبوونە د بهایێن پەستانا هەوایێدا بۆ بلندبوونا پلەیێن گەرمێ و بلندبوونا رەوایا رێژەیی ل دهۆکێ دزڤرت، کو دەریاچەیا مووسل ژ زاخۆ پتر کار لێ دکەت.

ل وەرزێ هاڤینێ پارێزگەها دهۆکێ دکەڤتە د بن کارلێکرنا دەڤەرا پەستانا گرانا نیڤ خولگەییدە (شبه المداری)، تێکراپێ وەرزی یێ بهایێن پەستانا هەوایی ل ئێستگەها سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ ژ تێکراپێ وەرزی یێ ئێستگەها زاخۆ ب (٢,٢ ملی بار) کێمترە. تێکراپێ وەرزی ل ئێستگەها زاخۆ ل هەمی وەرزێ هاڤینێ (٩٩٩,٥ ملی بار)ە و یێ ئێستگەها دهۆك (٩٩٧,٧ ملی بار)ە، و ئەگەرێ داکەڤتنا بهایێن پەستانا هەوایی د ڤی وەرزیدا ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ ل بەر وەرزێن دی، (کو کێمترین بهایێن وەرزی) توومار دکەت، بۆ بلندبوونا پلەیێن گەرمێ د وەرزێ هاڤینێدا ڤەدگەرت، کو بلندترین تێکراپێن وەرزی توومار دکەت، دیسا هورەبا و داکەتۆکێن ئاڤ و هەوایی هاڤینان نامینن، هەر وەسا ژ بەر جوداییا بلندی و نزمییان (التضاریس) و بهایێن هەلمبوونێ (التبخر).

## وەرزێ بهارێ:

ژ بەر بەربەر بلندبوونا پلەیێن گەرمێ د وەرزێ بهاریدا تێکراپێن پەستانا هەوایی دادکەڤن، ئەڤە ژی ل دووڤ بزاڤ و لڤینا چاڤێ رۆژێ یێ بەرچاڤ بەر ب هێلا یەکسانییێ و بەر ب نیڤا ژووریێ ئەردی، و تێکراپێ وەرزییێ بهایێن پەستانا هەوایی ل سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ ژ تێکراپێ وەرزی یێ ئێستگەها زاخۆ ب (١,٨ ملی بار) کێمتر دبت، ئێستگەها زاخۆ (١٠١١,٣ ملی بار)ان توومار دکەت، لێ ئێستگەها دهۆکێ (١٠٠٩,٥ ملی باران) وەك تێکراپەکی وەرزی توومار دکەت.

## وەرزێ پاییزێ:

تێکراپێن پەستانا هەوایی بەربەر بلند دبن، هەر ژ مەها ئیلۆنێ، ژ بەر هندێ بلندن ل بەر هەیڤێن هاڤینێ، تێکراپێ وەرزییێ بهایێن پەستانا هەوایی ل ئێستگەها باژێرێ دهۆکێ ژ تێکراپێ وەرزی یێ ئێستگەها زاخۆ ب (٢,١ ملی بار)ان کێمتر دبت، تێکراپێ وەرزی یێ پەستانا هەوایی ل ئێستگەها دهۆك (١٠١٠,١ ملی بار)ە و ل ئێستگەها زاخۆ (١٠١٢,٢ ملی بار)ە.

بهایێن پەستانا هەوایی ل وەرزێ بهارێ و پاییزێ ل ئێستگەهێن زاخۆ و دهۆك نزم و داکەڤتینە ل بەر یێن وەرزێ زڤستانێ و بلندن ل بەر یێن وەرزێ هاڤینێ، و ئەڤ جوداهییە بۆ هندێ دزڤرن کو داکەتۆکێن هەوایی ئەوێن وەرزێ بهارێ و پاییزێ دگەهن کێمن ل بەر ئەوێن زڤستانان دگەهن و هاڤینان ئێکجار نینن، زێدەباری داکەڤتن و نزمیا رێژەییا پلەیێن گەرمێ ل ڤان هەردو وەرزێن ڤەگوهێزۆك (الانتقالی) ل بەر وەرزێ هاڤینێ و بلندیا وان یا رێژەیی ل بەر یێن وەرزێ زڤستانێ، و کێماتیا رەوایێ د ناڤ هەواییدا[11]. ئەڤە هەمی ئەگەرن ڤان جوداهییانە. دیسا جوداهییا جهێ جوگرافی د ناڤبەرا ئێستگەها زاخۆدا ئەوا دکەڤتە سەرێ ژووریێ رۆژئاڤا و جهێ ئێستگەها دهۆك ئەوا دکەڤتە دەشتا سێمێلێ، کارلێکرنا خۆ یا ئاشکەرا هەیە ل سەر جوداهییا بهایێن پەستانا هەوایی د هەمی وەرزاندە.

## هور و با (الریاح):

هور و با بزاڤا ئاسۆییا هەوایییە بەربەندی روویێ ئەردی، کو ب کارێ جوداهییا ئاسۆیی د چرییا هەوایی و پەستانا هەواییدا پەیدا دبت، و ب هندێ هور و با ئاسۆیی و ل هنداڤی روویێ ئەردی ژ دەڤەرێن پەستانا بلند بەر ب دەڤەرێن پەستانا نزم دچن.

لەزچوونا بایی و سەمتا وی ب کارێ گەلەك هۆکاران دئێتە گوهۆرین، ل سەرێ هەمییان نشیڤێ پەستانێ (منحدر الضغط) و هێزا ڤێکەڤتنێ د گەل دیاردەیێن روویێ ئەردی، ژ گرتنا لەزچوونا بایی ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ دیاربوو کو تێکراپێ سالانەیێ لەزچوونا بایی (١,٣١ م/چرکە) ب ئاوایەکی گشتی هاتییە توومارکرن، ئێستگەها زاخۆ تێکراپەکی سالانە بۆ لەزچوونا بایی توومارکر

گەهشتە (١,١٦ م/چرکە) و ل باتێلێ (١,٦٣ م/چرکە) و ل سێمێلێ (١,١٦ م/چرکە) و ل دهۆکێ (١,٠٢ م/چرکە) و ل ئاکرێ (١,٦٤ م/چرکە).

هۆسا دیارە کو ئێستگەها ئاکرێ ژ بەر هۆکارێ بلنداهیێ، بلندترین تێکڕایێ سالانە توومارکرییە، چونکو لەزچوونا بایی ب بلنداهیێ زێدە دبت، و ب هندێ دووری بلندی و نزمییێن ڕوویێ ئەردی دبت و ئاستەنگ ناکەڤنە د ڕێکا چوونا ویدا، گاڤا هێزا ڤێکەڤتنێ (قوة الاحتكاك) کێم دبت، بزاڤا هوڕ و بایان پتر لێ دئێت. تێکڕایێن وەرزی یێن لەزچوونا هوڕ و بایان ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ نەوەکی ئێك و ژێك جودانە، هەر وەکی ژ خشتەیێ هژمار (٧) بۆ مە دیار دبت:

## وەرزێ زڤستانێ:

ژ ئێکا لەزچوونا بایێڤە، کێمترین وەرزێ سالاێنیە ژ بەر بلندیا بهایێن پەستانا هەوایی ئەوێن د مەهێن کانوونا پێشی و پاشیدە دگەهنە بلندترین ئاست ژ بەر زالبوونا بلندییێن هەوایی و مەها کانوونا پاشی (كانون الثانی) کێمترین لەزچوون د وەرزێ زڤستانێدا تێدا دئێنە توومارکرن، (١,١٨م/چرکە) هاتینە توومارکرن و ئەڤە ژی بۆ بزاڤا داکەتۆکێن هەوایی زێدەباری درێژبوونا زنجیرە چیایێن هاویردۆری دەڤەرێن ئێستگەهان ئەوێن کار ل لەزچوونا بایان دکەن، دیسا بۆ درێژبوونا کەمەرێن پەستانا بلندا ل هنداڤی بانیا ئەنەدۆلێ ئێوری، کو ب ئاوایەکی ئاشکەرا کار ل داکەڤتنا لەزچوونا بایی دکەت د وەرزێ زڤستانێدا. تێکڕایێ وەرزییێ لەزچوونا بایی د ڤی وەرزیدا یێ هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ گەهشتە (١,١٩ م/چرکە).

## وەرزێ بهارێ:

د وەرزێ بهارێدا، تێکڕایێ وەرزییێ لەزچوونا بایی ل ئێستگەها زاخۆ (١,٣٤ م /چرکە) و ل ئێستگەها باتێلێ (١,٦٣ م/چرکە) و ل سێمێلێ (١,٢٦م/چرکە) و ل ئێستگەها دهۆکێ (١,١٠ م/چرکە)، و ل ئێستگەها ئاکرێ بلندترین تێکڕا هاتنە توومارکرن د ڤی وەرزیدا کو (١,٦٥ م/چرکە)بوو، کو ئیشارەتێ ددتە

**خشتەیێ هژمار (٧)**

**تێکڕایێن وەرزی یێن لەزچوونا هوڕ و بایان ل ویستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ ژ (٢٠٠١-٢٠١١)ێ**

| وەرز | زڤستان | | | | بهار | | | | هاڤین | | | | پاییز | | | | تێکڕایێ سالانە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئێستگەه | ك١ | ك٢ | شوبات | تێکرا | ئادار | نیسان | گولان | تێکرا | حزیران | تیرمەه | تەباخ | تێکرا | ئەیلول | ت١ | ت٢ | تێکرا | |
| زاخۆ | ٠,٨٧ | ٠,٩٧ | ١,١١ | ٠,٩٨ | ١,١٦ | ١,٢٤ | ١,٦٢ | ١,٣٤ | ١,٦٢ | ١,٢٣ | ١,٠٩ | ١,٣١ | ٠,٩٨ | ٠,٩٦ | ٠,٨٧ | ٠,٩٣ | ١,١٤ |
| باتێل | ١,٦٠ | ١,٥٣ | ١,٧١ | ١,٦١ | ١,٧٥ | ١,٥٦ | ١,٥٩ | ١,٦٣ | ١,٥٤ | ١,٤٩ | ١,٥٣ | ١,٥٢ | ١,٥٣ | ٢,٠٣ | ١,٦٩ | ١,٧٥ | ١,٦٢ |
| سێمێل | ٠,٩٧ | ١,٠٧ | ١,٢١ | ١,٠٨ | ١,٢٩ | ١,٢٥ | ١,٢٦ | ١,٢٦ | ١,٣٨ | ١,١٥ | ١,٠٤ | ١,١٩ | ١,١٣ | ١,٢٢ | ١,٠٠ | ١,١١ | ١,١٦ |
| دهۆك | ٠,٩١ | ١,٠٠ | ١,١١ | ١,٠٠ | ١,٠٧ | ١,١٠ | ١,١٥ | ١,١٠ | ١,٠٩ | ١,٠٦ | ١,٠٣ | ١,٠٦ | ٠,٩٦ | ٠,٩٨ | ٠,٨٧ | ٠,٩٣ | ١,٠٢ |
| ئاکرێ | ١,٣١ | ١,٢٥ | ١,٢٧ | ١,٣١ | ١,٢٥ | ١,٥٧ | ٢,١٥ | ١,٦٥ | ٢,٣٧ | ٢,٢ | ١,٧٥ | ٢,١٠ | ١,٥٩ | ١,٧٢ | ١,٢١ | ١,٥٠ | ١,٦٤ |
| تێکرا | ١,١٣ | ١,١٨ | ١,٢٨ | ١,١٩ | ١,٣٠ | ١,٣٤ | ١,٥٥ | ١,٣٩ | ١,٦ | ١,٤٢ | ١,٢٨ | ١,٤٣ | ١,٢٣ | ١,٣٨ | ١,١٢ | ١,٢٤ | |

ژێدەر: ڕێڤەبەریا گشتیا کرتنا ئاڤ و هەوایی و بیڤەلەرزان ل پارێزگەها دهۆکێ، پشکا ئاڤ و هەوایی، سەرژمێرییێن هەیڤانە و سالانە ژ (٢٠٠١ - ٢٠١١)، پێزانینێن بەلاڤنەکری.

**نەخشەیێ هژمار (٩)**
**تێکڕایێ وەرزیێ لەزچوونا بایی م/چرکە یێ زڤستانێ ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ**

ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەری ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٧)

هندێ کو تێکڕایێن وەرزی ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ د وەرزێ بهارێدا، ژ بلی ئێستگەها ئاکرێ، کێمن. کێمبوونا لەزچوونێن هوڕ و بایان ب ئاوایەکی گشتی ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ بۆ هندێ ڤەدگەڕێت کو تالۆڤی (بەرهنگاری) بلنداهییا چیایان دبت و چیا بۆ دبنە ئاستەنگ، لێ د گەل هندێ ژی لەزچوونا ژێگۆتی ئەگەر بێتە هەڤبەرکرن ب وەرزێ زڤستانێ زێدە دبت، ئەو ژی ژ بەر زێدەبوونا داکەتۆکێن هەوایی هەر چەندە بهایێن پەستانا هەوایی نە گەلەك ئاشکەرانە ژی، نشیڤێ پەستانێ (الإنحدار الضغطی) کێمە، لێ مەها گولانێ بلندترین لەزچوونا هەوایی د وەرزێ بهارێدا تێدا دئێتە توومارکرن، لێ بەلێ ب جوداهییەکا کێم، هەر چەندە ئەڤ وەرزە وەرزەکی ڤەگوهێزۆکە ژ بەر تەمامنەبوونا پەستانێن کارلێکەر، و نشیڤێ پەستانا هەوایی هێدی هێدییە بەر ب سەنتەران و نابتە هاریکار بۆ هاتنا هوڕ و بایێن ب هێز، هنگێ نەبت دەمێ ئێستگەهێن پارێزگەهێ بەرهنگاری بۆرینا داکەتۆکێن هەوایی دبن. لێ تێکڕایێ وەرزیێ لەزچوونا بایی د وەرزێ بهارێدا، ل ئێستگەهێن پارێزگەهێ (١,٣٩ م/چرکە) توومارکر.

## وەرزێ هاڤینێ:

هندی وەرزێ هاڤینێیە، تێکڕایێ وەرزیێ لەزچوونێن هوڕوبایێن ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ د ڤی وەرزیدە (١,٤٣م/چرکە) توومارکر، و بلندترین لەزچوونێن بایان د وەرزێ هاڤینێدا ئێستگەها ئاکرێ توومارکر، و بلندترین لەزچوونێن بایان د وەرزێ هاڤینێدا ئێستگەها ئاکرێ توومارکر، گەهشتە (٢,١ م /چرکە) ژ بەر دژوارییا نشیڤێ پەستانێ. مەها خزیرانێ ل پەیسکا ئێکێ دئێت ل ناڤ هەمی مەهێن سالێدا و ل هەمی ئێستگەهان د لەزچوونێن بایاندە، ئێستگەها زاخۆ (١,٦٢ م/چرکە) و ئێستگەها باتیلێ

**نەخشەیێ هژمار (١٠)**
**تێکراییێ وەرزییێ لەزچوونا بایان (م/چرکە) د بهارێدا و ل هەمی ئێستگەیێن پارێزگەها دهۆکێ**




ژێدەر: ژ چێکرنا ڤەکۆلەری ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٧)

(١,٥٤ م/چرکە) و یا سێمێلێ (١,٣٨ م/چرکە) و یا دهۆك (١,٠٩ م/چرکە) و یا ئاکرێ (٢,٣٧ م/چرکە) تووماركر.

هێژایی گۆتنێیە کو تووماره‌نەکرنا لەزچوونەکا هور و بایان یا بلند ژ بەرێ ئێستگەهێن پارێزگەهێڤە، بۆ وێ سرۆشتێ تۆپۆگرافییێ دەڤەرێ دزڤرت، ئەوێ هێزا ڤێککەڤتنێ زێدە دکەت و لەزچوونا بایان کێم دکەت.

## وەرزێ پاییزێ:

د وەرزێ پاییزێدە تێکراییێ وەرزییێ لەزچوونێن هور و بایان ئەوێ ل ئێستگەهێن پارێزگەهێ هاتییە تووماركرن گەهشتە (١,٢٤ م/چرکە)یان، و بلندترین لەزچوونا هور و بایان ئێستگەها باتێلێ تووماركرییە و گەهشتییە (١,٧٥ م/چرکە)، لێ ئێستگەهێن دهۆك و زاخۆ (٠,٩٣م/چرکە) تووماركرییە، کو نزمترین تێکراییێ لەزچوونێن بایانە د ڤی وەرزیدا.

تێکراییێن لەزچوونێن هور و بایان د ڤی وەرزیدا ل بەر بێن مەهێن هاڤینێ کێمن، و ئەڤە ژی ژ بەر هندێیە چونکو سەنتەرێن پەستانێ ئەوێن کار ل هەرێمێ دکن و ب تایبەتی ل ئێستگەهێن پارێزگەهێ نە تەمامن و دبنە ئەگەرێن نەخوەجهییەکێ کو ئەو ژی دبتە ئەگەرێ هاتنا هور و بایان ژ هەمی ئالییان، و لەزچوونا بایان د ڤی وەرزیدا و ل بەر وەرزێ زڤستانێ بلند دبت، چونکو تێکراییێ لەزچوونا هور و بایان د زڤستانێدا نزمە، ئەڤە ژی دوباری بۆ زێدە دوبارەبوونا داکەتۆکێن هەوایی ڤەدگەرت، ئەوێن هور و با پێرە راوەستایی د نیڤەکا داکەتۆکێن هەواییدا، و گوهۆرینا سەمتا هور و بایان لێ دوبارە دبت و ئەڤە ژی دبتە ئەگەرێ کێمکرنا لەزچوونا بایی د ڤی وەرزیدە، ژ بلی وێ کێمبوونێ د پلەیێن گەرمێدا ئەوێن دبنە ئەگەرێن زالبوونا پەستانەکا بلند و زێدەکرنا رەوشا راوەستانێ کو لەزچوونا هور و بایان د ڤی وەرزیدە کێم دکن.

**نەخشەیێ هژمار (١١)**

**تێكڕایێ وەرزیێ لەزچوونێن هوڕ و بایان (م/چركە) ل هاڤینێ و ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ**




ژێدەر: ژ چێكرنا ڤەكۆلەری ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٧)

**نەخشەیێ هژمار (١٢)**

**هێلێن یەكسانییێ یێن لەزچوونا هوڕ و بایان د وەرزێ پاییزێدە و ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ**




ژێدەر: ژ چێكرنا ڤەكۆلەری ب پشتگرێدانا پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٧)

## سەمتا هورِ و بایان (إتجاهات الرياح):

سەمتا هورِ و بایان و لەزچوونا وان ل پارێزگەها دهۆکێ، ئێستگەهـ بۆ ئێستگەهـ ژێك جودانە، ئەڤە ژ بەر جوداییا سالۆخەتێن نزمی و بلندیيان ل پارێزگەهێ، هەر وەسا داکەتۆکێن هەوایی، ئەوێن ژ رۆژئاڤا بۆ رۆژهەلات، ب سەر پارێزگەهێدا دئێن، کارلێکرنا خۆ ل سەر هاتن و سەمتا هورِ و بایان هەیە و دبنە ژێدەر بۆ هورِ و بایێن ژێری و ژێریێ رۆژهەلات و یێن رۆژهەلات ب خۆ ژی، لێ پەستانا بلندا نیڤ خولگەیی (شبه المداری) د وەرزێ زڤستانێدا ئەوا ل دو ڤی ئەڤرازییێ هەوایی (المرتفع الهوائی) دئێت، داکەتۆکێن هەوایی یێن لڤۆك ژ رۆژئاڤا بۆ رۆژهەلاتن کو دبنە ژێدەر بۆ هورِ و بایێن رۆژئاڤا و ژێریێ رۆژئاڤا و دبنە ئەگەر بۆ زێدەبوونا رەوشێن نەخوەجهییێ یێن سەمتا هورِ و بایان ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ، و د وەرزێ زڤستانێدا زێدەتر دبن ژ بەر رێگرتنا زنجیرەچیایان، و ژ بەر بۆرینا داکەتۆکێن دەریایا ناڤین، ڤێجا هورِ و با بەر ب سەمتەکا دەستنیشانکریڤە و بۆ دەمەکێ درێژ بەردەوام دبن، و هۆسا د ڤی وەرزیدا، سەمتا هورِ و بایان د ناڤبەرا ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێدا نەوەکهەڤ دئێن و دەڤەر بەرهنکاری هاتنا گەلەك هورِ وبایان دبن و ژ گەلەك جهان، لێ رووکارێ گشتی ئەوە کو هورِ و بایێن ژێریێ رۆژهەلات سەردەست و زالن، و رێژەیا دوبارەبوونا وان (٣١٪)ێ یە، ژ بەر کو د داکەتۆکێن هەواییدا هلدکەڤن، ئەڤە ژ بلی درێژیا نزمی و بلندییان ئەوا کار ل هندێ دکەت کو هورِ و با پتر سەمتێن ژێریێ رۆژهەلات بگرن ژ سەمتێن ژێری. و د وەرزێن هاڤینێدا، رێژەیێن دوبارەبوونا هورِ و بایێن ژێریێ رۆژهەلات ل کێمیێ ددەن و رێژەیا وان دبتە (١٤,٦٪)ێ و ئەڤە ژی بۆ کارلێکرنا بلنداهیيا چیایان ڤەدگەرِت کو کار ل گوهارتنا سەمتا هورِ و بایان دکەت، زێدەباری درێژبوونا داکەتۆکێ هندستانێ یێ وەرزی (منخفض هند الفصلی) و کارلێکرنا وی ل سەر داکەڤتنا رێژەیا دوبارەبوونا ڤان هورِ و بایان.

سەمت و رووکارێن ژێریێ رۆژئاڤایا هورِ و بایان ل ئێستگەهێن پارێزگەهێ د وەرزێ هاڤینێدا زال دبن، و رێژەیا دوبارەبوونا وان دگەهتە (٢٣,٣٣٪)ێ و رێژەیێن زالبوونا سەمت و رووکارێن هورِ و بایان ل ئێستگەهێن پارێزگەهێ ژێك جودا دبن، ل دەڤەرا زاخۆ هورِ و بایێن رۆژئاڤایی ب رێژەیا (٢٠,٦٦٪)ێ ل دەڤەرا زاخۆ ڤەدگرن و هۆر و بایێن ژێری ب رێژا (٣٦,٦٦٪)ێ ل ئێستگەها باتێلێ زال دبن، و هورِ و بایێن ژێریێ رۆژئاڤا ب رێژەیا (٣٨٪)ێ زال دبن، و ل ئێستگەها دهۆکێ هورِ و بایێن رۆژئاڤا ب رێژەیا (٣٦,٦٦٪)ێ زال دبن و ل ئاکرێ هورِ و بایێن ژێریێ رۆژئاڤا ب رێژەیا (٣٥,٦٦٪)ێ زال دبن، و دیارە کو ئێستگەها دهۆك بلندترین رێژەیا دوبارەبوونا هورِ و بایێن ژێریێ رۆژئاڤا تۆمارکرینە و ئەڤە ژی بۆ کارلێکەرێن جهێ جوگرافی و کارلێکرنا پشکبوونا داکەتۆکێ هندستانێ یێ وەرزی ڤەدگەرِت کو ئەنجامێ درێژبوونا ئێك ژ داکەتۆکێن هەواییە، زێدەباری رابۆرینا سەنتەرێن داکەتۆکێن بەرۆکی (مراكز المنخفضات الجوية) د چارچۆڤێ بازنەیێن پانییێدا.

هندی کو هەردو وەرزێن ڤەگوهێزۆکێن بهار و پاییزانە، هورِ و بایێن ژێریێ رۆژهەلات تێدا زال و بەلاڤن، سەمتا بەلاڤ د وەرزێ بهارێدا، هورِ و بایێن ژێریێ رۆژهەلاتن ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ کو ل پلە و پەیسکا ئێکێ دئێت د ناڤبەرا سەمتا هورِ و بایان، و بلندترین رێژەیا دوبارەبوونا (٢٥,٣٣٪)ێ تۆمارکرییە.

دەمێ کێمبوونا دوبارەبوونا داکەتۆکێن دەریایا ناڤین د وەرزێ بهارێدا، دەلیڤەیێ ڤەدکەت کو ئەڤرازییێ سیبیری ببەزت، و ئەڤە دبتە ئەگەرێ نەخوەجهییا لەزچوونێن هورِ و بایان و سەمتا وان، و ب هندێ سەمتا وان ژ ژووریێ رۆژئاڤا بۆ ژێریێ رۆژهەلات دئێتە ڤەگوهارتن و هەر ژ بەر هندێ دوبارەبوونا هورِ و بایێن ژێریێ رۆژهەلات ل وەرزێ بهارێ و ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆك دئێنە گوهۆرین، ل زاخۆ (٣٢٪)ێ و ل باتێلێ (٢٦,٦٦٪)ێ و ل سێمێلێ (٣٥٪)ێ و ل دهۆکێ (٢١,٦٦٪)ێ و ل ئاکرێ (٥,٣٣٪)ێ هاتینە تۆمارکرن، هەر وەسا دوبارەبوونێن هورِ و بایێن ژێریێ رۆژهەلات یێن وەرزی و بەرەف نشیڤ، زێدەباری داکەتۆکێن دەریایا

ناڤین ئەوێن سەمتا ژووریێ رۆژهەلات دگرن، دبنە ئەگەرێ زێدە دوبارەبوونا ڤان هور و بایان. هندی وەرزێ پاییزێیە، هور و بایێن ژێریێ رۆژهەلات بلندترین رێژەیا دوبارەبوویی توومارکرینە کو گەهشتییە (٢٠,٦٦٪)ێ و ب هندێ د ڤی وەرزیدە ل پەیسکا ئێکێ دئێت د ناڤ هەمی سەمتاندا، لێ هور و بایێن ژێری و ژێریێ رۆژئاڤا ل پلە و پەیسکا دووێ دئێن (١٧,٦٦٪)ێ توومارکرینە و هور و بایێن رۆژئاڤا ل پلە و پەیسکا سێیێ دئێن، لێ هور و بایێن ژووری (١,٦٦٪)ێ توومارکرینە و ل پلە و پەیسکا دووماهییێ دئێن.

ئێستگەهێن ڤەکۆلین ژێ دگریت د وارێ دوبارەبوونا رێژەیا هور و بایێن ژێریێ رۆژهەلاتدا د وەرزێ پاییزێدا ژێك جودانە، ئێستگەها زاخۆ (٣٣,٦٦٪)ێ و ئێستگەها باتێلێ (٢٠,٣٣٪)ێ و ئێستگەها سێمێلێ (٣٦,٣٣٪)ێ و ئێستگەها دهۆکێ (٦٪)ێ و یا ئاکرێ (٦٪)ێ وەك تێکرایێن وەرزی د پاییزێدە توومارکرینە.

## هەلمبوون (التبخر):

هەلمبوون ئەوە ئاڤ ژ رەوشا رۆناتییێ (شل) ببتە گاز، و هەوا تەژی هەلم ببت[١٢]. هەر چەندە پلەیا گەرمێ هۆکارەکی سەرەکی و گرنگە د هەلمبوونێدا، لێ د گەل هندێ ژی هندەك هۆکارێن دی ژی هەنە، کار ل هەلمبوونێ دکن، وەکی چەنداتییا تیرۆژکا رۆژێ، لەزچوونا بایی، رەوایا د ناڤ هەواییدا، روویێ شینکاتی و هندەك هۆکارێن دی، ئەڤە هەمی ب هەڤبەندییێن راستانی (گردی) و هەڤبەندییێن بەرەڤاژیڤە گرێدایینە د گەل تڤاڤا هەلمبوونا هەر دەڤەرەکێڤە، و ژ گرتنا (رصد) تێکرایێن مەهانە و سالانەیێن هەلمبوونێ ئەم دبین کو تێکرایێ سالانەیێ هەلمبوونێ ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ دگەهتە (٢٠٣٦,١٧ ملم)، ئەڤ بهایە جهـ بۆ جهـ و ژ بەر تێکلییا د ناڤبەرا کۆمەکا توخمێن

**نەخشەیێ هژمار (١٣)**
**تێکرایێن سالانەیێن هەلمبوونێ (ملم) ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ**




ژێدەر: چێکرنا ڤەکۆلەری ب پشتگرێدانا داتایێن رێڤەبەرییا کەشناسی و بیڤەلەرزان، ل پارێزگەها دهۆکێ، پشکا ئاڤ و هەوایی، داتا و پێزانینێن تێکرایێن مەهانە و سالانەیێن هەلمبوونێ ژ (٢٠٠٠ - ٢٠١١)، پێزانینێن بەلاڤنەکری.

سرۆشتیدا و ل سەرێ هەمییان ئاڤ و هەوا دئێنە گوهۆڕین، ژ بەر كو پلەیا گەرمێ و هوڕ و بایان د گەل بلندی و نزمییان كارلێكرنا خۆ یا ئێكسەر و ڕۆلێ خۆ د كریارا هەلمبوونێدا هەیە.

ئێستگەهێن زاخۆ، باتیل، سێمێل، دهۆك و ئاكرێ هندەك تێكراێن سالانەیێن هەلمبوونێ تۆماركرینە گەهشتنە (٢٠٣٦,١٧ ملم)، تێكراێ سالانەیێ هەلمبوونا ئێستگەها زاخۆ یێ تۆماركری گەهشتە (١٩١٤,٨ ملم)، و ئێستگەها باتێلێ (٢١١٠ ملم)، و یا سێمێلێ (٢١٢٤,٥ ملم) و یا دهۆكێ (٢١٣٠,٤ ملم) و یا ئاكرێ (١٩٠١,٢ ملم) تۆماركرن، هەر وەكی ل سەر نەخشەیی هاتینە تۆماركرن.

و ژ گرتنا بهایێن (قیم) هەلمبوونا وەرزیا ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ د خشتەیێ (٨)دە ئەم دبینن:

## وەرزێ زڤستانێ:

ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ د وەرزێ زڤستانێ یێ سالدا د ناڤبەرا (٢٠٠١ – ٢٠١١)ێ سەرجەمێ وەرزیێ هەلمبوونێ ب ڤی ڕەنگی تۆماركریە: ل ئێستگەها زاخۆ گەهشتە (١٢٠,٥٢ ملم) و ل یا باتێلێ (١٦٢,٨١ ملم)بوون و ل سێمێلێ (١٠٨,٤٧ ملم) بوون و ل ئێستگەها دهۆكێ (١٣٨,٦٩ ملم)بوون و ل یا ئاكرێ (٩٩,٤٦ ملم)بوون و ئەڤە د گەل داكەفتنا پلەیێن گەرمێ و بلندبوونا ڕەوایا ڕێژەیی (الرطوبة النسبیة) د هەواییدا كو كارلێكرنا خۆ هەیە د ڤەبرینا وێ تڤاڤا ئاڤێدا ئەوا دبتە هەلم دەمێ پلەیا گەرمێ خوەجهـ دمینت.

## وەرزێ بهارێ:

ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ هندەك تێكراێن وەرزی د بهارێدا تۆماركرن، ل ئێستگەها زاخۆ بوو (٤٠١,٥٧ ملم) و ل ئێستگەها باتێلێ (٤٠٤,٣٩ ملم) و ل ئێستگەها سێمێلێ (٤٥٣,٢٣ ملم) و ل دهۆكێ بوو (٤٧٥,٧٣ ملم) و ل ئاكرێ (٣٣٧,٠٥ ملم)، و سرۆشتییە كو هەلمبوون بلندترین سەرجەم د وەرزێ بهارێدا و ل ئێستگەها دهۆكێ تۆمار بكەت، و كێمترین سەرجەم یێ هەلمبوونێ ل ئێستگەها ئاكرێ تۆمار بكەت، و ئەڤە ژی بۆ هندێ ڤەدگەڕت كو چەنداتییا هەلمبوونێ (كمیة التبخر) - ب ئاوایەكی بەرەڤاژی - هەڤڕێژە د گەل ڕەوایا ڕێژەیی و ئەگەرێ ڤێ ژی دزڤڕتە كارلێكرنا دەریاچەیا سكرێ دهۆكێ و دەریاچەیا سكرێ مووسل.

**خشتەیێ هژمار (٨)**

**تێكراێن پێشبینیكری یێن وەرزی یێن هەلمبوونێ (ملم) یێن ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ ژ (٢٠٠١ – ٢٠١١)**

| ئێستگەهـ / وەرز | زاخۆ | باتێل | سێمێل | دهۆك | ئاكرێ | تێكراێ سالانە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| وەرزێ زڤستانێ | ١٢٠,٥٢ | ١٦٢,٨١ | ١٠٨,٤٧ | ١٣٨,٦٩ | ٩٩,٤٦ | ١٢٥,٩٩ |
| وەرزێ بهارێ | ٤٠١,٥٧ | ٤٠٤,٣٩ | ٤٥٣,٢٣ | ٤٧٥,٧٣ | ٣٣٧,٠٥ | ٤١٤,٣٩ |
| وەرزێ هاڤینێ | ٩٥٥,٥١ | ١٠٣٣,٨٨ | ١٠٩٣,٣٩ | ١٠٤٠,٨٤ | ١٠٢٣,٥٢ | ١٠٢٩,٤٢ |
| وەرزێ پاییزێ | ٤٣٧,١٨ | ٥٠٨,٨٧ | ٤٦٩,٤٥ | ٤٧٥,٠٩ | ٤٤١,٢ | ٤٦٦,٣٥ |

ژێدەر: ڕێڤەبەریا كەشناسی و بیڤەلەرزان، ل پارێزگەها دهۆك، پشكا ئاڤ و هەوایی، پێزانینێن بەلاڤنەكری.

## وەرزێ هاڤینێ:

و د وەرزێ هاڤینێدا ژ بەر پلەیێن گەرمێ یێن بلند و نەبوونا عەوران و نەبوونا بارانان، زێدەباری داکەڤتنا رەوایا رێژەیی و هشکاتیا هەوایی، تێکراییێ هەلمبوونێ دگەهتە کوپیتکێ. بلندترین تێکراییێ وەرزی ل ئێستگەها دهۆك هاتە توومارکرن و گەهشتە (١٠٤٠,٨٤ ملم)، و کێمترین سەرجەمێ هەلمبوونێ ل ئێستگەها زاخۆ هاتە توومارکرن و گەهشتە (٩٥٥, ٥١ملم).

## وەرزێ پاییزێ:

بهایێن هەلمبوونێ د ڤی وەرزیدا بلند دبن، بلندترین بها ئێستگەها باتێلێ (٥٠٨,٨٧ ملم) و نزمترین بها ئێستگەها زاخۆ (٥٠٨,٨٧ ملم) توومارکرییە و ئەڤە ژی ژ بەر بلندبوونا پلەیێن گەرمێ ئەوێن رێژەیا هەلمبوونێ زێدە دکەن.

## رەوایا (شێیا) رێژەیی (الرطوبة النسبية):

رەوایا رێژەیی ل هەر جهـ و دەڤەرەکێ ب چەنداتییا پلەیا گەرمێ و هەلما ئاڤێڤە (ئەوا د ناڤ هەوایێ وێ دەڤەرێدا) دئێتە گرێدان. رەوایا رێژەیی ب تەزیبوون و ساربوونێ زێدە دبت، ئانکو ب کێمبوون و نزمبوونا پلەیا گەرمێ چونکو ئەڤە پلەیا تێربوونا هەوایی ب هەلما ئاڤێ کێم دکەت، دیسا زێدەبوونا هەلما ئاڤێ د ناڤ هەوایدا ب رێکا هەلمبوونێ، رەوایا رێژەیی زێدە دکەت. ژ خشتەیێ هژمار (٩) ئەم گەلەك جوداهییێن مەزن د ناڤ رێژەیێن تێکراییێن سالانەیێن رەوایا رێژەییدا دبینن، ئەڤە هەمی ژ بەر کارلێکەرێن جهێ جوگرافی، چونکو ئێستگەهێن دکەڤنە ئالییێ ژووریێ رۆژئاڤا، تێکراییەکی سالانە (یێ رەوایا رێژەیی) توومارکرییە ل زاخۆ (٣٩,٦٪)ێ یە و ل باتێلێ (٥١,٤٪)ێ یە و ل سێمێلێ (٤٢,٤٪)ێ و ل دهۆکێ (٤٥,٩٪)ێ یە.

## وەرزێ زڤستانێ:

د وەرزێ زڤستانێدا، ئێستگەهێن دکەڤنە دەڤەرێن چیایێن رۆژهەلاتی بلندترین تێکراییێن رەوایا رێژەیی توومار دکەن. تێکراییێن وەرزی یێن ل ئێستگەها ئاکرێ هاتینە توومارکرن گەهشتینە (٧١,٨٪)ێ ، ئەڤە ژ بەر پلەیێن گەرمێ یێن نزم کو هاریکاریا گەهشتنا نشیڤێن هەوایی دکەن و هور و بایان د وەرزێ زڤستانێدا بەرەڤاژی دکەن و رەوایا رێژەیی زێدە دکەن، لێ ئێستگەها بەردەرەش کێمترین تێکراییێن رەوایا رێژەیی توومارکرن کو گەهشتنە (٥٠,٤٪)ێ ، هەر وەسا مەها سوباتێ بلندترین تێکراییێن مەهانەیێن رەوایا رێژەیی د سالێدا توومار دکەت کو دگەهنە (٦٠,٦٪)ێ و ئەڤە ژی بۆ هندێ دزڤرت، هەر گاڤەکا پلەیا گەرمێ نزم دبت، رەوایا رێژەیی زێدە دبت، چونکو د ڤان رەوشاندا، شیانا هەوایی بۆ ڤەگرتنا هەلما ئاڤێ کێم دبت[13].

## وەرزێ بهارێ:

د وەرزێ بهارێدا، تێکراییێن رەوایا رێژەیی ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ بلند دبن و ئەگەر ژی بۆ هندێ ڤەدگەرت کو نشیف و بارۆڤە و بارستەیێن شەهدار ب سەر دەڤەرێدا دئێن و رادبۆرن و کار ل سالۆخەتێن رەوایی دکەن، لێ ب رێژەیەکا کێمتر ژ وەرزێ زڤستانێ. ئێستگەهێن پارێزگەهێ تێکراییەکی وەرزییێ گشتی توومارکرن گەهشتە (٤٧,٨٪)ێ و ئەڤە بۆ رەوایا رێژەیی ل پەیسکا دووێ پشتی وەرزێ زڤستانێ دئێت.

## وەرزێ هاڤینێ:

هندی د وەرزێ هاڤینێدایە، ئێستگەهێن پارێزگەهێ نزمترین بهایێن رەوایا رێژەییا وەرزی توومار دکەن و ئەڤە ژ بەر نزمبوون و داکەڤتنا رەوایا رێژەیی و ژ بەر نەبوونا باران و بلندبوونا پلەیێن گەرمێ کو پێکڤە هەوایی هشك دکەن و دبنە ئەگەرێ داکەڤتن و نزمبوونا رەوایا رێژەیی کو نزمترین تێکراییێن وەرزی (٢٧,٥٣٪)ێ د ڤی وەرزیدا توومارکرینە.

**خشتەیێ هژمار (٩)**

**تێكراپێن مەهانە و سالانە و وەرزانەیێن ڕەوایا ڕێژەیی ژ (٪)ێ ل پارێزگەها دهۆكێ ژ (٢٠٠١ – ٢٠١١)ێ**

| مەهـ / ئێستگەهـ | ك٢ | سوبات | ئادار | نیسان | گولان | خزیران | تیرمەهـ | تەباخ | ئیلۆن | چ ١ | چ ٢ | ك ١ | تێكراپێ سالانە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ٥٤,٨ | ٥٦,٠ | ٤٨,٤ | ٤٨,١ | ٣٥,٩ | ٢٣,١ | ٢٠,٩ | ٢١,٦ | ٢٥,٧ | ٣٨,٧ | ٤٧,٧ | ٥٤,٩ | ٣٩,٦ |
| باتێل | ٦٧,٠ | ٦٥,٣ | ٦١,٢ | ٥٩,٨ | ٤٨,٤ | ٣٩,٤ | ٣٩,٦ | ٣٦,٩ | ٣٩,٣ | ٤٦,٠ | ٥٣,١ | ٦١,٩ | ٥١,٤ |
| سێمێل | ٦١,٨ | ٦٢,١ | ٥١,٦ | ٥٢,١ | ٣٧,٠ | ٢٦,٠ | ٢٣,٥ | ٢٥,٧ | ٢٨,٢ | ٣٥,١ | ٤٩,٨ | ٥٦,٩ | ٤٢,٤ |
| دهۆك | ٦٥,٢ | ٦٤,٢ | ٥٥,٨ | ٥٣,٨ | ٣٩,٧ | ٢٩,٧ | ٢٦,٠ | ٢٨,١ | ٣٢,١ | ٤٠,٠ | ٥٥,٦ | ٦١,٢ | ٤٥,٩ |
| زاویتە | ٦١,٧ | ٦١,٤ | ٥٢,٩ | ٥٥,٧ | ٤٧,٧ | ٣٨,٥ | ٣٤,٩ | ٣٢,٩ | ٣٨,٠ | ٤٣,١ | ٥٥,٩ | ٥٨,٥ | ٤٨,٤ |
| سەرسنگ | ٦٠,٨ | ٦٠,٣ | ٥٥,٦ | ٥٣,٠ | ٤٤,٠ | ٣٤,٦ | ٢٨,٠ | ٢٩,٦ | ٣٣,٦ | ٤١,٣ | ٥٥,٥ | ٦١,٢ | ٤٦,٤ |
| ئامێدی | ٥٣,٤ | ٥٨,٣ | ٥٢,٥ | ٥٠,٣ | ٣٨,٤ | ٢٥,٧ | ٢٤,٤ | ٢٣,٩ | ٢٦,٣ | ٣٨,٥ | ٥٤,٥ | ٥٤,٨ | ٤١,٧ |
| ئاكرێ | ٧٦,٦ | ٧٢,٨ | ٦٣,٨ | ٥٤,٢ | ٣٩,٤ | ٣١,٦ | ٢٦,٦ | ٢٦,٣ | ٣٢,٢ | ٣٩,٩ | ٥٥,٩ | ٦٦,٠ | ٤٨,٧ |
| ئەترۆش | ٥٣,٦ | ٥٤,٨ | ٤٩,٠ | ٤٦,٥ | ٣٣,٨ | ٢٥,٠ | ٢٢,٠ | ٢١,٨ | ٣٣,٩ | ٣٤,٦ | ٤٥,٠ | ٥٢,٨ | ٣٩,٤ |
| بەردەڕەش | ٥٠,٥ | ٥١,٢ | ٥٠,٢ | ٣٦,٠ | ٢٠,٣ | ٢٠,٦ | ٢٢,٢ | ١٨,١ | ١١,٤ | ١٩,٠ | ٣٩,٥ | ٤٩,٥ | ٣٢,٣ |
| تێكراپێ گشتی | ٦٠,٥ | ٦٠,٦ | ٥٤,١ | ٥٠,٩ | ٣٨,٤ | ٢٩,٤ | ٢٦,٨ | ٢٦,٤ | ٣٠,٠ | ٣٧,٦ | ٥١,٢ | ٥٧,٧ | ٤٣,٦ |

| ئێستگەهـ / وەرز | زاخۆ | باتێل | سێمێل | دهۆك | زاویتە | سەرسنگ | ئامێدی | ئاكرێ | ئەترۆش | بەردەڕەش | تێكراپێ ئێستگەهان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێكراپێ وەرزێ زڤستانێ | ٥٥,٢٣ | ٦٤,٧٣ | ٦٠,٢٦ | ٦٣,٥٣ | ٦٠,٥٣ | ٦٠,٧٦ | ٥٥,٥ | ٧١,٨ | ٥٣,٧٣ | ٥٠,٤ | ٥٩,٦ |
| تێكراپێ وەرزێ بهارێ | ٤٤,١٣ | ٥٦,٤٦ | ٤٦,٩ | ٤٩,٧٦ | ٥٢,١ | ٥٠,٨٦ | ٤٧,٠٦ | ٥٢,٤٦ | ٤٣,١ | ٣٥,٥ | ٤٧,٨ |
| تێكراپێ وەرزێ هاڤینێ | ٢١,٨٦ | ٣٨,٦٣ | ٢٥,٠٦ | ٢٧,٩٣ | ٣٥,٤٣ | ٣٠,٧٣ | ٢٤,٦٦ | ٢٨,١٦ | ٢٢,٩٣ | ٢٠,٣ | ٢٧,٥٣ |
| تێكراپێ وەرزێ پاییزێ | ٣٧,٣٦ | ٤٦,١٣ | ٣٧,٧ | ٤٢,٥٦ | ٤٥,٦٦ | ٤٣,٤٦ | ٣٩,٧٦ | ٤٢,٦٦ | ٣٧,٨٣ | ٢٣,٣ | ٣٩,٦ |

**ژێدەر: ڕێڤەبەریا كەشناسی و بیڤەلەرزان، ل پارێزگەها دهۆك، پشكا ئاڤ و هەوایی، پێزانین و داتایێن بەلاڤنەكری**

نەخشەیێ هژمار (١٤)
هێلێن تێكراپێن سالانەیێن ڕەوایا ڕێژەیی ژ (٪)ێ ل پارێزگەها دهۆكێ



ژێدەر: چێكرنا ڤەكۆلەری ب پشتگرێدانا داتا و پێزانینێن خشتەیێ هژمار (٩)

## وەرزێ پاییزێ:

د وەرزێ پاییزێدا، ڕەوایا ڕێژەیی، ژ بەر نزمبوونا پلەیێن گەرمێ، بەرەبەر دەست ب زێدەبوونێ دكەت، زێدەباری دەستپێكرنا گەهشتنا نشیڤێن هەوایی ب هەژمارێن كێم و ئەڤە ژی گونجاییە د گەل لڤینا ڕۆژێ ئەوا بەرچاڤ بەرەڤ خولگەیێ كاركێڤە (مدار الجدی) و ب هندێ، چەنداتییا هەلما ئاڤێ ئەوا د ناڤ هەواییدا، كێم دبت، و پەیوەندی د ناڤبەرا تێكراپێ ڕەوایا ڕەها و سەربەردایی (الرطوبة المطلقة) و شیانا هەواییدا بۆ ڤەگرتنا چەنداتییەكا زێدە ژ هەلما ئاڤێ، كو ئەڤ پەیوەندییە ب زێدەبوونا تێكراپێ ڕەوایا ڕێژەیی د ناڤ هەواییدا دیار دبت[١٤]، كو تێكراپێن هەمی ئێستگەهان د ڤی وەرزیدا دگەهنە (٣٩,٦٪)ێ .

## داباربن (التساقط):

ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆكێ سالۆخەتێ وەرزێ زڤستانێ لێیە، و ل دەمێ داباربنێ، د بن كۆنترۆلا سیستەمێ بارانێن دەریایا ناڤینڤەیە، و دابارین ل پارێزگەهێ ژ سەرێ چریا پێشی دەست پێ دكەت و د ڤێ مەهێدا داكەتۆكێن هەوایی و بارۆڤە و بارستێن هەوایی دژوار دبن و چەنداتییا بارانێ ژ دەڤەرەكێ بۆ دەڤەرەكێ دئێتە گوهۆرین.

وەرزێ زڤستانێ گوپیتكا لێكرن و داباربنێیە ل پارێزگەهێ. د ڤی وەرزیدا و ب پلە و پەیسكا ئێكێ، و ژ بەر نشیڤێن هەوایی ئەوێن ب سەر پارێزگەهێدا دئێن، بارانێن نزمی و بلنداهییان (الامطار التضاریسیة) و بارانێن بارۆڤە پەیدا دبن. داكەتۆكێن دەریایا ناڤین كار ل پارێزگەهێ دكەن و بارانان دادرێژن. ئەو داكەتۆك ل دووڤ هەژمارا داكەتۆكێن هەوایی و وان بارۆڤەیێن ب

سەر پارێزگەهێدا دئێن، د داباریـنا خۆ یا سالانەدا و د مان و دوبارەبوونا خوەدا ژی ژێك جودانە. جوداهییا جوونێ داکەتۆکان بەرپرسیارە ژ ڤان جوداهییێن سالانە. دیسا چەنداتییا بارانێن داکەڤتین، چەند ئەم ژ نشیڤ بەر ب ئەڤرازڤە بچن (د سنوورێن پارێزگەهێدا) زێدە دبن و ئەڤە هەمی ژ بەر کارلێکرنا هۆکارێ نزمی و بلندییان[15].

و ژ ئالییێ سالۆخەتێن داباریـنا بارانێن سالانە و وەرزیڤە ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ، ژ خشتەیێ هژمار (١٠) ئاشکەرا دبت کو سەرجەمێ سالانەیێ داباریـنێ ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ (٥٩٣,١٠ ملم)ە، و ئێستگەها سەرسنگی د وارێ داباریـنا بارانا سالانەدا، ل بەر هەمی ئێستگەهێن دی سەرپشکە. ئێستگەها ژێگۆتی (٨٤٢,٢١ ملم) توومارکرینە، و یا سێمێلێ کێمترین سەرجەمێ سالانە توومارکرییە کو گەهشتییە (٤٠٩,٣ ملم)ان.

هەر وەسا جهی و بلندییا وی د سەر ئاستێ دەریایێرا، کارلێکرنا خۆ ل سەر هورِ و بایێن ب ڕەوا هەیە ئەوێن بەرهنگاری دەڤەرێ دبن. هۆکارێ نزمی و بلندییان (عامل التضاریس) ب بلندی و سەمتێن خوەڤە، ژ ژوورێ ڕۆژئاڤا بۆ ژوورێ ڕۆژهەلات، وە لێ دکەت کو پتر بەرهنگاری هورِ و بایێن ب ڕەوا ببت، و ب هندێ نشیڤ و پەیاکێن چیایان ئەوێن رووباری (مقابلی) هورو بایان باران پتر لێ دبارن.

## وەرزێ زڤستانێ:

د وەرزێ زڤستانێدا و ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەهێ، مەها کانوونا پاشی ژ هەمی مەهێن سالێ تێربارانترە. د ڤێ مەهێدا (١٢٣,١٣ ملم) ێن بارانێ هاتینە توومارکرن، ئەڤە دیار دکەت کو هۆکاری جهی و تۆبۆگرافییا ئەردی و سەمتا سەرێن چیایان ئەوێن ب بەر هورِ و بایێن ب ڕەوا دکەڤن، ڕۆلەکی مەزن هەیە ل سەر زێدەبوونا بارانێن دادبارن، و جوداهییا وان ژ ئێستگەهەکێ بۆ ئێکا دی د وەرزێ زڤستانێدا. هندی مەها سوباتێیە، ل پارێزگەهێ و د دەمسالا بارانبارینێدا، ل پلەیا دووێ دئێت بۆ داباریـنێ، ئەڤە هەمی ژ بەر بزاڤ و چالاکییا داکەتۆکێن هەوایی ل هنداڤ پارێزگەهێ، ژ بلی بلندییا پلەیا گەرمێ یا ڕێژەیی د ڤێ مەهێدا و ب تایبەتی ل دووماهییا وێ، کو باراپتر نەخوەجهییەکا هەوایی د گەلە و دبتە ئەگەرێ پەیداکرنا بارۆڤەیێن بارانێ.

## وەرزێ بهارێ:

بۆ بارانان، وەرزێ بهارێ د دووڤ وەرزێ زڤستانێدا دئێت. (٣٢٪)ێ ژ سەرجەمێ بارانێن سالانە یێن بهارێنە و (٥٥٪)ێ یێن وەرزێ زڤستانێنە و (١٣٪)ێ یێن وەرزێ پاییزێنە، و وەرزێ هاڤینێ ل هەمی ئێستگەهان، ژ ئێکا بارانبارینێڤە هشکە.

## وەرزێ هاڤینێ:

وەرزێ هاڤینێ ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەهێ هشکە و تنێ جارنا هندەك ڕەشیشەیێن بێخێر لێ دبارن، و چو ڕێژە د داباریـنا سالانەدا ب بەر ڤی وەرزی ناکەڤت.

## وەرزێ پاییزێ:

چەنداتییا بارانێن د مەهێن پاییزێدا (ئیلۆن، چرییا پێشی، چرییا پاشی) دبارن، تڤاڤ تڤاڤن و مەهـ بۆ مەهـ ژێك جودانە. ژ مەها ئیلۆنێ ب تڤاڤەکا کێم دبارن، چونکو ئیلۆن دەستپێکا داباریـنێیە، و ڤی دەمی داکەتۆکێن هەوایی کێمن. نیڤا دووێ ژ مەها چرییا پێشی ژ نوو دگەهن، و هەر ژ بەر هندێ کێم بارانە. پاشێ بەربەر باران زێدە دبن و ب تایبەتی د مەها چرییا پاشیدا، ئەو ژی ژ بەر بزاڤ و چالاکییا داکەتۆکان کو د ڤێ مەهێدا (چرییا پاشی) ژ هەمی مەهان پتر داکەتۆکێن دەریایا ناڤین لێ دوبارە دبن. د وەرزێ پاییزێدا دگەهتە (٥,٣)ێ ژ داکەتۆکان. ل پارێزگەها دهۆکێ، مەها چرییا پاشی تێکڕایەکی بارانی توومارکرییە گەهشتییە (٥١,٨١ ملم)ێ و مەها پێشتر (چرییا پێشی) تێکڕایێ وێ (٢٤,٩٦ ملم)ن.

**خشتەیێ هژمار (١٠)**

**تێکڕایێن هەیڤانە و سەرجەمێ وەرزی و سالانەیێ دابارینێ ب (ملم) ل پارێزگەها دهۆکێ، د دەمێ بارانبارینێدا ژ (٢٠٠١ - ٢٠١١)ێ.**

| ئێستگەهـ / مەهـ | زاخۆ | باتیفا | سێمێل | دهۆک | زاویتە | سەرسنگ | ئامێدی | ئاکرێ | ئەترۆش | بەردەرەش | چەندانیا بارزان | تێکرایێ ئێستگەهان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئیلۆن | ٢,٠ | ٣,٠ | ٠ | ٠,٩ | ٢,٦٥ | ٤,٥ | ٦,٧ | ٢,٨ | ٠ | ٣,٦ | ٢٦,١٥ | ٢,٦١ |
| چ ١ | ٢٨,٣ | ٢٢,٤ | ١١,١ | ٢١,٨ | ٢٤,٢ | ٣٦,٩ | ٤٣,٧ | ٢٨,٥ | ٩,٥ | ٢٣,٢ | ٢٤٩,٦ | ٢٤,٩٦ |
| چ ٢ | ٥٣,٥ | ٤٢,١ | ٤٧,٢ | ٤٦,٥ | ٥٦,٧ | ٨٢,٩ | ٧٥,٣ | ٥٧,٧٤ | ١٧,٦ | ٣٨,٦ | ٥١٨,١٤ | ٥١,٨١ |
| سەرجەمێ وەرزێ پاییزێ | ٨٣,٨ | ٦٧,٥ | ٥٨,٣ | ٦٩,٢ | ٨٣,٥ | ١٢٤,٣ | ١٢٥,٧ | ٨٩,٠ | ٢٧,١ | ٦٥,٤ | ٧٩٣,٨٤ | |
| ك ١ | ٧٤,٠ | ٨١,٣ | ٦٥,٤ | ٨٥,٤ | ٩٨,٤ | ١٣٦,٦ | ١٠٧,٧ | ١٠٣,٠ | ١٠٥,٠ | ٧٣,٨ | ٩٣٠,٦١ | ٩٣,٠٦ |
| ك ٢ | ٩٦,١ | ٩٩,٦ | ٨٧,١ | ١٠٥,١ | ١٧٥,٩ | ١٦٣,٢ | ١٢٠,٣ | ١٢٤,٨ | ١٦٧,٥ | ٩١,٧ | ١٢٣١,٣ | ١٢٣,١٣ |
| سوبات | ١٠٤,٥ | ٩٣,١ | ٨٥,٢ | ١٠١,٤ | ١٤٧,٨ | ١٥٣,٢ | ١٢٣,٥ | ١٢٤,٣ | ١٠٤,٠ | ٨٨,٣ | ١١٢٥,٣ | ١١٢,٥٣ |
| سەرجەمێ وەرزێ زڤستانێ | ٢٧٤,٦ | ٢٧٤ | ٢٣٧,٧ | ٢٩١,٩ | ٤٢٢,١ | ٤٥٣,٠ | ٣٥١,٥ | ٣٥٢,١ | ٣٦٧,٥ | ٢٥٣,٨ | ٣٢٧٨,٢ | |
| ئادار | ٧٨,٩ | ٧٨,٩ | ٦٧,٧ | ٦٧,٤ | ٩٦,١ | ١٤٣,٠ | ١٢٥,٦ | ٨٥,٧ | ١١٤,٩ | ٤٨,١ | ٩٠٦,٣ | ٨٨,٤ |
| نیسان | ٧٥,٣ | ٧٥,٣ | ٦١,٨ | ٦٢,٠ | ٧٦,٣ | ٨٩,٩ | ١٢١,٣ | ٨٠,٣ | ٧٤,١ | ٥٠,٨ | ٧٦٧,١ | ٧٣,٢٧ |
| گولان | ١٨,١ | ١٨,١ | ٢٩,٩ | ١٩,٦ | ٢٤,٣ | ٣٢,٠ | ٤١,٩ | ٢٦,٢ | ١١,٣ | ٨,١ | ٢٢٩,٥ | ٢٢,٧ |
| سەرجەمێ وەرزێ بهارێ | ١٧٢,٣ | ١٧٢,٣ | ١٥٩,٤ | ١٤٩,٠ | ١٩٦,٧ | ٢٦٤,٩ | ٢٨٨,٨ | ١٩٢,٢ | ٢٠٠,٣ | ١٠٧,٠ | ١٩٠٢,٩ | |
| خزیران | ٠,٨ | ٠,٨ | ١,٨ | ٠,٦ | ٠,٧٦ | ٠ | ١,٠٤ | ١,٠ | ٠ | ٠ | ٦,٨ | ٠,٦ |
| تیرمەهـ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| تەباخ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| سەرجەمێ وەرزێ هاڤینێ | ٠,٨ | ٠,٨ | ٠ | ٠,٦ | ٠,٧٦ | ٠ | ١,٠٤ | ١,٠ | ٠ | ٠ | ٥ | |
| سەرجەمێ سالانە | ٥٣١,٥ | ٥٠٢,٧ | ٤٠٩,٣ | ٥١٠,٧ | ٧٠٣,١١ | ٨٤٢,٢١ | ٧٦٧,٠٤ | ٦٣٤,٣٥ | ٦٠٣,٩ | ٤٢٦,٢ | | ٥٩٣,١٠ |

ژێدەر: ڕێڤەبەریا کەشناسی و بیڤەلەرزان، پشکا ئاڤ و هەوایی، داتا و پێزانینێن بەلاڤنەکری.

## پشككرنا جوگرافییا باران (التوزیع الجغرافی للأمطار) ل پارێزگەها دهۆكێ:

پشككرنا باران د ناڤبەرا دەڤەرێن پارێزگەها دهۆكێدا وەكهەڤ نینە. هندەك دەڤەران رێژەیا بارانبارینێ لێ پترە د ناڤبەرا (٧٠٠ – ٨٥٠ ملم)اندایە، و رووبەرێ ڤان دەڤەران دگەهتە (٣٩٪)ێ ژ رووبەرێ پارێزگەهێ، و (٢٦٪)ێ ژ رووبەرێ پارێزگەهێ، تڤاڤەكا ناڤنجی ژ باران ب بەر دكەڤت كو د ناڤبەرا (٦٠٠ – ٦٥٠ ملم)اندەیە، ئەڤە دكەڤتە رۆژهەلات و ژێرێ رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ، لێ رێژەیا (٢١٪)ێ ژ رووبەرێ پارێزگەهێ، تڤاڤەك ب بەر دكەڤت پترە ژ (٥٠٠ ملم)ان و ئەڤە پشكێن نیڤەك و ژوورێ رۆژئاڤایە ژ پارێزگەهێ، لێ رێژەیا (١٤٪)ێ ژ رووبەرێ پارێزگەهێ، بارانێن وێ پترن ژ (٤٠٠ ملم)ان كو ژێرێ پارێزگەهێیە، و ل دووڤ خشتەیێ هژمار (١٠) یێ بارانێن پارێزگەهێ ئەم دشێین ب ڤی ئاوایی ل سەر چەند دەڤەرەكان پشك بكن:

**دەڤەرا ئێكێ:**

ئەو ئێستگەهن كو ژووری و ژوورێ رۆژهەلات ژ پارێزگەهێ دگرت، ئەو ژی ئەڤەنە: (ئێستگەها سەرسنگی پتر ژ ٨٠٠ ملم)انە و (ئێستگەها ئامێدیێ و زاویتەیی ژ ٧٠٠ – ٨٠٠ ملم)انە.

**دەڤەرا دووێ:**

ئێستگەها ئاكرێ دگرت كو دكەڤتە ژێرێ رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ و چەندانییا باران لێ د ناڤبەرا (٦٠٠ – ٧٠٠ ملم)اندەیە.

**دەڤەرا سێیێ:**

ئێستگەهێن (دهۆك، باتیل، زاخۆ) دگرت كو دكەڤنە ژوورێ رۆژئاڤا و ژێرێ رۆژئاڤا ژ پارێزگەهێ و چەندانییا باران لێ د ناڤبەرا (٥٠١ – ٦٠٠ ملم)اندەیە.

**نەخشەیێ هژمار (١٥)**

**هێلێن تێكراییێن سالانەیێن باران ب (ملم) ل پارێزگەها دهۆكێ**




ژێدەر: چێكرنا ڤەكۆلەری ب پشتگرێدانا داتا و پێزانینێن خشتەیێ هژمار (١٠)

**دەڤەرا چوارێ:**

ئێستگەها (بەردەرەش )و (ئەتریش) دگرت کو دکەڤنە ژێرێ پارێزگەهێ و چەنداتیا بارانێن لێ دبارن (٥٠٠ ملم) و بنداترن.

دابارین ل پارێزگەهێ ل سەر وەرزێن پاییزێ و زڤستانێ و بهارێ بەلاڤ دبت، هەر ژ سەرێ مەها چریا پێشی هەتا مەها گولانێ و ب تێکرایێن د ناڤبەرا (٤٠٠ – ٨٥٠ ملم)ان د وەرزێ بارانیدا. هەر وەسا چەنداتیا باران سال بۆ سالێ جودایە. سالێن تێرەوا ژ تێکرایێن خۆ زێدە دبت و د هشکەسالاندا کێم دبت. سالا (٢٠٠١)ێ ئێستگەها زاخۆ (٣١٩,٢ ملم) وەرگرتن و سالا (٢٠١١)ێ تێکرا بلندبوو گەهشتە (٥٦٥ ملم)ان، هەر وەسا ئێستگەها دهۆکێ سالا (٢٠٠١)ێ (٤١١ ملم) توومارکرن، لێ ئەڤ چەنداتییە سالا (٢٠٠٦)ێ گەهشتە (٧٩٥ ملم)ان و سالا (٢٠١١)ێ ئەڤ چەنداتییە داکەڤت (هاتە خوارێ) و گەهشتە (٣٣٧,٩ ملم)ان.

## بەفر دابارین:

بەفردابارین ل پارێزگەها دهۆکێ ڤەدگەرێتە دابۆرینا بەرۆکێن سار و بارستەیێن جەمسەری یێن سار د وان مەهاندا ئەوێن پلەیێن گەرمێ تێدا ل پارێزگەهێ دادکەڤن و نزم دبن، ڤێجا بەفر دابارین ژ دەرڤەیی زنجیرە چیایێن پارێزگەهێ کێم دبت و مەزنترین چەنداتیا بەفر دابارینێ د مەها کانوونا پاشیدا دابارت، ئەو ژی ژ بەر گەلەك نزمبوونا پلەیێن گەرمێ، و زێدەتر دبارت هندی بلنداهی ژ ئاستێ دەریایێ زێدەتر ببت و هور و بایێن جەمسەری یێن تەزی و سار پشتی د سەر داکەتۆکێن ناڤێنرە دەرباز دبن، بگەهنە پارێزگەهێ.

بەفر دابارین د سالێدا ل سەر سێ مەهان رادوەستت کو ژ سەرێ کانوونا پێشی هەتا سوباتێیە، ئەڤە ئەو وەختە دەمێ پارێزگەه دکەڤتە د بن کارلێکرنا داکەتۆکێن ناڤێندا. مەها کانوونا پاشی بلندترین تێکرایێ مەهانەیێ بەفردابارینێ توومار دکەت کو دگەهتە (٤,٤٢ سم) ل ئێستگەها زاخۆ. ل ئێستگەها باتێلێ (٢,٥ سم)ن و ل ئێستگەها سێمێلێ نینە و ل دهۆکێ (٠,٧٧ سم) ن و ل ئێستگەها زاویتەیی (٩,٤٥ سم)ن و ل سەرسنکی (٤١,٠٩ سم)ن و ل ئامێدییێ (٤٦,٣٦ سم)ن و ل ئاکرێ (٢,٠٣ سم) ن و ل ئێستگەها ئەتریش (٣,٩٠ سم)ن و ل ئێستگەها بەردەرەش (١,٥ سم)ن. ئەگەرێ کێم بەفر دابارینێ ل باژێرێ دهۆکێ و نەبوونا وێ ل سێمێلێ ڤەدگەرێتە بلنداهیا رێژەیا پلەیێن گەرمێ د وەرزێ زڤستانێدا ل ڤان هەردو ئێستگەهان، دەمێ ل بەر ئێستگەهێن دی دئێنە هەڤبەرکرن. (خشتەیێ هژمار ١١).

# جوونکرنا ئاڤ و هەوایی (التصنیف المناخی):

ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆکێ ل دووڤ جوونکرنا (پورنپویت) و (کۆبن)ی هاتینە جوونکرن و ب ڤی ئاوایی:

پشت ب ڤێ (چالاکییا گەرما سالانە) هاتە گرێدان = ٥,٤ × ناڤنجییێ سالانەیێ پلەیا گەرمێ (س ٥).

بناخەیا (پورنپویت) یێ چالاکییا پلەیا گەرما سالانە د ناڤبەرا هەر شەش هەرێمێن پارێزگەها دهۆکێدا دیارکری هیمایێ (B) و شێوازێ ئاڤ و هەوایێ (هوونك = معتدل) و بهایێ راستانی (حقیقی) یێ پلەیا گەرما سالانە کو د ناڤبەرا (٦٤ – ١٢٧)یدایە، پیڤکێ بەسبوونا (کفایة) گەرمێ ل پارێزگەها دهۆکێ (١٠٠,٣٠)ە.

هەر وەسا پشت ب هەژمارا

**پەیتی و خەستبوونا هاڤینی یا چالاکییا گەرمێ =**

$$\frac{\text{چالاکییا گەرماتیێ ل مەهێن هاڤینێ}}{\text{چالاکییا گەرماتییا سالانە}} \times 100$$

### خشتەیێ هژمار (١١)
### تێكڕاییێن مەهانە و سالانەیێن چەنداتییا بەفرداباریێ ب (سم) ل پارێزگەها دهۆكێ ژ (٢٠٠١ – ٢٠١١)ێ

| مەهـ / ئێستگەهـ | ك٢ | سوبات | ئادار | چ ٢ | چ ١ | سەرجەمێ چەنداتییا بەفرداباریێ سالانە/سم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ٤,٤٢ | ١,٧٢ | ٠,١٣ | ٠ | ١,٣٦ | ٧,٦٣ |
| باتیل | ٢,٥ | ٠ | ٣ | ٠ | ٠ | ٥,٥ |
| سێمێل | ٠ | ٠,٢٧ | ٠,٠٩ | ٠ | ٠ | ٠,٣٦ |
| دهۆك | ٠,٧٧ | ٠ | ٠ | ٠ | ١,٨٨ | ٢,٦٥ |
| زاویتە | ٩,٤٥ | ٤,٦٣ | ١,٠٩ | ٠,٢٩ | ٤,٥٤ | ١٩,٩٨ |
| سەرسنگ | ٤١,٠٩ | ١٢,٩٠ | ١,٣٦ | ٠,٨١ | ٢٨,٠٩ | ٨٤,٢٥ |
| ئامێدی | ٤٦,٣٦ | ٢٨,٨٦ | ٣,٤٥ | ٢,٢٧ | ٢٣,٥ | ١٠٤,٤٤ |
| ئاكرێ | ٢,٠٣ | ٤,٩٠ | ٠ | ٠ | ١,٦٨ | ٨,٦١ |
| ئەترۆش | ٣,٩٠ | ٠,٦٣ | ٠ | ٠ | ٠,٢٧ | ٤,٨ |
| بەردەرەش | ١,٥ | ١,٠٩ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢,٥٩ |
| تێكڕاییێ ئێستگەهان | ١١,٢٠ | ٥,٥ | ٠,٩١ | ٠,٣٣ | ٦,١٣ | ٢٤,٠٨ |

ژێدەر: وەزارەتا چاندنێ، ڕێڤەبەرییا خزمەتێن چاندنێ، پشكا كەشناسی، داتا و پێزانینێن بەلاڤنەكری.

### نەخشەیێ هژمار (١٦)
### هێلێن تێكڕاییێن سالانەیێن بەفرداباریێ ب (سم) ل پارێزگەها دهۆكێ




ژێدەر: چێكرنا ڤەكۆلەری ب پشتگرێدانا داتا و پێزانینێن خشتەیێ هژمار (١١)

کو پەیتی و خەستبوونا هاڤینی یا پلەیا گەرمێ ل پارێزگەها دهۆکێ بوو (٤١,٥١)٥.

ل سەر بنیاتا ئەنجامێن وێ هەڤکێشەیا (پورنپویت) ب کارئینانی، هیمایێ دەربڕ ژ پەیتیبا هاڤینیبا هەرێمان، ئیشارەتێ بۆ هیمایێ (b) دکەت کو بهایێن وی د ناڤبەرا (٣٥٪ێ -٤٩٪)یدایە، و ئەڤە ئیشارەتێ بۆ جوونێ ئاڤ و هەوایێ هوونك ددت.

و بهایێ ڕاستانییێ بارانا سالانە دئێتە هژمارتن ب ڕێکا:

**چالاکیا بارانا سالانە =**

**چەندانیا بارانا سالانە**

**١,٦٥ (________________) ٩/١٠**

**ناڤنجییێ پلەیا گەرما سالانە + ١٢,٢**

**چەندانیا بارانا سالانە** = بارینا سەرجەمێ مەهێن سالێ (ملم)

**و ناڤنجییێ پلەیا گەرما سالانە** = تێکرایێ گەرما سالانە (س°)

و ل دووڤ هەڤکێشا بەسبوونا بارانێ (کاریگەریا بارانێ) پێنج دەڤەرێن ئاڤ و هەوایی د ڤان ناڤبەراندە دیار دبن:

کێمتر ژ ١٦ ملم ________ هشك
١٦ - ٣١ ملم ________ نیڤهشك
٣٢ - ٦٣ ملم ________ نیڤڕەوادار
٦٤ - ١٢٧ ملم ________ ڕەوادار
١٢٨ ملم پتر ________ گەلەك ڕەوادار

و ل سەر بنیاتا ڤێ جوونکرنێ، ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ دبنە (٥١,٨٦ ملم)ێ و ئەڤە ئیشارەتێ بۆ هندێ ددەن کو دکەڤنە د چارچۆڤێ دەڤەرێن بەسبوونا بارانیدا (الكفاية المطرية) د گەل هندەك جوداهییان د ناڤبەرا ئێستگەهاندا، کو ئێستگەها سەرسنگی (٨٢,٨٦ ملم)ان توومار دکەت و دکەڤتە د چارچۆڤێ دەڤەرێن ڕەوادارێن بەسبوونەکا بارانیا بلنددا، لێ ئێستگەها سێمێلێ (٣٢,٥ ملم)ان توومار دکەت و کێمترین بهایێن بەسبوونا بارانی لێ دئێنە توومارکرن و ب هندێ دکەڤتە فەرۆزا ئاڤ و هەوایێ نیڤڕەوادارە. (خشتەیێ هژمار ١٢).

## جوونکرنا (کۆبن):

کۆبن جوداهییێن شینکاتییێن سرۆشتی دکەتە ڕەنگڤەدانا کاودانێن ئاڤ و هەوایی یێن ڕەنگڕەنگ، و سێ هەڤکێشە ب کارئینان بۆ جوداکرنا ئاڤ و هەوایان و جوداکرنا وان ژ ئاڤ و هەوایێ هشك. ئەڤ هەڤکێشەیێن هە، پشتا خۆ ب بارانێن وەرزی گرێددەن، و ژ بەرکو بارانێن پارێزگەها دهۆکێ ژ بارانێن زڤستانینە، ژ بەر هندێ هاتینە ب کارئینان بۆ جوداکرنا جوونێن ئاڤ و هەوایی ل هەمی دەڤەرێن پارێزگەهێ.

ئەڤ هەڤکێشە (R =2(T هنگێ دئێتە کارئینان دەمێ باران دو جاران تەمەت پلەیا گەرمێ بن، ڤێجا ئەگەر باران زڤستانی بن، د نیڤا سالێ یا زڤستانیدا، باران (٧٠٪)ێنە.

R = چەندانیا بارانانە ب (ملم)
T = تێکرایێ گەرما سالانە (س٥)

ڤێجا ئەگەر ئالیێ ڕاستێ یێ هەڤکێشەیێ دو جاران تەمەت ئالیێ چەپێ بت، ئەو هندێ دگەهینت کو ئێستگەهـ ڕەوادارە.

مادەم ئالیێ ڕاستێ یێ هەڤکێشەیێ مەزنترە ژ ئالیێ چەپێ ل هەمی ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ، ئەڤە هندێ دگەهینت کو ئێستگەهێن وێ ڕەوادارن.

و ب ڕێکا کارئینانا جوونکرنا (کۆبن) دیاربوو کو پارێزگەها دهۆکێ ب تێکڕایێن خۆ یێن بارانی و گەرمێ هەڤئاوایە د گەل جوونکرنا کۆبن، دیاربوو کو پارێزگەها دهۆکێ دکەڤتە د چارچۆڤێ ئاڤ و هەوایێ

**خشتەیێ هژمار (١٢)**
**چالاكییا بارانی یا هەیڤانە ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆكێ ژ (٢٠٠١-٢٠١١)ێ**

| مەهـ / ئێستگەهـ | ك٢ | سوبات | ئادار | نیسان | گولان | حزیران | تیرمەه | تەباخ | ئیلون | ت١ | ت٢ | ك١ | سەرجەمێ سالانە | سالۆخەتێ ئاڤ و هەوایی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ٩,٢٨ | ١١,٧٤ | ٥,٦٢ | ٤,٧٠ | ٠,٧٦ | ٠,٠١٩ | ٠ | ٠ | ٠,٠٥٦ | ١,٣١ | ٣,٥٤ | ٦,٣٥ | ٤٣,٣٧ | نیڤرەوادار |
| باتیل | ٨,٨٩ | ٧,٧٧ | ٤,٥٦ | ٣,٥٤ | ١,٢٨ | ٠,٠٤٨ | ٠ | ٠ | ٠,٠٨٨ | ٠,٩٧ | ٢,٥٤ | ٦,٦٠ | ٣٦,٢٨ | نیڤرەوادار |
| سێمێل | ٧,٦٦ | ٧,٦٨ | ٤,٢٧ | ٢,٤٣ | ٠,٦٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠,٤٦ | ٣,٢٨ | ٦,٠٤ | ٣٢,٥ | نیڤرەوادار |
| دهۆك | ٩,٨٥ | ٨,٦٦ | ٤,٨٠ | ٣,٨٠ | ٠,٩٨ | ٠,٠٢٥ | ٠ | ٠ | ٠,٠٤ | ١,١٣ | ٣,١٦ | ٧,١٢ | ٣٩,٥٦ | نیڤرەوادار |
| زاویتە | ١٩,٦٣ | ١٥,٦٥ | ٨,٢٢ | ٥,٤٧ | ١,٤١ | ٠,٠٣٦ | ٠ | ٠ | ٠,١٣ | ١,٤٤ | ٤,٨١ | ١٠,٣٤ | ٦٧,١٣ | ڕەوادار |
| سەرسنگ | ٢٠,٦٠ | ١٦,٧٩ | ١٢,٣٤ | ٦,٥٢ | ١,٨٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠,٢٠ | ٢,٠٦ | ٦,٩٥ | ١٤,٨٩ | ٨٢,١٨ | ڕەوادار |
| ئامێدی | ١٥,٧٣ | ١٥,٣٨ | ١٢,١٦ | ٩,٢١ | ٢,٥٢ | ٠,٠٣٦ | ٠ | ٠ | ٠,٣٢ | ٢,٥٨ | ٦,٤٢ | ١٢,٣٢ | ٧٦,٦٧ | ڕەوادار |
| ئاكرێ | ١٢,٧٦ | ١٢,٠٣ | ٦,٣٧ | ٥,١٦ | ١,٣٣ | ٠,٠٣٦ | ٠ | ٠ | ٠,١٠ | ١,٥٣ | ٤,٢١ | ٩,٣٠ | ٥٢,٨٢ | نیڤرەوادار |
| ئەترۆش | ١٦,٣٠ | ٩,٥٦ | ٨,٤٩ | ٤,٧٩ | ٠,٦٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠,٥١ | ١,٣٠ | ٩,١٥ | ٥٠,٧ | نیڤرەوادار |
| بەردەڕەش | ٩,٩٨ | ٨,٧٣ | ٣,٧٧ | ٣,٥١ | ٠,٤٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠,١٤ | ١,٢٠ | ٢,٨٩ | ٦,٧٢ | ٣٧,٣٦ | نیڤرەوادار |
| تێكرا | ١٣,٠٦ | ١١,٣٩ | ٧,٠٦ | ٤,٩١ | ١,١٨ | ٠,٠٢ | ٠ | ٠ | ٠,١٠ | ١,٣١ | ٣,٩١ | ٨,٨٨ | ٥١,٨٦ | نیڤرەوادار |

ژێدەر: ڤەكولەر ب پشتگرێدانا داتا و پێزانینێن ڕێڤەبەریا كەشناسی و بیڤەلەرزان، ل پارێزگەها دهۆكێ.

هوونكێ ڕەوادارده (C) ژ بەر كو تێكڕایێ گەرمترین مەهێن سالێ ژ (١٠ س٥) كێمتر نینە و تێكڕایێ گەرما سارترین مەهێن سالێ كێمترە ژ (١٨ س٥) و كێمتر نینە ژ (- ٣ س٥).

و ژ بۆ ڤاڤارتنا ئاڤ و هەوایێ هشك ژ ئاڤ و هەوایێ ڕەوادار، هەڤكێشەیا $R = 2(T)$ ... [١٥] هاتە كارئینان، ڤێجا دیاربوو كو ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆكێ د چارچۆڤێ ئاڤ و هەوایێ هوونكێ ڕەوادارده‌یە (ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤین Csa) و هاڤینا وێ گەرمە ژ بەر كو تێكڕایێ گەرمترین مەهێن سالێ كێمتر نینە ژ (٢٢ س٥) و تێكڕایەكێ گەرمێ یێ سالانە هەیە پترە ژ (١٨ س٥) و وەختێ وی یێ هشكاتییێ وەرزێ هاڤینێیە (S) و ئەڤە چونكو ئاڤ و هەوایێ پارێزگەها دهۆكێ، هاڤینەكا گەرم هەیە و بارانێن وێ هەمی د وەرزێ زڤستانێدانە، و دیسا تێكڕایێن پلەیا گەرمێ یا بلند ژی د مەهێن هاڤینێدایە.

## ژێدەر:


١. شرف،عبد العزيز طريح، الجغرافية المناخية والنباتية، دار الجامعات المصرية الاسكندرية ١٩٥٨، ص٤٤.
٢. جودة حسين جودة،ا لجغرافية المناخية والنباتية، دار المعرفة الجامعية الاسكندرية ،١٩٩٦، ص٩٥.
٣. احمد سعيد حديد، فاضل الحسني ،علم المناخ، مطبعة جامعة بغداد، بغداد ،١٩٨٤، ص٧٥.
٤. دلير عزيز طه، مناخ محافظة دهوك رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ٢٠١٣، ص٤٣.
٥. علي موسى، الوجيز في المناخ التطبيقي، مطبعة دار الفكر، دمشق سوريا، ١٩٧٢ ص٢٩.
٦. فواز احمد الموسى، الخصائص المناخية للحرارة والامطار في منطقة شرقي البحر المتوسط جامعة حلب سوريا، ٢٠٠٢، ص٧٩.
٧. احمد سعيد حديد واخرون، المناخ المحلي، جامعة بغداد، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٢، ص٦٤
٨. مالك ناصر عبود، تحليل جغرافي للتباين المناخي بين محطات الحي والنجف والنخيب، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة القادسية، ٢٠٠٥، ص٣٧.
٩. الشلش، علي حسين، مناخ العراق، ترجمة ماجد السيد ولبوعبد الاله رزوقي كربل، جامعة البصرة كلية الاداب، ١٩٨٨، ص٢٠.
١٠. ابراهيم ابراهيم شريف، ص١٧٥.
١١. السامرائي، قصي عبد المجيد وعبد مخور الريحاني، جغرافية الاراضي الجافة، مطبعة دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠، ص٧٠.
١٢. شحاذة، نعمان، علم المناخ، دار الصفاءللنشر، عمان، الطبعة الاولى، ٢٠٠٩، ص١٦١.
١٣. حديد، احمد سعيد وفاضل باقر الحسني، علم المناخ، جامعة بغداد،١٩٨٤، ص١٥٢.
١٤. اسماعيل، سليمان عبد الله، التحليل المكاني لخصائص الامطار في اقليم كوردستان العراق، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٤، ص٢٨.
١٥. السامرائي، قصي عبد المجيد، المناخ والاقاليم المناخية، دار اليازوري للتوزيع والنشر، عمان ،الاردن، ٢٠٠٨، ص١٧٤.

# ئـــاخ

**پ.د. ئەحمد عەلی حەسەن بەبەواتی**
**زانکۆیا دهۆك - کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: دیان جەمیل**

## ئاخ Soil:

ئاخ دهێته هژمارتن ئێك ژ داهاتیێن سرۆشتی بۆ مرۆڤ و گیانەوەر و گشت بونەوەرێن دی یێن زیندی ل سەر روویێ عەردی دناڤ ژێنگەهێن جوگرافی یێن جودا جودا دا، ژبەرکو ژێدەرێ سەرەکی یێ توخم و کەرەستەیێن خوراکی یێن گرنگ و پێدڤییە ژبۆ گەشەکرنا شینکاتی و رووەکان و گرنگییەکا مەزن د بوارێ چاندنێ دا هەیە. زێدەباری هژمارەکا بوارێن دی یێن گرنگ کو تا رادەیەکی پشت بەستنێ دکەنە سەر ئاخێ. بەری ئەم بچینە دناڤ بابەتێ گرنگییا ئاخێ و ئەو فاکتەرێن دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا وێ و جۆرێن جودا جودا یێن ئاخێ ل دەڤەرا مە، ل دەستپێکێ دێ ئاماژێ ب چەند پێناسەیێن گشتی یێن گرێدایی ب ئاخێڤە دەین، هەڵبەت ئەڤ پێناسە ژی ژ بوارەکی بۆ بوارەکێ دی یێ زانستی دجودانە و هەر بوارەك ل دووڤ شێوازێ خۆ یێ تایبەت سەرەدەریێ دگەل ئاخێ دکەت و ل دووڤ تێگەهێن خۆ شرۆڤە دکەت. ل ڤێرێ ئەم دێ ل سەر چەند پێناسەیێن گرنگ راوەستین:

ئـاخ هوسا دهێـتە پێناسـەکرن کـو وەکـی ئامانەکی یە، شینکاتی گشت کەرەستەیێن خۆ یێن خوراکی ژێ وەردگریت، یانژی تەخەکا سست و نەرمە و ژ دندك و هویرکێن باش پێکدهێت ژبۆ پەیداکرنا خورانێ بۆ شینکاتی. ئاخ رووپێ هشکاتی ل سەر عەری هەمیێ یانژی پتریا وی د نخیڤیت ب ستووراتیێا چەندین سانتیمەتران بۆ چەندین مەتران[1]. ئاخ دروست دبیت پشتی کو کەڤر و بەرێن مەزن دشکێن و پرت پرت دبن ئەوژی پشتی چەندین کریارێن کەشوهەوای و ل دووڤدا کریارێن فیزیایی و کیمیایی و بایولوژی ب سەردا دهێن تاکو دگەهیتە وی ئاستی شینکاتی بشێت دناڤدا گەشەبکەت، ئەڤ کەرەستێ ژ ئەنجامێ ڤان کریاران پەیدابیت ل داویێ دبێژنێ ئاخ[2].

هەردو زانایێن ئەلمانی لیبگ Liebi و ڕێمان Raman ل سالا ۱۹۱۷ ب ڤی شێوەی ئاخ پێناسەکریە "ئاخ ئەو کەڤرێن مەزن یێن پرت پرت بووین و بووینە دندکێن گەلەك هویر و بچویك، ل دووڤدا ب ڕەنگەکی ژ ڕەنگان پێکهاتنا کیمیایی یا ڤان دندکێن هویر دگەل بەرمایکێن شینکاتی و گیانەوەرێن دناڤدا هاتییە گوهۆرین". ئاخ دهێتە

هژمارتن تێكەلەكێ پێكهاتێ ژ پێكهاتەیێن ئەندامی و كانزایی كو ئاخێ د هەردو حالەتێن شل (ئاڤ) و گازی (هەوا) پێكدئینیت. دناڤ پێكهاتە و دندكێن ئاخێ دا هژمارەكا مەزن یا ڤالاهییان هەنە دبێژنێ ڤالاهیێن ئاخێ، ئەڤ دندك و ڤالاهیە پێكڤە پەیكەرێ ئاخێ پێكدئینن. ئەڤ ڤالاهیەژی ب كەرەستەیێن ئاڤی و شل یانژی یێن گازی و هەوایی دهێنە پڕكرن. چڕاتییا پتریا جۆرێن ئاخێ دناڤبەرا ١-٢ گرام/ سانتیمەترێن دووجایە[٣].

هەردیسان ئاخ دهێتە پێناسەكرن ئەو تەخا سست و هویركری یا ڕوویێ عەردی دنخێڤیت، ئەڤ ئاخە ژ كەرەستەیێن بەری یێن هویركری پێكدهێت پشتی كو چەندین گوهۆڕین ب سەردا هاتین ئەوژی پشتی كەفتیە بەر كارتێكرنا هژمارەكا فاكتەرێن ژینگەهێ و بایولۆژی و كیمیایی، زێدەباری فاكتەرێن كەشوهەوا و پێتیبوون و ڕامالین و سەرئێك خڕڤەبوونێ[٤].

ب شێوەیەكێ گشتی ئەم دشێن بێژین ئاخ ئەو تەخا سەر ڕوویێ عەردییە یاكو شینكاتی ڕهێن خۆ دناڤدا قائیم دكەن و ئاڤێ و خوارنێ ژێ دمێژن. ئەو تەخە یاكو ژ هژمارەكا مەزن یا دندكێن هویر پێكدهێت و تایبەتمەندیێن وێ هاتینە گوهۆڕین ئەوژی ژ ئەنجامێ شرۆڤەبوونا بەرمایكێن شینكاتی و گیانەوەران ئەڤێن دناڤدا دژیان. گرنگییا ئاخێ یا د هندێ ڕا وەكی داهاتییەكێ سرۆشتیە ژبۆ مرۆڤان ژبەركو چالاكیێن مرۆڤایەتی یێن جۆراوجۆر ل سەر دهێنە ئەنجامدان زێدەباری دیمەنێ وێ یێ جیومورفولۆژی ئەوژی ژ ئەنجامێ فاكتەرێن كەشوهەوا و پێتیبوون و ڕامالین و سەرئێك خڕڤەبوونێ پەیدادبیت، ژبەركو فاكتەرێن جوداجودا دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا ئاخێ (جورێ كەڤری، بلنداهی و نزماتی، كەشوهەوا، شینكاتیێن سرۆشتی، هتد) لەوڕا ئەم دشێن گەلەك جۆرێن ئاخێ ژی ل سەر ڕوویێ عەردی ببینین. هەردیسان جۆرێ ئاخێ و ستووراتییا وێ ژ جهەكی ژبۆ جهەكێ دی یا جودایە ئەوژی ژ ئەنجامێ وان فاكتەرێن بووینە ئەگەرێ پەیدابوون و پێكهاتنا ئاخێ، ئەڤ جوداهییە ژی د ساخلەتێن وان یێن كیمیایی و فیزیایی دا دهێنە تێبینیكرن.

ل دووڤ جهێ پەیدابوونا وێ، بسپۆڕێن تایبەتمەند دبوارێ ئاخێ دا، ئاخ ل سەر دو جۆرێن سەرەكی پارڤەكریە ئەوژی ب ڤی ڕەنگێ خوارێ:

١- ئاخا بەرمایك Residual Soil: ئەڤ جۆرێ ئاخێ پەیدادبیت ژ ئەنجامێ پرت پرت بوون و هویربوونا كەڤران ب هاریكارییا كارتێكرنا فاكتەرێن كەشوهەوای (باران، گەرماتی، با، شێداری و بەستی) و ئەڤ چەندە بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا دندكێن هویركری و ئەڤ دندكە بەردەوام هەر ل وی جهێ كەڤر لێ هویربووی كەفتینە سەر ئێك.

٢- ئاخا ڤەگوهاستی Transported Soil: ئەڤ جۆرێ ئاخێ ژی پەیدادبیت ژ ئەنجامێ پرت پرتبوون و هویربوونا كەڤران ب هاریكارییا كارتێكرنا فاكتەرێن كەشوهەوای لێ ئەڤ دندكێن هویر نامینە ل وی جهی بەلكو دهێنە ڤەگوهاستن ژبۆ جهەكی دی ب هاریكارییا هندەك فاكتەران (ئاڤ، با، بەفر، تاودان یانژی هێزا ڕاكێشانا عەردی) و پێكهاتنا ڤی جۆرێ ئاخێ ژی پشت بەستنێ دكەتە سەر ڕێكا ڤەگوهاستنا وێ[٥]، بۆ نموونە ئەو ئاخا ب ڕێكا پەنگییا ئاڤێ، لافاو، ئاڤڕابوون و كەفتنا بارانێ پەیدادبیت و ستووراتییا وان یا ژێكجودایە و ئەڤ چەندەژی پشت بەستنێ دكەتە سەر ڕێژەیا دندكێن كەفتینە سەر ئێك و پلا تیژاتییا ڕوویێ عەردی وەك ئەو ئاخا دكەڤیتە بنێ گەلییان و ئاخا ل سەر كنارێن ڕووباران و ئاخا دەشتێن ژ ئەنجامێ ئاڤڕابوونێ و دەشتێن ژ هەڕیێ چێبووین، ئەڤ جۆرێ ئاخێ پتریا ئاخا پارێزگەها دهۆكێ پێكدئینیت. لێ ئەو ئاخا ژ ئەنجامێ هاتنا بای پەیدابیت ل جهێن هشك و نیمچە هشك هەیە لەوڕا ب زەحمەت ئەڤ جۆرە ل پارێزگەها دهۆكێ بێتە دیتن.

## فاکتەرێن کارتێکرنێ ل پەیدابوونا ئاخێ دکەن

دروستبوون یان پەیدابوونا ئاخێ ژ ئەنجامێ کارتێکرنا هژمارەکا فاکتەران پەیدابیت کو ژ لایێ خۆڤە ئەڤ فاکتەرە کارتێکرنێ ل وی کەرەستێ بنەرەت دکەن یێ ئاخ ژێ پەیدادبیت؛ ئەوژی پێکدهێن ژ فاکتەرێن بایولۆژی و کیمیایی و فیزیایی، ئەم دشێن ڤان فاکتەران هەمیان پێکڤە کورت بکەین بڤی رەنگی: فاکتەیێن کارتێکرنێ ل کەرەستێ بنەرەت دکەن کو کەڤرێن مەزنن (ماددەیێ دەیك) و کەشوهەوایێ کارتێکەر و تۆپۆگرافییا دەڤەرێ (بلندی و نزماتی) و فاکتەرێن زیندی و دەم.

### ١- کەرەستێ بنەرەت (کەرەستێ دەیك):

ئەو کەرەستێ بنەرەت یێ ئاخ ژێ پەیدادبیت دهێتە ناڤکرن ب کەرەستێ دەیك. ئەڤ کەرەست تەخەکا کەڤری یا دەستپێکی بخۆڤە دگریت و تووشی چەندین فاکتەرێن کەشوهەوایی و کەرەستەیێن ناڤنجی بوویە و ل دووڤدا ب رێکا هندەك فاکتەرێن ڤەگوهاستنێ ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی هاتییە ڤەگوهاستن، بەرچاڤترین نموونەیێن ڤی جۆرێ ئاخێ هویرکێن کەڤران و بەرمایکێن بنێ رووباران (رووبارێن تەڤنێ) ئەڤێن کەفتینە سەر ئێك ل جهێن کوور، دبیت ئەڤ بەرمایکە مابنە پێکڤە یانژی تایبەتمەندیێن وان ب رەنگەکی ژ رەنگان هاتبنە گوهۆرین. ل ڤێرێ بتنێ هندەك جۆرێن کێم یێن ئاخێ هەنە کو ب شێوەیەکێ راستەخۆ ژ هویربوونا کەڤرێن بنەرەت ل تەخێن نزم یێن ئاخێ پەیدادبن، پتریا جاران دبێژنە ڤی جۆرێ ئاخێ "ئاخا بەرمایك" و هەمان ئەو تایبەتمەندیێن کەرەستەیێن کیمیایی هەنە یێن وان کەڤرێن بنەرەت و رەسەن هەین.

ب شێوەیەکێ گشتی پتریا جۆرێن ئاخێ ژ وان کەرەستەیان پەیدادبن یێن ب رێکا فاکتەرێن ژنگەهێ ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی دهێنە ڤەگوهاستن وەك بای و ئاڤێ و هێزا راکێشانا عەردی. دبیت ئەڤ کەرەستە بۆ جهێن گەلەك دوور بێنە ڤەگوهاستن کو رەنگە بگەهیتە چەندین میلان یانژی دبیت بۆ جهەکێ نێزیك بێنە ڤەگوهاستن کو ژ چەند پێنگاڤەکان نەبۆریت.

ئەو کەرەستەیێن ژ ئەنجامێ ڤەگوهاستنا بای پەیدادبیت دهێتە نیاسین ب ئاخا سەرێك خرڤەبووی (یانژی ئاخا لویس Loess) و ئەڤ جۆرێ ئاخێ ل دەڤەرێن رۆژئاڤایێ ناڤەراست ل کێشوەرێ ئەمریکا باکوور و و ناڤەراست و رۆژهەلاتێ ئاسیا دهێتە دیتن ب تایبەت ل وەلاتێ چینێ و هندەك دەڤەرێن دی، ل پارێزگەها دهۆکێ کو خودانا ژنگەهەکا جیولۆجی یا ئالۆزە، گەلەك جۆرێن ئاخا سەرێك خرڤەبوویی یێن دووبارەبووی هەنە ئەوژی دناڤبەرا ئاخێن سەرێك خرڤەبوویی یێن دەریایی کو گەلەك جۆرێن ئاخا جیری و کلسی لێ بەلاڤبوونە، هەتا دگەهیتە ئاخێن سەرێك خرڤەبوویی یێن رووباران کو هژمارەکا جۆرێن خیزی لێ بەلاڤبووینە ب تایبەت یێن رووبارێن دیجلە و خابوور و زێ مەزن، زێدەباری ب دەهان دوڵ و نهاڵێن هشك کو ل وەرزێن بارانان رووبار تێرا دبورین، ئەڤ کاودانە بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا ئاخەکا چین چین (تەخ تەخ) و ئاخەکا ڤەگوهاستنی، ل دووڤ وان پێزانینێن ب دەست مەکەفتین ئاخا ڤەگوهاستی پتر ل دەڤەرێ یا بەربەلاڤە ئەوژی ژبەر وی سرۆشتێ بلندی و نزماتیێ ل دەڤەرێ و ئەڤ ئاخفتنە پتر دێ هێتە سەلماندن دەمێ ئەم بەحسێ جۆرێن ئاخێ ل دەڤەرێ دکەین.

### ٢- بلندی و نزماتی:

دیاردەیێن سەر روویێ عەردی وەك تیژاتی و ئەڤرازی و نشیڤی و بلنداهی و نزماتی کارتێکرنێ ل سەر رێژەیا شێداری و پلا گەرماتییا ئاخێ دکەن زێدەباری مەودایێ کارتێکرنا فاکتەرێن پێتیبوونێ ل سەر کەرەستێ بنەرەتی یێ ئاخێ. ئەو روویێ عەردی یێ گەلەگ تیژ پتر و زویتر دکەڤیتە ژێر کارتێکرنا فاکتەرێن پێتیبوون و داخشانێ ژوان رۆیێن عەردی یێن پەحن و ژ ئەنجامێ کەفتنا سەر ئێك پەیدابووی، ل

دەمەکی کو جهێن نزم پتر د گونجاینە ژبۆ خرڤەبوونا ئاخێ ب تایبەت ئەو ئاخا ژ لایێ ئاڤێ ڤە ژ جهێن بلند دهێتە ڤەگوهاستن بۆ وان دەڤەران و ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا ئاخەکا ڕەنگ تاری و کوور، بەرامبەر ڤان کرباران رۆلێ دیاردەیا بلندی و نزمیێ چالاکتر لێ دهێت د کونترۆلکرنا پێکئینانا ئاخێ دا، ژبەرڤێ چەندێ ئەم دشێن تێبینیا جوداهیێ بکەین ژ لایێ ستویراتی و جۆر و ڕەنگێ ئاخێ ب جوداهیا پلا بلندی و نزماتیێ، بۆ نموونە ل دەڤەرێن گەلەك ئەڤرازی و نشیڤی ئاخا وان نە هند یا ستوورە یان ژی دبیت هەر یا ستوور نەبیت ئەوژی ژ ئەگەرێ زانا ئاڤێ ل وان دەڤەران، لێ د هەمان دەمدا ل دەڤەرێن دەستپێکا چیا و دەشت و نهالان پلا ئاخا وان گەلەك یا ستویرە. ژبەر ڤێ چەندێ تشتەکێ سرۆشتیيە ئەگەر ئەم ڤێ جوداهیێ دناڤبەرا ئاخا پارێزگەها دهۆکێ دا ببینین ژبەرکو پلا بلندی و نزمیێ ژی یا ژێکجودایە (ل بەشێ تۆبۆگرافیا ڕوویێ پارێزگەها دهۆکێ بزڤرە).

## ٣- کەشوهەوا:

پێکهاتنا ئاخێ تا ڕادەیەکێ مەزن پشت بەستنێ دکەتە سەر کاوادنێن کەشوهەوایی یێن دەوروبەری وێ، ئەڤ چەندە دیاردبیت دەمێ ئەم تەماشەی جوداهیا تایبەتمەندیێن جۆرێن ئاخێ دکەین ب هەڤبەرکرن دگەل جوداهیێن دەڤەرێن کەشوهەوایی یێن ل وان دەڤەران، ژ گرنگترین فاکتەرێن کارتێکرنێ ل سەر دروستبوون و پێکهانا ئاخێ دکەن پلا گەرماتیێ و شێداری یە.

یا زانایە کو ئەڤ دەڤەرە یا تووشی گەلەك گوهۆرینێن کەشوهەوایی یێن دووبارەیی بوویە د ماوەیێ چەرخێ بلایستوسینی بەری نێزیکی ملیون سالان هەتا چەرخێ هۆلۆسین کو زانایێن جیولۆجی ڤی ماوەی ب ١١ هزار سالان ژ بەری نوکە دەستنیشان دکەن. دڤی وەختێ درێژدا چەندین ماوەیێن بارانبارینێ پەیدابووینە کو بووینە ئەگەرێ زێدەبوونا چالاکیێن پێتیبوونا ئاخێ ل دەڤەرێن چیایی یێن بلند و ئالۆز و ئەڤ چالاکییە بووینە ئەگەرێ ڤەگوهاستنا بەرمایکێن ئاخێ یێن مەزن و ل دەڤەرێن نزم و گومێن ئاڤێ ل سەر ئێك خرڤەکرینە و ئاخەکا ڤەگوهاستی یا ستوور و کوور پێکئینایە، ئەڤ چەندەژی چالاکیێن کەشوهەوایی یێن فیزیایی و میکانیکی زێدە دکەت، زێدەباری زێدەبوونا چالاکیێن کربارێن هەلوەشیان و شرۆڤەبوونا شینکاتی دماوەیێ ناڤبەرا سەردەمێن بەستی دا و ئەڤ چەندە ژ لایی خوڤە بوویە ئەگەرێ زێدەکرنا کەرەستەیێن ئەندامی بۆ ناڤ بەرمایکێن ئاخێ یێن خرڤەبوویی یێن ڤەگوهاستی و هوسا ئاخەکا زەنگین ب کەرەستەیێن ئەندامی یێن زەنگین و کانزایان پەیدابوویە.

یا زانایە کو کەشوهەوایێ نوکە یێ پارێزگەها دهۆکێ چەندین گوهۆرینێن کەشوهەوایی بخۆڤە دیتینە وەك بەشەك ژ کەشۆهەوایێ جیهانێ، ئەگەر ئەم ل کەشوهەوایی سالێن شێستان و حەفتێیان یێ پارێزگەها دهۆکێ بزڤرین دێ ببینین کەشوهەوایەکێ گەلەك سارببوو و پلا گەرماتیێ ژی ل وەرزێ زڤستانێ دگەهشتە دبن سفرێ دا دگەل دووبارەبوونا دیاردەیا بارینا بەفرێ و بارانێ ب رێژەیێن مەزن کو هندەك جاران دگەهشتە (١٠٠٠) ملیمەتران د سالەکێ ب تێکرایێ پتر ژ (٧٥٠) ملیمەتران، لێ د سەردەمێ ئەڤرۆکەدا بەفر ب وێ رێژەیا بەرێ ناباریت بتنێ ل دەڤەرێن گوپیتکا چیایان نەبیت و ب تێکرایێ کێمتر ژ (٥٠٠) ملیمەتران، گومان تێدا نینە کو ڤان گوهۆرینێن کەشوهەوایی رۆلەکێ ئەرێنی و نەرێنی هەبوویە د پەیدابوونا ئاخێ و وەرارکرنا وێ ل دەڤەرێ.

## ٤- فاکتەرێن بایولۆژی:

هەر ئێك ژ شینکاتی و گیانەوەر و کەروو (کڤارك) و بەکتریا و مرۆڤ کارتێکرنێ ل سەر دروستبوونا ئاخێ دکەن، لێ رۆلێ بەلگێن شینکاتی ژ هەمیان کاریگەرترە ژبۆ نەهێلانا کربارا ژناڤچوونا ئاخێ یا دبێژنێ خۆخۆارنا ئاخێ یانژی ڕامالینا دندکێن ئاخێ ب رێکا بارینا بارانێ ل سەر رویێ عەردی. هەردیسان ئەڤ

شینكاتیە ئاخێ ژ تیشكا رۆژێ یا دژوار و ئێكسەر دپارێزن و هوسا پلا گەرماتییا ئاخێ و تەزاتیا وێ دهێتە پاراستن و رێژەیا ژدەستدانا شێداریا وێ دهێتە كێمكرن.

یا زانایە كو ئەڤ چالاكییا ئەڤێ رۆلێ شینكاتی پێ رادبن پشت بەستنێ دكەتە سەر كەشوهەوای و بلنداهی و نزماتییا روویێ عەردی و فاكتەرێن بایولۆژی، زێدەباری ئەو فاكتەرێن پەیوەندی ب ئاخێ بخۆڤە هەین وەك چری و ستووراتی و كووراتییا ئاخێ و پێكهاتنا وێ یا كیمیایی و پلا ترشاتی و پلا گەرماتی و پلا شێدارییا وێ، زێدەباری وان جۆرێن شینكاتی یێن ل سەر هەر جۆرەكێ ئاخا هەبیت شین دبن. شینكاتییێن مری و بەلگ و چەقێن وان یێن شكەستی دكەڤنە سەر روویێ ئاخێ و پاشی گەنی دبن و دهێنە شرۆڤەكرن، پشتی هینگێ رۆلێ هندەك جۆرێن زیندەوەرێن هویر دهێت ئەوێن دناڤ ڤێ ئاخێ دا دژین و خوارنێ ژڤان شینكاتییێن گەنیبووی وەردگرن ژبەركو ئەو ڤان شینكاتییان شرۆڤەدكەن لەوا كەرەستەیێن ئەندامی دگەل تەخێن سەرڤە یێن ئاخێ تێكەل دبن هەتا ئەڤ پێكهاتەیێن ئەندامی دبنە بەشەك ژ كریارا دروستبوونا ئاخێ و ل داویێ رۆلەكێ گرنگ دگێرن ژبۆ دەستنیشاكرنا جۆرێ وێ ئاخێ ب خۆ.

رۆلێ ڤێ دیاردێ دیاردبیت د دروستبوون و پەیدابوونا ئاخەكا باش و پێتاندی یا زەنگین ب كەرەستەیێن ئەندامی د ئاخا پارێزگەها دهۆكێ دا ئەوژی ب هاریكارییا هەبوونا رێژەیەكا باش و زێدە یا شینكاتی كو ژ لایێ خۆڤە رەنگڤەدانا تایبەتمەندییێن كەشوهەوایەكێ باش دكەت (كەشوهەوایێ دەریا ناڤەراست) ب رەنگەكی كو پتریا بەشێن پارێزگەهێ برەكا باش یا بارانێ دناڤبەر (٥٠٠-٧٥٠) ملیمەتران وەك تێكرایێ سالانە ب دەستخوڤەدئینن. ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن تێبینیا هەبوونا چرینێ شینكاتی یا جوداجودا ل پارێزگەهێ بكەین ب رەنگەكی چرییا ڤان شینكاتییان ل بەشێن باشورێ پارێزگەها دهۆكێ یا كێمە و هێدی هێدی ئەڤ چریە و جۆرێن شینكاتی زێدەتر لێ دهێت دەمێ بەرەڤ بەشێن باكوری بچین ب ئاراستەیێ دەڤەرێن سەرسنك و ئامێدی و كانی ماسێ، زێدەباری ئاراستەیێ باكووری رۆژئاڤایێ پارێزگەهێ ل دەڤەرێن شەرانش و رووبارێ هێزل (بۆ پتر پێزانینان تەماشەی بەشێ شینكاتییێن سرۆشتی بكە).

## ٥- وەخت:

یا زانایە كو كریارا دروستبوونا ئاخێ كریارەكا ئالۆزە، ئەگەر ئەڤ فاكتەرێن بەری نوكە مە ئاماژە پێكری هەمی ژی هەبن لێ ئاخ هوسا ب سانەهی و ئێكسەر و ژدەڤخۆ دروست نابیت بەلكو دڤێت وەختەكێ درێژ پێڤە بچیت كو دبیت ئەڤ وەختە بگەهیت سەدەها یان هزارەها سالان، ئەڤ وەختەژی پشت بەستنێ دكەتە سەر چالاكییا فاكتەرێن بەری نوكە یێن بەرپرسیار ژ دروستبوونا ئاخێ.

ژبەر ڤێ چەندێ وەخت دهێتە هژمارتن ئێك ژ فاكتەرێن گرنگ یێن دروستبوونا ئاخێ و وەراركرنا وێ. ئاخ بەردەوام یا د قۆناغا گوهۆرین و گەشەكرنێ دا، بۆ نموونە ئەو كەرەستەیێن بەری ماوەیەكێ كورت ژ ئەنجامێ ئاڤرابوونەكێ كەفتینە سەر ئێك نابنە ئەگەرێ وەراركرنا ئاخێ ژبەركو ماوەیەكێ درێژ پێڤە نەچوویە هەتا ئاخ بشێت چالاكیێن خۆ ئەنجام بدەت لێ دگەل بۆرینا وەختی دێ گەلەك كەرەستە ل سەر روویێ ئاخێ خرڤەبن و پاشی پێكڤە دێ دەست ب كریارا دورستكرنا ئاخێ كەن، ئەڤ چەندە ل سەر رەوشا ئاخا دەڤەرا مە دگونجیت ژبەركو هندەك ژ وان ئاخان باش یا وەراركری و هندەك ژی ژ نوی یێن چێبووین و هندەك ژی یێن د قۆناغا وەراركرنێ دا و هندەكێن دیژی یێن تووشی كریارا پێتیبوونێ بووین و چ ژێ نەمایە بتنێ كەڤرێن بنەرەت نەبن (ئاخا دەڤەرێن چیایی) ئەڤ چەندەژی ب هاریكارییا چالاكییا كریارا پێتیبوونا ئاخێ یا پەیدابووی.

# سیفەتێن فیزیایی و كیمیایی یێن ئاخێ

## یەكەم: سیفەتێن فیزیایی

### ١- ڕەنگێ ئاخێ:

پتریا جاران ڕەنگێ ئاخێ دهێتە هژمارتن تایبەتمەندیا وێ یا سەرەكی ژبۆ دەستنیشانكرنا جۆرێ ئاخێ، ڕەنگێ ئاخێ ب شێوەیەكێ گشتی دكەڤیتە بن كارتێكرنا جۆرێ وان كەرەستەیێن كانزایی یێن دناڤ ئاخێ دا هەین و ڕێژەیا هەر كەرەستەیەكی. هەمەجۆریا ڕەنگێن ئاخێ ژبۆ هەمەجوری و جوداهیا جۆرێن كانزایێن ئاسنی یێن جۆراوجۆر دناڤ ئاخێ دا دزڤڕیت. دابەشبوون یان ڕێكخستنا ڕەنگێن ئاخێ و جۆرێن وێ دناڤ تەخێن ئاخێ دا پشت بەستنێ دكەتە سەر چەندین فاكتەران وەك فاكتەرێن پێتیبوونێ یێن فیزیایی و كارلێكێن ئوكساندن و داشكاندنێ یێن كیمیایی، هەردیسان د هەمان دەمدا وان توخمان دەستنیشان دكەت یێن دناڤ ئاخێ دا و ڕەنگێن وێ پێكدئینن، بۆ نموونە توخمێ ئاسنی هندەك كانزایێن دی یێن ناڤنجی یێن ڕەنگ زەر یان ڕەنگ سۆر بەرهەم دئینن كو ڕەنگڤەدانا ڕەنگێ ئاخێ دكەت، هەردیسان كەرەستەیێن ئەندامی ئەوێن شرۆڤەدبن دهێنە گوهۆرین بۆ ڕەنگەكێ قەهوایی یێ تاری یان ڕەش، ل ڤێرێ مەنگەنیز و كبریت و نایتروجین بەشداریێ د پێكئینانا بەرمایكێن كانزایی یێن ڕەنگ ڕەش دكەت[٦].

ل دووڤ ئەڤا بەری نوكە مە دیاركری بۆمە خۆیادبیت كو جوداهییەك هەیە د ڕەنگێ ئاخا دەڤەرا مەدا، د هەمان دەمدا دهێتە هژمارتن ئێك ژ پیڤەرێن سەرەكی بۆ ئاماژەپێكرنێ ب شیانێن وێ یێن بەرهەم ئینانێ، بۆ نموونە شیانێن بەرهەم ئینانێ یێن ئاخێ دناڤ ئاخێن ڕەنگ تاری دا (ڕەنگ سۆر و ڕەنگ ڕەش) زێدەترە ژ وان ئاخێن ڕەنگ ڤەبی (ڕەنگ زەر و سەر سپیڤە). هەژی گوتنێ یە كو ڕەنگێ ئاخێ نە تنێ ژ ئەنجامێ ڕەنگڤەدانا وان كانزایانە یێن دناڤ ئاخێ دا بەلكو هندەك ڕەنگێن ئاخێ پەیوەندی ب ستووراتیا ئاخێ و پلا كەرەستەیێن ئەندامی ڤە هەیە.

ل ڤێرێ ئەم دشێن ئاماژێ ب هەبوونا جوداهیێن ڕەنگی دناڤ ئاخا پارێزگەها دهۆكێ دا بكەین، ب ڕەنگەكی كو ڕەنگێ قەهوایێ ڤەبی بۆ قەهوایێ تاری پتر یێ بەربەلاڤە دناڤ ئاخا ڤێ دەڤەرێ دا، ب تایبەت ل ئاخا دەشتا سلێڤانەیان و ئاكرێ، پلا تاریاتیا ڕەنگێ ئاخێ بەرەڤ زێدەبوونێ دچیت ل دەڤەرا نەهلە (ئاكرێ) و بامەرنێ و دەشتا سندیان، ئەوژی ژ ئەگەرێ زێدەبوونا كەرەستەیێن ئەندامی كو دەربڕینێ ژ ڕەنگڤەدانا چڕیا شینكاتی دكەت، زێدەباری ستووراتیا ئاخێ و شیانێن وێ ل سەر پاراستنا شێداریێ.

### ٢- پێكهاتەیا ئاخێ:

ب شێوەیەكێ گشتی پێكهاتەیا ئاخێ هێمایێ دكەتە سەر هندێ كا چەوا دندكێن ئاخێ یان گەردێن وێ ل سەر ئێك خڕڤەبووینە، دبیت پێكهاتەیا ئاخێ و دندكێن وێ د ژێكجودا بن ژ لایێ شێوە و قەبارە و پلەیێن وەراركرنێ و ئەو دیاردەیێن توشبووینێ[٧]. پێكهاتەیا ئاخێ دكەڤیتە بن كاریگەریا پلا هەوایی و لڤینا ئاڤێ و مێژینا وێ زێدەباری بەرەڤانیا ئاخێ بۆ فاكتەرێن پێتیبوونێ یێن دبنە ئەگەرێ ژبەرێكچوونا ئاخێ و ئاستێ گەشەكرنا ڕهێن شینكاتی دناڤ ئاخێ دا. ل پتریا جاران پێكهاتەیا ئاخێ پێزانینان ل سەر چەندین تشتان دیار دكەت وەك شانەیێن ئاخێ و شیانێن وێ یێن بەرەڤانیێ و پێكهاتەیێن وێ ژ كەرەستەیێن ئەندامی و چالاكیێن وێ یێن زیندی و دیرۆكا وەراركرنا ئاخێ و چەوانییا ب كارئینانا وێ ژ لایێ مرۆڤانڤە، زێدەباری سرۆشتێ كانزایێن دناڤ ئاخێ دا و كاودانێن كیمیایی یێن بووینە ئەگەرێ دروستبوونا ئاخێ.

### ٣- تەڤنێ ڕێكخستنا ئاخێ:

تەڤنێ ڕێكخستنا ئاخێ (تەڤنێ چنینا ئاخێ) دەربڕینێ ژ قەبارەیێ ڕێژەیی یێ دندكێن ئاخێ دكەت

کو هێمایێ دکەتە سەر نەرمی یان زڤراتییا ئاخێ، ب شێوەیەکێ ڕۆهنتر ئەم دشێن بێژین تەڤنێ ئاخێ دابەشبووونا ڕێژەیی یا خیزی و هەڕی و تەقنێ دەستنیشان دکەت. تایبەتمەندیێن فیزیایی و کیمیایی یێن ئاخێ یێن گرنگ پشت بەستنێ دکەنە سەر تەڤنێ ڕێکخستنا ئاخێ ژبەرکو ئەڤ تەڤنە ڕووبەرێ ڕوویێ ئاخێ دەستنیشان دکەت ئەوێ کارلێك ل سەر دهێنە ئەنجامدان[٨]. گەردێن ئاخێ دژێکجودانە ژ لایێ قەبارەی ڤە ژبەرکو هندەك وان وەکی گومتلێن ئاخێ یان پرتێن بەرانە کو ژ ئەنجامێ کریارێن کەشوهەوایی یێن فیزیایی ئەوێن بسەر کەڤرێن مەزن دا هاتین بەرهەم هاتینە و هندەکێن دی خۆدان دندك و گەردێن بچویك و نەرمن کو ژ ئەنجامێ شرۆڤەکرنێن کیمیایی یێن کانزایان بەرهەم هاتینە[٩].

هەردیسان تەڤنێ ڕێکخستنا ئاخێ هێمایێ دکەتە سەر وان کەرەستەیێن ئاخێ پێکدئینن ژ خیز و هەڕی و تەقنێ، هەرئێك ژ خیز و هەڕیێ ژ ئەنجامێ فاکتەرێن کەشوهەوایی یێن فیزیایی بەرهەم دهێن، لێ تەقن ژ ئەنجامێ فاکتەرێن کەشوهەوایی یێن کیمیایی پێکدهێن. هەژی گوتنێ یە ب پشت بەستن ل سەر سێگۆشەیا تەڤنێ ڕێکخستنا ئاخێ سێ جۆرێن سەرەکی یێن ئاخێ هەنە ئەوژی ئاخا خیزی و ئاخا هەڕیێ (ئاخا تێکەل) و ئاخا تەقنێ، ل ڤێرێ ئەم ب درێژاهی ناچینە دناڤ ڤان هەرسێ جۆرێن ئاخێ دا لێ ئەم دشێن دیاربکەین کو هەر ئێك ژڤان جۆران ئەرێنی و نەرێنی یێن خۆ هەنە ل سەر لایەنێ چاندنێ لێ باشترین جۆر ئاخا هەڕیێ یە ژبەرکو ساخلەتێن هەردو جۆرێن دی یێن ئاخێ دناڤدا هەنە، ب شێوەیەکێ گشتی بۆمە خۆیادبیت کو ئاخا خیزی ل وان دەڤەران هەیە یێن بەرێن خیزی لێ هەین و ئاخا تەقنێ ژی ل وان دەڤەرێن دەشتی هەیە یێن ئاڤرابوونێن مەزن یێن ڕووباران لێ پەیدابووین (ئاخا دەڤەرێن دەشتی یێن ئاڤرابوونان) و ئاخا ب ڕەخ ڕووبارانڤە، کو ئەڤ جورەژی دناڤ ئاخا پارێزگەهێ دا هەنە (تەماشەی خشتەیێ ژمارە ١ بکە).

## دووەم: سیفەتێن کیمیایی

### ١- پلا ترشاتی و تفتی یا ئاخێ pH:

مەرەم ژ ترشاتییا و تفتییا ئاخێ ئەوە کا چەند ئایونێن هایدروجین و هایدروکسیدی دناڤدا هەنە، پێکهاتنا ئاخا ترش یان تفت پشت بەستنێ دکەتە سەر ڕێژەیا ئایونێن هایدروجینی دناڤ ڤێ ئاخێ دا کو پەیوەندی ب جۆرێ وان کەڤران هەیە یێن ئەڤ ئاخە ژێ پەیدابووی، ئاخا ترش وی دەمی پەیدادبیت دەمێ پلا pH وێ دناڤبەرا (١-٦,٥) دابیت. و ئاخا هەڤسەنگ پلا pH یا دناڤبەرا (٦,٦-٧,٣) و ئاخا تفت (سویر) ژی

**خشتەیێ (١)**
**هندەك تایبەتمەندیێن ئاخا پارێزگەها دهۆکێ**

| ئاخ | %کەرەستەیێن ئەندامی | | | pH ترشاتی و تفتاتی | | | تەڤنێ ڕێکخستنا ئاخێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بلندترین | نزمترین | تێکرا | بلندترین | نزمترین | تێکرا | |
| زاویتە | ٥,٨٦ | ٢,٥ | ٤,١٨ | ٨,٢ | ٧,٣ | ٧,٨ | تەقن – تەقنا تێکەل |
| سیارەتویکا | ٥,٥٤ | ١,٧٨ | ٣,٦٢ | ٨,٢ | ٧,٦ | ٧,٩ | تەقن – تەقنا هەڕی |
| دهۆك | ٢,٤٥ | ١,٤٥ | ٢,٩٥ | ٨,٢ | ٧,٧ | ٧,٩٥ | تەقن – هەڕیا تێکەل |
| ئاکرێ | ٣,٢ | ٢,٥ | ٢,٨٥ | ٧,٤ | ٧,٣ | ٧,٣٥ | |

- جنار محسن حسن، نمو وتوزیع السکان فی قضاء دهوك (١٩٤٧- ٢٠١٠)، رسالة ماجستیر غیر منشورة، فاکولتی العلوم الانسانیة، قسم الجغرافیة، جامعة دهوك، ٢٠١٤، الملحق ١١، ص١٢٠.
- حکومة اقلیم کوردستان، وزارة الزراعة والری، مدیریة زراعة ئاکری، تقریر غیر منشور، ٢٠٠٩، ص ٥.

پلا pH یا دناڤبەرا (٧,٤-١٤) دا[١٠].

ئاخ ساخلەتێن ترشاتیێ وەردگریت دەمێ رێژەیا ئایونێن هایدروجینی ژ ئایونێن هایدورکسیدی پتر لێ دهێن، لێ بەروڤاژی ئاخا تفت (ئاخا سویر) پەیدادبیت دەمێ رێژەیا ئایونێن هایدروکسیدی ژ ئایونێن هایدورجینی پتر لێ دهێن دناڤ ئاخێ دا. ترشاتی یان تفتاتیا ئاخێ گرنگییەکا مەزن بۆ بەرهەم ئینانا ئاخێ یا هەی، لێ ئاخا هەڤسەنگ دهێت هژمارتن باشترین جۆرێ ئاخێ و ل دووڤدا ئاخا تفت دهێت. لێ یا زانایە کو ئاخا هەڤسەنگ ئەوا pH دناڤبەرا (٦,٦-٧,٣) ل جیهانێ هەمیێ گەلەک یا کێمە.

ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١) بۆمە خویادبیت کو ئاخا پارێزگەها دهۆکێ پتر سەر ب ئاخا تفت ڤە دچیت ئەوژی ب پشت بەستن ل سەر داتایێن وان ئاخێن ژ دەڤەرێن دهۆک و زاویتە و سیارەتیکا و ئاکرێ هاتینە وەرگرتن، ئەڤ جۆرێ ئاخێ ژی ئاخەکا باشە بۆ پتریا کریارێن چاندنێ.

### ٢- کەرەستەیێن ئەندامی:

کەرەستێن ئەندامی دهێنە هژمارتن ژ کەرەستەیێن گرنگ بۆ پیتاندنا ئاخێ ژبەرکو کەرەستەیێن خۆراکی یێن پێدڤی ژبۆ گەشەکرنا شینکاتی دابین دکەت وەک کالسیوم و مەگنیسیوم و فۆسفات و نایترۆجینی و گەلەکێن دی. هەردیسان ئەو زیندەوەرێن هویر یێن دناڤ ئاخێ دا رادبن ب شرۆڤەکرنا کەرەستەیێن ئەندامی و هندەک پێکهاتەیێن ترشی یێن ئالۆز بەرهەم دئینن کو ئەوژی توخمێن کانزایی شرۆڤەدکەن بۆ گەردیلەیێن بچویک کو دناڤ ئاڤێ دا دحەلیێن زێدەباری رۆلێ وان د وەرارکرنا نەخۆشیێن ئاخێ دا[١١].

هەردیسان پێتیا ئاخێ دهێتە هژمارتن ل دووڤ رێژەیا کەرەستەیێن ئەندامی یێن دناڤدا، ئەو ئاخا زەنگین ب کەرەستەیێن ئەندامی ئاخەکا پری بەرهەم و باشە. هەژی گوتنێ یە کو رێژەیا کەرەستەیێن ئەندامی دناڤ ئاخێ دا دەربرینێ ژ سرۆشتێ شینکاتیێن سرۆشتی و چریا وان و جۆرێ کەشوهەوایێ بالادەست و ستووراتیا ئاخێ دکەت. ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێین تێبینیا جوداهیان د رێژەیێن کەرەستەیێن ئەندامی یێن دناڤ ئاخا پارێزگەها دهۆکێ دا بکەین کو ئەڤ رێژەیە دناڤبەرا (١,٤٥٪)ێ ل هندەک ئاخێن پارێزگەهێ و (٥,٨ ٪)ێ ل ئاخا دەڤەرا زاویتەدا.

ل دووڤ پێزانینێن خشتەیێ ژمارە (١) ئەم دشێین بێژین کو ئاخا پارێزگەها دهۆکێ یا زەنگینە ب کەرەستەیێن ئەندامی و پیتیەکا باش هەیە و خودانا بەرهەم ئینانەکا باشە بۆ پتریا بەروبوومێن چاندنێ سەرەرای هەبوونا هندەک جوداهیێن بچویک یێن پەیوەندی هەی ب ستویراتی و چریا شینکاتی و کەشوهەوایێ بالادەست ل دەڤەرێ.

## سیفەتێن ئاخا دەڤەرێن چیایی و پێلدار

بەری ئەم بچینە دناڤ بابەتێ سیفەتێن گشتی یێن ئاخا دەڤەرێن چیایی و دەڤەرێن پێلدار ب تایبەت ژی ئاخا پارێزگەها دهۆکێ، پێدڤییە ئەم ئاماژێ ب هندێ بکەین کو بسپۆرێ هولەندی (بیورەنگ) و گرۆپەکێ بسپۆرێن تایبەتمەند یێن عیراقی ئێکەم کەس بوون کو نەخشەیەکێ پری پێزانین دەربارەی شێواز و جۆرێن ئاخێ ل عیراقێ کێشای[١٢] و ل دەماهیا سالێن پێنجیان ل چەرخێ بووری بەلاڤکر، سەرەرای ناڤکرنا ڤێ نەخشەی ب نەخشەیەکێ گشتی لێ هەتا نوکەژی دهێتە هژمارتن ژێدەرەکێ سەرەکی بۆ گەلەک جوگرافیناسێن عیراقی. پشتی هینگێ کەسەکێ دی ب ناڤێ (فلیح الطائی) ئاخا وەلاتێ عیراقێ بۆ سەر ٦٠ جۆرێن ئاخێ دابەشکر[١٣] لێ کەسەکێ دی ب ناڤێ (شابمان)ی هوسا هزردکر کو سیفەتا سەرەکی یا ئاخا دەڤەرێن چیایی ژ جۆرێ ئاخێن نەپێکهەشتی یە. لێ سیفەتێن وێ یێن کیمیایی دکەڤنە دناڤبەرا ئاخەکا تفت یا سڤک بۆ ئاخەکا تفت یا بهێز، لێ ئاخا تەڤن یاکو ڤەدگەریتە سەر ب جۆرێ تەخێن ئەیوسیا سۆر و بەختیاری و

فارسی بهێزترین جۆرێن ئاخا تفتی یە. لێ ئاخێن تەڤنی یێن هەرپێ ژ بەرێن جیری یێن کریتاسی ژ جۆرێ ئاخا تفت یا سڤکن، لەورا ئاخەکا تفتی یا نافنجی پێکدئینیت دناڤبەرا ئاخا بەرێن ئاگری ل دەڤەرێن ئالۆز و خاروڤیچ و ئاخا تەڤنی یا خیزی یا پێکهاتی ژ بەرێن جیری[١٤].

ئەم دشێن سیفەتێن ئاخا دەڤەرێن چیایی و پێلدار د چەند خالەکان دا کروت بکەین، ئەوژی ب ڤی رەنگی[١٥].

١- کوالیتیا دەرخستنێ ژبۆ بنلداهیا عەردی و نەبوونا دەڤەرێن خوێ یان تفتی.

٢- تەڤنێ رێکخستنا ئاخێ (قەبارێ گەردێن ئاخێ) خودان دندکێن مەزنن.

٣- هەبوونا تەخێن ئاسویی یێن جودا جودا یێن بەران کو دهێنە هژمارتن بەرێ بنیاتی یێن ئاخێ و ب سانەهی دهێنە نیاسین، گرنگترین جۆرێن ڤان بەران بەرێن کلسی و خیزی و هەرپێ.

٤- تەخا ئاسویی یا بەرێن کلسی دکەڤیتە سەر کویراتیەکا مەزن دا و ئەڤ کیراتیە مەزنتر لێ دهێت دگەل زێدەبوونا بارانێ ژبەر ڤێ چەندێ کریارا بەلاڤبوونا ماددێن شیانێن حەلیانێ هەین دناڤ ئاڤێ دا کێم دبیت دگەل ئاڤا سەر عەردی دا هەتا دگەهیتە ئاڤا ناڤ عەردی.

٥- هەبوونا هندەك کەرەستەیێن ئەندامی دناڤ تەخا سەر رۆیی یا عەردی ب رێژەیەکا سەدی یا بلندمی و برەکا ئاسنی دناڤ ئاخێ دا.

ل دووڤ جوداهیا فاکتەرێن بەری نوکە مە ئاماژێ پێکری، ئاخا پارێزگەها دهۆکێ ژ هژمارەکا جوداجودا یا یا جۆرێن ئاخێ پێکدهێت، ل دووڤ نەخشەیێ (بیورەنگی) یێ جۆرێن ئاخێ ل عیراقێ و ل دووڤ ڤەکۆلینێن مەیدانی ل دەڤەرێ بۆمە دیاردبیت کو ئەڤ جۆرێن ئاخێ ل دهۆکێ هەنە، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (١) بکە:

**١- ئاخا شەرنوزمی (ئاخا رەش)**

**٢- ئاخا کستانی**

أ- ئاخا کەستانی یا کوور

ب- ئاخا کەستانی یا تەنك

**٣- ئاخا قەهوایی**

أ- ئاخا قەهوایی یا ستووراتیبا وێ نافنجی (سۆر)

ب- ئاخا قەهوایی یا ستووراتیبا وێ کوور (ئەسمەر)

**٤- ئاخا بەری یا تەنك (لیزوسول)**

**٥- ئاخا عەردێن سەخت یێن دەرزی و بەری**

**٦- ئاخا دەریا ناڤەراست یا سۆر (تیرا رۆزا)**

**٧- ئاخا رەند زینا (ئاخا چیایی)**

**٨- ئاخا عەردێن دەشتی**

أ- ئاخا دەشتی یا ئاڤرابوونان

ب- ئاخا دەشتی یا پانکی (المروحیة)

## ١- ئاخا شەرنوزمی (ئاخا رەش):

مەرەم ژ پەیڤا شەرنوزم Chernozem ئانکو ئاخا رەش و ب ڤان سیفەتێن ل خوارێ دهێتە نیاسین[١٦]

١- رەنگێ وێ یێ رەشە ژبەر هەبوونا رێژەیەکا مەزن یا کەرەستەیێن ئەندامی یێن شرۆڤەبووی دناڤدا.

٢- یا زەنگینە ب کەرەستەیێن کانزایی و ئەندامی

٣- رێکخستن و پێکهاتن و تەڤنێ وێ یێ باشە

٤- شیانێن مەزن بۆ هەلگرتن و عەمبارکرنا ئاڤێ هەنە.

ئەڤ جۆرێ ئاخێ دهێتە هژمارتن باشترین جۆرێ ل جیهانێ ژبەرکو شیانێن بەرهەم ئینانێ یێن مەزن هەنە، هەردیسان ل وەلاتێ عیراقێ ژی دهێتە هژمارتن ژ ئاخێن ب مفا و گرنگ ژ لایێ کەرتێ چاندنێ ڤە، لێ رووبەرێ وێ ل عیراقێ و وەلاتێن دی یێن جیهانێ نە گەلەکێ مەزنە. رەنگێ وێ وەکی رەنگێ خۆلیێ یێ تاریە هەتا دگەهیتە رەنگێ رەش، پێکهاتنا وێ یا پێتی و سڤکە و ژ دندکێن هویر و بچویك پێکدهێت و ژ لایێ کیمیایی ڤە ئاخەکا تفتە، رەنگێ ڤێ ئاخێ چەند کوورتر لێ بهێت ڤەبیترە هەتا دگەهیتە رەنگەکێ خۆلیێ یێ تەیسوك ل تەخێن نافنجی. رێژەیا کەرەستەیێن ئەندامی دناڤ ڤی جۆرێ ئاخێ دا دگەهیتە ٤-٨٪ێ، و تێکرایێ سالانە یێ بارانا

بارینێ لێ دگەهیتە (٨٠٠) ملیمەتران ب تایبەت ل وەرزێ زڤستانێ، رووبێ وێ ب شینکاتی و داروباریان دهێتە نخافتن کو ژ گیایێن درێژ و دارێن جۆراوجۆر پێکدهێت[١٧]، ئەڤ جۆرە ئاخە ب کێر چاندنا پتریبا بەروبومێن چاندنێ دهێت ب تایبەت ژی بەروبوومێن دانودکاکی، هەردیسان چاندنا بیستان و کەسکاتی، ئەڤ جۆرە ئاخە ل پتریبا دەڤەرێن دەشتی و دناڤبەرا چیایان ل پارێزگەها دهۆکێ دهێتە دیتن، زێدەباری دناڤ دەشتا نەهلا ل قەزا ئاکرێ و رووبەرەکێ دەشتا سندیان ل قەزا زاخۆ زێدەبارێ هندەک رووبەرێن عەردی یێن بچویک ل نهالا ئیستیبلان (چیایێ شەرانش) و دەڤەرا کانی ماسێ و شێلادزێ ل قەزا ئامێدیێ.

## ٢- ئاخا کەستانی:

ئەو جۆرێ ئاخێ یا ژ دندکێن تیژ و هویرکێن کلسی پێکدهێت، ب هندێ دهێتە نیاسین کو یا پێتی یە و رەنگێ وێ قەهوائیەکێ تاریە[١٨] و ستووراتییا وێ ژ دەڤەرەکێ بۆ ئێکا دی دهێت گوهۆرین کو دناڤبەرا ستووراتیەکا تەنك بۆ ستووراتیەکا کوور دایە. ئەڤ جۆرێ ئاخێ ل دەڤەرا مە دهێتە هژمارتن باشترین و بەرهەمترین جۆرێ ئاخێ ژبۆ کریارێن چاندنێ و پتریبا رووبەرێن دەڤەرێ دنخێڤیت، ب شێوەیەکێ گشتی ل دەڤەرێن دەشتێ و ب تایبەت ل دەڤەرا سندیان.

ئەڤ ئاخە ل دەشتێن دەڤەرا چیایی یا بەربەلاڤە ب رەنگەکی کول ل بەشێن سەری ئاخەکا پێتی یە و رەنگێ وێ یێ قەهوایی و تارییە و رێژەیا کەرەستەیێن ئەندامی دناڤدا دگەهیتە ١-٤٪ێ و رێژەیا کەرەستەیێن کلسی دناڤدا دگەهیت ٩٪، رەنگێ وێ چەند کوورتر لێ بهێت دهێتە گوهۆرین هەتا دگەهیتە بەرمایکێن رەنگ خۆلی یێن ڤەبی[١٩]. ئەو دەڤەرێن ئەڤ ئاخە لێ هەی، کەشوهەوایێ دەریا ناڤەراستە یێ لێ بالادەستە کو سالانە نێزیکی (٤٠٠) ملیمەترێن بارانێ لێ دبارن و شینکاتیێن سرۆشتی لێ شین دبن وەك گیایێن درێژ و دهێتە هژمارتن ئێك ژ باشترین جۆرێ ئاخێ بۆ چاندنێ[٢٠].

ئەڤ جۆرێ ئاخێ ژ ئەنجامێ خرڤەبوونا بەرمایکێن ئاڤا رووباران دروستدبن لەورا ژی گەلەك دەشتێن ئەڤ ئاخە لێ هەی ل سەر لێڤێن رووباران یان نێزیکی رووباران دروست بووینە, هندەك ژڤان جهان بۆ مەرەمێن چاندنێ هاتینە ب کارئینان و هندەکێن دیژی بووینە جهێ ئاکنجیبوونا مروڤان وەك دەڤەرێن شێلادزێ و ئێنیشکێ. ل دووڤ کویراتیا ڤێ ئاخێ دو جۆرێن ئاخێ ل پارێزگەها دهۆکێ هەنە، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (١) بکە.

### أ- ئاخا کەستانی یا کویر:

رەنگێ ڤێ ئاخێ رەنگەکێ تارییە وەکی رەنگێ کەستانی و ژ لایێ پێکهاتنا فیزیایی یا باش هەیە ژبەرکو رێژەیا کەرستێن ئەندامی دناڤدا دگەهیتە ١-٤٪ێ و تێکرایێ باران بارینا سالانە لێ دگەهیتە ٤٠٠-٨٠٠٪ێ ملیمەترێن بارانێ، رووبێ وێ سەرڤە ب گیایێ درێژ و داروبارێن جۆراوجۆر و دارێن بچویك وەك بەریان دهێتە نخافتن[٢١]. ئەڤ جۆرێ ئاخێ دهێتە هژمارتن باشترین جۆرێ ئاخێ ژبۆ چاندنا گەنمێ دێمی لەورا ژ لایێ کارگێری و ئابووریڤە گرنگییەکا مەزن یا هەی، زێدەباری بکارئینانا وێ بۆ بیستانان و چاندنا کەسکاتی[٢٢]. ئەڤ ئاخە ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ ل ناڤەراستا دەشتا سندی هەتا رۆژهەلاتی و ل باکوورێ باژێرێ زاخۆ هەتا رۆژئاڤایی بەرەڤ رووبارێ هیزل هەیە.

### ب- ئاخا کەستانی یا تەنك:

ئەڤ جۆرێ ب رەنگێ خۆ یێ قەهوایی یێ ڤەبی دهێتە نیاسین و پتریبا رووبەرێ قەزا زاخۆ دنخێڤیت و ب شریتەکێ دەست پێدکەت و درێژ دبیت ل بنێ چیایێن کوورە و دوورە (ژلایێ باشوری) و دناڤ ناحیا دەرکارێ را دبۆریت هەتا دگەهیتە سنورێ دەشتا سندیان ل رۆژهەلاتی و ژ لایێ باشوریڤە درێژ دبیت هەتا دگەهیتە بلنداهیێن زاخۆ، هەردیسان ب رووبەرەکێ کێمتر بەرەڤ رۆژئاڤایی درێژدبیت هەتا گوندێ بەهنونە یێ سندیان تا دگەهیتە رووبارێ هیزل (سنورێن عیراق و تورکیا).

**نەخشەیێ (١)**

**جۆرێن ئاخێ ل پارێزگەها دهۆکێ**




Dr, p. Buringh, Soil And Soil Conditions in Iraq, Soil Survey and Classification Specialist , Baghdad, 1960 .

د پتریا سیفەتاندا ئاخا کەستانی یا تەنك وەکی ئاخا کەستانی یا کووره و کەرەستەیێن وان بێن کلسی و جبسی ژی تا ڕادەیەکی وەکی ئێکن و هەردو ژی ب دارێن بچویك و گیایی دهێنە نخافتن[٢٣].

## ٢- ئاخا قەهوایی:

ئەو جۆرێ ئاخێ یە یاکو تەخەکا گێچێ هەی پێکدهێت ژ دندکێن تیژ، ل دووڤدا تەخەکا بەرمایکێن کلسی دهێت، ئەڤ ئاخە یا بەرنیاسە ب ڕەنگێ خۆ یێ قەهوایی و تەڤنێ ڕێکخستنێ یێ زڤر. ستووراتیا وێ ل دەڤەرا دهۆکێ دناڤبەرا ئاخەکا ناڤنجی و ئاخەکا کوور دایە و ب ڤان سیفەتان دهێتە نیاسین[٢٤]:

١- ڕەنگێ وێ یێ کستانی یان قەهوایی یێ ڤەبی یە تا دگەهیتە قەهوایی یێ تاڕی.

٢- ئاخەکا پێشکەفتی یە لێ ل سەرڤە تەخەکا لاواز یا گیایی هەیە لەوڕا ئەگەر دگەل ئاخا شەرنوزمی هەڤبەر بکەین دێ بینین ژ لایێ هەبوونا کەرەستەیێن ئەندامی ڤە یا لاوازە.

٣- دهێتە هژمارتن ئاخەکا ڤەگوهاستی دناڤبەرا ئاخا کستانی بۆ باکوورێ وێ و ئاخەکا بیابانی ل باشوورێ وێ.

٤- ب شێوەیەکێ تایبەت دهێتە ب کارئینان ژبۆ چاندنا دانودکاکی (گەنمی و جەهی)، هەردیسان دهێتە ب کارئینان بۆ شڤانان پەزێ خۆ لێ ب چەرینن ژبەرکو بڕەکا باش یا شینکاتیێ

ئەڤ ئاخە ب شێوەیەکێ بەرچاڤ ل بەشێن باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ پارێزگەها دهۆکێ دهێتە دیتن و دو جۆرێن ستووراتیێ هەنە:

**أ- ئاخا قەهوایی یا ناڤنجی (ئاخا سۆر)،**

ئەو جۆرێ ئاخێ یە یاکو ستووراتیەکا ناڤنجی هەی و تووشی کاودانێن پێتیبوون و ژناڤچوونێ بووی و ڕەنگێ وێ دناڤبەرا قەهوایی و سۆری دایە و دناڤ بەشێن وێ یێن ناڤخۆیی دا ڕەنگێ وێ دبیتە سۆر. ل سەر روویێ ڤێ ئاخێ و ل هندەك جهێن وێ یێن کوور هندەك بەرمایکێن کلسی یان گێچی هەنە کو ڕەنگە مابنە پێکڤە یان ژێ دسست بن[٢٥] . ئەگەر تەماشەی تەخێن کوورتر یێن ڤێ ئاخێ بکەین دێ بینین ڕەنگێ وێ یێ قەهوایی هێدی هێدی بەرەڤ ڕەنگێ سۆر دچیت و تەڤنێ وێ ڕێکخستنێ ژێ ئالۆزتر لێ دهێت.

ئەو کەرەستەیێن بنەرەت یێن ژێ دروست بووی پتر ژ جۆرێ کەرەستەیێن گێچی یان یێن تێکەلن، ل سەر روویێ وێ ژی ب تەخێن شینکاتی یێن گیایی و دارێن کورت دهێتە نخافتن و ڕێژەیا باران بارینا سالانە لێ دگەهیتە (٢٠٠-٤٠٠) ملیمەتران لێ ب شێوەیەکێ نەیێ ڕێکخستی دباریت. کریارێن کیمیایی و بایولۆژی دناڤ ڤێ ئاخێ دا تا ڕادەیەکی دلاوازن[٢٦] لێ ڕێژەیا کەرەستەیێن ئەندامی دناڤدا دگەهیتە (٢,٥٪)ێ و ل گەلەك دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ دهێتە دیتن وەك دەڤەرا فیشخابور بەرەڤ ئاراستەیێ رۆژئاڤای بەرەڤ لێڤێن رووبارێ خابووری ل سەر دیجلەی زێدەباری رووبەرێن بەرفرەهـ یێن دەشتا سلێڤانەی هەتا درێژدبیت بۆ سکرێ مووسل.

**ب- ئاخا قەهوایی یا کوور (ئاخا ڕەش)،**

ئەڤ ئاخە یا ستووراتییا وێ گەلەك یا کوور و ڕەنگێ وێ دناڤبەرا یێ قەهوایی تا دگەهیتە قەهوایەکێ تاری و ڕەش دا، ئەڤ ئاخە بۆ پتریا کریارێن چاندنێ یا باشە و هاریکاریا چارەسەکرنا ئاڤا پیس و زێدە ئەوا دناڤ بۆرێن سۆلین و ئاڤێ دا دهێتە سەر دکەت[٢٧] ، هەردیسان ئەڤ ئاخە ژ جۆرێ بەری نوکە باشترە ژبەرکو ستووراتییا وێ یا مەزن هاریکاریا پاراستنا شێداریێ دناڤ تەخێن ئاخێ دا دکەت، هەردیسان ل وان دەڤەران یا بەربەلاڤە ئەوا تێکراییێ باران بارینا سالانە لێ دگەهیتە پتر ژ (٤٠٠) ملیمەتران زێدەباری هەبوونا تەخێن شینکاتی یێن چڕ ل سەر روویێ وێ کو دبیتە ئەگەرێ زێدەبوونا کەرەستەیێن ئەندامی دناڤدا کو دگەهیتە (٢,٥-٣,٥٪)ێ، ئەڤ ئاخە ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ ل دەڤەرا دەشتا سلێڤانەیان و باشوورێ قەزا شێخان هەیە دگەل هندەك بەشێن دەشتا ئاکرێ بەرەڤ قەزا بەردەڕەش.

## ٤- ئاخا لیسوزول (ئاخا بەری یا تەنك):

ئەڤ ئاخە دکەڤیتە دەڤەرێن سەخت یێن بەری و شەق شەق، ب هندێ دهێتە نیاسین کو ئاخەکا تەنك و نەیا ستوورە و دەمەکێ درێژ نینە دروستبووی، ڕەنگێ وێ دناڤبەرا قەهوایەکێ ئەسمەر بەرەڤ سۆری یە و و ستووراتییا وێ نە گەلەکا مەزنە کو دگەهیتە چەند سانتیمەترەکان ل دەڤەرێن تیژ و ئاسێ و هێدی هێدی ئەڤ ستووراتیە پتر لێ دهێت ل نێزیك بنێ چیایان[٢٨] (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ١ بکە). دبیت ئەڤ ئاخە ل سەر هندەك کەڤر و بەران دروست ببیت کو پتریا وان بەرێن کلسی و خیزی یێن دەستپێکی یان گێچێ بن.

ئەڤ ئاخە دکەڤیتە بەر فاکتەرێن پێتیبوون و ژبەرێکچوونێ لەورا ل سەر شێوەیێ شریتێن تەنگ دیار دبیت، هەردیسان ل وان دەڤەران دهێتە پێش چاڤ یێن جهێن ئەڤرازی یێن ناڤنجی لێ هەین و هژمارەکا مەزن یا هویرکێن کەڤرێن کلسی و گێچی دناڤدا هەنە لەورا بهایێ وێ یێ بەرهەم ئینانێ کێم دبیت، هەردیسان ئەڤ ئاخە ل بلنداهیێن خوار و لار ب تایبەت ل سەر بلنداهیێن باشوری یێن چیایێ دێرە و کیرە و چیایێ بەرزور و باکوورێ بنداهیێن زاخۆ و گرێ بەهنون هەنە. ئەڤ ئاخە بنێ زنجیرا چیایێن شەرانش و بێخێر و ئاکرێ و گارە و مەتین و پتریا چیایێن پارێزگەها دهۆکێ دنخێڤیت. شیانێن بەرهەم ئینانێ یێن ڤێ ئاخێ دسنووردارن ژبەرکو ستووراتییا وێ یا بچویکە و کەرەستەیێن ئەندامی دناڤدا دکێمن. ئەو رووبەرێن چاندنێ یێن ئەڤ ئاخە لێ هەین تا ڕادەیەکێ

د بچویکن ژبەرکو گەلەك کەڤر و بەر و هویرکێن وان ل سەر روویێ وان د بەربەلاڤن لەورا پێدڤی ب هندێ دکەت ئەڤ بەرە بێنە راکرن بەری کو کریارا چاندنێ ل سەر بێتە ئەنجامدان.

## ٥- ئاخا تیرا رۆژا (ئاخا دەریا ناڤەراست یا رەنگ سۆر):

ئەڤ جۆرێ ئاخا سۆر ل هەرێما کەشوهەوایێ دەریا ناڤەراست ژ کەڤرێن کلسی دروست دبیت، ئاخەکا کەڤن و کوورە و ستووراتییا وێ دگەهتە نێزیکی مێترەکی و تەڤنەکێ رێکخستنێ یێ تەقنی هەیە لێ ژ لایێ کەرەستەیێن ئەندامی یا هەژارە[٢٩] و ل وان دەڤەران دروست دبیت یێن تێکرایا باران بارینا وان یا سالانە دگەهیتە (٤٠٠-٦٠٠) ملیمەتران. ئەڤ ئاخە ل دەڤەرێن دی یێن جیهانێ دهێتە نیاسین ب ئاخا دەریا ناڤەراست یا رەنگ سۆر و گەلەگ جاران د سیفەت و جهێ هەبوونا خۆ دا دناڤ ئاخا کەستانی دا تێکەل دبیت، مگرتیا هەبوونا ڤێ ئاخێ یا هەی لێ ب رووبەرێن گەلەك کێم[٣٠] . ئەڤ ئاخە ل سەر هندەك رووبەرێن عەردی یێن بچویك ل باکوورێ باژێرکێ باتیفا ل زاخۆ هەیە زێدەباری هەردو لایێن رێکا دناڤبەرا کەشان و بێکوڤا دا، ئەڤ ئاخە دکەڤیتە بەر ئاریشا راماڵینا ئاڤی ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ، هەردیسان تووشی دیاردەیا شەقبوونێ دبیت ب تایبەت ل سەر تەختێن روویێ وێ[٣١] (تەماشەی وێنی ژمارە ٢ بکە).

## ٦- ئاخا دەڤەرێن ئاسێ و سەخت و کەڤری:

ئەڤ ئاخە ب هندێ دهێتە نیاسین کو گەلەك یا ستوور نینە و ئاخەکا پێتی و سست و کەڤرییە ئەوژی ژبەر فاکتەرێن بلنداهی و ئەڤرازیان، زێدەباری کارێ پێتیبوون و ژبەرچوونا ئاڤی ل سەر ئاستێ پتر ژ (٩٠٠) مەتران لەورا ئەڤ چەندە کارتێکرنێ دکەتە سەر ستووراتییا وێ و وەلێ دکەت ببیتە ئاخەکا گەلەك تەنك تا وی رادەی گەلەك جاران کەڤرێن مەزن ل سەر روویێ وێ یێ ژدەرڤە دەردکەڤن کو پتریا وان بەرێن کلسی و خیزی و گێچێ نە و رێژەیەکا کێم یا کەرەستەیێن ئەندامی دناڤدا هەنە[٣٢]. هەبوونا هویرکێ بەران دناڤ زێ ئاخێ دا دبیتە ئاستەنگ ل هەمبەر ب کارئینانا وێ بۆ کریارێن چاندنێ و شیانێن وێ بۆ هەلگرتنا ئاڤێ کێمتر لێ دهێن ژبەرکو ستووراتییا وێ یا تەنکە و وەلێ دکەت زویکا بکەڤیتە بەر فاکتەرێن راماڵینێ ب تایبەت ل دەمێ بارینا بارانێ، ئەڤ چەندەژی وەلێ دکەت جوتیار بەرێ خو ژێ وەرگێرن و بتنێ شڤان بۆ چەراندنا پەزی بکاربینن[٣٣]، ئەڤ جۆرێ ئاخێ ل پتریا دەڤەرێن چیایی ل پارێزگەها دهۆکێ یا بەربەلاڤە.

## ٧- ئاخا رەندەزینا (ئاخا چیایی):

ئاخا رەندەزینا ل سەر جهێن ئەڤرازی یێن ژ کەڤرێن جیری و تەباشیری پێکهاتی دروست دبیت، یانژی ژ ئاخا مارل Marl ل هەرێمێن شێدار کو دارێن گەلارێز لێ شین دبن کو جۆرەکێ دارانە بەلگێن وان ل پاییزێ دوەریێن، ئەڤ ئاخە ژ جۆرێ ئاخا کلسیە و رێژەیەکا باش یا کەرەستەیێن ئەندامی یا دناڤدا هەی ئەوژی ژبەر شرۆڤەبوونا شینکاتیان دناڤدا، رەنگێ وێ یێ رەشە و تەڤنێ رێکخستنا وێ یێ زڤرە و ئاڤ باش دناڤدا دچیتە خوارێ، پتریا جاران روویێ وێ سەرڤە ب هندەك هویرکێن بەران هاتییە نخافتن. رەنگێ ڤێ ئاخێ دناڤبەرا قەهوایێ تاری بۆ رەشی یە و دندکێن وێ وەکی گومتلکانە و نە گەلەك یا ستوورە لێ شیانێن وێ یێن بەرهەم ئینانێ دسنووردارن[٣٤]، دندکێن ڤێ ئاخێ د زڤرن و ستووراتییا وێ دناڤبەرا (١٠-٣٠) سانتیمەتراندانە و ل سەر کەڤرێن کلسی دروست دبیت. دبێژنە ڤێ ئاخێ رەندەزینا و ل پتریا ئاخێن چیایی بلند هەیە لێ ژ جهەکی بۆ ئێکێ دی یا جودایە ئەوژی ب جوداهیا فاکتەرێن بلنداهی و نزماتی و ئەڤرازیان زێدەباری تووشبوونا وان ب فاکتەرێن راماڵین و ژبەرێکچوونێ[٣٥] لێ یا باشە بۆ چاندنا داروبارێن دەریا سپی یا ناڤەراست و هندەك جۆرێن دانودکاکی لێ رووبەرێن گەلەك کێم پێکدئینیت.

**وێنەیێ (١)**
**ئاخا بەری یا تەنک- بلنداهیێن زاخۆ**



ڤەکۆلینەکا مەیدانی ل رێکەفتی ٧/ ٣/ ٢٠١٣

**وێنەیێ (٢)**
**ئاخا دەریا ناڤەراست یا رەنگ سۆر (تیرا رۆژا) ل دەڤەرا کەشان-زاخۆ**



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل رێکەفتی ٢٠١٣/١١/٢٤ هاتییەگرتن

## ٨- ئاخا دەڤەرێن دەشتی:

**ئ- ئاخا دەشتێن ئاڤرابووی:**

ئاخا ڤان دەشتان ژ ئەگەرێ رابوونا ئاڤا رووباران دروست بیت ب تایبەت ل رەخورویێن رووباران ئەوژی پشتی كو ئەو ئاخ و كەرەستەیێن دناڤ ئاڤێ دا دهێنە ڤەگوهاستن بۆ رەخورویێن وێ. ژبەر ڤێ چەندێ دهێتە هژمارتن ئاخەكا ڤەگوهاستی و خودان ستووراتیەكا مەزن و شیانێن وێ یێن بەرهەم ئینانێ یێن باشن. ئەڤ ئاخە ب شێوەیەكێ بەرفەرەهـ ل رەخورویێن رووبارێن هیزل و خابووری ل زاخۆ (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٣ بكە) و رووبارێ زێ مەزن ل دهۆكێ یا بەرەبەلاڤە. رووبەرێ ڤێ ئاخێ ل نێزیكی بەرلێڤێن رووباران بەرفەرهتر لێ دهێت. تەڤنێ رێكخستنێ یێ ئاخێ ژ جۆرەكێ باشە و پتریا وێ ژ جۆرێ ئاخا تێكەل یا هەرێ یە و یا زەنگینە ب كەرەستەیێن ئەندامی كو رێژەیا وان دگەهیتە (٣,٥٪)ێ لەورا ژی دهێتە ب كارئینان بۆ بیستانان و چاندنا دارێن خۆخ و هژیر و گەلەك جۆرێن دی یێن بەروبومێن چاندنێ. ژبەر پەیتیا باش یا ڤێ ئاخێ بوویە ئەگەرێ هندێ جهێن ئاڤەدانكرن و ئاكنجیبوونا مرۆڤان ل سەر بێنە دانان وەك باژێرێ زاخۆ ل سەر رووبارێ خابووری و هژمارەكا مەزن یا گوندان ل دەڤەرێ.

**ب- ئاخا دەشتێن خرڤەبووی:**

ب شێوەیەكێ گشتی دو جۆرێن ڤێ ئاخێ هەنە ئەوژی ب ڤی شێوەی:

**١- ئاخا دەشتێن پانكی (بەرلێڤێن چیا):**

ئەڤ ئاخە ل بەر لێڤێن چیا دروست دبیت ژ

**وێنەیێ (٣)**
**ئاخا دەشتێن ئاڤرابووی ل رووبارێ خابووری دناڤبەرا زاخۆ و باتیفا**




وێنە ژلایێ ڤەكۆلەریڤە ل سالا ٢٠١٣ێ هاتییەگرتن

ئەنجامێ خرڤەبوونا بەرمایك و هویركێن بەران ئەوێن ل چیایی دهێنە خارێ و ل سەرئێك كوم دبن. ئەڤ ئاخە ب درێژاهیا چیایی درێژدبیت لێ فرەهیا وێ ژ چیایەكی بۆ چیایەكێ دی یا جودایە و پتریا جاران فرەهیا وان دناڤبەرا (٥-١٠) كیلومەتران دایە. ئەڤ ئاخە یا زەنگینە ب هەبوونا كەرەستەیێن ئەندامی و بارینا بارانەكا زێدە لەورا دەڤەرەكا باش دروستبوونا گوندان پەیدادكەت لێ ئاخا وێ هندەك هویركێن بەر و كەڤران دناڤدا هەنە لەورا پێدڤی ب پاقژكرنێ دكەت بەری كو كریارێن چاندنێ ل سەر بێنە ئەنجامدان. ئەڤ ئاخە ل بەر لێڤێن گەلەك جۆرێن چیایێن پارێزگەها دهۆكێ دهێتە دیتن.

**٢- ئاخا دەشتێن ناڤبەرێ دا (دناڤبەرا چیایاندا):**

ئەڤ ناڤە ل سەر وان دەڤەرێن دەشتی دهێتە دانان یێن دكەڤنە دناڤبەرا دو چیایاندا، لێ دینامیكیا چێبوونا وان ژ ئەنجامێ خرڤەبوونا وان هویركێن بەران یێن ژ چیایی هاتینە خوارێ و ل دەڤەرێن نزمتر كەفتینە سەر ئێك و ب پشتی بۆرینا دەمەكێ درێژ بووینە دەشت. ئاخا ڤان دەشتان یا پرە ژ كەرەستەیێن ئەندامی و خودان ستووراتیەكا مەزنە و شیانێن وێ یێن بەرهەم ئینانێ ژی گەلەك دباشن، دیارترین دەشتێن ل پارێزگەها دهۆكێ یێن ژ ڤی جۆری وەك دەشتا سندیان و ئیستیبلان ل زاخۆ و دەشتا بامەرنێ و شێلادزێ ل قەزا ئامێدیێ و دەشتا نەهلا ل قەزا ئاكرێ و دەشتا مەمانێ ل زاویتە زێدەباری رووبەرێن دشەتی دناڤبەرا چیایێ زاوا و چیایێ سپی كو باژێرێ دهۆكێ ل سەر هاتییە دروستكرن (دهێتە هژمارتن پشكەك ژ دەشتا سلێڤانەیان)، ب شێوەیەكێ گشتی ئاخا ڤان دەشتا دناڤبەرا ئاخا قەهوایی و ئاخا كەستانی یە.

# ڤاڤارتنا ئاخا پارێزگەها دهۆكێ

ل دووڤ سرۆشتی دروستبوونا ئاخێ، ئەم دشێن ئاخێ بۆ سەر چەندین جۆران پارڤە بكەین ژ پێخەمەت تێگەهشتن و دیاركرنا پەیوەندیا دناڤبەرا جۆرێن جوداجودا یێن ئاخێ دا و دەستنیشانكرنا چەوانییا ب كارئینانا هەر جۆرەكی ژبۆ هندێ بشێن باشترین مفا ژێ وەربگرین، ئەڤ چەندەژی بۆ رۆلێ مەزن یێ زانایێ رۆسی دوكچوڤی Dokuchaev دزڤریت كو ئێكەم كەس بوو سیستەمەكێ زانستی ژبۆ ڤاڤارتنا جۆرێن ئاخێ ل سالا ١٨٨٠ێ دانای. پشتی هینگێ ئەڤ سیستەمە چەندین جاران ژ لایێ زانا و ڤەكۆلەرێن ئەوروپی و ئەمریكی هاتییە پێشخستن هەتا گەهشتیە وێ سیستەمێ بەربەلاڤ ل سالێن شێستان ل سەد سالیا بیستێ، هەتا نوكە ئەڤ سیستەمە ل چەندین وەلاتان یێ بالادەستە و دهێتە بكارئینان ئەوژی ژبەركو ب شێوەیەكێ ب سانەهی ئاخێ بۆ سەر چەندین جۆران پارڤە دكەت كو پشت بەستنێ دكەتە سەر سرۆشتێ دروستبوونا ئاخێ و رەنگێ وێ، ئەڤ سیستەمە تا رادەیەكی وەكی وی سیستەمی یە یێ ڤەكۆلەر بیورینگی ئاخا عیراقێ پێ پارڤە كری.

## ١- ڤاڤارتن ل دووڤ تەڤنێ رێكخستنێ:

مەرەم ژ تەڤنێ رێكخستنێ قەبارەیێ وان گەردانە یێن ئاخێ پێكدئینن كو پتریا جاران دناڤبەرا خیزەكێ زڤر و تەقنێ (هەرێ) دایە. ل دووڤ تەڤنێ رێكخستنێ ئاخ دهێتە پارڤەكرن ل سەر ١٢ جۆران و سێگوشە دهێتە بكارئینان بۆ نیاسینا هەر جۆرەكی (تەماشەی شێوەیێ ژمارە ١ بكە). دڤێ سێگۆشەیێ دا ئاخ ل دووڤ پێكهاتەیێن وێ دهێتە پارڤەكرن بۆ سەر سێ جۆران ئەوژی (خیز و تەقن و هەری) و هەر گوشەك ژ گوشەیێن ڤێ سێگۆشێ دەربرینێ ژ پێكهاتەیەكا ئاخێ دكەت. د ڤێ سێگۆشێ دا جۆرێن جوداجودا یێن ئاخێ دیاردبن ئەوژی كو پشتی هەرسێ جۆرێن وێ دگەل ئێك دهێنە تێكەلكرن، ئەڤ كریارە پێدڤی ب شرۆڤەكرنا نموونەیێن ئاخێ هەیە داكو هەر جورەك بێتە نیاسین و ناڤێ وێ بێتە دانان كو ناڤێ هەر جۆرەكی ب هندێ دەستپێدكەت كا رێژەیا كیژ كەرەستەی دناڤدا كێمترە، بۆ نموونە ئەو نموونەیا ئاخێ یا پێكهاتی ژ خیزی ب رێژەیا ٧٠٪ێ و تەقنێ ب

رێژەیا ٢٨٪ێ دێ هێتە ناڤکرن ب ئاخا تەقنی یا خیزی (Sand clay).

## جورێن ئاخێ ل دووڤ رێژەیا پێکهاتنا وان[٣٦]:

١- ئاخا خیزی: رێژەیا خیزی دناڤدا پترە ژ ٨٥٪ێ و یا تەقنێ ژی ١٠٪ێ و ئەوا دمینیت ژی هەڕی یە.

٢- ئاخا هەڕیێ: رێژەیا هەڕیێ دناڤدا ٩٠٪ێ و خیز ژی کێمترە ژ ١٠٪ێ و یا مای ژی تەقنە.

٣- ئاخا تەقنێ: رێژەیا تەقنێ دناڤدا پترە ژ ٤٠٪ێ و کێمتر ژ ٤٥٪ێ ژی خیزە و یا مای ژی هەڕی یە.

٤- ئاخا تێکەلۆك: پێکدهێت ژ ٥-٤٠٪ێ ژ خیزی و ٣-٢٠٪ێ تەقن و یا مای ژی هەڕی یە.

٥- ئاخا خیزی یا تێکەلۆك: رێژەیا خیزی تێدا پترە ژ ٥٠٪ێ یا تەقنێ ژی نێزیکی ١٠-٢٠٪ێ و یا مای ژی هەڕی یە.

٦- ئاخا تێکەلۆك یا خیزی: رێژەیا خیزی دناڤدا کێمترە ژ ٥٠٪ێ و رێژەیا تەقنێ ژی نێزیکی ٢٠٪ێ و هەڕی ژی نێزیکی ٣٠٪ێ یە.

٧- ئاخا تێکەل یا تەقنی: پێکدهێت ژ ٣٠٪ێ ژ تەقنێ و دناڤبەرا ٢٠-٣٠٪ێ ژی خیز و یا مای ژی هەڕی یە.

٨- ئاخا تێکەلۆك یا تەقنی یا خیزی: نێزیکی ٤٥٪ێ خیز یێ دناڤدا و دناڤبەرا ٢٠-٣٥٪ێ ژی تەقن و یا مای ژی هەڕی یە.

٩- ئاخا تێکەلۆك یا هەڕیێ: پێکدهێت ژ ٧٠٪ێ ژ هەڕیێ و یا مای ژی تەقن و خیزە.

١٠- ئاخا تێکەلۆك یا تەقنی یا هەڕیێ: پێکدهێت ژ ٦٠٪ێ ژ هەڕیێ و ٢٠٪ێ ژ تەقنێ و ٢٠٪ێ ژی خیزی.

١١- ئاخا تەقنی یا خیزی: پێکدهێت ژ ٤٥٪ێ ژ تەقنێ و ٣٥٪ێ ژ خیزی و یا مای ژی هەڕیی یە.

١٢- ئاخا تەقنی یا هەڕیێ: پێکدهێت ژ ٦٠٪ێ ژ هەڕیێ و ٤٠٪ێ ژ تەقنێ.

شێوەیێ (١)
سێگۆشەیا تەقنێ رێکخستنێ یێ ئاخێ



ل ڤێرێ هەژی ئاماژەپێکرنێ یە کو پارێزگەها دهۆکێ چ ڤەکۆلینێن تایبەتمەند نەهاتینە ئەنجامدان ژ پێخەمەت ڤاڤارتنا ئاخا پارێزگەهێ ل دووڤ پیڤەرێ تەڤنێ رێکخستنێ ژبلی هندەك رووبەرێن بچویك یێن عەردی کو پشت بەستن کریە سەر بوارێ پرۆژەیێن چاندن و بەرهەمئینانا چاندنێ بۆ هندەك جۆرێن بەروبوومان، لەورا ئەم دشێین بێژین کو ل دووڤ هندەك دیمەنێن زەڤیێن دووبارەبووی یێن پتریبا بەشێن ئاخا پارێزگەهێ، ئاخا تێکەلۆك پتر ژ هەمی جۆرێن دی یێن ئاخێ روویێ پارێزگەها دهۆکێ نخافتیە کو ئەڤ ئاخەژی یا باشە بۆ چاندنا پتریبا بەروبوومێن چاندنێ ب تایبەت دناڤ ئاخا دەشتێن ئاڤڕابوون یێن سەر رووبارێ زێی مەزن و خابوور و هیزل و دیجلەی کو ئاخا تەڤنی یا هەرێ ل بەر لێڤێن ڤان روباران یا بەربەلاڤە زێدەباری دەشتێن پانکی، لێ ئاخا خیزی بتنێ هندەك رووبەرێن کێم یێن عەردی نخافتینە ب تایبەت ل بەشێن رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ پارێزگەهێ و ب رەخ رێکا دوریانا دناڤبەرا زاخۆ و دێرەبینێ دا.

## ٢- ڤاڤارتن ل دووڤ پێکهاتەیێن ئاخێ (ڤاڤارتنا ئەمریکی یا سەردەم بۆ ئاخێ):

رێکخستنا جۆرێن ئاخێ دهێتە هژمارتن نویترین شێوازێ ڤاڤارتنا ئاخێ کو ڤەکۆلەر ل دووماهییا چەخێ بیستێ بکاردئینن و دهێتە نیاسین ب سیستەمێ ڤاڤارتنا ئەمریکی بۆ ئاخێ کو د ڤی سیستەمی دا ئاخ دهێتە پارڤەکرن بۆ سەر ١٠ جۆران. دووماهییا ناڤێ هەر جۆرەکێ ئاخێ ب پاشکرێ "سۆل" ب دووماهی دهێت و ئەڤ سیستەمە پشت بەستنێ دکەتە سەر پێکهاتەیێن ئاخێ ژبۆ پارڤەکرنێ. هەتا نوکە چ ڤەکۆلین ل عیراقێ و هەرێمی نەهاتینە ئەنجامدان ژبۆ ڤاڤرتنا ئاخا وێ ل دووڤ ڤی سیستەمی، جۆرێن ئاخێ ل دووڤ ڤی سیستەمی ئەڤەنە[٣٧]:

١- ئاخا ئینتیسۆل: ئەڤ جۆرە ئاخە ل دەمەکێ ژمێژە نینە دروستبووی و دهێتە هژمارتن ژ جۆرێن ئاخێ یێن پێشکەفتی ژ لایێ پێتاندنێڤە. پتریبا جاران دناڤ وان بەرمایکێن پرت پرتبووی دا دهێتە دیتن ئەوێن هێزا پێکڤەنسیانا وان یا لاواز وەك خیزی، هندەك ژوان دهێنە نیاسین ب (A) کو ب شێوەیەکێ ئێکسەر کەڤرێن بنیات دنخێڤیت. پتریبا جاران ل بنێ ئەڤرازیێن چیایی یا بەربەلاڤە.

٢- ئاخا فیرتیسۆل: ئەڤ جۆرە ئاخەکا بەروڤاژی یە و دەمێ شێداریبا وێ بلند دبیت و ئاڤ دچیتە دناڤدا ئەڤ ئاخەژی ڤەدبیت و قەبارەیێ وێ مەزنتر لێ دهێت و ژێك دهێتە کێشان، لێ دەمێ دبیتە هشکاتی قەبارەیێ وێ ژی بچویك دبیت و تێکدچیت، پتریبا جاران ژی روویێ وێ ژ سەرڤە دپەقیت و هندەك پەق تێدا چێدبن هەتا وی رادەی روویێ وێ هەتا دناڤدا وان پەقاندا ژی بەردەوام دبیت، دناڤ ڤێ جۆرێ ئاخێ دا رێژەیا تەڤنێ دناڤدا یا زێدەیە و پتر یا ل وان دەڤەران بەربەلاڤە یێن بەردەوام دکەڤنە بەر ئاڤڕابوونان و دکەڤنە بەر لێڤێن رووباران.

٣- ئاخا ئینسیبتیسۆل: ئەڤ ئاخە ب هندێ دهێتە نیاسین کو نویترین جۆرێ ئاخێ ژ ژ لایێ دروستبوونێ ڤە، هەردیسان تەخێن وێ یێن دروستبووی نێزیکی تەخا سەر روویێ وێنە لێ بەردەوام دکەڤیتە بەر کریارا شیشتنا ئاخێ ژ کەرەستەیێن خوێ و نەبوونا شیانێن وەرگرتنا کەرەستەیێن ژێڤەبووی.

٤- ئاخا ئەردیسۆل: ئەڤ ئاخە ژ جۆرێ ئاخێن هشکە و ژ ئەنجامێ کاودانێن کەشوهەوایی ل دەڤەرێن بیابانی یێن هشك دروست دبیت، ئەڤ ئاخە نێزیکی ٢٠٪ێ ژ سەرجەمێ گشت ئاخا سەر روویێ عەردی پێکدئینیت لێ ئەڤ جۆرە ئاخە ل پارێزگەها دهۆکێ ناهێتە دیتن.

٥- ئاخا مولیسۆل: ئەڤ ئاخە دکەیڤتە دەڤەرێن سست و پێتی، بەهرا پتر ل دەڤەرێن گۆم و گەرێن ئاڤێ هەین یا بەربەلاڤە لێ ل پارێزگەها دهۆکێ ناهێتە دیتن.

٦- ئاخا سبۆدسۆل: ئەڤ ئاخە ژ جۆرێ ئاخێن ترشی یە کو ژ ئەنجامێ کریارا نەمانا پێکهاتەیێن تفتی دناڤدا دروست دبیت هەتا وەلێ دهێتە

دبیتە ئاخەکا ترشی و بتنێ ل دەڤەرێن دارستانێن سنوبەری (دارستانێن کاژان) و دارستانێن دارێن بەلگوەرێن هەیە کو ل دەڤەرێن سار دهێنە دیتن. ئەڤ ئاخە ل بەرشێن باکوور و باکوورێ رۆژئاڤایێ پارێزگەها دهۆکێ دهێتە دیتن.

٧- ئاخا ئەلفیسۆل: ئەڤ ئاخە یا زەنگینە ب هەردو توخمێن ئەلەمنیوم و ئاسنی و چەندین تەخێن تەقنێ یێن کەفتیە سەر ئێك دناڤدا هەنە، ئەڤ ئاخە ل وان دەڤەران هەیە یێن پلا شێداریا وان ناڤنجی و کەشوهەوایەکێ گەرم هەی کو ب کێمی بۆ ئەڤ کەشوهەوایە ژ سێ هەیڤان کێمتر نەبیت داکو یێ گونجایی بیت بۆ شینبوونا داروبار و شینکاتی ل سەر. ژبەر سرۆشتێ وێ، ئەڤ ئاخە ب رێژەیەکا کێم ل هندەك دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ دهێتە دیتن.

٨- ئاخا ئەلتیسۆل: ئەڤ ئاخە گەلەك دکەڤیتە بەر کریارا شویشتنێ داکو ژ کەرەستەیێن خوێ قورتال بیت، هەردیسان ئەڤ ل پارێزگەها دهۆکێ ناهێتە دیتن.

٩- ئاخا ئوکسیسۆل: دناڤ ڤێ ئاخێ دا رێژەیەکا مەزن یا ئوکسیدێن کانزایی هەنە.

١٠- ئاخا هیستوسۆل (ئاخا ئەندامی): ئەڤ ئاخە ب شێوەیەکێ بنەرەتی ژ کەرەستەیێن ئەندامی پێکدهێت، دبیت دەربرینێ ژ ئاخا شەرنوزمی ل پارێزگەهێ بکەت ئەوا رەنگێ وێ ب سەر رەشی ڤە.

## راماڵینا ئاخێ:

کریارا ژناڤچوون یان خۆخۆرانا ئاخێ پەیدادبیت ژبەر فاکتەرێن سرۆشتی یانژی ژبەر چالاکیێن مرۆڤان، ئەڤ کریارە شیانێن عەردی کێم دکەت ب تایبەت شیانێن وێ بۆ بەرهەم ئینان و چاندنێ. کریارا راماڵینی دهێتە دیارترین کریارا ژناڤچوونا ئاخێ کو کریارەکا سرۆشتی یە دبیتە ئەگەرێ ڤەگوهاستنا ئاخێ ژ جهەکی بۆ جهەکێ ب هاریکاریا فاکتەرێن ڤەگوهاستنێ وەك لڤینا بای و ئاڤێ و بەستی و لڤینا گەردێن ئاخێ ب هاریکاریا هێزا راکێشانا عەردی، ئەڤ فاکتەرە هەمی ل دەڤەرێن چیایی هەنە بتنێ لڤینا هەوای نەبیت کو ل دەڤەرێن بیابان هەبە لێ ل هندەك دەڤەرێن دیژی هەیە ب تایبەت ل وان دەڤەرێن مرۆڤ ئاخێ ب شێوەیەکێ نەدروست بکاردئینیت وەك نەهێلانا دارستانان و برینا داروباران و زێدەچەراندنا پەزی ل هندەك جهان و بەرفەرهبوونا باژێران ل سەر دەڤەرێن چاندنێ.

یا زانایە کو راماڵینا ئاخێ ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی یا جودایە و پشت بەستنێ دکەتە سەر چەندین فاکتەران وەك پلا تیژاتی یان ئەڤرازیا عەردی و هەبوونا شینکاتیێن سرۆشتی و بارینا بارانێن بۆش یێن ژ نیشکەکێڤە و کێلانەکا نەیا دورست (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٤ بکە). برینا داروباران ل دەڤەرێ گەلەك یا بەربەلاڤ بوو ب تایبەت د وان سەردەمێن ئالۆز و ب زەحمەت یێن تووشی دەڤەرێ بووین ل دووماهیا چەرخێ بووری ئەوژی ژبەر نەبوونا کەرەستەیێن سوتەمەنیێ دماوەیێ قەیراناندا لەورا خەلك نەچاردبوو داران ببریت و ب کاربینیت، لێ پشتی سالا ٢٠٠٠ پێشکەفتنەکا باش دبوارێ ڤەژاندنا دارستانان ل پارێزگەهێ پەیدابوو ئەوژی ژبەر وان یاسایێن هاتینە دانان ژبۆ نەهێلانا دیاردا برینا داران و باشبوونا کاودانێن ئێمناهی و ئابووری ل هەرێمێ.

هەردیسان چالاکیێن مرۆڤی گەلەك جاران دبنە ئەگەرێ راماڵینا ئاخێ ب تایبەتێ دەمێ مایێ خۆ د گوهۆرینا سیستەمێ ژینگەها دەڤەرێ دا دهێتە کرن وەك ڤەکرنا رێکان و ئاڤەدانکرنێ ل ناڤ ژینگەهێن چیایی ب تایبەت وان ئەڤرازیێن گەلەك تیژ و خار کو ب ڤی رەنگی کریارا راماڵینی زێدەتر لێ دهێت. (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٥ بکە).

هەردیسان پترین کاریگەریێن راماڵینا ئاخێ ل وەرزێن شێداریێ رویددەن ب تایبەت دەمێ باران و بەفرێن بوش دهێن، ئەم دشێین ڤی رۆلی د ڤان خالان دا دیاربکەین:

١- پتریا دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ تێکرایا باران بارینا وان یا سالانە دگەهیتە (٥٠٠ بۆ ٦٠٠)

ملیمەتران ل سێمێلێ و دهۆكێ ل دووڤ ئێك، هەردیسان دناڤبەرا (٧٠٠ بۆ ٧٥٠) ملیمەتران ل زاخۆ و ئامێدیێ، لێ ئەڤ تێكرایە دگەهیتە پتر ژ (٨٠٠) ملیمەتران ل كانی ماسێ و دەڤەرێن سنوری.

٢- هەبوونا جوداهییەكا بەرچاڤ د برەیا بارانێ دا ژ سالەكێ بۆ ئێكا دی (تەماشەی خشتەیێ ژمارە ٢ بكە). هەردو بنگەهێن زاویتە و دهۆك تێكرایا باران بارینا وێ گەهشتبوو (١٥٧٨) ملیمەتران ل سالا بارانی (١٩٩١/١٩٩٢) ژ چەرخێ بۆری، لێ ل بنگەهێ دهۆكێ كێمترین برە ل وەرزێ بارانی یێ سالا (٢٠٠٧/٢٠٠٨) توومارکربوو کو ئەوژی بتنێ (٢١٦) ملیمەترێن بارانێ بوون. ئەڤ چەندەژی رەنگڤەدانا جوداهیا شیانێن كربارا رامالینا بارانێ ب شێوەیەكێ راستەخۆ دكەت ڤێجا چ ئێكسەر ل دەمێ بارانا بارینێ بیت یانژی ل دەمێ بۆرینا ئاڤێ بیت ل سەر روویێ ئاخێ.

٣- ژ گرنگترین وان تشتێن هاتییە دیتن ئەوبوو یێ ژ ئەنجامێ وێرانكرنا بارانێ پەیدابووی ڤێجا چ ئەڤ بارانە ب شێوەیەكێ بەردەوام هاتبیت و چەند رۆژان ڤەكێشابیت یان ب شێوەیەكێ گەلەك بهێز باریت ددەمێ كێم دا، ب شێوەیەكێ گشتی كەشوهەوایێ دهۆكێ ب ڤان سالوخەتان دهێتە نیاسین، بۆ نموونە ل بهارا سالا ٢٠١٣ێ ل پارێزگەها دهۆكێ و ژ ئەنجامی باران بارینەكا بهێز د ماوەیێ كێمتر د دو دەمژمێراندا چەندین ئاڤرابوویێن مەزن پەیدابوون كو بوونە ئەگەرێ رامالینا ئاخێ و كەفتنا كەڤران زێدەباری وێرانكرنا رووبەرێن مەزن یێن چاندنێ و ژناڤبرنا ب دەهان مالان ل دەڤەرێن نزم و نێزیكی جهێ رامالینا ئاڤێ.

**وێنەیێ (٤)**
**رامالینا ئاخێ ژبەر هاتنا بارانێن بۆش (نهالا سبنە یا رۆژهەلاتی- دێرەلوك)**



وێنە ژ لایێ ڤەكۆلەریڤە ل ئادارا ٢٠١٣ هاتییەگرتن

وێنەیێ (٥)
کاریگەریا ڕامالینا ئاڤی یا ب هێز- باکوورێ باتیفا-زاخۆ




وێنە ژ لایێ ڤەکولەریڤە ل ڕێکەفتی ٢٠١٣/٣/١٧ هاتییەگرتن

٤- هەر د ڤی بواری دا ئەم دشێین ئاماژێ بکەینە وان توومارێن بنکەهێ زاخۆ کو ل ڕێکەفتی ١٩٧٢/٢/٦ بتنێ (٩٨,٥) ملیمەتر و ل شواتا ١٩٨١(٣٨) بتنێ (٤٢) ملیمەتر هاتینە توومارکن. ڤەکۆلین دیاردکەن کو هاتنا بارانێ ب ڕێژەیا (٣٠) ملیمەتر د دەمژمێرەکێ دا شیانێن مەزن یێن هەین بۆ ڕامالینا ئاخێ[٣٨].

هەردیسان ئەم دشێین ئاماژێ ب دەینە وێ ڤەکۆلینا هاتییە ئەنجامدان ژ لایێ ڤەکولەر (المالکی ٢٠٠٦)[٣٩] ل سەر دەڤەرێن چیایی و نیمچە چیایی، ئەو گەهشتیە وی ئەنجامی کو یا ڕامالینەکا ب هێز ل دەڤەرێن باشوور و ناڤەراستا پارێزگەها دهۆکێ یا بالادەستە، ئەڤ ڕامالینە ل بەشێن باکووری گەلەک ب هێزترە ب تایبەت دەڤەرێن چیایێن بلند هەین هەر ژ چیایێ کیرا و دیر (سنوورێ باشوورێ ڕۆژئاڤایی) تا دگەهیتە چیایێ گارە و ئاکرێ (سنورێ باشورێ ڕۆژهەلاتی) و بەرەڤ باکوری تا سنوورێ عیراق و تورکیا.

رولێ مەزن یێ کو باران دگێریت د کریارا ڕامالینا ئاڤی دا ڤێجا چ ب شێوەیەکێ ئێکسەر بیت وەك ڕامالینا چیکێن بارانێ (ڕامالینا بارانی)، یانژی ب شێوەیەکێ نەئێکسەر ئەوژی ژبەر بۆرینا ئاڤێ ل سەر ئاخێ. هەژی گوتنێ یە کو دەمێ چیکێن بارانێ دکەڤنە سەر ڕوویێ ئاخێ ئێکسەر دندکێن ئاخێ ژێکڤەدکەت یانی دبیت پیچەکێ ژ جهێ وی بەت، ئەم دشێین تێبینیا هندەك دەرزێن ئاخی بکەین ب تایبەت پشتی بۆرینا هندەك ڕەشەبایێن بارانێ ل سەر ڕوویێ تەڤنا سست. د ڤی بواری دا (Cook and Doornkam ١٩٧٣) ئاماژێ دکەتە ڕۆلێ چیکێن بارانێ د ڕامالینێ دا کو نێزیکی ٩٠٪ێ ژ دندکێن ئاخێ

**خشتەیێ (٢)**
**بلندترین و نزمترین رێژەیێن باران بارینێ ب هندەك بنکەهێن پاریزگەها دهۆکێ**

| بنکەهـ | بلندترین | سال | نزمترین | سال | تێکرا | سال |
|---|---|---|---|---|---|---|
| زاویتە | ١٥٨٨ | ١٩٩١/١٩٩٢ | ٤٢٦ | ٢٠٠٧/٢٠٠٨ | ٧٨٧,٨ | ١٩٩١ـ ٢٠١٠ |
| مانگێشك | ١٠٢٠ | ١٩٩١/١٩٩٢ | ٣١٠ | ٢٠٠٧/٢٠٠٨ | ٦٤٦ | ١٩٩١ـ ٢٠١٠ |
| دهۆك | ٨٩١ | ١٩٩٢/١٩٩٣ | ٢١٦ | ٢٠٠٧/٢٠٠٨ | ٥٧٤ | ١٩٩١ـ ٢٠١٠ |
| زاخۆ | ٧٩٤ | ٢٠١٢/٢٠١٣ | ٣٥٨ | ٢٠٠٧/٢٠٠٨ | ٦٥٢ | ٢٠٠٠ـ ٢٠١٣ |
| سەرسنك | ١٢٣٢ | ١٩٩١/١٩٩٢ | ١٥٨ | ١٩٩٩/٢٠٠٠ | ٦٩١ | ١٩٨٠ ـ ٢٠٠٩ |
| ئاكرێ | ١٣٧٨ | ١٩٥٧/١٩٥٨ | ٣٣٨ | ٢٠٠٧/٢٠٠٨ | ٦٣٣ | ٢٠٠٠ ـ ٢٠٠٩ |

- حکومەتا هەرێمێ کوردستانێ، وەزارەتا گەیاندن و ڤەگوهاستنێ، رێڤەبەریا کەشناسیا دهۆکێ، داتایێن نەبەلاڤکری (سالێن ژێکجودا)
- حكومة أقليم كوردستان، وزاره النقل والمواصلات، مديرية الانواء الجوية، دائرة انواء دهوك، بيانات غير منشورة (سنوات متفرقة).

دکەڤنە بەر ڤێ کارتێکرنێ کو قەبارەیێ وان دناڤبەرا (٠,١-٠,٥) ملیمەتران دا، ئەوژی ژبەر نەرمی یا ڤان کەرەستەیان و ب سانەهی ڤەگوهاستنا وان[٤٠]، لێ گەلەك یا ب زەحمەتە ئەم تێبنیا ڤێ کارتێکرنێ ب شێوەیەکی مەیدانی بکەین، لێ ئەم دشێین ڤێ چەندێ ب هندەك هاوکێشەیێن بیرکاریێ یێن تایبەت دیار بکەین کو هاتینە دانان بۆ دیارکرنا رۆل و کارێ بارانێ ل سەر ئاخێ، دیارترین ئەڤ هاوکێشە کو ل سەر داتایێن بنکەهێ کەشناسی یێ زاخۆ هاتینە بجهئینان ئەوژی ب ڤی رەنگی:

**هاوکێشا دوگلاس[٤١]:**

$$S=\frac{1.65(0.03937\ P)^{2.3}}{1+0.0007(0.03937\ P)^{3.3}}$$

ب رەنگەکی کو:

S = قەبارەیێ رامالینێ م٣/کم٢/سال
P = بارانا چالاك یا سورنسویس

بارانا چالاك یا سورنسویس ل دووڤ ڤێ هاوکێشەیێ دهێتە دەرئێخستن:

$$P=1.65(R / T+12.2)10/9$$

ب رەنگەکی کو:

P = بارانا چالاك/ملم
R = بارینا سالانە /ملم
T = تێکرایێ گەرماتییا سالانە /م

ژبۆ ب دەستەڤەئینانا قەبارەیێ رامالینا ئاخێ یا سالانە م٣/کم٢/سال، ئەم دێ ئەنجامێ هاوکێشا دوگلاسی ل سەر ژمارە (١٠٠٠) دابەش کەین و پاشی دێ ئەنجامێ وێ لێکدانی (٣٦٥) رۆژان کەین.

و ژبۆ پیڤانا قەبارەیێ رامالینێ ل دووڤ هاوکێشا بەری نوکە ل دەشتا سندی، دڤێت ل دەستپێکێ بارینا چالاك دەرێخین ل دووڤ هاوکێشا بەری نوکە مە دیارکری دگەل سەرجەمێ بارانێن باری و تێکرایێ گەرماتییا سالانە. ل دووڤ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٣) بارینا چالاك یا دەڤەرێ گەهشتیە (٥٠,٦٢)، ل دووڤ ڤان پێزانینان ئەنجامێ هاوکێشا دوگلاسی ل دەشتا سندی دبیتە(٢,٩٢) م٣/کم٢/سال.

### ٢- هاوکێشا لانکباس و شوم[٤٣] (Langbein and Schumm ١٩٥٨):

$$E = \frac{1.631(0.03937\ P)^{2.3}}{1+ 0.0007(0.03938\ P)^{3.3}}$$

ب ڕەنگەکی کو:
E= بەرهەمێ خرڤەبوویی م٣/کم٢/سنە
P = بارینا چالاك یا سورنسویس
ژمارە دەربرینێ ژ فاکتەرێ بەرەڤانیا شینکانی دکەن

ل دووڤ بارینا چالاك یا د هاوکێشا بەری نوکە مە ئاماژێ پێکری، ئەنجامێ هاوکێشا لانکباس و شومی گەهشتە(٢,٨٨) م٣/کم٢/ساڵ ، ئەڤ ئەنجامە هەر نیزیکی ئەنجامێ هاوکێشا دوگلاسی یە، ئەنجامێن ڤان هەردو هاوکێشان دیاردکەن کو ڕامالینا ئاخێ ل دەڤەرێ د ئاستەکێ مەترسیدار دا نینە، ژمارە ئەڤ هاوکێشە سەرەدەریێ دگەل تێکرایان دکەت و فاکتەرێن دی ل بەر چاڤ ناوەرگریت وەك گوهۆرینێن بلندی و نزمیێ و جۆرێ ئاخێ و چڕیا شینکاتیبان ل سەر ئاخێ. لێ ئەو دورهێلێ ڕاستەڤینە وەکی ئەنجامێ هاوکێشێ نینە. هەردیسان ئەنجامێ هاوکێشا (فورنیە)ژی چ جوداهی دناڤبەرا ئەنجامێن هاوکێشێن بەری نوکە نینە ژبەرکو ئەوژی پشت بەستنێ دکەتە سەر گوهۆرینێن بارانێ بتنێ بێی ل بەرچاڤ وەرگرتنا بارینا بارانێن بهێز یان قەبارەیێ بارینا وێ.

### ٣- هاوکێشا فورنیە[٤٤] (Four nier ١٩٦٠):

$$R= F \left( \sum^{12} \frac{P^2}{P} \right)$$

ب ڕەنگەکی کو:
R = شیانێن ڕامالینێ یێن بارینا بارانێ
P = برا بارینا هەیڤانە
p = برا بارینا سالانە / ملم .

زانا فورنێ (Fournier ١٩٦٠) شیانێن ڕامالینێ یێن باران بارینی ل دووڤ پلا بهێز بارینێ ل دووڤ ڤی شێوەی رۆهن دکەت:

| پلا بهێزیا ڕاماڵینێ | کارتێکرن |
|---|---|
| کێمتر ژ ٥٠ | لاواز |
| ٥٠ ــــ ٥٠٠ | ناڤنجی |
| ٥٠٠ ــــ ١٠٠٠ | بلند |
| پتر ژ ١٠٠٠ | گەلەك بلند |

پشتی بجهئینانا ڤێ هاوکێشێ ل سەر داتایێن بارانێ ل بنگەهێ زاخۆ (تەماشەی داتایێن خشتەیێ ژمارە ٣ بکە) دیاردبیت کو دەڤەرا زاخۆ ژبەر ڕامالینەکا ناڤنجی دنالیت ب ڕەنگەکی کو پلا هێزیا باران بارینێ لێ دگەهیتە (١٠٠,٥)، و ئەگەر ئەم ڤێ ئەنجامی دگەل ئەنجامێن هاوکێشێن بەری نوکە هەڤبەر بکەین دێ بینین کو چ مەترسییا ڕامالینا بارانێ ل دەڤەرێ نینە و ئەڤ چەندەژی دەربرینێ ژ سرۆشتێ جیولوژی یێ بالادەست ل پتریا دەڤەرێن پارێزگەهێ دکەت.

**خشتەیێ (٣)**

**هێزا رامالینێ (الحتية) یا بارینێ ل بنکەهێ زاخو دماوەیێ ناڤبەرا (١٩٧٧-٢٠٠٥)**

| هەیڤ | کانینا دوێ | شوبات | ئادار | نیسان | گولان | خزیران | تیرمەهـ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێکرایێ بارینێ | ١٢١,٤ | ١٠٧,٥ | ١١٦,٧ | ٩٢ | ٣٤,١ | ١,٦ | — |
| $P^2$ | ١٤٧٣٧,٩ | ١١٥٥٦,٢ | ١٣٦١٨,٩ | ٨٤٦٤ | ١١٦٢,٨ | ٢,٥٦ | — |
| $\frac{P^2}{p}$ | ٢١ | ١٦,٤٧ | ١٩,٤١ | ١٢,٠٦ | ١,٦٥ | — | — |
| هەیڤ | تەباخ | ئیلون | چریا ئێکێ | چریا دووێ | کانینا ئێکێ | p | |
| تێکرایێ بارینێ | ٠,٢ | ٠,٢١ | ٣٠ | ٨٤,٤ | ١١٣,٥ | ٧٠١,٦٤ | |
| $P^2$ | ٠,٠٤ | ٠,٠٤٤ | ٩٠٠ | ٧١٢٣,٣ | ١٢٨٨,٢ | R | |
| $\frac{P^2}{p}$ | — | — | ١,٢٨ | ١٠,١٥ | ١٨,٣٦ | ١٠٠,٥٨ | |

ل دووڤ ئەڤ چەندا بەری نوکە ئەم دشێین ئاماژێ ب مەترسیا رامالینا ئاڤی ل سەر ئاخا پارێزگەها دهۆکێ بکەین، ئەم دشێین کاریگەریا وی دڤان خالان دا کورت بکەین:

١- رامالینا رۆیی: دهێتە هژمارتن ئێکەم قۆناغا رامالین تێدا دبۆریت کو تەخەکا تەنك ل سەر روویێ عەردی دناڤ رووبەرەکێ بەرفرەهـ یێ عەردی دا رادکەت، ئەڤ دیاردەیە ل وان جهان پەیدادبیت یێن پلا تیژاتیبا وان یان ئەڤرازیبا وان یا کێم وەك دەڤەرێن دەشتا سندی و ئاکرێ و سلێڤانەی، زێدەباری دەڤەرێن دەشتی یێن پانکی و دەشتێن ئاڤرابوونان یێن گرێدای ب رووبارێ خابوور و دیجلە و زێ یێ مەزن ڤە.

٢- رامالینا خشتەیی: ئەڤ رامالینە هینگێ پەدادبیت دەمێ هێزا رامالینا رۆیی ب هەڤبەرکن دگەل یا بەری نوکە مەزنتر بیت، ژ ئەنجامێ وێ هندەك جۆك و گەرێن ئاڤێ دروست دبن. ئەڤ چەندە ل دەڤەرێن تیژاتیبا وان ناڤنجی دروست دبیت ب تایبەت ل دەڤەرێن هێلێن دابەشکرنا ئاڤێ.

٣- رامالینا دەرزاندنێ (شەقبونێ): دهێتە هژمارتن مەترسیدارترین قۆناغا رامالینێ ژبەرکو باران هێزا خۆ هەمیێ ل سەر دەڤەرەکا دەستنیشانکری دکەت کو ژ ئەنجامێ وێ هندەك دەرز یان شەق دروست دبن و ب بۆرینا وەختی کووراتی و فرەهیا ڤان دەرزان مەزنتر لێ دهێت و د ئەنجامدا تەخا روویێ ئاخێ دهێتە راکرن، ئەڤ دیاردە ل دەڤەرێن گەلەك تیژ پەیدادبیت وەك ئەڤرازیێن چیایان، پتریا روویێ ئاخا پارێزگەها دهۆکێ ژبەر ڤێ دیاردێ دنالیت (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٦ بکە).

هەژی ئاماژەپێکرنێ یە کو ئەنجامێن هندەك ڤەکۆلینان ل دۆر سرۆشتێ پەیوەندییا دناڤبەرا رامالینا ستووراتیبا ئاخێ و شیانێن بەرهەم ئینانا ئاخێ دیار دکەن کو پەیوەندییەکا بەروڤاژی یا هەی دناڤبەرا ستووراتیبا ئاخێ و شیانێن بەرهەم ئینانا بەروبوومێن دانودکاکی. ئێك ژ ڤەکۆلینان دیاردکەت کو رامالینا ب برا (٧,٥) ملیمەتران ژ ستووراتیبا روویێ ئاخێ راکەت ژ ئەگەرێ رامالینا ئاڤی دبیتە ئەگەرێ کێمکرنا بەرهەمئینانێ بەروبوومێ گەنمی و جەهی ب رێژەیا (٢١٪)ێ، هەردیسان ئەڤ بەرووبومە ب رێژەیا (٥٨٪)ێ کێم دبیت ئەگەر رامالین گەهشتە نێزیکی (١٥) سانتیمەتران ژ ستووراتیبا روویێ ئاخێ. هەردیسان ڤەکۆلینەکا دی دیاردکەت کو ئەڤ هەردو بەربوومە ب رێژەیا (٢٧,٣٪)ێ کێم دبن دەمێ تووشی رامالینەکا ناڤنجی دبن و ب رێژەیا (٦٥,٤٪)ێ کێم دبن دەمێ تووشی رامالینەکا ب هێز بن[٤٥].

**وێنەیێ (٦)**
**ڕامالینا ئاڤی یا دەرزان- باتیفا (زاخۆ)**



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل ڕێکەفتی ٢٠١٣/٣/١٧ هاتییەگرتن

ئەڤ چەندا بەری نوکە مەترسییا ڕامالینێ و ڕۆلێ وێ د وێرانکرنێ دی دیارکەت، ژبەر هندێ پێدڤییە هندەك پێرابوونێن گرنگ بێنە ئەنجامدان، هەردیسان یا دڤێت دیمەنێ عەردی بالادەست ل دەڤەرێ ل بەرچاڤ بێتە وەرگرتن ژبۆ پاراستنا ئاخا وێ ژدیاردا ڕامالینێ. هەردیسان دڤێت ڕێڤەبەرێن ڤان جهان دەست ب هندەك ڕێك و شێوازان بکەن ژبۆ کێمکرنا ڤێ دیاردێ ژبەرکو بەشەکێ مەزن ژ پارێزگەها دهۆکێ ژبەر دیاردا ڕامالینا ئاڤی دنالن، ب تایبەت دەڤەرێن تیژاتییا وان مەزن. ژبۆ کێمکرنا کاریگەریا ڤێ دیاردێ پێدڤییە ئەڤ خالە ل بەرچاڤ بێنە وەرگرتن:

١- ب کارئینانا سیستەمێ مالکان ل دەڤەرێن پلا تیژاتییا وان یا مەزن (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٧ بکە).

٢- ب کارئینانا سیستەمێ چاندنێ یێ کەنتوری.

٣- پاراستنا ئاستێن جێگیر یێن توخمێن خۆراکی و کەرەستەیێن ئەندانی یێن دناڤ ئاخێ دا.

٤- ب کارئینانا سیستەمەکێ چەرینێ یێ ڕێکخستی کو شڤانێن پارێزگەهێ پەزێ خۆ ل سەر بەرمایکێن گیایی دچەرینن ئەوژی ژ پێخەمەت کێمکرنا دیاردا ڕامالینێ.

٥- کونترۆلکرن ل سەر لڤینا بارانێ و ئاڤاکرنا ڕێگرێن پەحن ل هەمبەر ئاڤێ کو دبنە ئەگەرێ کێمکرنا هێزا لەزاتییا بۆرینا ئاڤێ.

٦- زێدەرکرنا چاندنا شینکاتی و داروباران و جۆرێن دی یێن شینکاتی کو دبنە ئەگەرێ زێدەبوونا پێکڤەمانا ئاخێ و نەهێلانا ڕامالینێ.

## ١- چاندنا كەنتوری:

مەرەم ژێ کێلانا عەردی یە دگەل هێلێن کەنتوری، ئەڤ چەندە پتر یا گونجایە بۆ عەردان یێن ئەڤرازیبان وان یا کێم ژبەرکو ئەڤ رێکە دبت ئەگەرێ کێمکرنا رامالینا ئاخێ ئەوژی ب رێکا گرتنا چوونا ئاڤێ ل سەر ئەڤرازیبان و زێدەکرنا دەلیڤا پالاڤتا ئاڤێ دناڤدا، کێلانا عەردی دگەل ئاراستەیێ ئەڤرازیبان یان نشیڤیبان شاشیەکا مەزنە ژبەرکو دبیتە ئەگەرێ پەنگینا ئاڤێ ل سەر وێ تیژاتیێ و پاشی شیانێن وێ بۆ رامالینا ئاخێ زێدە دکەت. ئەم دشێن تێبینیا هەبوونا ڤی جۆرێ کێلانێ بکەین ل هندەك دەڤەرێن پارێزگەهێ ئەوژی ژ ئەنجامێ ئەزموونێن وان یێن کەڤن.

## ٢- چاندنا شەریتی:

ئەڤ جۆرە دهێتە هژمارتن باشترین رێك بۆ کێلانا عەردی و پێکدهێت ژ هژمارەکا شریت یان خیچێن لێکگوهۆر ژبۆ هژمارەکا جۆرێن جوداجودا یێن بەروبوومێن چاندنێ کو ل سەر هێلێن کەنتوری دهێنە چاندن کو ژ لایێ خۆڤە ناهێلیت ئاخ ل جهێن ئەڤرازی ب رامالیت. د ڤێ رێکێ دا زەڤیا عەردی دهێتە دابەشکرن بۆ سەر چەندین پارچێن درێژ یان یێن لاکێشەی یێن تا رادەیەکی مەزن، ژ لایێ فرەهیێ ژی ڤە پەیوەندی یا هەی ب فاکتەرێن (ئاخ، برا بارینا بارانێ، ئەڤرازی و نشیڤی)، ب ڤێ رێکێ ئەم دشێن رامالینا ئاخێ کێم بکەین و خو ژ چێبوونا گۆمێن ئاڤێ قۆرتال کەین.

گرنگیا ڤێ ئێکێ یا د هندێ را کو دبیتە ئەگەرێ کێمکرنا تێکرایێن رامالینا ئاخێ ژبەرکو شریتا ئێکێ برەکا مەزن یا رامالینێ دگریت ل دەمەکی شریتا تژی پشکا دی دگریتن، لەورا ئەڤ رێکە گەلەك یا چالاکە ژبەرکو دبیتە ئەگەرێ کێمکرنا مەترسیا رامالینێ ل سەرێ ئاڤرازیان، ئەڤ رێکە دهێتە بکارئینان ل دەمێ چاندنا بەروبوومێن ژێکدوێر ل سەر وان زەڤیێن

**وێنەیێ (٧)**
**رێگرێن بەری ژبۆ کێمکرنا پلا تیژاتیا ئاخێ – گەرەگو - سەرسنك**



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل رێکەفتی ٢٠١٤/٩/١٠ هاتیبەگرتن.

عەردی یێن دەلیڤا راماڵینێ لێ هەی كو دشیان دا نەبیت ب رێكا چاندنا كەنتوری بتنێ بێتە پاراستن، ئەڤ رێكە ل وان ئەڤرازییان دهێتە بكارئینان یێن پلا وان دناڤبەرا (٦-١٥٪)ێ یانژی پتر ئانكو (٣,٤-٨,٥) و پتر، هەردیسان ل وان دەڤەران یێن بارانەكا بووش لێ دباریت[٤٦].

## ٣- مشارێن كەنتوری:

ئێكە ژ رێكێن چالاك ل سەر روویێ ئەڤرازییان بۆ كێمكرنا راماڵینا ئاڤی یا رۆیی كو ژ لایێ خۆڤە دبیتە ئەگەرێ كێمكرنا راماڵینا ئاخێ ئەوژی ب رێكا گرتنا ئاڤێن بارانا كو دەلیڤێ دەتێ دناڤ تەخێن ئاڤێ دا بێتە پالافتن. مشار پێكدهێت ژ دانانا شوستەكێ ژ بەران یان عەردی كو ب شێوەیەكێ پارچە پارچە دگەل ئەڤرازیێ دهێتە دانان و مەرەم ژ دانانا مشاران ب كارئینانا عەردێ ئەڤرازیانە ژبۆ چاندنێ ب شێوەیەكێ باشتر و چالاكتر، ئەڤ چەندەژی ژ ئەنجامێ كێمكرنا ئەڤرازییا دهێت ئەوێن كو ئاڤ ل سەرا دبۆریت و ئەڤ ئاڤە دهێنە هەلگرتن بەری كو ب ل سەر وی عەردی بچیت و هوسا ئاستێ راماڵینا راماڵین و داماڵینا ئاخێ بۆ كێمترین ئاست دهێتە كێمكرن، هەردیسان ئەڤ چەندە ژ لایێ خۆڤە دبیتە ئەگەرێ باشترلێكرنا سیستەمێ شێداریێ یێ ئاخێ ل سەر لێڤێن ئەڤرازییان كو دەلیڤا وەبەرهێنانێ بۆ بوارێ چاندنێ دهێتە دان[٤٧]. ئەم دشێین تێبینییا هەبوونا هژمارەكا ڤان مشاران بكەین ل دەڤەرێ وەك ئاشەوا و گەرەگو و دەشتا سپنە و بلنداهێن زاخۆ و كەشان، زێدەباری چەندین دەڤەرێن دی (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٨ بكە).

**وێنەیێ (٨)**
**رێكا مشاران ل مشارێن وەلاتێ چینێ**



هەردیسان ژ مفایێن مشاران ئەوە کێمکرنا چالاکییا ڕامالینێ ل جهێن چاندنێ ب هەڤبەکرن ل جهێن مشار لێ نەهاتینە ل کارئینان، ئەڤ چەندەژی دبیتە ئەگەر ئەو عەرد ب چڕیەکا بلند بێتە بکارئینان، هەردیسان مشار دبنە ئەگەرێ کێمبوونا چوونا ئاڤێ ل سەر ئەڤرازیان و ئەڤ چەندە ماوەیەکێ زێدەتر ددەتە شینکاتی دناڤ ئاخێ دا گەشە بکەت، هەروەسا ئاڤا زێدە دناڤبەرا کەنالاندا دهێتە ڤەگوهاستن و ل سەر هەمی زەڤیان بەربەلاڤ نابیت و هوسا مشار دبنە ئەگەرێ پاراستنا شێدارییەکا ناڤنجی یا باش دناڤ ئاخێ دا[٤٨]. پتریا ئەڤرازیێن پارێزگەها دهۆکێ ژبەر ئاریشا ڕامالینێ دنالن ژبەرکو ئەڤ سیستەمێ چاندنێ لێ نەهاتییە بکارئینان ژبلی هندەك رووبەرێن سنووردارنەبن کو هاتینە بکارئینان بۆ چاندنا بیستانان ب تایبەت ژی دارێن تری ل سەر لێڤێن هندەك نهالان ل دەڤەرا مانگێشك.

## ٤- سکرێن بچویك:

سکرێن بچویك دەربرینێ ژ هندەك دیوارێن کەڤران دکەن ئەوژی ب دانانا بەران ل سەر ئێك و ب هاریکارییا هندەك کەرەستەیێن پێکڤەمانێ وەك تەقنێ یان چیمەنتویێ پێکڤە دا دهێنە نساندن و درێژاهییا وان دگەهیتە چەند مەترەکان و ب فرەهیەکا گونجایی، ژبەر ڤێ چەندێ سکران چەندین مفا هەنە وەك عەمبارکرنا ئاڤێن روباران داکو ب هەروە نەچیت ل دووڤدا ئەڤ ئاڤە دهێتە پالافتن و دناڤ هندەك عەمبارگەهان دهێتە هەلگرتن، هەردیسان کریارا ڕامالینا ئاڤی کێم دکەن، ل پارێزگەها دهۆکێ ب دەهان سکران هەنە وەك سکرێ ئاشەوا، سپنە، گەلی (مام شڤان تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٩ بکە) و کەشکان و گەلەکێن دی. هەردیسان ئەو ئاڤا ل پشت ڤان سکران دهێتە خرڤەکرن بۆ مەرەمێن چاندنێ و ب ئاڤدانا گیانەوەران دهێنە بکارئینان.

**وێنەیێ (٩)**
**سکرێ مام شڤان**



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل ڕێکەفتی ٥/ ٣/ ٢٠١٣ هاتییەگرتن

## پەراويز:


١. صلاح حميد الجنابي، سعدي علي غالب، جغرافية العراق الإقليمية، كلية التربية، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل ،١٩٩٢، ص١٠٧- ١٠٨.
٢. سهل السنوي، يحيى الراوي، أحمد المنجد، محمد سوادي عطية، الجيولوجيا العامة الطبيعية والتاريخية، ط١، مطبعة كلية العلوم، جامعة بغداد، ١٩٧٩، ص ١٣٥
3. http://geology-soil-1.blogspot.com
4. http://geology-soil-1.blogspot.com
٥. المؤسسة العامة للتعليم الفني والتدريب المهني، تقنية مدنية خواص واختبارات التربة ـ ٢٠٠٤، ص ٤- ٥.
6. G. J., Retallack, (1990), Soils of the past : an introduction to paleopedology, Boston: Unwin Hyman, p 32.
7. Ames, S.W. (1990), Soil genesis and classification, Iowa State Univ. Press , p36.
٨. هـ.د. فوث, ل.م. تورك ، أساسيات علم التربة، الطبعة الخامسة، ترجمة صالح محمود دميرجي وعبد الله نجم العاني، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨، ص٣١.
٩. أزاد محمد أمين، تغلب جرجيس داود، جغرافية الموارد المائية، مطابع دار الحكمة،١٩٩٠، ص٦٣.
١٠. حسن ابو سمور، مصدر سابق، ص ٢٧٠.
١١. نفسه، ٢٨٦.
12. Dr, p. Buringh, Soil And Soil Conditions in Iraq, Soil Survey and Classification(2 Specialist, Baghdad, 1960.
١٣. صلاح حميد الجنابي، سعدي علي غالب، جغرافية العراق الاقليمية، المصدر السابق، ص ١٠٩.
١٤. شاكر خصباك، العراق الشمالي دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، المصدر السابق، ص ١١٣.
15. http://www.uobabylon.edu.iq/uobcoleges/lecture
١٦. حسن ابو سمور، مصدر سابق، ص٢٨٣.
١٧. فليح الطائي، http://www.alkutnet.com/vb/showthread
١٨. المصدر نفسه، ص ١٠٩.
١٩. جاسم محمد الخلف، مصدر سابق، ص ١٤٢.
٢٠. صلاح حميد الجنابي، سعدي علي غالب، جغرافية العراق الاقليمية، المصدر السابق، ص ١١١.
٢١. شاد محمد بالته، صيانة التربة والمياه في العراق، ط٢ ، بغداد،١٩٩٥، ص٤٢.
٢٢. فليح الطائي، http://www.alkutnet.com/vb/showthread
٢٣. المصدر نفسه.
٢٤. حسن ابو سمور، الجغرافية الحيوية والتربة، دار المسيرة للنشر والتوزيع، ط١، عمان، الاردن، ٢٠٠٥، ص٢٨٤.
٢٥. جاسم محمد خلف، مصدر نفسه، ص ١٤٣.
٢٦. فليح الطائي، http://www.alkutnet.com/vb/showthread
٢٧. صلاح حميد الجنابي، مصدر سابق، ص ١١٢.
٢٨. أحمد علي حسن البيواتي، حوض وادي العجيج في العراق واستخدامات أشكاله الأرضية، اطروحة دكتوراه، مصدر سابق، ص٥١.
٢٩. حسن ابو سمور، مصدر سابق، ص٢٨٩.
٣٠. فليح الطائي، http://www.alkutnet.com/vb/showthread
٣١. الدراسة الميدانية، بتاريخ ٢٤ / ١١/ ٢٠١٣.

٣٢. اسماعيل اسعد اسماعيل، المصدر السابق، ص ٤٣.

٣٣. حكمت عبدالعزيز حمد الحسيني، جيومورفولوجية جبل بيرمام واحواضه النهرية، المصدر السابق، ص١١٨.

٣٤. حسن ابو سمور، مصدر، سابق، ص٢٨٨_٢٨٩.

٣٥. جاسم محمد خلف، مصدر سابق، ص ١٤٤.

٣٦. حسن ابو سمور، مصدر سابق، ص٢٥٧ ـ٢٥٨.

37. http://ar.wikipedia.org/wiki

٣٨. الشيخ محمد اسماعيل، مشكلة الحت وانجراف التربة في جبال سوريا الساحلية - محافظة طرطوس، مجلة الجمعية الجغرافية الكويتية، العدد ٩٨، الكويت، ١٩٨٧، ص ١٧٥.

٣٩. عبد الله سالم المالكي، مصدر سابق، ص١١٠.

40. Cook. R .U ., Doornkam .P .J .C. "Geomorphology in Environmental Monagment . Oxford .1973. P 27

٤١. حسن رمضان سلامـــة، اصول الجيـــومورفولوجيا، ط١، دار المسيـرة، عمـان، الاردن، ٢٠٠٤، ص٤٢٣.

٤٢. يوسف صالح اسماعيل، التقييم الجيوموفولوجي لسهل دبكة، اطروحة دكتوراه (غير منشورة )، جامعة الموصل، ٢٠٠٨، ص٨٨.

٤٣. حسن رمضان سلامـــة، مصدر سابق، ص٨٨.

٤٤. محمد اسماعيل الشيخ، حول مشكلة الحت وانجراف التربة في جبال سوريا الساحلية، نشرة الجمعية الجغرافية الكويتية، العدد ٩٨، ١٩٨٧، ص٣٢.

45. Fre ,W.W.& OTHERS, Soil erosion effects on properties and productivity of two soil ,J. Soil .Sci- socity of A America , Vol.46, NO.5, California, 1982.p.1052

٤٦. ناهده جمال الطالباني، خالد طيب محمد البرزنجي، صيانة التربة والمياه، بحث غير منشور، قسم علوم التربة، كلية الزراعة، جامعة السليمانية، مطبعة سكرتارية جمعية طلبة كردستان، ١٩٩٨، ص ٥٧.

٤٧. إبراهيم شفيق، أمين احمد الراوي، استصلاح وتحسين التربة، مصدر سابق، ص٢٩٦.

٤٨. إسماعيل محمد، حول مشكلة ألحت وانجراف التربة في جبال سوريا الساحلية (محافظة طرطوس، نشرة الجمعية الجغرافية الكويتية)، العدد (٩٨)، الكويت، ١٩٨٧، ص٢٤-٢٥.

# ڕووەکێ سرۆشتی

**پ.د. ئەحمەد عەلی حەسەن بەبەواتی**
**زانکۆیا دهۆک - کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: خالد صالح**

مەبەست ژ ڕووەکێ سرۆشتی ئەو ڕووەکە کو بخۆ شین دبیت بێ دەستێ مرۆڤی بچیتە دناڤ شینبوونا وی دا، ڕووەکێ سرۆشتی بۆ هەر دەڤەرەکێ رەنگڤەدانەکا سرۆشتییا چەند هۆکارێن سرۆشتی یە کو ل وێ دەڤەرێ د بەربلاڤ، ب تایبەت هۆکارێن سەقایی و ئاخێ و توبوگرافیێ.

گرنگییا ڕووەکێ سرۆشتی د ڤەکۆلینێن جوگرافیایی دا یا دیارە دەمێ نەهێلیت ئاخ ب ئەگەرێن ئاڤێ و بای بێتە ڕامالین، ئەو چەند دبنە هاریکار کو ئاخ پتر پێکڤە ب نویسیێت و نەهێلیت پرت پرت بیت و بێتە ڕامالین، دیسان لەزاتییا چپکێن بارانێ دەمێ ڤ عەردی دکەڤن سست دکەت و ئەو چەند ژی دبیتە ئاستەنگ کو ئاخ نەهێتە ڕامالین و ڕەهیان چێ نەبن، ژبلی ڤێ چەندێ دبنە ئاستەنگ بۆ ئاڤا سەر عەرد کو خۆش نەچیت و چوونا ئاڤێ ب ڕێژەیا (٣٥- ٥٠٪)ێ دێ سست کەت، ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ وێ چەندێ کو ئاڤ پتر بچیتە دناڤ ئاخێ دا و ئاڤا ژێر عەرد دەولەمەند دکەت[1]. هەڤدژی وێ چەندێ ئەگەر داپووشینا ڕووەکی یا کێم بیت، ئاڤا سەر عەرد خۆش دچیت و کێم دچیتە دناڤ عەردی دا. هەر وەسان گرنگییا وێ یا د چوونا ئاڤێ و رێکخستنا وێ ژی دا هەی، زێدەباری باندۆرا وێ ل سەر پلەیێن گەرمێ و هەلمبوونێ، دیسان دهێتە هژمارتن داهاتەکێ ئابووری دناڤ بزاڤێن جودا یێن خەلکێ دەڤەرێ دا، ژبلی رۆلێ وێ د چاککرنا ئاخێ دا، چونکی ئەو هۆکارێ ئێکێ یە بۆ بلند بوون و نزم بوونا ئاستێ کەرەستەیێن ئەندامی (عضوی).

ڕووەکێ سرۆشتی رۆل یێ د راکێشانا گەشتیاران ژی دا هەی، مرۆڤ ب سرۆشتێ خۆ حەز ژ دەڤەرێن کەسک دکەت و ئەگەر تۆ هەلبژارتنان بدەیە وی ئەو دێ وان دەڤەران هەلبژێریت یێن دیمەنێن جوان لێ هەین و دێ خۆ ژ دەڤەرێن بیابانی کو د هەژارن ب ڕووەکی دوور ئێخیت[2]. ئەڤە ژبلی کو ئەگەرەکێ گرنگە بۆ سستکرنا گەرما دژوارا هاڤینێ و سەرما دژوارا زڤستانێ و سەقایەکێ مام ناوەندیێ دلڤەکەر و ساخلەم بۆ خەلکی پەیدا دکەت و هێزا لەزاتییا بای ژی کێم دکەت[3].

هەر چەند ئاماژە ب گەلەك باشی و ئەرێنیێن ڕووەکێ سرۆشتی هاتنە دان، لێ ل بەرامبەر رۆلێن

نەرێنی ژی هەنە، ب تایبەت ل ناڤ ژینگەهێن چیایی دا و نەمازە بەتەنێن چیا ژبەر:

١- پەق و ناڤبڕ ل دەڤەرێن کەڤرینێن نیشتەیی پتر لێ دهێن.

٢- ئاخێ تێر ئاڤ دکەت و دبنە ئەگەر کو ئاخ بێتە شویشتن و بێتە خوارێ، ب تایبەت ل بەتەنێن چیا.

٣- ژبەر بارگرانییا دکەڤیتە سەر وان بەتەنان، بنەجهبوونا وان کێم دکەت.

## هۆکارێن کاریگەریێ ل شینبوونا ڕووەکی دکەن:

کاودانێن ژینگەهی ڕەنگڤەدانێ ل سەر بەلاڤبوونا جوگرافیایی یا ڕووەکی ل وان جهێن لێ شین دبن دکەت، ئەو ئەنجامێ داویێ یێ وان هۆکارانە کو کارتێکرنێ ل شینبوونا وێ دکەن، ئەو هۆکار ژی توبوگرافی و سەقا و ژێدەرێن ئاڤێ و ئاخە[٤]. باران و گەرما دو کەرەستەیێن سەقایی یێن بنەرەتی نە کو کارتێکرنێ ل شینبوون و چڕییا ڕووەکی دکەن، چەند ڕێژەیا باران بارینێ پتر لێ دهێت، چڕییا ڕووەکی ژی ل بەرامبەر پتر لێ دهێت. پلەیێن گەرمایێ ژی ژێدەرێ تێهنێ یە بۆ ڕووەکی و کارتێکرنێ ل کریارێن فیزیولوژی کو پێ ڕادبیت دکەن. هەر جۆرە ڕووەکەکێ دەڤەرێ پێدڤی ب پلەکا تایبەتا گەرمایێ هەیە دا زڤڕۆکا شینبوونا خۆ تەمام کەت، لێ توبوگرافی کارتێکرنێ ل جۆرێ ڕووەکێ سرۆشتی دکەت، ئەو ژی ب ڕێژەیا ڤەرێژیا عەردی و سەمت و بلنداهییا وی و ئەو چەند کارتێکرنێ ل داپووشینا ڕووەکی دکەت[٥].

گەلەك هۆکارێن دیار کارتێکرنێ ل شکل و قەبارە و چڕی و ڕەنگ و لەزاتییا شینبوونا ڕووەکی دکەت، ژ گرنگترین وان هۆکاران:

### ١- سەقا:

فاکتەرێ سەقای سێ ڕەگەزێن پێدڤی بۆ ژیانا ڕووەکی ب خۆڤە دگریت: ئەو ژی: باران و گەرما و ڕۆناهی.

#### أ- باران:

ڕۆلەکێ مەزن د دەستنیشانکرنا جۆر و چەندییا ڕووەکی ل هەرێمێ هەیە، چەند ئاڤا بارانێ ل دەڤەرەکێ پتر هەبیت، ژیانا ڕووەکی دێ لێ یا دەولەمەند بیت، ل دەڤەرێن کەمەری کو باران مشە لێ د بارن، چڕییا ڕووەکی ژی لێ یا زۆرە، لێ ل دەڤەرێن بیابانی کو ڕێژەیا بارانێ یا کێمە، ل دووڤ وێ چەندێ ڕووەك ژی یێ لێ کێمە یان هەر ئێکجار نینە، ئەڤە وێ چەندێ دگەهینیت کو دەڤەرێن پڕی باران هەر ئەو دەڤەرن یێن دەولەمەند ب ژیانا ڕووەکی. یا دیار ئەوە کو جوداهی دناڤبەرا ڕێژەیێن بارانێ ل جهێن جودایێن پارێزگەها دهۆکێ هەنە، ڕێژەیا بارانا هاتییە تۆمارکرن، سالانە دناڤبەرا (٤٥٠- ٨٠٠) ملم دایە، ئەڤە ژی ڕەنگڤەدانێ ل سەر جوداهییا چەندیێ و چەوانییا ڕووەکی دکەت، دناڤبەرا سالۆخەتێن ڕووەکێ بیابانی ل لایێن باشووری ژ پارێزگەهێ و سالۆخەتێن ڕووەکێن سەقایێ شەهکرتی ل لایێن باکووری پارێزگەهێ.

#### ب- گەرما:

ئەڤە ژی ژ ڕەگەزێن پێدڤی یە بۆ ڕووەکی و بێ ئەو شینبوونا ڕووەکی هەر ئێکجار نینە، دیسان هەر ڕووەکەکێ پلەکا تایبەتا گەرمایێ ب شینبوونا خۆ هەیە، ئەگەر زێدە بیت یان کێم بیت ئەو ڕووەك دێ ژ ناڤچیت. ب گشتی پلەیێن گەرما دەڤەرێ مام ناوەندینە و پێدڤیێن ڕووەکی دابین دکەت، ڕێژەیا وێ دناڤبەرا (١٩- ٣٥٪)ێ پلەیێن سەدی یە، ئەڤێ چەندێ ژی جیاوازییا خۆ دناڤبەرا هەیڤ و ڕۆژان دا یا هەی و ل زڤستانان دگەهیتە ژێر پلەیێن سفرێ و ل هاڤینان دگەهیتە پتر ژ (٤٥) پلەیێن سەدی.

#### ج- ڕۆناهی:

ڕۆناهییا ڕۆژێ ژ ڕەگەزێن سەرەکی یە بۆ پێدڤیاتیێن شینبوونا ڕووەکی و ڤەکۆلینێن تایبەتمەند دیارکرینە کو ڕووەك چەند بەر ڕۆناهی بکەڤیت، شینبوونا وێ پتر لێ دهێت و قەبارەیێ وی ژی مەزنتر لێ دهێت،

کێمبوونا رۆناهیێ ژی کارتێکرنێ ل شینبوونا رووەکی دکەت و د دەمێ تاریێ دا رادوەستینت یان ناهێلیت، ئەڤە ژی وێ چەندێ دگەهینت کو ل دەمێ رۆژ درێژ دبن، دەمێ شینبوونا رووەکی و ژیانا وان ژی درێژتر لێ دهێت ژ جهێن دی. ل دووڤ پێزانینێن سەقای ل ئێستگەها دهۆکێ رێژەیا دەمژمێرێن تیرۆژکا رۆژێ رۆژانە دناڤبەرا (٤-٨) دەمژمێرانە، ئەڤ رێژەیە ژی وێ چەندێ دگەهینیت کو رۆناهییەکا باش هەیە و پشکداریێ د هەبوونا ژیانەکا جۆرا و جۆرا رووەکی دا دکەت.

## ٢- توبوگرافی:

یا زانا ئەوە کو توبوگرافیێ ژی کار ل سەر گوهۆرین و راستڤەکرنا کەرەستەیێن سەقای دا هەیە، دەڤەرێن چیایی یێن بلند (جهێن بلند) سارترن ژ جهێن نزم، ژبەر ڤێ چەندێ ئەو رووەکێن ل جهێن جودا یێن چیای ژ بنارا وی بۆ گوپیتکا وی شین دبن د ژێك جودانە ل دووڤ وێ گەرم و سەرمایا دکەڤیتە بەر. هەر وەسان توبوگرافیێ کارتێکرنێن ل سەر لەزاتی و سەمتا بای و چەندیا تیرۆژکا رۆژێ هەی، سەبارەت چیایێن پارێزگەها دهۆکێ دێ بینین جوداهی دناڤبەرا وان جهێن ل بەر رۆژێ دگەل ئەڤێن باران لێ دهێت یا هەی، ئەگەر تۆ بەتەنێن باکووری یێن چیا هەڤبەر بکەی دگەل بەتەنێن باشووری دێ بینین کو چڕیا رووەکی ل باکووری پترە، مینا چیایێن گارە و مەتین و بێخێر و شەرانش و بلنداهیێن دی یێن چیایان.

دیسان توبوگرافیێ رۆل یێ د پێکهاتا ئاخێ و ستووراتییا وێ دا هەی، ئەو ژی ل دووڤ ڤەرێژیا وان بەتەنان، یا دیار ئەوە کو پەیوەندییەکا هەڤدژ یا دناڤبەرا ستووراتییا ئاخێ و پلا ڤەرێژیێ دا هەی، ل بەتەنێن گەلەك ڤەرێژ ستووراتییا ئاخێ ژی یا کێمە، ژبەر کریارێن رامالینا ئاخێ، ئەڤە ژی دبیتە ئەگەر کو زاخا عەردی کێم ببیت، چونکی کەرەستەیێن خوارنێ و کانزایی و ئەندامی (عضوی) نامینن، لێ ل جهێن راست و د ناڤ دۆلاندا باشترە، چونکی ستووراتییا ئاخێ یا مەزنە و ژینگەهەکا خۆش بۆ رووەکی پەیدا دکەت، ژبەر ڤێ چەندێ چڕیا رووەکێ سرۆشتی دناڤ دۆلاندا پترە ئەگەر تۆ هەڤبەر بکەی دگەل بەتەنێن چیایان، مینا دۆلێن ئێستبلان و زریزە و باکوفا و کانی ماسێ و دۆلا نەهلە وەکی نموونە نە پتر.

## دەڤەرێن سەرەکی یێن رووەکی:

جوگرافیناسان رووەکێن سرۆشتی دابەشی چەند پشکان کرینە و هەر ئێك ب هەرێما رووەکی دهێتە نیاسین، کو ئێك یا جودایە ژ یا دی و ب ڤی رەنگی:

١- هەرێما رووەکێن گەرم.

٢- هەرێما رووەکێن مام ناوەندی یێن گەرم.

٣- هەرێما رووەکێن مام ناوەندی یێن سار.

٤- هەرێما رووەکێن جەمسەری.

٥- هەرێما رووەکێن چیایی.

ئارمانجا مە دڤێرەدا ڤەکۆلین ل سەر وان هەرێمان و پێزانین و سالۆخەتێن وان نینە، بەلکی ڤەکۆلینە ل سەر وان کۆمەلە رووەکان کو پێکهاتییە ژ دارستان و گژوگیایان، دا پتر ل سەر وان سالۆخەتان ل سەر جهێ ڤەکۆلینێ بزانین ل سەر نەخشەیێ (١) دێ ب ڤی شێوەی دیارکەین:

### ئێك- دارستان:

دهێتە نیاسین ب کۆمەلە دارێن ل نێزیکی ئێك شین دبن، سەرێن وان ل هندە جاران دگەهنە ئێك[٦]، ژ سالۆخەتێن وان ب چڕی یێن ل هندە دەڤەرێن دەستنیشانکری هەین، چ دارستانێن بەلگوەرین بن یان یێن هەردەم کەسك یان ژی یێن تێکهەل دگەل ئێك، دیارترینێن وان:

#### ١- دارستانێن بەلگوەرین:

ئەڤە ژی هاتینە ب ناڤکرن ژبەر کو د دەمەکی یان د وەرزەکێ سالێ دا بەلگێن خۆ دوەرینن، ئەڤە ژی ژبەر نزمبوونا پلەیێن گەرمێ بۆ ژێر سفرێ ل زڤستانێ، یان ژی ژبەر کێمیا ئاڤێن بارانان ل هاڤینێ، ب تایبەت کو ژیانا هندەك جۆرە داران یا گرێدای ئاڤا بارانانە[٧]، ژ وان

دارێن ل دەڤەرێ شین دبن (بەڕوی و الزان و البتولا)، هەرێما سەرەكیيا دارستانێن بەلگوەرێن رەخێن رۆژئاڤایی یە ژ كیشوەران ژ دەڤەرا مام ناوەندی، ئەڤ دەڤەرە دكەڤنە دناڤبەرا هەردو هێلێن پانیێ (٤٠-٦٠) باكوور و باشوور، و ل وان دەڤەرێن ئەڤ سالۆخەتێن سەقای ل ناڤ ڤان هێلێن پانیێ (العروض) هەین، مینا پشكێن باكوور ژ عەردێ پارێزگەها دهۆكێ دناڤبەرا رووبارێ هیزل ل رۆژئاڤایی و رووبارێ خابووری ل رۆژهەلاتی وێنە (١).

ژ گرنگترین جۆرێن بەربەلاڤ ل جهێ ڤەكۆلینێ، دارێن گویزا و فستەقا هندی و گهیشك و كەزان و سماق و توی و باهیڤ و سپیندار، وێنە (٢)، ژبلی بەڕوی ب هەمی جۆرێن خۆڤە. ئەڤ هەمی جۆرە دارە ب بەرهەمن و داهاتەكێ ئابووریێ گرنگ ژێ دهێت[٨].

ئەڤ جۆرە رووەكەكە مینا دارستانێن سرۆشتی دبەربەلاڤن، ب تایبەت ل وان جهێن بلنداهیيا وان دناڤبەرا (٥٠٠-٨٠٠) م دناڤ دۆلاندا و بلنداهیيا (١٢٠٠) م ل دەڤەرێن چیایی، وێنە (٣).

سەبارەت قەبارە و چڕییا داروباران ئەو ژێ دمینیتە ل سەر گەلەك ئەگەران، ژوانان كا چەند ل بەر تیرۆژكا رۆژێ و بایێ شەهگرتی نە، چڕییا وان ل بەتەنێن باكوور و باكوورێ رۆژهەلات پترە ژ بەتەنێن باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ دەڤەرێ، وێنە (٤)، هەر وەسان ئاڤا سەرعەرد و ئاڤا كانییان باندۆرا ل سەر شینبوون و چڕی و بەلاڤبوونا داروباری یا هەی و ل سەر درێژاهیيا جۆك و كانی و رووباران داروبار پترێ هەی و درێژترە.

**نەخشەیێ (١)**
**كەمەرێن دارستانان ل پارێزگەها دهۆكێ**

وێنە (١)
دارستانێن بەلگەوەرین ل چیایێن شەرانش ـ زاخۆ



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری ڤە ل ٢٠/٨/ ٢٠١٣ هاتییە کێشان

وێنە (٢)
دارێن سپیندارێن بەلگوەرین (دۆلا سپنە یا رۆژهەلاتی)



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری ڤە ل ٢٠١٢/٣/٢٣ هاتییە کێشان

وێنە (٣)
ڕووەکێن بەتەنێن چیایان ( دەڤەرا چیایێن بلند)



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری ڤە ل رۆژا ٢٠١٣/١٠/٣١ هاتیە کێشان

وێنە (٤)
ڤەدیتنا دارستانێن چڕێن بەلگوەرین ل ئەسمانی ل دۆلا زریزە و چیایێن دەردۆرێن وێ



- Google Earth.2014

**٢- دارستانێن هەردەم کەسك:**

ئەڤ دارستانە هەر ل هەمان هێلێن پانیێ یێن بەرێ (٤٠-٦٠پلە) باکوور و باشوور دبەربەلاڤن. ئەو جهێن وەکی وێ ل باکوور و باشوورێ ڤان هەردو پلان، سەقایێ دەڤەرا دارستانێن هەردەم کەسك یێ بەرنیاسە ب سەرمایێ ل زڤستانێ و ب هوینکاتیێ ل هاڤینێ. بەلگێن دار و بارێ ڤێ دەڤەرێ د سەر تیژن مینا دارێن کاژا و کاژا بیلادی (سەرو) و شربین و شکلێ وان یێ قوچەیی یە، ئەڤ چەندە ژی هاریکاریا دارێ دکەت خۆ ژ پشکەکا زۆرا ئەو بەفرا کەتیە سەر قورتالکەت، ژبلی کو باندۆرا بایێ سارێ د زڤستانێ دا دهێت ل سەر سستدکەت، ژ سالۆخەتێن ڤان داروباران ئەوە کو قورمێن راست و بەلگ ستوور و یێن رەنگ ستری یێن هەین، ئەڤە ژی هاریکاریێ ددەتێ کو پتر ئاڤێ دناڤ خۆدا بپارێزیت و هەلمبوونێ کێم بکەت[٩]. دارێن وان دهێنە هژمارتن ژێدەرەکێ گرنگێ دارێن نەرم، ئەڤ جۆرە دارە ل پارێزگەها دهۆکێ هەر یێن ل وان جهان هەین کو دارستانێن بەلگوەرین لێ هەین و تێکهەلن دگەل ئێك.

ئەڤ دارستانە یێن ل تیڤەرسکەکا تەنگ هەر ژ دهۆك و زاخۆ بەرەڤ رۆژهەلاتی ل لایێ ئەتریش و بۆ لایێ سەرسنگی ل باکووری یێن هەین، ئەڤ جۆرە دارستانێن هەردەم کەسك ل پتریا عەردێن پارێزگەها دهۆکێ دهێنە دیتن، ب تایبەت دناڤ دۆل و بەتەنێن چیایان دا، ژبلی چاندنا وان داران ل پشکێن باشووری ژ عەردێ پارێزگەهێ ب رەنگەکی کو نابنە رووبەرەکێ دارستانی، هەژی ئاماژە پێکرنێ یە کو رووبەرێن بەرفرەهـ ژ عەردێن ڤەرێژێن دەڤەرێ ب دارێن کاژان هاتینە چاندن دا ئاخ نەهێتە راماڵین، ب تایبەت پشتی چرپیا وان دارستانان ل دەڤەرێ ژبەر برینا بەردەواما داران ژ ئەنجامێ شەر و تەنگاڤیان کو ب سەر دەڤەرێ دا هاتین یێن بێ سەروبەربووین.

بۆ نموونە و ژ بۆ ئارمانجا باشکرنا ژینگەهێ ل قەزا ئاکرێ، گەلەك جۆرێن داران کو زوی شین دبن مینا یوکالیبتوس و کینا و کازولینا و کاژ و کاژا بیلادی و... هتد چاندی نە، و گرێ گوبا نموونەکە ژ دارستانێن چێکری ل پارێزگەها دهۆکێ، دارێن وان پێکهاتینە ژ کاژا و کاژا بیلادی[١٠] و ژ لایێ فەرمانگەها چاندنێ ڤە هاتینە چاندن. ئەڤ چەندە پتر ل قەزا زاخۆ بەرچاڤدبیت، هەروەکی د خشتەیێ (١)ی رووبەر و جۆرێ وان دارێن هەردەم کەسك ژ ئالیێ فەرمانگەها چاندنێ ڤە هاتینەچاندن دیارکری.

**خشتەیێ (١)**
**دارستانێن دەستکرد ل دەڤەرا زاخۆ**

| جهـ | رووبەر / دۆنەم | جۆرێ دارێ |
|---|---|---|
| دەرکار عەجەم | ١٤ | کاژا زاویتە، زەیتون، کاژا بەرهەمدار، سماق |
| دار هۆزان | ٣٠٨ | کاژا زاویتە، زەیتون، بەنوك، فستەق، گرزك، بەروی، باهیڤ |
| تلکبەر | ٤١ | کاژا زاویتە، زەیتون |
| کانی سارك | ٣ | کاژا زاویتە |
| ماميسا | ٨ | کاژا زاویتە، زەیتون، سماق |
| ئاڤرما | ٦ | کاژا زاویتە |

- حکومەتا هەرێما کوردستانێ، وزارەتا چاندنێ، رێڤەبەریا چاندنا زاخۆ هۆبا دارستانان، توومارێن نە بەلاڤکری.

## جۆرێن رووکان:

جۆرێن رووەکان ل دەڤەرێ ل دووڤ هۆکارێن بەرپرس ژ هەبوونا وان دژێك جودانە و دیارترین ئەو جۆر ئەڤەنە:

### ١- دار:

داروبارێن دەڤەرێ دژێك جودانە دناڤبەرا دارێن بەلگوەرین و یێن هەردەم کەسك، گرنگترینێن وان:

### أ- بەروی:

جۆرێن سەرەکیێن داران کو ل دەڤەرێ شین دبن

بەرِوییا هشك و یا نۆرمالە كو ل بنارێن چیا شین دبن و بەرِوێ مازك (كو مازوێ پێڤە دهێن) ل ناڤەراستا چیایان و دیندار كو ل جهێن بلندێن چیا شین دبن، دناڤ وان دارستانێن بەرِوییاندا كۆمەلەكا مەزنا گیایێن ژیدار (معمرة) ژ هەمیان پتر هەنە و چرِترن ژ رِووەكێن بیابانی و زویركان، هەر وەسان دارێن (بطم) و كەزان و گهیشك و سماق و كرسك و باهیڤ و هەڤرست ژی هەنە[11]، هەر وەسان دارێن حەز ژ ئاڤێ ژی دكەن مینا بیهۆك و چنار و گویز و ریل كو دناڤ دۆل و شیفكێن چیادا شین دبن[12]، دارا بەرِوێ دارەكا ئابووری یە، مفا ژ قورمێن وێ دهێتە وەرگرتن بۆ چێكرنا كومرِان و دهێتە بكارهینان بۆ گەرمكرنێ، هەر وەسان بۆ ئاڤاكرنا خانییان ژی مفای ژێ وەردگرن كو تایێن وان دكەنە شەقلە و نیری بۆ بانان و كەل و پەلان ژی ژێ دروست دكەن، بەلگێن وان ژی دكەنە ئالف بۆ گیانداران و ئەڤ دارە یا ل پتریبا جهێ مە ڤەكۆلین لێ كری یێن هەین، ب تایبەت ل چیایێن ئاكرێ، و نەمازە ل بەتەنا باكووری، و چیایێ گارە و چیایێ مەتینا و چیایێن بەرواری ژووریا و شەرانش، ژبلی بەتەنێن چیایێن دی ل پارێزگەها دهۆكێ، هەر وەسان مشە یێن ل وان جهان هەین كو ئاڤ لێ هەی و دناڤ نهالاندا، مینا گەلیێ كانی ماسێ و، ئستبلان، نەهلە، زریزە (وێنەیێ بەرێ ٤).

### ب- گاز:

ژ دارێن هەردەم كەسكە، بەلگێن وێ د تیژن و رەنگ ڤۆچەیی یە، ژ ئەنجامێ هەبوونا سەقایەكێ گونجای و ئاخەكا گونجای ب رەنگەكێ بەرفرەهـ ل پارێزگەها دهۆكێ هەنە و ل پلا دووێ پشتی دار بەرِوێ ل دهۆك، زاویتە، سەرسنك، ئەترووش، ژبلی دەڤەرێن دی دهێت.

هەژی ئامازێ یە كو مشە ل بەتەنێن چیا و ل نێزیكی رێكێن سەرەكی دهێنە چاندن دا ئاخ نەهێتە رامالین، مینا بەتەنێن ئینشكێ و قەدش و ئامێدیێ، هەر وەسان ب رەنگەكێ بەرفرەهـ دناڤ باغێن گشتی ل باژێران و ل ناڤەراست و هەردو رەخێن جادێن باژێران مشە دهێنە چاندن و ژوانان بازێرێ دهۆكێ بخۆ.

## ٢- تراشۆك:

ئەو ژ وان جۆرە رِووەكانە كو بەژنا وان یا كورتە و باراپتر یێن ل وان جهان هەین كو دكەڤنە دناڤبەرا جهێن دارستانان و ئەو جهێن گژوگیا لێ هەین و گەلەك جاران هەر دچنە دناڤ وان جهاندا بخۆ ژی دا، چ ل بەتەنێن چیایان بن یان ژی دناڤ دۆل و گەلیاندان، ژبلی دەڤەرێن دەشتی. ل ڤان جهێن مە ڤەكۆلین لێ كرین باراپتر هندە تراشۆكێن كورت لێ شین دبن، بەلگێن هندەك ژ وان ددرِكدارن وەكی دریا و ریلا و هندەك ژی د بەلگ پانن (بەلگوەرینن) نە ددرِكدارن، مینا هژیرێن چۆلی و سماق و كف مریم.

ئەڤ جۆرە تراشۆكە یان دبەلاڤن یان ژی دگەل داروبارێ دی یێ سرۆشتی و یێ چاندی دتێكهەلن و هندەك ژی ل دۆرێن ئاڤا یێن هەین، مینا (الطرفة) و ریل، یان ژی هندە جاران دوور ژ وان مینا تراشۆكێن دی شین دبن. ب رەنگەكێ گشتی هندی ئاڤ پتر هەبیت ئەڤ تراشۆكە پتر وەرارێ دكەت و چرِبیا وان پتر لێ دهێت و درێژتر ژی لێ دهێن و پتر دچنە دناڤێكرا، ب شێوەیەكی كو خەلكێن دەڤەرێ وەكی پەرژان بۆ باغێن خۆ ب كاردهینن و ل هندە جاران ژینگەهەكا باشە بۆ چەروانی. ئەڤ چەندە ژی ل نێزیكی چیایێ بێخێری و دەڤەرێن باتاس و ئیستبلان و هەردو سپنێن رۆژئاڤا و رۆژهەلات و ل دەڤەرا نەهلە (ئاكرێ) و بلنداهیێن باتیفا بەرچاڤ دكەڤن.

## ٣- گژوگیا:

ئەڤ گژوگیایە یێن ل هەمی ژینگەهێن جوگرافی و هەمی دەڤەران هەین، ل ناڤ جهێن داروبار و تراشۆك ژی شین دبن، باراپتر گیا حەز ژ وان جهان دكەن كو بكێر شینبوونا داروباری نەهێت[13]، ژ گرنگترین جۆرێن وان گیایێن سفانا (كو ل دەڤەرێن مەداری بەرچاڤ دكەڤن) و گیایێن هێلێن پانیێ یێن ناڤین (العروض الوسطى)، یێن ژ هەمیان پتر بەرچاڤ دكەڤن گیایێن بەراری، ئەو ژی ل جهێن باكوور ژ دەڤەرێ دبەربەلاڤن مینا گیایێن: شێلم و جەهداسی (شوفانێ چۆلی)

و جەهێ چۆلی و گەنمێ چۆلی و نەفەل، لێ گیایێن ئستبسی یێ ل دەڤەرێن دەشتی و جهێن باشووری ژ پارێزگەهێ هەین دگەل ب ناڤداچوونەکا رێژەیی بۆ دەڤەرا پێشتر ئاماژە پێ هاتییەدان.

گیایێن ئستبسی ئەو گیایێن وەرزیێن کورتن، دگەل وەرزێن باران بارینان ل وەرزێ پاییز و زڤستان و بهاران شین دبن و ژیانا وان دگەل ب دوماهی هاتنا وەرزێ بهارێ ب داوی دهێت[14]. دا ئەو گیا تۆڤێن خۆ ب وەریـنن و ل سالا دووڤدا ژنوی شین ببنەڤە، ژ گرگترین وان جۆران: (القلغانه والصفار، دەڤشێر، نسرین الجت البری، شلێر، نێرگز، هێرو، بنەفش، شەبوی، جلادیوس البری، اقحوان، ئادارۆك، نیسانۆك، خشخاش، سیسن، یاسمین و یێن مایی) وێنە(٥).

گژوگیا ژینگەهەکا چەروانییا باش بۆ گیاندارێن دەڤەرێ پەیدا دکەت، لێ هندە گیا یێن هەین پتر ژ هندەکێن دی دشێن خۆ ل بەر گەرمێ و هشکاتیێ راگرن و دەمێ شینبوونا وان پتر لێ دهێت مینا ڕووەکێن درکدار[15]، وەکی جۆرێن ستریا (الشوك والعاقول)، ژبلی هەبوونا هندەك گیایێن دی کو د ژەهراوی نە، یان هندەك بۆ کارێن پزیشکی مینا (عرق السوس و بەیبینکا) دهێنە بکارهینان. دیسان هندەك ژێ وەکی خوارن دهێنە بکارهینان و ئەڤ جۆرە گیایە ل وەرزێ بهارێ دناڤ بازارێ دهۆکێ دهێنە دیتن، وەکی (کەنگر و کڤارك و خەردەل) و گەلەکێن دی.

سەرەرای ئەڤا هاتییە دیار کرن دەڤەر ب کولیلکێن چۆلی ژێ یا دەولەمەندە، بۆ نموونە بنەفش، شیوی، جلاریوسا چۆلی، خشخاش، سیسن، یاسمین، زمیق، هەر وەسان نێرگز و ئادارۆك و نیسانۆك مشە ل وان جهێن ئاڤ لێ خرڤە دبیت ل وەرزێ بهاران پشتی حەلیانا بەفرێ یێن هەین[16].

**وێنە (٥)**

**هندەك ڕووەکێن وەرزی کو ل دەڤەرێ شین دبن.**






## ٤- ڕووەکێن پەراڤێن ڕووباران و دناڤ دۆل و گەلیاندا:

ناڤەکە بۆ وان ڕووەکێن حەز ژ ئاڤێ دکەن و ل سەر وان ئاڤێن د گەلیێن ئاڤی و شیڤکاندا دهێنە خوار دژین، وێنە (٦)، هەر وەسان ل سەر کانیێن ئاڤێ. و ژبەر هەبوونا گەلەك ڕووبار و شیڤێن ئاڤێ و کانیێن ئاڤێن بەردەوام، ئەڤ جۆرە ڕووەکە ب بەرفرەهی ل پاریزگەها دهۆکێ دهێتە دیتن. مینا دەردۆرێن زێیێ مەزن ب درێژەیاهیا سنوورێن رۆژهەلاتی یێن پاریزگەهێ و ڕووبارێ خابووری دناڤبەرا هەردو قەزایێن ئامێدیێ و زاخۆ دا و ڕووبارێ هیزلی کو سنوورێن رۆژئاڤایێ پاریزگەهێ یە و ڕووبارێ دیجلە سنوورێن باشووری کو دەست پێ دکەت ژ سێگۆشا سنووریا عیراق و سوریا و ترکیا هەتا ڕووبار دگەهیتە دناڤ ئاخا پاریزگەها دهۆکێ دا و ڕووبارێ خازر، وێنە (٧)، ژێلی دۆلێن ئستبلان و سپنە و چەمانکێ و کانی ماسێ و نەهلە و گەلیێ زەنتە. ب درێژەیاهیا پەراڤێن ڤان دۆل و ڕووباران جۆرێن ڕووەکێن سەر ب توخمێ لەڤەنان شین دبن، ژ وانان قەرەم، ژبلی ڕووەکێ الحلفا، هندە جاران خەلکێ گوندان مفای ژ وان جۆرە ڕووەکان وەردگرن، چ وەکی ئالف بۆ تەرش و کەوالی و چ ژی بانێن خانیان پێ چێ دکەن دیسان ژێدەرەکێ باشە بۆ سۆتنێ و چەند ئاڤ مشەتر بیت، چرپیا ڤان لەڤەنان ژی پتر و درێژتر لێ دهێن، کو مرۆڤ نەشێت جۆکان تێرا ببینت یان ب ساناهی تێرا دەرباز ببیت و درێژاهیا وان هندە جاران دگەهیتە پتر ژ (٣) م، هەر وەسان هندە جاران ئەڤ ڕووەکە تێکهەل دبن دگەل هندە دارێن دی مینا بیهۆك و سپیندار و ریل و دری و کاژ و دار چناران، یان دگەل هندە گیایان کو ل پەراڤێن دوورتر شین دبن، وێنە (٨).

وێنە(٦)

وێنەکێ ئەسمانی یە، تێدا چڕی و جۆرێن ڕووەکێن ل بەر لێڤێن ڕووبارێ خابووری دیار دکەن.




- Google Earth.2014

**وێنە (٧)**

**ڕووەکێن لێڤێن جۆکێن ئاڤا (ڕووبارێ خازر).**



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری ڤە ل ٢٠١٠/٧/٧ هاتییە کێشان

**وێنە (٨)**

**ڕووەکێن دناڤ دۆلێن چیایاندا (دەڤەرا کەشانێ).**



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری ڤە ل ٢٠١٣/١٠/٣١ هاتییە کێشان

## ڤاڤارتنا ڕووەکان ل دووڤ ژینگەهێ:

### ١- ڕووەکێن ژینگەها شەهگرتی:

ئەو ڕووەکن کو خۆ دگەل کاودانێن سەقایێن شەهگرتی، کو کێم تیرۆژکا رۆژێ دگەهیتێ گونجاندین و ئەڤە ژی دپێکهاتینە ژ وان ڕووکێن دناڤ شکەفتێن شەهگرتیدا دژین، مینا وان ڕووەکێن ل ناڤخۆ دبێژنێ (گیا لاوك) ل شکەفتا جفتیکی (ئامێدیێ) و شکەفتا شەرانش- (زاخۆ)، وێنە (٩). و ئەڤ گیایە بۆ هینانا گەشتیار د جوانن.

### ٢- ڕووەکێن ژینگەهێن هشك و نیمچە هشك:

ئەو ڕووەکن کو خۆ دگەل کاودانێن سەقایێ هشك گونجاندین و دگەل بارینا بارانان شین دبن، پتریا وان د وەرزی و بەلگوەرینن، یان بەلگ تیژن دا پتر بشێن ئاڤێ دناڤ خۆدا بپارێزن، دیارترینێن وان ئەو ڕووەکن ئەوێن ل خشتەیێ (٢). ئەڤە ژی ل لایێن باشووری ژ پارێزگەها دهۆکێ ل دەشتێن سێمێل و فەیدێ و

**خشتە (٢)**

**گرنگترین جۆرێن ڕووەکێن سرۆشتی ل پشکێن ژێری ێن پارێزگەها دهۆکێ**

| ت | ناڤێ کوردی | ناڤێ عەرەبی |
|---|---|---|
| ١ | کەنگر | کعوب |
| ٢ | زیوان | زیوان |
| ٣ | قیڤار | کلفان |
| ٤ | گیاوەرینۆك | عصا الراعی |
| ٥ | براگیابیرۆڤك | زهره الحواش |
| ٦ | کاویر؛ خورنیفك | خرنوب |
| ٧ | (ب عەرەبی دبێژنە کێراتێ ژی خرنوب) | خرنوب ا سود |
| ٨ | جەهداسی | الشوفان |
| ٩ | جەهێ سپی | الشعیر العربی |
| ١٠ | جەهداسی | هرطمان علف بری |
| ١١ | کولیلکزەر | زهر اللبن |
| ١٢ | تۆلك | خباز |
| ١٣ | ددانکوسك | زند العروس |
| ١٤ | خەندەلك | خردل بری |

- دیدارەك دگەل سبحی قادر مەسعود ل رۆژا ٢٤/ ٢/ ٢٠١٣

**وێنە (٩)**
**شکەفتا شەرانش زاخۆ**



وێنە ل ٢٠١٣/١٠/٣١ ژلایێ ڤەکۆلەری ڤە هاتیە کێشان

شێخان و بەردەرەش د بەربەلاڤن و ژێدەرەکێ باشە بۆ ئالفێ گیانداران ل وەرزێ هشک ل دەڤەرێ پێك دهینن.

## ئاریشەیێن دکەڤنە درێکا رووەکێ سرۆشتی ل دەڤەرێ:

یا دیار ئەوە کو رووەکێ سرۆشتی ل دەڤەرێ وەرارێ ناکەت هەتا رێژەیەکا شەها گونجای بۆ پەیدا نەبیت، ب رەنگەکێ گشتی عەرد پشتی دو هەیڤان ژ بارینا بارانان کو ل هەیڤا چرپیا دووێ و تا هەیڤا گولانێ دباریت ب گیایان دهێتە داپووشین، ئەڤە ژی وێ چەندێ دگەهینت کو عەرد ل قوناغا بەراهیێ یا بارینا بارانان پێ رویتە و دبیتە رێ خۆشکەرەکا باش بۆ رامالینا ئاخێ ژ دەمێن دی. پشتی وەرزێ بارینا بارانان دراوەستیت[١٧] ، گیا پیچ پیچە هشك دبن دا ب ئێکجاری بەرزەببنە ڤە، ژبەر بای و گەرمێ و چەراندنێ کو پیش و پەلەخی دبەن و رۆلێ بای بۆ رامالینا ئاخێ د وەرزێ هشك دا پتر لێ دهێت، هەر وەسان چەراندنا گیاندارن پێگڤەنیسانا ئاخێ ژی سست دکەت[١٨] . ئەڤە هەمی هۆکارن کو ئاریشەیێن رامالینا ئاخێ زێدە دکەن و ب نەرێنی ل سەر رووەکی دزڤریت کو کەرەستەیێن کانزایی و خوارنێ بۆ دابین ناکەت و ئەڤە ژی ئاریشەیێن رووەکێن سرۆشتی پتر لێ دکەت، دیسان گەلەك ئاریشەیێن دی تووشی رووەکێ سرۆشتی ل دەڤەرێن ڤەکۆلینێ دبن، دیارترینێن وان:

١- برینا داران و چەراندنا نە رێکخستی: برینا داران ژ لایێ مرۆڤان ڤە هەر بەر ب زێدەبوون ڤەچوو، دا مفای بۆ چێکرنا رەژویێ و سۆتنێ و چێکرنا کەل

**وێنە (١٠)**
**چەراندنا نە رێکخستی (یا دژوار)**



وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری ڤە ل ٢٠١٣/١٠/٣١ هاتییە کێشان

و پەلێن ئاڤاهییان مفای ژێ ببینن، یان دا عەردێن وان ڕووەکان بکەنە عەردێن چاندنێ، ل هندە دەڤەران ب رێژەیێن مەزن یێن هاتینە بڕین کو دارێن نوی نەشێن جهێن دارێن کەڤن بگرن، ئەڤە ژی رێخۆشکەرن کو ل وان جهێن ڤەرێژ ئاخ پتر بێتە ڕامالین، یا پتر ئاریشێ خورت دکەت، ئاڤدانا زێدەیە ل دەڤەرێ کو ڕووەکی بخۆ گرفتارێن شینبوونێ ل وی جهی هەنە.

٢- ئەڤ ئێشێن تووشی داران دبن، ب تایبەت پویکبڕێن (حفار) قورمان و کرمێن بەلگخۆر، کو دبنە ئەگەر بۆ گیروبوونا شینبوونا داران[١٩].

٣- سۆتنێن ژ ئەگەرێن سرۆشتی، یان ژی ژ ئەگەرێن شاشییێن مرۆڤان، یان ژی ژ ئەنجامێ شەران روی ددەن، ژ وانان شەرێ عیراق و ئیران دناڤبەرا سالێن (١٩٨٠- ١٩٨٨)زێ و جەنگا کەنداڤی ل سالا (١٩٩١)زێ، بوونە ئەگەر بۆ ژ ناڤچوونا رووبەرێن بەرفرەهـ ژ دەڤەرێن دارستانی، چ ژبەر کریارێن لەشکەری یان ڤەکرنا رێکان، یان ژی ژبەر بکارئینانا راستەوخۆ یا داران بۆ گەرم کرنێ ل رۆژێن زڤستانێن سار، ئەڤە ژبلی کو خەلکێ گوندێن چیایی ژی داران ژبۆ هەمان مەبەست خرڤە دکەن.

دڤی بواریدا بەرپرسێ ژینگەها دهۆکێ ئاماژە کریە وێ چەندێ کو ژ ئەگەرێ خەمساریا گەشتیاران نێزیکی (٥٠٠٠) دۆنەمێن دارستانێن

سرۆشتی د هەیڤێن خزیران و تیرمەهێ دا تووشی سۆتنێ بووینە ل وەرزێ هاڤینێ، هەر وەسان ئاماژە کرییە کو نێزیکی (٢٠٠٠٠) دۆنەمێن دارستانان ل سالا (٢٠٠٧)ێ سۆتینە، ژبەر ڤێ چەندێ فەرمانگەها دارستانان ل سالا (٢٠٠٨)ێ رابوویە ب هەوەکا دار چاندنێ و (٤٠٠٠) نەمامێن جۆراوجۆر چاندینە[٢٠].

٤- سیستەمێ بۆر بۆ چاندنێ، ئەڤە سیستەمەکە خەلکێ دەڤەرێن چیایی پێ رادبن، ئەو ژی پێ پێکهاتییە ژ بەرهەڤکرنا رووبەرەکێ عەردی یێ گونجای بۆ چاندنا هندە دەرامەتان پشتی برینا دارێن وی جهی، ب تایبەت ل بنارێن چیا و دناڤ گەلیاندا، کو وان تراشۆکان رادکەن و گژوگیایێن وێ دسۆژن دا عەردێ دارستانێ بکەنە عەردەك بۆ چاندنا دەرامەتەکی مینا گەنم و جەهـ و دەرامەتێن بیستانان.

٥- پشتگوهـ ئیخستنا دارستانان و نەبوونا چ رێڤەبەرییێن گونجای کو پویتەی بدەنە دارستانان ب شێوێن زانستی، هەر وەسان نەبوونا پالەیێن شەهرەزا کو حەز ژ کارێ چاندێ و دارستانان بکەن.

دڤی بواری دا و ل دووڤ ئەوا مە ل سەری ئاماژێ پێ دای، ئەم دشێین هندەك پێنگاڤان ب هاڤێژین دا رێگریێ ل وان گرفتاریان بگرین و سنوورەکی بۆ ب دانین، ژوانان:

أ- دەستنیشانکرنا دەزگەهێن زانستیێن چاندنێ، یان یێن دارستانی یێن تایبەتمەند کو سەرپەرشتیێ ل سەر دارستانان بکەن و دیڤچوونێن بەردەوام و دەم بۆ دەمی ل سەر بکەن و رابن ب چاککرنا وان.

ب- دەرکرنا هندە یاسایان دا سنوورەك بۆ پێشێلکارییێن ل سەر دارستانان دهێنە کرن بێنە دانان.

پ- رابوون ب چارەسەرکرنا وان دەرد و بەلایێن تووشی دارستانان دبن، ب پەیداکرنا کادرێ تایبەتمەند و دەرمانان.

ت- پەیداکرن و بەرهەڤکرنا رێکێن کو دشێن سنوورەکی بۆ ئاگران دابنن، ب پەیداکرنا ناڤەندێن ئاگر ڤەمراندنان و پەیداکرنا فرۆکەیان کو بشێن زێرەڤانیا وان جهان بکەن.

ج- دەرکرنا پۆستەران کو خەلکی ل سەر هشیاری و گرنگی پاراستنا ڤی سامانێ سرۆشتی ئاگەهدار بکەن.

## پەراوێز:

١. مهدي الصحاف، التصريف النهري والعوامل التي تؤثر فيه،مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، المجلد١٦، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧٠، ص١٦.

٢. عبدالرزاق عباس، الجغرافية السياحية،مكتب أطلس للطباعة، بغداد، ١٩٧٦، ص١٢.

٣. قيس رؤوف عبدالله، مصدرسابق، ص ص١٩٤ – ٢٠٠.

٤. ازاد جلال شريف، احمد علي حسن، حكمت عبد العزيز، التقييم الجيومورفولوجي لحوض دربند كومسبان، مصدر سابق، ص٣٧٥.

٥. جميل نجيب عبدالله، الغابات الطبيعية في شمال العراق, مجلة كلية الآداب جامعة البصرة, العدد٥، السنة الرابعة دارالطباعة الحديثة، بصرة ١٩٧١، ص٢٠٤.

٦. علي حسين شلش وعبد علي الخفاف، الجغرافية الحياتية، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة البصرة، مطبعة جامعة البصرة، ١٩٨٢، ص١٠٨.
٧. شاكر خصباك، العراق الشمالي دراسة النواحي الطبيعية والبشرية، مطبعة شفيق، بغداد ،١٩٧٣، ص٨٠ .
٨. إقليم كردستان العراق، وزارة الزراعة والري، محافظة السليمانية، المديرية العامة للغابات، تقرير زراعي لعام ١٩٩٨، ص١.
٩. محمد خميس الزوكة، البيئة ومحاورها وأثارها على صحة الإنسان، دار المعرفة الجامعية، مصر، ٢٠٠٠، ص١٠١.
١٠. مديرية زراعة ئاكرى،قسم الغابات، تقرير غير منشور، ٢٠١٠، ص٢٨.
١١. جاسم محمد خلف، جغرافية العراق الطبيعية والبشرية والاقتصادية، ط٣، القاهرة، ١٩٦٥، ص١٣٠.
١٢. آزاد محمد أمين و آخرون، مقدمة في الجغرافيا السياحية، بغداد ،١٩٨٠، ص ١٠٦.
١٣. علي حسين شلش، مصدر سابق، ص ١١٨.
١٤. شاكر خصباك، العراق الشمالي دراسة النواحي الطبيعية والبشرية، مصدر سابق، ص٨٢ .
١٥. غازي محمود عبد الله وحسين احمد التكريتي، المراعي وأدارتها في العراق، مجلة الزراعة العراقية، وزارة الزراعة، الجزء(١ ، ٢)، المجلد ٢٤ ، ١٩٧٠، ص٦٥ .
١٦. جاسم محمد خلف، مصدر نفسه، ص ١٣٢.
١٧. غازي محمود عبد الله وحسين احمد التكريتي، المراعي وأدارتها في العراق، مصدر سابق، ص٦٦.
١٨. بسام عبد الشريف عبد الصاحب الأيوب، جيومورفولوجية مرتفعات كاني دوملان، مصدر سابق، ص٦٠.
١٩. إقليم كردستان العراق، وزارة الزراعة والري، مصدر سابق، ص١.
٢٠. وكالة انباء براثا في ٢٠٠٨/١٠/١٠.

# ژێدەرێن ئاڤێ ل پارێزگەها دهۆکێ

**پ.هـ.د. فاتن خالد عەبدولباقی**
**وەرگێران: دیان جەمیل**

مەرەم ژ ژێدەرێن ئاڤێ ل پارێزگەها دهۆکێ، هەمی ئەو ژێدەرێن ئاڤێ نە یێن دکەڤنە دناڤ سنووری پارێزگەهێ دا، ب رەنگەکی کو پارێزگەها دهۆکێ دهێتە هژمارتن ئێك ژ پارێزگەهێن هەرە دەولەمەند ب سامانێن ئاڤێ. ئاڤ نهێنیا پەیدابوونا ژیانێ یە ل سەر رووێ عەردی و بنیاتێ هەمی کریارێن چاندنێ و بربرا پشتێ یە ژبۆ ئابوورەکێ سەربەخۆ و بنیاتێ ئێمناهیا خۆراکی[1].

ژێدەرێن ئاڤێ دهێنە هژمارتن ئێك ژ کاریگەرترین فاکتەرێن چالاك یێن کارتێکرنێ ل سەر بەرقەراربوونا ژیانا مرۆڤی دکەت، ئەو ژی ژبەر گرنگییا ئاڤێ د ژیانا مرۆڤان دا و رۆلێ وێ یێ بەرچاڤ د چالاکیێن وان دا کو بنیاتێ هەبوونا مرۆڤانە د ژیانێ دا.

داهاتێ ئاڤێ ل پارێزگەها دهۆکێ ژ دو ژێدەرانە: ئەو ژی ژێدەرێن دەرەکی وەك ئاڤا بەفر و بارانان، ژێدەرێن ناڤخۆیی وەك ئاڤا کانی و بیر و کارێزان.

## بەفر و باران

پارێزگەها دهۆکێ دکەڤیتە دەڤەرەکا زەنگین ب بارینا بارانێ، رێژەیا باران بارینێ ل پارێزگەها دهۆکێ ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی یا جودایە ئەو ژی پشتبەستنێ دکەتە سەر جوداهیا بلندی و نزماتیا عەردێ پارێزگەهێ، پلا پەیوەندیا وێ دگەل گوهۆرینێن کەشوهەوایی یێن نزم، برا شێداریێ دناڤ هەوایی دا و ئاراستەیێن بای.

ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١) بۆمە دیار دبیت کو سەرجەمێ باران بارینا سالانە ل ئێستگەهێن پارێزگەها دهۆکێ ب ڤی رەنگێ خوارێ بوو:

- ل وەرزێ (٢٠٠٠- ٢٠٠١)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ سەرسنکێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٩٦٦,٩ ملم)ان، لێ کێمترین رێژە ل ئێستگەهێ بەردەرەش هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٣١١,٣ ملم)ان.
- ل وەرزێ (٢٠٠١-٢٠٠٢)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ بامەرنێ هاتبوو توومارکرن کو برا

نەخشەیێ ژێدەرێن ئاڤێ ل پارێزگەها دهۆكێ




ژێدەر: ئەڤ نەخشە ژ كارێن ڤەكولەری یە ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێن:
١. حكومەتا هەرێما كوردستانێ، وەزارەتا چاندن و ژێدەرێن ئاڤێ، رێڤەبەریا ژێدەرێن ئاڤێ ل پارێزگەها دهۆكێ، هۆبا هونەری.
٢. حكومەتا هەرێما كوردستانێ، وەزارەتا چاندن و ژێدەرێن ئاڤێ، رێڤەبەریا ئاڤا ژێرعەرد ل پارێزگەها دهۆكێ، هۆبا هونەری.

وێ گەهشتبوو (١١١٩,٥ ملم)ان، لێ كێمترین رێژە ل ئێستگەهێ بەردەرەش هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٣٨٦,٧ ملم)ان.

- ل وەرزێ (٢٠٠٢-٢٠٠٣)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دینارتە هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (١١٩٧ ملم)ان، لێ کێمترین رێژە ل ئێستگەهێ سێمێلێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٥١٤,١ ملم)ان.

- ل وەرزێ (٢٠٠٣-٢٠٠٤)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دینارتە هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (١١٤١ ملم)ان، لێ کێمترین رێژە ل ئێستگەهێ باتیلێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٥١٣,٧ ملم)ان.

- ل وەرزێ (٢٠٠٤-٢٠٠٥)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دینارتە هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٨٧٧,٢ ملم)ان، لێ کێمترین رێژە ل ئێستگەهێ دەرکارێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٣٦٠,٤ ملم)ان.

- ل وەرزێ (٢٠٠٥-٢٠٠٦)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ چەمانكێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (١١١٩,٦ملم)ان، لێ کێمترین رێژە ل ئێستگەهێ دەرکارێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٥٣٩,٩ ملم)ان.

- ل وەرزێ (٢٠٠٦-٢٠٠٧)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دەرکارێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٩٨٩,٩ ملم)ان، لێ کێمترین رێژە ل ئێستگەهێ باعەردێ هاتبوو توومارکرن کو برا وێ گەهشتبوو (٤٩٩,٥ ملم)ان.

- ل وەرزێ (٢٠٠٧-٢٠٠٨)ێ بلندترین رێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دینارتە هاتبوو توومارکرن کو برا

وێ گەهشتبوو (٤٩٢,٤ ملم)ان، لێ کێمترین ڕێژە ل ئێستگەهێ زاخۆ هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (٣٥٧,٩ ملم)ان.

- ل وەرزێ (٢٠٠٨- ٢٠٠٩)ێ بلندترین ڕێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دینارتە هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (٦٢٧,٩ ملم)ان، لێ کێمترین ڕێژە ل ئێستگەهێ بەردەرەش هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (٢٣٦,٨ ملم)ان.
- ل وەرزێ (٢٠٠٩-٢٠١٠)ێ بلندترین ڕێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دینارتە هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (١١٦٠ ملم)ان، لێ کێمترین ڕێژە ل ئێستگەهێ بەردەرەش هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (٤٣٧,٣ ملم)ان.
- ل وەرزێ (٢٠١٠- ٢٠١١)ێ بلندترین ڕێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ دینارتە هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (١٠٠٩ ملم)ان، لێ کێمترین ڕێژە ل ئێستگەهێ بەردەرەش هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (٣٨٦ ملم)ان.
- ل وەرزێ (٢٠١١- ٢٠١٢)ێ بلندترین ڕێژەیا باران بارینێ ل ئێستگەهێ سەرسنکێ هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (٨١٩,٥ ملم)ان، لێ کێمترین ڕێژە ل ئێستگەهێ باتێلێ هاتبوو توومارکرن کو بڕا وێ گەهشتبوو (٢٧١,٥ ملم)ان.
- ب ڤێ چەندێ بۆمە دیاردبیت کو بنکەهێن پارێزگەها دهۆکێ بارینا بارانێ ب ڕێژەیێ جودا جودا هاتینە توومارکرن، ئەم دشێین سەرجەمێ بارینا بەفرێ ژی ل پارێزگەها دهۆکێ د ماوەیێ دناڤبەرا (٢٠١٠-٢٠١٣)ێ ب هاریکاریا داتایێن ڤی خشتەی دیاربکەین:

ب شێوەیەکێ گشتی، بارینا بەفرو بارانێ ل دووڤ ڕێژەیێن بارینێ و سرۆشتێ دابەشبوونا وان یا جهی و دەمی ل پارێزگەها دهۆکێ، دهێنە هژمارتن ژێدەرێن سەرەکی ژێۆ زێدەبوونا ئاڤا ڕووبار و لەقێن وان، زێدەباری تەخەکا بەرفرەهـ یا ئاڤا عەمبارکری یا ژێرعەرد. ژبەر ڤێ چەندێ هەر جوداهییەك د ڕێژەیا بارینێ دا دناڤبەرا کێمبوون و زێدەبوونێ دا پەیدابیت، ب شێوەیەکێ ئەرێنی یان نەرێنی کارتێکرنێ دکەتە سەر ئاستێن ئاڤا ڕووبار و لەقێن وان و ئاڤا عەمبارکری یا ژێرعەرد، ئەڤ ئاڤە ل سالێن (ڕەوادار) شێدار زێدە دبیت و ل سالێن هشك و کێم باران کێم دبیت کو ب ڕەنگەکی ئاڤا سەر عەرد و ژێر عەرد هەردو پێکڤە کێم دبن.

## ئاڤا سەر عەرد:

تایبەتمەندیێن بارانێ و وەرزێ بارینا وێ دهێنە هژمارتن ژ فاکتەرێن سەرەکی کو قەبارەیێ ئاڤا سەر عەرد دەستنیشان دکەن، پارێزگەها دهۆکێ دهێتە هژمارتن دەڤەرەکا زەنگین ب ئاڤێ چونکی ئاڤا وێ یا سەرعەرد ب شێوەیەکێ گشتی پێکدهێت ژ ئاڤا ڕووبارێن دیجلە و خابوور و زێ مەزن و ئاڤا دەریاچەیان، ئاڤا سەر عەرد هەمی وان جۆرێن ئاڤێ بخۆڤە دگریت یێن ل سەر ڕوویێ عەردی د لڤن (میاه جاریة)، ئاڤا سەرعەرد ڕووبارێن بەردەوام و ڕووبارێن وەرزی بخۆڤە دگریت، زێدەباری ئاڤا نهالێن هشك ئەوێن ل وەرزێ زڤستانێ ژ بنێ چیا دزێن و ئاڤا باران و بەفرێ ل سەر ئێك کۆم دکەت و بەرەڤ نهالێن ڕووبارێن بەردەوام یان وەرزی دچیت.

سرۆشتێ جیومورفۆلۆژی یێ پارێزگەها دهۆکێ وەلێکرییە شیانێن وەبەرهێنانا ئاڤا وێ یا سەرعەرد د کێمترین سنوورێن خو دا بیت، و ڤێ چەندێ کارتێکرن ل سەر تایبەتمەندیێن جوگرافی و هایدورلۆژی یێن ڕووباران کرییە. هەبوونا جوداهییەکا مەزن د بلنداهییا بنێ ڕووباران دا ب تایبەت دناڤبەرا جهێ زانا ئاڤێ بوویە ئەگەر پەنگینا پێلێن ئاڤێ دناڤ ڕێرەوێ ڕووباران دا ژ ڕادێ پێدڤی بلەزتر لێ بهێت لەوڕا ئەڤ ئاڤە نەچار دبیت دناڤ نهالێن کوور یێن دناڤ چیایان ڕا ب بۆریت، پاشی ئەڤ ئاڤە ئاراستەیێ خۆ دگوهۆریت ئەوژی ژبەر سرۆشتێ چیایی کو پشتی هینگێ ل هندەك دەڤەران چەندین لێڤێن چیایی دکەڤنە سەر

سینكێ وێ لەوڕا ئاستێ بلنداهییا ڤێ ئاڤێ ژ ئاستێ جهێ زانا وێ بلندتر لێ دهێت ب ڕەنگەكی ل هندەك جهان ئەڤ ئاستە ژ (١٠٠٠) مەتران ژی دبۆریت، ئەڤ ئاستێ بلند یێ ئاڤێ دبیتە ئەگەر ب كارئینانا وێ ل دەڤەرێن چیایی بۆ مەرەمێن چاندنێ گەلەك یا ب زەحمەت بیت، بەلكو ئەڤ چەندە بوویە ئەگەر كو كریارا چاندنێ ب تنێ ل وان دەڤەران بێتە ئەنجامدان یێن بنێ رووبارێن سەرەكی و لقێن رووباران لێ بلند دبیت و هوسا چاندن ل سەر شێوەیێ مالْكان لێ دهێتە ئەنجامدان، زێدەباری ڤێ چەندێ سرۆشتێ جیومورفۆلۆژی یا چوونا رووباران بووینە ئەگەر هندەك دەڤەر ببنە ئەگەرێ وەبەرهێنانا ب دەستڤەئینانا تێهنا وزە هایدروئاڤی ب رێكا دروستكرنا سكر و عەمبارێن ئاڤێ.

**خشتەیێ (1)**

**سەرجەمێ بارینا بەفرێ ل پارێزگەها دهۆكێ (سم) دماوەیێ دناڤبەرا (٢٠١٠-٢٠١٣).**

| بنگەهـ | چریا دووێ | كانوونا ئێكێ | كانوونا دووێ | شوات | ئادار | سەرجەمێ سالانە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| زاویتە | / | / | ٥٤ | ١٦ | ٣٩.٥ | ١٠٩.٥ |
| مانگێشك | / | / | ٥٥ | ٢٤ | ٧١ | ١٥٠ |
| ئامێدی | / | ٢١ | ٢٠٩ | ٧٧ | ٨٠ | ٣٨٧ |
| سەرسنك | / | ١٠ | ٢٠١ | ٧١ | ٧٩ | ٣٦١ |
| بامەرنێ | ١ | ٤ | ١٨٥ | ٨٠ | ٨٧ | ٣٥٧ |
| دێرەلوك | / | / | ٥٩ | ١٠.٥ | ١٣.٥ | ٨٣ |
| كانی ماسێ | ٥ | ٧٧ | ٣٦١.٥ | ١٣٧ | ١٠٥ | ٦٨٥.٥ |
| سپارەتویكا | ١ | ١ | ١١٢ | ٤٧ | ٤٠ | ٢٠١ |
| چەمانكێ | / | ١٠ | ٢٢٣ | ٩٢ | ٨١ | ٤٠٦ |
| باتیفا | / | / | ٤١ | ٢٥ | ٤٥ | ١١١ |
| دینارتە | / | / | ٤١ | ٩ | ٦٣ | ١١٣ |
| دهۆك | / | / | ٢٤ | ٦ | ١.٥ | ٣١.٥ |
| سكرێ دهۆكێ | / | / | ٢٣.٢ | / | ٤ | ٢٧.٥ |
| زاخۆ (كەشوهەوا) | / | / | ٢.٥ | ٦.٥ | ٠.٥ | ٩.٥ |
| زاخۆ | / | / | ١ | ٤ | ١ | ٦ |
| دەركار | / | / | ١٦ | ٩ | ٣ | ٢٨ |
| باعەدرێ | / | / | ١٩.٥ | / | ٦ | ٢٥.٥ |
| حەسەنێ | / | / | ٢ | / | ٢ | ٤ |
| قەسرۆك | / | / | ١.٥ | / | ٢ | ٣.٥ |
| بەردەرەش | / | / | ١.٥ | / | ١.٥ | ٣ |
| شێخان | / | / | ٧ | / | ٢ | ٩ |
| ئاكرێ | / | / | ٢١ | ٣ | ٣٤ | ٥٨ |
| گردەسین | / | / | ٨ | / | ٥ | ١٣ |
| سێمێل | / | / | ٢٧ | / | / | ٢٧ |

ژێدەر: حكومەتا هەرێما كوردستانێ، وەزارەتا گەیاندن و ڤەگوهاستن، رێڤەبەریا كەشناسی و بیڤەرزان ل پارێزگەها دهۆكێ، داتایێن نەبەلاڤكری.

# رووبار:

## ١. رووبارێ دیجله:

رووبارێ دیجله ژ هژمارەکا کانیێن زنجیرەیێن چیایان ل باشووری رۆژهەلاتێ ترکیا دزێت یێن کو بلنداهییا وان دناڤبەرا (١٠٠٠-٢٠٠٠م) ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی[٢]، ئەڤ رووبارە دناڤ عەردێ وەلاتێ ترکیا را دهێت تا دگەهیتە سنوورێ هەرێما کوردستانێ ل گوندێ بێشابیرێ و پاشی دناڤ چەندین دەڤەرێن ئاسێ و پێلدار دا دبۆریت کو ل لایێ وی یێ رۆژئاڤایی مفا ژێ دهێتە وەرگرتن بۆ مەرەمێن ئاڤدانا ل دەشتا ستیکێ، رووبارێ دیجلە پشکەکێ ژ سنوورێ رۆژئاڤایی یێ پارێزگەها دهۆکێ پێکدئینیت، سەرەرای هەبوونا دەڤەرێن چیایی یێن بلند ل رۆژهەلات و باکووری رۆژهەلاتێ دیجلەی، لێ هەمی ئەو رووبارێن دهێنە سەر رووبارێ دیجلەی ژ لایێ چەپێ ڤە دهێنە سەر، هندەك ژ وان رووبارێن بەردەوام یێن درێژنە سەر دیجلەی ئەڤەنە: رووبارێ خابوور (١٥٠ کم)، زێ مەزن (٣٩٢ کم) کو نێزیکی (٤٢ کم) سنوورێ رۆژئاڤایێ پارێزگەها دهۆکێ پێکدئینیت، دناڤ سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ دا ئاڤا چەندین رووباران درێژنە دناڤ رووبارێ دیجلەی دا ب تایبەت هەردو رووبارێن خابوور و زێ مەزن.

## ٢. رووبارێ خابوور:

رووبارێ خابوور بچویکترین و ئێکەم رووبارە دناڤ سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ دا یێ کو ئاڤا وی درێژتە دناڤ رووبارێ دیجلەی دا، درێژاهییا وی ژ سەروکانییا وی هەتا گەهشتنا وی بۆ ناڤ رووبارێ دیجلەی ل دەڤەرا بێشابیرێ دگەهیتە (١٦٠) کیلومەتران. ئەڤ رووبارە ل دەڤەرا بلنداهیێن دکەڤنە دناڤبەرا سنوورێ باکووری یێ دناڤبەرا وەلاتێ ترکیا و هەرێما کوردستانێ دزێت ب رەنگەکی بەرەڤ ئاراستەیێ باشوورێ رۆژئاڤایی ڤە دچیت هەتا دگەهیتە رووبارێ دیجلەی ل دەڤەرا بێشابیرێ و رووبەرێ حەوزا وێ دگەهیتە (٦٢٦٨ کم٢)[٣]. کانی یێن سەرەکی یێن زانا رووبارێ خابووری دکەڤنە باکوورێ کوردستانێ دناڤ چیایێن هەرەکول و جۆدی، ئەڤ رووبارە ئاڤا خۆ ژ ئاڤا دو رووبارێن دی وەردگریت ئەوژی رووبارێ خابووری ل بەشێن رۆژهەلاتی و رووبارێ هێزل، زێدەبارێ لقێن چەندین رووبارێن دی کو دناڤ قەزایێن زاخۆ و دهۆکێ دا دگەهنە سەر رووبارێ خابووری. پشتی ئەڤ رووبارە دگەهیتە دناڤ سنوورێن هەرێمێ دا دناڤ نهالەکا کوور و ئاسێ دا دبۆریت هەتا دگەهیتە کۆمەڵگەها (بێگوڤا) و پاشی گوندێ (بابیرێ) کو ل وێرێ ئەڤ رووبارە ئاراستەیێ خۆ ل چەندین دەڤەران دگوهۆریت دناڤبەرا رۆژهەلات و رۆژئاڤا و باکوور و باشووری دا ب تایبەت دناڤبەرا گوندێن (رۆسی) ل قەزا زاخۆ و (گەرمکێ) ل قەزا ئامێدیێ. ل نێزیکی گوندێ بابیرێ ئەڤ رووبارە بەرەڤ لایێ رۆژئاڤایی دچیت تا دگەهیتە زنجیرا چیایێ مەتینی، ل ڤی جهێ رووباری ژ لایێ رۆژهەلاتێ قەزا ئامێدیێ ڤە کۆمەکا رووبارێن دی دهێنە سەر ب تایبەت رووبارێن (دویفاف و شیف کووری و رووبێ هرورێ و نەهنك).

پاشی ئەڤ رووبارە ئاراستەیێ خۆ بەرەڤ باکوورێ رۆژهەلات و باشوورێ رۆژئاڤایی دگوهۆریت دناڤبەرا گوندێن (بابیری و بارهولێ) بەری کو جارەکا دی ئاراستەیێ خۆ بەرەڤ باکوور و باشووری ب گوهۆریت هەتا دگەهیتە گوندێ (دوکەرێ) ل هندەك دەڤەران کو ل وێرێ ژی ئێك ژ لقێن وی یێن سەرەکی دگەهیتێ ئەوژی رووبارێ (سبنە) یێ رۆژئاڤایە، تێکرایێ سالانە یێ بوورینا ئاڤا رووبارێ خابووری ل گوندێ دوکەرێ دگەهیتە (٣٢م٣/چرکە).

## ٣. رووبارێ زێ مەزن:

رووبارێ زێ مەزن دهێتە هژمارتن ئێك ژ مەزنترین و گرنگترین وان رووبارێن ئاڤا وان درێژتە سەر رووبارێ دیجلەی کو ژ دەڤەرێن چیایی یێن دکەڤنە دناڤبەر (وان)ێ ل باکوورێ کوردستانێ و دەریاچا (ئورمیێ) ل رۆژهەلاتێ کوردستانێ دزێت و بلنداهییا وان دگەهیتە پتر ژ (٣٠٠٠ م) ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی. ئەڤ رووبارە ل سنوورێ دناڤبەرا تورکیا- عیراقێ دبریت ل لایێ رۆژئاڤایێ گوندێ (شال) ل باکوورێ قەزا

ئامێدیێ را دگەهیتە ناڤ ئاخا هەرێما کوردستانێ و پاشی دناڤ کۆمەلگەها دێرەلوکێ را دبۆریت و بەرەڤ ئاراستەیێ باشووریٔ رۆژهەلاتی ل ویرێ رووبارێ (روویێ شین)[٤] دهێتە سەر و دناڤبەرا چیاێن (شیرین و پیرس) و د دەڤەرا (بارزان)را دچیت کو سنوورێ د ناڤبەرا پارێزگەها دهۆکێ و پارێزگەها هەولێرێ پێکدینیت.

هەردیسان هندەك رووبارێن دی یێن بچویك و نهالێن وەرزی هەنە کو ئاڤا وان درێژتە سەر رووبارێ زێ مەزن، لێ ئەو رووبارێن کو ل پارێزگەها دهۆکێ دزێن و پشکەکێ ژ سنوورێ وێ دیاردکەن ئەڤێن خوارێ نە:

- **روویی شین (شەمدینان):**

کانییێن سەرەکی یێن زانا ڤی رووباری دکەڤنە دناڤ چیاێن (باباز و ئیکیالی و یورول) ل دەڤەرا هەکاری ل باکوورێ کوردستانێ کو د بنەرەتدا ئەڤ رووبارە ژ دو لقان پێکدهێت ئێك ژ وان ژ لایێ رۆژهەلاتی و یێ دی ژ لایێ رۆژئاڤایی دهێت و سنوورێ هەرێما کوردستانێ ل نێزیك قەزا ئامێدیێ ب دووراتییا (٦ کم) ل گوندێ (چەم توی) دگەهنە ئێك و پاشی ئەڤ رووبارە ئاراستەکێ دی وەردگریت دناڤبەرا باکوور و باشووری دا دناڤبەرا بەشێن باکووری یێن گوندێ (شیمبینی) هەتا بەشێن رۆژهەلاتی یێن گوندێ (مێز)، ل ڤێ دەڤەرێ ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە مەزنترین و گرنگترین لقێ وی دهێتە سەر و ئەو ژی رووبارێ (شەمدینان)ە کو کانی یێن زانا وی دکەڤنە بەشێن باشوورێ رۆژهەلاتێ ترکیا ل نێزیك سێگوشەیا سنووری دناڤبەرا ترکیا و عیراق و ئیرانێ و درێژاهییا وی دگەهیتە نێزیکی (٦٠ کم)[٥].

پشتی رووبارێ روویی شین دگەل رووبارێ شەمدینان ئێکدگرن، ئاراستەیێ خۆ دگوهۆریت و بەرەڤ بەشێن باشوورێ رۆژئاڤایی ڤە دچیت و دکەڤتە د نهالەکا کوور و ئاسێدا و گەلەك تیژاتی و رێکین خوار دکەڤنە بەر سینگێ وی هەتا دگەهیتە خالا (گەلیێ بالندا)، بەری بگەهیتە ڤی گەلی ب دووراتییا (٦ کم) ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە رووبارەکێ دی دگەهیتێ ئەو ژی رووبارێ (ئاڤا مارکی) یە و پشتی ژ گەلیێ بالندا دبۆریت دگەهیتە رووبارێ زێ مەزن ب دووراتییا کێمتر ژ (١,٥ کم). ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە دناڤبەرا گوندێ (مێز) هەتا رووبارێ (ئاڤا مارکی) ئاڤا هژمارەکا نهالێن سەرەکی درێژتە دناڤ رووبارێ روویێ شین دا کو ژ گرنگترین نهالان نهالا (دووشاخی) یێ کو ژ لایێ باکووری هەتا باشووری ب درێژاهییا (٥,٣ کم) درێژدبیت، هەردیسان رووبارێ (بریمکی) ب درێژاهییا (٥,٥ کم) و رووبارێ (بافی) ب درێژاهییا (٥ کم) و رووبارێ (باوا) ب درێژاهییا (٢,٥ کم) درێژنە سەر. ب ڤی رەنگی درێژاهییا رووبارێ روویی شین دگەهیتە (١٠٢,٤ کم) و تێکراییێ سالانە یێ بۆرینا ئاڤێ ل نێزیك کۆمەلگەها (سیریێ) تێدا دگەهیتە (١٥٠ م٣/چرکە)، رووبارێ شەمدینان ل دەڤەرەکا چیایی یا گەلەك ئاسێ دزێت کو دناڤ چەندین نهالێن کوور دا دبۆریت و ل هەردو لایێن وی لێڤێن چیایی یێن بلند تیژ هەنە کو دبنە ئەگەر هێزا بۆرینا ئاڤێ تێدا بلەزتر لێ بهێت.

ئاراستەیێ گشتی یێ رووباری ژ باکووری هەتا باشووری دبیتە ئەگەرێ پێکئینانا سنوورەکێ سرۆشتی و کارگێری دناڤبەرا پارێزگەها دهۆکی و هەولێرێ، رووبەرێ حەوزا شەمدینان دگەهیتە (٢٦٠٠ کم٢) و پاشی رووبارێ شەمدینان درێژتە دناڤ رووبارێ زێ مەزن دا پشتی کو ژ گەلیێ بالندا دەردکەڤیت ب ماوەیەکێ کێم[٦].

- **خازر- گومەل:**

رووبارێ خازر ئێکە ژ وان رووباران یێن دناڤ سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ دا دزێت کو کانی یێن وی یێ سەرەکی دکەڤنە گوپیتکا چیایێ گارەی ل نێزیکی دەڤەرا (کافیا)[٧]، ژ لایێ راستێ ژ رووبارێ خابووری رووبارێ زێ مەزن یێ باشووری (ئەسکی کەلەك) درێژتە سەر ب دووراتییا (١٤ کم). رووبەرێ گشتی حەوزا رووبارێ خازری هەتا سکرێ (باکرمان) دگەهیتە (٧٢٤ کم٢) و قەبارەیێ دەشتا دکەڤیتە پشت سکرێ باکرمان دگەهیتە (١٥٦٠ کم٢)، ئاڤا ڤی رووباری زێدەدبیت ل

خالا گەهشتنا وی ئەوا دکەڤیتە باکووری پرا (مەندان) و رووبەرێ حەوزا وێ دناڤبەرا رووبارێن خازر – گومەل دگەهیتە (٥١٣کم٢). درێژاهیا رووبارێ خازری ژ خالا زانا وی هەتا دگەهیتە زێ مەزن نێزیکی (٩٠ کم) و ب ڤێ چەندێ تێکرایێ سالانە یێ بۆرینا ئاڤێ تێدا دگەهیتە (٤٧,٤ م٣/چرکە) و نێزیکی (١٠,٧٪)ێ ژ هەرکینا گشتی یا رووبارێ زێ مەزن پێکدئینیت.

• **کانی ماسێ:**

کانی یێن دەڤەرا (بێدوهـ و بناڤیا) دهێنە هژمارتن سەروکانیێن سەرەکیێن ڤی رووباری، خەلکێ ڤان دەڤەران ژی مفای ژ ئاڤا ڤی رووباری بۆ مەرەمێن چاندن و ئاڤدانێ وەردگرن. پشتی کو ئەڤ رووبارە د هندەك دەڤەرێن جوداجودا و خودان سرۆشتەکێ پری بلنداهی و نزماتی را دبۆریت ل داویێ درێژتە سەر رووبارێ زێ مەزن ل رەخ پرا ناڤدار ب پرا (بلبل)[8].

هەردیسان ب دەهان رووبارکێن بچویك هەنە کو ئاڤا وان ژ بلنداهیێن زنجیرا چیایێن (گارە، مەتین، و بەرواری بالا، شەرانش، ئاکرێ و پیرس) دزێن وەك رووبارێن (دهۆك، شەرانش، نینك، مارسیس و بریشو زەنتە).

• **هیزل:**

رووبارێ هیزل ل چیایێن (هەراکول داغ) ل باکووری کوردستانێ دزێت و پاشی بەرەڤ ئاراستەیێ باشووری دچیت و ل نێزیك گوندێ (دەشتە تەختێ) دهێتە دناڤ سنووری عیراقێ دا و پاشی درێژتە دناڤ رووبارێ خابووری ل لایێ رۆژئاڤایێ باژێرێ زاخۆ ب دووراتیا (٨ کم).

## رووبارێن وەرزی:

ئەڤ رووبارە ب هندێ دهێنە نیاسین کو ب تنێ ل هندەك هەیڤێن سالێ ئاڤ تێدا دبۆریت ب تایبەت ل وەرزێن (زڤستان و بهارێ) و ل هندەك وەرزێن دی هشك دبیت ب تایبەت ل (هاڤین و پاییزێ) و بەفر و باران ژێدەرێ سەرەکی یێ پەیدابوونا ڤان رەنگە رووبارانە. ئەڤ رووبارە ب تنێ هندەك لڤێن سەرەکی یان ناڤنجی یێن رووبارێن بەردەوامن ژبەر هندێ درێژبوونا وان (هەرکینا وان و ئەو دەڤەرێن چاندنێ یێن پێ دهێنە ئاڤدان) ژ لایێ جوگرافیڤە ژ سنووری پارێزگەها دهۆکێ نادەرکەڤن.

• **سپنەیێ رۆژهەلاتی:**

دهێتە هژمارتن مەزنترین و گرنگترین رووبارێ وەرزی ل قەزا ئامێدیێ و درێژاهیا وی دگەهیتە (٣١,٣ کم) و ژ ئەنجامێ خرڤەبوونا ئاڤا وان نهالان دروست دبیت یێن ژ بلنداهیێن باشووری یێن زنجیرا چیایێ مەتین و بلنداهیێن باکووری یێن چیایێ گارەی پەیدادبیت. ئاڤا وی بۆ ئاڤدانا پشکا رۆژهەلاتی یا عەردێ چاندنێ یێ قەزا ئامێدیێ دهێتە ب کارئینان. رێکا دناڤبەرا باژێرێ سەرسنگێ و گوندێ ئێنیشکێ دهێتە هژمارتن سنووری ژێکڤەکرنێ دناڤبەرا ڤی رووباری و عەردێ چاندنێ یێ رووبارێ سپنەیێ رۆژئاڤایی.

ژلایێ باکووریڤە ئاڤا هژمارەکا نهالان درێژتە سەر ڤی رووباری کو هندەك ژوان د وەرزینە و هندەك ژی یێن بەردەوامن ب تایبەت ئاڤا نهالا بەرێ کەر (٧,٦ کم) و نهالا بۆتیا (٧,٣ کم) و ئاڤا رووبارێ ئامێدیێ (٦,٦ کم).

لێ ئەو دەڤەرا دکەڤیتە دناڤبەرا رۆژهەلاتێ سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ و رووبارێ زێ مەزن، هندەك نهالێن هەین ئاڤ ب شێوەیەکێ وەرزی تێرا دبۆریت و درژێتە دناڤ رووبارێ سپنەیێ رۆژهەلاتی دا، ژ وان نهالا مریبکا (٤,٨ کم) کو ژ لایێ رۆژئاڤایی هەتا رۆژهەلاتی درێژدبیت، نهالا کانێ (٣,٦ کم)، نهالا مێرگا (٤,٤ کم)، نهالا سەرگەلێ (٥,٥ کم)، نهالا کەلیکا گەرماڤی (٥,٣ کام) و نهالا سەرسوباری (٣,٢ کم).

رووبارێ (سپنە) کو رووبارەکێ بچویکە د بنەرەتدا ژ وێ ئاڤا ژ چیایێن (گارە و مەتینی) دزێت و د ماوەیێ بۆرینا خۆ دا ژ لایێ باشووریڤە ل بەر باژێرێ ئامێدیێ را دبۆریت و بەردەوام دبیت هەتا درێژتە رووبارێ زێ مەزن ل باشووری دەڤەرا دێرەلوکێ[9] و رووبەرێ گشتی یێ وی عەردێ چاندنێ یێ ب ئاڤا رووبارێ سپنەیێ

رۆژهەلاتی دهێتە ئاڤدان دگەهیتە (٤٥٢,٦ کم٢).

## • سپنەیێ رۆژئاڤای:

ئەڤ رووبارە ئاڤا پشکا رۆژئاڤایی یا دەڤەرا ئامێدیێ پێکدهینت و درێژاهیا وی دگەهیتە (٢٨کم). ئەڤ رووبارە ژ ئەنجامێ ئێککرتنا ئاڤا هژمارەکا نهالان پەیدابیت یێن ئاڤا وان ژ نزماتیێن رۆژئاڤایی یێن چیایێ مەتین و نزماتیێن باکوورێ رۆژئاڤایی یێن چیایێ گارەی ژ باژێرێ سەرسنکێ هەتا سیارەتویکا دزێت، لێ ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە هەتا حەوزا رووبارێ خابووری درێژدبیت.

رووبارێ سپنەیێ رۆژئاڤایی ژ ئێککرتنا ئاڤا نهالا سەرسنکێ (٥ کم) ژ لایێ باشووری و ئاڤا نهالا خاری کندورە (٨,٢ کم) ژ لایێ باکووری کو کانیێن وی سەرەکی دکەڤنە وێرێ و پاشی ئەڤ رووبارە بەرەڤ ئاراستەیێ باشووری دچیت بەرەڤ لایێ رووبارێ خابووری دناڤ دەڤەرەکا چیایێن نزم و گرکێن ئاسێ، ژ لایێ باکووریڤە ئاڤا هژمارەکا نهالێن دی درێژت سەر کو پتریا وان د وەرزینە ب تایبەت ئەوێن ژ رۆژهەلاتی بەرەڤ رۆژئاڤای درێژ دبن وەك نهالا شیڤا کانیکا (٤,٤ کم)، نهالا ئەرەدنا (٤,١ کم) و ئاڤا بامەرنێ (٥,١ کم) و گەلەکێن دی.

لێ ژ لایێ باشووریڤە ئاڤا سێ نهالێن سەرەکی درێژتە سەر کو ئەوژی ئاڤا نهالا سەرسنك (٤,٩ کم)، ئاڤا ئاشەوا (٨ کم) و ئاڤا بێتکارێ (٤,٥ کم)، رووبەرێ گشتی یێ حەوزا رووبارێ سپنەیا رۆژئاڤایی دگەهیتە (٣١٩,١ کم٢).

## • رووی سۆرك:

ئەڤ رووبارە ڤەرێژا ئاڤا بەشێ باکووری و باکوورێ رۆژهەلاتێ دەڤەرا بەرواری بالا یە و ب شێوەیەکێ گشتی بەرەڤ باکوورێ رۆژئاڤایی و باشوورێ رۆژهەلاتی دچیت دناڤ دەڤەرەکا چیایی یا ئاسێ را دبۆریت کو بلنداهیا وێ دەڤەرا دۆرماندوری کانیێن وێ یێن باکوورێ رۆژئاڤایی دناڤبەرا (٢٠٠٠-٢٣٠٠ م) ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایێ یە ب تایبەت ل دەڤەرا نێزیکی گوندێ (ئۆرە)، لێ ل دەڤەرێن دەوروبەری گوندێ (چەمی، دێرکێ، هەلوە، سەردەشتێ) ئاستێ وی بەرەڤ نزمبوونێ دچیت دناڤبەرا (١٧٠٠- ٧٥٠ م) ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی، ئەڤ رووبارە دناڤ سەنتەرێ ناحیا کانی ماسێ را دبۆریت و پاشی ب دووراتیا (١٣,٥ کم) دچیت بەری کو برێژتە سەر رووبارێ زێ مەزن و ب ڤی رەنگی سەرجەمێ درێژاهیا وی دگەهیتە (٢٤,٥ کم).

کانیێن سەرەکی یێن ڤی رووباری ل دەڤەرا باکوورێ گوندێ ئۆرە دزێن و پاشی ل لایێ باشووری ئاڤا نهالا چەمانکێ (٨,١ کم) و شارانێ (٥,٥ کم) ل نێزیکی گوندێ بێدوهێ درێژتە سەر، ل دووڤدا ب درێژاهیا (٤ کم) دچیت هەتا دگەهیتە سەنتەرێ ناحیا کانی ماسێ و پشتی هینگێ ب درێژاهیا (١٣,٥ کم) دچیت هەتا دگەهیتە رووبارێ زێ مەزن و ل داوییێ درێژاهیا وی دگەهیتە (٢٤,٥ کم) و رووبەرێ حەوزا وی دگەهیتە (٣,١٩٢ کم٢).

## دەریاچە:

دەریاچەیێن دەستکرد و یێن سرۆشتی ل پارێزگەها دهۆکێ دهێنە هژمارتن ژ ژێدەرێن ئاڤێ یێن سەرەکی و گرنگ ژبۆ ئاڤدانا عەردێن چاندنێ یێن دکەڤنە دەوروبەرێ ڤان دەریاچان، تێبینی دهێتەکرن کو بەهرا پتر دەریاچەیێن دەستکرد ل هەرێما کوردستانێ ل دەڤەرێن چیایی و نیمچە چیایی هاتینە دروستکرن ئەو ژی ب رێکا دانانا سکران ل وان دەڤەران ب تایبەت وەك سکرێن هاتینە دانان ل سەر رووبارێ دیجلە و ب ڤی رەنگی هندەك دەریاچەیێن دەستکرد دناڤ رێرەوێن چیایی یێن سرۆشتی دا دروستبووینە وەك دەریاچا دهۆکێ و مووسل کو دهێنە هژمارتن گرنگترین دەریاچە (سکر و عەمبارێن هەلگرتنا ئاڤێ) ل پارێزگەهێ.

## • دەریاچا دهۆکێ:

دەریاچا دهۆکێ دکەڤیتە باکوورێ باژێری ل

حەوزێن رووباران ل بەشێ باکووریێ پاریزگەها دهۆکێ




دەڤ دەرگەهێ (گەلیێ دهۆکێ) و ب دووراتیا (۲ کم) ژ سەنتەرێ باژێری یا دوورە و ئەڤ دەریاچە ژ ئەنجامێ ئێکگرتنا هەردو رووبارێن سندۆر و گەرماڤا دروستبوویە، زێدەباری هەبوونا چەندین ژێدەرێن دی یێن ئاڤێ وەك کانیێن گۆگردی (کبریتی) ئەڤێن ب درێژاهیا سالێ ئاڤ ژێ دزێت، دروستکرنا ڤێ سکری و گشت بەشێن وێ ل سالا (۱۹۹۰)ێ هاتینە تەمامکرن، درێژاهیا وێ دگەهیتە (٦١٢ م) و بلنداهیا وێ نێزیکی (٦٤ م) لێ ئاستێ بلنداهیا لێڤا سەری دگەهیتە (٦٤٠ م) ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی و شیانێن هەلگرتنا (٥٢ ملیون م٣) یێن ئاڤێ هەنە.

مەرەم ژ دروستکرنا سکرێ دهۆکێ عەمبارکرن و هەلگرتنا ئاڤا بەفر و بارانایە ل وەرزێن زڤستان و بهارێ داکو ل وەرزێ هاڤینێ ب شێوەیەکێ رێکخستی نێزیکی (١١) هزار دۆنەمێن عەردێ چاندنێ ل دەشتا (مالتا و سێمێلێ) ل بەر بێنە شینکرن، زێدەباری دابینکرنا ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ ئاکنجیێن پاریزگەها دهۆکێ، هەردیسان ژێ مەرەما ب خودانکرنا ماسیيان د حەوزا سکری دا. ئاڤا دهۆکێ ب هندێ دهێتە نیاسین کو رێژەیەکا بلند یا خوێێن گۆگردی دناڤدا هەیە[10].

## • دەریاچا مووسل:

دەریاچا مووسل ئاڤەکا سەر عەردە ژ ئەنجامێ دروستکرنا سکرێ ل بەر سینگێ وێ ل سەر ئێك خرڤەبوویە و دکەڤیتە باکووریێ باژێرێ مووسل و رۆژئاڤا و باشووری رۆژئاڤایێ باژێرێ دهۆکێ، درێژاهیا ڤێ دەریاچێ نێزیکی (٣٦٠٠ م) و بلنداهیا وێ (١٣١ م)ە، لێ ئاستێ بلنداهیا ئاڤا وێ دگەهیتە (٣٣٦ م) ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی، ب کێمی ڤێ دەریاچێ شیانێن هەلگرتنا نێزیکی (١٢,٥ ملیار م٣) یێن ئاڤێ هەنە، لێ نێزیکی (١١,٤٣ ملیار م٣) یێن ئاڤێ تێدا هەنە و هێزا هەرکینا ئاڤێ تێدا دگەهیتە (٥٦٠٠م٣/ چرکە)[11].

مەرەم ژ دروستکرنا ڤێ دەریاچێ ئەوبوو داکو ئاڤا رووبارێ دیجلەی بێتە کونترۆلکرن و مەترسیا لەهیيان کێم بکەت، زێدەباری ئاڤدانا رووبەرێن

وێنە (١)
جهێ دەریاچا باژێرێ دهۆکێ



بەرفرەهـ بێن عەردێن چاندنێ و پەیداکرنا تێهنا کارەبێ، هەردیسان بۆ مەرەمێن گەشتوگوزاری و زێدەکرنا سامانێ ماسییان.

## ئاڤا ژێرعەرد:

ئاڤا ژێرعەرد دهێتە هژمارتن ئێك ژ زێدەرێن ئاڤێ یێن سرۆشتی و گرنگ ژبەرکو عەمبارەکا ئاڤێ یا گرنگە کو مفا ژێ دهێتە وەرگرتن بێی هەبوونا مەترسیان یان ژ زیانان ئەوێن ژ ئەنجامێ هەلمبوون یان پیسبوونا ئاڤێ پەیدادبن، هەردیسان دەرئێخستنا ڤێ ئاڤێ پێدڤی ب پارەیەکێ مەزن ناکەت[١٢]. گەلەك فاکتەر هەنە کارتێکرنێ ل سەر دروستبوون یان دەستنیشانکرن و دابەشبوونا ئاڤا ژێرعەرد دکەن وەك کەشوهەوا و توپۆگرافیا عەردی و سرۆشتێ کەڤران و پلا کونداریا وان، هەردیسان پلا گەرماتیێ و هێزا بای و رێژەیا بەفر و باران بارینێ و رێژەیا (رەوا) شێداریێ هەمی پێکڤە بەشداریێ د دەستنیشانکرنا بڕا ئاڤا ژێرعەردا دکەن.

ژ ئالیێ گرنگییا سەرەکیڤە ژبۆ بەردەوامیا ژیانێ ل سەر ڕوویێ عەردی، ئاڤا ژێرعەرد پشتی ئاڤا سەرعەرد دهێت، ئەڤ ئاڤە کارتێکرنێ ل سەر هندەك ژێدەرێن دی دکەت وەك پەیتیا ئاخێ و جۆرێ وان شینکاتیێن ئاخێ دنخێڤن و زێدەبوونا سامانێن گیانەوەری، هەردیسان کارتێکرنێ ل سەر سەرکەفتنا چالاکیێن چاندنێ و ئاکنجیبوونا مرۆڤان و قەبارەیێ ئاکنجیبوونا وان دکەت، د هەمان دەمدا رۆلەکێ گرنگ د گەشەکرنا چالاکیێن ئابووری و جڤاکی دا هەیە[١٣].

ئاڤا ژێرعەرد ئەو ئاڤە یا دکەڤتە بن ڕوویێ عەردی ڤێجا چ یا ڕاوەستیایی بیت یانژی بچیت، و ئەڤ ئاڤە ل سەر ڕوویێ ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر ڕەنگێ کانی و برکان دزێت یانژی ب شێوەیەکێ دەستکرد ژ لایێ مرۆڤان ڤە دهێتە دەرئێخستن ل سەر شێوەیێ بیر و کارێزان.

لڤینا ئاڤا ژێرعەرد ل دەڤەرێ دکەڤیتە ژێر کونترۆلا سیستەمێ دەڤەرێن ئاسێ و دەستپێکێن چیایی کو کارتێکرنێ ل سەر لڤینێن وێ ژ باکوورێ رۆژهەلاتی بەرەڤ باشووری رۆژئاڤایی دکەن ئەو ژی ژبەر بلندبوونا

تۆپۆگرافی یا پارێزگەهێ کو دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا فشارەکا هایدرۆلیکی یا بلند بۆ چیایان، ژبەر ڤێ چەندێ بەلاڤبوونا وان ل پارێزگەهێ دمینتە سەر تایبەتمەندیێن تۆپۆگرافی و جیولوجی (ژێدەرێ ٥، ١٣٧).

پارێزگەها دهۆکێ رێژەیەکا باش یا ئاڤا ژێرعەردێ یا عەمبارکری هەیە کو وەك یەدەگ ل وەرزێن پێدڤی و هشك دهێتە ب کارئینان ب تایبەت ل دەڤەرێن (دەشتا ئاکرێ، نافکورێ، دەشتا سندییا و دەشتا سلێڤانەیا) کو هندەك دەڤەرێن چیایی نە و خودان سرۆشتەکێ جیولوجی و هایدرولوجی یێن گونجاینە بۆ عەمبارکرنا ئاڤا ژێرعەردێ. ل پارێزگەها دهۆکێ چەندین ژێدەرێن ئاڤا ژێرعەرد هەنە وەك بیر و کانی و برك و کارێزان، ژ گرنگترین شێوەیێن ئاڤا ژێرعەرد ئەڤەنە:

## • بیر

بیر کۆرکەکا مەزنە دناڤ کووراتیەکا عەردی دا دهێتە کۆلان هەتا دگەهیتە ئاستێن ئاڤێ ژ ئاڤا ژێرعەرد یان عەمبارکرنا وان بۆ مەرەمێن وەبەرهێنانێ، بیر دهێنە هژمارتن بەربەلاڤترین رێکێن ب دەستڤەئینانا ئاڤا ژێرعەرد، هەردیسان ژێدەرەکێ سەرەکینە بۆ ئاڤا ڤەخوارنێ و ئاڤدانا گیانەوەران و جهێن چاندێ یێن هاڤینێ[١٤].

کۆلانا بیرێن ئاڤێ ل پارێزگەها دهۆکێ ئێك ژ رێکێن هەرە کەڤنە ژبۆ ب دەستڤەئینانا ئاڤێ بۆ مەرەمێن ناڤمالێ و چاندنێ و گەلەکێن دی، دو جۆرێن بیران هەنە ئەو ژی بیرێن سادە ئەوێن ب رێکێن کلاسیکی ژ لایێ کەسێن تایبەتمەندڤە د ڤی بواریدا دهێنە کۆلان و کووراتیا وان دناڤبەرا (٤-٣٥ م)، لێ جۆرێ دووێ بیرێن ئیرتیوازی نە کو ئاڤا وان ب رێکا فشارا هایدرولیکی دهێتە سەر رووبێ عەردی و بۆ کۆلانا وان چەندین کەرەستە و ئامیرێن تەکنولوژی یێن پێکشەفتی دهێنە ب کارئینان و ب شێوەیەکێ گشتی کووراتیا وان دناڤبەرا (٥٠-٢٥٠ م) یان پتر دایە.

## • کانی

ئەڤ جۆرێن ئاڤا ژێرعەرد ب شێوەیەکێ سرۆشتی ژ عەمبارێن خۆ یێن بن عەردی دگەهنە سەر رووبێ عەردی، یانژی دناڤ هندەك تەخێن کەڤران دا دهێنە دەر و سەر رووبێ عەردی دیاردبن، یانژی دیاردەیا دەرکەفتنا

**خشتەیێ (٢)**
**بیر ل پارێزگەها دهۆکێ ل دووف قەزایان.**

| قەزا | ژمارا بیرێن بەرهەمهێنەر | ژمارا بیرێن نەبەرهەمهێنەر | تێکرایێ بەرهەم ئینانێ گالون/خولەك | بەرهەم ئینانا گشتی م٣/ سال |
|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ١٢٥ | ١٤ | ٩٥.١ | ٢٣٦١٧٧٠٤.٦ |
| سێمێل | ٢٠٥ | ١٥ | ٩٣.٢ | ٣٧٩٥٩١٨٩.٤ |
| بەردەرەش | ٩٣ | ١ | ١٧٧.٩ | ٣٢٨٧٠٤٨٠.٥ |
| ئامێدی | ٧٣ | ١١ | ٧٢.٢ | ١٠٤٧١٤٥٩.٤ |
| شێخان | ١٠٢ | ٦ | ١١٧.٨ | ٢٣٨٧٢٢٠٩.٥ |
| ئاکرێ | ٩٤ | ١٣ | ١٢٢.٩ | ٢٢٩٥٢٣٣٥.٩ |
| زاخۆ | ١١٦ | ١١ | ١٠٨.٣٢ | ٢٤٩٦٣٩٧٨.٣ |

ژێدەر: حکومەتا هەرێما کوردستانێ، وەزارەتا چاندن و ژێدەرێن ئاڤێ، رێڤەبەریا ئاڤا ژێرعەرد، دهۆك، هۆبا دەستووریان، داتایێن نەبەلاڤکری، ٢٠١٣.

**خشتەیێ (٣)**
**کانی ل قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ.**

| قەزا | هژمارا گشتی یا ژێدەران | ناحیە | هژمارا گشتی | کانیێن بەرهەم هێنەر | هەرکینا ئاڤێ تێدا لتر/چرکە | کانیێن هشک |
|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ٤٨٥ | باتیفا | ٢٢٢ | ١٧٩ | ١٤٧٨.٦ | ٤٣ |
| | | دەرکار | ١٣٣ | ٩٦ | ١١١٠.٨ | ٣٧ |
| | | رزکاری | ١٣٠ | ٩٩ | ٧٥٠.٤٨ | ٣١ |
| دهۆک | ٥٨٥ | زاویتە | ٣١٧ | ٢٢٥ | ٢٢٧.٥٩ | ٩٢ |
| | | سەنتەرێ دهۆکێ | ١٠ | ٥ | ١٥.٣٢٥ | ٥ |
| | | مانگێشک | ٢٥٨ | ١٦٩ | ٣٧١.٣٢ | ٨٩ |
| سێمێل | ١٥٧ | باتێل | ٨٨ | ٦٦ | ١٥.٢٩٨ | ٢٢ |
| | | سەنتەرێ سێمێلێ | ٦٤ | ٤٦ | ١٤.٨٤٧ | ١٨ |
| | | فەیدیێ | ٥ | ٤ | ٣٧.٥ | ١ |
| ئاکرێ | ٧٢٤ | بجێل | ٢١٢ | ١٦٣ | ٣٣.٨٩٢ | ٤٩ |
| | | سەنتەرێ ئاکرێ | ١١٠ | ١٠٨ | ١٠٠.٨٥ | ٢ |
| | | گردەسین | ٤٠٢ | ٢٣٦ | ١٠٠ | ١٦٦ |
| ئامێدی | ٦١٥ | دێرەلوک | ٩٩ | ٩٩ | ١٦٥٦.٩ | - |
| | | سەرسنک | ٢٢٣ | ١٨٠ | ٥٢١.٧ | ٤٣ |
| | | سەنتەرێ ئامێدیێ | ١٠٢ | ٩٦ | ١١٩.٣٣ | ٦ |
| | | بامەرنێ | ١٦٧ | ١٢١ | ٢٠٦.٦٦ | ٤٦ |
| | | کانی ماسێ | ٢٤ | ٢٤ | ١١٩.١٧ | - |
| شێخان | ٤٨٥ | باعەدرێ | ٣٣ | ٣٣ | ١٥.٦ | - |
| | | ئەترووش | ٢٧٠ | ٢٢٣ | ١٥٢.٥٩ | ٤٧ |
| | | سەنتەرێ شێخان | ٣٠ | ١٢ | ٤.٧٥ | ١٨ |
| | | قەسروک | ٨٤ | ٤٧ | ١٧.٥٤٢ | ٣٧ |
| | | زیلکا | ٦٨ | ٤٠ | ٦.٤٣٧ | ٢٨ |
| سەرجەمێ گشتی | ٣٠٥١ | | ٣٠٥١ | ٢٢٧١ | ٧٠٧٧.٢ | ٧٨٠ |

**ژێدەر: حکومەتا هەرێما کوردستانێ، وەزارەتا چاندن و ژێدەرێن ئاڤێ، رێڤەبەریا گشتی یا ژێدەرێن ئاڤێ، دهۆک، هویا المدلولات المائیە ، داتایێن نەبەلاڤکری، ٢٠١٣.**

ئاڤا ژێرعەردە ب شێوەیێ جۆكان ژ تەخێن بن عەردی یێن ئاڤ تێدا هەتا دگەهنە سەر ڕوویێ عەردی. كانی پەیدابن دەمێ ئاستێ ئاڤا بن عەردی دگەهیتە سەر ڕوویێ عەردی ژبەر هەبوونا هندەك دەرز و شكەستنان د ڕوویێ عەردا دا، ئاڤا ژێرعەرد ب شێوەیەكی هێدی و ب ڕێژەیێن كێم دەردكەڤت كو بتنێ وەكی هندەك جۆكێن ئاڤێ یێن بچویك ل سەر ڕوویێ عەردی دیاردبن و ل ڤێرێ دبێژنێ (النزیر) و ئەڤ جۆرە پشتبەستنێ سەر برا بارینا بەفر و باران[١٥] ل وان دەڤەرێن ئەڤ كانیە لێ هەبن دكەن، ئەڤ كانیە هینگێ بۆش دبن دەمێ برا بارینا بەفر و باران ژی ل حەوزێن وان زێدە دبیت، ئاڤا ڤان كانییان ل وەرزێن هشك و كێم باران كێم دبیتن و دەمێ ئاڤا وان یا ژێرعەرد كێم دبیت ئەڤ كانییە ژی هشك دبیت و ناگەهنە سەر ڕوویێ عەردی (ژێدەرێ ١٠، ب٥٩).

پارێزگەها دهۆكێ ب كانی و بركێن خۆ یێن ئاڤێ یا ناڤدارە، كانیێن (بامەرنێ، شەرمن، بازیلان، سیارەتویكا، كانی مالك، سەرسنك، قەدش، سۆلاڤ شەرانش، زەرك، دێرەبوین و كانی ماسێ) ژ گرنگترین كانیێن ئاڤێ نە ل پارێزگەهێ ((ژێدەرێ ٧، ب٢٩)).

ژمارا كانی و بیرێن بەرهەمهێنەر د خشتەیێ ژمارە (١٠) دا هاتینە دیاركرن.

## • كارێز

كەهرێز پەیڤەكا فارسی یە و ب ڕامانا جۆك (كەنال) یان هژمارەكا كەنالێن ئاڤێ ل بن عەردی یێن دهێنە ب كارئینان ژبۆ مەرەما هەركینا ئاڤێ تێدا ب ئاراستەیێن جوداجودا[١٦]. كۆلانا كارێزان دهێتە هژمارتن ئێك ژ ڕێكێن كەڤن و بەربەلاڤ ل پارێزگەهێن هەرێما كوردستانێ بۆ مەرەمێن ب دەستڤەئینانا ئاڤێ ژبۆ ڤەخوارنێ و ئاڤدانێ ل وان دەڤەرێن ژێدەرێن وان یێن ئاڤێ د كێم ب ڕەنگەكی خۆ خەلكێ ڤان دەڤەران ژبۆ نەهێلانا ئاریشا كێم ئاڤیێ پشت كریە سەر ڤی ژێدەری.

هزرا دروستكرنا ڤان كارێزان ل سەر بنەمایێ هندێ د ڕاوەستیت كو ئاڤ ژ وان دەڤەرێن زەنگین ب ژێدەرێن ئاڤێ و هەبوونا جۆرێن باش یێن ئاڤێ ل بنێ چیایان دهێتە ڤەگوهاستن بۆ دەڤەرێن دەشتی یێن هشك و كێم ئاڤ داكو مفا بۆ چەندین چالاكیێن جوداجودا ژێ بێتە وەرگرتن، درێژاهیا كارێزان ژ دەڤەرەكێ بۆ ئێكا دی د جودانە ئەو ژی ل دووڤ سروشتێ ڕوویێ عەردی و جۆرێ كەڤران و كووراتیا ئاڤا ژێر عەرد ل دەڤەرێن ئاڤ لێ هەی دمینیت، پتریا جاران ئەڤ كەنالە دهێنە نخافتن ژبۆ ڕێگرتنێ ل كەفتنا بانێ وان یان پیسبوونا ئاڤا وان، دەرێن بیرێن وان دهێنە دائێخستن و بتنێ ل دەمێ سەخبێریكرنێ و پاقژكرنێ دهێنە ڤەكرن.

بلندترین هەركینا ئاڤێ د كارێزان دا ل وەرزێ زڤستان و بهارێ یە (ژێدەرێ ١١،ب٧٥)، ڕێژەیەكا گەلەك كێم یا كارێزان ل پارێزگەها دهۆكێ هەنە كو ل سالا (٢٠٠٢)ێ بتنێ (٣٤) كارێز هەبوون، لێ پشتی هینگێ هژمارا وان ژبەر هشكبوونێ كێم بوویە و ئێدی ب كێر كارئینانێ نەهاتن، هەردیسان كۆلانا كارێزان پارەیەكێ گەلەك مەزنتر ژ كۆلانا بیران د مەزێخیت و پێدڤی ب چاڤدێری و سەخبێریەكا پترە.

**خشتەیێ (٤)**
**كارێزێن پارێزگەها دهۆكێ**

| ئاڤێ كارێزێ | درێژاهی | تێكرایێ بەرهەمئینانێ لتر/چركە | بەرهەمئینانا گشتی م٣/سال |
|---|---|---|---|
| زمزمۆك | ١٢٥ | ٠،٥ | ١٥٧٦٨ |
| گێلان | ٢١٠٠ | ٢٨ | ٧٨٨٤٠٠ |
| جمرش | ١٠٠٠ | ٥ | ١٥٧٦٨٠ |
| سەرجەم | | | ٩٦١٨٤٨ |

**ژێدەر: حكومەتا هەرێما كوردستانێ، وەزارەتا چاندن و ژێدەرێن ئاڤێ، ڕێڤەبەریا گشتی یا ژێدەرێن ئاڤێ، دهۆك، هۆبا المدلولات المائية ، داتایێن نەبەلاڤكری، ٢٠١٣.**

## پەراوێز:


١. الخلف، محمد احمد محمود، تباين زراعة اشجار الفاكهة في الاردن، اطروحة دكتوراه، كلية التربية، الجامعة المستنصرية، ٢٠٠٠، ص٩٦.

٢. خصباك، شاكر، العراق الشمالي (دراسة للنواحي الطبيعية والبشرية)، مطبعة الشفيق، بغداد، ١٩٧٣، ص٩٨.

٣. مياه كوردستان وافاق المستقبل، منشورات مكتب الدراسات والبحوث المركزية، الحزب الديمقراطي الكوردستاني، المكتب السياسي، ط١، ١٩٩٦، ص٨.

٤. اسماعيل، اسعد اسماعيل، خصائص التصاريف لنهر الزاب الكبير في اقليم كردستان العراق، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٦، ص١١ .

٥. عبد الله، نشوان شكري، ومزكين محمد وابراهيم خشمان، جغرافية محافظة دهؤك، كلية العلوم الانسانية، جامعة دهؤك، ٢٠١٣، ص ١٢٩ .

٦. الحداد، هاشم ياسين محمد امين، اطلس الموارد الطبيعية لمحافظة اربيل، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٠، ص١٢٧ .

٧. صديق، اشتي سلام، امكانات محافظة دهؤك المناخية لزراعة الحبوب، رسالة ماجستير، كلية العلوم الاجتماعية، جامعة كوية، ٢٠٠٩ ، ص٢٤ .

٨. محافظة دهوك، دهوك بعد الحادي عشرمن اذار، مطبعة دهوك،١٩٧٣، ص٣٥ .

٩. موسيس، نيشان سورين، مقومات صناعة السياحة في محافظة دهوك، مطبعة وزارة التربية، اربيل،٢٠٠٥، ص١٢٩

١٠. لاوند، فيان احمد محمد، محافظة دهوك (دراسة اقليمية سياسية)، رسالة ماجستير، كلية التربية للبنات، جامعة بغداد، ٢٠٠٧، ص٥٢ .

١١. محمد، رمضان حمزة، سد دهؤك الاروائي الواقع والطموح، مجلة دهوك، العدد (٢)، نيسان، ١٩٩٨، ص١٠٥.

١٢. بكر، سناء عبد الباقي، مصادر الثروة الطبيعية في حوض دوكان وسبل صيانتها، رسالة ماجستير، غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٣، ص٦٥.

١٣. العاني، رقية احمد محمد امين، جيمورفولوجية سهل السندي، اطروحة دكتوراه، كلية التربية، جامعة الموصل، ٢٠١٠، ص١٢٦.

١٤. قادر، ريزين اكرم، اثر عامل التساقط على المياه الجوفية في محافظة اربيل، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠١٢، ص٦١.

١٥. نامق، آسو سوار، هيدرومورفومترية، حوض كومه سبان واستثماراتها المائية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٨، ص٨٨.

١٦. گەزنەيي، عبد الرحمن احمد، اربيل وماء الشرب في الماضي والحاضر، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ١٩٩٦، ص٣٣.

# ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ

د. نەشوان شوكری هروری
زانكۆیا دهۆك - كولیژا زانستێن مرۆڤایەتی
وەرگێران: دیان جەمیل

## (١)
## قەبارەیێ ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ

### ١. قەبارەیێ گشتی یێ ئاكنجییان

گومان تێدا نینە كو قەبارەیێ ئاكنجییان دهێتە هژمارتن بابەتێ سەرەكی یێ گشت بوارێن زانستێن مروڤایەتی و تەوەرێ سەرەكی یێ كو پتریا ئاریشەیێن مرۆڤایەتیێ ل دۆر دزڤڕن، هەردیسان پلانێن گەشەكرن و پێشكەفتنێ ل سەر بنیاتێ وێ دهێنە دانان. قەبارەیێ ئاكنجییان ژ هەر یەكەیەكا جهی دهێتە هژمارتن خۆدیك ژبۆ تێدا پیڤەرێن فوڕسییا ئابووری و داهاتێ مرۆڤایەتیێ، لەوڕا هەر گوهۆرینەكا د بهایێ قەبارەیێ ئاكنجییاندا بەرەڤ زێدەبوونێ یان كێمبوونێ ڕەنگڤەدانێ دكەتە سەر بهایێ پیڤەرێن بەری نها. ژبەر ڤێ چەندێ قەبارەیێ ئاكنجییان گرنگییەكا مەزن ژبۆ گشت فاكتەرێن بەرهەم ئینانێ هەیە و پێدڤییە جۆرەكێ هەڤسەنگیێ هەبیت دناڤبەرا قەبارەیێ ئاكنجییان و داهاتێن بەردەست كو دهێتە نیاسین وەك قەبارەیێ نموونەیی یێ ئاكنجییان (Optimum Population)[1].

سەرەرای وێ گرنگییا دهێتە دان ژبۆ خواندنێن ئاكنجییان ل سەر گشت بواران دناڤ هەر یەكەیەكا جهی دا، لێ ئەنجامدانا ڤەكۆلینان و شرۆڤەكرن ب زمانێ هژمارەیان د بابەتێن ئاكنجییاندا دبیت ژ تیۆراندنێ یا ڤالا و دوور نەبیت ب تایبەت ل هەرێما كوردستانا عیراقێ ئەوا د هندەك كاودانێن ئابووری و جڤاكی و سیاسی یێن بەرتەنگڕا بۆری كو كارتێكرنا وان ل سەر ئەنجامێن ڤەكۆلینێن ئاكنجییان یا بەرچاڤە.

پێشكەفتنەكا مەزن د قەبارەیێ ئاكنجییێن پارێزگەهێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)[٢] ڕویدا، قەبارەیێ ئاكنجییێن پارێزگەهێ ل سالا (١٩٤٧)ێ نێزیكی (١١٥١٢٧) كەسان بوو و هێدی هێدی زێدەبوو هەتا ل سالا (٢٠٠٩)ێ گەهشتییە (١١٧٧٧١٤) كەسان، ئەو ژی ب زێدەبوونەكا بەرچاڤ بڕا وێ (١٠٦٢٥٨٧) كەس بوون د ماوەیێ (٦٢) سالاندا. ئانكو قەبارەیێ ئاكنجییان نێزیكی حەفت جاران پتر

لێهاتییە (تەماشەى خشتەيێ (١) و وێنەيێ (١) بکەن).

**خشتەيێ (١)**

**رێژەيێن قەبارەيێ ئاکنجيێن پارێزگەها دهۆکێ دگەل گشت ئاکنجيێن عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٦)**

| سال | قەبارەيێ ئاکنجيێن پارێزگەهێ | رێژەیا ئاکنجيێن پارێزگەهێ بۆ گشت ئاکنجيێن عیراقێ٪ |
|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ١١٥١٢٧ | ٢,٣٩ |
| ١٩٥٧ | ١٣٩٨١٨ | ٢,١٤ |
| ١٩٦٥ | ١٤٥٨٣٤ | ١,٨ |
| ١٩٧٧ | ٢٥٠٥٧٥ | ٢,٠٩ |
| ١٩٨٧ | ٢٩٣٣٠٤ | ١,٨ |
| ١٩٩٦ | ٤٠٢٩٧٠ | ١,٨٣ |
| ٢٠٠٦ | ٨٦٧٢٣٥ | ٣ |
| ٢٠٠٩ | ١١٧٧٧١٤[٣] | ٣,٦ |

**ژێدەر-**

1. **سەرژمێريێن ئاکنجيیان ل سالێن (١٩٤٧، ١٩٥٧، ١٩٦٥، ١٩٧٧، ١٩٨٧).**
2. **کۆمارا عیراقێ، وەزارەتا پلان دانان و هاریکاریا گەشەپێدانێ، ئامیرێ ناڤەندى بۆ ژمێریارى و تەکنولوژیا پێزانینان، کۆمەلا ژمێریاریا سالانە یا سالێن (٢٠٠٥، ٢٠٠٦)ێ، دەزگەهێ عصام بێ چاپێ، بەغدا، ٢٠٠٦.**
3. **حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا شارەوانى، رێڤەبەریا گشتى یا شارەوانیێا پارێزگەها دهۆکێ، هۆبا ژمێریارى، داتایێن نەبەلاڤکرى یێن ئاکنجيێن شارەوانیيا ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن (٢٠٠٤ و ٢٠٠٦)ێ.**
4. **حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا بازرگانى، کۆمپانیا گشتى بۆ بازرگانیيا ئاهێن خوارنێ/ لقێ دهۆک، راپۆرتەك ل دۆر گشت ئاکنجيێن پارێزگەها دهۆکێ و دەوروبەرێن وێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ، داتایێن نەبەلاڤکرى.**
5. **حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا پلاندانانێ، دەستنیشانکرن و هژمارکرنا ئاڤاهیێن پارێزگەهێن هەرێما کوردستانا عیراقێ (٢٠٠٩)ێ، (داتایێن نەبەلاڤکرى).**

سەرەراى ڤێ چەندێ قەبارەيێ ئاکنجيێن پارێزگەهێ رێژەيەکا سادە ژ سەرجەمێ قەبارەيێ ئاکنجيێن عیراقێ یان پارێزگەهێن دەوروبەر پێکدئینیت یانژى ب هەڤبەرکرن دگەل قەبارەيێ ئاکنجيێن هەر پارێزگەهەکێ ژ پارێزگەهێن هەرێما کوردستانا عیراقێ. ژ تێبینیێن داتایێن خشتەيێ (١) و وێنەيێ (٢) دیار دبیت کو ئاکنجيێن پارێزگەهێ ژ تێکراى (٢,٣٣٪)ێ نابۆریت د ماوەيێ وان سالێن د خشتەيى دا دیارکرى ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجيێن عیراقێ و ئەڤ رێژەیە ژ سالەکێ بۆ ئێکا دى دهێتە گوهۆرین، بۆ نموونە قەبارەيێ ئاکنجيێن پارێزگەهێ کێمترین رێژە ل سالێن (١٩٦٥ و ١٩٨٧) ێ تۆمارکرن، و ئەڤ چەندە ژى بۆ کاودانێن ئێمناهیێ یێن نەجێگیر یێن ئەڤ دەڤەرا تێرا دبۆرى دزڤریت، ئەو ژى بەرى سەرژمێریا ئاکنجیيان لێ بێتە ئەنجامدان ل ڤان هەردو سالێن دیارکرى، ب رەنگەکێ دەستپێکرنا شۆرشا ئیلولێ ل سالا (١٩٦١)ێ ل کوردستانێ بۆ ئەگەر سەرژمێریا ئاکنجيیان هەمى دەڤەرێن کوردى بخوڤە نەگریت، لەورا پتریا ئەو داتایێن ب دەستڤە هاتین وەك هەلسەنگاندن بوون ب پشت بەستن ل سەر ئەنجامێن سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ[٤].

ژبەر ڤێ چەندێ د پتریا داتایێن خشتەيێن ل دووڤ ئێك د ڤەکۆلینێ دا، ئەم دشێن تێبینیا نزمبوونەکا بەرچاڤ بکەین د برە و رێژەيێن قەبارەيێ ئاکنجيێن پارێزگەهێ ل سالا (١٩٥٧)ێ ب پیڤان دگەل سەرژمێریێن پشتى هینگێ یان بەرى هینگێ، لێ ل سالا (١٩٨٧)ێ کاودانێن شەرێ عیراق و ئیرانێ و هەڤرکیێن ناڤخۆیى دناڤبەرا بەرەیێن کوردى ژ لایەکى و حکومەتا ناڤەندى ژلایەکێ دیڤە کارتێکرنا خۆ ل سەر ئەنجامێن سەرژمێریێن گشتى یێن ئاکنجيیان هەبوو ب تایبەت ل پارێزگەهێن هەرێما کوردستانێ[٥]. هەردیسان گوهۆرینێن پەیدابووى د خشتەيێ کارگێرى یێ پارێزگەهێ ب هەڤکارى دگەل کاودانێن ئێمناهیێ یێن نەجێگیر رەنگڤەدانا خۆ ل سەر وێنەيێ بەلاڤبوونا جوگرافى یا ئاکنجيیان ب تایبەت دناڤبەرا دەڤەرێن گوندان و باژێران هەبوو[٦]، لەورا هەردو ناحیێن کانى ماسێ و رزگارى

**وێنەیێ (١)**

**زێدەبوونا قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧- ٢٠٠٦)**




**وێنەیێ (٢)**

**زێدەبوونا رێژەیێن قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ بۆ گشت ئاکنجیێن عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٦)**



هەلوەشاندن[٧]، و ژبۆ ئێکەم جار قەزا سێمێلێ هاتە دروستکرن و دو ناحیە پێڤە هاتنە گرێدان ئەو ژی ناحیا باتێلێ کو بەری هینگێ سەر ب قەزا زاخۆ ڤەبوو و ناحیا فەیدیێ کو هەر د وێ سالێ دا دروست ببوو. ئەڤ گوهۆرینێن کارگێری د هەڤدەم بوون دگەل وان هەوێن تەعریبکرنێ یێن دژوار یێن پارێزگەهێ ب خۆڤە دیتین کو مەرەم ژێ گوهۆرینا دیموگرافی یێ وێ بوو، ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ژی گەلەك ژ خەلکێ وێ بەرەڤ ترکیا و سوریا و وەلاتێن ئەورووپی چوون، یانژی ب زۆری ژبۆ پارێزگەهێن باشووری هاتنە ڤەگوهاستن.

لێ نزمبوونێن بەرچاڤ یێن قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ ژ هەلسەنگاندنێن سالا (١٩٩٦)ێ ڤەدگەرن بۆ کاودانێن سەرهلدانا ئادارا (١٩٩١)ێ و کۆچا ملیونی، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر گەلەك خەلك نەڤەگەڕنە جهێ ئاکنجیبوونا خۆ یێ ڕەسەن. ل ڤێرێ دیار دبیت کو بلندترین ڕێژەیا قەبارەیێ پارێزگەهێ ب هەڤبەرکرن دگەل ئاکنجیێن عیراقێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ دیاربوو ئەو ژی ب ڕێژەیا (٣,٦٪)ێ و هەلبەت کاودانێن ئێمناهیێ و گەشەکرنا ئابووری و جڤاکی یێن ل هەرێما کوردستانا عیراقێ پشتی سالا (١٩٩٧)ێ پەیدابووین و بەرفرەهکرنا بجهێنانا بڕیارا گاز بەرامبەر خوارن (٩٨٦) بوونە ئەگەر گەلەك خێزانێن مشەختبووی بۆ ترکیا و ئیرانێ ڤەگەڕنە پارێزگەهێ.

د هەڤبەرکرنا قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ دگەل قەبارەیێن ئاکنجیێن پارێزگەهێن دەوروبەر و پارێزگەهێن هەرێما کوردستانا عیراقێ (تەماشەی خشتەیێ (٢) و وێنەیێن (٣) و (٤) بکە)، ئەم دشێن تێبینیا چەندین ڕاستیيان بکەین، ئەو ژی:-

١) پارێزگەها دهۆکێ کێمترین ڕێژە پێکدئینیت ب هەڤبەرکرن دگەل ڕێژەیێن قەبارێن ئاکنجیێن پارێزگەهێن دی، ئەڤ ڕێژەیە کێمترە ژ (١٠٪)ێ ژ سەرجەمێ پێنج پارێزگەهێن باکووری ژبلی سالێن (٢٠٠٦ و ٢٠٠٩)ێ کو ئەڤ ڕێژەیە بلند بوویە تا گەهشتییە (١١,٤٪)ێ و (١٣,٩٢٪)ێ ل دووڤ ئێك، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی دزڤڕیت بۆ گوهۆرینا پێکهاتنێن وێ یێن کارگێری دگەل پارێزگەهێن دی کو بەری ل سالا (١٩٦٩)ێ ببیتە پارێزگەهـ پشکەك بوو ژ پارێزگەها نەینەوا[٨].

**خشتەیێ (٢)**
**دابەشکرنا ڕێژەیی یا قەبارێن ئاکنجیێن پارێزگەهێن باکوورێ ل عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | دهۆك | هەولێر | سلێمانی | کەرکوك | نەینەوا |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ٩,٠٤ | ١٨,٨٣ | ١٧,٧٧ | ٢٢,٤٥ | ٣١,٩١ |
| ١٩٥٧ | ٨,١٢ | ١٥,٨٧ | ١٧,٧ | ٢٢,٥٧ | ٣٥,٧٤ |
| ١٩٦٥ | ٦,٨٨ | ١٦,٨٢ | ١٨,٨٧ | ٢٢,٣٦ | ٣٥,٠٧ |
| ١٩٧٧ | ٨,١٣ | ١٧,٥٧ | ٢٢,٤١ | ١٦,٠٨ | ٣٥,٨١ |
| ١٩٨٧ | ٧,١٦ | ١٨,٨١ | ٢٣,٢٣ | ١٤,٨٦ | ٣٦,١٢ |
| ١٩٩٧ | ٧,١٢ | ١٩,٣٧ | ٢٤,٠٨ | ١٣,٣١ | ٣٦,١ |
| ٢٠٠٦ | ١١,٤[٩] | ١٩,٦ | ٢٤,١ | ١١,٦٥ | ٣٣,٢٢ |
| ٢٠٠٩ | ١٣,٩٢ | ٢٠,٣١ | ٢١,٣٢ | ١٥,٦٧ | ٢٨,٧٨ |

ژێدەر، سەرژمێریياری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجیيان ژبۆ پارێزگەهان د ماوەیێ سالێن دیارکری دا.

٢) ڕێژەیا ئاکنجیيان ل سالێن (١٩٦٥، ١٩٨٧، ١٩٩٧)ێ بەرەڤ کێمترین ئاست دچیت، ئەو ژی ژبەر وان کاودانێن ئێمناهیێ یێن پارێزگەهـ د ماوەیێ ئەنجامدانا کرپارێن سەرژمێریياری و هەلسەنگاندنا ئاکنجیيان ل سالێن دیارکری تێڕا د بۆری.

٣) تێبینیا هندێ دهێتە کرن کو قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ دناڤبەرا سالێن (١٩٥٧ و ٢٠٠٩)ێ دا دگەهیتە نێزیکی چارێکا سەرجەمێ ئاکنجیێن هەرێمێ، لێ ئەڤ ڕێژەیە دهێتە گهۆڕین ل وان سالێن دکەڤنە دناڤبەرا ڤان هەردو سالاندا ئەو ژی ژبەر وان کاودانێن پارێزگەهـ تێڕا دبۆری وەکی هەمی دەڤەرێن دی یێن هەرێمێ (تەماشەی

وێنەیێ (٣)

پێشکەتنا دابەشکرنا رێژەیی یا قەبارەیێن پارێزگەهێن باکووری عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)




خشتەیێ (٣) بکە)

**خشتەیێ (٣)**

**رێژە و قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ب هەڤبەرکرن دگەل گشت ئاکنجییێن هەرێما کوردستانێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ | رێژەیا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ب هەڤبەرکرن دگەل گشت ئاکنجییێن هەرێما کوردستانا عیراقێ٪ |
|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ١١٥١٢٧ | ٥٧,٨٢ (دهۆک نەینوا) |
| ١٩٥٧ | ١٣٩٨١٨ | ٢٥,٥٥ |
| ١٩٦٥ | ١٤٥٨٣٤ | ١٦,١٧ |
| ١٩٧٧ | ٢٥٠٥٧٥ | ١٦,٩ |
| ١٩٨٧ | ٢٩٣٣٠٤ | ١٤,٨١ |
| ١٩٩٦ | ٤٠٢٩٧٠ | ١٤,٠٨ |
| ٢٠٠٦ | ٨٦٧٢٣٥ | ٢٠,٧ |
| ٢٠٠٩ | ١١٧٧٧١٤ | ٢٥,٠٦ |

٤) پارێزگەها نەینەوا پتر ژ سێیکا ٣/١ سەرجەمێ ئاکنجییێن پارێزگەهێن باکووری پێکدئینیت ئەو ژی ب درێژاهییا وان سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییە ئەنجامدان، ئەڤ چەندە ژی دزڤریتە سەر سەنگ و گرانییا ئاکنجییێن ڤێ پارێزگەهێ، گرێدانا وێ دگەل پارێزگەها دهۆکێ ب گرێدانەکا جوگرافی و مێژوویی.

٥) قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ناگەهیتە نیڤا سەرجەمێ ئاکنجییێن ئەو پارێزگەهێن ل دەوروبەران ب درێژاهییا قۆناغا سالێن (١٩٤٧-١٩٩٧)ێ ژبلی هندەک حالەتێن تایبەت (تەماشەی خشتەیێ (٤) بکە).

٦) قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن (٢٠٠٦ و ٢٠٠٩)ێ ب پلەیەکا بەرچاڤ زێدەبوویە ب هەڤبەرکرن دگەل قەبارەیێن ئاکنجییێن پارێزگەهێن دی ئەو ژی ژبۆ توومارکرنا رێژەیەکا جوری، کو نێزیکبوو ب گەهیتە قەبارەیێ

ئاكنجيێن پارێزگەها كەركووكێ ل دەمەكى كو ل سالا (١٩٩٧)ێ گەهشتبوو نيڤا قەبارەيێ ئاكنجيێن پارێزگەها كەركووكێ. هەرديسان قەبارەيێ ئاكنجيێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ گەهشتبوو نێزيكى سێيكا قەبارەيێ ئاكنجيێن پارێزگەها نەينەوا و نيڤا وان ل سالا (٢٠٠٩)ێ ئەڤ چەندە ژى شيانێن گەشەكرن و پێشڤەچوونا پارێزگەهێ خويا دكەت، ب تايبەت پشتى سالا (١٩٩٧)ێ كو ژ وێ سالێ وەرە گشت فاكتەرێن ئابوورى و جڤاكى و سياسى بەرەڤ باشيێ چووينە، كو دێ ب درێژى ل سەر راوەستين.

**خشتەيێ (٤)**
**رێژەيا سەدى بۆ قەبارەيێ ئاكنجيێن پارێزگەها دهۆكێ ب هەڤبەركرن دگەل قەبارەيێن ئاكنجيێن پارێزگەهێن باكوورى (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | هەولێر | سلێمانى | كەركووك | نەينەوا |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ٤٨ | ٥٠,٨ | ٤٠,٢ | ٢٨,٣٢ |
| ١٩٥٧ | ٥١,١ | ٤٥,٨ | ٣٥,٩ | ٢٢,٧ |
| ١٩٦٥ | ٤٠,٩ | ٣٦,٥ | ٣٠,٨ | ١٩,٦ |
| ١٩٧٧ | ٤٦,٣ | ٣٦,٣ | ٥٠,٦ | ٢٢,٧ |
| ١٩٨٧ | ٣٨ | ٣٠,٨ | ٤٨,٨ | ١٩,٨ |
| ١٩٩٧ | ٣٦,٧ | ٢٩,٦ | ٥٣,٥ | ١٩,٧ |
| ٢٠٠٦ | ٥٨,٢ | ٥٨,٢ | ٩٧,٩ | ٣٤,٣ |
| ٢٠٠٩ | ٦٨,٦ | ٦٥,٣ | ٨٨,٨ | ٤٨,٤ |

**ژێدەر: سەرژمێريارى و هەلسەنگاندنێن ئاكنجيێن پارێزگەهان ل سالێن دياركرى.**

٧) ل بن سيبەرا پێزانينێن چووين و ژ تێبينيكرنا داتايێن خشتەيێ (٥)، دياردبيت كو قەبارەيێ ئاكنجيێن پارێزگەها دهۆكێ نێزيكى چارێكەكا سەرجەمێ قەبارەيێ ئاكنجيێن هەرێمێ پێكدئينيت ئەو ژى ب رێژەيا (٢٢,٠١٪)ێ .

**خشتەيێ (٥)**
**دابەشبوونا رێژەيى يا قەبارەيێن ئاكنجيێن پارێزگەهێن هەرێما كوردستانا عيراقێ ل سالا ٢٠٠٩**

| پارێزگەه | هژمارا ئاكنجييان | ٪ |
|---|---|---|
| پارێزگەها هەولێرێ | ١٧١٧٢٨٤ | ٢٨,٥ |
| پارێزگەها سلێمانيێ | ١٨٠٣٧٩٢ | ٢٩,٩٤ |
| پارێزگەها دهۆكێ | ١١٧٧٧١٤ | ١٩,٥٥ |
| پارێزگەها كەركووكێ | ١٣٢٥٨٥٣ | ٢٢,٠١ |
| هەرێما كوردستانا عيراقێ | ٦٠٢٤٦٤٣ | ١٠٠ |

**ژێدەر: سەرژمێريارى و هەلسەنگاندنێن ئاكنجيێن پارێزگەهان ل سالێن دياركرى.**

ژ ئەڤ چەندا بەرى نها بۆ مە خويا دبيت قەبارەيێ ئاكنجيێن پارێزگەها دهۆكێ بتنێ رێژەيەكا بچويك ژ سەرجەمێ قەبارەيێ ئاكنجيێن عيراقێ پێكدئينيت، ئەو ژى ژ رێژەيا (٢,٣٣٪)ێ نابۆريت، ئەڤ قەبارە ب هەڤبەركرن دگەل قەبارەيێ پارێزگەهێن باكوورى بەردەوام هاتييە گوهۆرين، هەتا ل داوييا سالا (٢٠٠٩)ێ گەهشتييە بلندترين رێژە ئەو ژى (١٣,٩٢٪)ێ بوو. ل دەمەكى رێژەيا قەبارەيێ پارێزگەهێ بۆ سەرجەمێ ئاكنجيێن پارێزگەهێن هەرێمێ دناڤبەرا (١٤,٠٨٪)ێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ بۆ (٢٥,٨٢٪)ێ و (٢٥,٠٨)ێ ل سالێن (١٩٥٧ و ٢٠٠٩)ێ ل دووڤ ئێكدا. هەرديسان د پتريا سالاندا قەبارەيێ پارێزگەهێ هەتا سالا (١٩٩٧)ێ نەدگەهشتە نيڤا قەبارەيێ چ پارێزگەهێن باكوورى لێ دگەل هندێ ژى پێشڤەچوونەكا مەزن كەفتييە قەبارەيێ ئاكنجيێن پارێزگەهێ د ماوەيێ سالێن ڤەكولينێ دا.

## ٢. قەبارەیێ ئاکنجییان دناڤبەرا گوند و باژێران

ئەو ستاندەرێن دهێنە ب کارئینان بۆ ڤاڤارتنا ئاکنجیێن گوندان و باژێران، ژ وەلاتەکی بۆ ئێکێ دی دهێنە گهورین[10]، لێ ستاندەرێ کارگێری بەربەلاڤترین ستاندەرە ل عیراقێ کو هەمی کۆمەڵگەهێن ئاکنجیبوونێ یێن سیفەتا کارگێری (سەنتەرێ ناحیێ یان قەزایێ یان پارێزگەهێ) هەی بووینە باژێر و ئاکنجییێن وان ژی خۆ ب باژێری د هەژمێرن، لێ ئەوێن ژ دەرڤەی ڤان سنووران دژین دهێنە هژمارتن گوندی و ل دەڤەرێن گوندان دژین[11].

گوهۆرین و پێشکەفتنێن کارگێری رۆلەکێ گرنگ هەیە د دوبارە دابەشکرنا قەبارەیێ ئاکنجییان دناڤبەرا دەڤەرێن گوندان و باژێران ژ وەختەکی بۆ ئێکێ دی، بەری دهۆك ل سالا (١٩٦٩)ێ ببیتە پارێزگەهـ، دهۆك دگەل هەرسێ قەزایێن خو یێن سەرەکی (دهۆك و ئامێدی و زاخۆ) ژ لایێ کارگێریڤە سەر ب پارێزگەها نەینەوا ڤەبوو، ل سالا (١٩٤٧)ێ ژ ١٠ یەکەیێن کارگێری پێکدهات (سێ قەزا و حەفت ناحییان)، پشتی هینگێ ل سالا (١٩٦٥)ێ هژمارا یەکەیێن وێ یێن کارگێری بوونە ١٧ یەکە (چوار قەزا و ١٣ ناحیە) ئەو ژی پشتی کو قەزا ئاکرێ هاتییە هژمارتن وەك پشکەك ژ پارێزگەهێ، پشتی هینگێ ل سالێن حەفتێ و هەشتێیان هژمارا یەکەیێن وێ یێن کارگێری هاتنە کێمکرن ئەو ژی ژ ئەنجامێ چەندین کاودانێن سیاسی و ئێمناهیێ یێن دژوار، ئەڤ کاودانە بوونە ئەگەر هندەك یەکە هەلوەشاندن و هندەك نوی بێنە دانان، هەروەك ناحیێن رزگاری و زاویتە ل سالا (١٩٧٧)ێ و ناحیا فەیدێ ل سالا (١٩٨٧)ێ لێ د هەمان سالدا هەردو ناحیێن رزگاری و کانی ماسێ هاتنە هەلوەشاندن[12]. لێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ پارێزگەهـ هاتە دابەشکرن بۆ سەر ٢٠ یەکەیێن کارگێری کو ٦ قەزا و ١٤ ناحیە بوون ژوان ژی قەزایێن ئاکرێ و شێخان و دەوروبەرێن وێ، ل سالا (٢٠٠٩)ێ هژمارا یەکەیێن کارگێری یێن پارێزگەهێ زێدەبوون بۆ ٣٦ یەکەیان ئەو ژی ٧ قەزا، کو قەزا بەردەرەش ژنوی ل سەر هاتە زێدەکرن دگەل ٢٩ ناحییان، ئەو ژی پشتی ناحییێن (کەلەك، دارەتوو و رۆڤیا) ل سەر هاتینە زێدەکرن کو سەر ب قەزا بەردەرەش ڤەنە، هەردیسان ناحییێن (قەسرۆك، زیلکان، باعەدرێ، ئێسفنێ (ناحیا سەنتەرێ) ل قەزا شێخان هاتنە زێدەکرن، زێدەباری دابەشکرنا ناحیا سەرسنکێ بۆ سەر سێ ناحیان ئەو ژی (بامەرنێ، سەرسنك و چەمانکێ) (تەماشەی خشتەیێ (٦) بکە).

**خشتەیێ (٦)**
**گوهۆرین و پێشکەفتنێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧-٢٠٠٦)**

| سال | هژمارا یەکەیێن کارگێری | | سەرجەم |
|---|---|---|---|
| | قەزا | ناحیە | |
| ١٩٤٧ | ٣ | ٧ | ١٠ |
| ١٩٥٧ | ٣ | ٨ | ١١ |
| ١٩٦٥* | ٤ | ١٣ | ١٧ |
| ١٩٧٧ | ٣ | ١٠ | ١٣ |
| ١٩٨٧ | ٤ | ٨ | ١٢ |
| ١٩٩٦* | ٥ | ١٣ | ١٨ |
| ٢٠٠٦* | ٦ | ١٤ | ٢٠ |
| ٢٠٠٩* | ٧ | ٢٩ | ٣٦ |

**ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.**

*** سەرجەمێ هژمارا یەکەیێن کارگێری بخۆڤە دگریت ژوان ژی قەزا ئاکرێ.**

وەرارا قەبارەیێ ئاکنجییێن گوندو باژێران ل پارێزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)ێ ب ئێك سەمت بەرەڤ زێدەبوونێ نەچوویە مینا گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێ، بەلکو هندەك جاران بەرەڤ زێدەبوونێ و هندەك جاران ژی بەرەڤ کێمبوونێ چوویە ئەو ژی ل دووڤ کاودانێن وان سەردەمان، بەلێ گوهۆرینێن ل دووڤ پیڤەرێن قەبارەی ل دەڤ ئاکنجییێن باژێرێ پتربوون و ئەڤ گوهۆرینە ل دەڤ کەسێن

گوندنشین کێمتربوون ب هەڤبەرکرن دگەل گشت ئاکنجیێن باژێری. هژمارا ئاکنجیێن باژێری د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧- ٢٠٠٩)ێ ١٠ (دەهـ) جاران پتر لێهاتییە، لێ هژمارا ئاکنجیێن گوندان بتنێ (٣,٤) ێ جاران زێدەکرییە، ل دەمەکی قەبارەیێ گوهۆرینا ل دەڤ ئاکنجیێن باژێری د هەمان ماوەدا پەیدابووی (٦٠) جاران هند بوو، لەورا ژی بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ دناڤبەرا بهایێن قەبارەیێ گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ و ل سەر ئاستێ گوند و باژێری دماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا (٨٢٪)ێ و (٤٠٪)ێ و (١١٨٪)ێ بوون ل دووڤ ئێك.

سەرەرای ڤێ چەندا بۆری ژی قەبارەیێ ئاکنجیێن باژێری ل پارێزگەها دهۆکێ رێژەیەکا بچویك پێکدئینیت ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجیێن باژێری ل عیراقێ یان ژی پارێزگەهێن دەوروبەر ب هەڤبەرکرن دگەل قەبارەیێ ئاکنجیێن گوندان (تەماشەی خشتەیێ (٧) و وێنەیێ (٤) بکە)، ئەڤە ل دەمەکی کو گوهۆرین د رێژەیا ئاکنجیێن باژێری دا د زێدەبوونەکا بەردەوام دابوو، لێ ئەڤ گوهۆرینە ل دەڤ ئاکنجیێن گوندان د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییە ئەنجامدان، هندەك جاران بەرەڤ زێدەبوونێ و هندەك جاران بەرەڤ کێمبوونێ بوو، د ڤان سالاندا تێکرایێ قەبارەیێ ئاکنجیێن باژێری ل پارێزگەها دهۆکێ گەهشتبوو (١,٩٥٪)ێ (تەماشەی خشتەیێ (٧) بکە) ب هەڤبەرکرن دگەل گشت ئاکنجیێن باژێری ل عیراقێ، ئەڤ رێژەیە بەردەوام د گوهۆرینێ دابوون و ژ سالەکێ بۆ ئێکا دی یا جودابوو ب رەنگەکی کێمترین رێژە ل سالا (١٩٤٧)ێ هاتبوو توومارکرن ئەو ژی (٠,٩٥٪)ێ بوو، و بلندترین رێژە ژی (٣,٨١٪)ێ بوو ل سالا (٢٠٠٩)ێ هاتییە توومارکرن.

دەربارەی قەبارەیێ ئاکنجیێن گوندان ژی ب هەڤبەرکرن دگەل گشت ئاکنجیێن گوندان ل عیراقێ رێژەیا وان دگەهیتە (٢,٥٦٪)ێ ، ئەڤ رێژەیە ژی ب پلەیەکا گەلەك ئاشکرا دهێتە گوهۆرین ب تایبەت دەمێ دهێتە هەڤبەرکرن دگەل رێژەیا ئاکنجیێن باژێری یان گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ، لێ ئەڤ رێژەیە ل سالێن (١٩٨٧)ێ و (١٩٩٦)ێ بۆ (١,٥٣٪)ێ و(١,٤٦٪)ێ ل دووڤ ئێك بەرەڤ کێمبوونێ چوویە، ئەو ژی ژبەر

**خشتەیێ (٧)**

**قەبارەیێ ئاکنجیێن گوندان و باژێران ل پارێزگەها دهۆکێ ب هەڤبەرکرن دگەل ئاکنجیێن گوند و باژێرێن عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | هەڤبەرکرن دگەل ئاکنجیێن عیراقێ ٪ | |
|---|---|---|
| | ئاکنجیێن باژێرا ل پارێزگەهێ٪ێ ب هەڤبەرکرن دگەل گشت ئاکنجیێن باژێرا ل عیراقێ | ئاکنجیێن گوندا ل پارێزگەهێ٪ێ ب هەڤبەرکرن دگەل گشت ئاکنجیێن گوندان ل عیراقێ |
| ١٩٤٧ | ٠,٩٥ | ٣ |
| ١٩٥٧ | ٠,٩٩ | ٣ |
| ١٩٦٥ | ١,٢٦ | ٢,٣٩ |
| ١٩٧٧ | ١,٤ | ٣,٢٨ |
| ١٩٨٧ | ١,٩ | ١,٥٣ |
| ١٩٩٦ | ١,٩٩ | ١,٤٦ |
| ٢٠٠٦ | ٣,٣٥ | ٢,٣١ |
| ٢٠٠٩ | ٣,٨١ | ٣,٥٢ |
| تێکرا | ١,٩٥ | ٢,٥٦ |

ژێدەر: سەرژمێریباری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.

وێنەیێ (٤)
زێدەبوونا رێژەیێن ئاكنجییێن گوند و باژێران ل پارێزگەها دهۆكێ ب هەڤبەركرن دگەل ئاكنجییێن گشت گوند و باژێرێن عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)




كاودانێن تەعریبكرنێ و وان گوهۆرینێن ژ ئەنجامێ هندەك پێكهاتنێن كارگێری یێن نوی پەیدابووین[١٣]، زێدەباری وان ناكۆكییێن دناڤبەرا حكۆمەتا كوردی و پارتا كاركەرێن كوردستانێ (PKK) دفی ماوەی دا، ئەڤ چەندە ژی بۆ ئەگەرێ مشەختبوونا خەلكێ وان بەرەڤ هندەك دەڤەرێن دی یێن سەر ب پارێزگەهێ ڤە و مشەختبوون بەرەڤ هندەك پارێزگەهێن دی. هەلبەت دەڤەرێن گوندنشین یێن سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە پتر ژ پارێزگەهێن دی یێن هەرێمێ كەفتینە بن كارتێكرنا ڤان ناكۆكییان[١٤]. لێ بلندترین رێژە بەری سالا (١٩٨٧)ێ دیاربیت، كو ل وی دەمی دەڤەرێن گوندنشین یێن پارێزگەهێ هێشتا نەكەفتبوونە بن كارتێكرنا ڤان كاودانێن سیاسی و ئێمناهیێ، لێ د هەمان دەمدا بلندبوونەكا بەرچاڤ د ڤێ رێژەیێ دا ل سالا (٢٠٠٩)ێ دا هەیە، ئەو ژی رەنگڤەدانەكا سرۆشتییە كو ژیانەكا پڕی ئێمناهی و سرۆشتی جارەكا دی ڤەگەریایە دەڤەرێن گوندان پشتی سەرهلدانا ئادارا (١٩٩١)ێ، داتا دیاردكەن زێدەبوونەكا بەرچاڤ د قەبارەیێ ئاكنجییێن گوندان دا ل دناڤبەرا سالێن (١٩٩٧-٢٠٠٩)ێ پەیدابوویە، كو برا وێ دگەهیتە (٢٤٣١٧٦) كەسان یان ژی ب رێژەیا گوهۆرینێ كو دگەهیتە (٢٣٧,٦٪)ێ .

ب هەڤبەركرنا قەبارەیێ ئاكنجییێن گوند و باژێران ل پارێزگەها دهۆكێ دگەل قەبارەیێ ئاكنجییێن گوند و باژێرێن پارێزگەهێن دەوروبەر (تەماشەی خشتەیێ (٨) بكە)، ئەم دشێین تێبینیا ڤان خالێن ل خوارێ بكەین:

١. ب شێوەیەكێ بەرچاڤ رێژەیا ئاكنجییێن گوند و باژێرێن پارێزگەهێ بەری سالا (٢٠٠٦)ێ بەرەڤ كێمبوونێ چوویە ب هەڤبەركرن دگەل ئاكنجییێن گوند و باژێرێن دی یێن عیراقێ.

**خشتەیێ (٨)**

**هەڤبەرکرنا قەبارەیێ ئاکنجیێن گوند و باژێران ل پارێزگەها دهۆکێ دگەل قەبارەیێ ئاکنجیێن گوند باژێرێن پارێزگەهێن باکووری (١٩٤٧-٢٠٠٦)**

| سال | قەبارەیێ ئاکنجیێن گوند و باژێران ٪ێ دگەل قەبارەیێ ئاکنجیێن گوند باژێرێن پارێزگەهێن باکوورێ عیراقێ | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | هەولێر | | سلێمانی | | کەرکووک | | نەینەوا | |
| | باژێری | گوندی | باژێری | گوندی | باژێری | گوندی | شارنشین | گوندی |
| ١٩٤٧ | ٢٧,٩٢ | ٥٣,٢٥ | ٢٤,٧٢ | ٥٩,٤٥ | ١٤,٧٦ | ٥٢,٧١ | ٧,٥١ | ٤٥,٦٣ |
| ١٩٥٧ | ٣٣,١ | ٥٧,٧٤ | ٣٠,٣٢ | ٥١,٣٤ | ١٥,٨ | ٤٩ | ٩,٧٦ | ٣١,٤١ |
| ١٩٦٥ | ٣٨,٥٧ | ٤٢,٣٥ | ٤٠,٥١ | ٣٤,٥٨ | ٢٢,٣١ | ٣٨,٩٣ | ١٤,٤٣ | ٢٤,٥ |
| ١٨٧٧ | ٣٧,٢٨ | ٥٦,٥ | ٣٢,٩٨ | ٣٩,٢٣ | ٣٠,٩١ | ٩٦,٧٤ | ١٧,٩٤ | ٢٨,٣٦ |
| ١٩٨٧ | ٣٦,٦٩ | ٤٢,٨ | ٣٢,١٢ | ٢٧,٥٤ | ٤٨,٢٥ | ٥٠,٤٢ | ٢١,٨٧ | ١٥,٥٦ |
| ١٩٩٦ | ٣٥,٤٣ | ٤١,٣٢ | ٣٠,٨٥ | ٢٦,٣٥ | ٥٦,٦٢ | ٤٦,٠٥ | ٢٣,٧٧ | ١٣,١٥ |
| ٢٠٠٦ | ٥٦,٩ | ٦٢,١٨ | ٥٠,١٢ | ٤٠,٧٢ | ١٠٥,١٥ | ٨١,٥٢ | ٣٨,٩٥ | ٢٠,٨١ |
| ٢٠٠٩ | ٦٣,٣٣ | ٨٥,٦٧ | ٥٤,٣٨ | ١٢٦,٣١ | ٨٧,٥٨ | ٩١,٩٦ | ٣٩,٣٤ | ٣٧,١ |

**ژێدەر: سەرژمێرییاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.**

٢. ڤان رێژەیان ژمارەیێن پیڤانەیی ل سالێن (٢٠٠٦ و ٢٠٠٩)ێ ب هەڤبەرکرن دگەل سالێن بەری هینگێ توومارکرینە، هەتا قەبارەیێ ئاکنجیێن باژێرێ دهۆکێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ گەهشتییە قەبارەیێ ئاکنجیێن باژێرێ کەرکووکێ و قەبارەیێ ئاکنجیێن گوندێن پارێزگەها دهۆکێ ژ قەبارەیێ ئاکنجیێن گوندێن پارێزگەها سلێمانیێ پتر لێهاتینە ب رێژەیا (١٢٦٪)ێ، هەردیسان قەبارەیێ ئاکنجیێن باژێری ل پارێزگەها دهۆکێ ژ سێیکا قەبارەیێ باژێرێ مووسل دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٦ و ٢٠٠٩)ێ بۆری یە.

٣. رێژەیا ئاکنجیێن گوندێن پارێزگەهێ دناڤبەرا سالێن (١٩٨٧ و ١٩٩٦)ێ بەرەڤ کێمبوونێ چوویە ب هەڤبەرکرن دگەل ئاکنجیێن گوندێن پارێزگەهێن دی، ئەو ژی ژبەر وان کاودانێن سیاسی و ئێمناهیێ یێن دەڤەرێن گوندنشینێن پارێزگەهێ دناڤبەرا سالێن (١٩٧٧)ێ هەتا (١٩٩٦)ێ تێرا بۆری.

٤. ب هاریکاریا داتایێن خشتەیێ (٩) بۆ مە دیاردبیت کو ئاکنجیێن باژێرێ دهۆکێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ نێزیکی پێنجێکا ٥/١ ئاکنجیێن باژێرێن هەرێمێ پێکدئینیت ئانکو ب رێژەیا (٢٠,٥٪)ێ، دیسان دهەمان سالدا رێژەیا ئاکنجیێن گوندێن پارێزگەهێ نێزیکی چارێکا ئاکنجیێن گوندێن هەرێمێ پێکدئینیت ب رێژەیا (٢٤,٧١٪)ێ.

**خشتەیێ (٩)**

**دابەشکرنا رێژەیی یا ئاکنجیێن (گوندو باژێران) ل پارێزگەهێن هەرێما کوردستانێ ل سالا ٢٠٠٩**

| پارێزگەهـ | ئاکنجیێن باژێران ٪ | ئاکنجیێن گوندان ٪ |
|---|---|---|
| هەولێر | ٣٢,٤٣ | ٢٨,٨٥ |
| سلێمانی | ٣٧,٧٦ | ١٩,٥٧ |
| دهۆک | ٢٠,٥٣ | ٢٤,٧١ |
| کەرکووک | ٩,٢٨ | ٢٦,٨٧ |
| هەرێما کوردستانا عیراقێ | ١٠٠٪ | ١٠٠٪ |

**ژێدەر: سەرژمێرییاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.**

٥. ب گشتی، ژمارەیێن د ڤی خشتەیی دا ب شێوەیەکێ ئاشکەرا زێدەبوونا قەبارەیێ ئاکنجیێن گوند و باژێرێن پاریزگەهێ ل سالەکێ بۆ ئێکا دی دیاردکەن.

د ئەڤا بەری نهادا ژبۆ مە دیاردبیت کو گوهۆرینەکا بەرچاڤ د قەبارەیێ ئاکنجیێن گوند و باژێرێن پاریزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)ێ پەیدابوویە، ئاراستەیێ ڤێ گوهۆرینێ ل دەڤ ئاکنجیێن باژێری پتر بوو ژ گوندێن پاریزگەهێ، لێ ئاراستەیێ گوهۆرینێ ل دەڤ ئاکنجیێن گوندێن پاریزگەهێ ژ گشت ئاکنجیێن گوندێن دی یێن عیراقێ یان گوندێن دەوروبەرێن پاریزگەهێ ب هێزتربوو ب تایبەت ئەگەر دگەل ئاراستەیێ گوهۆرینێ ل دەڤ ئاکنجیێن باژێرێن وان پاریزگەهان بکەین.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. عبد الله عطوي ، جغرافية السكان، مؤسسة (النهضة)، ، بيروت، ٢٠٠١ ، ص ص ١٩٣-١٩٤.

٢. هژمارا ئاکنجیێن پاریزگەهێ د ماوەیێ هەر سالەکێ هاتینە هژمارتن ئەوژی ل دووڤ دابەشبوونا کارگێری و سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجییان.

٣. دگەل ناحیێن قەزایێن شێخان و ئاکرێ.

٤. خليل اسماعيل محمد، اقليم كوردستان العراق دراسات في التكوين القومي للسكان، مطبعة ئوفيست كريستال، اربيل، ١٩٩٨، ص٣٧.

٥. تێبینیا ئەنجامێن سەرژمێریا گشتی یا ئاکنجییان بکە ل پاریزگەها سلێمانیێ ل سالا (١٩٨٧) کو سەرژمێریا گشتی ل هندەك دەڤەران ژبەر بارودۆخێن شەری نەهاتەکرن.

٦. نشوان شكري عبد الله، النظام الحضري في محافظة دهوك، مؤسسة سبيريز للطبع و النشر، دهوك ٢٠٠٩، ص ص ٨١-١٠٥.

٧. هێما ب ناڤێن یەکەیێن کارگێری (قەزا و ناحیە) هاتییەکرن ب ناڤێن وان یێن نها بێ گوهدان ژبۆ وان گهورینێن ل سەر ڤان ناڤکرنان هاتینەکرن.

٨. خليل اسماعيل محمد، دهوك – نينوى دراسات في الخصائص الديموغرافية للسكان، مؤسسة كردستان للدراسات الاستراتيجية، ٢٠٠٥، ص٣٣.

٩. ڕێژا قەبارەیێ ئاکنجیێن پاریزگەهێ د ڤێ سالێ دا هاتییە دیارکرن پشتی قەبارەیێ ئاکنجیێن قەزا ئاکرێ ل سەر هاتییە زێدەرکرن ئەوژی کو پشتی ژ قەبارەیێ ئاکنجیێن مووسل هاتییە دەرکرن.

١٠. محمد السيد غلاب، يسري الجوهري ، جغرافية الحضر دراسة في تطور الحضر ومناهج البحث فيه ، منشأت المعاف ، الاسكندرية ، (بدون تاريخ) ، ص ص١٣٥-١٣٦ .

١١. عباس فاضل السعدي ، محافظة بغداد، المصدر السابق ، ص٤٥.

مجموعة القوانين والقرارات الصادرة عن المجلس الوطني لاقليم كوردستان العراق ، قانون وزارة البلديات والسياحة لاقليم كوردستان العراق ، اعداد المحامي عوني البزاز ، مطبعة جامعة صلاح الدين ، ط١،أربيل، ٢٠٠١، ص١٨.

١٢. نشوان شكري عبد الله، النظام الحضري في محافظة دهوك، المصدر السابق، ص ص٧٨-٩٩.

١٣. خليل اسماعيل محمد وآخرون، سياسة التعريب في أقليم كوردستان العراق دراسة وثائقية، دار ئاراس للطباعة والنشر، ط١، أربيل ٢٠٠٣، ص ص٢٣-٢٥.

١٤. خليل اسماعيل محمد، أقليم كوردستان العراق، المصدر السابق، ص١٠٥.

# (٢)
# وەرارا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ

## ١. وەرارا گشتی یا ئاکنجییان

دیاردا گهۆرینا ئاکنجییان بەرچاڤترین دیاردەیا دیموگرافییە ل چاخێ سەردەم و ئێکە ژ هەڤرکێێن مەترسیدار بێن ڕوی ب ڕوی مرۆڤایەتیێ دبیت ئەو ژی ژبەر گرنگییا وێ ب سرۆشتێ دینامیکی یێ ئاکنجییان بەرەڤ ئاراستەکی ڤێجا چ ئەڤ ئاراستە بەرەڤ زێدەبوونێ یان کێمبوونێ بیت[١]. زێدەبوونا ئاکنجییان دناڤ هەر کۆمەلگەهەکێدا یا گرێدایە ب کریارێن زێدەبوونا سرۆشتی و مشەختبوونێ، لێ ئەگەرەکێ دی ژی هەیە کو پەیوەندی ب گهۆرینێن کارگێریڤە هەیە و ب شێوەیەکێ بەرچاڤ کارتێکرنێ ل تێکراییێن گهۆرینا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ دکەت. پشت بەستن هاتییە کرن ل سەر دو پیڤەران بۆ دەستنیشانکرنا ئاراستەیێن زێدەبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ کو ئەڤ ئاراستە بەردەوام د بوارێ ڤەکۆلینێن ئاکنجییاندا دهێنە ب کارئینان، ئەو ژی ئەڤەنە:

### ئێك: ڕێژەیا گهۆرینا ئاکنجییان

پێکدهێت ژجوداهییا زێدەبوونا ئاکنجییان دناڤبەرا دو سەرژمێرییاندا وەك ڕێژەیا سەدی ژ هژمارتنا بەری هینگێ، ئەڤەژی پیڤەرەکێ گشتییە کو دەربرینێ ڕادەیێ گهۆرینێ د قەبارەیێ ئاکنجییاندا دکەت، ئەگەر مە بڤێت ڤێ گهۆرینێ ژبۆ هەر سالەکێ ب پیڤین دڤێت جوداهییا زێدەبوونێ ل سەر سالەکێ دناڤبەرا دو سەرژمێرییاندا دابەش بکەین[٢].

ژ تێبینیکرنا داتایێن خشتەیێ (١٠) دیاردبیت کو زێدەبوونا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ بەرەڤ زێدەبوونەکا هەڤسەنگ دچیت د ماوەیێ وان سالێن د خشتەیی دا هاتینە دیارکرن، ب ڕەنگەکی کو قەبارەیێ زێدەبوونا ل دەڤ ئاکنجییان پەیدابووی دگەهیتە (١٠٦٢٥٨٧) کەسان د ماوەیێ شێست سالێن بۆریدا کو بڕا وێ دبیتە (١٧١٣٨) کەس، ئانکو قەبارەیێ ئاکنجییان د ڤی ماوەیی دا نێزیکی نەهـ جاران پتر لێهاتییە.

**خشتەیێ (١٠)**
**پیڤەرێن گهۆرینا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٦)**

| سال | زێدەبوونا ئاکنجییان | زێدەبوونا سالانە | ڕێژەیا گهۆرینێ ٪ |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٧ | - | - | - |
| (١٩٥٧)ێ | ٢٤٦٩١ | ٢٤٦٩ | ٢١,٤٤ |
| (١٩٦٥)ێ | ٦٠١٦ | ٧٥٢ | ٤,٣ |
| ١٩٧٧ | ١٠٤٧٤١ | ٨٧٢٨ | ٧١,٨٢ |
| ١٩٨٧ | ٤٢٧٢٩ | ٤٢٧٣ | ١٧ |
| ١٩٩٦ | ١٠٩٦٦٦ | ٣٩٨٦٩ | ٣٧,٣٨ |
| ٢٠٠٦ | ٤٦٤٢٦٥ | ٢١٥١١ | ١١٥,٢١ |
| ٢٠٠٩ | ٣١٠٤٧٩ | ١٠٣٤٩٣ | ٣٥,٨ |
| ١٩٤٧-٢٠٠٩ | ١٠٦٢٥٨٧ | ١٧١٣٨ | ٩٢٢,٩٧ |

**ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.**

زێدەبوونێن د هژمارا ئاکنجییاندا پەیدابووین ژ دەمەکی بۆ ئێکی دی دهێنە گهۆرین ئەو ژی ژبەر وان کاودانێن ئێمناهی و ئابووری و جڤاکی یێن دەڤەر تێرا بۆری، زێدەباری گهۆرینێن کارگێری یێن د وی دەمیدا هاتینە کرن، مەزنترین زێدەبوونا ئاکنجییان د هەردو ماوێن داویێ دا پەیدابوویە ب زێدەبوونەکا گشتی کو برا وێ دگەهشتە (٤٦٤٢٦٥) کەسان و (٣١٠٤٧٩) کەسان ل دووڤ ئێکدا، و زێدەبوونەکا سالانە کو برا وێژی دگەهشتە (٢١٥١١) کەسان دناڤبەرا سالێن (١٩٩٦- ٢٠٠٦)ێ و برا (١٠٣٤٩٣) کەسان د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٦- ٢٠٠٩)ێ دا، ئانکو رێژەیا گهۆرینێ دگەهیتە (١١٥,٢١٪)ێ و (٣٥,٨٪)ێ ل دووڤ ئێکدا. ئەو گهۆرینێن مەزن یێن پەیدابووین د قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ دا د ماوەیێ بیست سالێن بۆری دا، بنیاتێ وان ڤەدگەریت بۆ وان گهۆرینێن کارگێری یێن د وی ماوەیی دا رویداین، ئانکو قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل سالێن (٢٠٠٦ و ٢٠٠٩)ێ کو قەبارەیێ ئاکنجییێن هەر چوار قەزایان (دهۆك، ئامێدی، زاخۆ و سێمێل) بخۆڤە دگرت دگەل قەبارەیێ ئاکنجییێن قەزایێن ئاکرێ و شێخان پشتی کو ژ لایێ کارگێریڤە هاتینە ب سەر وێڤە، لێ ب شێوەیەکێ نەیێ فەرمی بۆ پارێزگەها دهۆکێ پشتی سەرهلدانا ئادارا (١٩٩١)ێ، و بۆ زانین ئەڤ هەردو قەزایێن داویێ هژمارەکا مەزن یا ئاکنجییان لێ هەنە ب هەڤبەرکرن دگەل هەر چوار قەزایێن دی، هەردیسان قەزایێن (بەردەرەش، ئاکرێ و شێخان) نێزیکی سێیکا سەرجەمێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ پێکئینایە ب رێژەیێن (٩,٩٪)ێ و (١٢,٦٪)ێ و (١٠,٣٪)ێ ل دووڤ ئێك ل سالا (٢٠٠٩)ێ.

لێ کێمترین قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ دماوەیێ دناڤبەرا سالێن ((١٩٥٧ -١٩٦٥)ێ پەیدابوویە ب زێدەبوونەکا گشتی کو برا وێ بتنێ (٦٠١٦) کەس بوون، ئانکو ب زێدەبوونەکا سالانە کو بتنێ (٧٥٢) کەس بوون د هەر سالەکێدا و رێژەیا گهۆرینێ ژی بتنێ (٤,٣٪)ێ بوو، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی دزڤریت بۆ کاودانێن ئێمناهیێ یێن نەجێگیر پتریا دەڤەرێن هەرێما کوردستانێ ل وی سەردەمی بخۆڤە گرتین ژبەر کو ئەو گرۆپێن کریارا سەرژمێرییارێ ل سالا (١٩٦٥)ێ ئەنجامداین نەشیان بگەهنە پتریا دەڤەرێن هەرێمێ، لەورا پتریا هژمارێن هاتییە دانان بۆ ئاکنجییێن ڤان دەڤەرا وەك پێشبینی بووینە ل سەر ئەنجامێن سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ، ژبەر ڤێ چەندێ ئەو شاشیێن د سەرژمێرییا سالا (١٩٦٥)ێ دا پەیدابووین ب شێوەیەکێ نەرێنی رەنگڤەدان ل سەر قەبارەیێ ئاکنجییێن قەزایێ هەبوو ژبەرکو هندەك هژمارەبوون تا رادەیەکی ژ یێن سالا (١٩٥٧)ێ کێمتربوون. بۆ نموونە قەبارەیێ ئاکنجییێن قەزا دهۆکێ ل سەرژمێرییا سالا (١٩٦٥)ێ کێمتربوون ژ وێ هژمارا ل سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هاتییە ئەنجامدان ب رێژەیا (١,٧٪)ێ ، ئەڤ چەندە حالێ قەزا ئامێدیێ ژی بۆ ب رێژەیا (٣٦,٦٪)ێ و قەزا زاخۆ ژی ب رێژەیا (٣٦,٦٪)ێ و قەزا ئاکرێ ژی ب رێژەیا (١٤٪)ێ. زێدەباری ڤێ چەندێ ڤان ئەنجامان کارتێکرن ل سەر زێدەبوونا پەیدابووی د قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ دا کر د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٦٥- ١٩٧٧)ێ کو قەبارەیێ زێدەبوونێ (١٠٤٧٤١) کەس بوون ب زێدەبوونەکا سالانە (٨٧٢٨) کەس ل هەر سالەکێ، لەورا ئەڤ چەندە دووەم مەزنترین گهۆرینا ئاکنجییان بوو ب درێژاهییا ماوەیێ ڤەکۆلینێ ب رێژەیا (٧١,٨٢٪)ێ (تەماشەی وێنەیێن (٥) و (٦) بکە).

لێ ئەگەر ئەم تەماشەی قەبارەیێ گهۆرینا پەیدابووی ل سەر ئاستێ قەزایان بکەین (تەماشەی خشتەیێ (١١) و نەخشەیێن (١) و (٢) بکە) دێ شێین تێبینییا ڤان راستیان کەین:_

١) هەمی قەزایێن پارێزگەهێ زێدەبوونەکا ئەرێنی دماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧- ٢٠٠٩)ێ بخۆڤە دیتی نە، لێ ل دووڤ پیڤەرێن گهۆرینێ خۆ ئێك ژڤان قەزایان نەگەهشتبوو وی ئاستی یێ پیڤەرێن پارێزگەهێ گەهشتیێ.

**وێنەیێ (٥)**

**گەشەکرنا زێدەبوونا گشتی و یا سالانە یا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)**




**وێنەیێ (٦)**

**گەشەکرنا رێژەیا گهۆرینێ یا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)**




| | 1957-1947 | 1965-1957 | 1977-1965 | 1987-1977 | 1996-1987 | 2006-1996 | 2009-2006 | 1947-2009 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| رێژەیا گهورینێ | 21.44 | 4.3 | 71.82 | 17 | 37.38 | 115.21 | 35.8 | 922.97 |

٢) بلندترین رێژەیا زێدەبوونێ ل قەزا دهۆکێ بوو کو برا وێ (٢٧٤٠٣١) کەس بوون و زێدەبوونەکا سالانە کو (٤٤٢٠) کەس بوون د هەر سالەکێدا و رێژەیا گهۆرینێ ژی (٧٠٥٪)ێ بوو، ئانکو سەرجەمێ ئاکنجیێن قەزایێ حەفت جاران ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ د ماوەیێ شێست سالێن بۆریدا پتر لێهاتینە، ل دووڤدا قەزا ئاکرێ دهێت ب زێدەبوونا گشتی (٢٣٢٧٨٤) کەس و ب زێدەبوونا سالانە کو (٣٧٥٤) کەس د هەر سالەکێدا و رێژەیا گهۆرینێ ژی (٧٠٩ ٪)ێ بوو کو ل ویری ژی هژمارا ئاکنجیێن وێ حەفت جاران پتر لێهاتینە، ل رێزا سیێ ژی قەزا شێخان دهێت ب زێدەبوونەکا گشتی (١١٥٩٨٦) کەس و زێدەبوونا سالانە د هەر سالەکێ دا (١٨٧٠١) کەس و رێژەیا گهۆرینێ ژی د گەهشتە (١٩٩٧٪)ێ ، ئانکو ئاکنجیێن وێ نێزیکی بیست جاران پتر لێهاتینە. ئەگەرێ سەرەکی یێ وێ چەندێ ژی دزڤریت بۆ هندێ کو پترین هژمارا باژێرێن پارێزگەهێ دکەڤنە دناڤ ڤان هەردو قەزایاندا (دهۆك و ئاکرێ) و ڤان باژێران ژی رێژەیەکا باش یا گەشەکرنێ بخۆڤەگرتییە، زێدەباری کو رێژەیا هەرە مەزن یا مشەختبوونێ بەرەڤ ڤان قەزایان چووینە ڤێجا چ مشەختبوونا ژ گوندان بیت یانژی مشەختبوون ژ پارێزگەهەکێ بۆ ئێکا دی بیت.

٣) کێمترین ئاستێ زێدەبوونا ئاکنجییان ل قەزا ئامێدیێ هاتییە توومارکرن ب زێدەبوونەکا گشتی (٥٢٠٢٧) کەسان، کو زێدەبوونا سالانە دگەهیتە (٨٣٩) کەسان و رێژەیا گهۆرینێ ژی بتنێ دبیتە (١٢٠٪)ێ ، ژبەرکو قەزا ئامێدیێ ب درێژاهیا سالێن (١٩٦١-١٩٩١)ێ گورەپانا شەری بوو دناڤبەرا بەرەیێن کوردی و حکومەتا ناڤەندی، زێدەباری هندێ پتریا رووبەرێ ڤێ قەزایێ دەڤەرێن ئاسێ و چیایی نە لەورا جهەکێ ب زەحمەت بوو بۆ هژمارتنا خەلکێ وێ. لێ ئەگەرێ کێمیا ئاستێ زێدەبوون و رێژەیا گهۆرینا ئاکنجییان ل قەزا سێمێلێ ڤەدگەریتە هندێ کو دەمەکێ نە ژمێژە بوویە قەزا، ل سەرژمێریێن سالا (١٩٨٧)ێ و بەری هینگێ سەنتەرێ ناحیێ سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە بوو.

٤) هەمی قەزایان رێژەکا نەرێنی دناڤبەرا سالێن (١٩٥٧- ١٩٦٥)ێ هەبوو ئەو ژی ژبەر وان شاشیێن د سەرژمێریا سالا (١٩٦٥)ێ دا پەیدابووین، زێدەباری گەلەك فاکتەرێن دی کو بەری نها ئاماژە پێ هاتییەکرن، ژبلی هندێ قەزا ئامێدیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ کێمبوونەك د هژمارا ئاکنجیێن ویدا پەیدابوو ب برا (٤٥٧٨٠) کەسان ئانکو ب رێژەیا (٦٢,٢٪)ێ ژ قەبارەیێ ئاکنجیێن قەزایێ ل سالا (١٩٧٧)ێ، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی د زڤریت بۆ وی بارودۆخێ نەخۆش یێ قەزا تێرابۆری کو ببوو جهێ گورەپانا شەری دناڤبەرا هێزێن کوردی و حکومەتا ناڤەندی ب درێژاهیا سالێن (١٩٧٥- ١٩٨٨)ێ زێدەباری کریارێن لەشکەری و ئەنفالان یێن بەردەوام ل ڤێ دەڤەرێ پەیدابووین و گەلەك جهێن ڤێ قەزایێ بخۆڤە گرتین، ئەڤ چەندە ژی ببوو ئەگەرێ خرابکرن و تالانکرنا سەدەها گوندێن قەزایێ ب تایبەت ناحیێن کانی ماسێ و دێرەلوکێ و خەلکێ وان نەچاربوویە مشەخت بنە هندەك دەڤەرێن دی یێن دەوروبەر.

٥) گهۆرینەکا بەرچاڤ د برا زێدەبوونا گشتی ژ دەمەکی بۆ ئێکی هەیە ڤێجا چ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ یان قەزایێن وێ بیت (تەماشەی خشتەیێ (١٢) بکە) لێ بهایێ هاوکولکێ جوداهیێ (Coefficient of Variation) بۆ زێدەبوونێن گشتی یێن ئاکنجییان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ هەر مایە بلند ب رێژەیا (١٠٩,٥٪)ێ ب هەڤبەرکرن دگەل رێژەیا وێ ل سەر ئاستێ قەزایان، لێ بهایێ ڤی هاوکولکەی ل گەلەك قەزایان ب شێوەیەکێ بەرچاڤ ژ رێژەیا (٦٨,٧٪)ێ

**خشتەیێ (11)**

**پێشەرێن گهۆڕینا ئاکنجیبان ل قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | قەزا دهۆکێ | | | قەزا ئامێدیێ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | زێدەبوونا ئاکنجیبان | زێدەبوونا سالانە | ڕێژەیا گهۆڕینێ ٪ | زێدەبوونا ئاکنجیبان | زێدەبوونا سالانە | ڕێژەیا گهۆڕینێ ٪ |
| ١٩٤٧ | - | - | - | - | - | - |
| ١٩٥٧ | -١٠٣٠ | -١٠٣ | -٢,٦ | ١٣٠٣٢ | ١٣٠٣ | ٣٠,١ |
| ١٩٦٥ | -٦٥٥ | -٨٢ | -١,٧ | -٢٠٦١٠ | -٢٥٧٦ | -٣٦,٦ |
| ١٩٧٧ | ٦٥٤١٦ | ٥٤٥١ | ١٧٦ | ٣٧٨٦٣ | ٣١٥٥ | ١٠٦ |
| ١٩٨٧ | ٢٩٥٨٩ | ٢٩٥٩ | ٢٨,٨ | -٤٥٧٨٠ | -٤٥٧٨ | -٦٢,٢ |
| ١٩٩٦ | ٧٩٦٥٢ | ٨٨٥٠ | ٦٠,٢ | ٥٢٢٦٥ | ٥٨٠٧ | ١٨٨ |
| ٢٠٠٦ | ٦٧٤٠٣ | ٦٧٤٠ | ٣١,٨ | ١٤٣٨٢ | ١٤٣٨ | ١٨ |
| ٢٠٠٩ | ٣٣٦٥٦ | ١١٢١٨ | ١٢,٠٥ | ٨٧٥ | ٢٩٢ | ٠,٩٢ |
| ١٩٤٧-٢٠٠٩ | ٢٧٤٠٣١ | ٤٤٢٠ | ٧٠٥,٥ | ٥٢٠٢٧ | ٨٣٩ | ١٢٠,١ |
| سال | قەزا زاخۆ | | | قەزا سێمێلێ | | |
| | زێدەبوونا ئاکنجیبان | زێدەبوونا سالانە | ڕێژەیا گهۆڕینێ ٪ | زێدەبوونا ئاکنجیبان | زێدەبوونا سالانە | ڕێژەیا گهۆڕینێ ٪ |
| ١٩٤٧ | - | - | - | - | - | - |
| ١٩٥٧ | ٩٥٨٧ | ٩٥٨ | ٢٦,٦ | - | - | - |
| ١٩٦٥ | -١٢٦١٦ | -١٥٧٧ | -٢٧,٦ | - | - | - |
| ١٩٧٧ | ٤١٣٥٩ | ٣٤٤٦ | ١٢٥ | - | - | - |
| ١٩٨٧ | ٩٢٠٩ | ٩٢١ | ١٢,٤ | - | - | - |
| ١٩٩٦ | ٥٨٦٥٥ | ٦٥١٧ | ٧٠,١ | ٢١٣٠٨ | ٢٣٦٧ | ٤٣,١ |
| ٢٠٠٦ | ٥٢٩٣٧ | ٥٢٩٤ | ٣٧,٢ | ٢٩٩٥٠ | ٢٩٩٥ | ٤٢,٣ |
| ٢٠٠٩ | ٣٢٨٩٤ | ١٠٩٦٥ | ١٦,٨ | ٥٣٣٢٦ | ١٧٧٧٥ | ٥٣ |
| ١٩٤٧-٢٠٠٩ | ١٩٢٠٢٥ | ٣٠٩٧ | ٥٣٢,٣ | ١٠٤٥٨٤ | ٤٧٥٤ | ٢١١,٧ |
| سال | قەزا ئاکرێ[3] | | | قەزا شێخان | | |
| | زێدەبوونا ئاکنجیبان | زێدەبوونا سالانە | ڕێژەیا گهۆڕینێ ٪ | زێدەبوونا ئاکنجیبان | زێدەبوونا سالانە | ڕێژەیا گهۆڕینێ ٪ |
| ١٩٤٧ | - | - | - | - | - | - |
| ١٩٥٧ | ١٣٥٥٩ | ١٣٥٦ | ٤١,٣ | ١٨٠٨٦ | ١٨٠٨ | ٧٢,١ |
| ١٩٦٥ | -٦٤٩٣ | -٦٤٩ | -١٤ | -٤٣١٦ | -٥٣٩ | -١٠ |
| ١٩٧٧ | ٣٢٩١٠ | ٢٧٤٢ | ٨٢,٥ | -٥٢٩٥ | -٤٤١ | -١٣,٦ |
| ١٩٨٧ | ٢٠١٧٠ | ٢٠١٧ | ٢٧,٧ | ٢١٠١٢ | ٢١٠١ | ٦٢,٦ |
| ١٩٩٦ | ٥٤٢٦٣ | ٦٠٢٩ | ٥٨,٤ | -١٢٠٣٠ | -١٣٣٦ | -٢٢ |
| ٢٠٠٦ | ٥٠٤٣٩ | ٥٠٤٤ | ٣٤,٢ | ٣٤٢٧٢ | ٣٤٢٧ | ٨٠,٦ |
| ٢٠٠٩ | ٦٧٩٣٦ | ٢٢٦٤٥ | ٣٤,٤ | ٣٧٥١١ | ١٢٥٠٤ | ٤٤,٥ |
| ١٩٤٧-٢٠٠٩ | ٢٣٢٧٨٤ | ٣٧٥٤ | ٧٠٩ | ١١٥٩٨٦ | ١٨٧٠١ | ١٩٩٧ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەڵسەنگاندنێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.

نەخشەیێ (١)
زندەبوونا سالانە یا ئاكنجیبیان ل قەزایێن پارێزگەها دهۆكێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)




نەخشەیێ (٢)
رێژەیا گهۆرینا ئاكنجیبیان ل قەزایێن پارێزگەها دهۆكێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)



**خشتەیێ (١٢)**

**بهایێ هاوكۆلكێ جوداهیێ بۆ زێدەبوونێن گشتی یێن ئاكنجییان و ڕێژەیێن گهۆرینا ئاكنجییان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ و قەزایێن وێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٦)[٤]**

| قەزا | دهۆك | | ئامێدی | | زاخۆ | | شێخان | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | زێدەبونا ئاكنجییان | ڕێژەیا گهۆرینێ % | زێدەبونا سالانە | ڕێژەیا گهۆرینێ % | زێدەبونا سالانە | ڕێژەیا گهۆرینێ % | زێدەبونا سالانە | ڕێژەیا گهۆرینێ % |
| لادانا پیڤەری | ٢١٥٥٧ | ٦٩,٣ | ١٩٠٤٣ | ٧٨,٦ | ٢٣٦١٥ | ٤٤,٩ | ١٧٩٨٨ | ٤٨,١ |
| هاوكۆلكێ جوداهیێ | ٣٥,٦ | ٩٣,٤ | ٦٤,٨ | ٩١,٩ | ٦٨,٧ | ٨٢,٧ | ٣١,٢ | ٥٨,٧ |
| قەزا | سێمێل | | ئاكرێ | | پارێزگەهـ | | | |
| | ڕێژەیا گهۆرینێ | ڕێژەیا گهۆرینێ % | ڕێژەیا گهۆرینێ | ڕێژەیا گهۆرینێ % | ڕێژەیا گهۆرینێ | ڕێژەیا گهۆرینێ % | | |
| لادانا پیڤەری | ٦١١١ | ٠,٥٦ | ١٧٩٦٤ | ٢٢ | ١٣٧٢٥١ | ٤٤,٣٦ | | |
| هاوكۆلكێ جوداهیێ | ٢٣,٨ | ١,٣٢ | ٥٢,٤ | ٤٥,١ | ١٠٩,٥ | ٩٨,٦ | | |

ژێدەر، داتایێن خشتەیێن (٢-٥)

زێدەتر لێ نەهاتییە هەروەك قەزا زاخۆ، هەردو قەزایێن سێمێل و ئاكرێ كێمتر جوداهی هەنە و پتر د زێدەبوونا ئاكنجییاندا د جێگرین، ئەو ژی ژبەر كاودانێن ئێمناهیێ یێن تا ڕادەیەكی جێگیر ل ڤان هەردو قەزایان ب درێژاهییا ماوەیێ ڤەكۆلین ل سەر هاتییە كرن.

٦) بهایێ هاوكۆلكێ جوداهیێ ژبۆ ڕێژەیێن گهۆرینا ئاكنجییان بلند دبیت ب هەڤبەركرن دگەل بهایێ هاوكۆلكێ جوداهیێ ژبۆ زێدەبوونێن گشتی یێن ئاكنجییان، لێ تشتێ سەرنجراكێش ئەوە چ جوداهیێن مەزن نینن دناڤبەرا بهایێ هاوكۆلكێ جوداهیێ یێ ڕێژەیا گهۆرینا ئاكنجییان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ دگەل قەزایێن وێ یێن سەرەكی (دهۆك، ئامێدی و زاخۆ)، دەمێ ئەڤ بهایە دگەهشتە (٩٨,٦٪)ێ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ ڕێژەیێن (٩٣,٤٪)ێ و(٩١,٩٪)ێ و(٨٢,٧٪)ێ پێكدئینا ل دەڤ قەزایێن دهۆك و ئامێدی و زاخۆ ل دووڤ ئێكدا. لێ بهایێ هاوكۆلكێ جوداهیێ بۆ قەزایێن سێمێل و ئاكرێ و شێخان دمینیت كێمترین بها. بلندبوونا بهایێ هاوكۆلكێ جوداهیێ ژبۆ زێدەبوونێن گشتی یێن ئاكنجییان و ڕێژەیێن گهۆرینا ئاكنجییان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ و هندەك قەزایێن وێ ڤەدگەڕیت بۆ كاودانێن ئێمناهیێ یێن نەجێگر یێن ئەڤ دەڤەرە تێڕا بۆرین د ماوەیێ سالێن شێستان و حەفتییان و هەشتێیان ژ چەرخێ بۆری، لەورا بوو ئەگەرێ ڕویدانا پێلێن دژوار یێن مشەختبوونێ دناڤبەرا قەزایێن وێدا، هەردیسان گهۆرینێن كارگێری ژی ڕۆلەكێ سەرەكی دڤی بواریدا هەبوو.

## دو: تێکرایا وەرارا سالانە یا ئاکنجییان

دهێتە هژمارتن ئێك ژ پیڤەرێن گرنگ و بەربەلاڤ بۆ پیڤانا ئاراستەیێن زێدەبوونا ئاکنجییان و جوداهیا جهێن وان دناڤ دەڤەرەکا دەستنیشانکریدا[٥]، گرنگییا ڤی پیڤەری ژی د هویربینییا وێدایە دەمێ دهێتە ب کارئینان ژبۆ هژمارتنا تێکرایێ زێدەبوونا ئاکنجییان ل سەر بنیاتێ گهۆرینان د ماوەیێ هەر سالەکێدا زێدەباری گرنگییا وێ د هویربینییا پێشبینیکرنا دەرکەفتنێن ئاکنجییاندا (Population Projection) ئەو ژی ب پشت بەستن ل سەر وێ ڕاستیێ کو هژمارا ئاکنجییان زێدەدبیت ل دووڤ پرەنسیپێ مفایێن تێکەل نەك مفایەکێ سادە[٦]، ژبەر ڤێ چەندێ هاوکێشە هوسا دهێتە داڕێژتن کو زێدەبوونا پەیدادبیت د ماوەیێ هەر سالەکێدا و گرنگییا وێ د زێدەبوونا هژمارا ئاکنجییاندا ل سالا دووڤدا ل بەر چاڤ بێتە وەرگرتن، ئەڤ هاوکێشە ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ دهێتە ب کارئینان د ڤەکۆلینێن بازنەیا ئاکنجییان یا سەر ب نەتەوێن ئێککرتیڤە، هاوکێشە ژی ب ڤی رەنگیە:

$$r = \left( t\sqrt{\frac{p1}{p2}} - 1 \right) \times 100 \quad (٧)$$

ب رەنگەکی کو :

r = تێکرایێ زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجییان.

p1 = هژمارا ئاکنجییان د سەرژمێرێن پشتی هینگێ دا.

p2 = هژمارا ئاکنجییان د سەرژمێرێن بەری هینگێ دا.

t = هژمارا سالان.

پشت بەستن ل سەر ڤێ هاوکێشەیێ هاتییە کرن بۆ دەستنیشانکرنا ئاراستەیێن گەشەکرنا سالانە بۆ ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ب پیڤەرێن جهی یێن جوداجودا، و هەڤبەرکرنا وان دگەل ئاراستەیێن زێدەبوونێ ل سەر ئاستێ عیراقێ و پارێزگەهان د ماوەیێ دەمێن جوداجودا.

ب هاریکاریا وان داتایێن دخشتەیێ (١٣) و وێنەیێ(٧) دا، ئەم دشێن تێبینییا ڤان خالان بکەین:

١) سەرەرای هەبوونا جۆرەکێ هەڤنێزیکبوونێ دناڤبەرا تێکراییێن زێدەبونا سالانە یا ئاکنجییان د ماوەیێ سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٩)ێ دناڤبەرا پارێزگەهێن هاتینە دیارکرن د خشتەیی دا و ل سەر ئاستێ عیراقێ، لێ پارێزگەها دهۆکێ بلندترین تێکرایێ زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجییان تووماركرییە ب ڕێژەیا (٣,٨١٪)ێ و پشتی هینگێ پارێزگەها سلێمانیێ دهێت ب ڕێژەیا (٣,٣٩٪)ێ لێ پارێزگەها نەینەوا کێمترین تێکرا تووماركرییە ب ڕێژەیا (١,٣٪)ێ .

٢) ڕێژەیێن زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ د سالێن خشتەیی دا هاتینە دیارکرن کێم دبن ب هەڤبەرکرن دگەل پارێزگەهێن دی ژبلی ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٦٥ێ-١٩٧٧)ێ کو تێکرایێ زێدەبوونێ دگەهیتە (٤,٦١٪)ێ ، ئەڤ چەندە ژی ژ ئەگەرێ وان شاشییان پەیدابوویە یێن د سەرژمێریا سالا (١٩٦٥)ێ دا رویداین ب تایبەت ل هەردو پارێزگەهێن دهۆك و سلێمانیێ، کو داتایێن ئاکنجییان وەك هەڵسەنگاندنەك ژ ئەنجامێن سەرژمێرییارێن بەری هینگێ هاتبوونە وەرگرتن لەورا بۆ ئەگەرێ هەبوونا جوداهییەکا مەزن د هژمارا قەبارەیێ ئاکنجییاندا ل دەستپێك و دوماهیکا وێ ماوەیی. بەروڤاژی تێکرایێ زێدەبوونا سالانە یێ ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (١٩٩٦-٢٠٠٩)ێ بلندترین ئاست تووماركرییە ب ڕێژەیا

**خشتەیێ (١٣)**
**تێکراییێن زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ دگەل پارێزگەهێن دەوروبەر و پارێزگەهێن عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| پارێزگەهـ / سال | دهۆك | هەولێر | سلێمانی | کەرکووك | نەینەوا | عیراق |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٧-١٩٤٧ | ١,٩٦ | ١,٣٢ | ٣,٠٢ | ٣,١ | ٤,٢٤ | ٣,١ |
| ١٩٦٥-١٩٥٧ | ٠,٥٣ | ٣,٣٦ | ٣,٤٤ | ٢,٥ | ٢,٣٧ | ٢,٧ |
| ١٩٧٧-١٩٦٥ | ٤,٦١ | ٣,٥٥ | ٤,٦٦ | ٠,٣٧ | ٣,٣٥ | ٣,٣٣ |
| ١٩٨٧-١٩٧٧ | ١,٥٨ | ٣,٥٩ | ٣,٢٦ | ١,٩٥ | ٢,٩٧ | ٣,١٣ |
| ١٩٩٧-١٩٨٧ | ٣,٢٢ | ٣,٥٨ | ٣,٦٥ | ٢,٢٧ | ٣,٢٧ | ٣,٠٤ |
| ٢٠٠٦-١٩٩٧ | ٨,٨٨ | ٣,٤٧ | ٣,٣٤ | ١,٨٢ | ٢,٣٨ | ٣,٠١ |
| ٢٠٠٦-٢٠٠٩ | ١٠,٧٢ | ٤,٨٢ | ٠,٥ | ١٤,٣٦ | ٤,١٦ | ٤,٢ |
| ٢٠٠٩-١٩٤٧ | ٣,٨١ | ٣,٢٢ | ٣,٣٩ | ٢,٥٣ | ١,٣ | ٣,١٢ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەڵسەنگاندنێن ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.

**وێنەیێ (٧)**
**گەشەکرنا تێکراییێن زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ دگەل پارێزگەهێن دەوروبەر و پارێزگەهێن عیراقێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**



(١٠,٧٢٪)ێ (ژبلی پارێزگەها کەرکووکێ هەر د وێ سالێدا)، ئەڤ چەندە ژی دزڤریت بۆ کاودانیێن ئێمناهی و جڤاکی و ئابووری و پێشکەفتنێ یێن پارێزگەهـ دماوەیێ ڤان سالانرا تێرا بۆری، هەردیسان رێکخستنا سنوورێن کارگێری یێن پارێزگەهێ ژی رۆلەکێ گرنگ د ڤێ چەندێ دا هەبوو، ب رەنگەکی کو قەزا ئاکرێ هەر ژ سالا (١٩٩١)ێ وەرە دهێتە هژمارتن ئێك ژ قەزایێن سەر ب پارێزگەها دهۆکێڤە، و داتایێن ئاکنجیێن وان کو هەر ژ سالا (١٩٩١٩)ێ هاتینە ئەنجامدان و تا نهو دگەل پێشبینیێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ دهێنە هەژمارکرن.

٣) جوداهییەکا مەزن دناڤبەرا تێکرایێن زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ دگەل پارێزگەهێن دی هەیە، کو بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ دناڤبەرا واندا دگەهیتە (١٠١,٥٧٪)ێ ل پارێزگەها دهۆکێ، لێ ئەڤ بهایە دناڤبەرا هەر ئێك ژ پارێزگەهێن هەولێر و سلێمانی و کەرکووك و نەینەوا دگەهیتە (٣٣,٥٩٪)ێ و (١٧,٧١٪)ێ و (٧١,٢٧٪)ێ و (٢٦,١٣٪)ێ ل دووڤدا ئێکدا، ل دەمەکی کو بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ ل سەر ئاستێ عیراقێ کێم دبیت بۆ رێژەیا بتنێ (١٦,٩٢٪)ێ .

لێ ل سەر ئاستێ قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ (تەماشەی خشتەیێ(١٤) و وێنەیێ (٨) بکە)، ئەم دشێن تێبینیا جوداهییەکێ د تێکرایێن زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجییاندا د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا بکەین، ب رەنگەکی کو ئەو قەزایێن سرۆشتەکێ دەشت و جۆرەکێ ئێمناهیێ و بەرقەراربوونێ هەی د وی ماوەیی دا بلندترین تێکرایێن زێدەبوونێ هەنە، بۆ نموونە قەزایێن سێمێل و دهۆك و ئاکرێ تێکرایێن بلند توومارکرینە ب رێژەیێن (٥,٢٩٪)ێ و (٣,٤٢٪)ێ و (٣,٤١٪)ێ لێ ئەڤ تێکرایە دکێم بوون ل هەرسێ قەزایێن زاخۆ و شێخان و ئامێدیێ ب رێژەیێن

**خشتەیێ (١٤)**

**تێکرایێن زێدەبوونا سالانە یێن ئاکنجییێن قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| پارێزگەهـ / سال | دهۆك | ئامێدی | زاخۆ | شێخان | سێمێل[8] | ئاکرێ[9] |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٧-١٩٤٧ | -٠,٢٧ | ٢,٦٦ | ٢,٣٨ | ٥,٦ | - | ٣,٥٢ |
| ١٩٦٥-١٩٥٧ | -٠,٢٢ | -٥,٥٣ | -٣,٩٦ | -١,٣ | - | -١,٨٧ |
| ١٩٧٧-١٩٦٥ | ٨,٨٢ | ٦,٢ | ٧ | -١,٢ | - | ٥,١٤ |
| ١٩٨٧-١٩٧٧ | ٢,٥٧ | -٩,٢٧ | ١,١٧ | ٤,٩٨ | - | ٢,٤٧ |
| ١٩٩٦-١٩٨٧ | ٥,٣٨ | ١٢,٤٧ | ٦,٠٨ | -٢,٧ | ٤,٠٦ | ٥,٢٤ |
| ٢٠٠٦-١٩٩٦ | ٢,٨ | ١,٦٦ | ٣,٢١ | ٦ | ٣,٦ | ٢,٩٩ |
| ٢٠٠٩-٢٠٠٦ | ٣,٨٦ | ٠,٣١ | ٥,٣٢ | ١٦,٦ | ١٥,٢ | ١٠,٣٣ |
| ٢٠٠٩-١٩٤٧ | ٣,٤١ | ١,٢٨ | ٣,٠١ | ٢,٥٧ | ٥,٢٩ | ٣,٤٢ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆك ێ ل سالێن دیارکری.

وێنەیێ (٨)
گەشەکرنا تێکراییێن زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سەر ئاستێ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)




(٣,٠١) و (٢,٥٧٪)ێ و (١,٢٨٪)ێ ل دووڤ ئێكدا، ئەو ژی ژبەر سرۆشتێ چیایی و کاودانێ ئێمناهیێ یێ نەجێگیر ل ڤان دەڤەران، ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەرێ مشەختبوونا هژمارەکا مەزن یا خەلکێ وان بۆ هندەك قەزاییێن دەوروبەر ب تایبەت دناڤبەرا سالێن (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ، دهێتە تێبینیکرن کو قەزاییێن شێخان و دهۆك و ئاکرێ تێکراییێن بلند یێن زێدەبوونێ توومارکرینە ب رێژەیێن (٤,٩٨) و (٢,٥٦) و (٢,٤٧٪)ێ ل دووڤ ئێکدا، لێ تێکرایێ زێدەبوونێ ل قەزا زاخۆ کێمبوویە بۆ (١,١٧٪)ێ ، قەزا ئامێدیێ ژی تێکرایەکێ نەرێنی ب رێژەیا (-٩,٢٧٪)ێ توومارکرییە.

کاودانێن سیاسی و ئێمناهیێ یێن نەجێگیر و مشەختبوونا گوندییان دناڤبەرا قەزاییێن پارێزگەها دهۆکێ کارتێکرنا خو ل سەر جوداهیا تێکراییێن زێدەبوونا ئاکنجییان ژ دەمەکی بۆ ئێکی دی کرییە ڤێجا چ دناڤ قەزا دابیت یانژی ژ قەزایەکێ بۆ ئێکا دی د هەمان ماوەدا، هەردیسان جوداهییەکا ئاشکەرا هەیە دناڤبەرا تێکراییێن زێدەبوونا سالانە یا ئاکنجییان د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا بۆ هەر ئێك ژ قەزاییێن ئامێدی و زاخۆ و دهۆکێ ب رەنگەکی کو بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ دناڤبەرا ڤان تێکرایان دگەهیتە (٨٥,٠٢٪)ێ و (٦٢,٤٧٪)ێ و (٥٩,٦٪)ێ ل دووڤ ئێکدا، لێ قەزاییێن شێخان و سێمێل و ئاکرێ جوداهییەکا کێمتر هەیە ب رەنگەکی کو بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیا وان کێمبوویە بۆ (٤٧) و (٣٢,٥٣٪)ێ و (٨,٤٩٪)ێ ل دووڤ ئێکدا، (تەماشەی خشتەیێ (١٥) بکە)، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ گهۆرینێن کارگێری یێن قەزا سێمێلی و جێگیربوونا کاودانێن ئێمناهیێ تا رادەیەکێ مەزن بۆ قەزاییێن ئاکرێ و شێخان د ماوەیێ سالێن دیارکری دا.

**خشتەیێ (١٥)**
**پیڤەرێن جوداهیێ بۆ تێکراییێن زێدەبوونێ ل سەر ئاستێ قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| قەزا / پیڤەر | دهۆك | ئامێدی | زاخۆ | شێخان | سێمێل | ئاکرێ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| لادانا پیڤەری | ٢,٩١ | ٤,٨٨ | ٢,٤٧ | ٤,٠٢ | ١,٢٦ | ٠,٣٢ |
| هاوکۆلکێ جوداهیێ | ٥٩,٦ | ٨٥,٠٢ | ٦٢,٣٧ | ٤٧ | ٣٢,٥٣ | ٨,٤٩ |

**ژێدەر: پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ (١٤) هاتیە کرن**

ژڤان پێزانینێن بەری نها بۆ مە دیاردبیت کو گهۆرینەکا مەزن د هژمارا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ دا دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧- ٢٠٠٩)ێ پەیدابوویە، ل دووڤ وان پیڤەرێن پشت بەستنێ دکەنە سەر پیڤانا ئاراستەیێن گهۆرینێ دگەل بهایێ گهۆرینا وان ژ دەمەکی بۆ ئێکێ دی ژ ئەگەرێ کاودانێن جڤاکی و ئابووری و ئێمناهیێ و گهۆرینێن کارگێری. ئەم دشێین هەمان ئاخفتن بۆ ئاراستەیێ گهۆرینێ ل سەر ئاستێ قەزایێن پارێزگەهێ ژی بێژین، دژواریا دیاردا جوداهیێ د ئاستێن گەشەکرنێ دا ب جوداهیا پیڤەرێن جهی، ب رەنگەکی ئەڤ گهۆرینە د ئاستێ گەشەکرنێ دا بهێزتر لێ دهێن دگەل ڤەگوهاستنا ئاکنجییان ژ یەکەیەکا جهی یا مەزن بۆ هندەك یەکەیێن جهی یێن بچویکتر، فاکتەرێن مشەختبوونا گوندییان و کاودانێن ئێمناهیێ ژی دهێنە هژمارتن فاکتەرێن سەرەکی د هەبوونا جوداهییان دناڤبەرا ئاستێن گەشەکرنێ دا ڤێجا چ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ بیت یان ل سەر ئاستێ یەکەیێن کارگێری یێن بچویکتر وەك قەزا و ناحییان.

## ٢. گەشەکرنا ئاکنجییێن گوند و باژێران

ئەو جوداهیێن د بهایێ پیڤەرێن زێدەبوونێ دا ل سەر ئاستێ گشت ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ دیاربووین، ل سەر ئاستێ دەڤەرێن گوندان و باژێران پتر خویادکەن، ئەڤ جوداهییە دناڤبەرا بهایێ ڤان پیڤەران دناڤبەرا دەڤەرێن گوند و باژێران گەلەك یا ئاشکەرا بوو د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا. لێ قەبارەیێ زێدەبوونا سالانە ل سەر ئاستێ گشت ئاکنجییان دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧- ٢٠٠٩)ێ گەهشتییە (١٧١٣٨) کەسان، هەردیسان ل سەر ئاستێ دەڤەرێن باژێران ژی دا ئەڤ قەبارێ گەهشتییە (١٣١٩٩) کەسان لێ ل سەر ئاستێ دەڤەرێن گوندان کێمبوویە بۆ (٣٩٤٠) کەسان. ئەم دشێین ڤێ چەندێ ب شێوەیەکێ روهنتر دیاربکەین دەربارەی رادەیێ جوداهیێ و زێدەبوونا تەمام دناڤبەرا بهایێ پیڤەرێن زێدەبوونا ئاکنجییان ل سەر ئاستێ گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێ و دەڤەرێن گوند و باژێران ئەو ژی ب هاریکاریا پیڤەرێ رێژەیا گهۆرینا ئاکنجییان، ئەگەر تێبینییا هندێ بکەین کو گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا نێزیکی شەش جار و نیڤان پتر لێهاتینە ب رەنگەکی رێژەیا گهۆرینا ئاکنجییان گەهشتییە (٩٢٢,٩٪)ێ ، لێ ئاکنجییێن گوندان بتنێ دو جار و نیڤان پتر لێهاتینە ب رەنگەکی رێژەیا گهۆرینا ئاکنجییان گەهشتییە (٢٤١٪)ێ ، لێ ئاکنجییێن باژێران نێزیکی (٦٠) جاران پتر لێهاتینە ب رەنگەکی رێژەیا گهۆرینا ئاکنجییێن وێ گەهشتییە (٥٩٠٤٪)ێ .

سەرەرای ئەڤا بەری نها هەمیێ، ئاراستەیێن زێدەبوونا ئاکنجییان دناڤبەرا دەڤەرێن گوند و باژێران

(تەماشەی خشتەیێ (١٦) بكە) ژ سالەكێ بۆ ئێكا دی د جودانە، و جوداهییا د ئاستێن زێدەبونێ ل دەڤەرێن گوندان پتر دیارن ژ دەڤەرێن باژێران، هەردیسان پیڤەرێن زێدەبوونێ بەردەوام بهایەكێ ئەرێنێ ل دەڤەرێن باژێران توومارکرییە، لێ دهندەك سالێن ڤەكۆلین دا بهایەكێ نەرێنی ل هندەك دەڤەرێن گوندان توومارکرییە.

تشتێ ژ هەمیان سەرنجراكێشتر ئەو جوداهییا ئاشكەرا یا د تێكراییێن زێدەبوونا سالانەیە دناڤبەرا گشت ئاكنجیێن پارێزگەهێ و دەڤەرێن گوند و باژێران (تەماشەی خشتەیێ (١٧) و وینەیێ(٩) بكە)، ئەم دشێن تێبینییا ڤان خالان بكەین:-

١) تێكراییێ زێدەبوونا سالانە یا ئاكنجییان ل دەڤەرێن گوندان د ماوەیێ سالێن ڤەكۆلینێ دا گەهشتییە (١,٩٩٪)ێ ، ئەڤ تێكرایە ل سەر ئاستێ گشت ئاكنجییێن پارێزگەهێ بلندبوویە تاگەهشتییە (٣,٨١٪)ێ ، و ل دەڤەرێن باژێران نێزیكی دوجاران پتر لێهاتییە و گەهشتییە (٦,٨١٪)ێ د ماوەیێ هەر سالەكێدا.

٢) ل ڤێرێ ئاراستەكێ ئاشكەرا بۆ زێدەبوونا ئاكنجییان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ و دەڤەرێن گوندان هەیە د ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٨٧-١٩٩٦)ێ ب رەنگەكی تێكراییێن گەشەكرنێ یێن زێدەبوونا ئاكنجییان گەهشتییە (٩,٢٨٪)ێ و (١٦,٦٨٪)ێ ل دووڤ ئێك. ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی دزڤریت بۆ وی بارودۆخێ ئێمناهیێ یێ ڤەگەریایە پارێزگەهێ پشتی سالا (١٩٩١)ێ و ڤەگەریانا خێزانێن مشەختی تركیا و ئیرانێ بووین بۆ دەڤەرێن گوندان، د هەمان دەمدا دەڤەرێن باژێران هندەك تێكراییێن كێمتر دوان سالاندا ب هەڤبەركرن دگەل سالێن بەری هینگێ یان پشتی هینگێ توومارکرینە، بەلكو كێمترین تێكرا ب درێژاهییا ماوەیێ ڤەكۆلینێ توومارکرییە.

**خشتەیێ (١٦)**
**پیڤەرێن زێدەبوونا ئاكنجییێن گوند و باژێرێن پارێزگەها دهۆكێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| | باژێر | | | گوند | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | زێدەبوونا ئاكنجییان | زێدەبوونا سالانە | رێژەیا گهۆرینێ | زێدەبوونا ئاكنجییان | زێدەبوونا سالانە | رێژەیا گهۆرینێ |
| ١٩٥٧-١٩٤٧ | ١٠٢٩٠ | ١٠٢٩ | ٧٤,٢٥ | ١٤٤٠١ | ١٤٤٠ | ١٤,٢٢ |
| ١٩٦٥-١٩٥٧ | ٢٧٦٠٢ | ٣٤٥٠ | ١٤٢,٣ | -٢١٥٨٦ | -٢٦٩٨ | -١٨,٧ |
| ١٩٧٧-١٩٦٥ | ٥٥٦٥٣ | ٤٦٣٨ | ١٠٧,٥ | ٤٩٠٨٨ | ٤٠٩٠ | ٥٢,٢ |
| ١٩٨٧-١٨٧٧ | ١١١٣٠٦ | ١١١٣٠ | ١٠٣,٦ | -٦٨٥٧٧ | -٦٨٥٧ | -٤٧,٩ |
| ١٩٩٦-١٩٨٧ | ١٣٤٣١٧ | ١٤٩٢٤ | ٦١,٤١ | ٢٢٤٥٠٣ | ٢٤٩٤٥ | ٣٠١ |
| ٢٠٠٦-١٩٩٦ | ٢٩٢٢٧٥ | ٢٩٢٢٧ | ٨٢,٨ | -٧٧١٦٤ | -٧٧١٦ | -٢٥,٨ |
| ٢٠٠٩-٢٠٠٦ | ١٨٦٨٨٢ | ٣٠١٤ | ٢٨,٩٦ | ١٢٣٥٩٧ | ١٩٩٣ | ٥٥,٦٩ |
| ٢٠٠٩-١٩٤٧ | ٨١٨٣٢٥ | ١٣١٩٩ | ٥٩٠٤ | ٢٤٤٢٦٢ | ٣٩٤٠ | ٢٤١ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەڵسەنگاندنێن ئاكنجییێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالێن دیاركری.

**خشتەیێ (١٧)**
**تێكرایێن زێدەبوونا سالانە(٪)ێ بۆ گشت ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ و دەڤەرێن گوند و باژێران (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| | گشت ئاكنجی | باژێر | گوند |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٧-١٩٥٧ | ١,٩٦ | ٥,٧١ | ١,٣٤ |
| ١٩٥٧-١٩٦٥ | ٠,٥٣ | ١٠ | -٢,٥٥ |
| ١٩٦٥-١٩٧٧ | ٤,٦١ | ٦,٢٧ | ٣,٥٦ |
| ١٩٧٧-١٩٨٧ | ١,٥٨ | ٧,٣٧ | -٦,٣١ |
| ١٩٨٧-١٩٩٦ | ٩,٢٨ | ٥,٤٦ | ١٦,٦٨ |
| ١٩٩٦-٢٠٠٦ | ٢,٩ | ٦,٢٢ | -٢,٩٤ |
| ٢٠٠٦-٢٠٠٩ | ١٠,٧٢ | ٨,٨٣ | ١٥,٨٨ |
| ١٩٤٧-٢٠٠٩ | ٣,٨١ | ٦,٨١ | ١,٩٩ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆك ێ ل سالێن دیاركری.

٣) ل ڤێرێ حالەتەكێ رەنگڤەدانێ یێ ئاراستەیێ تێكرایێن زێدەبوونێ هەیە دناڤبەرا دەڤەرێن گوند و باژێران د هەمی ماوەیاندا، تێكرایێن زێدەبوونێ ل دەڤەرێن باژێران بەرەڤ زێدەبوونێ چووینە و ل دەڤەرێن گوندان بەرەڤ كێمبوونێ چووینە و بەروڤاژی ڤێ چەندێ ژی دروستە و رویدایە، بۆ نموونە دەڤەرێن گوندان بلندترین تێكرایێ زێدەبوونێ ل سالێن (١٩٨٧-١٩٩٦)ێ ب رێژەیا (١٦,٦٨٪)ێ توومارکرییە ب بەرامبەری وێ دەڤەرێن باژێران كێمترین تێكرا ب رێژەیا(٥,٤٦٪)ێ توومارکرییە، بەرامبەری ڤێ چەندێ ژی دەڤەرێن باژێران ل سالێن (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ تێكرایەكێ بلند یێ زێدەبوونێ توومارکرییە ب رێژەیا (٧,٣٧٪)ێ ، ل حالەتێ دووركەفتنا هەردو ماوەیێن (١٩٥٧-١٩٦٥ێ) و (٢٠٠٦-٢٠٠٩)ێ[١٠]، و ل بەرامبەری وێ كێمترین بهایێ نەرێنی ل دەڤەرێن گوندان هاتییە توومارکرن. ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ فاكتەرێ

**وێنەیێ (٩)**
**گەشەكرنا تێكرایێن زێدەبوونا سالانە (٪)ێ بۆ گشت ئاكنجیێن پارێزگەهێ و گوند و باژێران (١٩٤٧-٢٠٠٩)**



مشەختبوونێ دزڤڕیت کو بوویە ئەگەرێ دووبارە دابەشکرن و رێکخستنا ئاکنجییان دناڤبەرا گوند وبازێران د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا.

٤) بهایێ تێکراییێن زێدەبوونێ ئاکنجییان ل دەڤەرێن گوندان دهێتە گهۆرین ب گهۆرینەکا ئاشکەرا ب هەڤبەرکرن دگەل دەڤەرێن بازێران، ب رەنگەکی کو بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ دگەهیتە (١١٥,٢٪)ێ بەرامبەر (٢٤,٦٪)ێ ل دەڤەرێن بازێری، ل سەر ئاستێ گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ ژی بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ دگەهیتە (٩٠,٨٪)ێ .

ئەو خالێن ئاماژە پێ هاتییەکرن دەربارەی جوداهییێ د ئاراستەییێن زێدەبوونا ئاکنجییان دناڤبەرا دەڤەرێن گوندان و بازێران ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، دیاربوویە کو ئەڤ چەندە پتر ل سەر ئاستێ قەزایان یا بەرچاڤ بوو، ب هاریکاریا داتایێن خشتەیێ (١٨) و نەخشەیێن (٣) و (٤) ئەم دشێین تێبینییا ڤان خالان بکەین:-

١. دەڤەرێن بازێران ب شێوەیەکێ گشتی بهایەکێ بلند بۆ پیڤەرێن زێدەبوونا ئاکنجییان د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا هەبوو، ب تایبەت ل دەڤ قەزایێن دهۆك و زاخۆ و ئامێدی ب هەڤبەرکرن دگەل دەڤەرێن گوندان کو بهایەکێ نەرێنی بۆ پیڤەرێن زێدەبوونێ هەبوو ژبلی قەزایا ئاکرێ چونکی سرۆشتێ وێ یێ گوندی و وان بارودۆخێن ئێمناهیێ یێن تا رادەیەکی باش دەڤەر ب خۆڤەگرتی.

٢. ل دووڤ پێڤەرێ رێژەیا گهۆرینا ئاکنجییان دیاربوویە کو ئاکنجیێن بازێرێن دهۆکێ نێزیکی (٣٤) جاران زێدەبووینە و یێن زاخۆ نێزیکی (٢٦) جاران و یێن ئامێدی و شێخان و ئاکرێ ژی (١٩) و (٦) و (١٤) جاران ل دووڤ ئێك زێدەبووینە. لێ ئاکنجیێن بازێرێ سێمێلێ بتنێ پێنج جاران د ماوەیێ بیست سالێن بۆریدا زێدەبووینە، ئەگەرێ ڤێ کێماتیێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو ئەڤ دەڤەرە خودان سرۆشتەکێ گوندی و کشتوکالینە.

٣. ل ژێر سیبەرا وان پێزانینێن د پاراگرافێ بەری نهادا هاتین، تێکراییێن زێدەبوونا ئاکنجییان د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا سالانە کێمترنەبوویە ژ (٥٪)ێ ل قەزاییێن پارێزگەهێ ژبلی هەردو قەزاییێن ئاکرێ و شێخان کو تێکرایێ زێدەبوونا سالانە ل وان قەزایان گەهشتییە (٤,٥٪)ێ و (٣,١٪)ێ ل دووڤ ئێکدا.

٤. بهایێن مەزن یێن پیڤەرێن زێدەبوونێ بەرەڤ کێمبوون و زێدەبوونێ ل سەر ئاستێ دەڤەرێن گوند و بازێران د هەردو ماوەیێن (١٩٥٧-١٩٦٥)ێ و (١٩٦٥-١٩٧٧)ێ ڤەدگەرێتە شاشیێن ل سالا (١٩٦٥)ێ هاتینە ئەنجامدان.

٥. ب شێوەیەکێ گشتی قەزایا ئامێدیێ د ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ د هاتە هژمارتن دەڤەرەکا کێم ئاکنجی ژبەرکو دەڤەرێن وێ یێن گوند و بازێران بهایەکێ نەرێنی یێ زێدەبوونێ هەبوو.

٦. دەڤەرێن گوندان ل قەزایێن دهۆك و زاخۆ د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ د هاتنە هژمارتن دەڤەرێن کو بهایەکێ نەرێنی بۆ زێدەبوونێ هەی، بەرامبەری وێ دەڤەرێن بازێران ل قەزایێن دهۆك و زاخۆ و ئاکرێ و شێخان بهایەکێ ئەرێنی بۆ زێدەبوونێ هەبوو کو تێکراییێن زێدەبوونا سالانە گەهشتبوونە (٨,٧٪)ێ و (٥,٧٪)ێ و (٥,٢٪)ێ و (٤,٤)ێ ل دووڤ ئێك.

٧. دەڤەرێن گوندان پیچەك ژ رەوشا خۆیا بەرێ زڤراندەڤە ب تایبەت ل هندەك قەزایێن وەکو دهۆك و زاخۆ و ئامێدیێ ل داوییا ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٨٧-١٩٩٦)ێ ئەو ژی پشتی دوبارە ئێمناهی و بەرقەرابوون زڤرییە ڤان گوندان، ب رەنگەکی کو رێژەیا گهۆرینێ ل ڤان هەرسێ قەزایان ژ (١٥٠٪)ێ کێمتر لێ ناهێت بەلکو ل قەزا ئامێدیێ ئەڤ رێژەیە دوجارکی لێ دهێت، هەردیسان تێکراییێن زێدەبوونا سالانەژی بلندترین بها توومارکر ب هەڤبەرکرن دگەل سالێن بەری هینگێ کو دگەهیتە (١٠٪)ێ و ل قەزا زاخۆ ژی بلند دبیت تا دگەهیتە (١٦٪)ێ .

**خشتەیێ (١٨)**

**رێژەیێن گهۆرین و تێكرایێن زێدەبوونا سالانە یا ئاكنجییان (٪)ێ ل قەزایێن پارێزگەها دهۆكێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | قەزا دهۆكێ | | | | قەز ئامێدیێ | | | | قەزا زاخۆ | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بازێر | | گوند | | بازێر | | گوند | | بازێر | | گوند | |
| | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ |
| ١٩٥٧-١٩٤٧ | ١٤ | ١,٣ | -٧,٣ | -٠,٥٧ | ٥٧,٥ | ٤,٦ | ٢٨ | ٢,٥ | ٢٨,٨ | ٢,٥ | ٢٦ | ٢,٣ |
| ١٩٦٥ - ١٩٥٧ | ١١٣ | ٩,٩ | -٤٠,٩ | -٦,٤ | -١٥,٧ | -٢,١ | -٣٨,٦ | -٥,٩ | ٦٧,٨ | ٦,٧ | ١٠١,٨ | -٨,٩ |
| ١٩٧٧- ١٩٦٥ | ١٤٨,٧ | ٧,٩ | ٢٠٩,٧ | ٩,٨ | ٢٩٠,٣ | ١٢ | ٨١,٢ | ٥ | ١٥٠ | ٧,٩ | ١٠١,٨ | ٦ |
| ١٩٨٧-١٩٧٧ | ١٣٠ | ٨,٧ | -٧١,٢ | -١١,٧ | -٢١,٧ | -٢,٤ | -٧٤ | -١٢,٦ | ٧٤,٩ | ٥,٧ | -٥٩ | -٨,٥ |
| ١٩٩٦-١٩٨٧ | ٤٨,١ | ٤,٤ | ١٥٦,٤ | ١١ | ٦٦ | ٥,٨ | ٢٩٣,٨ | ١٦,٤ | ٤٨,١ | ٤,٥ | ١٧٥,٢ | ١١,٩ |
| ٢٠٠٦-١٩٩٦ | ٥١,١ | ٤,٢ | -٥٦ | -٧,٩ | ١٦٩ | ١٠,٤ | -٣٧,٣ | -٤,٦ | ٦٤,٦ | ٥,١ | -٣٥,٤ | -٤,٣ |
| ٢٠٠٩-٢٠٠٦ | ١٣,٧ | ٤,٣٧ | -١٣,٨ | ٤,٨٢ - | ١١,٥٩ | ٣,٧٢ | ١٥,٨٣ - | ٥,٥٧ - | ٢٠,٤ | ٦,٣٧ | ٧,٢٢ - | ٢,٤٦ - |
| ٢٠٠٩-١٩٤٧ | ٣٤٣٥ | ٥,٩ | -٥٢,٦ | ١,٢ - | ١٩٢١ | ٤,٩ | -٢٢,٩ | -٠,٤ | ٢٦٧٤ | ٥,٥ | -١٨,٧ | -٠,٣٣ |
| سال | قەزا سێمیلێ | | | | قەز ئاكرێ[11] | | | | قەزا شێخان | | | |
| | بازێر | | گوند | | بازێر | | گوند | | بازێر | | گوند | |
| | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ | رێژەیا گهۆرینێ | تێكرایێ زێدەبوونێ |
| ١٩٥٧-١٩٤٧ | - | - | - | - | ٦,٥ | ٠,٦ | ٥٠,٦ | ٤,٢ | ٤٤,١ | ٣,٧ | ٨٠,٥ | ٦ |
| ١٩٦٥ -١٩٥٧ | - | - | - | - | ٤٩,٢ | ٥,١ | -٢٦ | -٣,٧ | ٢٥,٢ | ٢,٨ | -١٨,٤ | -٢,٥ |
| ١٩٧٧ - ١٩٦٥ | - | - | - | - | ١٦,٥ | ١,٣ | ١٠٧,٨ | ٦,٣ | ٤٢,٢-\[12] | -٤,٤ | -٣ | -٠,٢ |
| ١٩٨٧-١٩٧٧ | - | - | - | - | ٦٦ | ٥,٢ | ١٩,٥ | ١,٨ | ٥٤ | ٤,٤ | ٦٤,٥ | ٥,١ |
| ١٩٩٦-١٩٨٧ | ١١,٣ | ١,٢ | ٦٢,٤ | ٥,٥ | ٥٧,٣ | ٥,١ | ٥٨,٧ | ٥,٢ | ١٦,٩ | ١,٧ | -١٨,١ | -٢,٢ |
| ٢٠٠٦-١٩٩٦ | ٣٥٠,٤ | ١٦,٢ | -٨٦,٢ | -١٧,٩ | ٨١,٨ | ٦,١ | ٢٠,١ | ١,٨ | ٥٦٢[13] | ٢٠,٨ | -٦٧,٤ | -١٠,٦ |
| ٢٠٠٩-٢٠٠٦ | ٢٦,١ | ٨ | ٤١٨,٣ | ٧٣ | ٧٣ | ٢٠ | ١٧ | ٥,٤ | ٤٤,١ - | ١٧,٦ - | ٥٧٥,٨ | ٨٨,٩ |
| ٢٠٠٩-١٩٤٧ | ٥٣٢,٥ | ٨,٧ | ١٦,٤ | ٠,٦٩ | ١٤٢٢ | ٤,٥ | ٥١٧,٢ | ٢,٩٧ | ٥٩٤,٧ | ٣,١٧ | ١٢٢,٧ | ٢,٣٥ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەڵسەنگاندنێن ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالێن دیاركری.

نەخشەیێ (٣)

تێكرایێن زێدەبوونا سالانە و رێژەیێن زێدەبوونا ئاكنجییان ل باژێرێن قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)

تێكریێن زێدەبوونا سالانە




رێژەیێن گهۆرینێ



## نەخشەیێ (٤)

## تێکرایێن زێدەبوونا سالانە و رێژەیێن گهۆرینا ئاکنجیبیان ل گوندێن قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٦)

تێکرایێن زێدەبوونا سالانە




رێژەیێن گهۆرینێ



٨. بلندبوون و کارتێکرنا زێدەبوونا ئاکنجییێن باژێران ل گشت قەزایێن پارێزگەهێ دماوەیێ دناڤبەرا (١٩٩٦-٢٠٠٦)ێ بۆ ئەگەرێن کارگێری دزڤریت، ب رەنگەکی کو گەلەك سەنتەرێن گوند و کۆمەلگەهێن ئاکنجییان هاتینە گهۆرین بۆ سەنتەرێن باژێران یانژی باژێرڤانی لێ هاتینە ڤەکرن لەورا ئاکنجییێن وان دگەل یێن باژێران هاتینە هژمارتن.

٩. بهایێ پیڤەرێن زێدەبوونێ ل دەڤەرێن گوند و باژێران ل سەر ئاستێ قەزا و پارێزگەهێ دهێتە گهۆرین ب گهۆرینەکا بەرچاڤ د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا (تەماشەی خشتەیێ (١٩) بکە)، ب رەنگەکی کو بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ ل دەڤەرێن گوندان بلند دبیت (هەتا ب بهایێن نەرێنی ژی) ب هەڤبەرکرن دگەل دەڤەرێن باژێران، ئەڤ چەندە ژی هێمایێ دکەتە سەر رادەیێ جوداهیێ د بهایێن پیڤەرێن زێدەبوونێ دا ل دەڤەرێن گوندان ب هەڤبەرکرن دگەل دەڤەرێن باژێران.

**خشتەیێ (١٩)**

**بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ بۆ رێژەیێن گهۆرینا ئاکنجییان و تێکرایێ زێدەبوونا سالانە ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ و قەزایێن وێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| | دهۆك | | ئامێدی | | زاخۆ | | شێخان | | سێمێل | | ئاکرێ | | پارێزگەهـ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | باژێر | گوند | باژێر | گوند | باژێر | گوند | باژێر | گوند | باژێر | گوند | باژێر | گوند | باژێر | گوند |
| رێژەیا گهۆرینا ئاکنجییان | ٢٢٠ | ٥٤٥ | ١٩٣ | ٣٥٧ | ٢١٤ | ٢٠٢ | ١١٧ | ٥٤ | ٨٣ | -٢٤٧ | ١٨٤ | ١٦٢ | ٢٣٠ | ٢١٦ |
| تێکرایێ زێدەبوونا سالانە | ٥٠ | -٨٩٧ | ١١٦ | ٩,٢ | ٣١,٥ | -٣,٢ | ١٦٢ | -٧٨٥ | ١٠٠ | -٢٠٢ | ٥٥ | ١٢٤ | ٣٢ | ٤٦٨ |

ژێدەر: داتایێن خشتەیێن (١٦) و (١٧) و (١٨).

## پەراوێز

١. فتحي محمد ابو عيانة، جغرافية السكان، دار النهضة العبية، بيروت، ١٩٨٦، ص٢٤٣.

٢. عبد علي الخفاف، محمد احمد عقلة المؤمني، سكان العالم الاسلامي دراسة عن الواقع ومؤشرات المستقبل، دار الكندي للنشر والتوزيع، ط١، ١٩٩٤، ص ص ٦٠-٦١.

٣. ئاکنجییێن قەزا بەردەرەش بخوڤە دگریت، سالا ٢٠٠٩ (قەزا بەردەرەش ژناڤدا نەهاتییەدەر چونکی ل سالا ٢٠٠٦ ێ بوویە قەزا.

٤. بهایێ هاوکولکێ جوداهیێ ب هاریکاریا پروگرامێ (Excel) هاتییە دەرخستن، پتریا جاران ئەڤ هاوکێشە دهێتە ب کارئینان

$$S = \sqrt{\frac{\sum\left(x_i - \bar{x}\right)^2}{n-1}}$$

ب رەنگەکی کو : $(x_i - \bar{x})$ = سەرجەمێ بهایێ گشتی یێ جوداهییا دناڤبەرا بها و ناڤەندێ وێ یێ بیرکاری

n = هژمارا بهایی

s = لادانا پیڤەری

بەرێ خو بدە :

J.Chapman, McGrew, Jr .Charles & B.Monroe , An Introduction to statistical problem sloving in geography , Mc Graw- Hill Higher Education ,Second Edition , United State of America , 2000 .pp.41-42 .

ب هاریکاریا بهایێ لادانا پیڤەری هاوکۆلکێ جوداهیێ (Coefficient of Variation) هاتییە دەرخستن کو پێکدهێت ژ رێژەیا دناڤبەرا لادانا پیڤەری و ناڤنجیێ بیرکاری پشتی کو هاتییە ڤەگوهاستن بۆ رێژەیا سەدی، دیسان تەماشەی ڤان ژێدەران بکە:

صلاح الدين محمود علام، تحليل بيانات البحوث النفسية والتربوية والاجتماعية، دار الفكر العربي، القاهرة، ٢٠٠٣، ص ١٧٨.

Peter Davis, Op.Cit.p.١٧.

٥. طه حمادي الحديثي، جغرافية السكان، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٨، ص ص٢٨٩-٢٩٤.

٦. محمد فتحي أبو عيانة، مدخل الى التحليل الاحصائي في الجغرافيا البشرية، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٦، ص ص٢٣٢-٢٣٣ .

٧. جمهورية مصر العربية، المركز الديموغرافي بالقاهرة، طرق الاسقاطات لسكان الحضر والريف، اعداد قسم الشؤون الاقتصادية والاجتماعية – بالامم المتحدة – نيويورك، الدراسات السكانية رقم (٥٥)، كتيب رقم (٨) من سلسلة كتيبات عن طرق تقدير السكان، ترجمة: أحمد مختار الجمال، محسن مصطفى حسين، القاهرة، ١٩٩٤ ، ص٧٤. ٨. تێکرایێ زێدەبوونێ یێ داویێ ل سالێن (١٩٨٧-٢٠٠٩) دیاردکەت.

٩. قەزا بەردەرەش ژی دگەل هاتییە هژمارتن.

١٠. دەڤەرێن باژێران د ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٥٧-١٩٦٥)ێ بلندترین تێکرایێ زێدەبوونا ئاکنجییان توماکربوو کو دگەهشتە (١٠٪)ێ ب هەڤبەرکرن دگەل سالێن دی یێن دخشتەیێ (١٧) دا هاتینە دیارکرن، لێ بلندبوونەکا زێدە بۆ ئاکنجیێن باژێران بەرامبەر کێمبوونا فی بهایی بۆ رێژەیەکا نەرێنی ل دەڤەرێن گوندان ئەگەرێ وێ بۆ وان شاشییان دزڤریت یێن د سەرژمێریا سالا (١٩٦٥)ێ دا هاتینەکرن.

١١. قەزا بەردەرەش ژی ل سالا (٢٠٠٩)ێ دگەل هاتییە هژمارتن چونکی ژنوی ل سالا (٢٠٠٦)ێ ببوو قەزا.

١٢. ئێك ژ ئەگەرێن کێمبوونا رێژەیێن گهورین و تێکرایێن زێدەبوونێ ل قەزا شێخان د سەرژمێریا سالا (١٩٧٧)ێ بۆ هندێ دزڤریت کو وی دەمی ناحیا ئەلقۆش دگەل نەهاتبوو هژمارتن.

١٣. ژ ئەگەرێ مشەختبوونا ئاکنجیێن گوندان و باژێران و بەرفرەهبوونا سەنتەرێ قەزا شێخان (باژێرکێ ئێسفنێ).

# (٣)
# دابەشبوونا جوگرافی یا ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ

## ئێك : دابەشبوونا ژمارەیی و رێژەیی یا ئاكنجییان

سەرەرای هەبوونا كۆمەكا فاكتەرێن سروشتی و ئابووری و مێژوویی و شارستانی د دەستنیشانكرنا شێوازێ دابەشكرنا جوگرافی یا ئاكنجییان ل هەر هەرێمەكێ ژ هەرێمێن جیهانێ[1]، لێ وێنەیێ دراماتیكی بۆ شێوازێ زێدەبوون و دابەشبوونا ئاكنجییان دناڤبەرا گوند و باژێرێن پارێزگەها دهۆكێ ب شێوازەكییە كو ب دەگمەن ئەڤ شێواز و ستایلە ل دەڤەرەكا دی یا جیهانێ هەبیت، ئەڤ چەندەژی ژ ڤەرێژا كۆمەكا فاكتەرێن سیاسی و ئێمناهی و كارگێری یێن كوور پەیدابوویە و بووینە سیمایێن جوداهیێ دناڤبەرا كۆمەڵگەهێن گوند و باژێران، رەنگە بەرچاڤترین سیمایێن ڤێ جوداهیێ ببنە ئەگەرێ دیاركرنا ئاستێن چڕی و پێكهاتنا پیشەیی[2].

دیاركرنا سروشتێ دابەشبوونا جهی بۆ ئاكنجییان دهێتە هژمارتن ئێك ژ بابەتێن گرنگ یێ كو جوگرافیناس پیتەكێ مەزن ددەنێ، چونكی ب هاریكاریا وێ دشێن ڤەكۆلینان ل سەر دیاردا بەربەلاڤبوونا مرۆڤان ل سەر روویێ ئەردی و پلا پشت بەستن و پێكڤە گرێدان و كارتێكرنا دناڤبەرا واندا بكەن و ل داویێ ژی وێنەیەكێ كارلێكا دناڤبەرا مرۆڤ و ژینگەهێ دا بكێشن[3]، زێدەباری فاكتەرێن گوهۆرین و جوداهیا دابەشبوونا وان ژ جهەكی بۆ ئێكی دی و ژ دەمەكی بۆ ئێكی دی دناڤ ئاستێن جهی یێن جوداجودا هەروەك هەرێمێن كارگێری و سروشتی و ئابووری و جڤاكی یانژی هەرێمێن پلاندانانێ یانژی دناڤبەرا گوند و باژێران[4].

سەرەرای هەبوونا جوداهیا تایبەتمەندیێن ئاكنجییان ل جهەكی، رۆلێ نەخشەیێ دابەشبوونا ئاكنجییان هەر یێ دیار و بەرچاڤە، ژبەر ڤێ چەندێ ژی هندەك ڤەكۆلەر هوسا د بینن كو بابەتێ سەرەكی یێ جوگرافییا ئاكنجییان تەوەرێ وی یێ سەرەكی دەربارەی دابەشبوونا ئاكنجییانە ل سەر نەخشەیان ل دووڤ تایبەتمەندیێن وان یێن جوداجودا زێدەباری شرۆڤەكرنا پەیوەندییان دناڤبەرا وێنەیێ دابەشبوون و فاكتەرێن كارتێكرنێ ل ڤێ چەندێ دكەن[5].

دەستپێكرنا بابەتێ دابەشبوونا جوگرافی یا ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ب قۆناغێن ڤەكۆلینێ یێن جوداجودا دەستپێكرییە زێدەباری رێك و شێوازێن شرۆڤەكرنێ یێن جوداجودا، هەر ئێك ژوان رەهەندەكی ژ رەهەندێن وێنەیێ گشتی یێ دابەشكرنا ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ دیاردكەت، و ب سەرجەمێ وان نیشانێن سەرەكی یێن كەسایەتیا مرۆڤی ل هەرێمێ دهێنە دەستنیشانكرن، و بۆ دیاركرنا ڤێ چەندێ ل دووڤ ڤێ رێزبەندیێ ئەم چووینە دناڤ بابەتی دا.

### ١. دابەشبوونا ژمارەیی و رێژەیی یا ئاكنجییان

سەركەفتیترین رێكێن دیاركرنا پێشكەفتنا دابەشبوونا ژمارەیی بۆ ئاكنجییان پشت بەستنێ دكەتە سەر نەخشەیێن خالبەندیا ئاكنجییان

کو دەڤەرێن ئاڤاکری (Oekoumene) و نەئاڤاکری (Non Oekoumene) و شاشییان یان ڕێکخستنان دابەشبوونێ دیاردکەت[١].

زێدەبوونەکا مەزن د هژمارا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلین تێدا هاتییەکرن زێدەباری گوهۆرینێن ڕیشەیی ل سەر نیشانێن وێنەیێ دابەشکرنا جوگرافی یا ئاکنجییان ڤێجا چ ل سەر ئاستێ یەکەیێن کارگێری یان هەرێمێن سرۆشتی بیت.

دیارترین نیشانێن وێنەیێ دابەشبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەهێ د ماوەیێ سییێکا ئێکێ ژ ماوەیێ ڤەکۆلینێ کو دبیتە ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-١٩٦٥)ێ دابەشبوونا هەڤسەنگا ئاکنجییانە ل هەمی لایێن پارێزگەهێ بێ جوداهی، ئەڤە ژی ڕەنگڤەدانەکا سرۆشتی یا شێوازێ دابەشبوونا یەکسان یا داهاتێن سرۆشتییە دناڤ پارچەیێن پارێزگەهێ دا ب تایبەت ژی داهاتێن ئاڤێ، هەردیسان فاکتەرێن سرۆشتی مینا بەرزی و نزمی و جۆرێ ئاخێ و کەشوهەوا.... هتد ڕۆلەکێ گرنگ د شێوازێ دابەشبوونا ئاکنجییاندا هەیە، گرنگییا ڤی فاکتەری بەری فاکتەرێن ئابووری و جڤاکی و سیاسی پترە کو ماوەیێن ل دووڤدا ڤان فاکتەران ژی گرنگییەکا مەزن هەبوویە د دابەشبوونا ئاکنجیاندا، ئەڤ چەندەژی دبیتە ئەگەرێ زێدەبوونا هژمارا ئاکنجییان ل دەڤەرەکێ و کێمبوونا وان ل دەڤەرەکا دی. ئەنجامدانا هەڤبەرکرنەکا سادە دناڤبەرا نەخشەیێن دابەشبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەهێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧ و ١٩٥٧)ێ (تەماشەی نەخشەیێن (٥) و (٦) بکە) ئەم نەشێین چ جوداهیێن مەزن د وێنەیێ دابەشبوونا جوگرافی یا ئاکنجییاندا دناڤبەرا واندا دیاربکەین ژبلی زێدەبوونا هژمارا خالان کو هەر خالەك هژمارەکا ئاکنجییان دیاردکەت.

و دەمێ ئەم تەماشەی نەخشەیێ دابەشکرنا ئاکنجییان یێ سالا (١٩٦٥)ێ دکەین (تەماشەی نەخشەیێ (٧) بکە) دێ بینین هەڤدژییەکا مەزن د قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ دا هاتییەکرن ژبەرکو هژمارا خالان بەرەڤ کێمبوونێ چوویە کو هەر ئێك ژ ڤان خالان هژمارەکا ئاکنجییان دەستنیشان دکەت، دڤێ سالێ دا قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ ب ڕێژەیا (٢١٪)ێ کێمبوویە ژ قەبارەیێ وان ل سالا (١٩٥٧)ێ، هەمی قەزایێن پارێزگەهێ کێمبوونەك د هژمارا ئاکنجیێن وێدا یا دیاربوو هەتا کو ل هندەك یەکەیێن کارگێری د نیمچە ڤالابوون ژ ئاکنجییان وەکی ناحیا ڕزگاری یا سەر ب قەزا زاخۆ و ناحییێن مانگێشك و زاویتە یێن سەر قەزا دهۆك و ناحیا سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ و ناحیا سەرسنکێ یێن سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە و ناحیا دینارتە یا سەر ب قەزا ئاکرێ ڤە. بەروڤاژی ل هندەك یەکەیێن کارگێری زێدەبوونەکا بەرچاڤ د هژمارا ئاکنجیێن وێدا هەبوو وەك ناحیا سەنتەرێ قەزا دهۆکێ و زاخۆ، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ وان شاشییان دزڤڕیت یێن د سەرژمێرییا سالا (١٩٦٥)ێ دا هاتینەکرن وەك ڕەنگڤەدانەك بۆ بارێ ئێمناهیێ ل گشت دەڤەرێن پارێزگەهێ بەری ئەنجامدانا سەرژمێرییان د وێ سالێ دا.

و سالا (١٩٧٧)ێ (تەماشەی نەخشەیێ (٨) بکە)، هژمارا ئاکنجیێن پارێزگەهێ نێزیکی دوجاران پتر لێهاتییە، وێنەیێ دابەشبوونا ئاکنجییان پتر یێ هەڤسەنگ بوو ژ سالا بەری هینگێ. لەورا نیشانێن چڕبوونێ پتر لێهاتییە ل هندەك یەکەیێن کارگێری ئەو ژی پشتی کو هژمارا کۆمەڵگەهێن ئاکنجیبوونێ دناڤ یەکەیێن کارگێری دا بەرەڤ زێدەبوونێ چووین، و پاشی قەبارەیێ هندەك باژێران ب شێوەیەکێ نەسرۆشتی مەزن بوویە وەك باژێرێن دهۆك و زاخۆ و ئامێدیێ، ئەو ژی ژ ئەنجامێ مشەختبوونا خەلکی ژ گوندان بۆ باژێران ب تایبەت پشتی ڕویدانێن سالا (١٩٧٥)ێ کو بووینە ئەگەر گەلەك ژ ئاکنجیێن گوندێن دەڤەرێن چیایی یێن سەر ب قەزایێن ئامێدی و زاخۆ و ئاکرێ ڤە ل هندەك کۆمەڵگەهێن ئاکنجیبوونێ دناڤ پارچەیێن باشوور و باشوورێ ڕۆژئاڤایێ پارێزگەهێ کۆم ببن.

نەخشەیێ (٥)
دابەشبوونا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٤٧




نەخشەیێ (٦)
دابەشبوونا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٥٧



نەخشەیێ (٧)
دابەشبوونا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٦٥




نەخشەیێ (٨)
دابەشبوونا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٧٧



پشتی بۆرینا دەهـ سالان دیاردەیێن زێدەبوون و چڕبوونا هژمارا ئاکنجییان سال بۆ سالی بەرەڤ زێدەبوونێ د چوو هەتا وێنەیێ دابەشبوونا ئاکنجییان ل سالا (١٩٨٧)ێ ب تەمامی هاتییە گوهۆرین ژ وی وێنەیی بەری دەهـ سالان هەی، ب ڕەنگەکی کو فاکتەرێن سرۆشتی ب شێوەیەکێ بەرچاڤ کارتێکرنا خۆ ل سەر ڕەهەندێن وێنەیێ دابەشبوونا ئاکنجییان ژ دەستدا، ل شوینا وان فاکتەرێن مرۆڤایەتی ب تایبەت یێن سیاسی ب شێوەیەکێ بهێز ڕۆل د دەستنیشانکرنا ڕەهەندێن ڤێ دابەشبوونێ دا وەك کریارێن تەعریب و مشەخبوونا ب نەچاری یا ئاکنجییێن دەڤەرێن چیایی بەرەڤ دەڤەرێن باشوور و باشوورێ ڕۆژئاڤایێ پارێزگەهێ هەبوو. دگەل ڤێ چەندێ ژی وەرارکرنەکا مەزن د گشت بوارێن ژیانا ئابووری و جڤاکی یا ئاکنجییێن باژێراندا پەیدابوو، لەورا زێدەبوونەکا ب لەز د هژمارا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ و گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێن کوردستانێ دا پەیدابوو.

دەمێ ئەم تەماشەی نەخشەیێ دابەشکرنا ئاکنجییان ل سالا (١٩٨٧)ێ بکەین (تەماشەی نەخشەیێ (٩) بکە)، دێ بۆ بینەری دیاربیت کو جۆرەکێ هەڤسەنگیێ د دابەشبوونا ئاکنجییێن هندەك یەکەیێن کارگێری دا هەیە وەك ناحییێن قەزا ئاکرێ و ئامێدی و شێخان، لێ ئەڤ ڕاستییە تا ڕادەیەکی یا بەروڤاژییە چونکی ئەو گوهۆرینێن ل سەر ستراکچەرێ کارگێری یێ پارێزگەهێ هاتینەکرن کارتێکرن ل ڤێ چەندێ کرییە، قەزا ئاکرێ هاتییە کێمکرن و یا ژێ مای سەنتەرێ ناحییێ و قەزا بەردەرەش بوون، ناحیا ئەتریش ژی ب قەزا شێخانڤە هاتە گرێدان و ناحیا کانێ ماسێ ژی دگەل سەنتەرێ ناحیا قەزا ئامێدیێ، ئەڤە ژ لایەکی و ژلایەکێ دیڤە قەبارەیێ ئاکنجییێن قەزا ئامێدیێ کێمبوویە بۆ پێکئینانا سێیکا ئاکنجییێن قەزایێ ل سالا (١٩٧٧)ێ کو نیڤا وان ل باژێرێن ئامێدی و سەرسنك و دێرەلوکێ د ئاکنجی بوون، هەردیسان چارێکا ئاکنجییێن قەزا ئاکرێ ل باژێرێن ئاکرێ و بەردەرەش د ئاکنجی بوون.

ب شێوەیەکێ گشتی زێدەبوونا هژمارا ئاکنجییێن ل هندەك یەکەیێن دەستنیشانکری ژ باژێران دیاردەیکا بەرچاڤ بوو لەورا بوویە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا ئاکنجییان ل وان یەکەیێن کارگێری، ب ڕەنگەکی کو هەردو باژێرێن زاخۆ و دهۆك ڕێژەیا (٤٥,٣٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل سالا (١٩٨٧)ێ ب دەستڤە ئینابوو.

ل سالا (١٩٩٦)ێ و ژ ئەنجامێ وان کاودانێن جڤاکی و ئابووری و سیاسی یێن سەر ب دەڤەرێ هاتین، نەخشەیێ دابەشکرنا ئاکنجییان (تەماشەی نەخشەیێ (١٠) بکە) دو ڕاستیان بۆ مە ڕۆهن دکەت، یا ئێکێ زێدەبوونا هژمارا خالان کو هەر ئێك هژمارەکا ئاکنجییان خویا دکەت، ب ڕەنگەکی کو هژمارا ئاکنجییێن پارێزگەهێ نێزیکی سێیکا قەبارەیێ وێ ل سالا (١٩٨٧)ێ ب ڕێژەیا (٦٨,٨٪)ێ زێدەبووینە، ڕاستییا دووێ ژی هەبوونا جۆرەکێ هەڤسەنگیێ یە د دابەشبوونا ئاکنجییاندا ل هندەك یەکەیێن کارگێری، ئەو ژی ژ ئەگەرێ زڤرینا ئێمناهی و بەرقەراربوونێ بۆ گشت دەڤەرێن پارێزگەهێ پشتی سەرهلدانا ئادارا (١٩٩١)ێ ب ڕێژەیا (٦٨,٨٪)ێ ، ژبلی ڤێ چەندێ ژی زێدەبوونەکا نەسرۆشتی ل هندەك یەکەیێن کارگێری دیاربوویە وەك سەنتەرێ قەزایێن دهۆك و زاخۆ.

هەردو نەخشەیێن دابەشکرنا ئاکنجییان ل سالێن (١٩٩٦ و ٢٠٠٦)ێ (تەماشەی نەخشەیێ (١٠) و (١١) بکە) چ جوداهییێن مەزن دناڤبەرا واندا نینن بتنێ دوبارە هەمان وان دیاردەیێن د بیست سالێن بۆریدا هەین دیاردکەن، ب شێوەیەکێ گشتی دابەشبوونا ئاکنجییان زێدەبوونەك ل یەکەیێن کارگێری ل پارچەیێن باشوور و باشوورێ ڕۆژئاڤایێ پارێزگەهێ بخۆڤە دیتییە، لێ یەکەیێن کارگێری ل پارچەیێن باکوور و باکوورێ ڕۆژهەلاتی چ زێدەبوونێن مەزن بخۆڤە نەدیتینە.

نەخشەیێ (٩)
دابەشبوونا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٨٧




نەخشەیێ (١٠)
دابەشبوونا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٩٦



نەخشەیێ (١١)

دابەشبوونا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٦




نەخشەیێ (١٢)

دابەشبوونا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٩



لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ وێنەیێ دابەشبوونا ئاکنجییان بۆ مە دیار دکەت هژمارا ئاکنجییێن پارێزگەهێ زێدەبوونەك بخۆڤە دیتییە ب رەنگەکی کو هژمارا ئاکنجییان نێزیکی (١,٣) جاران پتر لێهاتینە ژ هژمارا وان ل سالا (٢٠٠٦)ێ و رێژەیا گوهۆرینێ ژی (٣٥,٨) بوو، ئانکو د ماوەیێ سێ سالاندا پێشکەفتنەکا مەزن پەیدابوویە و ئەڤ چەندەژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو پێشکەفتن د گشت بوارێن ژیانێ دا پەیدابوویە ب تایبەت لایەنێن ئابووری و جڤاکی و ئێمناهیێ و ئەڤ چەندە بوویە ئەگەر هژمارا ئاکنجییان ل هندەك یەکەیێن کارگێری گەلەك زێدە ببیت ئەو ژی زێەر بچویکاتییا قەبارەیێ وان یەکەییان وەك سەنتەرێ ناحییێن دهۆك و زاخۆ و ئاکرێ، لەورا ل سێ جهان هژمارا ئاکنجییان گەلەك لێ زێدەبوویە کو مەزنترین و گرنگترین جهـ ژی دەوروبەرێن باژێرێ دهۆکێ و پاشی ل باژێرێ زاخۆ و یا سیێ ژی سەنتەرێ قەزا ئاکرێ یە.

ژڤێ چەندێ بۆمە دیار دبیت کو شێوازێ دابەشبوونا جوگرافی یا ئاکنجییێن پارێزگەها دهۆکێ هندەك تایبەتمەندیێن جودا د ماوەیێ شێست سالێن بۆریدا ب خۆڤە گرتینە و ئەم دشێین ڤان تایبەتمەندیان د چەند خالەکاندا کورت بکەین ئەو ژی ئەڤەنە:

١. ئەم دشێین شێوازێ دابەشکرنێ ب شێوازەکێ دینامیکی سالۆخەت بکەین کو ئەڤ شێوازە ب گوهۆرینەکا بەردەوام یێ بەرنیاسە ب رەنگەکی شێوازەکێ هەڤسەنگ ل دەستپێکا ماوەیێ ڤەکۆلینێ هەیە ئەو ژی ل ژێر هندەك فاکتەرێن سرۆشتی و پەیوەندیێن هەڤسەنگ دناڤبەرا گوند و باژێران، و ئەڤ شێوازە دهێتە گوهۆرین بۆ شێوازەکێ چڕ و قەرەبالغ ل داوییا ماوەیێ ڤەکۆلینێ و ل ڤێرێ دکەڤیتە ژێر کارتێکرنا فاکتەرێن مرۆڤایەتی کو بووینە ئەگەرێ لادانا پەیوەندییا دناڤبەرا گوند وباژێران دا.

٢. ل دەستپێك و داوییا ماوەیێ ڤەکۆلینێ، شێوازێ دابەشبوونێ جۆرەکێ جێگیربوونێ بخۆڤە دیتییە ئەو ژی ژ ئەگەرێ جێگیربوونا سرۆشتێ وان فاکتەران یێن کونترۆل ل سەر شێوازێ دابەشبوونا جوگرافی یا ئاکنجییان دڤی ماوەیی دا یا کری ، لێ ل ناڤەراستا ماوەیێ ڤەکۆلینێ شێوازێ دابەشبوونێ شێوازەکێ دینامیکی بخۆڤە دیتییە.

٣. سیفەتا دیار بۆ وەرارکرنا شێوازێ دابەشبوونا هژمارەیی یا ئاکنجییێن پارێزگەهێ بۆ حەزکرنا ئاکنجییان دزڤڕیت کو حەزدکەن دناڤ هندەك دەڤەرێن قەرەبالغ ل هندەك یەکەیێن کارگێری یێن تایبەت ئاکنجی بن لەورا سیفەتا چڕبوونێ ژ دیارترین سیفەتێن وەرارکرنا شێوازێ دابەشبوونێ نە.

دابەشبوونا ژمارەیی یا ئاکنجییان چ پیڤەرێن برەیی دەربارەی جوداهییا دابەشبوونا جوگرافی یا ئاکنجییان و گوهۆرینا وان ژ وەختەکی بۆ ئێکی دی نادەتە مە، ژبەر هندێ دڤێت ئەم پەنایێ بەینە بەر ب کارئینانا پیڤەرێ رێژەیی یێ ئاکنجییان ئەو ژی ل دووڤ یەکەیێن هەرێمان د هەر سەرژمێرییەکێ دا و ب هاریکارییا ب کارئینانا نەخشەیێن کوروبلیت (Choropleth) کو د هێنە هژمارتن باشترین جۆرێن نەخشەییان بۆ دیارکرنا پیڤەرێن رێژەیی یێن دیاردەیان[٧].

ئەگەر تەماشەی داتایێن خشتەیێ (٢٠) و نەخشەیێ (١٣) بکەین دێ بۆ مە دیار بیت کو جۆرەکێ هەڤسەنگیێ د دابەشبوونا ئاکنجییێن قەزایێن پارێزگەهێ دا دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧ و ١٩٥٧)ێ هەبوویە، لێ قەزا ئامێدیێ ل رێزا ئێکێ دهێت کو ل سالا (١٩٤٧)ێ نێزیکی چارێکا ئاکنجییێن پارێزگەهێ پێکدئینا، ل دووڤدا قەزایێن دهۆك و زاخۆ ب رێژەیێن (٢٢,١٪)ێ و (٢٠,٥٪)ێ ل دووڤ ئێك د هاتن و پاشی قەزا ئاکرێ و ناحییێن قەزا شێخان ل رێزێن چوار و پێنجێ د هاتن. لێ ل سالا (١٩٥٧)ێ گوهۆرینەك ب سەر ڤان رێژەییاندا هات، ژبلی قەزا ئامێدیێ کو شیا هەر ل رێزا ئێکێ بمینیت و رێژەیا ئاکنجییێ وێ هەر وەکی خو مابوو لێ گوهۆرینەکا بچویك د رێژەیا ئاکنجییێن قەزا ئاکرێ دا بەرەڤ زێدەبوونێ پەیدابوو،

لێ مەزنترین گوهۆرین د ناڤبەرا قەزایێن شێخان و دهۆك دا پەیدابوو، ب رەنگەكی كو كێمبوونەك د هژمارا ئاكنجیێن قەزا دهۆكێ دا پەیدابوو ب رێژەیا (٥,٦٪)ێ ، ل بەرامبەر قەزا شێخان ئەڤ گوهۆرینە بەرەڤ زێدەبوونێ چوو ب رێژەیا (٤,٦٪)ێ و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت كو ل سالا (١٩٥٧)ێ ناحیا ئەتریش ژ قەزا دهۆك هاتە ڤەكرن و هاتە ڤەگوهاستن بۆ سەر قەزا شێخان.

لێ ل سالا (١٩٦٥)ێ ژ ئەگەرێ سەرهلدانا شورشا ئیلولا مەزن و وان شاشیێن د سەرژمێریا ڤێ سالێدا پەیدابووین، كارتێكرن كرە سەر ئاستێن رێژەیێن ئاكنجیێن قەزایێن چیایی (قەزا زاخۆ و ئامێدی) و د ئەنجامدا رێژەیا ئاكنجیێن وێ بەرەڤ كێمبوونێ چوو، لێ بەرامبەری وێ رێژەیا ئاكنجیان ل قەزایێن دی بلندبوو ب تایبەت ژی قەزا دهۆكێ كو ئاكنجیێن وێ ب رێژەیا (٣,٧٪)ێ پتر لێهاتن ب هەڤبەركرن دگەل سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ئەو ژی پشتی كو دوبارە ناحیا ئەتریش ل سالا (١٩٦٥)ێ بۆ هاتییە ڤەگەراندن. و ل سالا (١٩٧٧)ێ ژبلی قەزا دهۆك ئەوا زێدەبوونەكا مەزن د هژمارا ئاكنجیێن وێدا پەیدابووی ب رێژەیا (٢٨,٥٪)ێ و دیسان قەزایێن ئامێدی و زاخۆ و ئاكرێ ژی نێزیكی هەمان رێژە لێ پەیدابوو، لێ ناحییێن قەزا شێخان هژمارا ئاكنجیێن وێ بەرەڤ كێمبوونی چوو ئەڤە و سەرەرای دوبارە ڤەگوهاستنا ناحیا ئەتریش بۆ سەر ڤێ قەزایێ و د ئەنجامدا هژمارا ئاكنجیێن وێ بۆ نیڤێ كیمبوو ب هەڤبەكرن دگەل سەرژمێریا سالا (١٩٦٥)ێ. زێدەبوونا مەزن د رێژەیا ئاكنجیێن قەزا دهۆكێ و كێمبوونا ڤێ رێژێ دئاكنجیێن قەزا شێخاندا، ئەگەرێ وێ بۆ زێدەبوونا هژمارا ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (١٩٧٧)ێ دزڤڕیت ئەو ژی ژبەر مشەختبوونا ئاكنجیێن گوندان بۆ باژێرێ دهۆكێ.

مەزنترین جوداهی درێژەیێن دابەشبوونا ئاكنجیێن قەزایێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (١٩٨٧)ێ پەیدابوو، ب رەنگەكی كو هەمی قەزایێن پارێزگەهێ زێدەبوونەك د رێژەیا ئاكنجیێن واندا پەیدابوو بتنێ قەزایێن زاخۆ و ئامیدیێ نەبیت ب رەنگەكی كو قەزا ئامێدیێ رێژەیەكا مەزن یا ئاكنجیێن خو ژ دەستدا كو ل وێ سالێ بتنێ نێزیكی (٦,٣٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاكنجیێن پارێزگەهێ پێكدئینا، ئەڤ دیاردە ژی ب درێژاهییا ماوەیێ ڤەكۆلینێ ل چ جهێن دی دوبارە نەبوویە، بێگومان ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ كاودانێن ئێمناهیێ ل ڤێ دەڤەرێ سالێن هەشتییان ژ چەرخێ بیستێ دزڤڕن و د ئەنجامدا خەلكێ وێ ژ دەڤەرێن

**خشتەیێ (٢٠)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن پارێزگەهێ دهۆكێ ل دووڤ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| قەزا | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٩٦ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ٢٢,١ * | ١٦,٥ | ٢٠,٢ * | ٢٨,٥ | ٣٠ | ٣٠,٣ | ٢٩,٣ | ٢٦,٦٥ |
| ئامێدی | ٢٤,٦ | ٢٤,٦ | ١٩,٣ | ٢٠,٥ | ٦,٣ | ١١,٤ | ٩,٩ | ٨,٠٨ |
| زاخۆ | ٢٠,٥ | ١٩,٩ | ١٧,٩ | ٢٠,٧ | ١٩ | ٢٠,٣ | ٢٠,٥ | ١٩,٣٥ |
| سێمێل | - | - | - | - | ١١,٢ | ١٠,٢ | ١٠,٦ | ١٣,٠٦ |
| ئاكرێ | ١٨,٦ | ٢٠,٢ | ٢١,٦ | ٢٠,٢ | ٢١,١ | ٢١ | ٢٠,٨ | ١٢,٦٣ |
| بەردەرەش | - | - | - | - | - | - | - | ٩,٩ |
| شێخان | ١٤,٢ | ١٨,٨ * | ٢١ | ١٠,١ * | ١٢,٤ | ٦,٨ * | ٨,٩ * | ١٠,٣٣ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالێن دیاركری.

نەخشەیێ (١٣)
دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن پارێزگەهێ دهۆکێ ل دووڤ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)




چیایی یێن باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ مشەختبوون بەرەڤ دەڤەرێن باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ پارێزگەهێ، و دماوەیێ دەهـ سالێن ل دووڤدا و هەتا سالا (١٩٩٦)ێ چ گوهۆرینێن مەزن د هژمارا ئاکنجیێن چ قەزایاندا پەیدانەبوو ب تایبەت یێن دهۆك و زاخۆ و سێمێل و ئاکرێ، هەردیسان هندەك ناحیێن قەزا شێخان نێزیکی نیڤەکا ئاکنجیێن وێ بەرەڤ کێمبوونێ چوو و ڤێ چەندێ ژی کارتێکرن کرە سەر رێژەیا ئاکنجیێن وێ قەزایێ.

ل قەزا ئامێدیێ ژی سەرەرای زڤرینا ئێمناهی و بەرقەراریێ لێ هەتا نها نەشیایە هژمارا ئاکنجیێن خو ئەوێن ل سالێن حەفتێ و هەشتێ یێن چەرخێ بۆری ژدەست داین ب زڤرینیت زێدەباری زڤرینا گەلەك خێزانێن وێ یێن مشەختبووی ل وی دەمی، ب رەنگەکی کو یەکەیێن ژیانا جڤاکی و ئابووری یێن هاتینە گوهۆرین و بووینە بەشەکێ گرنگ ژ توخمێن سیستەمێ ژیانا سەردەم و پێشکەفتی ل پارێزگەهێ و باژێرێن وێ یێن سەرەکی ڤە.

دەمێ تەماشەی دابەشووبونا رێژەیی یا ئاکنجییان ل سالا (٢٠٠٦)ێ بکەین دێ بۆ مە دیاربیت کو پترین رێژە ل قەزا دهۆکێ ئاکنجیبووینە کو دگەهیتە (٢٩,٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ، و ل دووڤدا ژی هەر ئێك ژ قەزایێن ئاکرێ و زاخۆ دهێت کو هەر ئێك ژوان ژی نێزیکی پێنجێکا ٥/١ ئاکنجیێن پارێزگەهێ پێکدئینیت، ل دووڤدا ژی قەزایێن سێمێل و ئامێدی و ناحیێن قەزا شێخان دهێن کو هەر ئێك ژوان ژی دەهێکا ١٠/١ ئاکنجیێن پارێزگەهێ پێکدئینیت. لێ وێنەیێ

دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجییان ل سالا (٢٠٠٩)ێ چ گوهۆرینێن مەزن بخۆڤە نەدیتن ب تایبەت ئەگەر هەڤبەر بکەین دگەل سالا (٢٠٠٦)ێ ب تایبەتژی ل قەزایێن سەرەکی (دهۆك، زاخۆ، ئامێدی و سێمێل)، سەرەرای هندێ کو هەمیان برەکا کێمتر تووماركربوو ژ بلی قەزا سێمێلێ کو ب رێژەیا (٢,٤٦٪)ێ بلندبوو، لێ مەزنترین گوهۆرین د قەزا ئاکرێ دا پەیدابوو کو ب رێژەیا (٨,١٧٪)ێ کێم ببوو و ئەڤ کێمبوونە ژی د بەرژەوەندییا قەزا بەردەرەش دا بوو کو ژنوی دروستبووی و بەری هینگێ سەر ب قەزا ئاکرێ ڤەبوو، گرنگییا ڤێ قەزا نوی د هندێ دایە نێزیکی دەهێکا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ پێکدئینیت.

جوداهییا دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجییان دناڤبەرا قەزایێن پارێزگەهێ د هەر سالەکێدا، و گوهۆرینا بهایێ رێژەیی ژ دەمەکی بۆ ئێکی دی ل هەمان قەزا هندەك پیڤەران بۆ مە دیار دکەن کو دەربرینێ ژ تایبەتمەندیێن وان یێن گشتی بۆ شێوازێ دابەشبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەهێ دکەن، و ئەم دشێین ڤان پیڤەران د چەند خالەکاندا کورت بکەین:-

١- بلندبوونا بەردەوام د رێژەیا ئاکنجیێن قەزا دهۆکێ ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالێن ڤەکولینێ دا، و نها ژی خودانا مەزنترین رێژەیە ژ سەرجەمێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ ب رێژەیا (٢٦,٦٥٪)ێ .

٢- کێمبوونا بەردەوام د رێژەیا ئاکنجیێن قەزا ئامێدیێ دا ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالێن ڤەکولینێ دا و نها ژی خودانا کێمترین رێژەیە ژ سەرجەمێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ ب رێژەیا (٨,٠٨٪)ێ .

٣- چ جوداهیێن مەزن دناڤبەرا رێژەیا ئاکنجیێن قەزایێن زاخۆ و ئاکرێ دا د ماوەیێ سالێن ڤەکولینێ دا ناهێنە دیتن ژبلی سالا (٢٠٠٩)ێ کو جوداهییا رێژەیی دناڤبەرا واندا گەهشتیە (٦,٧٢٪)ێ ، ئەو ژی پشتی قەزا بەردەرەش ژ قەزا ئاکرێ هاتییە ڤەکرن.

٤- قەزا دهۆك و زاخۆ هەر ژ سالا (١٩٧٧)ێ نێزیکی نیڤا ئاکنجیێن پارێزگەهێ پێکدئینن، ئەو ژی ژبەرکو خەلکی پتر حەزا ئاکنجیبوونێ ل ڤان هەردو قەزایان هەبوویە، ئەڤە ژی حالەتەکە پێدڤی ب هندەك چارەسەریێن پلاندانانێ یێن بلەز هەیە.

٥- جوداهییا رێژەیی یا ئاکنجییان و گوهۆرینا بهایێ ڤێ رێژەیێ ژ دەمەکی بۆ ئێکێ دی، د بنەرتدا بۆ ئەگەرێ مشەختبوونا خەلکی ژ گوندان بۆ باژێران د زڤریت، زێدەباری گوهۆرینێن سنوورێ کارگێری و کاودانێن ئێمناهی و بەرقەراربوونێ کو ل هندەك دەمان ئەڤ کاودانە د جێگیربوون و د هندەك دەمێن دیژی دا نەدجێگیربوون.

وێنەیێ جوداهییا رێژەیی یا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ب باشی دیار دبیت ب تایبەت دەمێ ئەڤ رێژەیە دهێنە هەڤبەرکرن ل سەر ئاستێ بچویکترین یەکەیێن کارگێری وەك ناحیان (تەماشەی خشتەیێ (٢١) و نەخشەیێن (١٤) و (١٥) و(١٦) بکە). دابەشبوونا ئاکنجییان ژ سالەکێ بۆ ئێکا دی دهێتە گوهۆرین ژبلی کو مەزنترین جوداهی پشتی سالا (١٩٨٧)ێ پەیدابوویە و بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ بلندبوونا بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ یە دناڤبەرا رێژەیاندا بۆ (١١٠) و (١٠٦,٤) و (١١٨,٣) و (١٢٢) ێ ل دووڤ ئێك د ماوەیێ سالێن (١٩٨٧)ێ و (١٩٩٦)ێ و (٢٠٠٦)ێ و (٢٠٠٩)ێ دا.

و ب مەرەما پیڤانا جوداهییا ئاستێن چربوونا رێژەیی یا ئاکنجییان ل سالەکێ بۆ ئێکا دی، ئەم دشێین پەنایێ بەینە بەر پیڤەرێ چربوونا رێژەیی[٨] بۆ هەر سالەکێ ئەو ژی ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ (٢٢)، ب رێکا دەرخستنا وی ب کریارا دابەشکرنا ژمارە (١٠٠) ل سەر هژمارا یەکەیێن کارگێری د هەر سالەکێدا، و پاشی ژبرنا ئەنجامی ژ ئەنجامێ رێژەیی یێ ئاکنجیێن هەر یەکەیەکا کارگێری و کۆمکرنا ئەنجامێ جوداهیێ بۆ پیڤەرێن ئەرێنی و نەرێنی.[٩]

**خشتەیێ (٢١)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن پارێزگەهێ ل دووڤ ناحیان (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| هـ. | سال / ناحیە | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٩٦ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆك | ١١,١ | ٣,٤ | ٩,٦ | ١١,٢ | ٢٨ | ٢٤,٢ | ٢٦,٣ | ٢٤,١٧ |
| ٢ | مانگیشك | ٥,٤ | ٥,١ | ١,٥ | ٤,٢ | ٠,٦ | ٤,٤ | ١,٤ | ٠,٩٩ |
| ٣ | زاویتە | - | - | ٢,١ | ٢,٩ | ١,٤ | ١,٦ | ١,٦ | ١,٤١ |
| ٤ | ئامێدی | ١٣,٥ | ٤,١ | ١,٨ | ٤,٩ | ١,٣ | ٢,١ | ٣,٧ | ٠,٧٥ |
| ٥ | سەرسنك | - | ٩,٢ | ٢,٣ | ٧,٢ | ٢,٢ | ٤,٥ | ٣,٥ | ١,٧٦ |
| ٦ | دێرەلوك | ٤,٥ | ٤,٩ | ٦,٤ | ٣,٧ | ٢,٨ | ٤,٩ | ١,٩ | ٣,٨٣ |
| ٧ | كانی ماسێ | ٦,٦ | ٦,٥ | ٨,٩ | ٤,٧ | - | - | ٠,٨ | ٠,٧٦ |
| ٨ | زاخۆ | ٨,١ | ٢,٧ | ٨ | ١١,٢ | ١٥,٣ | ١٤,٢ | ١٥,٦ | ١٤,٨٩ |
| ٩ | دەركار | ٤,٣ | ٥,١ | ٠,٩ | ٣,٣ | ١,٩ | ٢ | ٢,١ | ١,٢٦ |
| ١٠ | باتیفا | ٣,١ | ٣,٥ | ٤,٦ | ٣,٩ | ١,٨ | ٤,١ | ٢,٨ | ١,٧١ |
| ١١ | سێمێل | - | ٧,٦ | ٧,١ | ١٠,٣ | ٥,٨ | ٧,٣ | ٥,٢ | ٦,١٣ |
| ١٢ | فەیدێ | - | - | - | - | ٤ | - | ٤,٩ | ٥,٢٩ |
| ١٣ | باتێلێ | ٥,١ | ٨,١ | ٤,٦ | ٢,٣ | ١,٤ | ٢,٨ | ٠,٥ | ١,٦٥ |
| ١٤ | ئاكرێ | ٣,٢ | ٢,٧ | ٤,٥ | ٣,٣ | ١٢,٤ | ٤ | ٣,٩ | ٥,٦٣ |
| ١٥ | بەردەرەش | ٥,٨ | ٧,١ | ٩,٥ | ٧,٦ | ٨,٧ | ٧,٧ | ٧,٧ | ٢,٢٦ |
| ١٦ | گردەسین | - | - | - | ٤,٧ | - | ٤,٤ | ٤ | ٣,٤٣ |
| ١٧ | دینارتە | ٥,٤ | ٤,٣ | ٠,٩ | ٢,٨ | - | ٢,٩ | ٣,١ | ٢,٠٨ |
| ١٨ | بجیل | ٤,٢ | ٦,٣ | ٥,٨ | ١,٨ | - | ٢ | ٢,١ | ١,٤٩ |
| ١٩ | ئێسفنێ | ١٤,١ | ١٣,٥ | ٢١,١ | ٩,٣ | ١٢,٤ | ٦,١ | ٨,١ | ١,٨١ |
| ٢٠ | ئەترووش | ٥,٦ | ٥,٤ | ٠,٤ | ٠,٧ | - | ٠,٨ | ٠,٨ | ١,٠١ |
| ٢١ | رزگاری | - | - | - | - | - | - | - | ١,٥١ |
| ٢٢ | بامەرنێ | - | - | - | - | - | - | - | ٠,٥٨ |
| ٢٣ | چەمانكێ | - | - | - | - | - | - | - | ٠,٤١ |
| ٢٤ | باعەدرێ | - | - | - | - | - | - | - | ١,١٢ |
| ٢٥ | قەسرۆك | - | - | - | - | - | - | - | ٥,٠٩ |
| ٢٦ | زیلكان | - | - | - | - | - | - | - | ١,٣١ |
| ٢٧ | رۆڤیا | - | - | - | - | - | - | - | ٢,٥٤ |
| ٢٨ | دارەتوو | - | - | - | - | - | - | - | ٢,٤٥ |
| ٢٩ | كەلەك | - | - | - | - | - | - | - | ٢,٦٦ |

## نەخشەیێ (١٤)
## دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن پارێزگەهێ ل دووف ناحیان (١٩٤٧-١٩٩٦)

**1947**




**1957**




**1965**




**1977**




**1987**




**1996**



**نەخشەیێ (١٥)**

**دابەشكرنا رێژەیی بۆ ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ل دووڤ ناحیان (٢٠٠٦)**



**نەخشەیێ (١٦)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن پارێزگەهێ ل دووڤ ناحیان (٢٠٠٩)**

بهایێ ڤی پیڤەری ژ سالەکێ بۆ ئێکا دی یا جودابوو ئەڤە ژی وەك بەلگە ل سەر ئاستێ چڕبوونا ئاکنجییان ب رەنگەکی کو دهێتە دیتن، ل دەستپێکا ماوەیێ ڤەکۆلینێ ئاستێ چڕبوونا ئاکنجییان یێ کێم بوو ژبەرکو گوهۆرینێن سرۆشتی دشیان کونترولێ ل سەر دابەشبوون و دوبارە دابەشکرنا ئاکنجییێن پارێزگەهێ بکەن ب هەڤبەرکرن دگەل ناڤەراست و داوییا ماوەیێ ڤەکۆلینێ کو ڤان دەمان گوهۆرینێن سرۆشتی چ رۆلەکێ گرنگ نەبوو بەلکو ل شوینا وان گوهۆرینێن، سیاسی فاکتەرەکێ بهێزبوون ژبۆ دەستنیشانکرنا شێوازێ دابەشبوونا ئاکنجییان. بهایێ پیڤەرێ دابەشبوونێ د ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٤٧) و (١٩٥٧)ێ د گەهشتە (٢٢,٨) و (١٧,١)ێ ل دووڤ ئێك، ل سالا (١٩٦٥)ێ بهایێ ڤی پیڤەری دوجاران پتر لێهات و ل سالا (١٩٨٧)ێ گەهشتە بلندترین رادە (٤٢,٨٪)ێ ، هەرچەندە ل سالێن دووڤدا ئەڤ بهایە پیچەك بەرەڤ کێمبوونێ چوو لێ ل سالێن (٢٠٠٦)ێ و (٢٠٠٩)ێ هەر د ئاستەکێ بلند دا مابوو ئەو ژی (٣٧,٩٪)ێ و (٣٩٪)ێ بوو ل دووڤ ئێك.

بهایێ ڤی پیڤەری ئاماژێ ب هندێ ددەت کو پێدڤییە هندەك ژ ئاکنجییێن پارێزگەهێ دوبارە بێنە دابەشکرن ژ پێخەمەت وێ دابەشبوونا زالّ ئەوا ل دەستپێکا ماوەیێ ڤەکۆلینێ هەی ئەو ژی ب هاریکاریا پیڤەرێ دوبارە دابەشکرنێ (Redistribution Index) کو پێکدهێت ژ رێژەیا سەدی یا قەبارەیێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل داوییا ماوەیێ ڤەکۆلینێ دگەل وێ سالا مە دڤێت دوبارە کریارا دابەشبوونا ئاکنجییان لێ دیاربکەین، ب هاریکاریا داتایێن خشتەیێ (٢٢) ئەم دشێن تێبینییا هندێ بکەین کو بهایێ پیڤەرێ دوبارە دابەشکرنێ و قەبارەیێ ئاکنجییێن پێدڤییە دوبارە بێنە دابەشکرن، د هەر ماوەیەکی ژ ماوەیێن ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان کێمتر نینە ژ چارێکا سەرجەمێ گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێ، ژبلی هەردو ماوەیێن داویێ کو هندەك تایبەتمەندییێن ئێکانە بۆ شێوازێ دابەشبوونا جوگرافی یا ئاکنجییان و وەرارکرنا وان ل پارێزگەهێ هەبووینە، ب تایبەت د ماوەیێ دناڤبەرا

**خشتەیێ (٢٢)**

**پیڤەرێ چڕبوون و دوبارە دابەشکرنا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)[١٠]**

| سال | پیڤەرێ چڕبوونا رێژەیی٪ێ | پیڤەرێ دوبارە دابەشکرنێ٪ | قەبارەیێ ئاکنجییێن پێدڤی ب دوبارە دابەشکرنێ هەی |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ٢٢,٨ | - | - |
| ١٩٥٧ | ١٧,١ | ٢٥ | ٥٧٣٤١ |
| ١٩٦٥ | ٣٢,٤ | ٣٠,٤ | ٥٦٢٥٠ |
| ١٨٧٧ | ٢٥,٦ | ٢٨,٨ | ١٠٣٦٢٣ |
| ١٩٨٧ | ٤٢,٨ | ٣٨,٢ | ١٦٨٢٨٦ |
| ١٩٩٦ | ٣٢ | ٢٤,٦ | ١٧٢٢١٤ |
| ٢٠٠٦ | ٣٧,٩ | ١٣,٢ | ١٢٥٦٠٠ |
| ٢٠٠٩ | ٣٩ | ١٢,٣ | ١٤٤٨٥٨ |

سالێن (١٩٦٥-١٩٨٧)ێ زێدەباری رۆلێ گوهۆرینێن سیاسی د وێنەكرن و دانانا شێوازێ دابەشبوونی دا.

هەژی گوتنێ یە كو بهایێ پیڤەرێ دوبارە دابەشكرنێ و قەبارەیێ ئاكنجیێن پێدڤی ب دوبارە دابەشكرنێ هەی ل هەردو ماوەیێن داویێ دا هند ئاماژێ ناكەتە سەر كێمبوونا دیاردا چڕبوونێ تەمەت هندێ كو ئاماژێ بكەتە سەر شێوازێ دابەشبوونێ كو شێوازەكێ جێگیر وەرگرتییە دوور ژ دەستنیشانكەرێن پلاندانانێ ژ سالا (١٩٨٧)ێ و دیاردا چڕبوونێ ژ دیارترین سیفەتێن وێبوو. چاككرنا شاشییا دابەشبوونێ پێدڤی ب چارەسەریێن پلاندانانێ یێن رژد هەیە، هەروەسا رێژەیا ئاكنجیێن هەردو ناحیێن دهۆك و زاخۆ ب شێوەیەكێ سەرنجراكێش ل سالا (١٩٨٧)ێ بلندبوویە، ب رەنگەكی كو ئەڤ هەردو ناحییە پێكڤە ب رێژەیێن (٤٣,٣٪)ێ و (٣٨,٤٪)ێ و (٤١,٩٪)ێ و (٣٩,١)ێ ل دووڤ ئێك سەرجەمێ ئاكنجیێن پارێزگەهێ ل سالێن (١٩٨٧)ێ و (١٩٩٦)ێ و (٢٠٠٦)ێ و (٢٠٠٩)ێ پێكدئینن (تەماشەی خشتەیێ (٢١) بكە).

گومان تێدا نینە كو وەراركرنا وێنەیێ دابەشبوونا جوگرافی یێ ئاكنجییان ل دووڤ هەرێمێن كارگێری هێدی هێدی بوویە ئەگەرێ كێمبوونا رۆلێ فاكتەرێن سرۆشتی د دەستنیشانكرنا ڤێ دابەشبوونێ دا. ل دەمەكی كو ئەم دشێن فاكتەرێن سرۆشتی ب دانین وەك دەستنیشانكەرێن جهی بۆ دەستنیشانكرنا رەهەند و چارچۆڤێن شێوازێ دابەشبوونێ و وی فورمێ كو كارتێكرنا فاكتەرێن دی ددەتە لایەكی. و ژبەر ڤێ چەندێ و سەرەرای هندێ كو مە باوەریەكا تەمام هەیە فاكتەرێن مرۆڤایەتی رۆلەكێ مەزنتر ژ فاكتەرێن سرۆشتی د شێوازێ دابەشكرنا ئاكنجییاندا ل پارێزگەهێ گێرایە، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت كو رۆلێ فاكتەرێن سرۆشتی ژبیربكەین یان ب دەینە رەخەكی.

ئەم دشێن پارێزگەها دهۆكێ بۆ سەر دو هەرێمێن فیزیوگرافی دابەش بكەین، هەرێما چیایی و هەرێما نیمچە چیایی ئەو ژی ل دووڤ پیڤەرێن سرۆشتی یێن بووینە ئەگەرێ دەستنیشانكرنا سنووران دناڤبەرا پارچەیێن ئاخا عیراقێ دا، لێ سنوورێ ناڤبڕ دناڤبەرا دەڤەرا چیایی و نیمچە چیایی ل كوردستانێ ب تایبەت ئەو جهێ دكەڤیتە پارێزگەها دهۆكێ پێكدهێت ژ زنجیرەكا چیایان كو ژ چیایێ (بێخێر) ل سەر سنوورێ عیراق و سوریێ دەستپێدكەت تا دگەهیتە چیایێ سپی و چیایێ زاوا و ب چیایێ ئاكرێ ب داویێ دهێت هەتا خالا ئێككرتنا وی دگەل رووبارێ زێ مەزن، ئەم دشێن ڤی ناڤبڕی دناڤبەرا هەردو هەرێمان، هەرێما چیایی كو ڤان یەكەیێن كارگێری بخۆڤە دگریت: قەزایێن ئامێدی و زاخۆ و ناحییێن مانگێشك و زاویتە یێن سەر ب قەزا دهۆكێ و ناحیا ئەتریش یا سەر ب قەزا شێخان و ناحیا دینارتە یا سەر ب قەزا ئاكرێ. لێ هەرێما نیمچە چیایی یەكەیێن كارگێری یێن ماین بخۆڤە دگریت ئەوێن دكەڤنە سەر قەزایێن سێمێل و دهۆك و ئاكرێ (تەماشەی نەخشەیێن (١٧) و (١٨) بكە).

ئەگەر تەماشەی وەرارا شێوازێ دابەشبوونا جوگرافی یا ئاكنجیێن پارێزگەهێ بكەین ئەڤا د پاراگرافێ بەری نها ئاماژە پێ هاتییە كرن، دێ بۆ مە دیاربیت كو زنجیرا چیایێن بەحسێ وان هاتییە كرن تەوەرێ سەرەكی یێ ڕاكێشانا ئاكنجییان بوو، ب رەنگەكی دناڤبەرا ناڤ چییاندا مەزنە باژێرێن پارێزگەهێ دروست بووینە ب تایبەت بەشێ وێ یێ باشووری یێ سەر ب هەرێما نیمچە چیایی ڤە درێژ دبیت. ل دەستپێكا سالێن ڤەكۆلینێ ل هەردو هەرێمان جۆرەكی هەڤسەنگیێ د دابەشبوونا ئاكنجییاندا هەبوویە، لێ دگەل بۆرینا وەختی هەرێما نیمچە چیایی هێدی هێدی هژمارا ئاكنجیێن وێ بەرەڤ زێدەبوونێ چوویە بەروڤاژی هەرێما چیایی كو ئاكنجیێن وێ بەرەڤ كێمبوونێ چووینە. مەزنترین جوداهی دناڤبەرا رێژەیا ئاكنجیێن دناڤبەرا هەردو

**خشتەیێ (٢٣)**
**رێژەیێن دابەشبوونا ئاکنجییان ل دووڤ هەرێمێن سرۆشتی ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | هەرێما چیایی | | هەرێما نیمچە چیایی | |
|---|---|---|---|---|
| | قەبارەیێ ئاکنجییان | ٪ | قەبارەیێ ئاکنجییان | ٪ |
| ١٩٤٧ | ٩٩٤٤٥ | ٥٦,٥ | ٧٦٦٨٧ | ٤٣,٥ |
| ١٩٥٧ | ١١٨٥٩١ | ٤٩,١ | ١٢٣٠٦٩ | ٥٠,٩ |
| ١٩٦٥ | ٦٨٦١٢ | ٣٧,٢ | ١١٦٠٦٤ | ٦٢,٨ |
| ١٩٧٧ | ١٧٨٤٠٣ | ٣٩,٦ | ١٨١٤٠١ | ٥٠,٤ |
| ١٩٨٧ | ١٢٠٢٩٤ | ٢٧,٣ | ٣٢٠٢٤٦ | ٧٢,٧ |
| ١٩٩٦ | ٢٩٠٧٨١ | ٤١,٢ | ٤١٤٦٨٦ | ٥٨,٨ |
| ٢٠٠٦ | ٣٥٥١٢٤ | ٣٧ | ٦٠٣٨٧٢ | ٦٣ |
| ٢٠٠٩ | ٣٧٦١٩٣ | ٣٢,٩٤ | ٨٠١٥٢١ | ٦٨,٠٦ |

**نەخشەیێ (١٧)**
**هەڤبەرکرن دناڤبەرا هەرێمێن سرۆشتی و شێوازێ دابەشبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠٠٦**

**نەخشەیێ (١٨)**
**هەڤبەرکرن دناڤبەرا هەرێمێن سرۆشتی خالێن دابەشبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠٠٦**




هەرێمان ل سالا (١٩٨٧)ێ دا دیاربوویە ب رەنگەکی هەرێما نیمچە چیایی رێژەیا وێ گەهشتە (٧٢,٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ لێ هەرێما چیایی ب تنێ رێژەیا (٢٧,٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجیێن پارێزگەهێ پێکئینایە (تەماشەی نەخشەیێ (٢٣) بکە ).

ب شێوەیەکێ گشتی ل سالا (٢٠٠٩)ێ نێزیکی دو سێکێن ئاکنجیێن پارێزگەهێ ل هەرێما نیمچە چیایی خڕڤەبووینە ل دو خالێن سەرەکی، خالا ئێکێ چڕبوونا ئاکنجییان ل پشکا رۆژهەلاتی ژ دەشتا سلێڤانەیا ل دۆرماندۆر باژێرێ دهۆکێ، خالا دووێ ژی چڕبوونەکا کێمتر یا ئاکنجییان ل دەشتا ئاکرێ (ناڤکورێ)، لێ سێیکا دی یا ئاکنجییان ل هەرێما چیایی خڕڤەبوونە ئەو ژی ل خالەکا سەرەکی ل دەشتا سندی (تەماشەی نەخشەیێن (١٩) و (٢٠) بکە)، ئەگەر ئەم ئاکنجیێن یەکەیێن کارگێری یێن دیارکری ب دەینە لایەکی، هەرێما چیایی ب رووبەرێ (٥٨١٠ کم٢) رێژەیا (٥٩,٦٪)ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ پارێزگەهێ پێکدهینت و نێزیکی (٦٨٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاکنجیێن ڤێ هەرێمێ و (٢٥,٣٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ پێکدئینیت .

**نەخشەیێ (١٩)**

**هەڤبەرکرن دناڤبەرا هەرێمێن سرۆشتی و شێوازێ دابەشبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠٠٩**




**نەخشەیێ (٢٠)**

**هەڤبەرکرن دناڤبەرا هەرێمێن سرۆشتی و خالێن دابەشکرنا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠٠٩**



## دوو: چرپیا ئاکنجییان

چرپیا گشتی یا ئاکنجییان[11] دهێته دەربرین پەیوەندیا پێکڤەگرێدانێ دناڤبەرا ئاکنجیێن دەڤەرەکێ و جهێ ئاکنجیبوونا وان، ئەڤ پەیوەندییە ڕادەیێ هەڤسەنگیێ یان نەبوونا وێ دناڤبەرا وان ئاکنجییان و رووبەرێ دەڤەرا واندا دیار دکەت. سەرەرای هەبوونا گەلەك تێبینییا ل سەر ڤی پیڤەری لێ دگەل هندێ دهێتە هژمارتن رێکەکا سەرکەفتی ژبۆ شرۆڤەکرنا جوداهیێن جهی بۆ دابەشکرنا ئاکنجییان[12]، هندەك جاران ڤەکۆلەر پەنایێ دبەنە بەر هندەك پیڤەرێن دی ژ پێخەمەت ڤەشارتنا کێموکاسیێن پیڤەرێ چرپیا گشتی وەك پشت بەستنا ئاکنجییان ب داهاتێن ئابووری و چەوانیا ب کارئینانا عەردی و برا بەرهەمێ سالانە و وان جۆرێن پیشەیێن ئاکنجی دکەن[13].

ب شێوەیەکێ گشتی، ژبەر نەبوونا وان داتایێن دگەل پیڤەرێن دی یێن چرپیا ئاکنجییان د گونجن لەورا ئەم نەچاربووینە پیڤەرێ چرپیا گشتی ژبۆ شرۆڤەکرنا جوداهییا دابەشبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ب کاربینین. سەرەرای هندێ کو پیڤەرێ چرپیا گشتی پیڤەرەکێ گەلەك گشتییە و هندەك جاران ئەنجامێن نەدروست د دەتە مە چونکی پیڤەر و هەڤسەنگیێن دروست دناڤبەرا ئاکنجییان و ئاستێ جۆری یێ وێ دەڤەرێ ژ لایێ جوداهییا داهاتی و شیانێن بەرهەم ئینانێ دیار ناکەت، لەورا جوداهییا ئاستێن چرپیا ئاکنجییان ل سەر ئاستێ قەزا و ناحیان ب شێوەیەکێ جوداکری هاتینە شرۆڤەکرن – ئەگەر دەربرین یا راست بیت - لێ هندەك یەکەیێن ئاکنجیبوونێ ل سەر ئاستێ قەزایان هەنە کو هندەك دەڤەرێن مری ژ لایێ ئابووری و جوگرافی لێ هەنە ئانکو هندەك دەڤەرێن چیایی نە هژمارەکا گەلەك کێم یا مرۆڤان لێ دژین، ئەڤ چەندە ژی راستییا پەیوەندیا دناڤبەرا مرۆڤ و عەردی دا دیارناکەت، ژ لایەکێ دیڤە چرپیا ئاکنجییان ل هندەك جهان یا زێدەیە وەك کۆمەڵگەهێن ئاکنجیبوونێ ل سەنتەرێن کارگێری یێن پارێزگەهێ. سەرەرای ئاشنابوونێ دگەل گشت لایەنێن وەرارکرنا چرپیا ئاکنجییان ل پارێزگەهێ، نەخشەیێن چرپێ و ڤاڤارتنا داتایان هاتینە دروستکرن، ئەوژی ب پشتبەستن ل سەر وان رێکێن پتر وەکهەڤیێن دناڤبەرا بهایێ گرۆپان و کێمترین جوداهی دناڤبەرا وان گرۆپاندا دیار دکەن. لەورا ل ڤێرێ پشتبەستن هاتییە کرن ل سەر رێکا ڤاڤارتنا سرۆشتی[14] (Natural Break) ژبۆ دەستنیشانکرنا گرۆپێن چرپێ دناڤ بەرنامێ (ArcGIS10)، بیرۆکا ڤێ رێکێ ژی دمینتە ل سەر دەستنیشانکرنا سنوورێن دناڤبەرا گرۆپێن ڤاڤارتنێ یێن پترین وەکهەڤی دناڤ گرۆپاندا هەی ب رەنگەکی کو توخمێن تا ڕادەیەکێ مەزن وەکهەڤ بخۆڤە بگریت، زێدەباری کێمترین جوداهییا دناڤبەرا هەمان گرۆپاندا[15]. هژمارا گرۆپێن هەر ڤاڤارتنەکێ و سنوورێ هەر گرۆپەکێ دهێنە دیارکرن ب هاریکارییا سرۆشتێ داتایێن تۆمارکری، لەورا ڤەکۆلەر نەشێت مایێ خو د هژمارا گرۆپ و سنوورێ هەر گرۆپەکی دا بکەت ژ پێخەمەت دیارکرنا ئاستێن چرپیا نزم و بلند، ب مەرەما هەڤبەرکرنێ ژ دەمەکی بۆ دەمەکێ دی، و دوورکەفتنێ ژ ڤەشارتنا راستییا جوداهیێ دناڤبەرا گرۆپێن چرپێ د هەر سالەکێ دا.

و ب هاریکارییا داتایێن خشتەیێ (٢٤) و وێنەیێ (١٠) یێن کو وەرارکرنا بهایێ چرپیا ئاکنجییان ل پارێزگەهێ و قەزایێن وێ دیاردکەن، ئەم دشێن کۆمەکا تێبینیان دەربارەی جوداهییا ئاستێن چرپێ و وەختی و جهی ب دەستڤە بینین ئەوژی ئەڤەنە:-

١- بلندبوونەکا گشتی یا هەی ژبۆ ئاستێ چرپیا ئاکنجییان ژ دەمەکی بۆ ئێکی دی ڤێجا چ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ بیت یان ل سەر ئاستێ هەر قەزایەکێ، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ژبۆ زێدەبوونا هژمارەیی یا قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ دزڤریت دگەل جێگیرییا رووبەرێ دەڤەرێ، ب رەنگەکی کو قەبارەیێ چرپیا ئاکنجییان نێزیکی شەش جاران پتر لێهاتییە، ئاستێ چرپیا ئاکنجییان ژی ل سالا (١٩٤٧)ێ ژ (١٨ کەس/

کم٢) بلندبوویە بۆ (١٠٩ کەس/کم٢) ل سالا (٢٠٠٩)ێ.

٢- ل ڤێرێ جوداهیەك د ئاستێ بلندیێ و نزمیێ د چڕیا ئاکنجییاندا، ژ دەمەکی بۆ ئێکێ دی هەیە، ب رەنگەکی جار بلند دبیت و جار نزم دبیت و ئەگەرێ ڤێ جیاوازیێ ژی بۆ سێ فاکتەران دزڤرێت:

أ- کاودانێن سیاسی و ئێمناهیێ یێن نەجێگیر ل هندەك دەڤەرێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا تێرا بوورین، ئەڤ چەندە بوویە ئەگەر کو تیمێن سەرژمێریێ ب زەحمەت ب گەهنە ئەو جهێن دوور و نەخۆش و بزانن کا هژمارا ئاکنجییێن وان دەڤەران چەندە، ئەڤ چەندە ژی ب تایبەت ل سەرژمێرییێن سالێن (١٩٦٥) و (١٩٨٧)ێ روودان، ژبۆ ڤەشارتنا ڤێ کێماسیێ ژی کەسێن ئەڤ کارە ئەنجام ددایی رابوون ب هەلسەنگاندنا هژمارا ئاکنجییان ب پشت بەستن ل سەر پێشبینییێن وان ل سەر ئەنجامێن سەرژمێرییێن سالێن بەری هینگێ، لەورا دهێتە دیتن کو کێمبوونەکا بەرچاڤ د ئاستێن چڕیا ئاکنجییێن قەزایێن پارێزگەهێ ل سالێن (١٩٦٥)ێ و (١٩٨٧)ێ دا هەیە.

ب- مشەختبوونا ناڤخۆیی ژ گوندان بۆ باژێران ڤێجا چ یا ب دلێ خەلکی بیت یان ژ نەچاری بیت، لێ فاکتەرێن سیاسی و ئێمناهیێ ئەگەرێ سەرەکی یێ مشەختبوونێ بوون ل هندەك سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییە کرن، ب رەنگەکی ل قەزا ئامێدیی ل سالێن (١٩٧٧)ێ و (١٩٨٧)ێ ئاستێ چڕییێ هاتە خوار بۆ ٣/٢، لێ دهەمان سالدا ئەڤ ئاستە ل قەزایێن دهۆك و زاخۆ دو جاران پتر لێهات.

ج- گوهۆڕینا سنوورێن کارگێری، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ کێمبوونا چڕیا ئاکنجییان ل هندەك قەزایان و بلندبوونا وان ل هندەك قەزایێن دی، و ڤی فاکتەری ب پلەیەکا مەزن هاریکاریا وەرگەرانا ئاستێن چڕیا ئاکنجییان کرییە (تەماشەی خشتەیێ (٢٤) بکە).

**خشتەیێ (٢٤)**

**چڕیا ئاکنجییان (کەس/کم٢) ل پارێزگەها دهۆکی و قەزایێن وێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال / قەزا | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٩٦ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | [١٦]٢٠,٧ | [١٧]٢٤ | [١٦]١٩,٨ | [١٧]٦٥,٣ | ١٣٤,٧ | ٢١٦ | ٢٨٤,٦ | ٣١١,٣ |
| ئامێدی | ١٦,٥ | ٢١,٤ | ١٣,٦ | ٢٨ | ١٠,٦ | ٣٠,٥ | ٣٦ | ٣٤,٦ |
| زاخۆ | [١٨]١٩,٥ | [١٨]٢٤,٧ | [١٨]١٧,٩ | [١٨]٤٠,٣ | ٨٠,٨ | ١٣٧,٦ | ١٨٨,٨ | ١٥٨,١ |
| سێمێل | - | - | - | - | ٣٥,٢ | ٥٠,٤ | ٧١,٨ | ١٢١,٨ |
| ئاکرێ | ١١,٨ | ١٦,٧ | ١٤,٤ | ٢٦,٢ | ٣٣,٥ | ٥٣ | ٧١,٣ | ٨٢,١ |
| شێخان | ٣٩,٣ | [١٩]٤٦ | ٦١ | [١٩]٥٢,٦ | [١٩]٥٨,٢ | [١٩]٥١,١ | [١٩]٩٠ | ٨٧,٣ |
| بەردەرەش | - | - | - | - | - | - | - | ١٠٣ |
| پارێزگەهـ | ١٨ | ٢٣,٥ | ١٩ | ٣٦,٩ | ٤٥,١ | ٧١,٧ | ٩٧,٥ | ١٠٩ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن دیارکری.

وێنەیێ (١٠)
بلندبوونا بهایێ چڕیا ئاکنجیبان ل پارێزگەها دهۆکێ و قەزایێن وێ (١٩٤٧-٢٠٠٦)




٣- ل دەستپێکا ماوەیێ ڤەکۆلینێ، تێکرایێ چڕیێ ل سەر ئاستێ قەزایێ نێزیکی بهایێ تێکرایێ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ دبیت، لێ هندەك جاران ئەڤ جوداهییە ژ دەمەکی بۆ ئێکی دی بەرفرەهتر لێ دهێت، ل سالا (١٩٤٧)ێ جوداهییا دناڤبەرا تێکرایێ چڕیا پارێزگەهێ و کێمترین تێکرایێ چڕیێ دناڤبەرا قەزایاندا گەهشتە (٦,٢)ێ، لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ ئەڤ جوداهییە گەهشتییە (٧٤,٤)ێ، هەردیسان جوداهییا دناڤبەرا تێکرایێ چڕیا پارێزگەهێ و بلندترین تێکرایێ چڕیا دناڤبەرا قەزایێن پارێزگەهێ دا ل هەردو سالێن دیارکری بەرەڤ زێدەبوونێ چوویە (تەماشەی نەخشەیێ (٢٥) بکە)، ئەڤ چەندە ژی دووپاتیێ ل سەر ب هێزبوونا دیاردا چڕبوونا ئاکنجییان ل هندەك یەکەیێن کارگێری دکەت.

٤- بلندترین جوداهی دناڤبەرا ئاستێ چڕیێ ل دەستپێك و داویا سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییەکرن ل قەزایێن دهۆك و زاخۆ دیاربوویە، بۆ نموونە ل سەر ئاستێ قەزا دهۆکێ ئاستێ چڕیا ئاکنجییان نێزیکی ١٥ جاران پتر لێهاتییە ژ سالا (١٩٤٧)ێ کو بتنێ (٢٠ کەس/کم٢) دژیان، لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ گەهشتییە (٣١١,٣ کەس/کم٢) ئەڤ چەندە ژی دەربرینێ ژ هندێ دکەت کو ئەڤ قەزایە خودانا پترین چڕیا ئاکنجییان بوویە و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی د زڤڕیت بۆ بچویکاتییا رووبەرێ قەزا دهۆکێ بەرامبەر زێدەبوونا هژمارا ئاکنجیێن ڤێ قەزایێ.

٥- کێمترین تێکرایێن چڕیا ئاکنجییان ب تایبەت پشتی سالا (١٩٦٥)ێ ل قەزا ئامێدیێ دیاربوویە ئەوژی ژبەر مەزناهییا رووبەرێ ڤێ قەزایێ کو نێزیکی پتر ژ چارێکا رووبەرێ پارێزگەهێ پێکدئینیت دگەل هندێ ژی خودانا کێمترین هژمارا ئاکنجییانە ب هەڤبەرکرن دگەل قەزایێن دی، ڤێ قەزایێ نێزیکی (٦,٣٪)ێ و (١١,٥٪)ێ و (٩,٥٪)ێ و (٢٦,٦٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل سالێن (١٩٨٧)ێ و (١٩٩٦)ێ و

**خشتەیێ (٢٥)**

**جوداهیا دناڤبەرا تێکرایێ چڕیا ئاکنجیێن پارێزگەهێ دگەل کێمترین چڕیا دناڤبەرا قەزایاندا (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٩٦ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| جوداهیا دناڤبەرا تێکرایێ چڕیا ئاکنجیێن پارێزگەهێ دگەل کێمترین چڕیا دناڤبەرا قەزایاندا | ٦,٢ | ٦,٨ | ٥,٤ | ١٠,٧ | ٣٤,٥ | ٤١,٥ | ٦١,٥ | ٧٤,٤ |
| جوداهیا دناڤبەرا تێکرایێ چڕیا ئاکنجیێن پارێزگەهێ دگەل بلندترین چڕیا دناڤبەرا قەزایاندا | ٢١,٣ | ٢٢,٥ | ٤٢ | ٢٨,٤ | ٨٩,٦ | ١٤٤,٣ | ١٨٧,١ | -٤٩,١ |

ژێدەر: داتایێن خشتەیێ (٢٤)

(٢٠٠٦)ێ و (٢٠٠٩)ێ ێ پێکئینانینە، ئەگەرێ ڤێ کێمبوونێ ژی بۆ ئالۆزیا ڤێ دەڤەرا چیایی و وان کاودانێن ئێمناهییی یێن نەخۆش ئەوێن دەڤەر تێرا بۆری دزڤڕیت.

ب ئاماژە پێکرنێ بۆ سرۆشتێ زێدەبوونا ئاستێن چڕییێ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ و قەزایێن وێ، دبیت ل پشت وێ بەشەکێ گرنگ ژ راستییا جوداهیا ئاستێن چڕیا ئاکنجیان ژ لایێ دەمی و جهی یا ڤەشارتی بیت، لەورا ئەم ڕابووینە ب ئامادەکرنا نەخشەیێن چڕیا ئاکنجییان ل سەر ئاستێ بچویکترین یەکەیا کارگێری وەك ناحییان، (تەماشەی نەخشەیێن (٢١) هەتا (٢٨) بکە) ب بۆرینا دەمی ئەم دشێن تێبینییا بلندبوونا چڕیا بلند و نزم بکەین، ل سالا (١٩٤٧)ێ بلندترین ئاستێن چڕیا ئاکنجییان دناڤبەرا (١٨٢-٢٥٥ کەس/کم٢) ل هەرئێك ژ ناحیا سەنتەرێ قەزا دهۆك و ناحیا سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ هەبوو، لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ ئەڤ چڕییە گەهشتە (٢٧٦٢-١٠٦٤٤ کەس/کم٢) ل هەر ئێك ژ ناحیا سەنتەرێ قەزا دهۆك و ناحیا سەنتەرێ قەزا زاخۆ.

پتریا ناحییێن پارێزگەهێ خودان چڕییەکا کێمن، ب رەنگەکی کو ل هندەك دەڤەران ئاستێن چڕییێ د کێمترین گرۆپێن چڕییێ دابوون، ب درێژاهیا ماوەیێ ڤەکۆلین ل سەر هاتییە کرن، ئەڤ چڕییە ژ (١٠٠ کەس/کم٢) نەدبۆری ب تایبەت ل ناحییێن قەزایێن ئامێدی و ئاکرێ و ناحیا دەرکارێ ل قەزا زاخۆ و ناحیا باتیفێ ل قەزا سێمێلێ، لێ بەروڤاژی ب درێژاهیا سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییە کرن هندەك دەڤەر د بلندترین ئاستێن چڕیێ دابوون وەك ناحییێن سەنتەرێ قەزا ئامێدی و ئاکرێ و دهۆکێ زێدەباری ناحیا سەنتەرێ قەزا زاخۆ پشتی سالا (١٩٧٧)ێ، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ بچویکاتییا رووبەرێ ڤان ناحیان دزڤڕیت ل بەرامبەر رووبەرێ ناحییێن دی یێن پارێزگەهێ، زێدەباری هەبوونا خزمەتگوزاری و کارگێریەکا باش ل ڤان ناحیان کو بوویە ئەگەرێ ڕاکێشانا خەلکی ژ دەڤەرێن دی ب تایبەت ل وی دەمێ کاودانێن ئێمناهی و سیاسی نەدجێگیر.

پتریا وان ناحییێن سرۆشتەکێ چیایی هەیی و کەتینە دناڤ هەرێما چیایی دا خودان چڕییەکا کێم بووینە لێ بەروڤاژی ئەو ناحییێن سرۆشتێ دەڤەرا وان دەشت و کەتینە دناڤ هەرێما نیمچە چیایی هەردەم خودان چڕییەکا بلند بووینە، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن تێبینیا هندێ بکەین کو هەمی ناحییێن قەزا ئاکرێ چڕییەکا بلندە و هەمان تشت ل سەر ناحییێن قەزا شێخان و سێمێلێ (ژبلی ناحیا باتیفێ) و ناحیا قەزا دهۆکێ د گونجیت.

هەژی گوتنێ یە کو ئاستێن چڕییا ئاکنجییان پتر د نێزیك و هەڤسەنگ بوون د سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ب هەڤبەرکرن دگەل سەرژمێرییێن سالێن بەری هینگێ یان پشتی هینگێ، ئەڤ چەندە ژی بەلگەیە ل سەر رەوشا هەڤسەنگییێ د دابەشبوونا ئاکنجییادا ژ ئەنجامێ بارۆدۆخێ ئێمناهی و بەرقەراربوونێ بێ جێگیر ل گشت دەڤەرێن پارێزگەهێ بەری ئەنجامدانا سەرژمێرییێ ل سالا ناڤبری.

ب هاریکارییا نەخشەییێن دابەشکرنا ژمارەیی و رێژەیی یا ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل سەر ئاستێ ناحیان ل سالا (٢٠٠٦)ێ (تەماشەی نەخشەییێن (١١) و (١٢) بکە) و نەخشەیێ دابەشکرنا چڕییێن ئاکنجییان (تەماشەی نەخشەیێ (٢٧) بکە) ئەم دشێن پێنج هەرێمان یان بوارێن جوداجودا ژبۆ چڕییێن ئاکنجییان (تەماشەی خشتەیێ (٢٦) بکە) بکەین ئەوژی ئەڤەنە:-

١- هەرێم یان بوارێ چڕییا وێ گەلەك بلندە، ل ڤان هەرێمان هژمارەکا مەزن یا ئاکنجییان لێ دژین ب رەنگەکی کو تێکرایێ چڕییێ د گەهیتە (٩٩٢,٨ کەس/کم٢) و ئەگەر ئەم چڕییا هەر یەکەیەکێ بتنێ وەربگرین دێ دیاربیت کو چڕییا ئاکنجییان ل ناحیا قەزا دهۆکێ دو جاران پترە ژ چڕییا گشتی یا ڤێ هەرێمێ کو چڕییا وێ د گەهیتە (٢٣٤١ کەس/کم٢) و ئەڤ بوارە نێزیکی (٤٢٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجییێن ڤێ هەرێمێ پێکدئینیت لێ بتنێ ل سەر رووبەرەکێ بچویك ئەوژی (٤٠٢ کم٢) د ئاکنجینە ئانکو ب رێژەیا (٤,١٪)ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ پارێزگەهێ، ژبەر ڤێ چەندێ ئاستێن چڕیی گەلەك زێدەبووینە.

٢- هەرێم یان بوارێ چڕییا وێ بلند، ئەڤ بوارە نیمچە گرێدایە و گەلەك ژ بوارێ ئێکێ یێ دوورە و دکەڤیتە لایێ رۆژهەلاتی کو ناحییێن سەنتەرێ قەزایێن ئامێدی و ئاکرێ بخۆڤە دگریت، هەرچەندە ئەڤ هەرێمە هاتییە ناڤکرن ب خودانا چڕییەکا بلند لێ تێکرایێ چڕییا وێ ناگەهیتە سێیکا چڕییا گشتی یا هەرێما ئێکێ ژبەرکو چڕییا وێ (٣٠٤ کەس/کم٢)، و ئەڤ بوارە کێمترین رێژە ژ سەرجەمێ ئاکنجییێن پارێزگەهێ پێکدئینیت ئەوژی (٧,٦٪)ێ و ل سەر کێمترین رێژە ژ سەرجەمێ رووبەرێ پارێزگەهێ د ئاکنجینە کو رووبەرێ وێ (٢,٤٪)ێ یە، و ئەڤ چەندە ژی هێمایێ دکەتە سەر جۆرەکێ گونجاندنێ دناڤبەرا رێژەیا ئاکنجی و رووبەرێ هەرێمێ ب هەڤبەرکرن دگەل هەرێما ئێکێ.

٣- هەرێم یان بوارێ چڕییا وێ ناڤنجی، پتر ژ (٥/٤)ێ ژ رووبەرێ ڤی بواری دکەڤیتە سەر شریتەکا پێکڤەگرێدایی، ژ دەڤەرێن باشوورێ پارێزگەهێ درێژ دبیت کو ناحییێن قەزا شێخان و ناحییێن سێمێل و فەیدیێ بخۆڤە دگریت، پارچەیا وێ یا دی ناحیا باتیفا یا سەر ب قەزا زاخۆ بخۆڤە دگریت چڕییا ئاکنجییان ل ڤێ هەرێمێ دناڤبەرا (١٢٨–١٦٥ کەس/کم٢)، تێکرایێ چڕییا گشتی لێ د گەهیتە (١٣٨,٦ کەس/کم٢)، ئەڤ بوارە نێزیکی پێنجێکا ٥/١ ئاکنجییێن پارێزگەهێ پێکدئینیت کو ل سەر رووبەرێ (١٥٪)ێ ژ رووبەرێ گشتی یێ پارێزگەهێ ئاکنجیبووینە، ل ڤێرێ ژی گونجاندنەك دناڤبەرا رووبەر و ئاکنجییێن ڤێ هەرێمێ دا هەیە سەرەرای بلندبوونا رێژەیا ئاکنجییان ژ رێژەیا رووبەری ب (١,٤٣)ێ. لەورا هاتییە ناڤکرن ب بوارێ چڕی ناڤنجی هەتاکو تێکرایێ چڕییا گشتی گەلەگ دوور نینە ژتێکرایێ چڕییا گشتی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ.

٤- هەرێم یان بوارێ چڕییا وێ نزم، ئەڤ بوارێ هندەك دەڤەرێن پێکڤەگرێدایی ل باشوورێ رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ ب خۆڤە دگریت کو ناحیا بجێل و گردەسین و بەردەرەش ل قەزا ئاکرێ بخۆڤە دگریت سەرەرای درێژبوونا پترییا دەڤەرێن ڤی بواری ل دەشتێ لێ ئاستێ چڕیێ یێ لێ کێمە. ب رەنگەکی کو بهایێ تێکرایێ چڕییا گشتی یێ هەرێمێ ژ تێکرایێ گشتی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ کێمترە، و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ د زڤڕیت کو پترییا دەڤەرێن ڤێ

**نەخشەیێ (٢١)**
**چڕییا ئاکنجیبیان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٤٧**




**نەخشەیێ (٢٢)**
**چڕییا ئاکنجیبیان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٥٧**



## نەخشەیێ (٢٣)
## چڕییا ئاکنجییان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٦٥




## نەخشەیێ (٢٤)
## چڕییا ئاکنجییان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٧٧



نەخشەیێ (٢٥)
چڕییا ئاكنجییان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٨٧




نەخشەیێ (٢٦)
چڕییا ئاكنجییان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٩٦



**نەخشەیێ (٢٧)**

**چڕیا ئاكنجیبان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ٢٠٠٦**




**نەخشەیێ (٢٨)**

**چڕیا ئاكنجیبان ل ناحییێن پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ٢٠٠٩**



هەرێمێ بۆ كشتوكالی هاتینە ب كارئینان، زێدەباری دابەشكرنا ئاكنجییان ل سەر هندەك گوندێن بچویك و ژێكدوور. رێژەیا ئاكنجیێن ڤێ دەڤەرێ نێزیكی (١٣,٨٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاكنجیێن پارێزگەهێ پێكدئینیت كو ل سەر رووبەرەكی ئاكنجیبووینە نێزیكی (١٧٪)ێ ژ رووبەرێ پارێزگەهێ یە، و ل ڤێرێ ژنوی رێژەیا رووبەرێ هەرێمێ ژ رێژەیا ئاكنجیێن پارێزگەهێ پتر لێ دهێت. لێ سەرەرای ڤێ چەندێ ئەڤ بوارە دهێتە هژمارتن پترین هەرێما گونجاندن دناڤبەرا ئاكنجی و رووبەرێ وێدا هەی.

٥- هەرێما چڕییا وێ گەلەك نزم، ئەڤ بوارە دەڤەرێن دی یێن پارێزگەهێ بخۆڤە دگریت كو نێزیكی نیڤەكا یەكەیێن كارگێری یێن دكەڤنە دناڤ هەرێما چیایی دا بخۆڤە دگریت، ژبەر ڤێ چەندێ ئەڤ هەرێمە نێزیكی (٩٠٪)ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ هەرێما چیایی و (٦١,٨٪)ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ پارێزگەهێ پێكدئینیت. ل دەمەكی كو رێژەیا ئاكنجییان ل سەر ڤێ هەرێما بەرفرەهـ ناگەهیتە پتر ژ (١٥,٧٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاكنجیێن پارێزگەهێ. سەرەرای نەبوونا چ گونجاندن یان نێزیكبوونان دناڤبەرا رێژەیا ئاكنجی و رووبەرێ ڤێ هەرێمێ دا، لێ ئاستێ چڕیی گەلەك یێ كێمە ب رەنگەكی كو تێكرایێ چڕییا گشتی پتر نینە ژ (٢٤,٨ كەس/كم٢) لێ ئاستێ چڕیێ ب هندەك ناحیان گەلەك كێمتر لێ دهێت ژ تێكرایێ گشتی، بۆ نموونە چڕییا ئاكنجییان ل ناحیا باتیلێ (٦,٣ كەس/كم٢) و ل ناحیا كانی ماسێ (١٢,٣ كەس/كم٢).

لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ وێنەیێ دابەشبوونا چڕییا ئاكنجییان گەلەك هاتییە گوهۆرین ژ وێنەیێ سالا (٢٠٠٦)ێ، ب هاریكارییا نەخشەیێن دابەشبوونا ژمارەیی و رێژەیی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ و نەخشەیێن (٢١) و(١٦) و نەخشەیێ دابەشبوونا چڕیێن ئاكنجییان نەخشەیێ (٢٨)، ئەم دشێن تێبینییا سێ هەرێمان یان بوارێن ژێكجودا یێن چڕیێن ئاكنجییان بكەین (تەماشەی خشتەیێ (٢٧) بكە) ئەوژی ئەڤەنە:-

١- هەرێم یان بوارێ چڕییا وێ گەلەك بلند، ل ڤێ هەرێمێ هژمارەكا مەزن یا خەلكی لێ ئاكنجیبووینە وەك ناحیێن دهـۆك و زاخۆ، سەرەرای بچویكاتییا رووبەرێ وێ لێ تێكرایێ

**خشتەیێ (٢٦)**

**هەرێمێن سەرەكی یێن چڕییا ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ٢٠٠٦**

| هەرێم | تێكرایێ چڕییا گشتی كەس/كم٢ | رێژەیا رووبەرێ هەرێمێ | رێژەیا ئاكنجیێن هەرێمێ | هژمارا ناحییان |
|---|---|---|---|---|
| هەرێما چڕییا وێ گەلەك بلند | ٩٩٢,٨ | ٤,١ | ٤١,٩ | ٢ |
| هەرێما چڕییا وێ بلند | ٣٠٤ | ٢,٨ | ٧,٦ | ٢ |
| هەرێما چڕییا وێ ناڤنجی | ١٣٨,٦ | ١٤,٧ | ٢١ | ٤ |
| هەرێما چڕییا وێ نزم | ٧٢,٥ | ١٧ | ١٣,٨ | ٣ |
| هەرێما چڕییا وێ گەلەك نزم | ٢٤,٨ | ٦١,٨ | ١٥,٧ | ٩ |

ژێدەر: داتایێن بەرنامێ (ArcGIS٩,٣) و نەخشەیێن (١١) و(١٥) و (٢٧) .

چڕيا گشتی گەلەك يا بلندە كو د گەهيتە (٣٨٤٩,٤ كەس/كم٢)، هەرديسان جوداهييەكا مەزن د چڕيا ڤان هەردو ناحيان دا هەيە ب رەنگەكی كو چڕيا گشتی ل سەنتەرێ قەزا زاخۆ پترە ژ (١٠٠٠٠ كەس/كم٢) لێ ئەڤ چڕييە ل قەزا دهۆكێ د گەهيتە (٢٧٦٠ كەس/كم٢)، ئەڤ هەرێمە پترى سێيكا ئاكنجيێن پارێزگەهێ ب رێژەيا (٣٩,١٪)ێ پێكدئينيت كو خەلكێ وێ ل سەر رووبەرێ (١٢٠ كم٢) ئاكنجيبوينە و ئەڤەژێ بتنێ (١,١٪)ێ ژ رووبەرێ گشتی يێ پارێزگەهێ يە، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ئاستێ چڕيێ گەلەك يێ لێ بلندە.

٢- هەرێم يان بوارێ چڕيا وێ ناڤنجی، ئەڤ هەرێمە هندەك دەڤەرێن نە پێكڤەگرێدايى بخۆڤە دگريت ب رەنگەكی كو دەڤەرێن وێ ل سەر دو تەوەران دابەشبووينە، تەوەرێ ئێكێ هندەك دەڤەرێن قەزا ئاكرێ و بەردەڕەش و شێخان و ب تايبەتژێ ناحيا سەنتەرێ قەزا ئاكرێ و بەردەڕەش و قەسرۆكێ بخۆڤە دگريت، تەوەرێ دووێ سەنتەرێ ناحيا دهۆك و بەرەڤ رۆژئاڤايى ناحيا سەنتەرێ قەزا سێمێل و ناحيا فەيديێ بخۆڤە دگريت، سەرەراى ناڤكرنا وێ ب هەرێما چڕى ناڤنجی، لێ تێكرايێ چڕيا گشتی يا وێ گەلەك يا دوورە ژ تێكرايێ هەرێما ئێكێ ب رەنگەكی كو رێژەيا دناڤبەرا واندا پتر نينە ژ (٦,٦٪)ێ و چڕيا گشتی لێ د گەهيتە (٢٥٤,٥ كەس/كم٢). ئەڤ هەرێمە نێزيكی چارێكا ئاكنجيێن پارێزگەهێ ب رێژەيا (٢٤,٤٪)ێ پێكدئينيت كو ل سەر رووبەرەكی ئاكنجيبووينە نێزيكی دەهێكا رووبەرێ (١٠,٥٪)ێ پارێزگەهێ يە، ئەڤ چەندە دەربرينێ ژ جۆرەكێ لێكنێزيكبوون و هەڤسەنگيێ دناڤبەرا رێژەيا ئاكنجی و رووبەرێ هەرێمێ دا ب هەڤبەركرن دگەل هەرێما ئێكێ.

٣- هەرێم يان بوارێ چڕيا وێ گەلەك نزم، ئەڤ هەرێمە پتريا پەكەيێن كارگێرى كو نێزيكی (٢٢) يەكەيان بخۆڤە دگريت، سەرەراى مەزناهيا رووبەرێ ڤێ هەرێمێ كو د گەهيتە (٩٥٦٠ كم٢) و رێژەيا (٨٨,٤٪)ێ ژ رووبەرێ گشتی يێ پارێزگەهێ، لێ ئاستێ چڕيا گشتی گەلەك يا كێمە ب چ رەنگان ناهێتە هەڤبەركرن دگەل هەردو هەرێمێن بەرى نوكە، تێكرايێ چڕيێ لێ د گەهيتە (٤٥ كەس/كم٢) و ئەڤ بوارە نێزيكی (٣٦,٥٪)ێ ژ سەرجەمێ ئاكنجيێن پارێزگەهێ پێكدئينيت.

ژ ئەڤا بەرى نها ژبۆ مە دياردبيت ئاستێن چڕيا ئاكنجيان گەلەك يێ كێمە ل وان ناحيێن سرۆشتێ

**خشتەيێ (٢٧)**

**هەرێمێن سەرەكی يێن چڕيا ئاكنجيان ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ٢٠٠٩**

| هەرێم | تێكرايێ چڕيا گشتی كەس/كم٢ | رێژەيا رووبەرێ هەرێمێ | رێژەيا ئاكنجيێن هەرێمێ | هژمارا ناحيان |
|---|---|---|---|---|
| هەرێما چڕيا وێ گەلەك بلند | ٣٨٤٩,٤ | ١,١ | ٣٩,١ | ٢ |
| هەرێما چڕيا وێ ناڤنجی | ٢٥٤,٥ | ١٠,٥ | ٢٤,٤ | ٥ |
| هەرێما چڕيا وێ گەلەك نزم | ٤٥ | ٨٨,٤ | ٣٦,٥ | ٢٢ |

ژێدەر: داتايێن بەرنامێ (ArcGIS٩,٣) و نەخشەيێن (١٢) و(١٦) و(٢٨)

وێ چیایی ل دەڤەرێن باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ، ب رەنگەکی کو ئالۆزیا جوگرافی بەرەڤ ڤی لایێ زێدە دبیت، لێ بەروڤاژی ئاستێن چڕییێ ل دەڤەرێن باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ پارێزگەهێ بەرەڤ زێدەبوونێ نە، کو ئالۆزیا جوگرافی ژی ل ڤان دەڤەران بەرەڤ کێمبوونێ یە و عەردێ وێ هێدی هێدی دبیتە دەشت، لێ ئەڤ چەندە نە یاسایەکا گشتی یە، ب رەنگەکی کو عەردێ ژبۆ کشتوکالی باش و دابەشبوونا کۆمەڵگەهێن ئاکنجیبونێ ل سەر دەڤەرەکا بەرفرەهـ چڕیا ئاکنجیبوونێ ل ناحیێن بجێل و گردەسین و بەردەڕەش ل قەزا ئاکرێ و ناحیا باتێلێ ل قەزا سێمێلێ کێمبوویە. دیار دبیت کو بلندترین چڕی ل وان ناحیان هەیە یێن خودان بها و گرنگییەکا کارگێری و چەند ئەم ژ ڤان ناحیان دوورکەڤین چڕیا ئاکنجییان ژی بەرەڤ کێمبوونێ دچیت، سەرەرای وێ گوهۆڕینا مەزن دناڤبەرا وێنەیێ چڕیا ئاکنجییان ل سالا (٢٠٠٦)ێ و (٢٠٠٩)ێ لێ دهێتە تێبینیکرن کو حەزەکا مەزن هەیە بۆ ئاکنجیبونێ ل هندەك یەکەیێن جهی یێن دەستنیشانکری ب تایبەت ژی ناحیێن دهۆك و زاخۆ.

## سێ: دابەشبوونا ژمارەیی و رێژەیی یا ئاکنجییێن گوند و باژێران

### أ- دابەشبوونا ژمارەیی دناڤبەرا ئاکنجییێن گوند و باژێران

وێنەیێ دابەشبوونا جوگرافی یێ ئاکنجییان دناڤبەرا دەڤەرێن گوند وباژێران ل پارێزگەها دهۆکێ رەنگڤەدانا سرۆشتێ زێدەبوونا قەبارەیێ ئاکنجییان و پیڤەرێن زێدەبوونا وان ل ڤان دەڤەران خویا دکەت، ل دەمەکی کو سیفەتێن ڤی وێنەی و ئەو فاکتەرێن ل پشت هەین د ژێکجودا نینن بتنێ د هندەك پشکێن بچویك یێن وێنەیێ دابەشبوونا جوگرافی یێ گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێ نەبیت د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلینێ دا، لەورا مە نەڤێت دوبارە بچینە دناڤ هووردەکارییێن وێنەیێ دابەشبوونێ داکو ئەو تشتێ مە ل بەشێ دووێ ئاماژە پێکری نەهێتە دوبارەکرن، بتنێ دێ داکۆکیێ ل هندەك سیفەتێن پارچەیی یێن بچویك کەین کو پەیوەندی ب سرۆشتێ دابەشبوونا ئاکنجییان دناڤبەرا گوند و باژێراندا هەیە، ل ژێر سیبەرا نەخشەیێن (٢٩) هەتا (٣٦) ئەم دشێین تێبینیا ڤان خالان بکەین:-

١) ئەو خالێن پەیوەندی ب سرۆشتێ دابەشبوونا ئاکنجییێن گوندان ڤە هەی، دووپاتێ ل سەر ڤان خالان دکەت:

أ- جۆرەکێ هەڤسەنگیێ د سرۆشتێ دابەشبوونا ئاکنجییێن گونداندا د ماوەیێ دەستپێکی یێ ڤەکۆلین هاتییەکرن (١٩٤٧، ١٩٥٧) هەیە.

ب- ل سالا (١٩٦٥)ێ ژبەرێکچوون یان کێمبوونەکا ئاشکەرا یا ئاکنجییان ل دەڤەرێن گوندان هەیە ب هەڤبەرکرن دگەل سالێن بەری هینگێ، ئەو ژی ژ ئەنجامێ کێمبوونا قەبارەیێ ئاکنجییێن گوندان ژ سەدەما شاشیێن پەیدابووین د سەرژمێریا وێ سال دا.

ت- مەزنترین حالەتێ تێکچوونا قەبارەیێ ئاکنجییێن گوندان ل داویا سالێن (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ پەیدابوو ب تایبەت ل ناحیێن قەزا دهۆك و زاخۆ و ئامێدیێ هەتا هندەك ناحی ژ ئاکنجییان ڤالا بووین وەك ناحیێن کانی ماسێ و سەرسنك و دەرکار و گولی و مانگێشکێ (تەماشەی نەخشەیێ (٣٣) بکە).

پ- پتریا ناحیێن قەزا ئاکرێ حالەتێ خۆ یێ هەڤسەنگیێ د زێدەبوون و دابەشبوونا ئاکنجییێن گوندان دا ب درێژاهیا سالێن ڤەکۆلینێ پاراست ب تایبەت پشتی سالا (١٩٧٧)ێ، دگەل ئاکنجیبوونا خەلکی ل گوندان ل ڤان سالێن داویێ ئەو ژی ژبەر سرۆشتێ کشتوکالی یێ ڤێ قەزایێ.

٢) ئەو خالێن پەیوەندی ب سرۆشتێ دابەشبوونا

ئاكنجییێن بازێران ڤە هەی، دوویاتیێ ل سەر ڤان خالان دكەت:

أ- شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجییان ل دەستپێكا ماوەیێ ڤەكۆلین ل سەرهاتییەكرن پتر یێ هەڤسەنگ بوو هەروەكی شێوزاێ دابەشبوونا ئاكنجییێن گوندان.

ب- شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجییێن بازێران ئاراستەكێ جودا بخۆڤە دیتییە ب تایبەت پشتی سالا (١٩٧٧)ێ، بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ژی بلندبوونا تێكرایێ زێدەبوونا سالانە د ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٧٧-١٩٨٧)ێ كو بلندترین بها هاتییە تووماركرن دناڤ تێكراییێن زێدەبوونا ئاكنجییێن بازێران دا ل ماوەیێ سالێن ڤەكۆلین ل سەرهاتییەكرن.

ت- بەرچاڤترین ساخلەتێ شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجییێن بازێران ئەوە كو دیاردا چربوونەكا مەزن یا ئاكنجییان لێ هەیە ب تایبەت پشتی سالا (١٩٧٧)ێ، ل هندەك یەكەیێن كارگێری یێن تایبەت وەك سەنتەرێ ناحیێن دهۆك و زاخۆ بەلگەژی ل سەر ڤێ چەندێ زێدەبوونا هژمارا وان گرۆپانە یێن ئاكنجییێن بازێری سال بۆ سال ل سەر دابەش دبن زێدەباری زێدەبوونا قەبارەیێ ڤالاهییا دناڤبەرا بهایێ بلند یێ بلندترین گرۆپ و نزمترین گرۆپ ل هەر سالەكێ (تێبینی و هەڤبەركرنێ بكە دناڤبەرا گرۆپێن دابەشبوونا ئاكنجییێن بازێران دناڤ نەخشەیێن (٢٩) تا (٣٦).

ئەم دشێین بێژین كو شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجییان دناڤبەرا گوند و بازێران ژ لایێ جهی ڤە گوهۆرینێن مەزن ب سەردا هاتینە هەر ژ دەستپێك هەتا داوییا ماوەیێ ڤەكۆلین ل سەرهاتییەكرن، ئەو ژی ژبەر كۆمەكا فاكتەرێن سرۆشتی و ئابووری و سیاسی، ژبلی ڤێ چەندێ جوداهییا جهی یا بهێز د شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجییێن بازێراندا پتر یا رۆهن و ئاشكەرا و خودان هندەك سیفەتێن بەرچاڤ بوو ب هەڤبەركرن دگەل شێوازێ دابەشبوونێ ل گوندان.

**نەخشەیێ (٢٩)**

**دابەشبوونا ئاكنجییێن گوند و بازێران ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٤٧**



خشتەیێ (٣٠)

دابەشبوونا ئاکنجیێن گوند و بازێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٥٧




خشتەیێ (٣١)

دابەشبوونا ئاکنجیێن گوند و بازێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٦٥



خشتەیێ (٣٢)

دابەشبوونا ئاکنجیێن گوند و باژێران باژێران ل پارێزگەھا دهۆکێ ل سالا ١٩٧٧




خشتەیێ (٣٣)

دابەشبوونا ئاکنجیێن گوند و باژێران ل پارێزگەھا دهۆکێ ل سالا ١٩٨٧



خشتەیێ (٣٤)
دابەشبوونا ئاکنجیێن گوند و بازێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٩٦




خشتەیێ (٣٥)
دابەشبوونا ئاکنجیێن گوند و بازێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٦



خشتەیێ (٣٦)
دابەشبوونا ئاکنجییێن گوند و باژێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٩




## ب- دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجییێن گوند و باژێران

ئەو ئاراستە و ئاستێن گەشەکرنێ یێن ئاکنجییێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییەکرن کارتێکرنەکا مەزن ل سەر پێشکەفتنا دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجییان دناڤبەرا دەڤەرێن گوند و باژێران هەیە دگەل هەبوونا هندەك جوداهییان د ئاستێن ڤان دەڤەراندا د هەر یەکەیەکا جهی دا. ب هاریکارییا هەردو نەخشەیێن (٣٧) و (٣٨) و داتایێن خشتەیێ (٢٨) یێن کو پەیوەندی ب رۆهنکرنا سەنگییا رێژەیی یا ئاکنجییێن گوند وباژێران ل پارێزگەهێ هەی ب هەڤبەرکرن دگەل پارێزگەهێن دەوروبەر دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧- ٢٠٠٩)ێ دا ئەڤ راستییە بۆ مە دیاردبن:-

١. بلندبوونا پەیدابووی د رێژەیا ئاکنجییێن باژێران ل پارێزگەهێ دگەل بۆرینا دەمی وەکی یێن هەردو پارێزگەهێن هەولێر و سلێمانیێ بوویە، لێ هەکە دگەل پارێزگەهێن کەرکۆك و نەینەوا هەڤبەربکەین، دێ دیاربیت کو ئەڤ هەردو پارێزگەهێن داویێ کێمبوونەکا بەرچاڤ د رێژەیا ئاکنجییێن باژێرێن واندا دیاربوویە ب تایبەت ئەگەر هەڤبەربکەین دگەل سەرجەمێ ئاکنجییێن باژێرێن دەوروبەری وان، ئەڤ چەندەژی بەلگەیە ل سەر هێز و کارتێکرنا دیاردا باژێربوونێ ل پارێزگەهێن دهۆك و هەولێر و سلێمانیێ.

٢. بلندبوونا رێژەیا ئاکنجییێن باژێران ل پارێزگەهێ ب شێوەیەکێ بەرچاڤ دناڤبەرا ماوەیێ دەستپێك و داوییا سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییە ئەنجامدان، ب رەنگەکی ئەڤ رێژەیە ل سالا (١٩٤٧)ێ (٣,٤٪)ێ بوو لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ گەهشتییە (١٣,٨٪)ێ .

٣. جوداهییا زێدەبوونێ دناڤبەرا رێژەیێن ئاکنجییێن

**خشتەیێ (٢٨)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا قەبارەیێ ئاکنجییێن گوند وبازێرێن پارێزگەهێن باکووری (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| | دهۆك | | هەولێر | | سلێمانی | | کەرکووك | | نەینەوا | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند |
| ١٩٤٧ | ٣,٤ | ١١,٦ | ١٢,٤ | ٢١,٧ | ١٤ | ١٩,٥ | ٢٣,٦ | ٢١,٩ | ٤٦,٦ | ٢٥,٣ |
| ١٩٥٧ | ٤,٢ | ١٠,١ | ١٢,٧ | ١٧,٥ | ١٣,٨ | ١٩,٦ | ٢٦,٤ | ٢٠,٦ | ٤٢,٩ | ٣٢,٢ |
| ١٩٦٥ | ٥,٧ | ٧,٧ | ١٤,٨ | ١٨,٣ | ١٤,١ | ٢٢,٤ | ٢٥,٧ | ١٩,٩ | ٣٩,٧ | ٣١,٧ |
| ١٨٧٧ | ٦,٥ | ١٠,١ | ١٧,٣ | ١٧,٩ | ١٩,٥ | ٢٥,٨ | ٢٠,٨ | ١٠,٥ | ٣٥,٩ | ٣٥,٧ |
| ١٩٨٧ | ٧,٤ | ٦,٥ | ٢٠,٢ | ١٥,٢ | ٢٣,١ | ٢٣,٦ | ١٥,٤ | ١٢,٩ | ٣٣,٩ | ٤١,٨ |
| ١٩٩٧ | ٧,٧ | ٥,٩ | ٢١,٦ | ١٤,٢ | ٢٤,٩ | ٢٢,٣ | ١٣,٥ | ١٢,٨ | ٣٢,٣ | ٤٤,٨ |
| ٢٠٠٦ | ١٢,١ | ٩ | ٢١,٣ | ١٤,٥ | ٢٤,١ | ٢٢,١ | ١١,٥ | ١١,١ | ٣١ | ٤٣,٣ |
| ٢٠٠٩ | ١٣,٨ | ١٣,٧ | ٢١,٨ | ١٥,٩ | ٢٥,٤ | ١٠,٨ | ٦,٣ | ١٤,٨ | ٣٢,٧ | ٤٤,٨ |

**ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاکنجییان ل پارێزگەهان د ماوەیێ سالێن دەستنیشانکری دا.**

**نەخشەیێ (٣٧)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجییێن بازێران ل پارێزگەهێن باکوور (١٩٤٧-٢٠٠٩)**



**نەخشەیێ (٣٨)**
**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن گوندان ل پارێزگەهێن باکوور (١٩٤٧-٢٠٠٩)**




بازێران پارێزگەهێن دهۆك و هەولێر و سلێمانیێ دناڤبەرا دەستپێك و داویا ماوەیێ ڤەکۆلینێ ب ڤی رەنگی بوون (١٠,٤٪)ێ ، (٩,٤٪)ێ ، (١١,٤٪)ێ ل دووڤ ئێك، لێ د هەمان دەمدا ڤێ رێژەیێ بهایەکێ نەرێنی ل هەردو پارێزگەهێن کەرکووك و نەینەوا توومارکر ئەو ژی (-١٧,٣٪)ێ و (-١٣,٩٪)ێ ل دووڤ ئێك.

٤. ل دەستپێکا ماوەیێ ڤەکۆلینێ جوداهییەك دناڤبەرا رێژەیا ئاکنجیێن گوندێن پارێزگەهێ دگەل سەرجەمێ گشت ئاکنجیێن گوندێن پارێزگەهێن دەوروبەر هەیە، ئەڤ رێژەیە (١١,٦٪)ێ و (١٣,٧٪)ێ بوون ل سالێن (١٩٤٧)ێ و (٢٠٠٩)ێ ل سالێن (١٩٩٧)ێ و (١٩٨٧)ێ کێمبوویە بۆ (٥,٩٪)ێ و (٦,٥٪)ێ ل دووڤ ئێك.

دەربارەی سرۆشتێ گەشەکرنا دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن گوند وبازێران ل سەر ئاستێ یەکەیێن جهی، ئەم دشێن تێبینیا ڤان خالان بکەین:-

١) وێنەیێ دابەشبوونێ دناڤبەرا دەستپێك و داویا ماوەیێ ڤەکۆلینێ ب ئێکجاری هاتییە گوهۆرین، ل دەمەکی کو ل سالا (١٩٤٧)ێ رێژەیا ئاکنجیێن بازێری بتنێ (١٢٪)ێ بوو بەرامبەر (٨٨٪)ێ یا ئاکنجیێن گوندان، لێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ ئەڤ رێژەیە گەلەك بلندبوویە تا وی رادەیی گەهشتییە سێ چارێکێن ئاکنجیێن پارێزگەهێ ب رێژەیا

(٧٤,٤٪)ێ ژ سەرجەم ئاكنجیێن پارێزگەهێ و نێزیكی دوسێكان ل سالا (٢٠٠٩)ێ، كو گەهشتییە (٧٠,٧٪)ێ (تەماشەی خشتەیێ (٢٩) و وێنەیێ (١١) بكە).

٢) سرۆشتێ دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجییان هەڤسەنگیەك دناڤبەرا دەڤەرێن گوند و باژێران پارێزگەهێ ل ناڤەراستا ماوەیێ ڤەكۆلینێ ل سالا (١٩٧٧)ێ بخۆڤە دیتییە، دگەل زێدەبوونەكا بچویك د بەرژەوەندییا دەڤەرێن گوندان.

٣) ڤالاهییا دناڤبەرا رێژەیا ئاكنجیێن دەڤەرێن گوند وباژێران ل سالا (١٩٧٧)ێ كێمبوویە، لێ ل سالا (١٩٨٧)ێ دوبارە ئەڤ ڤالاهییە بەرفرەهبوویە كو ل باژێران گەهشتییە (٧٤,٦٪)ێ ل بەرامبەری وێ ل گوندان گەهشتییە (٢٥,٤٪)ێ و ئەڤ رێژەیە هەتا سالا (٢٠٠٩)ێ وەكی خۆ ماینە.

٤) دەربارەی گەشەكرنا دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجییان دناڤبەرا دەڤەرێن گوند و باژێران ل سەر ئاستێ قەزایان د ماوەیێ ڤەكۆلینێ دا (تەماشەی خشتەیێ (٣٠) بكە، ئەم دشێین تێبینیا ڤان خالان بكەین:-

أ- چ جوداهی دناڤبەرا گەشەكرنا وێنەیێ دابەشبوونا ئاكنجیێن گوند وباژێران ل قەزایێن (دهۆك، ئامێدی، زاخۆ و سیمێل) دا نینە ژ هەڤشێوەییێن وان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ.

ب- وێنەیێ دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجییان ل قەزا ئاكرێ ژ دو لایاڤە حالەتەكێ ئێكانە بخۆڤە دیتییە كو یێ جودایە ژ وێنەیێ هەمی قەزایێن دی، لایێ ئێكێ پەیوەندی ب سرۆشتێ گوهۆرینێ د رێژەیا وێدا هەیە ب رەنگەكی كو رێژەیا ئاكنجیێن باژێری ل سالا (١٩٤٧)ێ نێزیكی (٢١٪)ێ بوو لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ ئەڤ رێژەیە گەهشتییە (٤٤,٩٪)ێ ، هەردیسان رێژەیا ئاكنجیێن گوندان ل سالا (١٩٤٧)ێ یا بلندبوو كو (٧٨,٧٪)ێ بوو لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ كێمبوویە بۆ (٥٥,١٪)ێ . لایەنێ دوێ ژی پەیوەندی ب سرۆشتێ دابەشبوونێ ڤە هەیە كو ل دەڤەرێن گوندنشین بەردەوام رێژەكا مەزن هەبوویە ژ سەرجەمێ گشت ئاكنجیێن قەزایێ ب درێژاهییا ماوەیێ ڤەكۆلینێ، ئەڤەژی بەروڤاژی وێنەیێ دابەشبوونێ یە ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ و قەزایێن دی، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ سرۆشتێ كشتوكالی یێ دەڤەرێ و كاودانێن ئێمناهیێ یێن جێگیر یێن ڤێ قەزایێ د زڤڕیت.

ت- وێنەیێ دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجییان دناڤبەرا گوند و باژێران ل قەزا شێخان تا ڕادەیەكێ مەزن وەكی وێنەیێ قەزا ئاكرێ یە، لێ رێژەیا ئاكنجیێن باژێری گوهۆرینەكا بچویك د ڤان سالێن داویێ دا بخۆڤە دیتە ئەو ژی ژبەر سرۆشتێ ژیانا هەڤچەرخ ل سنوورێ قەزا شێخان.

**خشتەیێ (٢٩)**
**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجییان دناڤبەرا گوند و باژێران ل پارێزگەها دهۆكێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | ئاكنجیێن ٪ باژێران | ئاكنجیێن ٪گوندان |
|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ١٢ | ٨٨ |
| ١٩٥٧ | ١٧,٣ | ٨٢,٧ |
| **١٩٦٥ | ٣٥,٥ | ٦٤,٥ |
| ١٩٧٧ | ٤٢,٩ | ٥٧,١ |
| ١٩٨٧ | ٧٤,٦ | ٢٥,٤ |
| **١٩٩٦ | ٧٤,٦ | ٢٥,٤ |
| **٢٠٠٦ | ٧٤,٤ | ٢٥,٦ |
| ٢٠٠٩ | ٧٠,٧ | ٢٩,٣ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاكنجییان ل پارێزگەهان د ماوەیێ سالێن دەستنیشانكری دا

**وێنەیێ (١١)**

**گەشەکرنا دابەشبوونا رێژەیی یا یا ئاکنجییان دناڤبەرا گوند و بازێران ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**




**خشتەیێ (٣٠)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن گوند و بازێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سەر ئاستێ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٦)**

| سال | دهۆك | | ئامێدی | | زاخۆ | | شێخان | | سێمێل | | بەردەرەش | | ئاکرێ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند | بازێر | گوند |
| ١٩٤٧ | ٢١,٧ | ٧٨,٣ | ٧,٤ | ٩٢,٦ | ٢٠,٥ | ٧٩,٥ | ٢٣,٢ | ٧٦,٨ | - | - | - | - | ٢١,٢ | ٧٨,٨ |
| ١٩٥٧ | ٢٥,٥ | ٧٤,٥ | ٨,٩ | ٩١,١ | ٢٠,٨ | ٧٩,١ | ١٩,٤ | ٨٠,٦ | - | - | - | - | ١٦ | ٨٤ |
| ١٩٦٥ | ٥٥,٢ | ٤٤,٨ | ١١,٨ | ٨٨,٢ | ٤٨,٣ | ٥١,٧ | ٢٧ | ٧٣ | - | - | - | - | ٢٧,٧ | ٧٢,٣ |
| ١٩٧٧ | ٤٩,٧ | ٥٠,٣ | ٢٢,٤ | ٧٧,٦ | ٥٣,٦ | ٤٦,٤ | ١٨ | ٨٢ | - | - | - | - | ١٧,٧ | ٨٢,٣ |
| ١٩٨٧ | ٨٨,٨ | ١١,٢ | ٤٦,٥ | ٥٣,٥ | ٨٣,٤ | ١٦,٦ | ١٧,١ | ٨٢,٩ | ٣٧,٨ | ٦٢,٢ | - | - | ٢٣ | ٧٧ |
| ١٩٩٦ | ٨٢ | ١٨ | ٢٦,٨ | ٧٣,٢ | ٧٢,٦ | ٢٧,٤ | ٢٢,٨ | ٧٧,٢ | ٢٩,٤ | ٧٠,٦ | - | - | ٢٢,٩ | ٧٧,١ |
| ٢٠٠٦ | ٩٤ | ٦ | ٦١,١ | ٣٨,٩ | ٨٧,١ | ١٢,٩ | - | - | ٩٣,١ | ٦,٩ | - | - | ٣١ | ٦٩ |
| ٢٠٠٩ | ٩٥,٤ | ٤,٦ | ٦٧,٦ | ٣٢,٤ | ٨٩,٨ | ١٠,٢ | ٣٣,١ | ٦٦,٩ | ٧٦,٨ | ٢٣,٢ | ٣٣,٤ | ٦٦,٦ | ٤٤,٩ | ٥٥,١ |

**ژێدەر: سەرژمێریاری و هەڵسەنگاندنێن ئاکنجییان ل پارێزگەهان د ماوەیێ سالێن دەستنیشانکری دا.**

٥) دەربارەی سروشتێ دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن گوند و باژێران ل سەر ئاستێ قەزایان (تەماشەی خشتەیێن (٣١) و (٣٢) و وێنەیێن (١٢) و (١٣) بكە) ئەم دشێین تێبینیا ڤان خالان بكەین:-

أ- ب درێژاهییا سالێن ڤەكۆلین ل سەر هاتییەكرن، قەزا دهۆكێ خودانا مەزنترین رێژەیا ئاكنجیێن باژێری بوویە ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، ئەڤ رێژەیە ل سالێن (١٩٨٧، ١٩٩٦)ێ دوجاركی لێهاتییە، لێ ل سالێن (٢٠٠٦) و (٢٠٠٩)ێ بەرەڤ كێمبوونێ چوویە و گەهشتییە (٣٦,٦٪)ێ و (٣٥,٩٪)ێ ئەڤ كێمبوونەژی د بەرژەوەندیا قەزایێن سێمێل و ئامێدی و شێخان و بەردەڕەش دا بوویە، ئەگەرێ ڤێ پاشڤەزڤرینێ ژی بۆ رۆلێ فاكتەرێ كارگێری د زڤریت كو هندەك ژ سەنتەرێن ڤێ قەزایێ هاتینە ڤەگوهاستن بۆ سەر وان قەزایێن ژنوی دروست بووین.

**خشتەیێ (٣١)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ل سەر ئاستێ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| قەزا | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٩٦ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ٢٦,٦ | ٢٤,١ | ٣٣ | ٤٠,٣ | ٤٧ | ٤٧,٧ | ٣٦,٦ | ٣٥,٩ |
| ئامێدی | ١٠ | ١٢,٥ | ٦,٨ | ١٣,١ | ٥,٢ | ٥,٩ | ٨ | ٧,٧ |
| زاخۆ | ٢٣,٢ | ٢٣,٨ | ٢٥,٦ | ٣١,٦ | ٢٨ | ٢٨,٤ | ٢٣,٧ | ٢٤,٦ |
| شێخان | ١٨,٢ | ٢١ | ١٦,٨ | ٤,٨ | ٣,٨ | ٣ | ١٠ | ٤,٩ |
| سێمێل | - | - | - | - | ٧,٥ | ٥,٧ | ١٣,١ | ١٤,٢ |
| بەردەڕەش | - | - | - | - | - | - | - | ٤,٧ |
| ئاكرێ | ٢٢ | ١٨,٣ | ١٧,٨ | ١٠,٢ | ٨,٥ | ٩,٣ | ٨,٦ | ٨ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاكنجییان ل پارێزگەهان د ماوەیێ سالێن دەستنیشانكری دا.

**خشتەیێ (٣٢)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن گوندێن پارێزگەها دهۆكێ ل سەر ئاستێ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| قەزا | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٩٦ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ٢١ | ١٤,٩ | ١٣,٦ | ٢٢,٤ | ٧,٧ | ١١,٤ | ٧,٢ | ٤,٢ |
| ئامێدی | ٢٧,٨ | ٢٧,١ | ٢٥,٧ | ٢٤,٧ | ٧,٨ | ١٧,٥ | ١٥,٧ | ٨,٩ |
| زاخۆ | ١٩,٩ | ١٩,١ | ١٤ | ١٥ | ٧,٤ | ١١,٧ | ١٠,٧ | ٦,٧ |
| شێخان | ١٣,٤ | ١٨,٣ | ٢٣,٢ | ١١,٩ | ٢٣,٧ | ١١,١ | ٥,٢ | ٢٣,٧ |
| سێمێل | - | - | - | - | ١٦ | ١٤,٥ | ٢,٩ | ١٠,٣ |
| بەردەڕەش | - | - | - | - | - | - | - | ٢٢,٥ |
| ئاكرێ | ١٧,٩ | ٢٠,٦ | ٢٣,٥ | ٢٦ | ٣٧,٤ | ٣٣,٨ | ٥٨,٣ | ٢٣,٧ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەلسەنگاندنێن ئاكنجییان ل پارێزگەهان د ماوەیێ سالێن دەستنیشانكری دا.

ب- درێژاهیا سالێن ڤەکۆلین ل سەرهاتیەکرن دیاربوویە کو رێژەیا ئاکنجیێن قەزایێن دهۆك و زاخۆ چ جاران ژ (٤٧٪)ێ نەهاتیە خوار، بەلکو ئەڤ رێژەیە ل سالا (١٩٧٧)ێ گەهشتە (٧٠٪)ێ و ل سالێن (١٩٨٧)ێ و (١٩٩٦)ێ ژی گەهشتییە (٧٥٪)ێ و (٧٦,١٪)ێ ، لێ دوبارە ل سالێن (٢٠٠٦)ێ و (٢٠٠٩)ێ هاتییە خوار بۆ (٦٠,٣٪)ێ و (٦٠,٦٪)ێ ل دووڤ ئێك.

ت- جارەکا دی قەزا ئاکرێ حالەتەکێ ئێکانە دیار دکەت ژبەرکو رێژەیا ئاکنجیێن باژێرێن وێ نێزیکی دو سێیکان ٢/٣ کێمبوویە، ژبەرکو رێژەیا وێ ل سالا (١٩٤٧)ێ (٢٢٪)ێ بوو لێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ کێمبوویە بۆ (٨٪)ێ ، بەرامبەری وێ رێژەیا ئاکنجیێن گوندێن وێ د هەمان دەمدا نێزیکی دو سێیکان زێدەبویە ژبەرکو ل سالا (١٩٤٧)ێ رێژەیا وێ (١٧,٩٪)ێ بوو لێ ئەڤ رێژەیە ل سالا (٢٠٠٦)ێ گەهشتییە (٥٨,٣٪)ێ.

پ- سەرەرای زێدەبوونا ئاکنجیێن قەزا دهۆکێ ل دەڤەرێن باژێری ب درێژاهیا ماوەیێ ڤەکۆلینێ، لێ رێژەکا مەزن ژ ئاکنجیێن گوندێن خۆ ب رێژەیا (١٣,٨٪)ێ ژ سەرجەمێ رێژەیا (٢١٪)ێ ل سالا (١٩٤٧)ێ ژ دەستدایە، تا ل سالا (٢٠٠٩)ێ گەهشتییە (٤,٢٪)ێ ، هەلبەت ئەڤ کێمبوونە ژی د بەرژەوەندیا قەزایێن ئاکرێ و شێخان و سێمێلێ دابوویە، لێ کێمبوونا دیار د رێژەیا ئاکنجیێن گوندێن قەزایێن دی د بەرژەوەندیا قەزا دهۆکێ دابوویە ب تایبەت ل سالێن (٢٠٠٦)ێ و (٢٠٠٩)ێ، گەلەك ئەگەر ژی ل پشت ڤێ چەندێ هەبوون و بێن ژ هەمیان دیارتر مشەختبوونا خەلکی ژ دەڤەرێن گوندان بۆ باژێران، زێدەباری فاکتەرێن سیاسی و گوهۆرینێن کارگێری ب رەنگەکی کو گەلەك کۆمەڵگەهێن گوندنشین بووینە سەنتەرێن باژێران.

**وێنەیێ(١٢)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن باژێران ل پارێزگەها دهۆکێ دووڤ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)**



وێنەیێ(١٣)
دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجییێن گوندێن پارێزگەها دهۆکێ دووڤ قەزایان (١٩٤٧-٢٠٠٩)




ج- ب درێژاهییا ماوەیێ ڤەکۆلینێ، قەزا شێخان کێمترین جوداهیێ د رێژەیا ئاکنجییێن ویدا پەیدابوویە ڤێجا چ ل سەر ئاستێ گوندان یان باژێران وێ بیت.

٦) وێنەیێ دابەشبوونا رێژەیی یێ ئاکنجییێن گوند و باژێران ل سەر ئاستێ یەکەیێن کارگێری یێن بچویک وەک ناحیان پتر جوداهی تێدا دیاربووینە، ب هاریکاریا داتایێن خشتەیێن (٣٣) و (٣٤) نەخشەیێن (٣٩) تا (٤٤)، ئەم دشێن تێبینیا ڤان راستیان بکەین:-

أ- ب بۆرینا دەمی ئاستێن چڕبوونا رێژەیی یا ئاکنجییێن باژێران ب شێوەیەکێ بەرچاڤ زێدەبوونە، ب تایبەت ل سەنتەرێ ناحیێن دهۆک و زاخۆ، لێ ئەڤ رێژە ل هندەک ناحیێن دی کێمبوویە وەک ناحیێن ئاکرێ و شێخان، ل بەرامبەری وی ئاستێن چڕیا ئاکنجییێن گوندان ل هندەک ناحیان زێدەبووینە ب تایبەت ئەو ناحیێن سەر ب قەزا ئاکرێ ڤە و ئەڤ رێژەیە ل هندەک ناحیێن دی کێمبوویە وەک سەنتەرێ ناحیێن سەرسنک و دهۆک و ئامێدیێ.

ب- ب هاریکاریا بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ بۆ دابەشبوونا رێژەیا ئاکنجییێن گوند و باژێران (تەماشەی خشتەیێ (٣٣) بکە) دیار دبیت کو جوداهی دناڤبەرا دابەشبوونا رێژەیێن ئاکنجییێن باژێران پترە ژ ئاکنجییێن گوندان ل وان سالێن د خشتەی دا دیار، ب رەنگەکێ کو بلندترین بهایێ هاوکۆلکێ جوداهیێ ل دەڤ ئاکنجییێن باژێری ل سالا (٢٠٠٦)ێ گەهشتییە (٢١٠,٩)ێ بەلێ بلندترین بهایێ ڤی هاوکۆلکەی ل سالا (١٩٨٧)ێ دەڤ ئاکنجییێن گوندان زێدەتر نەبوویە ژ (١١٢,١)ێ.

ت- مەزنترین جوداهی بۆ رێژەیێن دابەشبوونا ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل سەر ئاستێ دەڤەرێن گوند وباژێران یانژی گشت ئاکنجییان پشتی سالا (١٩٨٧)ێ دیاربوویە.

پ- بهایێ پیڤەرێن چرپیا ئاکنجییان و دوبارە دابەشکرنا وان (تەماشەی خشتەیێ (٣٤) بکە) دیاردکەت کو دیاردا چرپوونا ئاکنجییان پتر ل دەڤەرێن باژێری هەبوویە ژ دەڤەرێن گوندان، ب رەنگەکی کو بهایێ پیڤەرێ چرپیا ئاکنجییێن باژێری ل پتریا سالێن ڤەکۆلینێ گەهشتییە (٥٠٪)ێ، لێ ئەڤ بهایە ل دەڤەرێن گوندان بەرەڤ کێمبوونێ چوویە ژبلی سالێن

**خشتەیێ (٣٣)**
**پیڤەرێن جوداهییا رێژەیێن سەدی بۆ ئاکنجییان ل سەر ئاستێ ناحیێن پارێزگەها دهۆکێ(١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| ماوە | | لادانا پیڤەری | هاوکۆلکێ جوداهیێ ٪ |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٧ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٣,٥ | ٥٢,٥ |
| | باژێر | ٧,٥ | ١١٣,٦ |
| | گوند | ٣,٦ | ٥٤,٥ |
| ١٩٥٧ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٢,٧ | ٤٦,٥ |
| | باژێر | ٧,١ | ١٢٢,٤ |
| | گوند | ٣,٧ | ٦٣,٧ |
| ١٩٦٥ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٤,٩ | ٨٩ |
| | باژێر | ٨,٥ | ١٥٤,٥ |
| | گوند | ٦,٣ | ١١٤,٥ |
| ١٩٧٧ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٣,٢ | ٦١,٥ |
| | باژێر | ٨,٤ | ١٦١,٥ |
| | گوند | ٣,٥ | ٦٧,٣ |
| ١٩٨٧ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٧,٦ | ١١٥,١ |
| | باژێر | ١٢,٣ | ١٨٦,٣ |
| | گوند | ٧,٤ | ١١٢,١ |
| ١٩٩٦ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٥,٥ | ١٠٠ |
| | باژێر | ١١,٦ | ٢١٠,٩ |
| | گوند | ٣,٦ | ٦٥,٤ |
| ٢٠٠٦ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٦ | ١٢٠ |
| | باژێر | ٨,٤ | ١٦٨ |
| | گوند | ٥,٥ | ١١٠ |
| ٢٠٠٩ | سەرجەمێ ئاکنجییان | ٦,٣ | ١١٨ |
| | باژێر | ١٠,٤ | ٢٠١ |
| | گوند | ٥,٢ | ٩٩ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەڵسەنگاندنێن ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ د ماوەیێ سالێن دەستنیشانکری دا.

**خشتەیێ (٣٤)**

**پیڤەرێ چڕبوون و دوباره دابەشبوونا ئاكنجیێن گوند و باژێران ل پاریزگەها دهۆكێ (١٩٤٧-٢٠٠٩)**

| سال | پیڤەرێ چڕیێ % | | پیڤەرێ دوباره دابەشكرنێ | | قەبارەیێ ئاكنجیێن پێدڤی ب دوباره دابەشكرنا وان هەی | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | باژێر | گوند | باژێر | گوند | باژێر | گوند |
| ١٩٤٧ | ٤٨ | ١٩ | - | - | - | - |
| ١٩٥٧ | ٥٠ | ٢٤ | ٦,٥ | ٢٨,٧ | ٢٥٩٥ | ٥٤٣٦٨ |
| ١٩٦٥ | ٥٩ | ٤٥ | ١٣,٦ | ٣٢,٨ | ٨٤٦٢ | ٤٠١٦٤ |
| ١٩٧٧ | ٤٨ | ٢٦ | ٢٢,٦ | ٣٦ | ٢٨٦٥٤ | ٨٣٨٨٥ |
| ١٩٨٧ | ٥٧ | ٤٢ | ١٦ | ٤٩,٤ | ٣٩٩٠٩ | ٩٤٥٥٤ |
| ١٩٩٦ | ٦٠ | ٢٧ | ٤,٥ | ٤٧,١ | ١٦٣٧٧ | ١٥٨٣١٥ |
| ٢٠٠٦ | ٥٢ | ٣٥ | ٢٠,١ | ٢٨,٥ | ١٤٤٢٢٣ | ٦٦٦٨٥ |
| ٢٠٠٩ | ٥٤ | ٣٣ | ٢٣,٣ | ٣٠,٢ | ١٩٣٨٩٨ | ١٠٤٣٥٠ |

ژێدەر: سەرژمێریاری و هەڵسەنگاندنێن ئاكنجیيان ل پاریزگەها دهۆكێ د ماوەیێ سالێن دەستنیشانكری دا.

(١٩٦٥) و (١٩٨٧)یێ ێ كو بهایێ پیڤەرێ چڕیێ پیچەك بلند بوویە.

ج- سەرەرای بلندبوونا بهایێ پیڤەرێ چڕیێ ل دەڤەرێن باژێران ب هەڤبەركرن دگەل گوندان ل درێژاهیيا سالێن ڤەكۆلینێ، لێ بهایێ پیڤەرێن دوبارە دابەشكرنێ ل دەڤەرێن گوندان بهایەكێ ئەرێنی هەڤبەركرن دگەل باژێران هەبوویە، ئەڤ چەندەژی بەڵگەیە ل سەر رادەیێ جوداهیيا شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجیێن گوندان ژ سالەكێ بۆ ئێكا دی ئەو ژی ژ ئەنجامێ كاودانێن ئێمناهی و ئابووری و سیاسی یێن گران یێن سەر ڤان دەڤەرێن پارێزگەهێ ب گشتی و یێن گوندان ب تایبەتی دا هاتین، ل وی دەمێ دەڤەرێن باژێری ئاستێ چڕیيا ئاكنجیێن خۆ سال بۆ سال د پاراست، دەڤەرێن گوندان تووشی هندەك گوهۆرینێن ریشەیی بوون د شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجیياندا.

ژ ئەڤا بۆری رادەیێ جوداهیيا سرۆشتێ دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن گوند و باژێران ژ دەمەكی بۆ ئێكی دی ل سەر ئاستێن دەڤەرێن جوداجودا بۆ مە دیاردبیت، ژبلی هندێ ژی سرۆشتێ گوهۆرینێ ل دووڤ وان پیڤەرێن پشت بەستن ل سەرهاتییەكرن بۆ مە دیار دكەت كا كیژ شێوازی دیاربووی ل دووڤ دابەشبوونا قەبارەیی یان ژمارەیی یا ئاكنجیيان دیار دكەت. هەردیسان گەشەكرنا شێوازێ دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیيان ل دووڤ ناڤبرێن دەمی رەنگڤەدانێ ل سەر سرۆشتێ گوهۆرینا پەیدابووی د سیستەمێ ژیانا جڤاكی و ئابووری یا ئاكنجیيان ب تایبەت ل دەڤەرێن باژێری دكەت.

**نەخشەیێ (٣٩)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاكنجیێن بازێران ل پاریزگەها دهۆكێ ل سەر ئاستێ ناحیان ١٩٤٧-١٩٩٦**

**1947**




**1957**




**1965**




**1977**




**1987**




**1996**



**نەخشەیێ (٤٠)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن گوندان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سەر ئاستێ ناحیان ١٩٤٧-١٩٩٦**

1947




1957




1965




1977




1987




1996



**نەخشەیێ (٤١)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن باژێری ل پاریزگەها دهۆکێ ل سەر ئاستێ ناحیان ٢٠٠٦**




**نەخشەیێ (٤٢)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن گوندان ل پاریزگەها دهۆکێ ل سەر ئاستێ ناحیان ٢٠٠٦**



**نەخشەیێ (٤٣)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن باژێری ل پاریزگەها دهۆکێ ل سەر ئاستێ ناحیان ٢٠٠٩**




**نەخشەیێ (٤٤)**

**دابەشبوونا رێژەیی یا ئاکنجیێن گوندان ل پاریزگەها دهۆکێ ل سەر ئاستێ ناحیان ٢٠٠٩**



## چار: سەنتەرێ سەنگا ئاكنجییان

سەرەرای هەبوونا گەلەك بۆچوونان ل سەر تێگەهێ سەنگا ئاكنجییان ژ ئەنجامی سرۆشتێ دیاردەیێن هاتینە خواندن و وان مەرەمێن ڤەكۆلین ژبۆ دهێتە ئەنجامدان زێدەباری راو بۆچوونێن جوداجودا یێن ڤەكۆلەران[٢٠]، لێ پتریا جاران ئەڤ تێگەهە دهێتە ناڤكرن ب نێزیكیا رێژەیی یا ئاكنجییان (Relative Proximity) و هندەك جاران ژی دهێتە ناڤكرن ب سەنگا ئاكنجییان یا برەیی [٢١] (Population Potential)، لێ هندەك ڤەكۆلەر دخوازن زاراڤێ سەنتەرێ سەنگیێ (Center of Gravity) یانژی زاراڤێ سەنتەربوونێ (Centrography) ب كاردئینن، سەرەرای ڤان بۆچوونان، لێ ناڤەرۆكا ڤی تێگەهی دەربرینێ ژ سەنتەرێ ناڤنجی یێ دابەشبوونەكا یەكسان ژبۆ دیاردەیێ دكەت، ب رەنگەكی دەمێ كو سەنتەرێ دابەشبوونەكا یەكسان دهێتە دیاركرن و هێدی هێدی چەند ژ دۆرماندۆری ڤی سەنتەری دوور بكەڤی و بەرەڤ لایێن وی بچی ئەڤ دابەشبوونە كێم دبیت هەتا ل داویێ چ نەمینیت[٢٢]، ئەڤ سەنتەرە نەخالەكا جێگیر و نەگوهۆرە بەلكو بەردەوام دهێتە گوهۆرین ئەوژی ل دووڤ ئاراستەیێ دابەشبوونێ ل دووڤ بۆرینا دەمی و ل ژێر كارتێكرنا هندەك فاكتەران[٢٣].

ڤەكۆلەر (Stewart) ب رەنگەكی تێگەهێ سەنگا ئاكنجییان شرۆڤەدكەت كو ئەو خالە یا پلا نێكزبوونا ئاكنجییان دەستنیشان دكەت، و ل دووڤدا دبیتە پیڤەر بۆ رادەیێ شیانێن گەهشتنێ بۆ ڤێ خالێ كو ب نێزیكبوونەكا هەڤدژ دگەل رووبەرێ وێ ب گونجیت، د راستێ ئەڤ خالە بهایەكێ نەئاراستەكرییە ئانكو چ ئاراستەیێن دیاركری بۆ چ جهان نینن[٢٤]. بهایێ دروست یێ تێگەهێ سەنگا ئاكنجییان ژ هندێ دهێت كو ئامرازەكێ باشە بۆ پیڤان و پێناسەكرنا رەوشت و تایبەتمەندیێن دابەشبوونا جهی یا ئاكنجییان د ماوەیەكێ دیاركری دا ژ لایێ پلا چربوون و ئاراستەیێ گشتی یێ دابەشبوونێ، ئانكو كا ل كیژ خالێ چر دبیت و بەرەڤ كیژ ئاراستەی بەربەلاڤ دبیت، بۆ ڤێ چەندێ پشت بەستن هاتییە كرن ل سەر تەكنیكا (IDW) دناڤ بەرنامێ (ArcGIS١٠) بۆ دەستنیشانكرنا سەنتەرێ سەنگا ئاكنجییان و هێلێن یەكسانكرنا ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ د ماوەیەكێ سالێن ڤەكۆلین ل سەر هاتییە كرن.

### أ- سەنتەرێ گشتیێ سەنگا ئاكنجییان

دەربارەی سرۆشتێ دابەشبوونا گشت ئاكنجیێن پارێزگەها دهۆكێ ل دووڤ ئالاڤێ سەنتەرێ سەنگا ئاكنجییان (تەماشەی نەخشەیێن (٤٥) هەتا (٥٢) بكە) ئەم دشێین بگەهینە ڤان راستیان:-

#### ١- دەربارەی هێلێن یەكسانكرنا ئاكنجییان، ئەڤ تێبینییە دكەڤنە بەر چاڤێن مە:

أ- ل دەستپێكا سالێن ڤەكۆلین ل سەر هاتییەكرن (١٩٤٧) و (١٩٥٧)ێ ئەڤ خالە ژێكدوور دكەڤن، لێ ب شێوەیەكێ هێدی هێدی و دگەل بۆرینا دەمی ئەڤ هێلە پتر نێزیكی ئێك دبن ب تایبەت ل دۆرماندۆر دەڤەرێن سەنگا ئاكنجیێن وان مەزن یان ژی دۆرماندۆر وان دەڤەرێن ئاكنجیێن وان كێم و بەربەلاڤ ئەڤ چەندە ژی ئاماژەیێ دكەتە سەر گەشەكرنا دیاردا چربوونا ئاكنجییان ل دووڤ بۆرینا دەمی.

ب- هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجییان ژێك دووردكەڤن و پاشی ل گشت دەڤەرێن پارێزگەهێ ب جۆرەكی ژ جۆرێن هەڤسەنگیێ بەلاڤ دبن ئەوژی ل هەر سێ سالێن دەستپێكێ یێن ڤەكۆلین ل سەر هاتییە كرن، ئەڤ چەندە ژی گرۆڤەیێ دكەتە سەر هەبوونا هەڤسەنگیەكێ د دابەشبوونا ئاكنجییاندا ل سێیكا ئێكێ ژ ماوەیەكێ ڤەكۆلین ل سەر هاتییە كرن.

ت- ل سالا (١٩٩٧)ێ ل وان دەڤەرێن ئاكنجیێن وان كێم و بەربەلاڤ هێلێن یەكسانبوونێ ب پلەیەكا

**نەخشەیێ (٤٥)**
**سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٤٧**




**نەخشەیێ (٤٦)**
**سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٥٧**



نەخشەیێ (٤٧)
سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٦٥




نەخشەیێ (٤٨)
سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٧٧



نەخشەیێ (٤٩)
سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٨٧




نەخشەیێ (٥٠)
سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجییان ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٩٦



نەخشەیێ (٥١)
سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٦




نەخشەیێ (٥٢)
سەنتەرێ سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجییان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٩



دیار و بەچاڤ لێکنێزیك دبن و ل وان دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان لێ هەی ژێك دووردکەڤن ئەڤ چەندە ژی ئامارەیێ ب نەبوونا هەڤسەنگیێ ل ڤان دەڤەرێن پارێزگەهێ دکەت.

پ- ب شێوەکێ گشتی د ماوەیەکێ گشت سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییە کرن، دهێتە تێبینیکرن کو هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجییێن ب پلەیەکا مەزنتر ل دەڤەرێن ئاکنجییێن وان کێم و بەربەلاڤ لێك نێزیك دبن ژ وان دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان لێ هەی.

## ٢- دەربارەی دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان، ئەڤ تێبینییە دکەڤنە بەر چاڤێن مە:

أ- دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان لێ هەی پتر بەشێن باشوور و باشووریێ رۆژئاڤایی ئەڤێن پتریا عەردێ وێ دەشت دهێنە دیتن، لێ دەڤەرێن باکوور و باکووریێ روژهەلات ئەڤێن پتریا عەردێ وان چیا هەر دمینن دەڤەرێن کێم ئاکنجی.

ب- جهێن دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان لێ هەی د وان سالێن ڤەکۆلین ل سەر هاتییەکرن د هێنە گوهۆرین ب رەنگەکی کو جهەکێ بەرفرەهـ ژ دەڤەرێن ناڤەراست و باشووریێ پارێزگەهێ ل سالێن (١٩٤٧)ێ و (١٩٥٧)ێ بخوڤە دگریت، ل سالێن ل دووڤدا هێدی هێدی بەرەڤ دەڤەرێن باشوور وباشووریێ رۆژئاڤایی کۆمڤە دبیت، و هەر ژ سالا (١٩٧٧)ێ و هەتا نها دو دەڤەرێن سەرەکی یێن سەنگا ئاکنجییان هەنە ئێك ژوان دکەڤیتە بازێرێ دهۆکێ و یا دیژی دکەڤیتە بازێرێ زاخۆ.

ت- دگەل بۆرینا دەمی دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان لێ هەی بەرەڤ کێمبوون و بەرتەنگبوونێ دچن، لێ بەروڤاژی دەڤەرێن ئاکنجییێن وان و بەربەلاڤ بەرەڤ بەرفرەهبوونێ دچن ئەڤ چەندە ژی گرۆڤێ دکەتە سەر چربوونا ئاکنجییان ل هندەك دەڤەرێن تایبەت.

پ- هەر ژ سالا (١٩٧٧)ێ وەرە دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان لێ هەی و دەڤەرێن ئاکنجییێن وان کێم و بەربەلاڤ شێوازەکێ نەگوهۆر بخۆڤە دیتییە، ژبلی سالێن بەری هینگێ، ب رەنگەکی کو هندەك دەڤەر هەر مانیە دەڤەرێن کێم ئاکنجی وەك ناحییێن بجێل و دینارتە یێن سەر ب قەزا ئاکرێ و ناحییێن کانی ماسێ و دێرەلوك یێن سەر ب قەزا ئامێدیێ و ناحییێن باتیفا و دەرکار یێن سەر ب قەزا زاخۆ و ناحییێن مانگێشك و زاویتە یێن سەر ب قەزا دهۆکێ و ناحیا باتێلێ یا سەر ب قەزا سێمێلێ ڤە، هەروەسا دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان لێ هەی، هەر ژ سالا (١٩٧٧)ێ وەرە ژی وەکی خۆ مانە ب تایبەت ئەوێن دکەڤنە رەخ و رویێن هەردو بازێرێن دهۆك و زاخۆ.

## ب- سەنتەرێ سەنگا ئاکنجییێن بازێران

دەربارەی سرۆشتێ گوهۆرینێ د دابەشبوونا ئاکنجییێن بازێراندا ل دووڤ پیڤەرێن سەنتەرێ سەنگا ئاکنجییان و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنحییان (تەماشەی نەخشەیێن (٥٣) تا (٥٥) بکە) ئەم دشێن تێبینیا ڤان خالان بکەین:-

أ- بەرچاڤترین تێبینیا دکەڤیتە بەر چاڤێن مە د سرۆشتێ گەشەکرنا ئاراستەیێن دابەشبوونا ئاکنجییێن بازێراندا، نێزیکبوونا وێیە دگەل سرۆشتێ گەشەکرنا دابەشبوونا گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێ ب تایبەت پشتی سالا (١٩٧٧)ێ، ب رەنگەکی کو سەرجەمێ ئاکنجییێن بازێران نێزیکی (٤٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت ئاکنجییێن پارێزگەهێ ل سالا (١٩٧٧)ێ پێکدئینا، و نێزیکی سێ چارێکان دناڤبەرا سالێن (١٩٨٧)ێ و (٢٠٠٦)ێ دا.

ب- هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجییان و دەڤەرێن سەنگا ئاکنجییان ل پتریا دەڤەرێن پارێزگەهێ بەربەلاڤ دبن، دگەل نەبوونا چ نێزیکبوونێن مەزن

**نەخشەیێ (٥٣)**

**دەڤەرێن سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجیێن بازێران ل پارێزگەها دهۆکێ (١٩٤٧-١٩٩٦)**

**1947**




**1957**




**1965**




**1977**




**1987**




**1996**



## نەخشەیێ (٥٤)
## دەڤەرێن سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجیێن باژێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٦




## نەخشەیێ (٥٥)
## دەڤەرێن سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجیێن باژێران ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٩



دناڤبەرا هێلێن یەكسانبوونێ ژ سالا (١٩٤٧)ێ هەتا (١٩٦٥)ێ، دگەل هەبوونا هندەك دەڤەرێن دەستنیشانكری یێن ئاكنجیێن وان كێم و بەربەلاڤ ب تایبەت ل بەشێن باكوور و باكوورێ رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ ل ناحیێن باتیفا و دەركار و كانی ماسێ و دێرەلۆك و دینارتە و بجێل، ئەڤ چەندە ژی بەلگەیە ل سەر هەبوونا جۆرەكێ وەكهەڤیێ د دابەشبوونا ئاكنجیێن باژێراندا دوی ماوەیی دا.

ت- هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجییان یێن خودان بهایەكێ بلند پشتی سالا (١٩٧٧)ێ ل دو سەنتەرێن سەرەكی یێن سەنگا ئاكنجییان دهێنە دیتن، ئێك ژوان ل باژێرێ دهۆكێ و یا دی ل باژێرێ زاخۆیە، بەشێن دیژی دمینن دەڤەرێن كێم ئاكنجی. ئەڤ چەندە ژی هێمایێ دكەتە سەر گەشەكرنا دیاردا چڕبوونا ئاكنجیێن باژێری سال بۆ سالێ هەتا وی ڕادەیی نەبوونا هەڤسەنگیێ و چڕبوونەكا زێدە بووینە دیارترین سیمایێن سرۆشتێ دابەشبوونا ئاكنجییان ل داویا سالێن ڤەكۆلین ل سەر هاتییە كرن.

## ث- سەنتەرێ سەنگا ئاكنجیێن گوندان

دەربارەی گوهۆرینێ دابەشبوونا ئاكنجیێن گوندان ل دووڤ پیڤەرێن سەنتەرێ سەنگا ئاكنجییان و هێلێن یەكسانبوونا ئاكنحییان (تەماشەی نەخشەیێن (٥٦) تا (٥٨) بكە) ئەم دشێن تێبینیا ڤان خالان بكەین:-

أ- بەرچاڤترین خالا دهێتە تێبینیكرن د سرۆشتێ گەشەكرنا ئاراستەیێن دابەشبوونا ئاكنجیێن گوندان، نێزكیبوونا وێیە دگەل سرۆشتێ دابەشبوونا گشت ئاكنجیێن پارێزگەهێ ل بەری سالا (١٩٦٥)ێ كو ل وی دەمی ڕێژەیا ئاكنجیێن گوندان (٦٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت ئاكنجیێن پارێزگەهێ و ئەڤ ڕێژەیە ل سالێن (١٩٥٧)ێ و (١٩٤٧)ێ نێزیكی (٨٢٪)ێ و (٨٨٪)ێ بوو ل دووڤ ئێكدا.

ب- پشتی سالا (١٩٧٧)ێ ناحیێن قەزایێن ئامێدی و زاخۆ بووینە دیارترین دەڤەرێن ئاكنجیێن گوندێن وان كێم و بەربەلاڤ ئەوژی ژبەر وان كاودانێن سەخت یێن ئەڤ قەزایە تێرا بۆرین، پشتی سالا (١٩٩٦)ێ قەزایێن دهۆك و سێمێلی ژی ل سەر زێدەبووینە ئەوژی ژ ئەگەرێ بلندبوونا زێدە یا تێكرایێن گەشەكرنا ئاكنجیێن باژێری، لێ بەروڤاژی ل سالا (١٩٧٧)ێ وەرە ناحیێن قەزایێن ئاكرێ و بەردەڕەش و دەڤەرا شێخان بووینە دیارترین دەڤەرێن سەنگا ئاكنجییان ل گوندان، هەتا وی ڕادەی نەهەڤسەنگی و چڕبوونا زێدە بوویە ئێك ژ سیمایێن شێوازێ دابەشبوونا ئاكنجیێن گوندان ل داویا ماوەیێ ڤەكۆلین ل سەر هاتییە كرن، ب ڕەنگەكی قەزا ئاكرێ نێزیكی (٥٨,٣٪)ێ سەرجەمێ گشت ئاكنجیێن گوندێن پارێزگەهێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ پێكئینایە و ل سالا (٢٠٠٩)ێ ژی قەزایێن ئاكرێ و بەردەڕەش پێكڤە نێزیكی (٤٦,٢)ێ پێكئینایە.

ت- ب شێوەیەكێ گشتی ب ڕێكا سرۆشتێ گوهۆرینێ د هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجیێن گوندان و دەڤەرێن سەنگا ئاكنجییان، ئەم دشێن تێبینیا هندێ بكەین كو ئاراستەیێ دابەشبوونا ئاكنجییان دناڤبەرا دەستپێك و دوماهیكا ماوەیێ ڤەكۆلین ل سەر هاتییە كرن گوهۆرینەكا ڕیشەیی بخۆڤە دیتییە، ب تایبەتژی ل سەر ئاستێ شێوازێ دابەشبوونا گشت ئاكنجیێن پارێزگەهێ و ئاكنجیێن باژێران.

پ- شێوازێ گوهۆرینێ د دەڤەرێن سەنگا ئاكنجییان و هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجیێن گوندان یا گرێدایە ب فاكتەرێن كارگێری و سیاسی و شارستانی و ئابووری پتر ژ فاكتەر و دیاردەیێن سرۆشتی.

## نەخشەیێ (٥٦)

## دەڤەرێن سەنگا ئاكنجییان و هێلێن یەكسانبوونا ئاكنجییێن گوندان ل پارێزگەها دهۆكێ (١٩٤٧-١٩٩٦)

1947




1957




1965




1977




1987




1996



**نەخشەیێ (٥٧)**

**دەڤەرێن سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجیێن گوندان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٦**




**نەخشەیێ (٥٨)**

**دەڤەرێن سەنگ و هێلێن یەکسانبوونا ئاکنجیێن گوندان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٩**



## پەراوێز

١. عبد الله عطوي، جغرافية السكان، المصدر السابق، ص ص٤٣-٦٢.

٢. صلاح حميد الجنابي، المصدر السابق، ص ص١١-١٣.

٣. منصور محمد الكيخا، جغرافية السكان، منشورات جامعة قاريونس، بنغازي، ط١، ٢٠٠٣، ص٢٢٧.

٤. عباس فاضل السعدي، سكان الوطن العربي دراسة في ملامحه الديموغرافية وتطبيقاته الجغرافية، مؤسسة الوراق للنشر والتوزيع، عمان – الأردن، ٢٠٠١، ص٩٩.

٥. رمزي بن أحمد الزهراني،"التوزيع الجغرافي للسكان والمساكن على المحافظات في المملكة العربية السعودية ١٤٢٥هـ (٢٠٠٤)"، مجلة جامعة أم القرى للعلوم التربوية والاجتماعية والإنسانية، المجلد(١٩)، العدد(١)، ٢٠٠٧، ص١٧.

٦. بۆ دووڤچوونێ ل سەر زاراڤێ دەڤەرێن ئاڤاکری (Oekoumene) و دەڤەرێن نەئاڤاکری (Non Oekoumene) ب زڤرە بۆ ژێدەرێ : منصور محمد الكيخا ، المصدر السابق ، ص ص٢٢٩-٢٣٤.

٧. فتحي عبد العزيز أبو راضي، المساحة والخرائط دراسة في الطرق المساحية وأساليب التمثيل الكارتوكرافي، المصدر السابق، ١٩٩٨، ص ٣٢٥.

* ناحیا ئەتریش ژی دگەل هاتییە هژمارتن.

٨. هندەك جاران ژی دهێتە ناڤکرن ب (بەلگێ نە وەکهەڤیێ) یانژی (پیڤەرێ دابەشبوونێ)، ل ڤان ژێدەران ب زڤرە:

١- عيسى علي ابراهيم، الاساليب الاحصائية والجغرافيا، دار المعرفةالجامعية، الإسكندرية، ١٩٩٩، ص ص١٤٦-١٤٨.

٢- عبد الحميد غنيم، التوزيع الجغرافي لسكان الإمارات العربية المتحدة، رسائل جغرافية، نشرة دورية محكمة تعني بالبحوث الجغرافية، يصدرها قسم الجغرافيا بجامعة الكويت والجمعية الجغرافية الكويتية، العدد(٩٧)، ١٩٨٧، ص٤٩.

٩. عباس فاضل السعدي، سكان الوطن العربي دراسة في ملامحه الديموغرافية وتطبيقاته الجغرافية، المصدر السابق، ص٣٤٩.

١٠. پیڤەرێ دوبارە دابەشکرنێ (Redistribution Index) دەربرینە ژ رێژەیا سەدی یا قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ ل داوییا وی ماوەیێ دڤێت دوبارە ئاکنجیێن وی دناڤبەرا یەکەیێن کارگێری بێنە دابەشکرن ژ پێخەمەت ب دەستڤەئینانا وێ دابەشبوونا ل دەستپێکا وی ماوەی هەی، ئەڤ چەندەژی ژ دەرکرنا ئەنجامێ رێژەیی بۆ هەر یەکەیەکێ ل سەرژمێرییا ئێکێ ژ ئەنجامێ رێژەیی بۆ سەرژمێرییا دوێ دهێت، پاشی دێ سەحکەینە جوداهییا دناڤبەرا واندا کا یا ئەرێنی یان نەرێنی یە و ئەڤ ئەنجامێ داویێ دەربرینێ ژ بهایێ پیڤەرێ دوبارە دابەشکرنێ دکەت. لێ قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ یێن کو پێدڤییە دوبارە دابەشکرن بۆ بێتە کرن ل داوییا ماوەیی ئەم دشێن ب دەستڤەبینین ب رێکا لێکدانا بهایێ پیڤەرێ دابەشکرنێ بۆ قەبارەیێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ ل داوییا وی ماوەیی و پاشی دابەشکرن ل سەر (١٠٠)، تەماشەی ڤی ژێدەری بکە:

ينظر : عباس فاضل السعدي، التوزيع الجغرافي للسكان في اليمن، نشرة دورية محكمة تعني بالبحوث الجغرافية، يصدرها قسم الجغرافيا بجامعة الكويت والجمعية الجغرافية الكويتية، العدد(٥١)،١٠٨٣، ص٥.

١١. بۆ پتر ئاشنابوون ل سەر تێگەهێ (چرییا ئاکنجیبان) و جۆرێن وان ل ڤی ژێدەری ب زڤرە: محمد السيد غلاب، فتحي صبحي عبد الحكيم، السكان ديموغرافيا وجغرافيا، مكتبة الانجلو المصرية، ط٢، القاهرة، ١٩٦٧، ص ص٢٢٥-٢٢٨.

١٢. جون كلارك، المصدر السابق، ص٦١.

١٣. منصور محمد الكيخا، المصدر السابق، ص ص٢٣٣-٢٧٦.

١٤. Maantay, J., et al, Op.Cit, p.107.

١٥. رمزى بن أحمد الزهرانى، المصدر السابق، ص ص٢٩-٣٠.

١٦. دگەل ناحیێن سێمێل، فەیدێ و ئەترووش.

١٧. دگەل هەردو ناحیێن سێمێل و فەیدیێ

١٨. دگەل ناحیا باتێلێ

١٩. بضمنها ناحیة ئەترووش.

** قەبارەیێ ئاكنجیيان هاتییە دیارکرن پشتی کو ئاكنجییێن قەزا ئاکرێ ژی ل سەر هاتینە زێدەکرن، لێ ل سالێن دی ئاكنجییێن قەزا ئاکرێ ل سەر نەهاتینە زێدەکرن.

٢٠. تێگەهێ سەنگا ئاکنجیيان ب گەلەك ڕەنگ و شێوەیان دهێتە ب كارئینان ئەوژی ل دووڤ ئارمانجا ڤەکۆلین ژێ هاتییەکرن، ل ڤان ژێدەران ب زڤڕە:

G.A.Gornostayeva, " Quantitative analysis of the spatial evaluation of cities ", Soviet Geography ,Vol.(XX).No.(1),1979.pp.8-9.

R.B.Mandal , Statistics for geographer & social scientists , Op.Cit.pp.295-296, 390-396.

٢١. فتحی محمد أبو عيانه، جغرافية السكان، المصدر السابق، ص٤٧.

٢٢. فاروق بن محمد الجمال، المصدر السابق، ص١٧٢.

٢٣. صلاح حمید الجنابی، جغرافية الحضر اسس وتطبيقات، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨، ص٣٠٢.

٢٤. جون كلارك، المصدر السابق، ص٧٣.

# سکرێن پارێزگەها دهوکێ

**پ.د. ئەحمەد عەلی حەسەن بەبەواتی**
**زانکۆیا دهۆك - کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: دیان جەمیل**

سکر Dams دهێنە هژمارتن مەزنترین دامەزراوێن ئاڤی یێن کو مرۆڤان ل سەر رووبارێن بەردەوام یان رووبارێن وەرزی دانایین ئەوژی ژ پێخەمەت عەمبارکرنا ئاڤا وان و رێکخستنا هەرکینا وان و نەهێلانا مەترسییا پەیدابوونا لەهییان، زێدەباری بکارئینانا ئاڤێ ژبۆ بەرهەم ئینانا تێهنا کارەبێ و قەرەبوکرنا کێمیا ئاڤا ڤەخوارنێ و بکارئینانا ئاڤێ د بوارێن ناڤمالێ و پیشەسازی و گەشتوگوزار و چاندن و ئاڤدانێ دا. هەردیسان ژ پێخەمەت رێکسختنا گەشتێن رووباران و پاراستنا ژینگەهێ و دروستکرنا ژینگەهێن گەشتوگوزاری.

هەر ژ کەڤندا مرۆڤان سکر دروستکرییە، بابلییان سکرێن بچویك و کەنالێن ئاڤێ سەر رووبارێن دیجلە و فۆراتی دروستکرینە، د هندەك یاسایێن حەمورابی دا بەحسێ چەوانییا رێکسختن و بکارئینانا ئاڤێ هاتییەکرن. هەردیسان مسرییێن کەڤن ژی دەستەکێ زێرین د دروستکرنا سکران ل سەر رووبارێ نیلی هەبوو، رۆمانییان ژی گەلەك سکر سەر رووباران دروستکرینە لێ ناڤدارترین سکرێ کەڤن، سکرێ "مەئرەب"ە ل وەلاتێ یەمەنێ[1].

هەژی گوتنێ نە کو هونەرێ دروستکرنا سکرێن ئاخێ ل وی سەردەمی هەتا سەردەمێ بەری سەد سالان ژی پشت بەستن دکرە سەر ئەزموونا تاکەکەسی یێن پەتی، ل وی سەردەمی پتریا ئەندازیاران ل شوینا هویرکێن بەر و کەڤران، ئاخ وەك کەرەستەیێ سەرەکی ژبۆ دروستکرنا سکران ب کاردئینا لەورا پتریا ڤان سکران تووشی هەرفتنێ دبوون[2]، هەرچەندە هەتا نها هندەك سکر بڤی شێوازی دهێنە دروستکرن لێ ئەو سکرێن بچویکن یێن بۆ هندەك مەرەمێن سادە دروستکرن وەك عەمبارکرنا ئاڤا بارانێ ژبۆ مەرەمێن چاندن و بخودانکرنا گیانەوەران.

ب شێوەیەکێ گشتی دروستکرنا سکرێن مەزن ل دووڤ پیڤەرێن ئەندازەیی یێن سەردەم پشت بەستنێ دکەتە سەر بکارئینانا ئاخێ و هویرکێن بەر و کەڤران وەك کەرەستەیێ سەرەکی ژبۆ دروستکرنا سکرێن تاشەبەردی زێدەباری بکارئینانا کونکرتیی د هندەك بەشاندا هەروەکی سکرێن دهۆك و مووسل، د دروستکرنا هندەك سکراندا ژی کونکریت وەکو کەرەستێ سەرەکی هاتییە بکارئینان وەك سکرێ دۆکان ل سەر رووبارێ زێ بچویك ل هەرێما کوردستانا عیراقێ .

ب شێوەیەکێ گشتی، سکر ژ چوار بەشێن سەرەکی پێکدهێت ئەوژی دیوارێ سکری Dam wall و ڤالاکەرێ خـوارێ Bottom outlet و وەرگرێ ئاڤێ Water intake و دەرگەهێن ڕێژتنێ Spillway. پتریا جاران دیوارێ سکری ل تەنگترین جهێ گەلی یان نهالێ دهێتە دروستکرن ئەوژی ژێخەمەت کێمکرنا کارێ دروستکرنا سکرێ و بهایێ تێچوونا وێ بۆ کێمترین ڕادە ب مەرجەکی ئەو جهێ دکەڤیتە پشت سکری یێ بەرفرەهـ بیت ژێخەمەت دروستبوونا عەمبارەکا ئاڤێ یا گونجایی.

دڤێت ئەڤ گەلی یان جهێ سکر ل سەر دهێتە دروستکرن ل بەر سینگێ وی دهێتە چێکرن هند ئاڤ هەبیت یان تێرا دبۆریت کو تێرا هندێ بکەت سکر ل سەر بێتە دروستکرن، هەردیسان گەلەك یا پێدڤییە ل ئەو جهێ سکر لێ دهێتە چێکرن مەرجێن جیۆلۆجی ل سەر بێنە بجهئینان ئەوژی کو وی عەردی شیانێن هندێ هەبن خۆ ل بەر فشارا ئاڤێ یا بهێز بگریت زێدەباری مەرجێن هایدروجیۆلۆجی یێن گونجایی ژبۆ گرەنتیا بنەماییێن سکرێ و دەرباچا عەمبارکرنێ ژێخەمەت کێمکرنا هەدەردانێن ئاڤی تا ئاستەکێ گونجایی ژ لایێ ئابووریڤە. ژلایەکێ دیڤە وەرگرێ ئاڤێ و ڤالاکەرێ خوارێ، هندەك بۆرینە ل بن دیوارێ سکری یان ل سەر ئێك ژ لایێن گەلی دهێنە دانان ژێخەمەت ڕێکخستنا چوونا ئاڤێ ژ دەرباچا سکری بۆ دەڤەرا دکەڤیتە پشت دیوارێ سکری ب شێوەیەکێ ئێمن، ئەڤ چەندە ژی ب ڕێکا هندەك دەرگەهێن گونجایی دهێنە چێکرن ژێخەمەت کونترۆلکرن ل سەر برا وێ ئاڤا پێدڤی یا بۆ هەر مەرەمەکێ دهێتە ڕێژتن. هندەك جاران ئەڤ هەردو بەشە د ئێك بەشدا دهێنە کۆمکرن ب تایبەت د سکرێن بچویك و ناڤنجی دا. دەرگەهێن ڕێژتنێ ژی وەك سەردەڤکێن ئێمناهیێ یە ژبەرکو ب ڕێکا ڤان سەردەڤان ئەو ئاڤا زێدە یا دناڤ دەرباچا سکری دا دهێنە هەلگرتن یان دەمێ ڕابوونا لەهیبان ئاڤا زێدە ب شێوەیەکێ ئارام و بێ مەترسی دهێنە ڤەگوهاستن بۆ دەڤەرا دکەڤیتە پشت سکری یان بۆ گەلیەکێ دی یێ ب ڕەخ سکری ڤە[٣].

## جۆرێن سکران[٤]:

سکر ل دووڤ وان مەرەمێن ژبۆ هاتییە دروستکرن، دهێنە دابەشکرن بۆ سکرێن عەمبارکرنێ یان سکرێن ڕێگرتنێ ل لەهیبان یان ژی سکرێن فلتەرکرنێ ژبۆ هەلگرتنا ئاڤا ژێرعەرد. لێ ل دۆر بنەمایێ وان کەرەستەیێن سکر ژێ هێنە دروستکرن، دهێنە دابەشکرن بۆ دو جۆرێن سەرەکی ئەوژی سکرێن کونکریت و سکرێن ئاخێ.

### ١. سکرێن کونکریتی Concrete Dams:

ئەڤ جۆرێ سکران ل دەڤەرێن کەڤری یێن ڕەق دهێنە چێکرن یێن کو خۆ ل بەر زەبرێن گران دگرن ئەڤێن ژ ئەنجامێ سەنگا گران یا کەرەستەیێن کونکریتی پەیدادبیت. سکرێن کونکریتی ڤان جۆران بخۆڤە دگریت:

أ. سکرێن گران: ئەڤ سکرە پشت بەستنێ دکەنە سەر سەنگا خۆ یا گران ژبۆ گرەنتیا سەقامگیریا وان، ل ڤێرێ دبیت تەوەرێ دیوارێ سکری یێ ڕاست یان یێ سەر شێوەیێ کڤانی بیت.

ب. سکرێن کڤانی: ئەڤ سکرە پشت بەستنێ دکەنە سەر شێوەیێ خۆ یێ کڤانی ژبۆ سەقامگیریا وان و ڤەگوهاستنا زەبرێن هێزێ بۆ هەردو لایێن گەلی، تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١) بکە.

### ٢. سکرێن ئاخ و تاشەبەردان Earth-rock dams:

دەمێ دەڤەرەك نەیا گونجایی بیت ژبۆ دروستکرنا سکرەکێ کونکرتی، ل وی دەمی دێ سکرەکێ ئاخێ یان یێ تاشەبەردێ هویر ل سەر هێتەدروستکرن کو بشێت خۆ ل بەر زەبرا هێزا وێ بگریت. ئێك ژ تایبەتمەندیێن ئابووری یێن ڤان سکران ئەوە کو

ئەو کەرەستێ ئەڤ سکرە ژێ دهێنە دروستکرن ب برەیەکا مەزن ل نێزیکی وی جهێ سکر ل سەر دهێتە دروستکرن یێ هەی زێدەباری شیانێن دروستکرنا وان ل سەر هەر جهەکی کو یێ گونجایی بیت ژبەرکو چ گرانیەکا مەزن ل سەر وی عەردی پەیداناکەت.

گرەنتیا سەقامگیریا ڤان سکران پشت بەستنێ دکەتە سەر ستووراتیا تەخێن ئاخێ و جۆرێ ئاخێ و ئامرازێن ژبۆ دروستکرنا سکری دهێنە بکارئینان ب تایبەت وان ئامیرێن بەردەست یێن ژبۆ دروستکرنا دیوارێ سکری دهێنە بکارئینان. ئێك ژ مەزنترین مەترسیێن گەفا ل سەقامگیریا ڤان سکران دکەت ئەو ئاڤ ژبەرچوونا زێدەیە یا د بنیاتێ دا ڤان سکران ڕا دبۆریت ب تایبەت دەمێ ژ ڕادێ پێدڤی دەرکەڤیت، زێدەباری پەیدابوونا لەهیبیان د دەریاچا ڤان سکراندا کو دبیتە ئەگەر ئاڤ بسەردا بچیت ب تایبەت دەمێ دەرگەهێن وان یێن ڕێژتنێ نەشێن بدروستاهی کارێ خۆ بکەن و ئاڤا زێدە برێژن.

ئێك ژ جۆرێن بەربەلاڤ یێن ڤان سکران، سکرێن وەکهەڤن ئانکو ئەو سکرن ژبۆ دروستکرنێ پشت بەستنێ دکەنە سەر جۆرەکێ بتنێ یێ کەرەستەیی و پتریا جاران ژی ئەڤ جۆرە کەرەستە ئاخە و ئەڤ جۆرە گرەنتیا سەقامگیریا دیوارێ سکری دژی ژبەرچوونا ئاڤێ ددەن، جۆرەکێ دی یێ ڤان سکران دبێژنێ سکرێن نەوەکهەڤ کو ژبۆ دروستکرنا وان پشت بەستنێ دکەنە سەر هژمارەکا کەرەستەیان یان هژمارەکا جۆرێن ئاخێ و سکرێن تاشەبەردان دیارترین و باشترین نموونەیە ل سەر ڤی جۆری.

## فاکتەرێن کاریگەر ل سەر دیزاینکرنا سکران:

ژ گرنگترین فاکتەرێن کاریگەریێ ل سەر دیزاینکرن و دروستکرنا سکران دکەن پێکدهێن ژ: مەرەم ژ دروستکرنا سکری، کەرەستەیێن ئاڤاکرنێ،

وێنەیێ (١)
سکرێ دۆکان



وێنە ل سالا ٢٠٠١.ز لایێ ڤەکۆلەریڤە هاتیەگرتن

**شێوێ (١)**
**هێلکارییێ دیوارێ سکرەکێ ژ جۆرێ وەکهەڤ**




سرۆشتێ بنیاتێ سکری، کەشوهەوا، شێوەیێ گەلی بان نهالێ، ڕێکا گوهورینا ئاراستێ ئاڤا رووبارێ ل دەمێ دروستکرنا سکری، کاریگەریا پێلێن ئاڤا عەمبارکری ل سەر سکری و ماوەیێ دەستنیشانکری ژبۆ دروستکرنا سکری.

## قۆناغێن ڤەکۆلینا ل سەر سکری:

١. ڤەکولینا دەسپێکی ژبۆ دروستکرنا سکرەکێ پێکدهێت ژ ڤەکۆلین و هەلسەنگاندنا هندەك جهێن دکەڤنە سەر رووبارێن ئاڤی و ب بەرچاڤ وەرگرتنا فاکتەرێن کاریگەریێ ل سەر دروستکرنا سکری دکەن ئەوژی ژێخەمەت هەلبژارتنا باشترین جهـ ژبۆ دروستکرنا سکری. ئەڤ قۆناغا هندەك پێڕابوونێن دەسپێکی یێن جوداجودا بخۆڤە دگریت وەك کەرەستەیێن دهێنە بکارئینان ژبۆ دروستکرنێ و کاریگەریا ژینگەهێ و دۆخێ هێلکاریێ گشتی یێ پرۆژێ سکری و پاشبەندێن وی، زێدەباری هەڵسەنگاندنا هونەری و ئابووری یا دەسپێکی.

٢. قۆناغا داویێ یا دیزاینکرنێ هەمی پشکنێن هویر ل جهێ هاتییە دەستنیشانکرن بخۆڤە دگریت زێدەباری مەزندەکرنا بڕا کەرەستەیێن پێدڤی ژبۆ ئاڤاکرنێ و دەستنیشانکرنا تایبەتمەندیێن وان و ئامادەکرنا هێلکاریێن بجهئینانێ یێن هویر و تایبەتمەندیێن هۆنەری ژبۆ هەمی کارێن پێدڤی یێن سکری پێکدئینن، زێدەباری ڤەکۆلینا کاریگەریا ژینگەهێ و هەڵسەنگاندنا ئابووری یا داویێ ژبۆ جهێ هاتییە هەلبژارتن ل دووڤ وان ڕێك و ستاندەرێن ل جیهانێ پشت بەستنێ ل سەر دکەن.

هەژی گوتنێ یە کو نێزیکی ٤٧٠٠ سکر ل سەرانسەری جیهانێ هاتینە دروستکرن کو پتریا وان ژ سکرێن مەزنن و پتریا وان دکەڤنە وەلاتێن چین و ویلایەتێن ئێکگرتی و هندێ. بۆ زانین سکرێن مەزن ئەو سکرن یێن بلنداهیا وان پتر بیت ژ ٢٥٠ مەتران[٥].

## سکرێن پارێزگەها دهۆکێ:

گەلەك دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ بنەمایێن سەرەکی ژبۆ دروستکرنا سکران یێن هەین ڤێجا چ ژبۆ سکرێن مەزن یان ناڤنجی یان یێن بچویك بن. ئەڤ بنەمایە پێکدهێن ژ پێکهاتەیا جیۆلۆجی یا دەڤەرێ و پێکهاتەیا ئاخێ و پێکهاتەیا کەڤری زێدەباری بنەمایێن بلندی و نزمیا عەردی ل سەر ئاستێ جهێ سکری یان یێ دەریاچێ. ژ لایێ هایدرولوجیڤە ژی پارێزگەها دهۆکێ ب دەهان گۆمێن ئاڤێ یێن کو بەردەوام یان وەرزانە ئاڤا وان دهەڕکیت یێن هەین. ئەڤ بنەمایە د گونجاینە ژبۆ دروستکرنا هندەك سکرێن دی یێن وەکهەڤ بۆ سکرێ دهوکێ یێ نها و سکرێن دی یێن بچویك یێن دناڤ گەلیاندا کو ب دەهان ژ ڤان سکرێن بچویك ل پارێزگەها دهۆکێ هەنە.

## یەكەم: سكرێن مەزن:

### سكرێ بەخمە[٦]:

هزرا دروستكرنا سكرێ بەخمەی بۆ سالێن سیهان ژ سەدسالییا بۆری دزڤریت دەمێ ئێك ژ رۆژنامەڤانێن ئەمریكی گۆتارەك ل رۆژناتا (الاوقات البغدادیة) دا ل رێكەفتی ١٨ تەباخا ١٩٣٢ ێ دا بەلاڤكری كو گۆتارا وی یا تایبەتمەندبوو ب مفاوەرگرتنێ ژ ژێدەرێن ئاڤێ ژبۆ بەرهەم ئینانا تێهنا كارەبایی و دروستكرنا كارگەهێن پیشەسازی ل عیراقێ. ڤی رۆژنامەڤانی د گۆتارا خۆ دا ئاماژە ب گەلی عەلی بەخمەی كریوو كو جهەكێ گونجایە ژبۆ دروستكرنا سكرەكی ب بلنداهییا ٨٠ مەتران و بەرهەم ئینانا پتر ژ ١٥٠٠ مێگاواتێن كارەبێ. پشتی هینگێ ئەنجومەنێ شیرەتكاری (ویلسون و میشێل و قوگان لی) ل سالا ١٩٣٧ێ رابوون ب ئەنجامدانا ئێكەم ڤەكۆلینا جیۆلۆجی ل ڤێ دەڤەرێ و پشتی هینگێ ژ لایێ (ی. فی ریچارد)ی ڤە بریار ل سەر راپۆرتا وان هاتەدان ژبۆ دروستكرنا سكرەكێ بلند ل دەڤەرا نێزیكی گوندێ بەخمە ( ل نێزیك سكرێ قەندیل یێ نها).

ل سالا ١٩٤١ێ، ئەندازیار (أوارد)( I.L.ward) رابوو ب پێشكێشكرنا راپۆرتەكێ دەربارەی دروستكرنا سكرەكی ب بلنداهییا ٤٧٠ مەتران ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی ژ پێخەمەت عەمباركرنا پتر ژ ملیارەك و چارێك مەترێن سێجا یێن ئاڤێ و ل سالا ١٩٥٠ێ و پشتی پێكئینانا ئەنجومەنێ پیران ئەنجومەنی بریاردا سكرەكێ دی یێ بلند ل گەروویێ بەخمە بێتە دروستكرن ژپێخەمەت كونترۆلكرنێ ل سەر لەهییان و بكارئینانا ئاڤا عەمباركری ژبۆ مەرەمێن چاندن و ئاڤدانێ. ئەنجومەنی كارێ ڤەكۆلین و هەلسەنگاندنا ڤی پرۆژەی پێشكێشی كۆمپانیا "هارزا" یا ئەمریكی كر و ڤێ كۆمپانیێ ل سالا ١٩٥٦ێ راپۆرتا خۆ یا هێلكاری پێشكێشی ئەنجومەنی كر كو ژ سێ جۆرێن سكران پێكدهات ئەوژی ئەڤەبوون:

١. سكرێ راكێشان یان تاودانی.

٢. سكرێ كو هەردو ملێن وی پێكڤە گرێدایی بن

٣. سكرێ چەند كڤان

هەردیسان دگەل ٩ دیزاینێن دەسپێكی ژبۆ سكری و پاشكۆیێن وێ. ڤێ راپۆرتێ سێ جهـ)ب درێژییا گەروویێ بەخمە د ڤەكۆلینا خۆ دا دەستنیشانكربوون ئەوژی دەڤەرێن (A.B.C ) بوون ب بلنداهییێن ٥٢٥ هەتا ٥٥٠ مەتران ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی (تەماشەی خشتەیێ ژمارە ١ بكە). هەروەسا ڤێ راپۆرتێ ئاماژە ب هندێ كربوو كو سكرێ ب بلنداهییا ١٦٥ مەتران دێ شیانێن عەمباركرنا ٦,٨ میار مەترێن سێجا یێن ئاڤێ هەبن.

ل سالا ١٩٧٥ێ، وەزارەتا ئاڤدانێ (وزارة الری) یا عیراقی داخواز ژ كۆمپانیا هارزا كر دوبارە ڤەكۆلینەكا تایبەت ل دۆر پرۆژێ دروستكرنا سكرێ بەخمەی بكەت و هندەك بەلگەیێن پێكوهۆرك پێشكێش بكەت ژپێخەمەت هەلبژارتنا باشترین پێكوهۆرك، پێكوهۆركێن وێ كۆمپانیێ ب ڤی رەنگی بوون:

- یەكەم: سكرەك ب دووراتییا ٣,٥ كم ژ دەسپێكا گەرویی یێ نێزیكی گوندێ بەخمە
- دووەم: سكرەك ب دووراتییا ٧,٥ كم بۆ ژووردانییا گەلیێ رێزان
- سێیەم: پشتی ئێككرتنا رووبارێ رەواندوز دگەل رووبارێ زێ مەزن ل دەرگەهێ گەرویی، وان ئەڤ دەڤەرە وەك باشترین دەڤەر ژبۆ دروستكرنا سكرەكێ تاشەبەردی هەلبژارت.

ل سالا ١٩٧٨ێ، وەزارەتا ئاڤدانێ یا عیراقی داخواز ژ حەفت كۆمپانیێن شیرەتكاری یێن (یابان و فرەنسا و ئەمریكا) پرۆژەیێن خۆ ب شێوەیەكێ راستەخۆ ل دۆر كارێن ڤەكۆلینێن جیۆلۆجی و ئەندازەیی هایدرولوژی دگەل بەرهەڤكرنا دیزانەكێ پێشكێش بكەن. ل سالا ١٩٧٩ێ كۆمپانیەكا یابانی رابوو ب گوهۆرینا هندەك تشتێن سادە د دیزاینا پرۆژەی دا و ل سالا ١٩٨٦ێ هەردو كۆمپانیێن (ئانكا یا توركی و هایدروكراوینیا یا یوگوسلافی) رابوون بجهئینانا پرۆژەی، لێ ژ ئەنجامێ شەرێ كەنداڤی ل سالا ١٩٩١ێ كار د پرۆژەیدا هاتە

ڕاوەستاندن پشتی کو نێزیکی ٣٤٪ێ کار تێدا هاتییە ئەنجامدان.

شیانێن عەمبارکرنا ئاڤێ ل سکرێ بەخمەی ل دووڤ گوهۆرینێن داوێ گەهشتە ١٤,٤ ملیار مەترێن سێجا یێن ئاڤێ، لێ هندەك ژێدەرێن دی ئاماژێ ب ١٧ ملیار مەترێن سێجا یێن ئاڤێ دکەن ب کووراتییا ١٧٩ مەتران (تەماشەی خشتەیێ ژمارە ٢ بکە).

**خشتەیێ (١)**

**شیانێن عەمبارکرنا ئاڤێ (ملیار م٣) ل دووڤ بلنداهییا سکرێ**

| بلنداهییا ئاستێ ئاڤێ ل سەر ئاستێ رووێ دەریایێ | بلندترین بلنداهییا سکرێ (م) | شیانێن عەمبارکرنێ ملیار (م٣) |
|---|---|---|
| ٤٧٥ | ٩٠ | ١,٤٥ |
| ٥٠٠ | ١١٥ | ٢,٧٥ |
| ٥٢٥ | ١٣٥ | ٤,٣ |
| ٥٥٠ | ١٦٥ | ٦,٨٠ |

**خشتەیێ (٢)**

**هندەك تایبەتمەندیێن داوێ یێن سکرێ بەخمە یێ سەرەکی**

| جۆرێ سکرێ | تاشەبەردی و گومتلێن تەقنێ |
|---|---|
| بلنداهییا سکری | ٢٣٠ مەتر |
| قەبارێ گوما ئاڤێ | ١٦,٦٠٠ کم٢ |
| تێکرایێ داهاتێ ئاڤی یێ عەمبارکری | ١١,٨٧×٦١٠م٣ |
| بلندترین رادێ ئاستێ ئاڤێ | ٥٩٩ م |
| تێکرایێ رادێ ئاسایی یێ ئاستێ ئاڤێ | ٥٨٧ م |
| نزمترین رادێ ئاستێ ئاڤێ | ٥١٧ م |
| شیانێن عەمبارکرنێ یێن گشتی | ١٧,١×٩١٠ م٣ |
| شیانێن عەمبارکرنێ یێن زیندی | ١٢,٦×٩١٠ م٣ |
| قەبارێ گومێ ل کێمترین رادە | ٢٢٣ کم |
| بلندترین رادێ پێدڤییا ئاڤێ | ٧٥٠ م٣/چ |
| رووبەرێ بەرهەڤکرنا سالانە | ٢٥٧ م٣/چ |
| رووبەرێن عەردێن پێ دهێتە ئاڤدان | ٥٦٥,٠٠٠ هێکتار |
| کونترۆلکرن ل سەر لەهیان | ٤٠٠٠ م٣/چ |
| کێمترین رادێ بەرهەم ئینانا تێهنێ | ١٥٠٠ مێگاوات |
| بلندترین ئاستێ هەرکینێ | ١٠٠٠ م٣/چ |

**ژێدەر:**

Planning report on Behkma dam project EDPC Tokyo Japan July 1980

**تایبەتمەندییێن گشتی یێن سکرێ بەخمەی(٧):**

بەری کو ئەم بەحسێ تایبەتمەندییێن ڤی سکری بکەین دێ بەحسێ ئارمانجێن سەرەکی یێن دروستکرنا وی کەین کو ئەڤێن ل خوارێ نە:

**یەکەم:** رێکخستنا هەرکینا ئاڤێ و دانانا سنوورەکی ل هەمبەر لەهیان.

**دووەم:** بەرهەم ئینانا نێزیکی ١٥٠٠ مێگاواتێن کارەبێ.

**سێیەم:** عەمبارکرنا نێزیکی ١٠ ملیار مەترێن سێجا یێن ئاڤێ.

**چوارەم:** دابینکرنا ئاڤێ ژبۆ ئاڤادنا نێزیکی ٥٦٥ هزار هێکتارێن عەردێ چاندنێ.

دیوارێ سکرێ بەخمەی ژ کەرەستەیێن تاشەبەردی یێن کەڤری دگەل گومتلێن تەقنێ پێکدهێت و بلنداهیا وێ دگەهیتە ٢٣٠ مەتران و بلنداهیا گوپیتکا وێ دگەهیتە ٥٧٠ مەتران. نزمترین ئاستێ ئاڤێ یێ سالانە دگەهیتە ٥١٧ مەتران و بلندترین ئاستێ ئاڤا دگەهیتە ٥٨٧ مەتران ل سەر ئاستێ رووێ دەریایێ، ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەر ئەو بشێت نێزیکی ١٠١٠٠ ملیون مەترێن سێجا یێن ئاڤێ ژبۆ ئاڤدان و بەرهەم ئینانا کارەبێ عەمبار بکەت.

ئەڤ سکرە ژ سێ دەرگەهان پێکدهێت ب فرەهیا ١٢ مەتر و بلنداهیا ١٣ مەتران، هەر دەرگەهەکی شیانێن رێژتنێ ب برا ٨٨٦٥ مەترێن سێجا د چرکەکێ دا یێن هەین ب تایبەت دەمێ ئاستێ بلنداهیا ئاڤێ دگەهیتە ٥٩٨,٧ مەتران ل سەر ئاستێ رووێ دەریایێ. هەردیسان ئەڤ شیانێن رێژتنێ بەسن ژبۆ راگرتنا لەهیان کو برا وێ ٢٥٨٥٠مەتر٣/ چرکە کو بهێزترین لافاوا پێشبینیکرییە.

دەرگەهێ خوارێ یێ سکری ژ دو تونێلان پێکدهێت کو تیرێ هەر ئێکێ ١٤ مەترن و دکەڤنە لایێ چەپێ یێ سکری. ئەڤ تونێلە (١١٠٠ مەتر و ١١٢٠ مەتر) دهێنە بکارئینان وەك پاشەند ژبۆ ڤەگوهاستنا ئاڤا رووباری و چارەسەرکرنا هەرکینا لەهیان. هێزا هەرکینا ئاڤێ د ڤان دەرگەهێن خوارێ دا دگەهیتە ٢٠٠٠ مەترێن سێجا.

هەردیسان ژ پێخەمەت گوهۆرینا ئاراستەیێ هەرکینا ئاڤێ دماوەیێ دروستکرنێ دا، دو تونێلێن دی ب درێژیا ١١٠٠ و ١١٦٠ مەتران و ب تیرێ ١٢ مەتران ل سەر لایێ چەپێ هەنە ( تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٢ بکە) و هێزا هەرکینا ئاڤێ د ڤان تونێلاندا (زێدەباری هێزا هەرکینا ئاڤێ د هەردو دەرگەهێن خوارێ دا) دێ گەهیت ٨٦٠٠ مەترێن سێجا د هەر چەرکەیەکێ دا دەمێ ئاستێ ئاڤێ دگەهیتە ٤٤٦ مەتران ل سەر ئاستێ رووێ دەریایێ.

هەردیسان هێزا ڤی سکری بۆ بەرهەم ئینانا تێهنا کارەبێ دگەهیتە ١٥٠٠ مێگاواتان. دڤی سکری دا سێ تونێل هەنە (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٣ بکە) و هەر ئێك ژڤان تونێلان دهێتە دابەشکرن بۆ سەر دو تونێلێن دی ب فرەهیا ٨,٥ مەتر و بلنداهیا ١١ مەتران و دبێژنێ تونێلێن تێهنا کارەبایی و هەر ئێك ژوان دشێت ٢٥٠ مێگاواتان بەرهەم بینیت.

## دووەم: سکرێن ناڤنجی:

### ١. سکرێ دهۆکێ:

سکرێ دهۆکێ دهێتە هژمارتن مەزنترین سکر ل پارێزگەها دهۆکێ ئەگەر ئەم سکرێ بەخمە ئەوێ دکەڤیتە دناڤبەرا پارێزگەها دهۆك و هەولێرێ دا ژناڤ بیننە دەرێ (ژبەرکو هەر ژ سالا ١٩٩١ وەرە کار ل سەر ڤی سکری هاتیە راوەستاندن) و ژ لایێ هێزا عەمبارکرنێ ڤە ل رێزا ئێکێ دهێت. سکرێ دهۆکێ دکەڤیتە باکوورێ سنوورێ سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ ب دووراتیا ٢ کیلومەتران ژ دەڤەرا گەلیێ دهۆکێ. مەرەم ژ دروستکرنا ڤی سکری ئەوبوو داکو ئاڤا رووبارێ دهۆکێ و ئاڤا گەلی یێن دی یێن وەرزی بێنە خرڤەکرن و ژبۆ ئاڤدان و چاندنا عەردی مفا ژێ بێتە وەرگرتن ب تایبەت ئەو عەردێن دکەڤنە باشوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەری ئەوژی ب رێکا تۆرەکا بۆری و کەنالێن ئاڤێ. هەردیسان ژ پێخەمەت دابینکرنا ئاڤا

وێنەیێ (٢)
تونێلێن ڤەگوهاستنا ئاڤا رووبارێ زێ مەزن ژبۆ مەرەما دروستکرنا سکری




وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل رێکەفتی ٢٠١٣/٤/٦ هاتییەگرتن.

وێنەیێ (٢)
تونێلێن تێهنا کارەبایی




وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل رێکەفتی ٢٠١٣/٤/٦ هاتییەگرتن.

ڤەخوارنێ بۆ خەلكێ باژێری، زێدەباری دیمەنێ وێ یێ گەشتوگوزاری.

رۆبەرێ حەوزا گەلیێ دهۆكێ دگەهیتە ١٣٣,٨كم٢ و ژلایێ جوگرافیڤە دكەڤیتە دناڤبەرا چیایێ كەمەكا ل باكووری و چیایێ سپیرێز ل رۆژهەلاتی و چیایێ بەرۆشكێ ل باشوور و باشووری رۆژهەلاتی و چیایێ سپی ل باشوور و باشووری رۆژئاڤایی (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە ١ بكە). ژ لایێ فەلەكیڤە حەوزا ڤی سكری دكەڤیتە دناڤبەرا هێلێن درێژاهیێ (٤٠ً ٥٠َ ٤٢ْ ـ ٤٤ً ٠٨َ ٤٣ْ) ژلایێ رۆژهەلاتی و هێلێن فرەهیێ (٠٩َ ٤٩ ٣٦ْ ـ ٢٦ً ٠٠َ ٣٧ْ) ل باكووری[٨].

هزرا دروستكرنا ڤی سكری ل سەر رووبارێ دهۆكێ ل سالا ١٩٧٠ هاتە پێشكێشكرن دەمێ رێڤەبەریا سكرو عەمبارێن ئاڤێ دەست ب ڤەكۆلینەكێ كری ل سەر ڤی رووباری و دو جهـ دەستنیشانكرین ژبۆ دروستكرنا سكرەكێ، لێ ژبەر كێمیا داهاتێ ئاڤێ ل جهێ ئێكێ یێ نێزیكی گوندێن "باخرنیف و خازیاڤا" لەورا جهێ ئێكێ هاتە رەتكرن و جهێ دووێ ل نێزیكی گەروویێ گەلیێ (ئەوژی پشتی كو هەردو رووبارێن بچویك یێن گوندێن سندۆر و گەرماڤا دگەهنە رووبارێ دهۆكێ) هاتە هەلبژارتن[٩]. كۆمپانیا بولگاری "ئەكروكۆمبلكت" رابوو ب ئەنجامدانا كارێن

**نەخشەیێ ژمارە (١)**

**دیتنەكا ئەسمانی بۆ حەوزا دەریاچا سكرێ دهۆكێ**




- Google Earth 2015

دەسپێکی و دیزاینا پرۆژەی و ڤەکۆلینا هونەری و توپۆگرافی و جیۆلۆجی یا سکریّ دهۆکێ، پشتی هینگێ کۆمپانیا جیهانی "ESI" کو بنکەهێ ویّ یێ ل بازێرێ دوبەی یێ ئیماراتێ یە ڕابوو ب بجهئینانا ڤێ پرۆژەی ب درێژیا ١٤ کیلومەتران ل دەسپێکا سالا ١٩٨٠ هەتا سالا ١٩٨٨ێ، لێ هەر ژ سالا ١٩٨٧یڤە دەست ب عەمبارکرنا ئاڤێ د ڤێ سکری دا هاتییە کرن[١٠].

**جیۆلۆجییا سکریّ دهۆکێ:**

جیۆلۆجییا سکریّ دهۆکێ ژ جیۆلۆجییا سکرێن دی یێن پارێزگەها دهۆکێ گەلەك یا جودانینە، دناڤ حەوزا ڤێ سکری دا هژمارەکا پێکهاتنێن جیۆلۆجی یێن هەین کو دیرۆکا وان ڤەدگەڕیت بۆ سەردەمێن میوسین و هولۆسین، ژسەردەمێ کەڤن بۆ یێ نوو ئەوژی پێکهاتنێن (بەخمە، شەرانش، کولوش، خۆرمال، جەرکس، پێلاسپی، فەتحە، ئینجانە) بخۆڤەدگریت تەماشەی خشتەیێ ژمارە ٣ بکە.

**توپۆگرافییا حەوزا سکریّ دهۆکێ:**

بلنداهییا روویێ حەوزا سکریّ دهۆکێ ل هەمی جهان هندی ئێك نینە ب ڕەنگەکی کو بلندترین خالا وێ دگەهیتە ١٣٥٢ مەتران ل نێزیك لایێ باشووری یێ چیایێ کەمەکا و باکووریّ چیایێ سپی، ڤی حەوزێ شێوەیەکێ سێجایی یێ درێژ یێ هەی ب ڕەنگەکی کو سەریّ وێ بەرەڤ ئاڕاستێ باکووریّ رۆژئاڤایی درێژدبیت و بنکێ وێ بەرەڤ باشووریّ رۆژهەلاتی درێژدبیت و ئەڤ چەندە ئاڕاستێ گشتی یێ روویێ دەڤەرێ دیاردکەت (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە ٢ بکە). ئەڤ حەوزە ڕادبیت ب خرڤەکرنا ئاڤا بەشێ رۆژئاڤایی یا پێکدهێت ژئێککرتنا ئاڤا گەلیێن سندۆر و گەرماڤا ب درێژاهییا ٢٥کم هەتا دگەهیتە سکری، هەردیسان ئاڤا بەشێ باشووریّ رۆژهەلاتی ل گەلیێ باجلۆرێ و هندەك گەلیێن دی یێن کورت.

**تایبەتمەندیێن گشتی یێن سکر و دەریاچا دهۆکێ:**

سکریّ دهۆکێ ژ جۆریّ سکرێن ئاخێ یە کو بلنداهییا وی دگەهیتە ٦٠,٥ مەتران ل سەر ئاستێ عەردی یێ سرۆشتی و نێزکیی ٦٤ مەتران ژ خەندەکا سەرەکی و درێژاهییا گوپیتکا وی یا سەرەکی دگەهیتە ٦١٣ مەتران و فرەهییا وی ٩ مەتران ب ئاستێ ٦١٩,٧٥ مەتر ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی، هەردیسان فرەهییا بنکێ وی دگەهیتە ٢٠٠ مەتران و شیانێن عەمبارکرنا زیندی ٤٧,٥ ملیون مەترێن سێجا یێن ئاڤێ هەنە و شیانێن عەمبارکرنا بری ٤,٣٩ ملیون مەترێن سێجانە. کەنالەك ب درێژیا

**خشتەیێ (٣)**
**تایبەتمەندیێن پێکهاتنێن سەرەکی یێن حەوزا سکریّ دهۆکێ**

| پێکهاتن | بەری | ستویراتی/ م | ڕەنگ | بەرگری دژی راماڵینا ئاخێ |
|---|---|---|---|---|
| بەخمە | بەرێ جیری، مارل | ٢٠٠ | تاری بەرەڤ رەشی | بهێزە |
| شەرانش | بەرێ جیری، مارل | ٥٠-١٠٠ | سپی بەرەڤ رساسی | لاوازە |
| کولوش | شیل ، بەرێن تەقنێ، سلت، خیز | ٤٥٠ | رساسیێ تاری بەرەڤ زەری | لاوازە |
| خۆرمال | بەرێ جیری دولومایتی | ١ ـ ٦ | زەر | لاوازە |
| جەرکس | کەڤرێن خیزی، گرینی و هندەك حەسو | ٧٠٠ | سۆر | ناڤنجیە |
| پێلاسپی | بەرێ جیری | ٤٠٠ | رساسی یێ سەر سپیڤە | بهێزە |

- هژمارەکا ژێدەرێن جیۆلۆجی یێن جوداجودا

نەخشەیێ (٢)
هێلێن بلنداهیێ یێن یەکسان یێن دەڤەرا حەوزا گەلیێ دهۆکێ




- ب پشت بەستن ل سەر بەرنامێ SAS Plant ،٢٠١١.

وێنەیێ (٤)
شێوە و توپۆگرافییا سکرێ دهۆکێ



**خشتەیێ (٤)**
**تایبەتمەندیێن هونەری یێن سکرێ دهۆکێ**

| جۆرێ سکری | خیزی دگەل گومتلێن تەقنی |
|---|---|
| مێژوویا ب دوماهی هاتنێ | ١٩٨٨ |
| مێژوویا دەست ب عەمبارکرنا ئاڤێ | ١٩٨٧ |
| بلندترین ئاستێ ئاڤێ سەر ئاستێ رووبێ دەریایی | ٦٢٨ مەتر |
| ئاستێ سروشتی یێ رووبێ ئاڤێ سەر ئاستێ رووبێ دەریایی | ٦١٥,٧٥ مەتر |
| ئاستێ ئاڤێ د عەمبارێ دا سەر ئاستێ رووبێ دەریایی | ٥٩٠ مەتر |
| ئاستێ عەمبارکرنێ یێ مری | ٥٨٤ مەتر |
| بلندترین ئاستێ عەمبارکرنێ | ٤٧,٥ ملیون مەتر سێجا |
| قەبارێ عەمبارکرنا مری | ٤,٤ ملیون مەتر سێجا |
| ئاستێ گوپیتکا سکری ل سەر ئاستێ رووبێ دەریایی | ٦١٩,٧٥ مەتر |
| فرەهیا گوپیتکا سکری | ٩ مەتر |
| بلنداهیا سکری ژ بنکێ رووباری | ٦٠,٥ مەتر |
| قەبارێ پرکرنا سکری | ٢,٨ ملیون مەتر سێجا |
| درێژاهیا سکری ژ سەری ڤە | ٦١٣,٤٣ مەتر |
| تیرێ کونا بەردانا ئاڤێ | ٢٤ مەتر |
| بلندترین ئاستێ هەرکینا بەردانا ئاڤێ | ٨١٠ مەتر سێجا |
| رووبەرێ حەوزا سکری | ١٣٣,٨ کیلومەتر سێجا |
| درێژیا تونێلا دەرگەهێ خوارێ | ٣٨٠ مەتر |
| تیرێ تونێلا دەرگەهێ خوارێ | ٧ مەتر |
| درێژیا عەمبارێ ل جهێ بەردانێ ٦١٥,٧٥ م | ٤ کیلو مەتر |
| فرەهیا عەمبارێ ل جهێ بەردانێ ٦١٥,٧٥ م | ١,٥ کیلو مەتر |

- رمضان حمزة محمد، تقويم المخاطر البيئية للموجات التصريفية الحرجة لسد دهوك على استخدامات الارض المجاورة، (دبلوم فى الجغرافية)، جامعة الموصل، ٢٠٠٧، ص٣٩.

١٤,٦٥٠ کیلومەتران ژ بنی وی هاتیە کێشان کو دهێتە بکارئینان بۆ ئاڤدانا رووبەرێن عەردی یێن بەرفرەهـ ب رووبەرێ ١٦ هزار دۆنەمێن عەردی. مەرەم ژ دروستکرنا ڤی کەنالی ئەوە داکو ئاڤا چاندنێ ژ دووماهیا تونێلا ئاڤا چاندنێ یا سکرێ دهۆکێ ل سەر ٢٧ بۆریێن دی یێن لقدار سەر دەڤەرێن چاندنێ دابەش بکەت، کارکرن دڤی پرۆژەی دا ل سالا ١٩٨٨ێ ب دوماهی هاتیە تەماشەی وێنەیێ ژمارە (٤) بکە. رووبەرێ دەریاچا سکری دگەهیتە ٢,٦٦ کم٢ ب تێکرایێ درێژیا ٢,٩ کم و فرەهیا ٧٦٠ مەتران[11]. تایبەتمەندیێن دی یێن سکری د خشتەیێ ژمارە ٤ دا هاتینە شرۆڤەکرن..

### ٢. سكرێ كشكان

سكرێ كشكان دهێتە هژمارتن درێژترین سكر ل قەزا سێمێلێ و ل ڕێزا دووێ ژ لایێ شیانێن عەمبارکرنا ئاڤێ پشتی سكرێ مام شڤان دهێت، ئەڤ سكرە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ قەزا سێمێلێ ل سەنتەرێ ناحیا باتێلێ ب دووراتییا ١٥ كیلومەتران ل سەر گەلیێ كشكان ئەوێ كو ئاڤا وی درێژتە رووبارێ دیجلەی ل رۆژهەلاتێ دەڤەرا كشكان، ئەڤ سكرە دكەڤیتە سەر سەر هێلێن فرەهیێ (٥١ً ٩َ ٣٧ْ) ل باكووری و هێلێن (٣٨ً ٣٤َ ٤٢ْ) ل رۆژهەلاتی. سكر ژ لایێ كۆمپانیا (الاشقاء) ڤە هاتییەدروستكرن لێ دیزاین و سەرپەرشتییا وێ ژ لایێ وەزارەتا ژێدەرێن ئاڤێ یا عیراقی بوو.

جیۆلۆجییا ڤی سكری ژی ژ جیۆلۆجییا سكرێن بەری نها یا جودا نینە، لێ د ڤی سكری دا بەهرا پتر پێكهاتنا كەڤرێن مەزن و ئالۆز پێكدهێت ب تایبەت گومتلێن هەرێ و خیزی و گرینی كو ستووراتیا تەخێن وێ دناڤبەرا (٠,٥- ١) مەتر دایە ل لایێ چەپێ یێ سكری، لێ ل لایێ راستێ هندەك ڤەوەریانێن (نیشتەیێن) نوی یێن كەڤرێن هەرێ هەنە كو پترییا روویێ حەوزا وێ ب ڤان ڤەوەریانێن نوی هاتییە نخافتن و ستووراتیا وێ دگەهیتە نێزیكی ٦ مەتران[١٢].

جوداهی دناڤبەرا روویێ ڤێ حەوزێ دا یێ هەی ب ڕەنگەكی بلندترین خالا بلنداهییا وێ دگەهیتە ١٢٢١ مەتران ل لایێ باشووری یێ چیایێ بێخیر و ل دووڤدا روویێ وی خوار دبیت بەرەڤ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایی، هەر ئێك ژ گەلیێ كشكان ل لایێ رۆژهەلاتی و گەلیێ مزری ڕادبن ب هەرکاندنا ئاڤا ڤێ دەڤەرێ ب ڕەنگەكی كو سەروكانییێن وان ژ بلنداهییا ١٢٥٠ مەتر هێدی هێدی نزم دبن هەتا گەلیێ زاخۆ دگەهیتە ٨٠٠ مەتران.

ئەڤ سكرە دكەڤیتە سەر گەلیێ كشكان ل باكوورێ ڕێكا باتێل- دیرەبوونێ ب دووراتییا ١٢٠٠ مەتران و د نیڤەكا دەریاچا وێ را هێلا كەنتور (٤٨٠ م) تێرا دبوریت و درێژییا ڤی گەلی هەتا سكری دگەهیتە ٧ كیلومەتران و سەرجەمی وی دبیتە ١٥ كیلومەتر هەتا درێژتە دەریاچا سكرێ مووسل. ئەڤ دەڤەرە دهێتە نیاسین كو خودانا توپۆگرافییەكا سادە یا پێكهاتی ژ هندەك گركان یێن ژ ئەنجامێ كارێ ڕامالینێ ل وان گەلییان پەیدابووین، بلنداهییا وی گركێ دكەڤیتە بەرامبەر دەریاچا ڤی سكری دگەهیتە ٢٢-٢٧ مەتران.

#### تایبەتمەندییێن گشتی یێن سكر و دەریاچا كشكان[١٣]:

ئەڤ سكرە ژ هندەك گومتلێن تەقنێ پێكدهێت و ب بەرێن پێكڤە گرێدایی هاتییە نخافتن ب درێژییا ٢٨٧ مەتر و فرەهییا بنكێ وی ١٢١,٤مەترن و فرەهییا سەری وی ٧ مەترن و بلنداهییا ٢١ مەترن. د شیانێن ڤی سكری دا هەیە سالانە نێزیكی ١,٤ ملیون مەترێن سێجا یێن ئاڤێ عەمباربكەت ژبۆ مەرەمێن ئاڤدانا گیانەوەران و چاندنێ. شیانێن عەمباركرنێ یێن ڤی سكری پشت بەستنێ دكەنە سەر ئاڤا بارانێن وەرزی زێدەباری هندەك كانییێن ئاڤێ كو تێكرایێ بەرهەم ئینانا ئاڤا وان (١لیتر/چركە) دایە، ڤی سكری دەرگەهەكێ زێدە یێ هەی بۆ ڕێژتنا ئاڤێ ل دەمێ ڕابوونا لەهییان، فرەهییا وی دگەهیتە ٣٥ مەتران، تەماشەی خشتەیێ ژمارە ٥ و وێنەیێ ژمارە ٥ بكە.

رووبەرێ دەریاچێ و شیانێن وێ یێن عەمباركرنێ دهێنە گوهۆرین دگەل گوهۆرینا ئاستێ روویێ دەریاچێ، ل ئاستێ روویێ ٤٨٣ مەتران، شیانێن وێ یێن عەمباركرنێ دگەهنە ٠,٦ ملیون مەترێن سێجا، مەزنترین شیانێن وێ دگەهنە ١,٥ ملیون مەترێن سێجا ل ئاستێ بلنداهییا ٥٠١ مەتران.

### ٣. سكرێ مام شڤان

ئەڤ سكرە دكەڤیتە باشوورێ قەزا سێمێلێ ب دووراتییا ١١ كیلومەتران ل گوندێ مام شڤان (تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٦ بكە) ئانكو ل سەر وێ ڕێكێ یا بەرەڤ كۆمەلگەها خانكێ و سكرێ مووسل ڤە دچیت. ژ لایێ فەلەكیڤە دكەڤیتە سەر هێلێن

**خشتەیێ (٥)**

**تایبەمەندییێن درێژاهیێ یێن سکرێن مام شڤان و کشکان**

| ناڤێ سکری | مام شڤان | کشکان |
|---|---|---|
| دووراتی ژ گوندی | ٥٠ | ٢٠٠ |
| درێژاهی/ مەتر | ٢٦٠ | ٢٨٧ |
| فرەهیێ ژ سەریڤە/ مەتر | ٧ | ٧ |
| بلنداهی/ مەتر | ١٧ | ٢١ |
| فرەهیا بنکەی/ مەتر | ١٠١ | ١٢١ |
| فرەهیا دەرگەهێن رێژتنێ | ٧ | ٣٥ |
| جۆرێ سکری | ئاخی یا نخافتی ب بەران | ئاخی یا نخافتی ب بەران |
| شیانێن عەمبارکرنێ/ مليون م٣ | ١,٧ | ١,٥ |
| ئارمانجا دروستکرنێ | چاندن | ئاڤدان |
| سالا بجهئینانا پرۆژەی | ٢٠١٣ | ٢٠٠٨ |
| بلنداهیا لێڤێن دەریاچێ/ مەتر | ٢٢ _ ٢٥ | ٢٢ _ ٢٧ |

- پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە ٦ هاتییە کرن

**وێنەیێ (٥)**

**سکر و دەریاچا کشکان ل دەمێ دروستکرنێ**




- وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە هاتییەگرتن ل رێکەفتی ٢٠١٢/١٢/١٥.

فرەهیێ (٣٦ً٤٨َ٣٦) ل باكووری و هێلێن درێژاهیێ (١٨ً ٤٢ْ ٤٦َ ) ل رۆژهەلاتی.

جیۆلۆجیيا سكر و دەریاچا ڤی سكری یا سادەیە و پێكهاتنا وێ نەیا ئالۆزە، ل هندەك جهان هندەك بادانێن خوار یێن هەین كو سەرێ هندەك ژوان پیچەك تیژ دبیت و گركان دروست دكەن، هەردیسان هندەك بادانێن دی یێن قەوری یێن هەین كو هندەك ڤالاهی و دەڤەرێن نزم دروستدكەن و دبنە دەڤەرێن باش ژبۆ عەمباركرنا ئاڤێ پشتی سكر ل سەر دهێنە دروستكرن.

ژلایێ كەڤریڤە ژی، جهێ ڤی سكری هندەك كەڤرێن بەرێ خیزی (Sandsto) یێن هەین كو ستووراتییا وان دگەهیتە ٢٥ مەتران و هەتا ١٠ پلەیان خوار دبن هەردیسان چەندین كەڤرێن هەرێ (Clay)ژی یێن هەین دگەل ڤەوەراندنێن بەرمایكێن رووباران ب ستووراتییا ٢- ٦ مەتران[١٤].

حەوزا دەریاچا مام شڤان ژ دو گەلیێن سەرەكی پێكدهێت ئەوژی گەلیێ هشك (wadi hishk)و گەلیێ بەیرەق (Wadi bayraq)و ب گەهشتنا هەردوكان گەلیێ مام شڤان پەیدادبیت، سەروكانییێن وی ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ بێخێر خوار دبن هەتا دگەهنە ١١٨٠ مەتران سەر ئاستێ روویێ دەریایی لێ پتریيا ڤان سەروكانییان بلنداهییا وان دناڤبەرا ١١٠٠ هەتا ١١٥٠ مەترانداية. درێژیيا ڤی گەلی ژ دەسپێكا وی هەتا درێژتە سكرێ مووسل دگەهیتە ٢٥ كیلومەتران. ب شێوەیەكێ گشتی ئەڤ دەڤەرە یا بێ بلنداهی و نزماتییە بەلكو پتریيا عەردێ وێ یێ راستە ب تایبەت باكووری سەنتەرێ ڤەزا سێمێلێ و ئاخا وێ یا زەنگینە ب ماددێن ئەندامی (المواد العضوية) رووبەرێ حەوزا ڤی سكری دگەهیتە ٩٥,٥ كیلومەترێن دووجا[١٥].

**وێنەیێ (٦)**
**سكرێ مام شڤان**




- وێنە ژ لایێ ڤەكۆلەریڤە ل رێكەفتی ٢٠١٣/٣/٥ هاتییەگرتن.

**تایبەتمەندیێن گشتی یێن سکرێ مام شڤان[١٦]:**

ئەڤ سکرە ژ گومتلێن تەقنێ هاتییە دروستکرن و ب بەرێن پێکڤە گرێدایی هاتییە نخافتن و دکەڤیتە دەڤەرەکا خاروڤیچدا کو هندەك گرك لێ هەنە بلنداهیا وان دناڤبەرا ٢٢- ٢٥ مەترانداپە ل سەر ئاستێ بنکێ گەلی، درێژیا سکری دگەهیتە ٢٦٠ مەتران و فرەهیا بنکێ وی دگەهیتە ١٠١ مەتران و فرەهیا سەرێ ڤی دگەهیتە ٧ مەتران و بلنداهیا ویژی دگەهیتە ١٧ مەتران و سالانە شیانێن عەمبارکرنا نێزیکی ١,٧ ملیون مەترێن سێجا یێن ئاڤێ هەنە ژبۆ چاندن و ئاڤدانا گیانەوەران (تەماشەی خشتەیێ ژمارە ٥ بکە)، شیانێن عەمبارکرنێ یێن ڤی سکری پشت بەستنێ دکەنە سەر ئاڤا بارانێن وەرزی، ڤی سکری دەرگەهەکێ زێدە یێ هەی بۆ رێژتنا ئاڤێ ل دەمێ رابوونا لەهییان، فرەهیا وی دگەهیتە ٧ مەتران و کووراتییا وی دگەهیتە ٣ مەتران.

### ٤. سکرێ سپنەیێ رۆژئاڤایی ٢:

ئەڤ سکرە دهێتە هژمارتن دووەم سکرێ ناڤنجی ل پارێزگەها دهۆکێ پشتی سکرێ دهۆکێ و دکەڤیتە ناحیا بامەرنێ. ئەڤ سکرە دکەڤیتە لایێ رۆژئاڤایێ سەیرانگەها سەرسنکێ و ب دووراتییا ١٠ کم دناڤ سنوورێ قەزا ئامێدیێ دا، هەروەسا ل باکوورێ سەنتەرێ پارێزگەها دهۆکێ ب دووراتییا ٦٠ کم ل سەر رێرەوێ سەرەکی یێ گەلیێ سپنەیێ رۆژئاڤایی. حەوزا ڤی سکری ب رووبەرێ ١٣٨,٧٣ کم٢ ئێکدگریت دگەل بنارێ باشووری یێ چیایێ مەتین ل لایێ باکووری، بنارێ باکوورێ یێ چیایێ سوارەتیکا و تاژیکا و کوژیێ باکوورێ رۆژئاڤایێ چیایێ گارە ل لایێ رۆژئاڤایی، رێکا سەرسنك – قەدش ل لایێ رۆژهەلاتێ. ژ لایێ فەلەکی ڤە دکەڤیتە سەر هێلێن درێژاهیێ (٤٣ْ ١٣َ ٥٠) ل رۆژهەلاتی و هێلێن فرەهیێ (٣٧ْ ٠٣َ ٣٩ً)ل باکووری (تەماشەی نەخشەیێ ژمارە ٣ بکە).

ژلایێ جیوجولیڤە، جهێ سکر و دەریاچا سپنەیێ بچویك یێ پرە ژ کەڤران کو هژمارەکا مەزن یا کەڤرێن بەرێ خیزی (Sandston) یێن لێ هەین و ل بەشێن سەری ژی هندەك ڤەوەریانێن ژێهەلییان لێ هەنە.

حەوزا ڤی سکری ژ سێ گەلیێن خوار پێکدهێت هەر ژ بنارێ باشووری یێ چیایێ مەتین و ئەڤ گەلیە ب لاریۆنەکا گشتی بەرەڤ ئاراستەیێ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایی درێژ بیت، زێدەباری هەبوونا چەندین گەلیێن کورت و لار ژ بنارێ باکووری یێ چیایێ سیارەتیکا و تاژیکا. بلنداهیا روویێ حەوزا وی دناڤبەرا ٧٨٠ هەتا ٢٠٠٠ مەترانداپە ل سەر ئاستێ روویێ دەریایی. هژمارەکا گەلیێن خوار ل بنارێ باشووری یێ چیایێ مەتین رادبن ب هەرکاندنا ئاڤا ڤێ دەڤەرێ وەك گەلیێ گۆلی و شێخ مەما و گەلیێ ئاشەوا و سوارەتیکا ل بنارێ باشووری.

**تایبەتمەندیێن گشتی یێن سکرێ سپنەیی ٢:**

ئەڤ سکرە ژ گومتلێن تەقنێ هاتییە دروستکرن و ب بەرێن پێکڤە گرێدایی هاتییە نخافتن. ئەڤ سکرە ژ لایێ هەردو کۆمپانییێن زنار یا عیراقی و کۆمپانیا ئەردنیزی یا تورکی ب کوژمێ ٦,٩ ملیار دیناران هاتییە بجهئینان. درێژیا وێ نێزیکی ٢٤٠ م و فرەهیا وێ ل لایێ سەری ١٠ مەترن و بلنداهیا ویژی ٢٢ مەترن. ڤی سکری سالانە شیانێن عەمبارکرنا نێزیکی ٥ ملیون مەترێن سێجا یێن ئاڤێ هەنە ژبۆ ئاڤدانا گیانەوەران و چاندنێ. شیانێن عەمبارکرنێ یێن ڤی سکری پشت بەستنێ دکەنە سەر ئاڤا بارانێن وەرزی، ڤی سکری دەرگەهەکێ زێدە یێ هەی بۆ رێژتنا ئاڤێ ل دەمێ رابوونا لەهییان، فرەهیا وی دگەهیتە ١٠ مەتران و کووراتییا وی دگەهیتە ٦ مەتران[١٧] تەماشەی وێنەیێ ژمارە ٧ بکە.

### ٥. سکرێ خنس:

سکرێ خنس دکەڤیتە دووراتییا ٤٠کم باکووری ناڤەندا قەزا شێخان و ب سەر گەلیێ خەوسەر، ژ لایێ فەلەکیڤە دکەڤیتە سەر هێلێن درێژاهیێ (٣٦ً

٤٣٢٥) ل رۆژهەلاتی و هێلێن فرەهیێ (٣٦٤٥٤٢) ل باکووری، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە ٤ بکە.

حەوزا سکرێ خنس دگەل بنارێ رۆژئاڤایی یێ چیایێ سیارەتیکا ئێکدگریت، هەردیسان دگەل حەوزا رووبارێ بەدرەدین ل چەمانکێ ل لایێ باکوورێ رۆژئاڤایی و حەوزا روگەرم ل باکوورێ باکوورێ رۆژئاڤایی. ئەڤ سکرە ژ هژمارەکا گەلییان پێکدهێت کو بەرەڤ باشوور و باشوورێ رۆژهەلاتیڤە درێژدبن، زێدەباری هژمارەکا گەلیێن کورت و خوار ژ بنارێ چیایێن دکەڤنە دەڤەرێ. بلنداهیا روویێ حەوزێ دگەهیتە ١٦٠٠ مەتر هەتا ٤٨٠ مەتر سەر ئاستێ روویێ دەریایی، هەروەسا دگەل چیایێ ملا کیرزا ب بلنداهیا ١٠٠٦ مەتران و چیایێ کێکری ب بلنداهیا ١٠٩١مەتران ئێکدگریت

**نەخشەیێ (٣)**

**سنوورێن حەوزا سکرێ سپنەی ٢**




Sbna- 2 Dam, Hydrological Investigation Report, Duhok, Iraq, 2012, p 4-5.

وێنەیێ (٧)
جهێ سکرێ سپنەیێ ٢



- وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە ل ڕێکەفتی ٢٠١٥/٥/١٧ هاتیبەگرتن.

**تایبەتمەندیێن گشتی یێن سکرێ خنس،**

ئەڤ سکرە ژ کومتلێن تەقنێ هاتیبە دروستکرن و ب بەرێن پێکڤە گرێدایی هاتییە نخافتن. درێژیا وێ نێزیکی ٢٠٠م و فرەهیا وێ ل لایێ سەری ١٠ مەترن و بلنداهیا ویژی ٢٠ مەترن. ڤی سکری سالانە شیانێن عەمبارکرنا نێزیکی ٤,٦٩ ملیون مەترێن سێجا یێن ئاڤێ هەنە، لێ نزمترین ئاستێ عەمبارکرنێ دگەهیتە ٨٠٨ هزار مەترێن سێجا. مەرەما سەرەکی ڤی سکری ژبۆ کونترۆلکرنا ئاڤێ و عەمبارکرنا وێ و ئاڤدانا گیانەوەران و چاندنێ بوو زێدەباری لایەنی گەشتوگوزاری. شیانێن عەمبارکرنێ یێن ڤی سکری پشت بەستنێ دکەنە سەر ئاڤا بارانێن وەرزی و چەندین کانیێن ئاڤێ، ڤی سکری دەرگەهەکێ زێدە یێ هەی بۆ ڕێژتنا ئاڤێ ل دەمێ ڕابوونا لەهیان کو هێزا ڕێژتنا وێ دگەهیتە ٧٩٧ م٣/چرکە[١٨].

## سێیەم: سکرێن بچویک

دروستکرنا سکرێن بچویک دهێتە هژمارتن ئێک ژ گرنگترین ڕێکێن هەلگرتنا ئاڤێ ل دەڤەرێ، د ماوەیێ ڤەکۆلینەکا جوگرافی بۆ عەردێ حەوزا روویێ پارێزگەها دهۆکێ (بلندی و نزمیا روویێ پارێزگەها دهۆکێ) دیاربوویە کو دشیانێن عەردێ وێ دا هەیە مفا ژێ بێتە وەرگرتن ژ پێخەمەت هەلگرتنا ئاڤێ ب تایبەت دروستکرنا سکرێن بچویک.

ئەڤ سکرە سەر وان گەلیان دهێنە دروستکرن یێن رووبەرەکێ بەرفرەهـ هەی و ل جهەکی تەنگ دبیت داکو سکر ل وی جهی بێتە دروستکرن، دبیت ئەڤ سکرە ب ئاخێ یان ب بەران یان ب تێکەلەکی ژ هەردویان بێتە دروستکرن. پێکهاتنا سکرێن بچویک ژی وەکی یا سکرێن مەزنە (ئەڤ سکرە ژی پێکدهێن ژ دیوارێ سکری، دەریاچا عەمبارکرنێ، دەرگەهێن

توومار نەکرینە ب تایبەت قەزا ئاکرێ. بەرهەمێ گشتی یێ پتاتان نێزیکی (71232) تەنان بوویە کو رێژەیا(38,54٪)ێ ژ قەزا شێخان هاتییە و ل ریزا ئێکێ دهێت. ل دووڤدا هەر ئێک ژ قەزایێن بەردەڕەش و سێمێلێ ل ریزێن سێیێ و چوارێ دهێن ب رێژەیێن (26,04٪، 24,47٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پتاتان ل پارێزگەهێ، لێ قەزایێن زاخۆ و دهۆک و ئامێدیێ ب رێژەیێن گەلەك كێم ل ریزێن داویێ دهێن، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (3) بکە.

2. هەردو قەزایێن ئامێدی و ئاکرێ پێکڤە پتر ژ سێ چارێکێن بەرهەمێ گشتی یێ پیڤازان ل پارێزگەهێ دماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان توومارکریە ئەو ژی ب رێژەیێن (39,23٪، 37,28٪)ێ ل دووڤ ئێك، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هەبوونا ژێدەرێن ئاڤێ یێن گرنگ دزڤریت. هەردیسان ئەڤ بەروبوومە ل هەمی قەزایێن دی یێن پارێزگەهێ هاتییە چاندن ب رێژەیێن جوداجودا.

3. قەزا بەردەڕەش پتر ژ نیڤا بەرهەمێ گشتی یێ بەروبۆمێن سلکان ل پارێزگەهێ پێکدئینیت ئەو ژی ب رێژەیا(55,54٪)ێ، قەزا ئامێدیی ل ریزا دووێ دهێت ب رێژەیا (24,24٪)ێ، هەرسێ قەزایێن دهۆك و سێمێل و شێخان ژی رێژەیێن نێزیکی ئێك پێکدئینن لێ قەزایێن زاخۆ و ئاکرێ چ رێژە توومار نەکرینە د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان.

4. پتریا بەربوومێ شێلمان ل قەزا سێمێلێ هاتییە چاندن ب رێژەیا (81,37٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ، ل دووڤدا هەر ئێك ژ

نەخشەیێ (3)

گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن رهدار (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (2013_2014)




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ کارگێری یێ پارێزگەها دهۆکێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (5).

قەزایێن شێخان و ئامێدی ب رێژەیێن (١٠,٨٥٪، ٧,٧٧٪)ێ ل دووڤ ئێك ل ریزێن دووێ و سیێ دهێن، لێ قەزایێن دی چ رێژە توومار نەکرینە.

٥. د ماوەیێ سالێن ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان، تڤر ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ هاتییە چاندن لێ قەزا بەردەرەش ل ریزا ئێکێ دهێت ب رێژەیا (٣٨,٤٦٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ، ل دووڤدا قەزا ئامێدیێ ل ریزا دووێ دهێت ب رێژەیا(٢٦,٩٢٪)ێ. رێژەیا بەرهەم ئینانێ ل قەزایێن دی ژی یا نێزیکی ئێك بوو.

٦. پتریا بەروبوومێن شێلمدر و گێزەران ل قەزایێن شێخان و ئامێدیێ هاتییە توومارکرن لێ قەزایێن دی دماوەیێ سالێن ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان چ رێژە توومار نەکرینە.

## ٤- بەروبۆمێن زەیتی:

بەروبۆمێن زەیتی وان جۆرێن شینکاتییان بخۆڤە دگریت یێن ژبۆ مەرەما دەرخستنا زەیتێ دهێنە چاندن ژبەرکو ئەڤ شینکاتییە رێژەیەکا باش یا زەیتێ دناڤ بەروبۆمێن خۆدا عەمبار دکەن وەك (گولبەرۆژ، کونجی و تۆڤکێن پەمپی و گژنیژ ...هتد)[٩]. د خشتەیێ ژمارە (٦) دیار دبیت کو بتنێ چوار جۆرێن بەروبۆمێن زەیتی یێن زڤستانی ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە چاندن.

**ژ پێزانینێن خشتەیێ ژمارە (٦) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان، قەزا شێخان شیایە هەمی جۆرێن بەروبۆمێن زەیتی یێن زڤستانی یێن د خشتەیێ (٦) دا هاتینە دیارکرن بەرهەم بینیت، ئەڤ قەزایە ل ریزا ئێکێ دهێت ژبۆبەرهەمئینانا گژنیژان ب رێژەیا(٨٨,١٥٪)ێ و گەنموکێن زەر ب رێژەیا (٦٦,٦٦٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ ڤان هەردو بەروبۆمان ل پارێزگەهێ، تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٣) بکە.

٢. رێژەیا بەرهەمئینانا بەروبۆمێن پیڤازان ل پتریا

**خشتەیێ (٦)**

**گرنگییا رێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن زەیتی (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | یەکەیێن کارگێری | پیڤاز | | گولبەرۆژ | | گەنموکێن زەر | | گژنیژ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| ١ | دهۆك | ٨ | ٧,٣٣ | ١٥,٦ | ٣٩,٧٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ١ | ٠,٩١ | ٠ | ٠ | ١٤٠٠٠ | ١٠,٢٥ | ٠,٣١ | ٤,٧٧ |
| ٣ | ئامێدی | ٤٥ | ٤١,٢٨ | ٨,٥٨ | ٢١,٨٥ | ٠ | ٠ | ٠,٤٦ | ٧,٠٧ |
| ٤ | شێخان | ١٧ | ١٥,٥٩ | ١١,١٨ | ٢٨,٤٧ | ٩١٠٠٠ | ٦٦,٦٦ | ٥,٧٣ | ٨٨,١٥ |
| ٥ | ئاکرێ | ٠ | ٠ | ٣,٩ | ٩,٩٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٦ | زاخۆ | ٣٨ | ٣٤,٨٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٣١٥٠٠ | ٢٣,٠٧ | ٠ | ٠ |
| پارێزگا | | ١٠٩ | ١٠٠ | ٣٩,٢٦ | ١٠٠ | ١٣٦٥٠٠ | ١٠٠ | ٦,٥ | ١٠٠ |

**- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکولەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.**

**وێنەیێ (٣)**

**گرنگییا رێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن زەیتی (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٦).

یەکەیێن کارگێری یێن پارێزگەهێ گەلەك یا کێم بوو، لێ هەردو قەزایێن ئامێدی و زاخۆ پتر (٧٥٪)ێ ژ ڤێ بەرهەمی پێکدئینن ئەو ژی رێژەیا (٤١,٢٨٪)ێ بۆ قەزا ئامێدیێ و (٣٤,٨٦٪)ێ بۆ قەزا زاخۆ، لێ هەردو قەزایێن بەردەڕەش و ئاکرێ چ رێژە د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان توومار نەکرینە.

٣. ژبۆ چاندنا گولبەرۆژان قەزا دهۆکێ ل رێزا ئێکێ ب رێژەیا (٣٩,٧٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ دهێت، ل دووڤدا هەر ئێك ژ قەزایێن شێخان و ئامێدیێ ب رێژەیێن (٢٨,٤٧٪، ٢١,٨٥٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن. سەرەڕای ڤان رێژەیێن بلند لێ هندەك قەزایێن دی چ رێژە د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین هاتییە ئەنجامدان توومار نەرکینە.

### ٥- بەروبۆمێن کەسکاتی:

بەروبۆمێن کەسکاتی هژمارەکا وان شینکاتییان بخۆڤە دگریت یێن دهێنە چاندن ژ پێخەمەت مفا وەرگرتنێ ژ بەلگێن وان یان بەرهەمێ وان، ئەڤ شینکاتییە ل سەر ئاخێ شین دبن و رهـ پێڤە نینن و دبیت ژ جۆرێ شینکاتیێن بەلگدار بن. ل دووڤ وان داتایێن دەستکەفتی دیاردبیت کو هژمارەکا کێم یا بەروبۆمێن کەسکاتی ل پارێزگەها دهۆکێ دهێنە چاندن وەك (قەڕنابیت و کەلەمی و خەسان .... هتد) و بڕا بەرهەمئینانا ڤان بەروبۆمان د خشتەیێ ژمارە (٧) دا هاتینە دیارکرن.

**ژ پێزانینێن خشتەیێ ژمارە (٧) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاربن:**

١. ژ داتایێن خشتەیێ سەری بۆ مە دیاربیت

**خشتەیێ (٧)**

**گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمێن بەروبومێن کەسکاتی (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | یەکەیێن کارگێری | فەرنابیت | | کەلەمی | | خەس | | کەسکاتیێن دی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| ١ | دهۆك | ٠ | ٠ | ١٤ | ٦,٤٩ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سیمێل | ٠ | ٠ | ٢٢,٤ | ١٠,٣٩ | ٤٠ | ٢٤,٣٩ | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ٨ | ١٥,٣٨ | ١١٢ | ٥١,٩٥ | ٠ | ٠ | ٦٩,٧ | ١٩,٦١ |
| ٤ | شێخان | ٤٤ | ٨٤,٦٢ | ٦٧,٢ | ٣١,١٧ | ١٠٠ | ٦٠,٩٧ | ٢٧٢ | ٧٦,٥٥ |
| ٥ | ئاکرێ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ١١,٩ | ٣,٣٥ |
| ٦ | زاخۆ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٤ | ١٤,٦٣ | ١,٧ | ٠,٤٨ |
| ٧ | بەردەرەش | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| | پارێزگەهـ | ٥٢ | ١٠٠ | ٢١٥,٦ | ١٠٠ | ١٦٤ | ١٠٠ | ٣٥٥,٣ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ نوکە.

**وێنەیێ (٤)**

**گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمێن بەروبومێن کەسکاتی (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٧).

کو هندەك قەزایێن پارێزگەهێ چ بەروبۆمێن کەسکاتی نەچاندینە یان ژی بەرهەم نەئینانە وەك قەزایێن بەردەڕەش و ئاکرێ، لێ بەروڤاژی قەزا شێخان شیایە هەمی جۆرێن بەروبۆمێن کەسکاتی ب چینیت و بەرهەم بینیت و قەزا ئێکانەیە ژبۆ هنارتنا هەمی جۆرێن بەروبۆمێن کەسك بۆ قەزایێن دی.

٢. چاندن و بەرهەمئینانا قەڕنابیتێ بتنێ ل دو قەزایێن پارێزگەهێ هەیە ئەو ژی قەزایێن شێخان و ئامێدیێ ب ڕێژەیێن (٨٤,٦٢٪، ١٥,٣٨٪)ێ ل دووڤ ئێك، لێ د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ئەڤ بەروبۆمە ل قەزایێن دی نەهاتییە چاندن، تەماشەی وێنەیێ ژمارە (٤) بکە.

٣. بەروبۆمێن خەسان ل پارێزگەهێ تنێ ل هەرسێ قەزایێن شێخان و سێمێلێ و زاخۆ دهێنە بەرهەمئینان ب ڕێژەیێن (٦٠,٩٧٪، ٢٤,٣٩٪، ١٤,٦٣٪)ێ ل دووڤ ئێك.

٤. قەزا شێخان جۆرێن دی یێن کەسکاتی ژی بەرهەم ئینانە ب ڕێژەیا(٧٦,٥٥٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت بەرهەمێ پارێزگەها دهۆکێ د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییەئەنجامدان.

## دووەم : بەروبۆمێن چاندنێ یێن هاڤینی

بەروبۆمێن هاڤینی وان بەرهەمان بخۆڤە دگریت یێن ل داوییا بوهارێ و دەستپێکا هاڤینێ دهێنە چاندن[١٠]. ئەڤ بەروبۆمە ل سەر دو جۆران دهێنە دابەشکرن ئەو ژی بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری و بەروبۆمێن ڕهدار یێن هاڤینێ. بەروبۆمێن هاڤینێ دهێنە هژمارتن ژێدەرێن سەرەکی و گرنگ یێن خوارنێ ل وەرزێ هاڤینێ، هەردیسان ژێدەرەکێ گرنگن بۆ داهاتیێ جۆتیار و کرێکارێن د بوارێ چاندنی دا کاردکەن. بۆ چاندنا ڤان جۆرە بەروبۆمان جۆتیار پشت بەستنێ دکەنە سەر ئاڤدانێ کو بەهرا پتریا جاران ئاڤا ڕووباران ب ڕێکا جۆکان یان بۆریان بۆ ناڤ ڕەز و بیستانان دهێتە کێشان، یان ژی ب ڕێکا کانیك و بیرێن ئیرتیوازی ل پارێزگەها دهۆکێ.

ئەم دشێین دیارترین بەروبۆمێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ دابەش بکەین بۆ سەر چەندین جۆران ئەو ژی ل دووڤ جۆرێ بەروبۆمی و گرنگییا وی یا ڕێژەیی، ئەو ژی ب ڤی شێوەی: ل ڕێزا ئێکێ بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری دهێن ب برا(٢٢٧٥٠٣) تەنان کو ڕێژەیا وێ دبیتە (٧٨,٦٥٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ چاندنێ یێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ.

**خشتەیێ (٨)**

**گرنگییا ڕێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | جۆرێ بەروبۆمی | برا بەرهەم ئینانێ\تەن | ٪ |
|---|---|---|---|
| ١ | بەروبۆمێن دانودکاکی | ٥٤١١ | ١,٨١ |
| ٢ | باقلەمەنی | ٢٢٧٤ | ٠,٧٨ |
| ٣ | بەروبۆمێن ڕهدار | ٤٤٧٠٠ | ١٥,٤٥ |
| ٤ | بەروبۆمێن زەیتی | ٩٣٨٤ | ٣,٢٤ |
| ٥ | بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری | ٢٢٧٥٠٣ | ٧٨,٦٥ |
| | سەرجەمێ گشتی | ٢٨٩٢٧٢ | ١٠٠ |

**- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.**

ل دووڤدا بەروبۆمێن ڕهدار دهێن ب برێ (٤٤٧٠٠) تەنان و ڕێژەیا وان دبیتە (١٥,٤٥٪)ێ، ل ڕێزا سیێ ژی بەروبۆمێن زەیتی ب برێ (٩٣٨٤) تەنان دهێن کو ڕێژەیا وان دبیتە (٣,٢٤٪)ێ، لێ بەروبۆمێن دانودکاکی وەك برنجی برا وی دگەهیتە (٥٤١١) تەنان ب ڕێژەیا (١,٨١٪)ێ، تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٨) و وێنەیێ ژمارە (٥) بکە.

ژبلی ڤان بەروبۆمان، تویتن ژی ل قەزایێن پارێزگەهێ دهێتە چاندن لێ ژبەرکو ڕێژەیا بەرهەمئینانا وێ گەلەك یا کێمە لەورا دڤێ ڤەکۆلینێ بەحسێ وێ نەهاتیە کرن، د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ل قەزا ئامێدیێ نێزیکی (١١) تەنێن تویتنێ هاتینە بەرهەم ئینان. ڕێژەیا بەرهەمئینانا ڤان بەروبۆمان ل سەر ئاستێ قەزایێن پارێزگەهێ دهێتە گوهۆرین، تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٩) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٩) ئەڤ ڕاستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری پتریا بەرهەمێ هاڤینێ ل پارێزگەهێ پێکدئینن کو برێ وێ دگەهیتە(٢٢٧٥٠٣) تەنان، قەزا بەردەڕەش پتر ژ نیڤا ڤی بەروبۆمی بەرهەم دئینیت ب ڕێژەیا (٥٠,١٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ، ل دووڤدا قەزایێن ئاکرێ و شێخان ل ڕێزێن دووێ و سیێ ب ڕێژەیێن (١٥,٨٧٪، ٩,٧٤٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن، ڕێژەیا بەرهەمئینانا وان ل یەکەیێن دی یێن کارگێری ژی یا نێزیکی ئێکە.

٢. هەردیسان قەزا بەردەڕەش پتر ژ نیڤا بەرهەمێ پارێزگەهێ یێ بەروبۆمێن دانودکاکی ل هاڤینێ پێکدئینیت کو ل ڕێزا ئێکێ ب ڕێژەیا (٥٠,٣٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ دهێت، ل دووڤدا قەزا ئاکرێ ب ڕێژەیا (٣٨,٥٦٪)ێ دهێت، لێ قەزایێن دهۆك و زاخۆ و سێمێلێ چ ڕێژەیێن بەرهەمئینانا بەروبۆمێن هاڤینی ب تایبەت برنجی تۆمار نەکرینە.

**وێنەیێ (٥)**

**گرنگییا ڕێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٩).

## خشتەیێ (٩)

### گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)

| بەروبۆم / قەزا | بەروبۆمێن بەری: بەرهەم | بەروبۆمێن بەری: ٪ | باقلەمەنی: بەرهەم | باقلەمەنی: ٪ | بەروبۆمێن رهدار: بەرهەم | بەروبۆمێن رهدار: ٪ | بەروبۆمێن زەیتی: بەرهەم | بەروبۆمێن زەیتی: ٪ | بەروبۆمێن دانودکاکی: بەرهەم | بەروبۆمێن دانودکاکی: ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ١١٦٨٩ | ٥,١٣ | ٢٠٧ | ٩,١ | ١٠٥٠ | ٢,٣٤ | ١٠ | ٠,١١ | ٠ | ٠ |
| سێمێل | ١٥٩٠٢ | ٦,٩٩ | ٢٧ | ١,١٨ | ٥٩٠٦ | ١٣,٢ | ١٢٠٧ | ١٣,٥١ | ٠ | ٠ |
| ئامێدی | ١٠٣٦٢ | ٤,٥٥ | ٢٩٨ | ١٣,١ | ٢٦٦١ | ٥,٩٤ | ٤٢٨ | ٤,٧٩ | ٨٨ | ١,٤٩ |
| شێخان | ٢١٥٤٧ | ٩,٤٧ | ١٣٩ | ٦,١١ | ١٥٤١٠ | ٣٤,٤٦ | ٣٦١٣ | ٤٠,٤٤ | ٦٨ | ١,١٥ |
| ئاکرێ | ٣٦١١٤ | ١٥,٨٧ | ٥١١ | ٢٢,٤٧ | ١٣١٦ | ٣,٩٣ | ٣٠ | ٠,٣٣ | ٢٧٧٩ | ٣٨,٥٦ |
| زاخۆ | ١٧٨٩٤ | ٧,٨٦ | ٢٧ | ١,١٨ | ٦٨٢ | ١,٥١ | ٩٠٠ | ١٠,٠٧ | ٠ | ٠ |
| بەردەڕەش | ١١٣٩٩٥ | ٥٠,١ | ١٠٦٥ | ٤٦,٨٤ | ١٧٦٧٥ | ٣٩,٥٣ | ٣١٩٦ | ٣٥,٧٧ | ٢٩٧٥ | ٥٠,٣٤ |
| پارێزگەه | ٢٢٧٥٠٣ | ١٠٠ | ٢٢٧٤ | ١٠٠ | ٤٤٧٠٠ | ١٠٠ | ٩٣٨٤ | ١٠٠ | ٥٤١١ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکۆمەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە هاتییە ئامادەکرن.

## نەخشەیێ (٤)

### گرنگیا رێژەیی یا بەروبۆمێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ کارگێری یێ پارێزگەها دهۆکێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (٩).

٣. دیسان قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێكێ ژبۆبەرهەمئینانا باقلەمەنییان و بەروبۆمێن رهدار یێن هاڤینێ ب ڕێژەیێن (٤٦,٨٤٪، ٣٩,٥٣٪)ێ ل دووڤ ئێك بۆ هەر بەروبۆمەكی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ دهێت. قەزا ئاكرێ ل ڕێزا دووێ ژبۆبەرهەمئینانا باقلەمەنییان ب ڕێژەیا (٢٢,٤٧٪)ێ دهێت و قەزا شێخان ژی ل ڕێزا دووێ ژبۆبەرهەمئینانا بەروبۆمێن رهدار ب ڕێژەیا (٣٤,٤٦٪)ێ دهێت. تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٤) بكە.

٤. ژبۆبەرهەمئینانا بەروبۆمێن زەیتی، قەزا شێخان ل ڕێزا ئێكێ ب ڕێژەیا (٤٠,٤٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ دهێت، ل دووڤدا قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا دووێ ب ڕێژەیا (٣٥,٧٧٪)ێ دهێت، لێ كێمترین ڕێژە ل قەزایێن دهۆك و ئاكرێ هاتینە بەرهەمئینان ئەو ژی ب ڕێژەیێن (٠,١١٪،٠,٣٣٪)ێ ل دووڤ ئێك.

**ئەڤێن ل خوارێ دیارترین بەروبۆمێن هاڤینێ نە كو ل دووڤ گرنگی وڕێژەیا بەرهەمئینانا وان هاتینە ڕێزكرن:**

### ١- بەروبۆمێن كەسكاتی یێن بەری

بەروبۆمێن كەسكاتی مەرەم ژێ ئەو شینكاتیێن گیایی نە كو پتریا وان ل وەرزەكی و هندەك ژی ل دو وەرزان و ل هەمی سالان دهێنە چاندن. ئەڤ بەروبۆمە پشكەكا گرنگ یا خوارنا مرۆڤان ل سەر روویێ عەردی دابیندكەن ب تایبەت ئەوێن مفا ژ بەرێ وان دهێتە وەرگرتن وەك (باجانسۆرك، باجانڕەشك، فلفل، بامی و خیار .... هتد)[11]. ل ڤێرێ مە ل دەستپێكێ ئاماژی كرە بەروبۆمێن بەری ژبەركو ڕێژەیابەرهەمئینانا وان ل سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمئینانا بەروبۆمێن هاڤینێ ل پارێزگەهێ پترە.

خشتەیێ ژمارە (١٠) گرنگترین بەروبۆمێن بەردار یێن ل سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان بۆ مە دیار دكەت، ئەو ژی ب ڤی رەنگی:

١. هەمی قەزایێن پارێزگەهێ پشكداری د بەرهەمئینانا بەروبۆمێن بەری یێن هاڤینێ دا كرینە ژبەر پێدڤیا بازارێ ناڤخۆیی بۆ ڤان جۆرە بەرهەمان د سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان. بتنێ قەزا زاخۆ نەبیت كو ڕێژە ژبۆ چاندن وبەرهەمئینانا بەروبۆمێن بامیان دەمێ سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان توومار نەركرینە.

٢. ژ داتایێن د خشتەی دا هاتین بۆ مە دیاردبیت كو قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێكێ دهێت ژبۆ بەرهەمئینانا هەمی جۆرێن بەروبۆمێن بەری یێن هاڤینێ ل پارێزگەهێ ژبەركو قەزایەكا چاندنی یا ناڤدارە ل پارێزگەهێ، بتنێ ل ڤێ قەزایێ ل سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ڕێژەیا بەرهەمئینانا كولندان (٦٦,٩٨٪)ێ و یا بامیان (٦٤,٧٣٪)ێ و ترۆزیان (٦٢,٧٪)ێ و یا خیاران (٥٥,١٪)ێ و یا (٥١,٦٪)ێ یا شتیان و (٤٧,٣٤٪)ێ یا باجانكان و یا (٤٦,٢٧٪)ێ باجانڕەشكان و (٤١,٤٪)ێ یا گوندروان بوو.

٣. بەرهەمئینانا گوندۆران ل ڕێزا ئێكێ ژ ڤی بەرهەمی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ ب بڕی (٦٧٣٩٢) تەنان دهێت، قەزا بەردەڕەش ب پلا ئێكێ ژ ڤی بەرهەمی ب ڕێژەیا (٤١,١٪)ێ دهێت، ل دووڤدا قەزایێن ئاكرێ و شێخان ب ڕێژەیێن (١٤,٥١٪، ١٣,٢٥٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن، ئەڤ بەروبۆمە ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ دهێتە چاندن.

٤. ژ داتایێن خشتەی بۆ مە دیاربیت كو باجانسۆرك ل ڕێزا دووێ ژ سەرجەمێ بەروبۆمێن بەرهەمهاتی ل پارێزگەهێ د ماوەیێ سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ب ڕەنگەكی كو بڕێ وێ گەهشتیە(٤٣٢٤٥) تەنان، قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێكێ دهێت ب ڕێژەیا(٤٧,٣٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ و ل دووڤدا هەر ئێك ژ قەزایێن ئامێدی و سێمێلێ دهێت ل ڕێزێن دووێ و سیێ ب ڕێژەیێن (١٣٪، ١٢,٩٨٪)ێ ل دووڤ ئێك.

٥. بەرهەم ئینانا ترۆزیان ل ڕێزا سیێ دهێت پشتی

گوندۆران و باجانکان ب برا (٣٥٨٧١)تەنان، هەردیسان قەزا بەردەرەش ل ڕێزا ئێکێ دهێت ژبۆبەرهەمئینانا ترۆزیان ب ڕێژەیا (٦٢,٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەم ئینانێ ل پارێزگەهێ، ل دووڤدا هەر ئێك ژ قەزایێن ئاکرێ و شێخان ل ڕێزێن دووێ و سیێ دهێن ب ڕێژەیێن (١٨,٩٥٪ێ ،١٧,٢١٪)ێ ل دووڤ ئێك، ڕێژەیا بەرهەمئینانا ترۆزیان ل قەزایێن دی ژێ تا ڕادەیەکی یا نێزیکی ئێکە، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٥) بکە.

٦. دەربارەی بەروبۆمێن شتیان ژێ، قەزا بەردەرەش ل ڕێزا ئێکێ دهێت ب ڕێژەیا (٥١,٦٪)ێ و ئاکرێ ل ڕێزا دووێ دهێت ب ڕێژەیا (٣٠,٤٪)ێ و ئەڤ هەردو قەزایە پێکڤە ڕێژەیا (٨١٪)ێ پێکدئینن ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمئینانا ڤی بەرویوومی ل پارێزگەهێ.

**خشتەیێ (١٠)**

**گرنگیا ڕێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن بەری (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| یەکەیێن کارگێری | باجانک | | خیار | | باجانرەشك | | بامی | | گوندۆر | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| دهۆك | ٣٠١٥ | ٦,٩٧ | ٤٤٩ | ٢,٠٣ | ٤٧٥ | ٣,٩٩ | ٥٢ | ١,٦٢ | ٦٦٠٠ | ٩,٧٩ |
| سێمێل | ٥٦١٦ | ١٢,٩٨ | ١٨٥٩ | ٨,٤ | ١٣٣٥ | ١١,٢٣ | ١٢٥ | ٣,٩ | ٣٤٥٠ | ٥,١٢ |
| ئامێدی | ٥٦٢٥ | ١٣ | ١٣٩٥ | ٦,٣١ | ٧٧٥ | ٦,٥٢ | ١٤٠ | ٤,٣٥ | ١٤٢٨ | ٢,١١ |
| شێخان | ٣٢٩٨ | ٧,٦٢ | ٩٢٨ | ٤,٢ | ٩٨٥ | ٨,٢٨ | ٣٢٥ | ١٠,١١ | ٨٩٣٤ | ١٣,٢٥ |
| ئاکرێ | ٢٧١٨ | ٦,٢٨ | ٤٢٦٠ | ١٩,٢٧ | ٦٤٠ | ٥,٣٨ | ٤٩١ | ١٥,٢٨ | ٩٧٨٠ | ١٤,٥١ |
| زاخۆ | ٢٤٩٨ | ٥,٧٧ | ١٠٤٤ | ٤,٧٢ | ٢١٧٥ | ١٨,٣ | ٠ | ٠ | ٩٣٠٠ | ١٣,٨ |
| بەردەرەش | ٢٠٤٧٥ | ٤٧,٣٤ | ١٢١٨٠ | ٥٥,١ | ٥٥٠٠ | ٤٦,٢٧ | ٢٠٨٠ | ٦٤,٧٣ | ٢٧٩٠٠ | ٤١,٤ |
| پارێزگەهـ | ٤٣٢٤٥ | ١٠٠ | ٢٢١٠٥ | ١٠٠ | ١١٨٨٥ | ١٠٠ | ٣٢١٣ | ١٠٠ | ٦٧٣٩٢ | ١٠٠ |

| یەکەیێن کارگێری | شتی | | فلفل | | ترۆزی | | کولند | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| دهۆك | ٧١٧ | ٢,٠٧ | ٦٠ | ٢,٠٣ | ٦٠ | ٠,١٦ | ٢٦٠ | ٤,١٦ |
| سێمێل | ٢٤٤٦ | ٧,٠٧ | ٦٢١ | ٢١ | ١٩٨ | ٠,٥٥ | ٢٥٢ | ٤,٠٣ |
| ئامێدی | ٤٠٩ | ١,١٨ | ٢٠١ | ٦,٨ | ٦٩ | ١,١٩ | ٣٢٠ | ٥,١٢ |
| شێخان | ٣٧٩ | ١,١ | ٢٧٣ | ٩,٢٥ | ٦١٧٤ | ١٧,٢١ | ٢٥٢ | ٤,٠٣ |
| ئاکرێ | ١٠٥٢٥ | ٣٠,٤ | ٢٠٧ | ٧,٠٢ | ٦٨١٠ | ١٨,٩٥ | ٦٨٤ | ١٠,٩٤ |
| زاخۆ | ٢٢٥٧ | ٦,٥٢ | ٢٤٠ | ٨,١٤ | ٦٠ | ٠,١٦ | ٣٢٠ | ٥,١٢ |
| بەردەرەش | ١٧٨٥٠ | ٥١,٦ | ١٣٥٠ | ٤٥,٧ | ٢٢٥٠٠ | ٦٢,٧ | ٤١٦٠ | ٦٦,٥٨ |
| پارێزگەهـ | ٣٤٥٨٣ | ١٠٠ | ٢٩٥٢ | ١٠٠ | ٣٥٨٧١ | ١٠٠ | ٦٢٤٨ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەری، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

**نەخشەیێ (٥)**

**گرنگییا ڕێژەیی یا بەرهەمێن بەروبوومێن بەری (تەن) ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)**




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەكۆلەریڤە هاتییە ئامادەكرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ كارگێری یێ پارێزگەها دهۆكێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٠).

## ٢- بەروبۆمێن ڕهدار یێن هاڤینێ

ل وەرزێ هاڤینێ بتنێ دو بەرهەمێن ڕهدار دهێنە چاندن ئەو ژی پیڤاز و پتاتێن پاییزی نە، ئەڤ هەردو بەرهەمە ل دوماهییا وەرزێ بهارێ دهێنە چاندن، پیڤاز ل وەرزێ هاڤینێ دهێنە بەرهەم ئینان لێ پتات ل وەرزێ پاییزێ دهێنە بەرهەم ئینان، ب شێوەیەكێ گشتی بۆ چاندنا ڤان بەروبۆمان ژی پشت بەستن ل سەر ئاڤدانا دەستكرد دهێتە كرن. د خشتەیێ ژمارە (١١) بڕا بەرهەم هاتی یا هەر ئێك ژڤان بەروبۆمان ل پارێزگەهێ ل دووڤ یەكەیێن كارگێری هاتینە دیاكرن.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١١) ئەڤ ڕاستییە بۆ مە دیاربین:**

١. بڕا بەرهەم هاتی یا بەروبۆمێن پتاتان گەهشتییە (٣٢٦٩٣) تەنان ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ د ماوەیێ سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان. پتریبا بەرهەمی ل هەردو قەزایێن ئاكرێ و شێخان هاتییە بەرهەمهینان، قەزا شێخان ل ڕێزا ئێكێ ب ڕێژەیا (٤٤,٧٪)ێ دهێت و قەزا بەردەرەش ل ڕێزا دووێ ب ڕێژەیا (٤٢,٨٢٪)ێ دهێت، قەزا سێمێلێ ل ڕێزا سێێ ب ڕێژەیا (٩,٧٣٪)ێ دهێت، لێ قەزایێن دهۆك و زاخۆ چ ڕێژەیێن ڤی بەروبۆمی تۆمارنەكرینە.

٢. پیڤازا هاڤینێ ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان هاتییە چاندن و بەرهەم ئینان، قەزا بەردەرەش ل ڕێزا ئێكێ ب ڕێژەیا(٣٠,٦٪)ێ دهێت و سێمێلێ ل ڕێزا دووێ ب ڕێژەیا (٢٢,٧٪)ێ دهێت و ئامێدیێ ل ڕێزا سێێ ب ڕێژەیا (٢٠,٧٥٪)ێ ژ سەرجەمێ بەرهەمێ ڤی بەروبۆمی دهێت. بنێرە وێنەیێ ژمارە (٦).

**خشتەیێ (١١)**

**گرنگیا رێژەیی یابەرهەمئینانا بەروبۆمێن رهدار (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| یەکەیێن کارگێری | پیڤاز | | پتات | |
|---|---|---|---|---|
| | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| دهۆک | ١٠٥٠ | ٨,٧٤ | ٠ | ٠ |
| سێمێل | ٢٧٢٦ | ٢٢,٧ | ٣١٨٠ | ٩,٧٣ |
| ئامێدی | ٢٤٩٢ | ٢٠,٧٥ | ١٦٩ | ٠,٥١ |
| شێخان | ٧٩٥ | ٦,٦٢ | ١٤٦١٦ | ٤٤,٧ |
| ئاکرێ | ٥٨٨ | ٤,٩ | ٧٢٨ | ٢,٢٢ |
| زاخۆ | ٦٨٢ | ٥,٦٨ | ٠ | ٠ |
| بەردەرەش | ٣٦٧٥ | ٣٠,٦ | ١٤٠٠٠ | ٤٢,٨٢ |
| پارێزگەهـ | ١٢٠٠٨ | ١٠٠ | ٣٢٦٩٣ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ: حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

**وێنەیێ (٦)**

**گرنگیا رێژەیی ژێو بەرهەمئینانا بەروبۆمێن رهدار (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١١).

## ٣- بەروبۆمێن زەیتی

ئەڤ بەروبۆمە وان جۆرێن شینکاتی ب خۆڤە دگریت یێن ژبۆ مەرەما دەرخستن و ب دەستڤەئینانا زەیتێ دهێنە چاندن، ب شێوەیەکی گشتی بڕەکا باش یا ماددێن زەیتی دناڤ بەرێ ڤان بەروبۆماندا دهێتە عەمباکرن. د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتیە ئەنجامدان پێنج جۆرێن بەروبۆمێن زەیتی یێن هاڤینی هاتینە چاندن و بەرهەم ئینان ئەو ژی پێکدهێن ژ (گولبەرۆژ، کونجی، گەنموکێن زەر، فستەقێن بیستانی، فاسۆلیێن سۆیا). تەماشەی خشتەیێ ژمارە (١٢) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٢) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاربن**

١. جوداهییەکا مەزن یا هەی دناڤبەرا یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەهێ ژبۆ بەرهەمئینانا بەروبۆمێن زەیتی ب ڕەنگەکی کو ل هندەک قەزایان ڕێژەیەکا مەزن هاتیە چاندن و بەرهەم ئینان لێ ل هندەک قەزایێن دی ڕێژەیەکا گەلەک کێم هاتییە بەرهەم ئینان. بۆ نموونە قەزایا شێخان قەزایا ئێکانەیە ژبۆ چاندنا فستەق و فاسۆلیا سۆیا هەر چەند ئەڤ ڕێژەیە تا ڕادەیەکی یا سنوورداربوو ل سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان.

٢. قەزا شێخان ل ڕێزا ئێکێ بۆ بەرهەمئینانا هەر ئێك ژ گولبەرۆژان ب ڕێژەیا (٦٢,٩٤٪)ێ و گەنموکێن زەر ب ڕێژەیا (٣٩,٦٢٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ بۆ ڤان هەردو بەروبۆمان دهێت. قەزا بەردەڕەش ژی ل ڕێزا دووێ ژبۆ بەرهەمئینانا ڤان هەردو بەروبۆمان ب ڕێژەیێن (١٢,٥٪، ٣٦,١٤٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێت. لێ قەزایێن دهۆك و ئاکرێ چ ڕێژەیێن بەرهەمئینانا گەنموکان توومار نەکرینە، هەردیسان قەزا زاخۆ چ ڕێژەیێن بەرهەمئینانا گولبەرۆژان توومارنەکرینە، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٦) بکە.

٣. قەزا ئامێدیێ ل ڕێزا ئێکێ ژبۆ بەرهەمئینانا کونجیان ب ڕێژەیا (٨٨,٩٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ دهێت، لێ قەزایێن دهۆك و ئاکرێ و زاخۆ چ ڕێژەیێن بەرهەمئینانا ڤی بەروبۆمی توومار نەکرینە.

**خشتەیێ (١٢)**

**گرنگیا ڕێژەیی یابەرهەمئینانا بەروبۆمێن زەیتی (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| بەروبوم | کونجی | | گولبەرۆژ | | گەنموکێن زەر | | فستەقێن بیستانی | | فاسۆلیێن سۆیا | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یەکەیێن کارگێری | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| دهۆک | ٠ | ٠ | ١٠ | ٤,٤٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| سێمێل | ٠ | ٠ | ٧ | ٣,١٢ | ١٢٠٠ | ١٣,٧٧ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ئامێدی | ٣٩٤ | ٨٨,٩٤ | ٣٤ | ١٥,١٧ | ١٢ | ٠,١٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| شێخان | ٥ | ١,١٣ | ١٤١ | ٦٢,٩٤ | ٣٤٥٣ | ٣٩,٦٢ | ٩ | ١٠٠ | ٦ | ١٠٠ |
| ئاکرێ | ٢٦ | ٥,٨٧ | ٤ | ١,٧٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| زاخۆ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٩٠٠ | ١٠,٣٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| بەردەڕەش | ١٨ | ٤,٠٦ | ٢٨ | ١٢,٥ | ٣١٥٠ | ٣٦,١٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| پارێزگەهـ | ٤٤٣ | ١٠٠ | ٢٢٤ | ١٠٠ | ٨٧١٥ | ١٠٠ | ٩ | ١٠٠ | ٦ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ نوکە.

نەخشێ (٦)
گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمێن بەروبۆمێن زەیتی (تەن) ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەكۆلەریڤە هاتییە ئامادەكرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ كارگێری یێ پارێزگەها دهۆكێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٢).

## ٤- بەروبۆمێن باقلەمەنی

باقلەمەنیێن هاڤینێ سێ بەروبۆمێن قەرەنی ل جهێ ڤەكۆلین لێ هاتییە كرن ب خوڤە دگریت ئەو ژی (لوبیك و فاسۆلی و ماش). باقلەمەنی ل رێزا دووێ پشتی دانودكاكی ژ ئالیێ گرنگیا خۆراكی ژبەركو ژێدەرەكێ زەنگینە ب پرۆتینێن رووەكی دهێن، ئەڤ بەروبۆمە بۆ خوارنا مرۆڤان یان ژی وەك ئالف بۆ گیانەوەران دهێنە ب كارئینان. د خشتەیێ ژمارە (١٣) برا بەرهەم هاتی یا جۆرێن باقلەمەنییان ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤) دا هاتینە دیاركرن.

**ژ داتایێن خشتەیێ ل ژمارە (١٣) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاربین**

١. بەروبۆمێن لۆبیكان ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان هاتییە بەرهەم ئینان لێ قەزا بەردەرەش پشكا هەرە مەزن ب رێژەیا (٤٨,٦٩٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ بەرهەمئینایە، ل دووڤدا هەر ئێك ژ قەزایێن ئاكرێ و ئامێدیی ب رێژەیێن (٢٢,٠٣٪، ١٢,٨٤٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن.

٢. بەروبۆمێن باقلەمەنییان یێن هاڤینێ كو داتایێن وان د خشتەیێ سەری دا هاتینە دیاركرن ل هەردو قەزایێن ئامێدی و شێخان هاتینە بەرهەم ئینان، تەماشەی وێنەیێ ژمارە (٧) بكە.

٣. قەزایێن دهۆك و سێمێل و زاخۆ چ رێژەیێن بەرهەمئینانا فاسۆلی و ماشان توومار نەكرینە ـ هەردیسان قەزا ئاكرێ گەلەك كێم رێژەیێن بەروبۆمێن فاسۆلی و قەزا بەردەرەش ژی بەروبۆمێن ماشان توومار كرینە.

**خشتەیێ (١٣)**

**گرنگیا رێژەیی یابەرهەمئینانا باقلەمەنیێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | یەكەیێن كارگێری | لۆبیك | | فاسۆلی | | ماش | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| ١ | دهۆك | ٢٠٧ | ١٠,١٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ٢٧ | ١,٣٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ٢٦١ | ١٢,٨٤ | ٢٤ | ١٥ | ١٣ | ١٥,٨٥ |
| ٤ | شێخان | ٧٣ | ٣,٥٩ | ٦١ | ٣٨,١٢ | ٦ | ٧,٣٢ |
| ٥ | ئاكرێ | ٤٤٨ | ٢٢,٠٣ | ٠ | ٠ | ٦٣ | ٧٦,٨٣ |
| ٦ | زاخۆ | ٢٧ | ١,٣٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٩٩٠ | ٤٨,٦٩ | ٧٥ | ٤٦,٨٧ | ٠ | ٠ |
| | پارێزگەهـ | ٢٠٣٣ | ١٠٠ | ١٦٠ | ١٠٠ | ٨٢ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەكۆلەریڤە هاتییە ئامادەكرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حكومەتا هەرێما كوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوكە.

**وێنەیێ (٧)**

**گرنگیا رێژەیی ژێبەرهەمئینانا بەرویۆمێن باقلەمەنیێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەكرنا ڤەكۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٣).

## ٥- بەروبۆمێن دانودکاکی یێن هاڤینێ

بەروبۆمێن دانودکاکی یێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ بتنێ برنجی ب خۆڤە دگریت کو بۆ چاندنا وێ پشت بەستنێ دکەتە سەر ئاڤدانا دەستکرد ئەوا ژ رووباران ب رێکا جۆکان بۆ دهێتە ڤەگوهاستن. ئەڤ بەروبۆمە ل هندەك قەزایان دهێتە چاندن لێ ل هندەك قەزایێن دی ناهێتە چاندن، ئەڤ چەندە ژی پشت بەستنێ دکەتە سەر هەبوونا ژێدەرێن ئاڤی یێن بەردەوام ژبۆ چاندنا ڤی بەرهەمی ژبەرکو چاندنا برنجی پێدڤی ب ژێدەرەکێ ئاڤێ یێ بەردەوام هەیە. هەروەکی د خشتەیێ ژمارە (١٤) دا هاتییە دیارکرن پتریا بەرهەمێ پارێزگەهێ ل قەزایێن بەردەرەش و ئاکرێ ب رێژەیێن (٥٠,٣٣٪، ٤٧,٠٢٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێت، لێ قەزایێن دهۆك و سێمێل و زاخۆ نەشیاینە چ رێژەیان ژ برنجی د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان تووماربکەن، تەماشەی وێنەیێ ژمارە (٨) بکە.

**خشتەیێ (١٤)**

**گرنگیا رێژەیی یابەرهەمئینانا بەروبۆمێن دانودکاکیێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | یەکەیێن کارگێری | برنج | |
|---|---|---|---|
| | | بەرهەم | ٪ |
| ١ | دهۆك | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ٨٨ | ١,٤٩ |
| ٤ | شێخان | ٦٨ | ١,١٥ |
| ٥ | ئاکرێ | ٢٧٧٩ | ٤٧,٠٢ |
| ٦ | زاخۆ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٢٩٧٥ | ٥٠,٣٣ |
| پارێزگەه | | ٥٩١٠ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکۆمەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

**وێنەیێ (٨)**

**گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمئینانا بەروبۆمێن دانودکاکی یێن هاڤینێ (تەن) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٤).

# پشکا دووێ یا ڤەکۆلینێ:

## جوداهیيا جهی و ڕووبەرێ عەردی ژبۆ بەراوبوومێن چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ

مەرەم ژ جوداهیيا جهی ئەو ڕووبەرێ عەردی یە یێ هاتییە چاندن و دابەشکرن ل سەر جۆرێن جوداجودا یێن بەروبۆمێن چاندنی د ماوەیەکێ دەست نیشانکری دا ئەو ژی ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ. ئەڤ جوداهیيا ڕووبەرێ عەردی ل پارێزگەها دهۆکێ یا ب هندێ بەرچاڤ و دیارە کو پتریا عەردێ وێ ژبۆ بەروبۆمێن چاندنی یێن زڤستانێ هاتییە تەرخانکرن و ئەڤ چەندە ژی ل دووڤ داتایێن بەردەست یێن ڕووبەرێن عەردێن چاندنێ ژبۆ بەروبۆمێن زڤستانی دیاردبیت کو ڕووبەرێ ڤی عەردی ژ ڕووبەرێن چاندنێ یێن بەروبۆمێن هاڤینێ پترە (تەماشەی خشتەیێن ژمارە (١٥)، و (٢٢) بکە). ئەڤ داتایە پتر ئاماژێ دکەنە سەر دو جۆرێن بەروبۆمێن چاندنی ل پارێزگەها دهۆکێ ئەو ژی ل دووڤ وەرزێن سالێ و ب ڤی ڕەنگێ ل خوارێ:

### یەکەم: جوداهیيا جهی و ڕووبەرێ عەردی ژبۆ بەروبۆمێن چاندنی یێن زڤستانێ ل پارێزگەها دهۆکێ

ب شێوەیەکێ گشتی، بەروبۆمێن زڤستانێ یێن ل دەڤەرا ڤەکۆلین ل سەر هاتییە ئەنجامدان (پارێزگەها دهۆکێ) ل پلا ئێکێ دانودکاك دهێت (گەنمێ دێمی و گەنمێ ئاڤی و جەهـ) و ئەو ڕووبەرێ عەردی یێ ژبۆ چاندنا ڤان بەروبۆمان هاتییە تەرخانکرن دگەهیتە (٩١٠٣٧٥) دۆنەمێن عەردی ل گشت قەزایێن پارێزگەهێ، ئەڤ ڕووبەرە ڕێژەیا (٩٦,٤٦٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ عەردێ هاتییە تەرخانکرن بۆ چاندنا بەروبۆمێن زڤستانی پێکدئینیت.

جۆرێن دی یێن بەروبۆمێن زڤستانێ (نۆك، نیسك، باقلکێن تەڕ و باقلکێن هشك) ل ڕێزا دووێ دهێن و ڕووبەرێ عەردێ چاندنێ ژبۆ ڤان بەروبۆمان دگەهیتە (١٦٠٩٥) دۆنەمێن عەردی ب ڕێژەیا(١,٧٪)ێ. لێ بەروبۆمێن ڕهدار(پیڤاز، سلك، پتات، تقڕ، شێلم، شێلمدر و گێزەر) ل ڕێزا سیێ دهێن و ڕێژەیا عەردێ تەرخانکری بۆ چاندنا وان دگەهیتە (١,٣٤٪)ێ ژ سەرجەمێ ڕووبەرێ گشتی یێ چاندنا بەروبۆمێن زڤستانی د ماوەیێ سالاڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان. ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ زێدەبوونا

**خشتەیێ (١٥)**

**گرنگییا ڕێژەیی یا ڕووبەرێ عەردێ یێ بەروبۆمێن چاندنێ یێن زڤستانێ ل پارێزگەها دهۆکێ ل دووڤ ڕێژەیا بەرهەم ئینانێ (تەن) ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | جۆرێ بەروبۆمی | ڕووبەرێ عەردی/دونەم | ٪ |
|---|---|---|---|
| ١ | بەروبۆمێن دانودکاکی | ٩١٠٣٧٥ | ٩٦,٤٦ |
| ٢ | باقلەمەنی | ١٦٠٩٥ | ١,٧ |
| ٣ | بەروبۆمێن ڕهدار | ١٢٦٦٥ | ١,٣٤ |
| ٤ | بەروبۆمێن زەیتی | ٤٢٢٢ | ٠,٤٤ |
| ٥ | بەروبۆمێن کەسکاتی | ٣٥٣ | ٠,٠٣ |
| | سەرجەمێ گشتی | ٩٤٣٧١٠ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ نوکە.

عەردێ چاندنێ یێ هاتییە ب کارئینان ژبۆ چاندنا پتاتان دژڤریت.

کێمترین ڕێژەیا عەردێ هاتییە مەزاختن ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن زڤستانێ ل پارێزگەها دهۆکێ بەروبۆمێن کەسکاتی بوو (قەرنابیت، کەلەمی، خەس، و جۆرێن دی یێن کەسکاتی) ب رەنگەکی کو ڕێژەیا وان بتنێ (٠,٠٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ هاتییە مەزاختن ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن زڤستانێ ل پارێزگەها دهۆکێ. تەماشەی خشتەیێن ژمارە (١٥) و (١٦) و وێنەیێ ژمارە (٩) و نەخشەیێ ژمارە (٧) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٦) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاربین،**

١. دەربارەی رووبەرێ عەردی یێ هاتییە مەزاختن ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن چاندنی یێن زڤستانێ ل سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان، قەزا شێخان ل ڕێزا ئێکێ، ب بەروبۆمێن کەسکاتی و زەیتی و ڕهدار ب ڕێژەیێن (٦٥,٤٤٪، ٦٣,٦٤٪، ٣٣,٤٧٪)ێ ل دووڤ ئێك ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ تەرخانکری بۆ هەر بەروبۆمەکی ل پارێزگەهێ دهێت. د هەمان دەمدا قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن باقلەمەنی و دانودکاکی ب ڕێژەیێن (٤٧,٤٪، ٢٦,٣٦٪)ێ ل دووڤ ئێك ژ سەرجەمێ عەردێ چاندی دهێت، لێ هەر ئەڤ قەزایە نەشیایە چ ڕێژەیان ژبۆ بەربووومێن کەسکاتی توومار بکەت.

٢. دەربارەی بەروبۆمێن باقلەمەنی و دانودکاکی، قەزا شێخان ل ڕێزا دووێ ب ڕێژەیێن (٢٤,١٧٪، ٢٤,٥٢٪)ێ ل دووڤ ئێك ژ سەرجەمێ عەردێ چاندنی دهێت، لێ قەزا بەردەڕەش ژی ل ڕێزا دووێ ژبۆ بەروبۆمێن ڕهدار و زەیتی ب ڕێژەیێن (٢٣,٦١٪، ٢٢,٠٣٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێت.

**وێنەیێ (٩)**
**گرنگیا ڕێژەیی یا رووبەرێن عەردێ کشتۆکالی ژبۆ بەروبۆمێن زڤستانێ ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٥).

## خشتەیێ (١٦)

## گرنگیا ڕێژەیی یا ڕوویەرێ عەردی یێ بەروبۆمێن زڤستانێ (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارێکری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا(٢٠١٣-٢٠١)

| بەروبۆم | بەروبۆمێن دانودکاکی | | باقلەمەنی | | بەروبۆمێن زەیتی | | ڕهدار | | بەروبۆمێن کەسکاتی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| قەزا | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ |
| دهۆك | ٢٨٥٩١ | ٣,١٤ | ١٨٠ | ١,١٢ | ١٣٣ | ١,٠٥ | ٦٨ | ١,٦١ | ٥ | ١,٤١ |
| سێمێل | ٢١٧٤٥٠ | ٢٣,٨٨ | ١٤٦ | ٠,٩ | ٢٩٦١ | ٢٣,٣٨ | ٤٠٣ | ٩,٥٤ | ١٨ | ٥,١ |
| ئامێدی | ١١٦٤٣ | ١,٢٨ | ٥٢٣ | ٣,٢٥ | ٧٦٥ | ٦,٠٤ | ٨١ | ١,٩٢ | ٨٥ | ٢٤,٠٨ |
| شێخان | ٢٢٣٢٤١ | ٢٤,٥٢ | ٣٨٩٠ | ٢٤,١٧ | ٤١١٣ | ٣٣,٤٧ | ٢٦٨٧ | ٦٣,٦٤ | ٢٣١ | ٦٥,٤٤ |
| ئاکرێ | ٩٤٣٥٠ | ١٠,٣٦ | ٣٦٤١ | ٢٢,٦٢ | ٥٨٥ | ٤,٦٢ | ١٥ | ٠,٣٥ | ٧ | ١,٩٨ |
| زاخۆ | ٩٥١٠٠ | ١٠,٤٤ | ٨٥ | ٠,٥٣ | ١١١٧ | ٨,٨٢ | ٣٨ | ٠,٩ | ٧ | ١,٩٨ |
| بەردەڕەش | ٢٤٠٠٠٠ | ٢٦,٣٦ | ٧٦٣٠ | ٤٧,٤ | ٢٩٩١ | ٢٣,٦١ | ٩٣٠ | ٢٢,٠٣ | ٠ | ٠ |
| پارێزگەهـ | ٩١٠٣٧٥ | ١٠٠ | ١٦٠٩٥ | ١٠٠ | ١٢٦٦٥ | ١٠٠ | ٤٢٢٢ | ١٠٠ | ٣٥٣ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

## نەخشەیێ (٧)

## گرنگیا ڕێژەیی یا ڕوویەرێ عەردی یێ بەروبوومێن زڤستانێ (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١١_٢٠١٣)




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ کارگێری یێ پارێزگەها دهۆکێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٦).

٣. هەر ئێك ژ قەزایێن دهۆك و زاخۆ و ئامێدیێ ل ڕێزێن داویێ دهێن ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن زڤستانێ یێن جۆراو جۆر ل پارێزگەهێ.

**ئەڤێن ل خوارێ دیارترین بەروبۆمێن زڤستانێ نە كو ل دووڤ گرنگی و ڕێژەیا بەرهەم ئینانا وان هاتینە ڕێزكرن:**

**١- بەروبۆمێن دانودكاكی**

دانودكاك دهێتە هژمارتن ئێك ژ گرنگترین بەروبۆمێن چاندنی، نە بتنێ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ بەلكو ل سەر ئاستێ جیهانێ هەمیێ ژبەر كو خوارنا مرۆڤی یا سەرەكی دابین دكەت. چاندنا دانودكاكی ڕووبەرێن بەرفرەهـ یێن عەردی ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ بخۆڤە دگریت و ڤان بەرهەمان ب خۆڤە دگریت (گەنمێ دێمی و گەنمێ ئاڤی، جەهێ دێمی و جەهێ ئاڤی) و ب ڤی ڕەنگی دهێنە دابەشكرن:

**أ- گەنمێ دێمی و گەنمێ ئاڤی**

ڕووبەرێن عەردێ هاتییە ب كارئینان ژبۆ چاندنا گەنمێ دێمی ل قەزایەكێ بۆ ئێكا دی یا جودایە و سەرجەمێ ڕووبەرێ هەمی قەزایان ژبۆ چاندنا وی دگەهیتە (٨١٠٤٤١) دۆنەمان، لێ سەرجەمێ ڕووبەرێ هاتییە ب كارئینان ژبۆ چاندنا گەنمێ ئاڤی ل سەر ئاستێ هەمی یەكەیێن پارێزگەهێ ل سالا ٢٠١٤ دگەهیتە (٤٧٩٤١) دۆنەمان. د خشتەیێ ژمارە (١٧) دا گرنگترین بەروبۆمێن دانودكاكی یێن ل زڤستانێ دهێنە چاندن ل پارێزگەها دهۆكێ هاتینە دیاركرن.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٧) ئەڤ ڕاستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. گەنمێ دێمی ل هەمی یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ دهێتە چاندن، لێ قەزا بـەردەڕەش ل ڕێزا ئێكێ ژبۆ مەزاختنا جهێ چاندنێ كو نێزیكی چارێكا ڕووبەرێ گشتی یێ پارێزگەهێ ژبۆ چاندنا گەنمی د مەزێخیت ئەو ژی ب ڕێژەیا(٢٥,٢٩٪)ێ دهێت، ل دووڤدا قەزا سێمێلێ ب ڕێژەیا (٢٤,٨٪)ێ و پاشی قەزا شێخان ل ڕێزا سێێ ب ڕێژەیا (٢٣,٥٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی دهێن.

**خشتەیێ (١٧)**

**گرنگییا ڕێژەیی یا ڕووبەرێ عەردێ چاندی ژبۆ بەروبۆمێن دانودكاكی (دۆنەم) ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا(٢٠١٣-٢٠١)**

| ژ | یەكەیێن كارگێری | گەنمێ دێمی | | گەنمێ ئاڤی | | جەهێ دێمی | | جەهێ ئاڤی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ |
| ١ | دهۆك | ٢٧٠٣٦ | ٣,٣٣ | ٠ | ٠ | ١٥٥٥ | ٣,٠٢ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ٢٠١٠٠٠ | ٢٤,٨ | ٦٢٥٠ | ١٣,٠٣ | ١٠٢٠٠ | ١٩,٨٢ | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ٨٢٧٤ | ١,٠٢ | ، | ٠ | ٣٣٧٠ | ٦,٥٥ | ٠ | ٠ |
| ٤ | شێخان | ١٩١٠٨٣ | ٢٣,٥٧ | ٢٦٦٩١ | ٥٥,٦٧ | ٥٢٧٣ | ١٠,٢٥ | ١٩٥ | ٣٥,٧٧ |
| ٥ | ئاكرێ | ٨٧٥٥٠ | ١٠,٨ | ٨٥٠ | ١,٦٧ | ٥٩٥٠ | ١١,٥٦ | ٠ | ٠ |
| ٦ | زاخۆ | ٩٠٥٠٠ | ١١,١٦ | ٢١٥٠ | ٤,٤٨ | ٢١٠٠ | ٤,٠٨ | ٣٥٠ | ٦٤,٥٥ |
| ٧ | بەردەڕەش | ٢٠٥٠٠٠ | ٢٥,٢٩ | ١٢٠٠٠ | ٢٥,٠٣ | ٢٣٠٠٠ | ٤٤,٧ | ٠ | ٠ |
| | پارێزگەهـ | ٨١٠٤٤١ | ١٠٠ | ٤٧٩٤١ | ١٠٠ | ٥١٤٤٨ | ١٠٠ | ٥٤٥ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەكۆلەریڤە هاتییە ئامادەكرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حكومەتا هەرێما كوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوكە.

وێنەیێ (١٠)
گرنگییا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ چاندی ب بەروبومێن دانودکاکی (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٦).

٢. هەردو قەزایێن شێخان و بەردەرەش پتر ژ سێ چارێکێن رووبەرێن عەردێ چاندنا گەنمێ زڤستانی یێ ئاڤی ب رێژەیین (٥٥,٦٧٪،٢٥,٠٣٪)ێ ل دووڤ ئێك پێکدئینن، تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١٠) بکە.

**ب – جەهێ دێمی و جەهێ ئاڤی**

داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٧) دیاردبیت کو سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردی یێ هاتییە چاندن ب جەهێ دێمی ل پارێزگەها دهۆکێ دماوەیێ دناڤبەر سالێن (٢٠١٣–٢٠١٤)، قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا رووبەرێ چاندنا جەهێ دێمی دهێت ب رووبەرێ (٥١٤٤٨) دۆنەمان کو دبیتە رێژەیا (٤٤,٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی، قەزا سێمێلێ ل رێزا دووێ ب رووبەرێ (١٠٢٠٠) دۆنەمان کو دبیتە رێژەیا(١٩,٨٢٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی دهێت. لێ سەرجەمێ رووبەرێ گشتی یێ هاتییە ب کارئینان بۆ چاندنا جەهێ ئاڤی د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ل پارێزگەها دهۆکێ دگەهیتە (٥٤٥)دۆنەمان، ئەڤ رووبەرە ژی بتنێ ل قەزایێن زاخۆ و شێخان هاتییە ب کارئینان.

## ٢- بەروبومێن باقلەمەنی

باقلەمەنیێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ سێ جۆرێن بەروبومێن قەرەنی بخۆڤە دگریت (لۆبیك، فاسۆلی و ماش)، باقلەمەنی پشتی دانودکاکی ژبۆ گرنگییا وان یا خۆراکی دهێت ژبەرکو دهێنە هژمارتن ژێدەرێن پرۆتینێن رووەکی یێن گرنگ و بۆ خوارنا مرۆڤان یان ژی وەك ئالف بۆ گیانەوەر دهێنە ب کارئینان. د خشتەیێ ژمارە (١٨) دا رووبەرێن عەردێ چاندنێ یێن هاتینە ب کارئینان ژبۆ چاندنا باقلەمەنیان ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا(٢٠١٣ – ٢٠١٤) هاتینە دیارکرن.

**خشتەیێ (١٨)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێن عەردی یێن چاندنا باقلەمەنییان (دۆنم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | یەکەیا کارگێری | نۆک | | نیسک | | باقلکێن تەر | | باقلکێن هشک | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| ١ | دهۆك | ١٣٥ | ٠,٩٥ | ٠ | ٠ | ٤٥ | ٣,٤٥ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ١٢٠ | ٠,٨٥ | ٠ | ٠ | ٢٦ | ١,٩٩ | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ٣٧٠ | ٢,٦١ | ١٠ | ٣,٨٧ | ٧٧ | ٥,٩١ | ٦٦ | ١٧,٢٧ |
| ٤ | شێخان | ٣٦٧٨ | ٢٥,٩٨ | ٢٠ | ٧,٧٥ | ١٣٢ | ١٠,١٤ | ٦٠ | ١٥,٧ |
| ٥ | ئاکرێ | ٢٨٥٠ | ٢٠,١٤ | ٢٢٨ | ٨٨,٣٧ | ٣٧٧ | ٢٨,٩٥ | ١٨٦ | ٤٨,٧ |
| ٦ | زاخۆ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٨٥ | ٦,٥٣ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٧٠٠٠ | ٤٩,٤٦ | ٠ | ٠ | ٥٦٠ | ٤٣,٠١ | ٧٠ | ١٨,٣٢ |
| | پارێزگەهـ | ١٤١٥٣ | ١٠٠ | ٢٥٨ | ١٠٠ | ١٣٠٢ | ١٠٠ | ٣٨٢ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەری، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ل سەری ئەڤ راستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. بەروبۆمێن نۆکان ل رێزا ئێکێ ژبۆ رووبەرێ وی عەردێ هاتییە مەزاختن بۆ چاندنا وان کو نێزیکی (١٤١٥٣) دۆنەمان بوویە ژ سەرجەمێ گشی یێ عەردێ هاتییە مەزاختن ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی ل پارێزگەهێ دهێت، ل دووڤدا باقلکێن تەر دهێن کو ل سەر رووبەرێ (١٣٠٢)دۆنەمێن عەردی هاتییە چاندن، لێ باقلکێن هشك ل رێزا سێیێ دهێن و ل سەر رووبەرێ (٣٨٢)دۆنەمێن عەردی هاتییە چاندن و ل داویێ ژی نیسك ل رێزا چوارێ دهێت کو ل سەر رووبەرێ (٢٥٨) دۆنەمێن عەردی هاتییە چاندن.

٢. قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ژبۆ رووبەرێ تەرخانکری یێ چاندنا نۆکان ب رێژەیا (٤٩,٤٦٪)ێ کو دبیتە نێزیکی نیڤەکا رووبەرێ گشتی یێ تەرخانکری ل پارێزگەهێ ژبۆ چاندنا ڤی دەرامەتی دهێت. قەزا شێخان ژی ل رێزا دووێ ب رێژەیا (٢٥,٩٨٪)ێ دهێت و ئاکرێ ل رێزا سێیێ دهێت ب رێژەیا (٢٠,١٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ تەرخانکری بۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی، لێ هەرسێ قەزایێن ئامێدیێ و دهۆك و سێمێلێ ل دووڤ ئێك ب رێژەیێن کێمتر هاتینە توومارکرن. قەزا زاخۆ چ رێژەیێن چاندنا ڤی بەرهەمی ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤) توومار نەکرینە، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (١١) بکە.

٣. ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن نیسکان ژی بتنێ ل سێ قەزایێن پارێزگەهێ رووبەرێن عەردی بۆ هاتییە دابینکرن کو ل رێزا ئێکێ قەزا ئاکرێ ب رێژەیا (٨٨,٣٧٪)ێ دهێت و ل دووڤدا قەزا شێخان ب رێژەیا (٧,٧٥٪)ێ ل رێزا دووێ دهێت و قەزا ئامێدیێ ژی ل رێزا سێیێ ب رێژەیا (٣,٨٧٪)ێ دهێت.

٤. باقلکێن تەر ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ هاتییە چاندن لێ قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ب رێژەیا(٤٣,٠١٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردی یێ تەرخانکری دهێت ، ل دووڤدا قەزا ئاکرێ ل رێزا دووێ ب رێژەیا (٢٨,٩٥٪)ێ دهێت و ئەڤ هەردو قەزایە پێکڤە نێزیکی سێ چارێکێن رووبەرێ عەردێ چاندنێ ژبۆ ڤی

**وێنەیێ (١١)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێن عەردی یێن چاندنا باقلەمەنییان (دۆنم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٨).

بەروبۆمی ل وێ سالا ڤەکۆلین لێ هاتییە کرن پێکدئینن. هەردیسان ئەڤ هەردو قەزایە ل رێزێن دەستپێکێ دهێن ژبۆ چاندنا باقلکێن هشك ژی ب رەنگەکی کو قەزا ئاکرێ ل رێزا ئێکێ ب رێژەیا (٤٨,٦٩٪)ێ دهێت و قەزا بەردەڕەش ل رێزا دووێ ب رێژەیا (١٨,٣٢٪)ێ دهێت. لێ چ رووبەرێن عەردی ل هەر سێ قەزایێن دی یێن گرنگ کو دهۆك و سێمێلێ و زاخۆنە د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان نەهاتینە توومارکرن.

## ٣- بەروبۆمێن رهدار

بەروبۆمێن رهدار کۆمەکا جۆرێن کەسکاتییان بخۆڤە دگریت، ل وەرزێ زڤستانێ دهێنە چاندن دا مفای ژ رهێن وان دهێتە وەرگرتن. ئەڤ کەسکاتیە ماددەیێن خۆراکی دناڤ رهێن خۆ دا خرڤە دکەت، وەکی (پیڤاز، سلك، پتات " کرتووپ - رتاخ "، تڤر، شێلم، شێلمدر و گێزەر). بەروبۆمێن پتاتان دهێنە هژمارتن بەربەلاڤترین بەروبۆمێن رهدار یێن زڤستانێ ژ ئالیێ مەزاختنا رووبەرێ عەردێ چاندنی یێ بۆ چاندنا وان هاتییە دابینکرن. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (١٩) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٩) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. بەروبۆمێن پتاتان دهێتە هژمارتن پترین بەروبۆمێن رهدار ژ ئالیێ مەزاختنا رووبەرێ عەردێ چاندنی ڤە، سەرەرای هندێ کو ل هندەك قەزایان وەکی قەزا ئاکرێ ئەڤ بەروبۆمە نەهاتییە چاندن لێ رێژەیا بەرهەم ئینان و مەزاختنا عەردی ژ هەمی بەروبۆمێ، دی یێن رهدار پترە.

٢. سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێن عەردێ چاندنی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ یێن هاتینە ب کارئینان

**خشتەیێ (١٩)**

**گرنگییا رێژەیی یا رووبەرێن عەردی یێن چاندنا بەروبۆمێن رهدار (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| یەکەیا کارگێری | پیڤاز | | سلک | | شێلم | | تفر | | شێلمدر | | پتات | | گێزەر | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| دهۆك | ٧٥ | ٤,٩ | ١٢ | ٧,٢٧ | ٠ | ٠ | ١٦ | ٨,٨ | ٠ | ٠ | ٣٠ | ٠,٢٩ | ٠ | ٠ |
| سێمێل | ٨ | ٠,٥٢ | ١٣ | ٧,٨٧ | ٤٥٠ | ٨٠,٣ | ١٢ | ٦,٦ | ٠ | ٠ | ٢٤٩٠ | ٢٤,٥٤ | ٠ | ٠ |
| ئامێدی | ٦٠٥ | ٣٩,٥ | ٤٠ | ٢٤,٢٤ | ٤٣ | ٧,٦٧ | ٤٩ | ٢٦,٩٢ | ٣ | ٩,١ | ١٥ | ٠,١٤ | ١٠ | ٥٢,٦٣ |
| شێخان | ٦٥ | ٤,٢٤ | ١٠ | ٦,٠٦ | ٦٠ | ١٠,٧١ | ١٧ | ٩,٣٤ | ٣٠ | ٩٠,٩ | ٣٩٢٢ | ٣٨,٦٥ | ٩ | ٤٧,٣٧ |
| ئاکرێ | ٥٧٥ | ٣٧,٥٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٠ | ٥,٥ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| زاخۆ | ٢٣ | ١,٥ | ٠ | ٠ | ٧ | ١,٢٥ | ٨ | ٤,٣٩ | ٠ | ٠ | ١٠٦٩ | ١٠,٥٣ | ٠ | ٠ |
| بەردەرەش | ١٨١ | ١١,٨١ | ٩٠ | ٥٤,٥٤ | ٠ | ٠ | ٧٠ | ٣٨,٤٦ | ٠ | ٠ | ٢٦٥٠ | ٢٦,١١ | ٠ | ٠ |
| پارێزگەهـ | ١٥٣٢ | ١٠٠ | ١٦٥ | ١٠٠ | ٥٦٠ | ١٠٠ | ١٨٢ | ١٠٠ | ٣٣ | ١٠٠ | ١٠١٤٦ | ١٠٠ | ١٩ | ١٠٠ |

**- ئەڤ خشتە ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەری، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.**

ژبۆ پتاتان دگەهیتە (١٠١٤٦)دۆنەمێن عەردی، قەزا شێخان ل رێزا ئێکێ ب رێژەیا (٣٨,٦٥٪)ێ ژ سەرجەمێ رووبەرێ گشتی یێ هاتییە مەزاختن ل پارێزگەهێ دهێت. ل دووڤدا هەر ئێک ژ قەزایێن بەردەرەش و سێمێل ل رێزێن دووێ و سێ ب رێژەیێن (٢٦,١١٪، ٢٤,٥٤٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن. لێ قەزایێن دهۆك و ئامێدی و زاخۆ ب رێژەیێن کێمتر هاتینە توومارکرن. تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٨) بکە.

٣. هەردو قەزایێن ئامێدی و ئاکرێ نێزیکی سێ چارێکێن رووبەرێن عەردێن چاندنی ژبۆ چاندنا پیڤازان د مەزێخن ئەو ژی ب رێژەیێن (٣٩,٥ ٪، ٣٧,٥٣ ٪)ێ ل دووڤ ئێك. ژبەر هەبوونا ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤان هەردو قەزایان دزرڤیت.

٤. قەزا بەردەرەش پتر ژ نیڤا رووبەرێ تەرخانکری ژبۆ چاندنا سلکان مەزاختییە کو رێژەیا وێ دگەهیتە (٥٤,٥٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ تەرخانکری ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی، قەزا ئامێدیێ ل رێزا دووێ ب رێژەیا (٢٤,٢٤٪)ێ دهێت.

لێ رێژەیا توومارکرنا هەرسێ قەزایێن دهۆك و سێمێلێ و شێخان تا رادەیەکی یا نێزیکی ئێك بوو. لێ د هەمان دەمدا هەردو قەزایێن زاخۆ و ئاکرێ چ رێژە د سالا ڤەکۆلین لێ هاتییە کرن نەهاتینە توومارکرن.

٥. بەروبۆمێن شێلمان ژی پتریا وێ ل قەزا سێمێلێ هاتییە چاندن ب رەنگەکی کو رێژەیا وێ دگەهیتە (٨٠,٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ هاتییە تەرخانکرن ژبۆ چاندنا ڤی بەروبوومی ل پارێزگەهێ، ل دووڤدا هەر ئێك ژ قەزایێن شێخان و ئامێدیێ ب رێژەیێن (١٠,٧١ ٪، ٧,٨٧٪)ێ دهێن، ل وێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان قەزایێن دی ئەڤ بەرهەمە نەهاتییە توومارکرن،

٦. بەروبۆمێن تفران ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ ل وێ سالا ڤەکۆلین لێ هاتییە ئەنجامدان هاتییە چاندن، قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ب رێژەیا (٣٨,٤٦٪)ێ دهێت و ل دووڤدا قەزا ئامێدیێ ل رێزا

**نەخشێ (٨)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێن عەردی یێن چاندنا بەروبوومێن رهدار (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)**




**- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ کارگێری یێ پارێزگەها دهۆکێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٩).**

دووێ ب رێژەیا (٢٦,٩٢٪)ێ ژ سەجەمێ رووبەرێ هاتییە مەزاختن ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی دهێت. هەردیسان رێژەیا مەزاختنا رووبەرێن عەردی ل قەزایێن دی ژی ژبۆ چاندنا تڤران تا رادەیەکی یا نێزیکی ئێك بوو.

٧. بەروبۆمێن شێلمدر و گێزەر بتنێ ل قەزایێن شێخان و ئامێدیێ هاتینە چاندن کو بۆ چاندنا وان پشت بەستن دهێتە کرن سەر ژێدەرێن ئاڤدێری، لێ د هەمان سالدا ئەڤ بەروبۆمە ل چ قەزایێن دی نەهاتییە چاندن.

## ٤- بەروبۆمێن زەیتی

بتنێ چوار جۆرێن بەروبۆمێن زەیتی کو ل وەرزێ زڤستانێ ل پارێزگەها دهۆکێ د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان هاتینە چاندن

هەنە ئەو ژی (سیر، گولبەرۆژ، گەنموکێن زەر و گژنیژ). رێژەیا مەزاختنا عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا ڤان جۆرە بەروبۆمان ژ قەزایەکێ بۆ ئێکا دی یا جودایە. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٢٠) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١٢) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. د خشتەیێ سەری دا هاتییە دیارکرن کو ل قەزا شێخان رووبەرێن عەردێ چاندنی هاتینە تەرخانکرن ژبۆ چاندنا هەمی جۆرێن بەروبۆمێن زەیتی یێن زڤستانێ، ئەڤ قەزا ل رێزا ئێکێ ژبۆ تەرخانکرنا رووبەرێ عەردێ چاندنا هەر ئێك ژ گژنیژان ب رێژەیا (٨٨,٠٩ ٪)ێ و گەنموکێن زەر ب رێژەیا(٦٦,٦٦٪)ێ دهێت. تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١٢) بکە.

**خشتەیێ (٢٠)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێن عەردی یێن چاندنا بەروبۆمێن زەیتی (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | یەکەیێن کارگێری | سیر | | گولبەرۆژ | | گەنموکێن زەر | | گژنیژ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| ١ | دهۆک | ٨ | ٧,٣٣ | ٦٠ | ٣٣,١٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ١ | ٠,٩ | ٠ | ٠ | ٤٠٠ | ١٠,٢٥ | ٢ | ٤,٧٦ |
| ٣ | ئامێدی | ٤٥ | ٤١,٣ | ٣٣ | ١٨,٢٣ | ٠ | ٠ | ٣ | ٧,١٤ |
| ٤ | شێخان | ١٧ | ١٥,٦ | ٤٣ | ٢٣,٧٥ | ٢٦٠٠ | ٦٦,٦٦ | ٣٧ | ٨٨,٠٩ |
| ٥ | ئاکرێ | ٠ | ٠ | ١٥ | ٨,٢٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٦ | زاخۆ | ٣٨ | ٣٤,٨٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٠ | ٠ | ٣٠ | ١٦,٥٧ | ٩٠٠ | ٢٣,٠٧ | ٠ | ٠ |
| پارێزگەهـ | | ١٠٩ | ١٠٠ | ١٨١ | ١٠٠ | ٣٩٠٠ | ١٠٠ | ٤٢ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکۆمەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

**وێنەیێ (١٢)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێن عەردی یێن چاندنا بەروبۆمێن زەیتی (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٠).

٢. بەروبۆمێن سیران ب رێژەیەكا كێم ل پتریا قەزایێن پارێزگەهێ هاتییە چاندن و ئەو رووبەرێ عەردی یێ بۆ چاندنا وان هاتییە تەرخانكرن گەلەك یێ كێم بوو، لێ قەزایێن ئامێدی و زاخۆ پتر ژ (٧٥٪)ێ رووبەرێ عەردی د مەزێخن ب رەنگەكی قەزا ئامێدیی ب رێژەیا (٤١,٣٪)ێ و قەزا زاخۆ ب رێژەیا (٣٤,٨٦٪)ێ، لێ ل هەردو قەزایێن بەردەڕەش و ئاكرێ ئەڤ بەروبۆمە ل وێ سالا ڤەكۆلین لێ هاتییە ئەنجامدان نەهاتییە چاندن.

٣. قەزا دهۆكێ ل رێزا ئێكێ ژبۆ مەزاختنا رووبەرێ عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن گولبەرۆژان ب رێژەیا (٣٣,١٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ هاتییە تەرخانكرن ژبۆ چاندنا گولبەرۆژان ل پارێزگەهێ دهێت، ل دووڤدا هەردو قەزایێن شێخان و ئامێدیێ ب رێژەیێن (٢٣,٧٥٪، ١٨,٢٣٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن.

## ٥- بەروبۆمێن كەسكاتی

بەروبۆمێن كەسكاتی هژمارەكا جۆرێن شینكاتی ب خۆڤە دگریت كو دهێنە چاندن ژ پێخەمەت مفا وەرگرتنێ ژ بەلگێن وان یان بەرێ وان كو ل سەر روویێ عەردی شین دبن، بەرێ ڤان بەروبۆمان ژ هژمارەكا مەزن یا بەلگان پێكدهێت . ل دووڤ داتایێن دەستكەفتی دیاربوویە كو د ماوەیێ سالا ڤەكۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان هژمارەكا كێم یا بەروبۆمێن كەسكاتی ل پارێزگەهێ هاتییە چاندن وەك (قەرنابیت و كەلەمی و خەس ... هتد). د خشتەیێ ژمارە (٢١) رووبەرێن عەردی یێن ژبۆ چاندنا هەر ئێك ژ ڤان بەروبۆمان و گرنگیا وان یا رێژەیی هاتییە دیاركرن.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢١) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. ژ داتایێن ڤی خشتەی بۆ مە دیار دبیت كو ل هندەك قەزایێن پارێزگەهێ چ جۆرێن بەروبۆمێن كەسكاتی گەلەك كێم، یان هەر ئێكجار نەهاتینە چاندن، وەكی قەزایێن بەردەڕەش و ئاكرێ، لێ بەروڤاژی قەزا ئامێدیێ رابوویە ب چاندنا هەمی ڤان جۆرێن بەروبۆمێن كەسكاتی و د پێشییێ دایە بوویە بۆ عەردێ چاندنێ بۆ هەمی

**خشتەیێ (٢١)**

**گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمئینانا بەروبۆمێن كەسكاتی یێن زڤستانێ (دۆنەم) ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**

| ژ | یەكەیا كار گێری | قەرنابیت | | كەلەمی | | خەس | | كەسكاتیێن دی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| ١ | دهۆك | ٠ | ٠ | ٥ | ٦,٤٩ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ٠ | ٠ | ٨ | ١٠,٣٩ | ١٠ | ٢٤,٣٩ | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ٤ | ١٥,٣٨ | ٤٠ | ٥١,٩٥ | ٠ | ٠ | ٤١ | ١٩,٦٢ |
| ٤ | شێخان | ٢٢ | ٨٤,٦٢ | ٢٤ | ٣١,١٦ | ٢٥ | ٦٠,٩٧ | ١٦٠ | ٧٦,٥٥ |
| ٥ | ئاكرێ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٧ | ٣,٣٥ |
| ٦ | زاخۆ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٦ | ١٤,٦٣ | ١ | ٠,٤٨ |
| ٧ | بەردەڕەش | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| پارێزگەهـ | | ٢٦ | ١٠٠ | ٧٧ | ١٠٠ | ٤١ | ١٠٠ | ٢٠٩ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ لایێ ڤەكۆلەریڤە هاتییە ئامادەكرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حكومەتا هەرێما كوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوكە.

**وێنەیێ (١٣)**

**گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمئینانا بەروبۆمێن کەسکاتی یێن زڤستانێ(دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢١).

جۆرێن بەروبۆمێن کەسکاتی.

٢. بەروبۆمێن قەرنابیتێ بتنێ ل دو قەزایێن پارێزگەهێ هاتییە چاندن ئەو ژی قەزایێن شێخان و ئامێدیێ ب رێژەیێن (٨٤,٦٢٪، ١٥,٣٨٪)ێ ل دووڤ ئێك. لێ د سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ئەڤ بەروبۆمە ل قەزایێن دی نەهاتییە چاندن. تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١٣) بکە.

٣. بەروبۆمێن خەسان بتنێ ل سێ یەکەیێن کارگێری هاتییە چاندن ئەو ژی قەزایێن شێخان و سێمێل و زاخۆ ب رێژەیێن (٦٠,٩٧٪، ٢٤,٣٩٪، ١٤,٦٣٪)ێ ل دووڤ ئێك.

٤. قەزا شێخان رابوویە ب چاندنا هندەك جۆرێن دی یێن بەروبۆمێن کەسکاتی ب رێژەیا (٧٦,٥٥٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ مەزاختنا عەردێ چاندنی ل پارێزگەهێ.

## دووەم: جوداهییا جهی و رووبەرێ عەردی ژبۆ بەروبۆمێن چاندنی یێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ

بەروبۆمێن چاندنی یێن هاڤینێ دهێنە هژمارتن ژێدەرەکێ گرنگ یێ خوارنێ بۆ مرۆڤان ل وەرزێ هاڤینێ، زیندەباری ژێدەرەکێ گرنگ بۆ داهاتیێ جۆتیاران و کرێکارێن دڤی بواری دا کاردکەن. ئەڤ بەروبۆمە پشت بەستنێ دکەنە سەر ئاڤدانا دەستکرد و کێشانا بورییێن ئاڤێ ژ رووبار و کانیکان. بەروبۆمێن هاڤینێ دهێنە پارڤەکرن ل سەر پێنج گروپێن بەروبۆمان ئە ژی بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری، بەروبۆمێن رەهدار یێن هاڤینێ، بەروبۆمێن دانودکاکی، بەروبۆمێن زەیتی و باقلەمەنی. رووبەرێ عەردێ چاندنی و رێژەیا بەرهەمئینانا ڤان بەروبۆمان ژ قەزایەکا پارێزگەها دهۆکێ بۆ ئێکا دی یا جودایە.

تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٢٢) بکە.

ژبلی ڤان بەروبۆمان تویتن ژی ل پارێزگەها دهۆکێ دهێتە چاندن و ڕووبەرێ عەردێ چاندنێ ژبۆ ڤی بەروبۆمی دگەهیتە (٣٢) دۆنەمێن عەردی و پتریا وی ل قەزا ئامێدیێ دهێتە چاندن.

بەروبۆمێن کەسکاتی یێ بەری ل ڕێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنێ کو ل سەر ڕووبەرێ (٦٧٦٨٨)دۆنەمێن عەردی هاتیە چاندن و ڕێژەیا وێ دگەهیتە (٧٥,٦٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ ڕووبەرێ عەردێ چاندنێ ژبۆ بەروبۆمێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهوکێ دهێت، ل دووڤدا بەروبۆمێن ڕهدار دهێن ب مەزاختنا (٩٣٢٣) دۆنەمێن عەردی و ڕێژەیا بەرهەمئینانا وان دگەهیتە (١٠,٤٣٪)ێ و پاشی ل ڕێزا سێێ بەروبۆمێن دانودکاکێ هاڤینێ دهێن کو برنجی بخۆڤە دگریت و ل سەر ڕووبەرێ (٦٩٥٤) دۆنەمێن عەردی دهێتە چاندن و ڕێژەیا (٧,٧٨٪)ێ پێکدئینیت. بەروبۆمێن زەیتی ژی ل سەر ڕووبەرێ (٣٩٨٣) دۆنەمێن عەردی هاتیە چاندن و ڕێژەیا مەزاختنا عەردی بۆ چاندنا وی دگەهیتە (٤,٤٦٪)ێ ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ڤەکۆلین تێدا هاتیە ئەنجامدان. تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١٤) بکە.

ژ داتایێن خشتەیێ (٢٣) ئەڤ ڕاستیە بۆ مە دیاربین،

١. بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری پتریا عەردێ چاندنی مەزاختیە کو دگەهیتە دۆنەمێن (٦٧٦٨٨) عەردی، قەزا بەردەرەش ل ڕێزا ئێکێ دهێت ژبۆ مەزاختنا ڤی عەردی ب ڕێژەیا (٥٠,٢٩٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ ڕووبەرێ عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی ل پارێزگەهێ. ل دووڤدا قەزایێن ئاکرێ و شێخان ل ڕێزێن دووێ و سێێ ب ڕێژەیێن (١٦,٥٪، ٩,٨٦ ٪)ێ ل دووڤ ئێک دهێن، ڕێژەیا مەزاختنا عەردی ژ ئالیێ قەزایێن دیڤە تا ڕادەیەکی یا نێزیکی ئێک بوو.

٢. قەزا بەردەرەش نیڤا ڕووبەرێ عەردێ چاندنی یێ تەرخانکری بۆ چاندنا بەروبۆمێن دانودکاکی ل پارێزگەهێ ڤەگرتیە کو ڕێژەیا وێ دگەهیتە (٥٠,٣٣٪)ێ ژ سەرجەمێ ڕووبەرێ گشتی یێ تەرخانکری بۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی، ل دووڤدا قەزا ئاکرێ ب ڕێژەیا (٤٧,٠٢٪)ێ دهێت، لێ ل قەزایێن دهۆك و زاخۆ وسێمێلێ چ ڕووبەرێن عەردی بۆ چاندنا دان و دکاکێ هاڤینی (برنج)

**خشتەیێ (٢٢)**

**گرنگیا ڕێژەیی یا ڕووبەرێن تەرخانکری ژبۆ بەروبۆمێن چاندنێ یێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ ل دووڤ ڕێژەیا بەرهەم ئینانێ (دونەم) ل سالا (٢٠١٣-٢٠١)**

| ژ | جۆرێ بەروبۆمی | ڕووبەرێ عەردی/ دونەم | ٪ |
|---|---|---|---|
| ١ | بەروبۆمێن دانودکاکی | ٦٩٥٤ | ٧,٧٨ |
| ٢ | باقلەمەنی | ١٥٠٩ | ١,٦٩ |
| ٣ | بەروبۆمێن ڕهدار | ٩٣٢٣ | ١٠,٤٣ |
| ٤ | بەروبۆمێن زەیتی | ٣٩٨٣ | ٤,٤٦ |
| ٥ | بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری | ٦٧٦٨٨ | ٧٥,٦٧ |
| | سەرجەمێ گشتی | ٨٩٤٥٧ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتیە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

### وێنەیێ (١٤)
### گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمئینانا بەروبۆمێن هاڤینێ (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٢).

### خشتەیێ (٢٣)
### گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێ عەردی یێ بەروبۆمێن هاڤینێ (دونەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا(٢٠١٣ – ٢٠١٤)

| بەروبۆم / قەزا | بەروبۆمێن بەری | | باقلەمەنی | | بەروبۆمێن رهدار | | بەروبۆمێن زەیتی | | بەروبۆمێن دانودکاکی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| دهۆك | ٣٤٥٠ | ٥,١ | ١١٥ | ٧,٦٢ | ٣٠٠ | ٣,٢٢ | ٢٥ | ٠,٦٣ | ٠ | ٠ |
| سێمێل | ٤٣٨٩ | ٦,٤٩ | ١٥ | ١ | ١٣٩٩ | ١٥,٠١ | ٤١٨ | ١٠,٥ | ٠ | ٠ |
| ئامێدی | ٢٦٩٤ | ٣,٩٨ | ٢٠٥ | ١٣,٥٩ | ٧٤٤ | ٧,٩٨ | ٣٠٨ | ٧,٧٤ | ١٠٤ | ١,٥ |
| شێخان | ٦٦٧٣ | ٩,٨٦ | ١٠٠ | ٦;٦٣ | ٢٨٣٧ | ٣٠,٤٣ | ١٥٥٦ | ٣٩,٠٧ | ٨٠ | ١,١٥ |
| ئاکرێ | ١١١٦٧ | ١٦,٥ | ٤٥٩ | ٣٠,٤٢ | ٢٩٨ | ٣,٢ | ١٥٦ | ٣,٩٢ | ٣٢٧٠ | ٤٧,٠٢ |
| زاخۆ | ٥٢٧٥ | ٧,٨ | ١٥ | ١ | ١٩٥ | ٢,١ | ٣٠٠ | ٧,٥٤ | ٠ | ٠ |
| بەردەرەش | ٣٤٠٤٠ | ٥٠,٢٩ | ٦٠٠ | ٣٩,٧٧ | ٣٥٥٠ | ٣٨,٠٨ | ١٢٢٠ | ٣٠,٦٣ | ٣٥٠٠ | ٥٠,٣٣ |
| پارێزگەهـ | ٦٧٦٨٨ | ١٠٠ | ١٥٠٩ | ١٠٠ | ٩٣٢٣ | ١٠٠ | ٣٩٨٣ | ١٠٠ | ٦٩٥٤ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

نەخشەیێ (٩)

گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێ عەردی یێ بەروبۆمێن هاڤینێ (دونەم) ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەكۆلەریڤە هاتییە ئامادەكرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ كارگێری یێ پارێزگەها دهۆكێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٣).

نەهاتییە تەرخانكرن، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٩) بكە.

٣. هەردیسان قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێكێ ژبۆ چاندنا هەر ئێك ژ بەروبۆمێن باقلەمەنی و بەروبۆمێن رهدار ب رێژەیێن (٣٩,٧٧٪، ٣٨,٠٨٪)ێ، ل دووڤ ئێك ژ سەرجەمێ رووبەرێ گشتی یێ تەرخانكری بۆ چاندنا ڤان بەروبۆمان ل پارێزگەهێ دهێت. قەزا ئاكرێ ل رێزا دووێ ژبۆ چاندنا باقلەمەنیان ب رێژەیا (٣٠,٤٢٪)ێ دهێت ، قەزا شێخان ژی ل رێزا دووێ ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن رهدار ب رێژەیا (٣٠,٤٣٪)ێ دهێت.

٤. قەزا شێخان ل رێزا ئێكێ ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن زەیتی ب رێژەیا (٣٩,٠٧٪)ێ ل ژ سەرجەمێ رووبەرێ گشتی یێ تەرخانكری بۆ چاندنا ڤان بەروبۆمان ل پارێزگەهێ دهێت. ل دووڤدا قەزا بەردەرەش ل رێزا دووێ ب رێژەیا (٣٠,٦٣٪)ێ دهێت. لێ كێمترین رێژە ل قەزایێن دهۆك و ئاكرێ هاتینە توماركرن ب رێژەیێن (٠,٦٣ ٪ێ، ٣,٩٢٪)ێ ل دووڤ ئێك.

ئەڤێن ل خوارێ دیارترین بەروبۆمێن هاڤینێ نە كو ل دووڤ گرنگی و رێژەیا بەرهەم ئینانا وان هاتینە رێزكرن:

## ١- بەروبۆمێن كەسكاتی یێن بەری

بەروبۆمێن كەسكاتی ئەو جۆرێن كەسكاتینە یێن مفا ژ بەرێ وان دهێتە وەرگرتن وەك (باجانسۆرك، باجانرەشك، فلفل "بیبەر"، بامی، خیار، شتی، گوندۆر، كولند و ترۆزی ... هتد) و د ماوەیێ سالا ڤەكۆلین تێدا

هاتییە ئەنجامدان ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە چاندن. ل دەستپێکێ مە ئاماژە ب بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری کریە ژبەرکو مەزنترین رێژەیا بەرهەمئینانا بەروبۆمێن هاڤینێ ل پارێزگەهێ پێکدئینن، هەردیسان ئەڤ بەروبۆمە رێژەیەکا مەزن یا رووبەرێن عەردێ چاندنی ل پارێزگەهێ د سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان د مەزنخن. د خشتەیێ ژمارە (٢٤) دا بەربەلاڤترین بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری ل پارێزگەهێ هاتینە دیارکرن و ل دووڤ گرنگییا وان یا رێژەیی یا رووبەرێ عەردی تەرخانکری و دابەشکرنا

**خشتەیێ (٢٤)**

**گرنگییا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**

| یەکەیا کارگێری | باجانسۆرک | | خیار | | باجانرەشك | | بامی | | گوندۆر | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| دهۆك | ٦٧٠ | ٦,٩٨ | ١٥٥ | ٢,٠٤ | ٩٥ | ٤ | ٢٠ | ١,٦٢ | ٢٢٠٠ | ٩,٨ |
| سێمێل | ١٢٤٨ | ١٢,٩٩ | ٦٤١ | ٨,٤١ | ٢٦٧ | ١١,٢٤ | ٤٨ | ٣,٨٩ | ١١٥٠ | ٥,١٢ |
| ئامێدی | ١٢٥٠ | ١٣,٠١ | ٤٨١ | ٦,٣١ | ١٥٥ | ٦,٥٢ | ٥٤ | ٤,٣٧ | ٤٧٦ | ٢,١٢ |
| شێخان | ٧٣٣ | ٧,٦٣ | ٣٢٠ | ٤,٢ | ١٩٧ | ٨,٢٩ | ١٢٥ | ١٠,١٢ | ٢٩٧٨ | ١٣,٢٦ |
| ئاکرێ | ٦٠٤ | ٦,٢٩ | ١٤٦٩ | ١٩,٢٧ | ١٢٨ | ٥,٣٩ | ١٨٩ | ١٥,٣ | ٣٢٦٠ | ١٤,٥١ |
| زاخۆ | ٥٥٥ | ٥,٧٨ | ٣٦٠ | ٤,٧٢ | ٤٣٥ | ١٨,٣ | ٠ | ٠ | ٣١٠٠ | ١٣,٨ |
| بەردەرەش | ٤٥٥٠ | ٤٧,٣٥ | ٤٢٠٠ | ٥٥,٠٨ | ١١٠٠ | ٤٦,٢٨ | ٨٠٠ | ٦٧,٧٣ | ٩٣٠٠ | ٤١,٤ |
| پارێزگەهـ | ٩٦١٠ | ١٠٠ | ٧٦٢٦ | ١٠٠ | ٢٣٧٧ | ١٠٠ | ١٢٣٦ | ١٠٠ | ٢٢٤٦٤ | ١٠٠ |

| یەکەیا کارگێری | شتی | | فلفل | | ترۆزی | | کولند | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | | |
| دهۆك | ٢٠٥ | ٢,٠٨ | ٢٠ | ٢,٠٤ | ٢٠ | ٠,١٧ | ٦٥ | ٤,١٧ | | |
| سێمێل | ٦٩٩ | ٧,٠٨ | ٢٠٧ | ٢١,٠٤ | ٦٦ | ٠,٥٦ | ٦٣ | ٤,٠٤ | | |
| ئامێدی | ١١٧ | ١,١٩ | ٦٧ | ٦,٨١ | ٢٣ | ٠,٢ | ٨٠ | ٥,١٣ | | |
| شێخان | ١٠٨ | ١,١ | ٩١ | ٩,٢٥ | ٢٠٥٨ | ١٧,٧٥ | ٦٣ | ٤,٠٤ | | |
| ئاکرێ | ٣٠٠٧ | ٣٠,٤٤ | ٦٩ | ٧,٠٢ | ٢٢٧٠ | ١٨,٩٩ | ١٧١ | ١٠,٩٥ | | |
| زاخۆ | ٦٤٥ | ٦,٥٣ | ٨٠ | ٨,١٣ | ٢٠ | ٠,١٧ | ٨٠ | ٥,١٣ | | |
| بەردەرەش | ٥١٠٠ | ٥١,٦١ | ٤٥٠ | ٤٥,٧٤ | ٧٥٠٠ | ٦٢,٧٣ | ١٠٤٠ | ٦٦,٥٩ | | |
| پارێزگەهـ | ٩٨٨١ | ١٠٠ | ٩٨٤ | ١٠٠ | ١١٩٥٧ | ١٠٠ | ١٥٦٢ | ١٠٠ | | |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ: حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

وان ل سەر یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەهێ هاتینە ڕێزکرن.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٤) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاردبن:**

١. هەمی قەزایێن پارێزگەهێ پشکداری د مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری یێن هاڤینێ دا کرییە، ئەو ژی ژبەر پێدڤیا بازاڕێ ناڤخۆیی بۆ ڤان جۆرە بەرهەمان د سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان. بتنێ قەزا زاخۆ نەبیت کو چ رووبەرێن عەردی ژبۆ چاندن وبەرهەمئینانا بەروبۆمێن بامیان دماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان تۆمار نەکرینە.

٢. ژ داتایێن خشتەی دا هاتین بۆ مە دیاردبیت کو قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێکێ دهێت ژبۆ تەرخانکرنا رووبەرێ عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری یێن هاڤینێ ل پارێزگەهێ ژبەرکو قەزایەکا چاندنی یا ناڤدارە ل پارێزگەهێ. بتنێ ل ڤێ قەزایێ ل سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ڕێژەیا ب کارئینانا عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری ب ڤی ڕەنگی بوو: بامی ب ڕێژەیا (٦٧,٧٣٪)ێ، کولند ب ڕێژەیا (٦٦,٥٩٪)ێ، تروزی ب ڕێژەیا (٦٢,٧٣٪)ێ، خیار، ب ڕێژەیا (٥٥,٠٨٪)ێ، شتی ب ڕێژەیا (٥١,٦١٪)ێ، باجانسۆرك ب ڕێژەیا (٤٧,٣٥٪)ێ، باجانرەشك ب ڕێژەیا (٤٦,٢٨٪)ێ، گوندۆر ب ڕێژەیا (٤١,٤٪)ێ، و فلفل ب ڕێژەیا (٤٥..٦٤٪)ێ.

٣. ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، بەروبۆمێن گوندۆران ل ڕێزا ئێکێ ژبۆ تەرخانکرنا عەردێ چاندنی کو ل سەر رووبەرێ (٢٢٤٦٤) دۆنەمان هاتینە چاندن دهێت، قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێکێ ژبۆ تەرخانکرنا ڤی رووبەری ب ڕێژەیا (٤١,٤٪)ێ دهێت، ل دووڤدا قەزایێن ئاکرێ و شێخان ب ڕێژەیێن (١٤,٥١٪)ێ ، ١٣,٢٦٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن، ئەڤ بەروبۆمە ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ دهێتە چاندن.

٤. ژ داتایێن خشتەی بۆ مە دیاربیت کو تروزی ل ڕێزا دووێ ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی ل پارێزگەهێ د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان دهێن، ب ڕەنگەکی کو ل سەر رووبەرێ (١١٩٥٧) دۆنەمێن عەردی هاتینە چاندن. قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا ڤی رووبەری ب ڕێژەیا(٦٢,٧٣٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ چاندنی ل پارێزگەهێ یێ بۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی هاتییە تەرخانکرن دهێت، و ل دووڤدا هەر ئێك ژ قەزایێن ئاکرێ و شێخان ل ڕێزین دووێ و سیێ ب ڕێژەیێن (١٨,٩٩٪، ١٧,٧٥٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن. تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (١٠) بکە.

٥. بەروبۆمێن شتی و باجانسۆرك ژی ل ڕێزا سیێ و چوارێ ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی کو ل سەر رووبەرێ (٩٨٨١، ٩٦١٠) دۆنەمێن عەردی هاتینە چاندن دهێن. قەزا بەردەڕەش پتر ژ نیڤا رووبەرێ عەردێ چاندنی یێ بەروبۆمێن شتیان د مەزێخیت ئەو ژی ب ڕێژەیا (٥١,٦١٪)ێ، هەردیسان نێزیکی نیڤا رووبەرێ عەردێ چاندنی یێ بەروبۆمێن باجانسۆرکان ب ڕێژەیا (٤٧,٣٥٪)ێ د مەزێخیت. قەزا ئاکرێ ل ڕێزا دووێ ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی یێ چاندنا شتیان ب ڕێژەیا (٣٠,٤٤٪)ێ دهێت ب ڕەنگەکی کو قەزا ئاکرێ و بەردەڕەش پێکڤە پتر ژ (٨١٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ تەرخانکری بۆ چاندنا بەروبۆمێن شتیان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ پێکدئینن. قەزا سێمێلی ل ڕێزا دووێ ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی یێ تەرخانکری بۆ بەروبۆمێن باجانسۆرکان ب ڕێژەیا (١٢,٩٩٪)ێ دهێت.

٦. نێزیکی دوسێکێن رووبەرێ تەرخانکری بۆ چاندنا بەروبۆمێن باجانرەشکان دکەڤیتە قەزایێن بەردەڕەش و زاخۆ ب ڕێژەیێن (٤٦,٢٨٪، ١٨,٣٪)ێ ل دووڤ ئێك، قەزایێن دی ژی ب ڕێژەیێن نێزیکی ئێك ل دووڤدا دهێن.

**نەخشەیێ (١٠)**

**گرنگیا رێژەیی یا روویەرێ عەردی یێ بەروبوومێن کەسکاتی یێن بەری (دۆنەم) ل دووف یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤)**




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەکولەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ کارگێری یێ پارێزگەها دهۆکێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٤).

## ٢- بەروبۆمێن رهدار یێن هاڤینێ

ل وەرزێ هاڤینێ بتنێ دو بەرهەمێن رهدار دهێنە چاندن ئەو ژی پیڤاز و پتاتێن پاییزی نە، ئەڤ هەردو بەرهەمە ل داوییا وەرزێ بهارێ دهێنە چاندن، پیڤاز ل وەرزێ هاڤینێ دهێنە بەرهەمئینان لێ پتات ل وەرزێ پاییزێ دهێنە بەرهەمئینان (هلکێشان)، ب شێوەیەکێ گشتی بۆ چاندنا ڤان بەروبۆمان ژی پشت بەستن ل سەر ئاڤدانا دەستکرد دهێتە کرن. د خشتەیێ ژمارە (٢٥) برا بەرهەم هاتی یا هەر ئێك ژڤان بەروبۆمان ل پارێزگەهێ ل دووف یەکەیێن کارگێری هاتینە دیاکرن.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٥) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاربین:**

١. بلندترین رێژەیا مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا پتاتان ژ ئالیێ رووبەر و گرنگیا رێژەیی ڤە ل قەزا شێخان هاتییە توومارکرن، ب رەنگەکی ئەڤ بەروبۆمە ل سەر رووبەرێ (٢٦١٠) دۆنەمێن عەردی ل قەزا ناڤبری هاتییە چاندن کو دبیتە رێژەیا (٤٤,٤٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ تەرخانکری ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ. ل دووڤدا قەزا بەردەرەش دهێت کو ل وێرێ ژی پتات ل سەر رووبەرێ (٢٥٠٠) دۆنەمێن عەردی هاتینە چاندن و دبیتە رێژەیا (٤٢,٥٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتیێ پارێزگەهێ. قەزا سێمێلی ژی ل رێزا سێ ب مەزاختنا رووبەرێ (٦٠٠) دۆنەمان کو رێژەیا (١٠,٢١٪)ێ پێکدئینن دهێت. لێ قەزایێن دهۆك و زاخۆ ج رێژەیێن مەزاختنا رووبەرێن عەردی

**خشتەیێ (٢٥)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ بەروبۆمێن رهدار (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**

| یەکەیێن کارگێری | پیڤاز | | پتات | |
|---|---|---|---|---|
| | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| دهۆک | ٣٠٠ | ٨,٦٩ | ٠ | ٠ |
| سێمێل | ٧٩٩ | ٢٣,١٥ | ٦٠٠ | ١٠,٢١ |
| ئامێدی | ٧١٢ | ٢٠,٦٣ | ٣٢ | ٠,٥٤ |
| شێخان | ٢٢٧ | ٦,٥٧ | ٢٦١٠ | ٤٤,٤٤ |
| ئاکرێ | ١٦٨ | ٤,٨٧ | ١٣٠ | ٢,٢١ |
| زاخۆ | ١٩٥ | ٥,٦٥ | ٠ | ٠ |
| بەردەرەش | ١٠٥٠ | ٣٠,٤٢ | ٢٥٠٠ | ٤٢,٥٧ |
| پارێزگەهـ | ٣٤٥١ | ١٠٠ | ٥٨٧٢ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکۆمەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ نوکە.

**وێنەیێ (١٥)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ بەروبۆمێن رهدار (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٥).

ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی نەهاتینە توومارنەکرن. تەماشای وێنەیێ ژمارە (١٥) بکە.

٢. بەروبۆمێن پیڤازان ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ هاتییە چاندن، لێ قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا عەردێ چاندنێ بێ چاندنا پیڤازان ب ڕێژەیا (٣٠,٤٢٪)ێ ژ سەرجەمێ عەردێ چاندی ب ڤی دەرامەتی دهێت و ل دووڤدا قەزایێن سێمێلێ و ئامێدیێ دهێن ب ڕێژەیێن (٢٣,١٥٪، ٢٠,٦٣٪)ێ ل دووڤ ئێك، لێ ڕێژەیێن مەزاختنا عەردێ چاندنێ ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی ل قەزایێن دی ل وێ سالا ڤەکۆلین لێ هاتییە کرن تا ڕادەیەکی د نێزیکی ئێك بوون.

## ٣- بەروبۆمێن زەیتی

ئەڤ بەروبۆمە وان جۆرێن شینکاتی ب خۆڤە دگریت یێن ژبۆ مەرەما دەرخستن و ب دەستڤەئینانا زەیتێ دهێنە چاندن، ب شێوەیەکی گشتی بڕەکا باش یا ماددێن زەیتی دناڤ بەرێ ڤان بەروبۆماندا دهێتە عەمباکرن. د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان پێنج جۆرێن بەروبۆمێن زەیتی یێن هاڤینی ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە چاندن و بەرهەم ئینان ئەو ژی پێکدهێن ژ (گولبەرۆژ، کونجی، گەنمۆکێن زەر، فستەقێن بیستانی، فاسۆلیێن سۆیا). تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٢٦) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٦) ئەڤ ڕاستییە بۆ مە دیاردبن؛**

١. جوداهییەکا مەزن دناڤبەرا یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەهێ ژبۆ ب کارئینانا عەردێ چاندنێ ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن زەیتی یا هەی ب ڕەنگەکی کو ل هندەك قەزایان ڕێژەیەکا مەزن هاتییە چاندن و بەرهەمئینان لێ ل هندەك قەزایێن دی نە هاتییە بەرهەمئینان. بۆ نموونە قەزایا شێخان قەزایا ئێکانەیە ژبۆ چاندنا فستەق و فاسۆلیا بیستانی، لێ ئەڤ ڕێژەیە تا ڕادەیەکی ل سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان یا سنووردار بوو.

**خشتەیێ (٢٦)**

**گرنگیا ڕێژەیی یا ڕووبەرێ عەردێ بەروبۆمێن زەیتی (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**

| بەروبۆم | کونجی | | گولبەرۆژ | | گەنمۆکێن زەر | | فستەقێن بیستانی | | فاسۆلیێن سۆیا | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یەکەیێن کارگێری | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ | بەرهەم | ٪ |
| دهۆك | ٠ | ٠ | ٢٥ | ٤,٤٥ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| سێمێل | ٠ | ٠ | ١٨ | ٣,٢ | ٤٠٠ | ١٣,٧٧ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ئامێدی | ٢١٩ | ٤٤,٦ | ٨٥ | ١٥,١٢ | ٤ | ٠,١٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| شێخان | ٢٦ | ٥,٢٩ | ٣٥٤ | ٦٢,٩٩ | ١١٥١ | ٣٩,٦٢ | ١٥ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠٠ |
| ئاکرێ | ١٤٦ | ٢٩,٧٣ | ١٠ | ١,٧٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| زاخۆ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٣٠٠ | ١٠,٣٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| بەردەڕەش | ١٠٠ | ٢٠,٣٦ | ٧٠ | ١٢,٤٥ | ١٠٥٠ | ٣٦,١٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| پارێزگەهـ | ٤٩١ | ١٠٠ | ٥٦٢ | ١٠٠ | ٢٩٠٥ | ١٠٠ | ١٥ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠٠ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ: حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

٢. قەزا شێخان ل ڕێزا ئێکێ بۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا هەر ئێك ژ گولبەڕۆژان ب ڕێژەیا(٦٢,٩٩٪)ێ و گەنمۆکێن زەر ب ڕێژەیا(٣٩,٦٢٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ بۆ ڤان هەردو بەروبۆمان دهێت. قەزا ئامێدیێ ل ڕێزا دووێ ژبۆ مەزاختنا رووبەرێ عەردی ژبۆ چاندنا گولبەڕۆژان ب ڕێژەیا (١٥,١٢٪)ێ دهێت و قەزا بەردەڕەش ل ڕێزا دووێ ژبۆ مەزاختنا عەردی ژبۆ چاندنا گەنمۆکێن زەر ب ڕێژەیا (٣٦,١٤٪)ێ دهێت. لێ قەزایێن دهۆك و ئاکرێ چ ڕێژەیێن بەرهەمئینانا گەنموکان نەهاتینە تۆماکرن، هەردیسان قەزا زاخۆ چ ڕێژەیێن بەرهەمئینانا گولبەڕۆژان تۆمارنەکرینە، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (١١) بکە.

٣. قەزا ئامێدیێ ل ڕێزا ئێکێ بۆ مەزاختنا عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا کونجیان ب ڕێژەیا (٤٤,٦٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ پارێزگەهێ دهێت، قەزا ئاکرێ ل ڕێزا دووێ ب ڕێژەیا (٢٩,٧٣٪)ێ دهێت ، لێ قەزایێن دهۆك و سێمێلێ و زاخۆ چ ڕێژەیێن بەرهەمئینانا ڤی بەروبۆمی توومار نەکرینە.

## ٤- بەروبۆمێن باقلەمەنی

رووبەرێن عەردێن چاندنی ژبۆ چاندنا باقلەمەنییان ل هاڤینێ ژ قەزایەکێ بۆ قەزایەکا دی یا پارێزگەهێ ل دووڤ وێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان دهێتە گوهۆرین و سێ بەروبۆمێن قەرەنی ب خۆڤە دگریت ئەو ژی (لۆبیك و فاسۆلیی و ماش).

**نەخشەیێ (١١)**

**گرنگیا ڕێژەیی یا رووبەرێ عەردی یێ بەروبۆمێن زەیتی (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣_٢٠١٤)**




- ئەڤ نەخشە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر نەخشەیێ کارگێری یێ پارێزگەها دهۆکێ و داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٦).

**خشتەیێ (٤٧)**

**گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ بەروبۆمێن باقلەمەنی (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)**

| ژ | یەکەیێن کارگێری | لۆبیک | | فاسۆلی | | ماش | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ | رووبەر | ٪ |
| ١ | دهۆك | ١١٥ | ١٠,١٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ١٥ | ١,٣٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ١٤٥ | ١٢,٨٤ | ١٦ | ١٥,٠٩ | ٤٤ | ١٦,٠٦ |
| ٤ | شێخان | ٤٠ | ٣,٥٤ | ٤٠ | ٣٧,٧٣ | ٢٠ | ٧,٢٩ |
| ٥ | ئاکرێ | ٢٤٩ | ٢٢,٠٥ | ٠ | ٠ | ٢١٠ | ٧٦,٦٤ |
| ٦ | زاخۆ | ١٥ | ١,٣٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٥٥٠ | ٤٨,٧١ | ٥٠ | ٤٧,١٧ | ٠ | ٠ |
| | پارێزگەهـ | ١١٢٩ | ١٠٠ | ١٠٦ | ١٠٠ | ٢٧٤ | ١٠٠ |

**- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتییە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.**

باقلەمەنی ل رێزا دووێ پشتی دانودکاکان ژ ئالیێ گرنگیا خۆراکی دهێن ژبەرکو ژێدەرەکێ دەولەمەندە ب پرۆتینێن رووەکی، ئەڤ بەروبۆمە بۆ خوارنا مرۆڤان یان ژی وەك ئالف بۆ گیانەوەران دهێنە ب کارئینان. د خشتەیێ ژمارە (٤٧) برا بەرهەم هاتی یا جۆرێن باقلەمەنییان ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤) دا هاتینە دیارکرن.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٤٧) ئەڤ راستییە بۆ مە دیاربن،**

١. بەروبۆمێن لوبیکان ل هەمی قەزایێن پارێزگەهێ د ماوەیێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان هاتییە بەرهەم ئینان لێ قەزا بەردەرەش پشکا هەرە مەزن یا رووبەرێ عەردێ چاندنی ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی د مەزێخیت ب رەنگەکی کو رێژەیا وێ دگەهیتە (٤٨,٦٩٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ تەرخانکری ژبۆ چاندنا ڤی بەروبۆمی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، ل دووڤدا هەر ئێك ژ قەزایێن ئاکرێ و ئامێدیی ب رێژەیێن (٢٢,٠٣٪، ١٢,٨٤٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن. تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١٦) بکە.

٢. بەروبۆمێن باقلەمەنییان یێن هاڤینێ کو داتایێن وان د خشتەیێ سەری دا هاتینە دیارکرن ل هەردو قەزایێن ئامێدی و شێخان هاتینە چاندن.

٣. قەزایێن دهۆك و سێمێلێ و زاخۆ چ رێژەیێن بەرهەمئینانا فاسۆلی و ماشان توومار نەکرینە هەردیسان قەزا ئاکرێ چ رێژەیێن بەروبۆمێن فاسۆلی و قەزا بەردەرەش ژی بەروبۆمێن ماشان توومار نە کرینە.

## ٥- بەروبۆمێن دانودکاکی

بەروبۆمێن دانودکاکی یێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ بتنێ برنجی ب خۆڤە دگریت کو بۆ چاندنا وێ پشت بەستنێ دکەتە سەر ئاڤدانا دەستکر و ئەوا ژ رووباران ب رێکا جۆکان بۆ دهێتە ڤەگوهاستن. ئەڤ بەروبۆمە ل هندەك قەزایان دهێتە چاندن لێ

### وێنەیێ (١٦)
### گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ بەروبومێن باقلەمەنی ل هاڤینێ (دێمێ) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٧).

### خشتەیێ (٢٨)
### گرنگیا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ بەروبومێن دانودکاکێ هاڤینێ (دێمێ) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤)

| ژ | یەکەیێن کارگێری | برنج | |
|---|---|---|---|
| | | ڕووبەر | ٪ |
| ١ | دهۆك | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ٠ | ٠ |
| ٣ | ئامێدی | ١٠٤ | ١,٥ |
| ٤ | شێخان | ٨٠ | ١,١٥ |
| ٥ | ئاكرێ | ٣٢٧٠ | ٤٧,٠٢ |
| ٦ | زاخۆ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٣٥٠٠ | ٥٠,٣٣ |
| پارێزگەهـ | | ٥٩١٠ | ٦٩٥٤ |

- ئەڤ خشتە ژ ئالیێ ڤەکۆلەریڤە هاتیە ئامادەکرن ب پشت بەستن ل سەر ژێدەرێ، حکومەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەری نوکە.

**وێنەیێ (١٧)**
**گرنگییا رێژەیی یا رووبەرێ عەردێ بەروبومێن دانودکاکێ هاڤینێ (دۆنەم) ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا (٢٠١٣ - ٢٠١٤)**




- ئەڤ وێنەیە ژ ئامادەکرنا ڤەکۆلەری یە ب پشت بەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (٢٨).

ل هندەك قەزایێن دی ناهێتە چاندن، ئەڤ چەندە ژی پشت بەستنێ دکەتە سەر هەبوونا ژێدەرێن ئاڤی یێن بەردەوام ژبۆ چاندنا ڤی بەرهەمی ژبەرکو چاندنا برنجی پێدڤی ب ژێدەرەکێ ئاڤێ یێ بەردەوام هەیە.

هەورەکی د خشتەیێ ژمارە (٢٨) دا هاتییە دیارکرن، نیڤا رووبەرێ عەردێ چاندنی ژبۆ چاندن ڤی بەروبومی دکەڤیتە قەزا بەردەڕەش ئەو ژی ب رێژەیا (٥٠,٣٣٪)ێ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ کشتوکالی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ ژبۆ چاندنا ڤی بەروبومی. ل دووڤدا قەزا ئاکرێ ب رێژەیا (٤٧,٠٢٪)ێ ژ سەرجەمێ عەردێ ب ڤی دەرامەتی هاتییە چاندن دهێت، وەکە د خشتەیێ ژمارە (٢٨) دا دیار. تەماشەی وێنەیێ ژمارە (١٧) بکە.

# دەرئەنجام

## ل داوییا ڤێ ڤەکۆلینێ ئەم گەهشتینە ڤان دەرئەنجامان:

١. برا گشتی یابەرهەمئینانا بەروبومێن زڤستانێ د سالا (٢٠١٣ - ٢٠١٤)، گەهشتییە (٤٩٠٧١٢,٦٥) تەنان ل رێزا ئێکێ بەروبومێن دانودکاکی (گەنمێ دێمێ، گەنمێ ئاڤێ، جەهێ دێمێ و جەهێ ئاڤی) دهێت و رێژەیا وی دگەهیتە (٨٠,٠٨٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ زڤستانێ ل پارێزگەها دهۆکێ.

٢. ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، قەزا شێخان ل رێزا

ئێکێ ژبۆ بەرهەمئینانا هەر ئێك ژ بەروبۆمێن زڤستانێ یێن رهدار و زەیتی و کەسکاتیێ بەری ب رێژەیێن (٣٦,٤٪، ٦٦,٢٪، ٦١,١٪)ێ ل سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ل دووڤ ئێك دهێن. هەردیسان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ژبۆ بەرهەمئینانا هەر ئێك ژ بەروبۆمێن دانودکاك و باقلەمەنیێن زڤستانێ ب رێژەیێن (٢٦,١٪، ٤٣,٣٪)ێ دهێت.

٣. برا گشتییا بەرهەمئینانا بەروبۆمێن هاڤینێ ل سالا (٢٠١٣ – ٢٠١٤) ێ ل پارێزگەها دهۆکێ گەهشتییە (٢٨٩٢٧٢) تەنان ل رێزا ئێکێ بەروبۆمێن کەسکاتیێ بەری دهێت کو برا بەرهەمێ وی دگەهیتە (٢٢٧٥٠٣) تەنان و رێژەیا وی دگەهیتە(٧٨,٦٥٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بەرهەمێ هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ.

٤. ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ژبۆ بەرهەمئینانا هەر ئێك ژ بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری یێن هاڤینێ و بەروبۆمێن رهدار و دانودکاکی ب رێژەیێن (٥٠,١٪، ٤٦,٨٤٪، ٣٩,٥٣٪، ٥٠,٣٤٪)ێ ل وێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ل دووڤ ئێك دهێن. هەردیسان قەزا شێخان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ ل رێزا ئێکێ ژبۆ بەرهەمئینانا بەروبۆمێن زەیتی یێن هاڤینێ ب رێژەیا (٤٠,٤٤٪)ێ ژ سەرجەمێ بەرهەمێ پارێزگەهێ دهێت.

٥. سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ چاندنی یێ هاتییە تەرخانکرن ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن زڤستانی ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤) ێ دگەهیتە (٩٤٣٧١٠) دۆنەمێن عەردی ل سەر سەر ئاستێ پارێزگەهێ، بەروبۆمێن دانودکاکی (گەنمێ دێمی، گەنمێ ئاڤی، جەهێ دێمی و جەهێ ئاڤی) ل رێزا ئێکێ دهێن بۆ مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ کو ل سەر رووبەرێ (٩١٠٣٧٥) دۆنەمێن عەردی هاتییە چاندن و رێژەیا وی دگەهیتە (٩٦,٤٦٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ عەردێ هاتییە تەرخانکرن بۆ چاندنا بەروبۆمێن زڤستانی ل پارێزگەها دهۆکێ.

٦. قەزا شێخان ل رێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی یێن چاندنا بەروبۆمێن زڤستانی یێن کەسکاتی یێن بەری و بەروبۆمێن زەیتی، و بەروبۆمێن رهدار ل وێ سالا ڤەکۆلین تێدا هاتییە ئەنجامدان ب رێژەیێن (٦٥,٤٤٪، ٦٣,٦٤٪، ٣٣,٤٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ تەرخانکری بۆ هەر بەروبۆمەکی ل دووڤ ئێك دهێن. لێ قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی یێن چاندنا بەروبۆمێن زڤستانی یێن باقلەمەنی و دانودکاکی ب رێژەیێن (٤٧,٤٪ێ ، ٢٦,٣٦٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێن.

٧. سەرجەمێ گشتی یێ رووبەرێ عەردێ چاندنی یێ هاتییە تەرخانکرن ژبۆ چاندنا بەروبۆمێن هاڤینێ ل سالا (٢٠١٣-٢٠١٤) ێ ل پارێزگەها دهۆکێ دگەهیتە (٨٩٤٥٧) دۆنەمێن عەردی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، بەروبۆمێن کەسکاتیێ بەری ل رێزا ئێکێ بۆ مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ دهێت کو ل سەر رووبەرێ (٦٧٦٨٨) دۆنەمێن عەردی هاتییە چاندن و رێژەیا وی دگەهیتە (٧٥,٦٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ عەردێ هاتییە تەرخانکرن بۆ چاندنا بەروبۆمێن هاڤینێ ل پارێزگەها دهۆکێ.

٨. قەزا بەردەرەش ل رێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی یێن چاندنا بەروبۆمێن هاڤینێ یێن کەسکاتی یێن بەری و باقلەمەنی و بەروبۆمێن رهدار و بەروبۆمێن دانودکاکی ب رێژەیێن (٥٠,٢٩٪ێ، ٣٩,٧٧٪، ٣٨,٠٨٪، ٥٠,٣٣٪)ێ ل دووڤ ئێك دهێت. لێ قەزا شێخان ل رێزا ئێکێ ژبۆ مەزاختنا رووبەرێن عەردێ چاندنی یێن چاندنا بەروبۆمێن زەیتی یێن هاڤینێ و ب رێژەیا (٣٩,٠٧٪)ێ دهێت.

هندەك پەیڤ و ئیدیۆمێن چاندنێ

| عربي | كوردي |
|---|---|
| المحاصيل الزراعية | بەروبۆمێن کشتوکالی |
| التباين النوعي والمكاني | جوداهیيا جۆری و جهی |
| فرضية البحث | مگرتیا ڤەکۆلینێ |
| المحاصيل الزراعة الشتوية | بەروبۆمێن کشوکالی یێن زڤستانێ |
| المحاصيل الزراعية الصيفية | بەروبۆمێن کشوکالی یێن هاڤینێ |
| محاصيل الحبوب | بەروبۆمێن دانودکاکی |
| المحاصيل الجذرية | بەروبۆمێن رهدار |
| المحاصيل الزيتية | بەروبۆمێن زەیتی |
| البقوليات | باقلەمەنی |
| المحاصيل الخضرية الثمرية | بەروبۆمێن کەسکاتی یێن بەری |
| القمح الديمي والاروائي | گەنمێ دێمی و ئاڤی |
| الشعير الديمي والاروائي | جەهێ دێمی و ئاڤی |
| الشلغم | شێلم |
| الشوندر | شێلمدر |
| الفجل | تڤر |
| بذور القطن | تۆڤکێن پەمپی |
| الكزبرة | گژنیژ |
| اللهانة | کەلەمی |
| الرقي | شتی |
| البطيخ | گوندۆر |

## پەراویز:


١. عبدالله قاسم الفخري، الزراعة في الوطن العربي، دار الكتب للطباعة والنشر ، جامعة الموصل، ١٩٨٢ ، ص١٠١ .

٢. أشتي سلام صديق، امكانيات محافظة دهوك المناخية لزراعة الحبوب ـ دراسة في المناخ التطبيقي، رسالة ماجستير عير منشورة ، جامعة كوية ، ٢٠٠٩ ، ص ٣١ .

٣. للمزيد من التفاصيل حول تصنيف المحاصيل الزراعية انظر : ابراهيم المشهداني ، مبادئ واسس الجغرافية الزراعية ، مطبعة الارشاد ، بغداد ، ١٩٧٠ ، ص ص ٢٧٩ – ٢٨٠ .

٤. محمد محمود ابراهيم الديب، جغرافية الزراعة تحليل في التنظيم المكاني، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، طبعة ثانية ، ١٩٩٥ ، ص ٥٦٠ .

٥. مخلف مرعي شلال، ابراهيم محمد حسون القصاب، جغرافية الزراعة، دار الكتب للطباعة والنشر ، جامعة الموصل، ١٩٩٦ ، ص ١٥١ .

٦. ابراهيم المشهداني، مبادئ واسس الجغرافية الزراعية، المصدر السابق ، ص ١٦٧ .

٧. مخلف مرعي شلال، ابراهيم محمد حسون القصاب، جغرافية الزراعة، المصدر السابق، ص ٣٤٢.

٨. ابراهيم المشهداني، المصدر نفسه ، ص ٢٨٠ .

٩. للمزيد من التفاصيل انظر ، عبدالحميد احمد اليونس، عبدالستار عبدالله الكركجي، زراعة المحاصيل الصناعية في العراق، دار الكتب للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٧.

١٠. أشتي سلام صديق، المصدر السابق، ص ١٦٦.

١١. مخلف مرعي شلال، ابراهيم محمد حسون القصاب، جغرافية الزراعة، المصدر السابق، ص ٣٣٠.

# سامانێن تەرش و كەوالی ل پارێزگەها دهۆكێ

**پ.هـ. ئیبراهیم ختمان هسام**
**زانكۆیا دهۆك - كولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**

## پیشەكی

گیانەوەر یان سامانێن ئاژەلی دهێتە هژمارتن وەكی چالاكییەكا سەرەكی ژ چالاكیێن ئابووری، چونكی گرێدایبە ب چاندنێڤە ئەوا وەكی چالاكیا دەستپێكێ یە ژ كارێن ئابووری. و بشكەكا هەرە سەرەكییە ژ داهاتێ ئابووریێ وان وەلاتێن پشتگەرمێن چاندنی نە وەك داهاتەكێ سەرەكی د ئابووریا خۆدا.

خودانكرنا هندەك جۆرێن گیانەوەرێن كەهی مفایەكا ئابووریێ مەزن دگەهینتە وان كەسان یێن ب وێ وێ چەندێ رادبن، چ ژلایێ بارێ دارایبڤە بیت یان بەرهەمێ وان بۆ خوارنێ بێتە بكارئینان، چونكی بەرهەمێن گیانەوەری جۆرا و جۆرن وەكی (گۆشت، شیر، هری، پیست، ماست، پەنیر،.......هتد) و مفایەكێ باش دگەهینە مرۆڤی.

گیانەوەر ب شێوەیەكێ بەرفرەهـ ل پارێزگەها دهۆكێ ب تایبەت ل گوندان دهێنە خودانكردن. چ هندەك ژوان تەرش و كەوال بن وەكی (پەز، بزن و چێل) یان پەلەوەر بن ل پرۆژاندا وەكی(مریشك) یان ماسی، و ژ ئەگەرێ هەبوونا ئەردەكێ بەرفرەهـ وجهێن خودانكرنێ و هەبوونا ئالفێ ئاژەلان و پیتەدانا وەلاتیبان ب مفا وەرگرتنێ ژ ڤی سامانی. دێ د ڤێ ڤەكۆلینێدا دابەشكرنا جوگرافیبا ئەڤێ چەندێ دیاركەین. بەلێ ل گەل ئەڤێ چەندێدا هندەك هۆكار هەنە كارتێكەرن ل سەر خودانكرنا ئەڤی سامانی ل پارێزگەها مە ب فەری دیت بێنە دیاركرن ژوان یێن سەرەكی ب شێوەیەكا كورت.

## ئێك: هۆكارێن كارتێكەر ل سەر سامانێن ئاژەلی ل پارێزگەها دهۆكێ

### ١- هۆكارێن سرۆشتی

ئێك ژ گرنگترین فاكتەرێن كاریگەرە ل سەر ژیانا گیانەوەران یان خودانكرنا وان، چونكی گرێداینە ب ژینگەها سرۆشتیڤە ئەوا مرۆڤ نەشێت ب ساناهی چ گوهۆرینێ تێدا بكەت، ئەڤ هۆكارە ژ هندەك لایەنێن سەرەكی یێن خوارێ پێكدهێن.

### أ- بەرزی و نزمی

شیوەیێ ئەردێ ل هەر دەڤەرەكی ل دووڤ دیاردێن سرۆشتی هەر ژ (زنجیرێن چیا و بانیا و دەشتا و نهالا) ب خۆڤە دگریت. ل ڤێرێ بەرزی و نزمی رۆلەكێ گرنگ د خودانكرنا گیانەوەراندا هەیە برێكا كارتێكرنا وان ل سەر پرۆسا چەراندنێ و بەرهەمێن گیانەوەری ل هەر جهەكی.

ئەڤ كارتێكرنە دیاردبیت برێكا ئاراستەیا زنجیرێن چیای و چەنداتییا پلا لاریا ئەردی كو كاریگەریێ ل سەر خودانكرنا گیانەوەران ل جهێن چەراندنێ دكەت، ب شێوەیەكی گشتی پترین ئەردێ پاریزگەها دهۆكێ ژ دیاردێن رویێ ئەردی لایی بەرزی و نزمییان بخۆڤەدگریت، ئەڤ چەندە بوویە ئەگەرێ پەیداكرنا بارودۆخەكی باش و گونجای ژبۆ گەشبوونا رووەكێ پێدڤی بۆ چەراندنا گیانەوەران. هەروەسا هندەك گیانەوەر گرێداینە ب ڤی سرۆشتیڤە وەكی (بزنان)، بەلێ بەرزاتییا ئەردی ئاستەنگە درێكا خودانكرنا هندەكێن دیتر وەكی (پەز و چێلان) لەوما ئەوژی دهێنە خودانكرن یان پتریا وان ل دەڤەرێن دەشتا ل پاریزگەهێ نە، دەمێ ئەم بەحسا دابەشكرنا جوگرافی یا تەرش و كەوالان ل پاریزگەهێ بكەین ئەڤ چەندە دێ بۆ مە باش دیاربیت.

### ب- هشكاتی

كێمبوونا رێژا شهێ د ئاخێدا دبیتە ئەگەرێ كێمیا ئاڤێ درووەكیدا، دیسان دبیتە ئەگەرێ كێمبوونا گەشەكرنا رووەكی، كو كێمبوونا رێژا شهێ د جەویدا ئەڤە ژی ب باردوخێن كەش و هەوایڤە دهێتە گرێدان و ئەگەرێ هەرە سەرەكییێ كێمبوونا رێژا شهێ ب شێوەكا گشتی د كەش و هەوایێدا بلندبوونا پلا گەرمێ یە[1].

كەش و هەوا و رەگەزێن وێ ژ گرنگترین فاكتەرانە یێن دبنە ئەگەرێ هشكاتیێ ب تایبەتی (دابارین و شهـ و پلەیێن گەرمێ) ل گەل بای، بەلێ دڤێت ئەم ژبیرنەكەین دەمژمێرێن تیشكا رۆژێ و دووری و نێزیكی ژ هێلا كەمەری ژ هوكارێن گرنگن. كو هەمی پێكڤە دبنە ئەگەرێ هشكاتیێ. دیسان رۆلێ وێ یێ گرنگ دیاردبیت ل سەر جۆر و چریا رووەكان ئەوێ دبیتە ئالفێ سەرەكییێ چەراندنا گیانەوەران یان خارنا سەرەكییا وان. ب شێوەكی گشتی ل پاریزگەها دهۆكێ تا نهو چ سالێن هشكاتیێن زۆر لێ پەیدانەبووینە و یا لەرە لەرەیە. كو تێكرایێ چەنداتییا باران ل سەرجەمێ پاریزگەهێ نەهاتیە خوار ژ (٥٠٠) مللیمەترا سالانە د دەهـ سالێن داویێدا. وەكی دیار ئێك ژ رەگەزێن هەرە سەرەكی یێ هشكاتیێ كو كارتێكەر ئەوژی چەندییا بارانایە.

### ت- نەخۆشی

هندەك نەخۆشی هەنە كارتێكەرن ل سەر تەندروستییا گیانەوەرا، هندەك ژوان نەخۆشیان ژ ئەگەرێ هندەك زیندەوەرێن دیتر ئەڤێن ل سەر (الانسجة الحیة) یان خوینێ دژین پەیدادبن، ڤێجا چ ژ دەرڤەی یان ژوورڤەی لەشێ گیانەوەری بیت، یان ب رێكا خوارنێ و چاوانییا وێ ب رێكا خودانكرنێڤە گرێداینە، بۆ نموونە كێمبوونا رەگەزەكێ ژ رەگەزێن خوارنێ یان ئێك ژ جۆرێن ڤیتامینان یان خوێیا خوارنێ نەخۆشی پەیدادكەت و هندەك نەخۆشی زك ماكینە پەیدادبن ژبەر نەخۆشیێك ژ دەیك و بابا[2].

ئەڤ نەخۆشییە دبنە ئەگەرێ ژ دەستدانەكا مەزن ژ گیانەوەرا، ئەوێن تووشی ڤێ نەخۆشیێ دبن كێمكرنەكا مەزن ژ بەرهەمێ شیری لێ پەیدادبیت زێدەباری هندێ ،كو هندەك جارا دبنە ئەگەرێ ژناڤبرنا كەرێ گیانەوەران.

ژێدەرێن ئەمریكی دیاردكەن رێژا (٩- ١١٪)ێ ژ سەرجەمێ گیانەوەران ژ ئەگەرێ تووشبوونا وان ب نەخۆشیا سالانە دهێنە ڤەقەتیان و ڤەدەرگرن[3]. وەك نموونە: دێ هندەك ژوان جۆرێن نەخۆشیا دیاركەین، ئەوێن كارتێكرنێ ل سەر تەندروستییا گیانەوەرا ژ تەیر و كەوالا دكەن، ئەڤێن بەربەلاڤ ل عیراقێ[4].

بنێرە خشتەیێن ژمارە (١،٢) دا.

خشتەیێ (١)
نەخوشیێن گیانەوەران و چارەسەرکرنا وان ل پارێزگەها دهۆکێ

| ژ | جورێ نەخۆشیێ | چارەسەرکرن | جورێ دەرمانان |
|---|---|---|---|
| ١ | FMDشەبەك وتەبەکی (کولبوونا دەڤی) | ڤاکسینکرن | ئوکسی تیتراسایکلین |
| ٢ | خوریك (POX) | ڤاکسینکرن | تایلوسین و پینسلین |
| ٣ | تایا مالتا | ڤاکسینکرن | سترایپتومایین، ئە نروسول |
| ٤ | کولبوونا سیها | انتیبایوتیك+ڤیتامین | نیومایین |
| ٥ | کولبوونا گوهان | انتسبایتیوك + ڤیتامین | فینیکول، سلڤاپریم |
| ٦ | ئێشا پشیکا | | لیڤوزان، دیڤیر مکتین |
| ٧ | (PPR) دەردێ مرنێ (طاعون ) | ڤاکسینکرن | سایپر میرین |
| ٨ | لەرزك (ژەهراوی بوون ) | ڤاکسینکرن | مالتی ڤیتامین |
| ٩ | کێمبوونا کانزا و ڤیتامینان | کالسیوم+ ڤیتامین | ئەنالجین |
| ١٠ | مشەخۆرێن ناوەکی | دژە مشە خور | ئەنتی هستامین |
| ١١ | مشەخۆرێن دەرەکی | دژەمشەخور + شیشتن | ئەتروپین |
| ١٢ | کولبوونا چاڤا | انتیبایوتیك + ڤیتامین | کالسیوم |
| ١٣ | برینێن جۆراوجۆر | پاقژکرن+ انتیبایوتیك | فلوران |
| ١٤ | ئاستەنگ بونازانێ | نیشتە گەری +هورمون پاقژکرن+ انتیبایوتیك | ئولیگوڤیت |

- ژ کارێ ڤەکولەری، پشتبەستن ل سەر، حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەریا ڤیتەرنەری ل دهۆکێ، سالا ٢٠١٣، پێزانینێن نە بەلاڤکری.

خشتەیێ (٢)
نەخۆشین پەلەوەران و چارەسەرکرنا وان ل پارێزگەها دهۆکێ

| ژ | جورێ نەخۆشیا | چارەسەرکردن | جورێ دەرمان |
|---|---|---|---|
| ١ | نیوکاسل | ڤاکسینکرن | ئوکسی تیترا سایکلین، تایلوسین |
| ٢ | گەمبورو | ڤاکسینکرن | پینسلین، ئەندوسول |
| ٣ | CRD | انتیبایوتیك | لیڤوزان، ایڤیرمکتین، سایپرمیسرین |
| ٤ | I B | ڤاکسینکرن | ئولیگوڤیت |
| ٥ | زکچونا سپی | انتیبایوتیك | ئەنالجین، کالسیوم |
| ٦ | خوریکا باڵندا | ڤاکسینکرن | ئەنتی هتامین، ئەتروپیت |

- ژ کارێ ڤەکولەری، پشتبەستن ل سەر، حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ

## ٢- هۆکارێن مرۆڤی

ژ گرنگترین هۆکارێن مرۆڤی ئەڤێن ل خوارێ نە:

### أ- پیتاندنا دەستکرد و بکارئینانا دەرمانا بۆ چارەسەرکرنێ

ئەڤ کارە ژی ب رێکا ڤاکسیندانێ دهێتەئەنجامدان کو ئەو ژی (بارستەکا بهێزە کو دانا رادەیەکێ ژ دەرمانی جەرسومی یان ڤایروسی کو د بنەرتدا هاتییە وەرگرتن ژ گیانەوەرەکێ نەخۆش، ئەڤ جەرسومە یان ڤایروسە دهێتە زێدەکرن ب رێکێن جۆراوجۆر بەری بدەنە گیانەوەرێ یان ب رێکا دەڤی یان ب سرنجی دهێنەدان بۆ گیانەوەرێ ساخلەم داکو بەرگریا خوینا گیانەوەری دژی ڤان ئێشان مسۆگەربیت). ئەو هەوێن ڤاکسیندانێ پێ دهێنەکرن ژ لایێ بنکەهێن ڤیتەرنەری ڤە ل پارێزگەهێ ئەڤەنە[٥]:

١- شەبەك و تەبەکی (کولبوونا دەڤ وزمان) (FMD) سالێ دو جار.

٢- ئێشا خوریکا (POX) .

٣- تایا مالتا (Brucellosis).

٤- دەردە مرن (طاعون) (PPR).

### ب- بکارئینانا رێکێن زانستی د خودانکرنێ دا:

مەبەست ژ بکارهینانا رێکێن زانستی د خودانکرنا گیانەوەراندا ئامەدەکرنا سەقایەکێ باش و ساخلەم و جۆرێن ئالفێن نایاب و ڤاکسیندانێ و ئامادەکرنا دەرمانان و رێڤەبرنا پرۆژەیان ژ لایێ کەسانێن شارەزا و بسپۆرڤە، داکو ڤەرێژا وان زێدەبیت یان ئەڤ گیانەوەر د ساخلەمبن و بەرهەمێن وان د زێدەبن، و ئەڤ چەندە ژی ب پەیدابوونا ژمارەیەك زور ژ پرۆژەیێن خودانکرنا پەزی و چێلا و پرۆژەیێن خودانکرنا مریشك و ماسیان ل پارێزگەهێ دیاردبیت. سال بۆ سالێ ژمارەیا ئەڤان پرۆژەیان ل پارێزگەها دهۆکێ ل زێدەهیێ ددەت.

## دوو: دابەشکرنا جوگرافییا سامانێن ئاژەلی ل پارێزگەها دهۆکێ

## ١- تەرش و کەوال

### أ- پەز

ئاژەلەکێ زۆر ب مفایە، ئێکە ژ ئاژەلێن شیردەر، نیڤشك و پەنیر و ماست ژ شیرێ وی دروستدبن. ژ هریا وی جل و بەرگ و هندەك پێدڤێن ناڤمالێ وەکی : فەرش وجاچم سۆفی دروستدکەن. پیستێ وی ژی دپیشەسازیێدا دهێتە بکارئینان. هندەك جاران ژی ب ساخی د فرۆشن ژبەر هندێ خودانێن پەزی پارەکێ زۆر بدەستڤەدهینیت. پەزێ کوردستانێ ب شێوەکی زۆر ژ وان جۆرانە کو سالێ جارەکێ زاوزێ دکەن. بەرخێن وان ژی ژ (٤ - ١٠) هەیڤا ژ دایکێ جودا ناکەن. ئەڤەژی بۆ هندێ یە دا بەرخێن وان ب هێزبن. پشتی هنگێ دێ ڤان بەرخان ژ ماکێن وان جوداکەن. بەلێ هەر رۆژ دو جارا سپێدێ و ئێڤاری د دەمێ دۆشینێدا دێ ڤان بەرخا بەردەنە دگەل دایکێن وان. پشتی هنگی شیرێ پەزی هێدی هێدی کێم دبیت. حەتا وی وەختی کو رۆژێ جارەکێ د دۆشن.

پەز د رۆژێدا (٠,٣ – ١,٣) کێلوییێن شیری ددەت، کو سالانە هەر ژ رۆژا زانێ تا هشك دبیت دەمێ (٤-٦) هەیڤا شیری ددەن، سەرجەمێ شیری دگەهێتە دناڤبەرا (٤٠- ٥٠) لیتران د سالێدا. و گرنگترین جورێ پەزی ل پارێزگەها دهۆکێ (عەواسی، کوردی، حەمدانی)نە، ژ لایی جوگرافیڤە دهێتە دابەشکرن ل سەر ئاستێ قەزایان وەکی دیار د خشتەیا ژمارە (٣) دا[٦].

**ئەڤ خالێن خوارێ ژ خشتەیا سەری دیاردبن:**

١- ل سەر ئاستێ پارێزگەها دهۆکێ قەزا ئاکرێ ب پلا ئێکێ دهێت ب هژمارا پەزی ل هەردو سالێن دەستنیشانکریدا کو ب رێژەیا (٣١,٨٥٪)ێ ژ سەرجەمێ پەزی ل پارێزگەهێ یە، بنێرە نەخشە

**خشتەیێ (٣)**

**گرنگیا ڕێژەیی یا پەزی ل دووڤ یەکەیێن ڕێڤەبەری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن (٢٠٠٧ و ٢٠١٣)ێ**

| ژ | یەکێن ڕێڤەبەری | ژمارا پەزی ٢٠٠٧ | ٪ | ژمارا پەزی ٢٠١٣ | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆکێ | ٢٦٤٧٦ | ٤,٣ | ٤٢٣٦١ | ٤,٣ |
| ٢ | سیمیل | ١٥٦٣٩٤ | ٢٥,٤ | ٢٥٠٢٣٠ | ٢٥,٤ |
| ٣ | زاخو | ٧٣٨٩١ | ١٢ | ١١٨٢٢٦ | ١٢ |
| ٤ | ئاکری | ١٩٦١١٧ | ٣١,٨٥ | ٣١٣٧٨٧ | ٣١,٨٥ |
| ٥ | ئامیدی | ٢٠٠٣٧ | ٣,٢٥ | ٣٢٠٥٩ | ٣,٢٥ |
| ٦ | شیخان | ٨٦٦٣٤ | ١٤,٠٧ | ١٣٨٦١٤ | ١٤,٠٧ |
| ٧ | بەردەرەش | ٥٦١٢٧ | ٩,١٢ | ٨٩٨٠٣ | ٩,١٢ |
| پارێزگەهـ | | ٦١٥٦٧٦ | ١٠٠ | ٩٨٥٠٨٠ | ١٠٠ |

**- ژ کارێ ڤەکۆلەری، پشتبەستن ل سەر:**

**١- حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ڕێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، سالا ٢٠٠٧ێ، پێزانینێن نە بەلاڤکری.**

**٢- حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ڕێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، سالا ٢٠١٤، پێزانینێن نە بەلاڤکری. وەکی تقدیرات بو سالا ٢٠١٣.**

ژمارە (١)، کو ژمارا وان ژ (١٩٦١١٧) سەرن ل سالا (٢٠٠٧)ێ و بلندبوو تا گەهشتە (٣١٣٧٨٧) سەر ل سالا (٢٠١٣)ێ.

٢- سیمێلێ ب پلا دووێ دهێت ژ لایێ گرنگییا ڕێژەییڤە کو ب ڕێژا (٢٥,٤٪)ێ یە ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ ب خودانکرنا پەزی ،کو ژمارا وان ل سالا (٢٠١٣)ێ ل ڤێ قەزاێ گەهشتە(٢٥٠٢٣٠) سەرێن پەزی. و ئەگەرێ بلندبوونا ژمارا وان ل ڤێ دەڤەرێ دزڤریت کو پترین ئەردێ وێ دەشتە. چونکی ئەڤ گیانەوەرە نەشێت ل دەڤەرێن چیایی هاتن و چوونێ بکەت لەوما خودانکرنا وی ب زحمەتە و ئەڤ چەندە یا ڕۆنە کو کێمترین هژمار و گرنگییا ڕێژەیا ل قەزا ئامێدی (٣,٢٥٪)ێ یە ئەوا پتریا ئەردێ وێ چیای یە.

٣- پاشان قەزا شیخان ب پلا سێیێ دهێت ب ڕێژەیا (١٤,٠٧٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی ژ خودانکرنا پەزی ل پارێزگەهێ. بنێرە نەخشە (١).

## ب - بزن

بزنێ شیانێن زۆر هەنە بۆ هاتن و چوونێ و هەتا ئەگەر ل دەڤەرێن چیایی ژی بێتە خودانکرن. دشێت ل سەر گژوگیایێ کورت بچەریت. ژبەر هندێ بارا پتر وان ل پارێزگەها دهۆکێ ل ناوچێن چیایی دهێنە چەراندن. بزن بخۆ ئەگەر تێر ب زکێ خو خوارنێ نەخۆت هەر دێ شیری دەت. کو هەر ژ ڕۆژا زانێ و دناڤبەرا (٥- ٧) هەیڤا نێزیکی (٥٥) لیترێن شیری ددەت. هەروەسا بزن د دەمێ سالەکێدا (١) کیلۆیەکا مى ددەت. ژ مفایێن ڤی ئاژەلی ژ شیرێ وێ (ماست و پەنیر و ژاژی) دروستدبن، هەروەسا گوشتێ وێ مرۆڤ فایدەی ژێ دبینیت دگەل پیستێ وێ د هندەك پیشەسازیاندا دهێتە بکارئینان وەك پێلاڤا و مویێ وێ ژی دگەلەك پیشەسازیاندا بەشدارە وەك: دروستکرنا جل وبەرگ و گەلەك پێدڤیێن دی[7]. جۆرێن بزنا ل پارێزگەها دهۆکێ (کوردی، شەرابی، عەرەبی) نە. و دابەشکرنا وان ژ لایێ جوگرافیڤە ل پارێزگەهێ وەکی دیار ل خشتەیێ (٤) دایە.

**نەخشە(١)**

**گرنگیا رێژەیێ یا پەزی ل دووف یەکەیێن رێڤەبەری ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠١٣**




**خشتا (٤)**

**گرنگیا رێژەیێ یا بزنا ل دووف یەکەیێن رێڤەبەری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالێن (٢٠٠٧ و ٢٠١٣)**

| ژ | یەکێن رێڤەبەری | ژمارا بزنا ٢٠٠٧ | ٪ | ژمارا بزنا ٢٠١٣ | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆکێ | ١٣٣٥١ | ٥,٩٤ | ٢١٣٦١ | ٥,٩٣ |
| ٢ | سیمیل | ٢٣١٠٥ | ١٠,٢٧ | ٣٦٩٦٨ | ١٠,٢٧ |
| ٣ | زاخو | ٣٩٣٢٤ | ١٧,٤٩ | ٦٢٩١٨ | ١٧,٤٩ |
| ٤ | ئاکری | ١٠٤٩٩٦ | ٤٦,٦٩ | ١٦٧٩٩٤ | ٤٦,٦٩ |
| ٥ | ئامێدی | ١٧٩٠٧ | ٧,٩٦ | ٢٨٦٥١ | ٧,٩٦ |
| ٦ | شیخان | ١٦٤٤٨ | ٧,٣١ | ٢٦٣١٦ | ٧,٣١ |
| ٧ | بەردەرەش | ٩٧١٤ | ٤,٣٢ | ١٥٥٤٢ | ٤,٣٢ |
| | پارێزگەه | ٢٢٤٨٤٥ | ١٠٠ | ٣٥٩٧٥٠ | ١٠٠ |

- ژ کارێ ڤەکۆلەری، پشتبەستن ل سەر:

١- حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، سالا ٢٠٠٧، نە بەلاڤکری.

٢- حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، سالا ٢٠١٤، پێزانینێن نە بەلاڤکری.وەکی تقدیرات بو سالا ٢٠١٣.

**ئەڤ تێبینێن ل خوارێ ژ خشتەیێ سەری دیاربن:**

١- دیسان وەكی پەزی قەزا ئاكرێ ب پلا ئێكێ دهێت ب گرنگیا رێژەیی یا هژمارا بزنا ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ ل هەردو سالێن دەستنیشانكریدا كو نێزیكی نیڤا بەرهەمێن پارێزگەهێ ب رێژەیا (٤٦,٦٩٪)ێ ژ سەرجەمێ بزنێن پارێزگەهێ بنێرە نەخشە ژمارە (٢)، كو ژمارا وان ژ (١٠٤٩٩٦) سەر ل سالا (٢٠٠٧)ێ و بلندبوو تا گەهشتە (١٦٧٩٩٤) سەر ل سالا (٢٠١٣)ێ . بەلێ ژمارا دوماهێكێ بتنێ تەقدیرە ژ لایێ رێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەهێ و چ ئامار بۆ ئاژەلان ب شێوەكێ گشتی و بزنان ب شێوەكی تایبەت نەهاتینە ئەنجامدان.

٢- ب پلا دووێ و سێیێ قەزایێن زاخۆ وسێمێلێ دهێن ب گرنگیا رێژەیی یا هژمارا بزنان ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ كو بـ (١٧,٤٩ ٪ێ، ١٠,٢٧٪)ێ ل دووڤ ئێكدا ل سالێن ئاماركرنێ وتەقدیرا هاتیە ئەنجامدان ژ لایێ رێڤەبەریا بەرهەمێن ئاژەلی یا پارێزگەها دهۆكێ.

٣- دیاردبیت ژ خشتەیێ كو قەزا ئامێدی پلا دوماهیك ناهێت ب گرنگیا رێژەیی بو بزنا ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ كو (٧,٩٦٪)ێ دگەل كو پترین ئەردێ وێ بەرزاتی یە، چونكی ئەڤ گیانەوەرە دشێت خۆ بگونجینیت ل گەل ئەڤی ب ارودۆخی. كو قەزا بەردەرەش ب پلا دوماهیێ دهێت، چونكی هاولاتیێن وێ جەخت ل سەر خودانكرنا پەزی دكەن.

**نەخشە(٢)**
**گرنگیا رێژەیی یا بزنا ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ٢٠١٣**



## ج- چێل

جۆتیار پێكیرییەكا تایبەت ب خودانكرنا چێلا دكەن. چونكی ژ لایەكیڤە ژبەر بەرهەمێن وێ وەك شیر و ماست و گۆشت چ بۆ خۆ بیت یان بو فروتنێ بیت مفادارن. ژ لایەكێ دیڤە دەمێن بەرێدا چێل بۆ كاروبارێن چاندنی وەك جۆتی و كێلانێ دهاتنەبكارئینان. بەلێ نۆكە ژبەر پێشكەفتنێن تەكنولوجی چێل بۆ كارێن كێلانێ ناهێنە بكارئینان.

چێل رێژەیەكا زۆر یاشیری ددەت بەلێ نۆكە ژبەر خرابی ونەبوونا ئالفێ باش و بەلاڤبوونا نەخۆشییا شیرێ چێلێ كێمبوویە. ژمارا رۆژێن چێل شیری ددەت دناڤبەرا (٨٠ – ٢٢٠) رۆژانە. د ڤی دەمیدا شیرێ چێلێ دگەهیتە ناڤبەرا (٥٠٠- ٨٠٠) لیترێن شیری. كو ئەو ژی رۆژێ دوجاران د دۆشن سپێدێ و ئێڤاری. ژمارا سەرێن چێلا ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣) دا دگەهشتە (٤٩٨٣٤) سەر ژ جۆرێن (كوردی و شەرابی) دگەل ڤێ چەندێ هندەكێن دی ژی دهێن خودانكرن ژ بۆ بەرهەمكرنا شیری وەكی چێلێن (ڤریزیان و یێن هولەندی). بەلێ دابەشكرنا وان ژ لایی جوگرافیڤە جیاوازە ل سەر ئاستێ یەكەیێن رێڤەبەری ل پارێزگەهێ وەكی دیار ل خشتەیێ ژمارە (٥) دا.

### ژ خشتەیێ ژمارە (٥) ئەڤ تێبینێن ل خوارێ دیاربین:

١- دیسان وەكی پەزی و بزنا قەزا ئاكرێ ب پلا ئێكێ دهێت ب گرنگییا رێژەیی یا هژمارا چێلا ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ ل هەردو سالێن دەستنیشانكریدا كو زێدەتر نیڤا بەرهەمێن پارێزگەهێیە ب رێژا (٥٤,٦٥٪)ێ ژ سەرجەمێ سەرێن چێلا ل پارێزگەهێ. بنێرە نەخشە ژمارە (٣)، كو ژمارا وان ژ (٢٧٢٣٧) سەرن ل سالێن (٢٠٠٧ – ٢٠١٣)ێ. و چ ئامارێن دروست بو چێلا نەهاتینە ئەنجامدان.

٢- ب پلا دووێ قەزا بەردەرەش دهێت ب گرنگییا رێژیی یا هژمارا چێلا ل سەر ئاستێ پارێزگەهی كو ب (٢٠,٥٣٪)ێ یە، كو (١٠٢٣٤) سەرن ل دووڤ ئامار

خشتەیێ (٥)

گرنگیا رێژەیی یا چێلا ل دووڤ یەكەیێن كارگیری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالێن (٢٠٠٧ و ٢٠١٣)

| ژ | یەكەیێن رێڤەبەری | ژمارا چێلا ٢٠٠٧ | ٪ | ژمارا چێلا ٢٠١٣ | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆكێ | ٣٦٦ | ٠,٧٣ | ٥٨٥ | ١,١٧ |
| ٢ | سیمیل | ١٣٥٩ | ٢,٧٤ | ١٣٥٩ | ٢,٧٣ |
| ٣ | زاخو | ١٢٤٤ | ٢,٥ | ١٢٤٤ | ٢,٤٩ |
| ٤ | ئاكری | ٢٧٢٣٧ | ٥٤,٨٩ | ٢٧٢٣٧ | ٥٤,٦٥ |
| ٥ | ئامیدی | ٦٠٥٤ | ١٢,٢ | ٦٠٥٤ | ١٢,١٤ |
| ٦ | شیخان | ٣١٢١ | ٦,٢٩ | ٣١٢١ | ٦,٢٦ |
| ٧ | بەردەرەش | ١٠٢٣٤ | ٢٠,٦٢ | ١٠٢٣٤ | ٢٠,٥٣ |
| | پارێزگەهـ | ٤٩٦١٥ | ١٠٠ | ٤٩٨٣٤ | ١٠٠ |

- ژ كارێ ڤەكولەری، پشتبەستن ل سەر:

١- حكومەتا هەرێما كوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەرییا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆكێ، سالا ٢٠٠٧، نە بەلاڤكری.

٢- حكومەتا هەرێما كوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەرییا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆكێ، سالا ٢٠١٤، پێزانینێن نە بەلاڤكری.وەكی تقدیرات بۆ سالا ٢٠١٣.

نەخشە (٣)
گرنگیا رێژەیی یا چێلا ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالێن (٢٠٠٧ و ٢٠١٣)




و تەقدیرا هاتییە ئەنجامدان ژ لایی رێڤەبەریا بەرهەمێن ئاژەلی یا پارێزگەها دهۆكێ.

٣- دیاردبیت ژ خشتەیێ كو قەزا دهۆكێ پلا دوماهیك دهێت ب گرنگیا رێژەیی بۆ چێلا ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ كو (٠,٧٣٪)ێ ل سالا (٢٠٠٧)ێ بەلێ بلندبوویە تا گەهشتیە (١,١٧٪)ێ ل سالا (٢٠١٣)ێ ژبەر زێدەبوونا ژمارا سەرێن چێلا (٣٦٦) سەرا بوو (٥٨٥) سەر ل سالا دوماهیێ.

## ٢- پەلەوەر

هەبوونا ئەڤان جۆرە پەلەوەران وخودانكرنا وان ب بەرفرەهی ل هەمی گوندێن پارێزگەها دهۆكێ ژ ئەنجامێ پیتەدانا خەلكێ وان گوندانە و هەروەسا هەبوونا ئالفی و جهێن تایبەت بۆ خودانكرنا ڤان پەلەوەران تارادەیەكێ ناڤنجی و مفا گەهاندن ب سەروبەرێ ئابووریێ كەسێن بخودانكرنا پەلەوەران رادبن، گرنگترین بەرهەمێ پەلەوەران (گۆشت و هێك و پەر)ن.

بەلێ خودانكرنا مریشكان و پرۆژەیێن وان ل پارێزگەهێ ب شێوەیەكی ئابووری ژ هەمی پەلەوەرێن دیتر پترن، لەوما دێ داكوكیێ ل سەر پرۆژەیێن مریشكا كەین. چونكی د ڤان سالێن داوییدا ژبەر زێدەبوونا خارنا هێكا و گۆشتێ مریشكێ و زێدەبوونا بهایێ گۆشتێ گیانەوەران چەندین پرۆژەیێن خودانكرنا مریشكان ل دهۆكێ هاتینە دانان.

هندەك پرۆژە شیانێن بەرهەمكرنا مریشكێن گۆشتی ل دووڤ وەرزێن سالێ هەنە كو هەر وەرزەكی شیانێ بەرهەمئینانا وەجبەكا مریشكان هەیە. دیسان هندەك پرۆژە د بسپۆرن ب دایكبوونا مریشكان یان چیچەلۆكا بتنێ كو دبێژنێ پرۆژەیێن

(تفقیس). بەلێ دابەشکرنا جوگرافی یا وان پرۆژەییا و پرۆژەیێن بەرهەمئینانێ و هۆلێن خودانکرنێ و پرۆژەیێن چیچەلۆکێن مریشکا ل سەر ئاستێ یەکەیێن کارگیری ل پارێزگەهێ دیاردبیت د خشتەیێن ژمارە (٦، ٧) دا.

**ژ خشتەیێ ژمارە (٦) تێبینێن خوارێ دیاردبن :**

١- قەزا بەردەرەش ب پلا ئێکێ دهێت ب گرنگیا رێژەیی یا هژمارا مریشکان و هۆلێن خودانکرنێ ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ کو (٢٨,٧٩٪، ٢٨,٥٢٪)ێ ل دووڤ ئێکدا ژ سەرجەمێ وزا

**خشتەیێ (٦)**

**گرنگیا رێژەیی یا پەلەوەرا (مریشك) ل دووڤ یەکەیێن کارگیری ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠١٤**

| ژ | یەکێن ڕێڤەبەری | وزا بەرهەمکرنێ | ٪ | ژمارا هولا | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆکێ | ٥٤٧٠٥٠ | ١٩,٩٧ | ٤٧ | ١٦,٩٧ |
| ٢ | سیمیل | ٤٥٧٢٥٠ | ١٦,٦٩ | ٥٥ | ١٩,٨٦ |
| ٣ | زاخو | ٩٥١٥٠ | ٣,٤٨ | ١٠ | ٣,٦١ |
| ٤ | ئاکری | ١٤٣٠٠٠ | ٥,٢٢ | ١٥ | ٥,٤٢ |
| ٥ | ئامێدی | ١٣٦٧٥٠ | ٤,٩٩ | ١٤ | ٥,٠٥ |
| ٦ | شێخان | ٥٧٢٣٦٠ | ٢٠,٨٩ | ٥٧ | ٢٠,٥٨ |
| ٧ | بەردەرەش | ٧٨٨٧١٠ | ٢٨,٧٩ | ٧٩ | ٢٨,٥٢ |
| پارێزگەهـ | | ٢٧٤٠٢٧٠ | ١٠٠ | ٢٧٧ | ١٠٠ |

- ژ کارێ ڤەکولەری، پشتبەستن ل سەر، حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ

**خشتەیێ (٧)**

**گرنگیا رێژەیی یا وزا بەرهەمئینانا چیچەلۆکێن مریشکان ل دووڤ یەکەیێن کارگیری ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠١٤**

| ژ | یەکێن ڕێڤەبەری | وزا بەرهەمکرنێ | ٪ | ژمارا هولا | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆکێ | ١٩٢٠٠٠ | ٠,٥٨ | ١ | ١١,١٢ |
| ٢ | سیمیل | ٢٤٣٦٥٠٠٠ | ٧٢,٦ | ٤ | ٤٤,٤٥ |
| ٣ | زاخو | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٤ | ئاکری | ٩٠٠٠٠٠٠ | ٢٦,٨٢ | ٤ | ٤٤,٤٥ |
| ٥ | ئامێدی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٦ | شێخان | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| پارێزگەهـ | | ٣٣٥٥٧٠٠٠ | ١٠٠ | ٩ | ١٠٠ |

- ژ کارێ ڤەکولەری، پشتبەستن ل سەر، حکومەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ

**نەخشە (٤)**

**گرنگیا رێژەیی یا وزا بەرهەمئینانا مریشکان و هۆلێن خودانکرنێ ل دووف یەکەیێن کارگێری ل دهۆکێ ٢٠١٤**




بەرهەمکرنێ و هۆلێن خودانکرنێ ل پارێزگەهێ. بنێرە نەخشە ژمارە (٤)، کو ژمارا وان ژ (٧٨٨٧١٠) مریشکن ل (٧٩)هـۆلا د سالا ٢٠١٤ دا دهێن خودانکرن.

٢- قەزا شێخان ب پلا دووێ دهێت ب گرنگیا رێژەیی یا هژمارا مریشکان و هۆلێن خودانکرنێ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ کو (٢٠,٨٩ ٪، ٢٠,٥٨ ٪)ێ ل دووف ئێکدا ژ سەرجەمێ وزا بەرهەمکرنێ و هۆلێن خودانکرنێ، کو ژمارا وان ژ (٥٧٢٣٦٠) مریشکن دهێن خودانکرن ل (٥٧)هۆلا پارێزگەها دهۆکێ.

٣- دیاردبیت ژ خشتەی کو قەزا دهۆکێ پلا سێیێ دهێت ب گرنگیا رێژەیی بۆ ژمارا مریشکا ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ کو (١٩,٩٧٪)ێ یە ب (٥٤٧٠٥٠) مریشك، بەلێ ژلایی هۆلێن خودانکرنێ ب پلا چارێ دهێت پشتی قەزا سێمێل کو (٤٧) هۆل ل دهۆکێ دیاردبن بەرامبەری (٥٥) هۆل ل قەزا سێمێلێ.

**ژ خشتەیێ ژمارە (٧) تێبینێن خوارێ دیاردبن،**

١- ل سێ قەزا بتنێ پرۆژەیێن چیچەلۆکا دیاردبن (دهۆکێ، سێمێل، ئاکرێ)، کو سەرجەمێ وان دگەهینە (٣٣٥٥٧٠٠٠) چیچەلۆك. و ل قەزایێن دیتر ئەڤ پرۆژە دیارنابن.

٢- قەزا سێمێل ب پلا ئێکێ دهێت ب گرنگیا رێژەیی یا بەرهەمئینانا چیچەلۆکێن مریشکا کو نێزیکی سێ پشکێن بەرهەمێ پارێزگەهێ ب قەدگریت ب رێژا (٧٢,٦٪)ێ یە ب (٢٤٣٦٥٠٠٠)

نەخشە (٥)
گرنگیا رێژەیی یا وزا بەرهەمئینانا چیچەلۆكا و هولێن خودانكرنێ ل دووڤ یەكەیێن كارگێری ل دهۆكێ ٢٠١٤




چیچەلۆك بۆ هەر وەجبا بەرهەمئینانێ. بەلێ رێژا هۆلێن خودانكرنێ ل قەزا ئاكرێ ب رێژەیا (٤٤,٤٥٪)ێ بۆ هەر ئێك ژوان. بنێرە نەخشەیێ ژمارە (٥).

## ٣- ماسی

ماسی ئێك ژ گیانەوەرێن زۆر گرنگە و وەك كەرەستەكێ خوارنێ مرۆڤ مفای ژێ وەردگریت. ژ ساخلەتێن بەرهەمێ گۆشتی ماسی پەیداكرنا هندەك كانزایێن گرنگ و پێدڤییە بۆ مرۆڤی ل شێوێن ئاسایدا دڤێت مرۆڤ گوشتێ ماسی بكاربینیت حەفتیانە یان ئەگەر هەبیت ب شێوەكێ بەردەوام كو هیچ لایەنێن زەرەرمەندی ل خوارنا گۆشتێ ماسی دا نینە بەرامبەری گوشتێن سوور یان گوشتێن بالندەیان.

پتریا جۆرێن ماسیان ل دەڤەرا ڤەكۆلینا مە ژێ دگریت دیاردبن ئەوژی ماسیێن رووبارانە (یێن تازە) نە، چونكی ئەو دهێنە دەرئینان ژ بەنداڤێ سكرێ مووسل یان جهێن دیترێن كوردستانێ و عێراقێ دئینن. گرنگترین جۆرێن ماسیێن رووباران ئەوێن پێدڤی ل سەر هەی ژ جۆرێ (شەبوت – مەرمەریج – مار ماسی - كارب) ل گەل هندەك جۆرێن دیتر دهێنە دەرئینان وەكی (جری).

هندەك جۆرێن دی یێن ماسییان دیاردبن بەلێ ئەوژی ژ ماسیێن دەریایی نە، ئەوێن دهینە ئینان بۆ بازارێن هەرێما كوردستانێ ب شێوەكێ گشتی و ل پارێزگەها دهۆكێ ب شێوەكێ تایبەت ئەوژی ماسیێن بەستی كرینە و ساخلەتێن وان كو بهایێن وان ئەرزانترە ژ ماسیێن ناڤخۆیی ئەوێن ئەم دبێژینێ ماسیێن رووباران. ئەوێن بهایێ وان گرانتر و پێدڤیاتی پتر ل سەر هەی.

دو جۆرێن پرۆژەیێن خودانکرنا سامانێن ماسیيان ل پارێزگەها دهۆکێ هەنە کو ئەوژی یێ ئێکێ خودانکرن ب ڕێکا حەوزا ب رووبەرێن جۆراوجۆر، و یێ دووێ خودانکرن برێکا قەفەسا بەلێ ئەڤە بتنێ ل دەڤەرەکێ یان ل قەزایەکێ دیاردبیت کو ئەوژی قەزا سێمێلێ یە دناڤ رووبارێ دیجلەی قەفەسێن خودانکرنێ هاتینە دروستکرن.دیسان دابەشکرنا جوگرافی یا پرۆژەیێن ماسیيان ب ڕێکا حەوزا ل هەمێ یەکەیێن ڕێڤەبەری دیاردبن بەلێ ب رووبەری و ژمارا وان ژ هەڤجودانە وەکی دیار د خشتەیێ ژمارە (٨) دا.

**ئەڤ تێبینێن خـوارێ ژ خشتەیێ ژمـارە (٨) دیاردبن،**

١- ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ قەزا زاخۆ ب پلا ئێکێ دهێت ب گرنگیا ڕێژەیی یا هژمارا حەوزێن خودانکرنا ماسیيان ب (٦٧) حەوزا ب ڕێژەیا (٣٩,٨٨٪)ێ ژ سەرجەمێ حەوزێن ماسیيان ل پارێزگەهێ. بەلێ ب پلا دووێ دهێت ژ لایێ رووبەرێ ئەردێ وەبەرهینای بۆ بخودانکرنا ماسیيانن پشتی قەزا بەردەرەش ب ڕێژەیا (٣٤,٤١٪)ێ ژ سەرجەمێ ئەردێ وەبەرهینای ب حەوزێن ماسیيان ل پارێزگەهێ بەرامبەری (٢٥,٨٨٪)ێ بو قەزا زاخو. بنێرە نەخشەیێ ژمارە (٦).

٢- ئامێدیێ ب پلا دووێ دهێت ب ژمارا حەوزێن ماسیيان ب (٥٦) حەوزا ب ڕێژەیا (٣٣,٣٤٪)ێ یە ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ، بەلێ ب پلا پێنجێ دهێت ژ لایێ ئەردێ وەبەرهینای، چونکی رووبەرێ ئەردێ راست یێ کێمە و پتریا ئەردێ وێ قەزایێ چیایی یە.

٣- دیاردبیت کو قەزا ئاکرێ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ ب پلا دوماهیێ دهێت چ ژ لایێ ژمارا حەوزێن ماسیيان یان ئەردێ وەبەرهینای بو وێ چەندێ.

٤- قەفەسێن خودانکرنێ ماسیيان بتنێ ل قەزا سێمێلێ دیاردبن کو ئەوژی ل رووبارێ دیجلە دا دهێنە دانین.

**خشتا (٨)**

**گرنگیا ڕێژەیی یا حەوز و قەفەسێن خودانکرنا ماسیيان ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠١٤**

| ژ | یەکەیێن ڕێڤەبەری | ژمارا حەوزا | ٪ | رووبەر /دۆنم | ٪ | ژمارا قەفەسا | ٪ | رووبەر /م ٢ | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆکێ | ٣ | ١,٧٩ | ٣,٥ | ٤,٩٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٢ | سێمێل | ٩ | ٥,٣٦ | ١٤,٧ | ٢٠,٦٥ | ٩١ | ١٠٠ | ٢٠٤٠ | ١٠٠ |
| ٣ | زاخۆ | ٦٧ | ٣٩,٨٨ | ١٨,٤٢٦ | ٢٥,٨٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٤ | ئاکرێ | ١ | ٠,٦ | ١,٠٨ | ١,٥٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٥ | ئامێدێ | ٥٦ | ٣٣,٣٤ | ٣,٦ | ٥,٠٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٦ | شێخان | ٧ | ٤,١٧ | ٥,٤ | ٧,٥٩ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ٧ | بەردەرەش | ٢٥ | ١٤,٨٨ | ٢٤,٥ | ٣٤,٤١ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| | پارێزگەهـ | ١٦٨ | ١٠٠ | ٧١,٢١ | ١٠٠ | ٩١ | ١٠٠ | ٢٠٤٠ | ١٠٠ |

- ژ کارێ ڤەکۆلەری، پشتبەستن ل سەر، حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ

**نەخشەیێ (٦)**

**گرنگیا رێژەیی یا حەوز وقەفەسێن خودانکرنا ماسیبان ل دووڤ یەکەیێن کارگێری ل پارێزگەها دهۆکێ ٢٠١٤**




## ژێدەر و پەراویز:

١. عبدلله قاسم الفخری، الزراعه الجافة اسسها وعناصر استثمارها، دار الکتب للطباعة والنشر جامعة الموصل، سنة ١٩٨١،ص٩٣.

٢. نجیب توفیق غزال، انتاج الاغنام والصوف، دار الکتب للطباعة والنشر جامعة الموصل، سنة ١٩٧٠ ،ص ٣٦٠.

٣. احمد الحاج طه صالح ،ماشیة الحلیب، دار الکتب للطباعة والنشر جامعة الموصل، سنة ١٩٨٩م ،ص٣٣٩.

٤. نجیب توفیق غزال، انتاج الاغنام والصوف، المصدر سابق، ص٣٦٠

٥. حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەریا ڤیتەرنەری ل دهۆکێ، سالا ٢٠١٣، پێزانینێن نە بەلاڤکری

٦. حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، ژێدەرێ بەرێ.

٧. حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، سالا ٢٠٠٧، پێزانینێن نە بەلاڤکری.

٨. حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ عیراقێ، وەزارەتا چاندنێ، رێڤەبەریا چاندنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، سالا ٢٠١٤، پێزانینێن نە بەلاڤکری.وەکی تقدیرات بو سالا ٢٠١٣.

٩. عەبدوللاغفور، جوگرافیای کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی چوارەم، ٢٠٠٥، ص٣٥٠.

# جۆرێن گیانەوەران ل پارێزگەها دهۆکێ

**بەرهەڤکرن: سلێمان تەمەر**

ل سەرانسەری جیهانێ و ژ چەرخێن کەڤنڤە بایەخدانەك ب ئاژەلی دهێتەدان، ژبەر مفا وەرگرتنا مرۆڤی ژ ئاژەلی، ب تایبەت ئەو ئاژەلێن بەرهەمدار چ بۆ بکارئینانا وان وەك خوارن و قویتێ رۆژانە ژ گۆشت و شیر و هێك....هتد یان بکارئینانا پیست و هریا وان بۆ دروستکرنا جل و بەرگ و پیداویستێن رۆژانە یان بکارهینانا وان بۆ ڤەگوهاستنا مرۆڤ و کەل و پەلا یان بۆ نێچیر و کەیف و خۆشی و جوانیێ یان بۆ بەریکانێن وەرزشی و بازرگانی و کارێن ڤەکولینێن زانستی، هەروەسا ژ بەر کو سامانێ ئاژەلی دهێتە هژمارتن ئێك ژ ستوینێن سەرەکی ژ بۆ پاراستنا ژێرخانا ئابووریا هەر مللەتەکی و وەك یا دیارە کو وەلاتێ عیراقێ ب گشتی و هەرێما کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی دهێتە هژمارتن ب باشترین جهـ بۆ بخودانکرن و گەشە پێدانا سامانێ ئاژەلی و ب تایبەت پەز و بزن و گارەش ژ بەر هەبوونا ئاڤ و هەوا و ئاخەکا باش کو ب کێر دهێن ببیتە باشترین چەروان بۆ گیانەوەران، ئەڤە د زڤریتە ڤە بۆ هەبوونا ب دەهان دەشت و دۆل و نهال و چیایێن پری گژوگیایێن مفادار و ب کێر هندێ بهێن هەر چوار دەمێن سالێ بێنە خوارن ژ ئالیێ گیانەوەران ڤە و چ پارچە یان بەرمایك ژ ڤان گژو گیان ب هەروەیی نەچیت مینا پیش و پەلەخ و چولی و بەڕوی و مازی و لاڤلاڤك و هەلز و کێرات.....هتد.

ل دووڤ شێوازێ بخودانکرنێ گیانەوەر دهێتە دابەشکرن بۆ:

١- گیانەوەرێن کەهی(الحیوانات المستائنسة) Domestic Animal، وەك (پەز و بزن و چێل..... هتد).

٢- گیانەوەرێن کویڤی(الحیوانات البریة) (Wild Anima) وەك (پلنگ و هورچ و حەفتیار.... هتد).

٣- گیانەوەرێن بەرەلا و بەردای و بێ خودان وەك (سەو و پشیك).

٤- گیانەوەرێن باغچێن گیانەوەرا (گیانەوەرێن ئێخسیر).

ل دووڤ شێوازێ شاهینشاهیا گیانەوەرا:

**هەمی جۆرێن گیانەوەرا ل سەرتاسەری جیهانێ دهێنە دابەش کرن بۆ سەر (٢) دو شاهینشاهیا،**

## ١) گیانەوەرێن بربرەدار (الحیوانات الفقاریة):

Vertebrates (animals with abackbone)

ئەو گیانەوەرن كو ئەندامی دەماری یێ ناوەندی (الجهاز العصبي المركزي) یێ هەی كو گەلەك یێ پێشكەفتی یە و بریتی یە ژ دەماغ و دەمارا پشتێ (الحبل الشوكي) كو دپاراستینە ب هەستیكێن سەری و بربڕا پشتی.

ئەڤ شاهینشاهییە دهێتە دابەش كرن بۆ (٥) كۆمێن گیانەوەرا:

١- گیانەوەرێن شیردەر Mammals
٢- گیانەوەرێن خشۆك Reptiles
٣- گیانەوەرێن ئاڤی(ماسی) Fish
٤- گیانەوەرێن هشكئاڤی Amphibians
٥- بالندە Birds

## ٢) گیانەوەرێن بێ بربرە (الحیوانات اللافقاریّة):

Invertebrates (animals without a backbone)

ئەو گیانەوەرن ئەوێن بربڕا پشتێ نەبی و ل سەرتاسەری جیهانێ پتری ملیونەكا گیانەوەرانە د بەلاڤن ل ناڤ هەوای و سەر ئاخێ و بن ئاخێ و سەر ئاڤێ و ل بن ئاڤێ و د زكێ دەریایا دا.

## هندەك ناڤ و كریار و ئامرازێن ل دەمێ سەرەدەریێ د گەل گیانەوەرێن كەهی دا دكەی ل دەڤەرا بەهدینان دهێتە بكار ئینان:

**ڤڤان:**

ئەو كەسە یێ رۆژانە ل گەل تەرش و كەوالی دەردكەڤیت و ل چۆلی سەخبێریێ ژێ دكەت و دچەرینیت و ئێڤاریا د زڤرینیتە ڤە بۆ خودانی.

**كۆپال:**

دهێتە دورستكرن ژ داری و باشترین كۆپال ژ دارێ كنێری یە و ئەو دارە یێ سەرێ وی چەماندی و دبێژنێ كەڤا گۆپالی كو ب گەرمكرنێ د چەمینن و زۆربەی جارا دهێتە بكارئینان بۆ گرتنا تەرش و كەوالی ژ پێیی یان ژ ستوی هەروەسا وەراندنا بەلگێن دارا بۆ بەر گیانەوەران دیسان هاژوتنا گیانەوەرا و خو ل سەر گرتن.

**كەپەنە:**

ژ هوریێ دهێتە دورستكرن و ل رۆژێن سەرمایا دژوار و بەفر و باران شڤانێن تەرش و كەوالی دكەنە بەرخۆ و دهێتە زانین كو گەلەك یێ گەرمە و بەفر و باران تێ ناچن.

**مەنجلۆك:**

ئەو ئامانە یێ بێری شیرێ تەرش و كەوالی دوشیتێ و شیری پێ ڤەدگوهێزن و ماستی تێدا د مەهینن.

**پارزین:**

ئەو دهێتە دورستكرن ژ موویێ بزنا و ب شێوەیێ سێگۆشەیە و دو لەپكێن درێژ پێڤەنە و بێری ل پشتا خۆ و سەر هەردو ملێن خو د شدینن بۆ ڤەگوهاستنا كەل و پەلا و ب تایبەت شیری و ئاڤێ ل دەمێ بێرێ.

**بەرێ بێرێ:**

بەرەكە دهێتە دەستنیشانكرن و شڤان ل سەر دروینیتە خوارێ و سەرێ تەرش و كەوالی ل هەردو رەخا ب هەردو دەستا دگریت داكو بێری ب دۆشن.

**قەید (مەربەد):**

ئەو پارچا بەنكییە یا هەر دو سەرێن وی كون وەك بازنێ و دهێتە بكارئینان بۆ قەیدكرنا دەوارا داكو دوور نەكەڤن و ل دۆرماندوری خۆ بچەرن.

**بازبەند:**

ئەو پارچا بەنكی یە یا هەر دو سەرێن وی كون وەك بازنێ بۆ هشیاركرنا شڤانێ تەرشی ل دەمێ ب شەڤێ دخەو د چیت دهێتە بكارئینان و سەرەكێ بەندكی ب دەستی نێری یەكی ڤە گرێ ددەت و سەرێ دی ب دەستی خۆ ڤە و هەر دەمێ نێری ژ جهـ لڤی شڤان ژێ هشیار د بیت.

**جەلەب:**

ئەڤ پەیڤە دهێتە ب كارهینان بۆ وان كەرێن تەرشی (پەز) ل دەمێ هاتن و چوون و ڤەگوهاستنێ ژ جهەكی بۆ جهەكی و ب تایبەت ل دەمێ چوونا زۆزانان.



جەلەبەكێ پەزی رسەر و چەراندنا وی ل كۆز و پاوانا

**زۆزان:**

ئەو جهن یێن ل سەرێ چیایێن بلند و ل وەرزێ هاڤینێ پری گژ و گیا و شینكاتی و كانییێن ئاڤێن تەزی نە و دەمێ چەروان ل كۆز و پاوانا ل گوندا نەمینیت خودانكەرێن تەرش و كەوالی تەرشێ خۆ دبەنە ڤان زۆزانا بۆ چەراندنێ د بەن و ل پاییزێن درەنگ د زڤرنەڤە.

**كۆز و پاوان :**

ئەو جهە یێ ڤەدەر ژ گوند و جهێن ئاكنجی بوونێ و پرە ژ دار و بار و گژ و گیایێن سرۆشتی و ژ ئالیێ خەلكێ گوندی دهێتە بكارهینان بۆ چەراندنا تەرش و كەوالێ خۆ.

**داس:**

ئامیرەكە ژ مەترەكێ كێمترە و دەڤ زراڤ و تەنك و خوشە بۆ برینێ و سەرێ وێ یێ چەمیایە بۆ ژ ناڤدا و دهێتە بكارئینان بۆ برینا چولی بۆ تەرش و كەوالی.

**چولی:**

ئەو بەلگ و شاكێن دارێن مازی و بەڕوی نە كو دهێتە ب كارئینان وەك خوارن بۆ تەرش و كەوالی.

**چولی برین:**

كریارا برینا چولی یە كو خودانكەرێن تەرش و كەوالی بۆ تەرشێ خو ل سەرێ هاڤینێ دەست ب برینێ دكەن و دبهێن چولی دورست كەن و ل وەرزێ زڤستانێ دەما بەفر و باران د هێن و تەرش و كەوال نەشێن بچیتە چەرێ چولی ددەنێ.

**دیها چولی:**

دەمێ چولی برین ب داوی دهێن ب كریارا نهیشتنا وێ رادبن، وەكی تەخێن بەلگا ل سەر ئێك بلند دكەن و دهێتە پێشكەشكرن بۆ تەرش و كەوالی ل رۆژێن زڤستانێن دژوار وەك خوارن.

**داردوینك:**

دارەكێ دو چەقلە نێزیك میترە و نیڤا یە و ل دەمێ زڤستانا دهێتە چكلاندن و تەخە تەخە چولی دكەنە د ناڤ دا كو تەرش و كەوال بشێن بخۆن.

**ریسی:**

ئەو بالولكا مەزن یا گیایێ هشكە كو دهێتە چێكرن ل بهارا دەمێ گژ و گیا بلند و درێژ دبن و كۆم دكەن ل جهەكی كو هشك بیت و ل رۆژێن زڤستان و بەفر و باران دەنە تەرش و كەوالی.

**دیها ریسی یا:**

ئەو دیهە یا ریسێن گیای تەخ تەخ دداننە سەرێك و دنژنن دا ل زڤستانێ بێتە بکارهینان بۆ تەرش و کەوالی وەك خوارن.

**کا:**

ئەو پیش و پەلەخ و قەسەلە ئەوا دهێتە لێکدان و کۆمکرن و خرڤەکرن ل ناڤ زەڤیێن گەنم و جەها پشتی دهێتە دورین و ئەڤ قەسەلە دهێتە هویرهویر کرن چ ب جەنجەرا باراپتر ل بەرێ و چ ب ماکینەیا ل نها باراپتر و دهێتە بکارئینان وەك خوارن ل گەل جەهی بۆ گیانەوەرا.

**کادین:**

ئەو جهە یان ژوورە یا کا تێدا دهێتە کۆمکرن و هەلگرتن و پاراستن ژ بەفر و بارانێ و ل رۆژێن زڤستانێن بەفر و باران د کەنە بەر گیانەوەرا ل گەل جەهی یان گەنمی.

**گۆڤ:**

ئەڤ ئاڤاهی یان نهانی یە کو پێکهاتی یە ژ دیوار و بانی کو ئاژەل تێدا دهێتە ڤەحەواندن و پاراستن ژ سەرما و گەرم و بەفر و باران و درندا و دزیکەر و تەقیانێ ل دەمێ داکرنی یان ڤەحەواندنێ و گۆڤ یا تایبەتە بۆ ڤەحەواندنا تەرش و کەوالی و چێل و گۆلا.

**ئاخویر:**

ئەڤ ئاڤاهی یان نهانییە کو پێکهاتی یە ژ دیوار و بانی کو ئاژەل تێدا دهێتە ڤەحەواندن و پاراستن ژ سەرما و گەرم و بەفر و باران و درندا و دزیکەر و تەقیانێ ل دەمێ داکرنی یان ڤەحەواندنێ و ئاخویر یا تایبەتە بۆ ڤەحەواندنا دەواران مینا (هەسپ وهێستر و ماهین و بارگیر و کەر و ماکەر).

**کۆتان:**

ل بەر دەرێ هەر گۆڤەکێ کۆتانەك ب دار و ترکا و هندەك جاران ب سیمەی و تێلێ دهێتە دورستکرن وەك بەربیاڤ بۆ تەرش و کەوالی و دانا خوارن و بێهن ڤەدانا وان.

**خویێ دان:**

کریارەکە خودانکەرێن تەرش و کەوالی ل زۆربەی وەرزێن سالێ ئەنجام ددەن و بریتی یە ژ رەشاندن و بەلاڤەکرنا خوێ ل سەر کەڤران و بەران ژ بۆ خوارن و ئالیستنا وان ژ ئالیێ تەرش و کەوالی ڤە.

## ناڤ و نەقل ناڤێن کوردی ل دەڤەرا بەهدینان بۆ پەز و بزنا:

**پەز:**

١- **میها سەر رەش:** میهـ یا سەر رەشە تاکو ستوی و د بیت یا ب شاخ بیت یان بێ شاخ.

٢- **میها رسەر:** میهـ یا سەر سپی یە و پنێین رەش ل سەر و چاڤ و گوهایە و دبیت یا ب شاخ بیت یان بێ شاخ.

٣- **میها قەمەر:** هەمی میهـ یا سپی یە و پنێن گەور(قەهوایی) ل سەر هەمی لەشی هەنە.

٤- **میها بەل:** ئەو میهە یا دو گوهێن بەل و رەپ و راست و درێژ هەین (گوهـ نە چەمیای نە).

٥- **میها کەر:** ئەو میهە یا گوهێن وێ زۆر دبچویك یان بتنی کرکروشکێ گوهی هەی (بێ گوهـ).

٦- **میها کەلە بەش:** ئەو میهە یا ب شاخ و ناڤ چاڤسپی.

٧- **میها کەویسار:** ئەو میهە یا سەرێ وێ هەمی سپی و نوقوچ نوقچ تاکو ستوی.

٨- **میها قەمەر:** ئەو میهە یا سەر و لەش(هەمی میهـ) یا رەشە.

**بزن:**

**بزنا چال:** ئەو بزنە یا سەر و چاڤ و گوهـ هەمی سپی و پنی پنیێن رەش ل سەر.

**بزنا همبز یا سۆر:**

**بزنا قلۆز:** ئەو بزنە یا جۆتەکێ شاخێن راست و درێژ و قیچ هەین.

**بزنا قلیچ:** ئەو بزنە یا شاخەکێ وێ راست و درێژ و قیچ و یێ دووێ یێ خوار و چەمیای.

**بزنا کۆچا سۆر:** ئەو بزنە یا بێ شاخ و رەنگێ وێ هەمی یێ سورە.

**بزنا کۆچا سپی:** ئەو بزنە یا بێ شاخ و رەنگێ وێ هەمی یێ سپی یە.

**بزنا کۆچا شین:** ئەو بزنە یا بێ شاخ و رەنگێ وێ هەمی یێ شینە.

**بزنا شەماما سپی:** ئەو بزنە یا سەر و لەش هەمی سپی و ستوکر و بەر چاڤ د گەورن (تەحینی) نە.

**بزنا شەماما رەش:** ئەو بزنە یا سەرو لەش هەمی رەش و ستوکر و بەر چاڤ د گەورن (تەحینی) نە.

**بزنا ب گولیك:** ئەو بزنە یا دو گولیك ب بنحەفکا وێ ڤە (گەردەنا وێ ڤە).

**بزنا ب کەمەر:** ئەو بزنە یا هەمی لەشێ وێ رەش و کەمەرەك سپی سەر پشتی یان ل دۆر دزڤریت.

**بزنا پۆش:** ئەو بزنە یا گوهـ رەش و پنیێن سپی ل گوهێن وێ.

**بزنا کڕ:** ئەو بزنە یا گوهێن وێ کەلەك بچویك( بێ گوهـ).

**بزنا بەل:** ئەو بزنە یا گوهێن وێ بەل و رەپ و نە چەمیای.

## ناڤێن پەزی (کەوال) ل دووڤ ژیێ وان:

**بەرخێ نێر:** ژیێ وی ژ ئێك رۆژ تاکو (٦) مەهە.

**کاڤر:** ژیێ وی ژ (٦) مەها تاکو ئێك سال.

**شەك:** ژیێ وی ژ ئێك سال تاکو دو سال.

**هۆگج:** ژیێ وی ژ دو سال تاکو سێ سال.

**قەرت:** ژیێ وی سێ سالە.

**بەران:** ژیێ وی ژ سێ سالا ویڤە.

**بەرخا مێ:** ژیێ وی ژ ئێك رۆژ تاکو (٦) مەهە.

**کاڤرا مێ:** ژیێ وی ژ (٦) مەهە تاکو ئێك سال.

**بەلندیر:** ژیێ وی ژ ئێك سال تاکو دو سال.

**بەلندیرا زایی:** ژیێ وی ژ دو سال تاکو سێ سال

**میهـ:** ژیێ وی ژ سێ سالا ویڤە یە.

## ناڤێن بزنێ (رەشۆکی) ل دووڤ ژیێ وان:

**کارێ نێر:** ژیێ وی ژ ئێك رۆژ تاکو (٦) مەهە.

**گیسکێ نێر:** ژیێ وی ژ (٦) مەها تاکو ئێك سال.

**سەپص (سەپێ):** ژیێ وی ژ ئێك سال تاکو دو سال.

**نێرێ:** ژیێ وی ژ دو سال تاکو سێ سال.

**کارا مێ:** ژیێ وی ژ ئێك رۆژ تاکو (٦) مەهە.

**گیسکا مێ :** ژیێ وی ژ (٦) مەها تاکو ئێك سال.

**تشتیر:** ژیێ وی ژ ئێك سال تاکو دو سال نە زایە.

**تشتیر زای:** ژیێ وی ژ ئێك سال تاکو دو سال، زاییە.

**بزن:** ژیێ وی ژ دو سال تاکو سێ سال.

## ناڤێ گارەشی ل دووڤ ژیێ وان:

**گۆلکێ نێر:** ژیێ وی ژ ئێك رۆژ تاکو سالەکێ یە.

**جوانە گا:** ژیێ وی ژ ئێك سال تا دو سالە.

**گا:** ژیێ وی ژ سێ سالا ویڤە یە.

**گۆلکا مێ:** ژیێ وێ ژ ئێك رۆژ تاکو سالەکێ یە.

**مێ گوان:** ژیێ وێ ژ ئێك سال تا دو سالە.

**چێل:** ژیێ وێ ژ سێ سالا ویڤە یە.

## ناڤێن سەی ل دووڤ ژیێ وان:

**کویچك(نێر و مێ):** ژیێ وان ژ ئێك رۆژ تاکو سالەکێ یە.

**سە (نێر):** ژیێ وی ژ سالەکێ و ێڤەیە.

**دێل (مێ):** ژیێ وێ ژ سالەکێ و ێڤەیە.

**ناڤێن دەوارا ل دووڤ ژیێ وان:**

**جوانی هەسپی (نێر)**، ژیێ وی ژ ئێك رۆژ تاكو ئێك سالە.

**جەحشێ هەسپ (نێر)**، ژیێ وی دو سال تاكو سێ سالە.

**هەسپ**، ژیێ وی ژ سێ سال و وێڤە یە.

**جوانیا ماهینێ (مێ)**، ژیێ وێ ژ ئێك رۆژ تاكو ئێك سالە.

**جەحشێ ماهینێ(مێ)**، ژیێ وێ دو سال تاكو سێ سالە.

**ماهین**، ژیێ وێ ژ سێ سال و وێڤە یە.

## ١- گیانەوەرێن کەهی (الحیوانات المستأنسة Domestic Animal)

### ١. پەز (کەوال- میه و بەران):

پەز گیانەوەرەکێ بربڕەدارێ شیردەرە دهێتە بخودانکرن ب شێوەیێ کەر(جەلەب) و رەواجەکا باش ژ ئالیێ مرۆڤی ڤە ل سەر بخودانکرنا پەزی هەیە ژ بەر (هوری و گۆشت و شیر)ێ وی هەروەسا کێمتر ژ هەمی گیانەوەرێن بخودانکرنێ ل مال پێدڤی ب چاڤدانێ هەیە (خوارن و ڤەخوارن) ئانکو ب پیش و پەلەخ و کا و ئاڤەکا کێم د شێن بژیت و ژ وان گیانەوەرانە ئەوێن ب ساناهی د شێن خوارنی بخۆن ژ سەر ئەردی ئانکو وەکی بزنێ نینە بشێن ب کەلۆژیت و بزدینیت و لەڤا لێبدەت، دهێتە زانین کو دو جۆرێن پەزی ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ دشێن بژین و بەربەلاڤن:.

#### ١. پەزی عواسی (العواسی Awassi):

٥٥-٦٠٪ێ ژ پەزێ عیراقی ئەڤ جۆرەیە کو تایبەتە ب دەڤەرێن باشوور و ناڤەراستا عیراقێ ڤە و کەلەخێ میهێ(مێ) نیزیك(٥٠-٦٠) کگم ن و بەلندیرا ئێك سالی یێ بچویکە و (٣٧-٤٨) کگم ن و بەران (٦٠-٨٠) کگم و زۆربەی سالێ دو جارا دزێن، هەمی خوارن و پیش و پەلەخێ دخۆت، ئانکو یێ ب ساناهی یە بۆ خودانکرنێ.

رەنگێ هوری و موویێ وی یێ سپی یە و درێژە و نیزیك (٢) کگم سالانە ژێ د هێن و سەر و لاقێن پیا و دەستا زۆربەی جارا سپی یان گەورن، هەروەسا زۆربەی میها بێ شاخن و کتەکا کێم نەبیت ب شاخن و زۆربەی بەران ب شاخن و شاخێن وان گروڤر و مەزن.

سالانە نیزیك (١٠٠-١٢٠) لیترێن شیری ژ هەر میهەکێ د ئێن.

#### ٢. پەزێ کوردی (الکرادی Karadi):

ژ بنیات دا ب دەڤەرێن کوردی ڤە گرێدایە، ب تایبەت ل پارێزگەهێن دهۆك و هەولێر و سلێمانیێ و کەرکووك و زۆربەی ناوچێن کوردی ل ئیران و ترکیا و رێژەیا ٢٠٪ێ ژ هەژمارا پەزێ عیراقێ پێك دهینیت و د هێنەنیاسین ب ناسنامەیا مللەتێ کورد ب تایبەت ل بازارێن کرین و فرۆتنا ئاژەلی ل سەرانسەری جیهانێ ب تایبەت بازارێن تورك و یۆنان و ئیران و سعودیە و سۆریا و گەلەکێن دی، هەروەسا ل دووڤ پێزانینێن مە ئەوروپیا مفایەکێ زۆر ژ پەز و بزنا کوردی دیتیە، بخودان دکەن و گۆشتێ پەز و بزن و کار و بەرخێن کوردی ب گرانترین گۆشت و بەرهەم دهێتەفرۆتنێ و خودان کەلەخەکێ مەزن و هوریەکا بۆش و گۆشت و شیرەکێ گەلەك لەورا ئەڤرۆکە ئەڤ جۆرێ ئاژەلی یێ بەرەڤ کێمبوون و نەمانێ ڤە دچیت، ب تایبەت پشتی چەندین کارەسات و نەخۆشی و دەربەدەری ب سەرێ مللەتی کورد هاتین ژلایەکی ڤە و ژ لایەکێ دیڤە چوونا خەلکی بەرەڤ ئەوروپا و دەرڤە و بەرەڤ باژێران و خۆ ل فەرمانگەهێن میری دامەزراندن و خۆشبوونا ژیارا خەلکی ئەڤرۆکە بووینە ئەگەر دەست ژ خودانکرنا ئاژەلی بەردەن ژ لایەکیڤە و ژ لایەکێ دیڤە ئەڤ جۆرێ پەزی پێدڤی ب پیش و پەلەخ و کۆز و پاوانێن پاقژ و بژین هەیە وەك زۆزانان.

رەنگێ هوریێ یێ سپی و درێژ و پرە و نیزیك (٣)

کگم سالانە ژێ دهێن ب تنێ ل سەر و مل ئەگەر هەبیت یێ رەشە یان سوریێ تارییە .

نێر و مێ (میهـ و بەران) د بێ شاخن، سەر و گوە زۆر د مەزنن و دفن یا خوار و چەمیایە، دەست و پێ د کورتن و کەلەخ گەلەکێ مەزنە و دوینگ ژێ گەلەکێ مەزن و بەرفرەهە و کێشا بەرانا (٨٠-١٠٠) کگم و یا میها (٦٠-٧٠) کگم نە و سالانە ( ٩٠-١٣٠) کگم شیری بەرهەم د هینن.

## دو جۆرێن پەزێ کوردی هەنە:

### أ- پەزێ کۆچەرا وەك پەزێ هەرکی یا و پەزێ جافا:

ئەڤ جۆرێ پەزا دبنیاتدا ل توخیبین پارێزگەها هەڤلێرێ و سلیمانیێ هەیە و نوکە ل گەلەك جهێن پارێزگەها دهۆکێ مینا ناڤکورێ دهێنە بخودان کرن و ل دەمی نەمانا چەروانی وەك کۆچەرات بەرەڤ توخیبین ئیرانێ ڤە ل زۆزانێن سەرێ چیا دچن.

### ب- پەزێ نە کۆچەری وەك پەزێ حەمدانی:

ئەڤە ب باشترین جۆرێ پەزی ل عیراقێ دهێتە هژمارتن ژ بەر مەزنییا کەلەخێ وان و دانا شیرەکێ باش و ل زۆر جهێن دهۆك و هەولێر و کەرکووکێ و مووسل دژیت و ل دەمێ کۆز و پاوان و چەروان هەبن ل سەر دژین و هەر دەمێ نەمینن خوارنا وان د بیتە ( کا و جەهـ و ئونجە).



**پەزێ حەمدانی بەرنیاسە ب مەزنییا کەلەخ و سەر و گوها**

**جۆتبوون و زاوزێ:**

باشترین دەمێن سالێ بۆ جۆتبوون و زاوزێ یا پەزی ل پارێزگەها دهۆکێ ل هەیڤێن چریا ئێکێ و دووێ یە و زان ل هەیڤێن ئادار و نیسانێ دەست پێدکەت و دەمێ ئاڤسبوونێ نێزیکی (٥) هەیڤانە، ئانکو ژ (١٤٥- ١٥٥) رۆژانە و د شیاندا هەیە هندەك جارا جێمکەکێ بەرخا بینیت.

## ٢. بزن و نێری (تەرش- رەشۆك):

گیانەوەرەکێ برپرەدارێ شیردەرە باهرا پتر ل جهێن چیایی و کەڤرین و تێر دار و بار دژیت، هەرچەندە ل دەشتێ ژی دشێت بژیت لێ ژ وی جۆرێ گیانەوەرانە کو حەزا لەقدان و کەلۆتن و جوینا دار و بار و تراشانە ئانکو زۆر حەز ژ خوارنا بلند ب داراڤە وەك چولی و بەروی و بەلگێن دارا وەك مێو و سێڤ و هورمیك..... هتد هەیە. واتە ئەگەر پیش و پەلەخ و گیا هەبیت یان نەبیت نابیتە ئاستەنگ د رێکا ژیانا وێ دا ژبەر هندێ د راستا بزنێ دا دهێتەگۆتن کو تێکدەرا ژینگەهێ یە ژ بەر خوارن و تیڤلکرنا داروبارا لێ ژ بیر نەکەین هەر دەما جهـ و خوارن و بخودانکرنا بزنێ یا باش بیت برەکا باش ژ شیری و گۆشتی ددەت و بۆ دەمەکێ درێژێ سالێ نە وەك پەزی ب تنێ بهارێ.

بۆ دەستڤەهینانا چولی و شینکاتی رەشۆکە دشێن نێزیکی ١,٥ مترا خۆ بلندکەتە تراش و دار و باری و زۆربەی نێریی و باراپتر بزنا د شاخدارن.

باشترە دەمێ بزن دهێتە خودانکرن تنێ (٣-١٠) بزن بن نەك زێدەتر وەك پەزی ب جەلەبی چونکی زۆر زەرەرێ ل ژینگەها دەوروبەرێن خۆ دکەت.

**جۆتبوون و زاوزێ:**

د کوردەواریێ دا بارا پتر نێری ل داوییا بهارێ تاکو سەرێ پاییزێ ژ ناڤ بزنی دگرن و ل مال بخودان دکەن داکو جۆتبوون نە هێتە ئەنجام دان و بزن ژێ ئاڤس نەبیت لەورا باشترین دەم بۆ جۆتبوون و زاوزێ ل هەیڤێن چریا ئێکی و دووێ یە و زان ل هەیڤێن ئادار و نیسانێ دەست پێدکەت و دەمێ ئاڤسبوونێ نێزیکی (٥) هەیڤانە، ئانکو ژ (١٣٥-١٦٠) رۆژانە و د شیاندا هەیە زۆر جارا جێمکەکێ کارا بینیت.

## سێ جۆرێن بزنا ل پارێزگەها دهۆكێ دشێن بژین:

### بزنا كوردی یا خۆمالی:

ئەڤ جۆرێ بزنی ل سەرتاسەری پارێزگەهێن هەرێما كوردستانێ و هندەك پارێزگەهێن عیراقێ دژین، ب تایبەت دەڤەرێن چیایی و پری چولی و گژوگیایێ شین و بۆ بخودانكرنێ یێ ب ساناهییە و شیرەكێ زۆر یێ هەی، تایبەت ل پاییزا مفا ژێ دهێتە وەرگرتن پشتی شیرێ پەزی كێم دبیت.





بزنا كوردی یا خۆمالی یا بەرنیاس ب كەلەخ و شاخ و گوهێن مەزن

### بزنا شامی:

ئەڤ جۆرێ بزنێ ب ناڤێ شامی دهێتە نیاسین ژ بزنێ هاوردەكری یە و یێ جیاوازە ژ بزنێن كوردی ب نیشانەكا بەر چاڤ كو هەر كەسەك دشێت ب ساناهی بنیاسیت، ئەو ژی شێوازێ دفنا وێ گەلەك یێ خوار و چەمیایە و دهێتە نیاسین ب كەلەخ و گوهانێن مەزن و پێش چاڤ.



بزنا شامی یا بەرنیاس ب زراڤیا لەشی و دفنا خوار و ستوكر درێژ

### بزنا مەرەزی (چویر):

ئێكەمین جۆرێ گیانەوەرێ خودانكەرە ل وەلاتێ عیراقێ كو ئەڤرۆكە مەترسییەكا مەزن یا ل سەر هەیی و پتر ژ پەز و بزن و گارەشی كو ژ ناڤ بچت و ئەڤرۆكە ئەم د شێن ل پاژێرەكێ وەكی دهۆكێ ب هژمارا تبلان خودانكەرێن وان بهژمێرین، ئەڤە ژ بلی كو سامانەكێ سرۆشتی یە و مفا ژ گۆشت و شیر و موویێ وێ دهێتە دیتن، لێ ئەڤ جۆرێ بزنێ یێ گرێدایە ب رەوشت و تیتالێن كوردەواری ڤە چونكی موویێ وێ دهێتە بكارهینان بۆ دروستكرن و چێكرنا جل و بەرگێن زەلاما (بەرگیز- شەل و شەپك) ل سەرانسەری كوردستانێ ئانكو ب نەمانا بزنا چویر كەلتورێ جل و بەرگێن كوردی ژی دێ كەڤیتە د مەترسێ دا.

ئامارا بزنی مەرەزی (چویر) ب نیزیكی ڤە ل پارێزگەها دهۆكێ وەك نموونە ل سەر نەمانا وێ بۆ سالا (٢٠١١)ێ كو ژ ئالیێ رێكخراوا كوردستان بۆ پاراستنا مافێ ئاژەلی ڤە هاتبوو ئەنجامدان. دیارە

ل سەرتاسەری پارێزگەها دهۆکێ نیزیکی ( ٤١٧٥) سەرێن بزنی هەنە و ئەڤە رێژەیەکا زۆر کێمە هەمبەر کڕین و فرۆتن و ب کارهینانا جل و بەرگێن زەلاما (شەل و شەپك) و ئەڤە رێکێ ددەتە هندی بازرگانییا ژ دەرڤە بێتە کرن و مەرەزی نە خورستی و رەسەن بێتە د ناڤ کەلتۆرێ کوردەواری دا.

ئامارا بزنا چویر ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١١)ێ

| ژ | ناڤێ دەڤەرێ | سالا ٢٠١١ |
|---|---|---|
| ١ | مانگێش | ٠ |
| ٢ | زاویتە | ٠ |
| ٣ | قەسرۆك | ١٢٠٠ |
| ٤ | باعەدرێ | ٠ |
| ٥ | باتێل | ٧٠٠ |
| ٦ | سێمێل | ٨١٥ |
| ٧ | بامەرنێ | ٠ |
| ٨ | سەرسنك | ٠ |
| ٩ | قدش | ٠ |
| ١٠ | ئامێدیێ | ٠ |
| ١١ | دێرالۆك | ٠ |
| ١٢ | شێلادزێ | ٠ |
| ١٣ | کانی ماسێ | ٠ |
| ١٤ | دێرەبوون | ٠ |
| ١٥ | زاخۆ | ٤٠٠ |
| ١٦ | هیزاوا | ٠ |
| ١٧ | باتیفا | ١٠٠٠ |
| ١٨ | بەردەرەش | ٠ |
| ١٩ | گردەسین | ٦٠ |
| ٢٠ | ئاکرێ | ٠ |
| ٢١ | بجیل | ٠ |
| ٢٢ | دینارتە | ٠ |
| سەرجەمێ گشتی | | ٤١٧٥ |


بزنا چویر (بزنا مەرەزی) یا سۆر




بزنا چویر (بزنا مەرەزی) یا سپی

## ٣. گارەش (چێل و گول):

گارەش گیانەوەرەکێ برپڕەدارێ شیردەرە، دهێتە هژمارتن ژ گیانەوەرێن سەیر ژ بەر هەبوونا ئامرازێ هەرسکرنا وی ب زەحمەت و گرتی و کارەکێ مەزن ل

سەرە ژ بەر چ خوارنەکا هشك و رەق و ب زەحمەت بۆ هێرانێ گارەش دشێن بخۆت و هەرس بکەت و هەمی بێ بکەتە بەرهەم (گۆشت و شیر) لەورا ئەڤرۆکە ل سەرانسەری جیهانی گارەش ب تایبەت (چێل) هاتییە ڤاڤارتن و دەستنیشانکرن و زانین چ خودانکرنا وێ بۆ شیری بیت وەك جۆرێن فریزیان و هولشتاین و شانیل یان بۆ گۆشتی وەك هیرفورد و ئبیردین انجوس یان بۆ کاری دەرامەتی (جۆتی) و کێشانا عەرەبانا و گێرەکرنی بیت .

زۆربەی وەلاتێن جیهانی کار کرییە کو بشێن گارەشێ خۆ یێ ناڤخۆیی فێری ڤێ چەندێ بکەت، ژ وان وەلاتا کورد ژی شیاینە گارەشێ خۆ فێرکەتە هندێ کۆ بۆ شیری بیت یان بۆ گۆشتی بیت یان بۆ جۆتی و گێرەکرنێ بیت.

**جۆتبوون و زاوزێ:**

د کوردەواریێ دا هەمی وەرزێن سالێ د گونجاینە بو جۆتبوون و ئاڤسبوون و تێژك کرنێ، لێ پتر ئەو دەم دهێتە دەستنیشانکرن ل پارێزگەها دهۆکێ کو شیرێ پەز و بزنا نامینیت، وەکی داویا پاییزێ و سەرێ زڤستانێ کو یێ پەز و بزنا دەردکەڤیت، لەورا باشترین دەمێ جۆتبوون و زاوزێ هەیڤێن بهار و نیسانێ یە، و ل هەیڤێن چریا دووێ و کانوونا ئێکێ زان دەسپێدکەت و دەمێ ئاڤسبوونێ نێزیکی (٩) هەیڤانە.

چەندین جۆرێن گارەشی نها ل کوردستانێ تایبەت پارێزگەها دهۆکێ دژین، مینا (خابویری و فریزیان و هولشتاین....هتد) لێ یا گرنگ ئەوە کو تایبەتمەندییا هەی چێلێن خابویری نە (خۆمالی) کو ب رێژەیەکا باش و بەرچاڤ ل دەڤەرێن جودا جوداێن پارێزگەهێ وەك دەوروبەرێن زاخۆ، دەشتا سلێڤانەیا، قەسرۆك، ئاکرێ، بەردەرەش، دێرالۆك و شێلادزێ دژین، دووڤ پیزانینێن لایەنێن پەیوەندیدار نها نیزیکی (٤٥) هزار چێل و گۆل ل سەرانسەری پارێزگەهێ هەنە.

## ٤. گامێش:

ل سالێن چلا و تاکو دوماهیکا سالێن شێستان ناڤ سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ تایبەت تاخێن شێلێ و کۆچەرا و شندۆخا و گەڤەرکێ و رووبارێ هشکەروی و کانی خشمانا گامێش د هاتنە بخودانکرن ژ ئالیێ عەرەبێن مووسلی ڤە و کێم کەسەکا ژ خەلکێ دهۆکێ ژی هندەك گامێش هەبوون لێ ل دەسپێکا سالێن حەفتیان، پشتی رۆژ بۆ رۆژێ باژێر مەزن بووی ئەڤە نەمان، هەروەسا دهێتە زانین کو ل زاخۆ و ب درێژاهیا خابووری هەمان مرۆڤان گامێش بخودانکرن و دۆرماندوری زێی ل ئاکرێ و بەردەرەش ژی دهاتنە بخودانکرن و مفایەکێ باش ژ شیر و قەیماغ و گۆشتێ وان دهاتە وەرگرتن. مخابن ئەڤرۆکە خودانکرنا گامێشی ل سەرانسەری باژێرێ دهۆکێ نە مایە و کەس ب خودان ناکەن.

## ٥. دەوار

(هەسپ وهێستر و ماهین و بارگیر و کەر و ماکەر):

گیانەوەرێن برپرەدارێن شیردەرن ل سەرتاسەری کوردستانێ و ب تایبەت ل دەڤەرێن چیایی هەر ژ کەڤندا دەوار کەتییە د خزمەتا مرۆڤی دا، وەکی کارێ رۆژانە ژ کاروان و جۆت و شڤانی و کێشانا پشتی و ئاڤ و ریسی و شخرا و لبنا.....هتد.

هەروەسا ئەم ژ بیر نەکەین کو د هەمی شورش و بزاڤێن هاتینە ئەنجامدان، دەواران مفایەکێ بەرچاڤ د ڤەگوهاستنا کەل و پەلێن شەری و خوارن و بریندار و شەهیدا دا گەهاندییە، لەورا ئەم دبینین د زۆربەی هەوێن پروپاگندەیێن هەلبژارتنا درووشمێ زۆر پارتا سەرێ هەسپی یە وەك هێمایەك بۆ رەسەنایەتی و کەڤنارەیا مللەتێ کورد وەك کەڤنارەتییا هەسپی.

### هێستر و بارگیر:

ژ بنەمالا دەوارا نە، ژ ئەنجامێ جۆتبوونا نڤشێ کەری (نیر ومێ) و هەسپی( نیر و مێ) پەیدا دبن و نەشێن زاووزێ بکەن و زۆربەی جارا ژ ئەنجامێ کەرێ

نێر ل گەل هەسپێ مێ (ماهین) پەیدا دبن كو كەلەخ مەزن و بلندن كو د بێژنێ (هێستر) یان ژی ژ كەرێ مێ (ماكەر) ل گەل هەسپێ نێر (هەسپ) پەیدادبن كو بچویكترە ژ هێسترێ و گەلەك بەربەلاڤ نینە دبێژنێ (بارگیر).

هەردو گیانەوەر زۆر ب شیانن بۆ هەلگرتنا بارێ، ل رێكێن دوور و درێژ و رۆژێن سەرما و گەرما دژوار كار دكەن، ژ بەرهندێ رۆلەكێ باش د شەرا دا بۆ ڤەگوهاستنا مرۆڤ و ڤویت و كەرەستەیێن شەرێ وەك فیشەك و كێشانا تۆپا گێرایە. هەردو زۆر زیرەك و خودان شیانن بۆ سەركەفتن و هلپاسكیبوونا چیا و رێكێن تەنگ و ب زەحمەت. زۆربەی جارا رەنگێ ڤان گیانەوەرا سۆرێ تاری یە و كێشا وان نێزیك ٣٥٠ كگم و گەلەگ د هشیارن.



هێسترا كوردی یا رەسەن

### كەر و ماكەر:

ئەڤ گیانەوەرە ژ بنەمالا دەوارا نە، ئەگەر چاڤدێریەكا باش ژ ئالیێ خوارن و ڤەخوارن و جهیڤە بۆ بێنە دابینكرن نێزیكی (٣٠-٤٠) سالا دژین، دهێنە بكارهینان بۆ ئەنجامدانا هەمی كار و كریارێن مالێ ژ ئینان و برنا بار و كێشانا ئاڤێ و گێرەكرنا دەرامەتی و جۆتكرنێ و كێشانا عەرەبانا و گەلەك كارێن دی. د ژیارا رۆژانە یا خەلكێ مە دا ل گوندا دا گەلەك بۆ هینانا دارا بۆ سۆتنێ و سواربوونێ ل گەل پەزی و كێشانا ئاڤێ و چوونا كاروانا ب كارهینایە.



كەر و ماكەر ژ هەسپی و ماهینێ بچویكترن لێ گوهێن وان ژ یێن هەسپی و ماهینێ مەزنترن و بەرنیاسە ب دەنگێ خۆ و ب رەنگێ خۆیێ گەور و خۆلیكی بەرنیاسە. سەرتاسەری جیهانێ ئەڤ گیانەوەرە یێ بەربەلاڤە و درێژیا وی ژ ٨٠ سم بۆ ١٦٠ سم و كێشا وی ژ ٨٠ كگم و پێهەلە. سالێ جارەكێ ئاڤس دبیت، دەمێ (١٢) مەها ڤەدكێشیت و زۆربەی جارا ئێك ئێكەیە و زۆر كێمە یان هەر نینە ببینی جوتكەكێ (جەحشا) هینابیت. خوارنا وان گژوگیا و پیش و پەلەخ و هەمی شینكاتی یە.

### هەسپ و ماهین:

گیانەوەرەكی زۆر هەستیارە و ب سۆزە ئەگەر خودان بشێن رازی كەت و پێدڤی ب چاڤدانەكا باش ژ ئالیێ خوارن و ڤەخوارن و جهی (ئاخویر)ڤە هەیە، هەروەسا نالكرنا هەسپ و ماهینا سالانە زۆر پێدڤییە.



ل كوردستانێ و ب تایبەت ل پارێزگەها دهۆكێ د كەڤندا هەسپ و ماهین هەبوویە و هەیە، زۆربەی ئاغا و بەگ و ماقویل و دەولەمەندا هەسپ هەبووینە و بخودانكری نە و ل سەیران و شاهی و گوڤەند و شەڤبێریا بەحسی هەسپ و ماهینێ هاتیە كرن، هەروەسا گەلەك هاتییە بكارهینان بۆ ڤەگوهاستنا بویكا. دهێتە زانین ل چەرخێن كەڤن دا بۆ ئێكەم جار هەسپێ كویڤی ل كوردستانێ هاتییە خودانكرن و كەهی كرن.

رۆژانە هەسپ و ماهین نیزیك ٨ دەم ژمێرا د نڤن، زۆربەی ڤی دەمی د نڤن و ئەو ل سەر پیا، بلندیا وان ژ (١٥٠-١٨٠سم) و كێشا وان ژ (٢٥٠-٦٠٠كگم). سالێ جارەكێ ماهین د زێن و هەر جارەكێ جوانیەكێ د هینیت و دەمێ ئاڤسبوونێ ١١ یانزە مەهن.

ئەم دشێن بێژین دو جۆرێن هەسپا ل كوردستانێ و ب تایبەت ل پارێزگەها دهۆكێ دشێن بژین، ئەو ژی هەسپێ كوردی و هەسپێ عەرەبی یە، لێ نەبوونا



چ ڤەكۆلین و دووڤچوونا ل دۆر هەسپێ كوردی ژ لایەكی ڤە و ژ لایەكێ دی ڤە نەخودانكرن و ژ دەستانا بكارهینانا وی بووینە ئەگەر پێزانینێن مە كێم ل سەر هەبن، بتنێ ئەم د شێن بێژین هەسپێ كوردی خودان كەلەخ و پێ و دەست و سینگەكێ بلند و بەرفرەهـ و مەزن و تەحەمولا كارێ زێدە و بارەكێ گرانتر ژ یێ عەرەبی یێ هەی.



هەسپ و ماهینێن كوردی یێن رەسەن

**خشتەیێ ژمارە (١)**

**ئامارا سامانێ ئاژەلی ل پارێزگەها دهۆكێ بۆ سالا (٢٠٠١)ێ ل دووڤ پێزانینێن رێڤەبەریا گشتیا چاندنێ**

| ز | ناڤێ دەڤەرێ | پەز | بزن | چێل |
|---|---|---|---|---|
| ١ | زاویتە | ٩٣٨٨ | ٨٨٣٨ | ٧٨٠ |
| ٢ | مانگێش | ١٣٥٩٣ | ١١٦٦٥ | ٢٨٧ |
| ٣ | ئامێدیێ | ٥٦٤٣ | ٩١٦٠ | ٦١٤٩ |
| ٤ | سەرسنك | ٨٦٤٣ | ١٠٩٣٧ | ١٨٤٣ |
| ٥ | باتیفا | ١٥٠٧٧ | ٢١١٤٦ | ١٠١١ |
| ٦ | زاخۆ | ٤٥٣٣٨ | ١٩٨٢١ | ٢٢٨٥ |
| ٧ | دێرەبوون | ٣٤٣٨٢ | ٤١٦٠ | ٧٨٩ |
| ٨ | باتێل | ٣١٩٥١ | ٧٧١٧ | ٤٨٦ |
| ٩ | سێمێل | ٦٥٩٤٨ | ١٧٨١٥ | ٢٩٦٧ |
| ١٠ | دهۆك | ٤٣٠٦١ | ١٣٤٥١ | ١٨٩٥ |
| ١١ | بەردەرەش | ٥٨٣٠٧ | ١٤٢١٤ | ١٤٠٤٥ |
| ١٢ | ئاكرێ | ١٦٠٥١ | ١٦٧٥٨ | ٤٩٢٨ |
| ١٣ | بجیل | ٤٥٣٣٥ | ٢٩٩٨٤ | ٦٥٠٥ |
| ١٤ | دینارتە | ٦٤٧٦ | ٢٨٤٦٠ | ٨٤٠٧ |
| ١٥ | گردەسین | ٧٥٢٣٨ | ٢٩١٠٢ | ٦١٥٢ |
| ١٦ | قەسرۆك | ٣٢٨٤٨ | ١٠٨٤٨ | ٦٥٥١ |
| سەرجەمێ گشتی | | ٥٠٧٢٧٩ | ٢٥٤٠٧٦ | ٦٥٠٨٠ |

**خشتەیێ ژمارە (٢)**

**ئامارا سامانێ ئاژەلی ل پارێزگەها دهۆكێ بۆ سالا (٢٠٠٧)ێ ل دووڤ پێزانینێن رێڤەبەریا گشتیا چاندنێ**

| ز | ناڤێ دەڤەرێ | هەژمارا گوندا | هەژمارا خێزانا | پەز | بزن | چێل | مریشك | دەوار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆك | ٩٤ | ٢٨٥٩ | ٢٦٤٧٦ | ١٣٣٥١ | ٣٦٦ | ١٩٩٣١ | ١١١ |
| ٢ | ئامێدیێ | ١٥٨ | ٤٤٠٥ | ٢٠٠٣٧ | ١٧٩٠٧ | ٦٠٥٤ | ٣٤٣٧٨ | ١١٢٩ |
| ٣ | سێمێل | ١٠٥ | ١١٥٩٢ | ١٥٦٣٩٤ | ٢٣١٠٥ | ١٣٥٩ | ٢٥٢٤٥ | ٣٦٥ |
| ٤ | زاخۆ | ١٢٦ | ٨٠٥٦ | ٧٣٨٩١ | ٣٩٣٢٤ | ١٢٤٤ | ١٤٨٢٣ | ٤٠١ |
| ٥ | بەردەرەش | ٨٧ | ٩٢٢٩ | ٥٦١٢٧ | ٩٧١٤ | ١٠٢٣٤ | ١٢٦٠٩٠ | ٣٤٠ |
| ٦ | ئاكرێ | ٢٣٥ | ٨٤٥٩ | ١٩٦١١٧ | ١٠٤٩٩٦ | ٢٧٢٣٧ | ١٢٧٤٠٠ | ١٥٨٤ |
| ٧ | شێخان | ١١١ | ٥٢٥٢ | ٨٦٦٣٤ | ١٦٤٤٨ | ٣١٢١ | ٢٣٣٩٢ | ٣٢٠ |
| سەرجەمێ گشتی | | ٩١٦ | ٤٩٨٥٢ | ٦١٥٦٧٦ | ٢٢٤٨٤٥ | ٤٩٦١٥ | ٣٧١٢٥٩ | ٤٢٥٠ |

**خشتەیێ ژمارە (٣)**

**ئامارا سامانێ ئاژەلی ل پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١١)ێ ل دووڤ پێزانینێن رێڤەبەریا ڤێتێرنەریا دهۆکێ**

| ز | ناڤێ دەڤەرێ | پەز | بزن | گارەش | گامێش |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | باعەدرێ | ١٦٤٥٠ | ٤٠٤١ | ١٥٠ | ٠ |
| ٢ | ئاکرێ | ٢١٣٤٣ | ١٧٧٠٠ | ٤٣٣٠ | ٠ |
| ٣ | باتیفا | ٦٥٩٧ | ٧٧٨٨ | ٤٥٠ | ٠ |
| ٤ | باتێل | ٥١١٦٠ | ٨٢٧٧ | ٣٨٥ | ٠ |
| ٥ | بامەرنێ | ٩٠٠٠ | ٥٠٠٠ | ٤٤ | ٠ |
| ٦ | زاخۆ | ٤٨٠٠٠ | ٢٣٠٠٠ | ٨٠٠ | ٠ |
| ٧ | زاویتە | ٢٠٠٠٠ | ١٠٠٠٠ | ٥٠٠ | ٠ |
| ٨ | سێمێل | ٧٩٩٠٠ | ٢٣٩٠٠ | ٢٨٠١ | ٠ |
| ٩ | ئامێدیێ | ٨٢٧٠ | ٦٥١٥ | ١٢٨٥ | ٠ |
| ١٠ | قەسرۆك | ٤٠٣٥٥ | ١٤٦٤٥ | ٣٥٣٣ | ٠ |
| ١١ | کانی ماسێ | ٥١٠٠ | ٥٧٠٠ | ٢٣٥ | ٠ |
| ١٢ | گردەسین | ٥٢٠٠٠ | ١٩٠٠٠ | ٢٠٠٠ | ٠ |
| ١٣ | هیزاوا | ١٠٠٠٠ | ٥٠٠٠ | ٢٠٠ | ٠ |
| ١٤ | دێرەبوون | ١٨٠٠٠ | ٧٠٠٠ | ٤٥٠ | ٠ |
| ١٥ | بەردەرەش | ٤٥٠٠٠ | ١٠٠٠٠ | ٤٠٠٠ | ٠ |
| ١٦ | مانگێش | ٢٠١٣٥ | ٨٦٩٦ | ١٠٢ | ٠ |
| ١٧ | سەرسنك | ١٠٥٦٤ | ٤٥٤٩ | ٣٨٨ | ٠ |
| ١٨ | قدش | ٤٠٠٠ | ٢٥٠٠ | ٦٠٠ | ٠ |
| ١٩ | بجیل | ٣٧١٠٠ | ٢١٥١٠ | ٢٨٨٠ | ٠ |
| ٢٠ | دینارتە | ١٢٠٠٠ | ٣٠٠٠٠ | ٥٠٠٠ | ٠ |
| ٢١ | شێلادزێ | ٢٠٠٠ | ٢٥٠٠ | ٣٥٠٠ | ٠ |
| ٢٢ | دێرالۆك | ٦٠٠ | ٢٣٠٠ | ١٦٠٠ | ٠ |
| سەرجەمێ گشتی | | ٥١٧٥٧٤ | ٢٣٩٦٢١ | ٣٥٢٣٣ | |

**خشتەیێ ژمارە (٤)**

**ئامارا سامانێ ئاژەلی ل پارێزگەها دهۆكێ بۆ سالا (٢٠١٢)ێ ل دووڤ پێزانینێن رێڤەبەریا ڤێتێرنەریا دهۆكێ**

| ز | ناڤێ دەڤەرێ | ژمارا گوندا | پەز | بزن | چێل | مریشك |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مانگێش | ٣٥ | ٢٣٠٣١ | ٧٩٨٢ | ١٥٥ | ٤٢٤٤ |
| ٢ | زاویتە | ٤٢ | ١٠٤١ | ٥٢١٠ | ٤٥١ | ١١٢٣ |
| ٣ | باعەدرێ | ٢٢ | ٢٣٠٦٣ | ٥٥٥٨ | ١٢٦ | ١٠٤٨٤ |
| ٤ | سێمێل | ٤٩ | ٨٤٢٣٦ | ١٠٨٠٣ | ٨٣١ | ٤٣٢٩٥ |
| ٥ | فەیدێ | ١٤ | ٢٠٨٨٣ | ٣٧٩٤ | ٣ | ٠ |
| ٦ | باتێل | ٤٧ | ٩٣١٤٢ | ١١٢٨٠ | ٣٤٢ | ١٨٣٠٦ |
| ٧ | بامەرنێ | ٢٣ | ٧٦٧٠ | ٤٧١٨ | ١٠٧ | ٤٣٣٩ |
| ٨ | سەرسنك | ٣٠ | ١٤٦١٥ | ٩٤٤٢ | ٣٥٩ | ٨٦٠٠ |
| ٩ | قدش | ٨ | ٣٩٨٧ | ٢٢١٨ | ٣١٥ | ٣٢٠٠ |
| ١٠ | ئامێدیێ | ٣٥ | ٣٧٩١ | ٥٠١١ | ١١٣١ | ٨٥٠٨ |
| ١١ | دێرالۆك | ٩ | ١٢٤٩ | ٢٨٠٧ | ١١٤٩ | ٧٠٤٢ |
| ١٢ | شێلادزێ | ١٧ | ١٧١٠ | ٢٦٥٩ | ٤٤٠٣ | ١٠٥٠٠ |
| ١٣ | كانی ماسێ | ٤٢ | ٨٥٤٢ | ١١٧٤٠ | ٣٦٤ | ٥١٧٢ |
| ١٤ | دێرەبوون | ٢٢ | ٥٣٧٥٧ | ١٤٠٦٣ | ٦٦٥ | ٨٩٥١ |
| ١٥ | زمار | ٦١ | ٦٨٥٠٢ | ٥٤٩٦ | ٦٢٦٨ | ٤٦٢٠٩ |
| ١٦ | زاخۆ | ٣٠ | ٢٩٠٧٥ | ٩٨٤٩ | ٦١٩ | ٤٠٩٧ |
| ١٧ | هێزاوا | ١٤ | ٢٨٢٢٢ | ١٦٠٦٦ | ١٩٢ | ٧٢٦٧ |
| ١٨ | باتیفا | ٢٨ | ١٥٩٦٦ | ٧٦٨٦ | ٢٧٨ | ٥٠٦٤ |
| ١٩ | قەسرۆك | ٦٥ | ٣٧٥١٠ | ١١٩٨٧ | ٢٢٣٣ | ٢٥٧٢٥ |
| ٢٠ | بەردەرەش | ٧٢ | ٦١٢٤٤ | ١٢٥٠١ | ٢٠٣٧ | ٩٦٥٥٠ |
| ٢١ | گردەسین | ٥٤ | ٦٠٨٦٢ | ٢٩٠٦١ | ٢٥٥٧ | ٢٣٤٥٠ |
| ٢٢ | ئاكرێ | ٦٢ | ٤٣٨١٧ | ٢٨٥٧٢ | ٤٧٤٤ | ٣١٨٠٧ |
| ٢٣ | بجیل | ٦١ | ٦١٦٨٧ | ٣٥٣٧٤ | ٣٦٩٩ | ٢٢٥٦١ |
| ٢٤ | دینارتە | ٦٢ | ١٠١٩٥ | ٣٣٨٤٥ | ٩٢٦٦ | ٢٣١٥٧ |
| سەرجەمێ گشتی | | ٩٠٤ | ٧٥٧٧٩٧ | ٢٨٧٧٢٢ | ٤٢٢٩٤ | ٤١٩٦٥١ |

**خشتەیێ ژمارە (٥)**

**ئامارا سامانێ ئاژەلی ل پارێزگەها دهۆكێ بۆ سالا (٢٠١٣)ێ ل دووڤ پێزانینێن رێڤەبەریا ڤێتێرنەریا دهۆكێ**

| ز | ناڤێ دەڤەرێ | ژمارا گوندا | پەز | بزن | چێل | مریشك |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مانگێش | ٣٥ | ٢٣٠٣١ | ٧٩٨٢ | ١٥٥ | ٤٢٤٤ |
| ٢ | زاویتە | ٤٢ | ٥٢١٠ | ٤٥١ | ١١٢٣ | ٠ |
| ٣ | باعەدرێ | ٢٢ | ٢٦٧٢٧ | ٦٧١٧ | ٢٠٠ | ١٣٣٩٥ |
| ٤ | سێمێل | ٤٩ | ٨٢٢٨٨ | ٦٩٣٢ | ١٤٨١ | ٣٣٠٦٦ |
| ٥ | فەیدێ | ٢٤ | ٣٩٧٣٠ | ٣٢٢٠ | ١٠٢ | ٤١٥٥ |
| ٦ | باتێل | ٤٧ | ٧٢٧٥٠ | ١١٦٥٠ | ٢٥٠ | ١٤٢٦٨ |
| ٧ | بامەرنێ | ٢٣ | ٧٦٧٠ | ٤٧١٨ | ٩٠ | ٤٥٠٠ |
| ٨ | سەرسنك | ٣٤ | ١٠٧٠٥ | ٦٣٥٧ | ٣٨٣ | ١٤٧٠٥ |
| ٩ | قدش | ٨ | ٣٩٨٧ | ٢٢١٨ | ٣١٥ | ٣٢٠٠ |
| ١٠ | ئامێدیێ | ٣٥ | ٤٢١٦ | ٤٤٢٧ | ١٣٥٧ | ٨٥٠٨ |
| ١١ | دێرالۆك | ٩ | ١٢٤٩ | ٢٨٠٧ | ١١٤٩ | ٧٠٤٢ |
| ١٢ | شێلادزێ | ١٧ | ٣٤٤٠ | ٥١٤٠ | ٥١٤٠ | ١٠٥٠٠ |
| ١٣ | كانی ماسێ | ٤٢ | ٧٠٥٦ | ١٠١٤٩ | ١٥٩ | ٥١٧٢ |
| ١٤ | دێرەبوون | ٢٢ | ٥٣٧٥٧ | ١٤٠٦٣ | ٦٦٥ | ٨٩٥١ |
| ١٥ | زمار | ٦١ | ٧٤١٨٦ | ٥٤٤٩ | ٧٦٩٨ | ٤٦٢٠٩ |
| ١٦ | زاخۆ | ٣٠ | ٢٩٠٧٥ | ٩٨٤٩ | ٦١٩ | ٤٠٩٧ |
| ١٧ | هێزاوا | ١٥ | ٢٨٩٠٠ | ١٤٨٥٠ | ٥٥٢ | ٩٦٥٠ |
| ١٨ | باتیفا | ٢٨ | ١٥٩٦٦ | ٧٦٨٦ | ٢٧٨ | ٥٠٦٤ |
| ١٩ | قەسرۆك | ٦٥ | ٣٧٥١٠ | ١١٩٨٧ | ٢٢٣٣ | ٢٥٧٢٥ |
| ٢٠ | بەردەرەش | ٧٢ | ٦١٢٤٤ | ١٢٥٠١ | ٢٠٣٧ | ٩٦٥٥٠ |
| ٢١ | گردەسین | ٥٤ | ٦٩٤٣٩ | ٢٩٤٢٣ | ٣٣٢٢ | ٢٣٤٥٠ |
| ٢٢ | ئاكرێ | ٦٢ | ٤٣٨١٧ | ٢٨٥٧٢ | ٤٧٤٤ | ٣١٨٠٧ |
| ٢٣ | بجیل | ٦١ | ٦١٦٨٧ | ٣٥٣٧٤ | ٣٦٩٩ | ٢٠١١٠ |
| ٢٤ | دینارتە | ٦٢ | ١٠١٩٥ | ٣٣٨٤٥ | ٩٢٦٦ | ٢٢١٨٥ |
| | سەرجەمێ گشتی | ٩١٩ | ٧٧٣٨٣٥ | ٢٧٦٣٦٧ | ٤٧٠١٧ | ٤١٦٥٥٣ |

### ٦. سە:

دهێتەزانین کو سە پتر ژ ٥٠٠٠ هزار سالانە دگەل مرۆڤی دا دژین و بێن هاتینە خودانکرن و فێری گەلەك کارا بووینە وەك پاراستن و چاڤدێریکرن و زێرەڤانیکرن و شڤانیا ئاژەلی و هاریکاریا پۆلیسان و رێڤەبرن و نیشادانا کۆرەیان، دهێتەزانین کو سە ب وەفادارترین گیانەوەرن مرۆڤی کەهیکرین کو مرۆڤ دشێت بەرپرسیارەتیێ بێخیتە سەر وان، خەلکێ مە د کوردەواریێ دا مفایەکێ باش ژێ وەرگرتییە ب تایبەت د بوارێ شڤانیێ و نوبەداریێ دا، ب شێوەکێ زانستی چ ڤەکۆلین ل سەر نە هاتینەکرن و تا رادەکێ باش گەلەك مفا ژێ نە هاتییە وەرگرتن.

ژ بنەمالا گیانەوەرێن شیردەرێن گۆشتخۆرە و کێشا وی یا جیاوازە ل گۆرەی جۆرێ وی، وەکی سەیێن کوردەواری ژ (٢٠-٤٠کگم) لێ هندەك سەیێن بیانی د گەهنە (٨٠) کگم و هندەکێن ناڤ مالا دگەهنە (١) کگم.

هندەك ژجۆرێن سەیێن ل پارێزگەها دهۆکێ د ژین:

- **سەیێ خۆمالی ئانکو سەیێ کۆلانا:**

مخابن ئەڤرۆکە ب شێوەکی بەرچاڤ و پێدڤی مفا ژ ڤی جۆرێ سەی نەهاتییەکرن، تنێ ئەو نەبیت ئەوێ ل هندەك مالا ل گوندا بۆ شڤانیێ ب کاردهێنن بەلکو بەروڤاژی ئەڤ جۆرێ سەی رۆژانە تووشی کوشتن و ژ ناڤ چوونێ دبن چ ژ ئالیێ خەلکی ڤە و



چ ژ ئالیێ ئاڤ و هەوایێن نەگونجای و لێدانا ترومبێلان و کوشتنا وان ژ ئالیێ سازیێن میری ڤە.

ئەڤ جۆرێ سەیا زۆر د نورمالن زۆربەی رەنگێ وان رەش یان گەور یان سپی یان تێکەلی ئێکن و زۆربەی جارا ل دۆرماندوری گوند و کۆمەلگەهـ و باژێرا دژین، ل جادە و کۆلانا دهێنەدیتن، تایبەت جهێن خرڤەبوونا گلێش و بەرمایبان.

- **سەیێ پشدەر:**

ئەڤ جۆرێ سەیا ل وەلاتێ ترکیا ب ناڤێ(سەیێ گەنگال) دهێتە ناڤکرن و نۆکە ئەم د ململانێیەکێ داینە کا خوجهیا وی سەی کوردستانە (دەڤەرا پشدەر ل سلیمانیێ) یان وەلاتێ ترکیایە، لێ مخابن نهو ل کوردستانێ وەکی ڤەکۆلین چ بۆ نە هاتییەکرن.

ئەڤ جۆرێ سەیا نها ل گەلەك جها دهێتە خودانکرن، تایبەت ل مالێن حەژێکەر و ئاژەلدۆست و زەنگین و پایە بلندا و ب برە پارەکێ باش کرین و فرۆتن پێ دهێتەکرن.

ئەڤ جۆرێ سەیا یێ بەرنیاسە ب کەلەخەکێ مەزن و سەر و دەست و پێ بلند و تێر گۆشت و ب هەیبەت و ترس و سەهم و کێم کەس یان خودان نەبیت نە وێریت د بەررا یان تەماشەی سەر و چاڤێن وی بکەن، ل دووڤ گۆتنێن خودانکەرێن وان بۆ نێچیر و نۆبەداریێ و شەرە سەیانێ گەلەك د زیرەك و دژوارن .



سەیێ پشدەر یێ بەرنیاس ب مەزناهیا کەلەخێ وی

- **سەیێ بیانی**

ئەڤرۆکە سە خودانکرن وەکی چاڤلێکرنەك و ب تایبەت دناڤ سەنتەرێ باژێراندا پەیدابوویە، تایبەت سەیێن بیانی و پارەکێ باش ب کرینا وان ددەن، چ بۆ جوانی و زەوقان، یان ژی بۆ شڤانی و نوبەداریێ وەکی (سەیێن لابرادو و روتریڤەر و جیرمەن شیپەرد و چاوچاو گەلەکێن دی) و باراپتر ژێدەرێن هینانا ڤان سەیان ژ وەلاتێن ترکیا و لوبنان و کێمەك ژ ئەوروپا نە.



سەیێ بیانی یێ هاوردەکری (چاوچاو)



سەیێ بیانی یێ هاوردەکری ( GSD)

## ٧. تاژی:

ئێکە ژ گیانەوەرێن گۆشتخۆرێن بنەمالا سەیان کو د کەڤن دا ل کوردستانێ هاتییە کەهیکرن و کەلەخێ وی ژ سەی مەزنتر و درێژترە، لێ زۆر یێ لاواز و کێم گۆشتە و ب ناڤتەنگ زراڤییا خۆ بەرنیاسە و گەلەك ژ سەی بۆ غاردان و نێچیرێ زیرەکترە، تایبەت بۆ گرتنا کێرویشك و بالندا و زۆربەی ئەو کەسێن تاژی ب خودانکرین پتریا وان هۆستا و موکری و قەرەج و کۆچەرات بوون.

## ٨. پشیك:

ژ مێژە وەرە هاتییە خودانکرن، تایبەت ل چەرخێ مسریێن کەڤن بەری (٥٠٠٠)ێ هزار سالا و پشیك ژ ئالیێ وانڤە دهاتەپەرستن و ئەڤ حەژێکرنە یا بەردەوام بوو، تاکو ل چەرخێن ناڤەراست پشیك هاتە دویرئێخستن و رەجماندن چونکی ب سێربەندیێ و فێلبازیێ و کارێن شەیتانی ڤە هاتە گرێدان، لێ ئەڤێ دۆم نەکێشا و جارەکا دی پشیك ژبەر زیرەکاتیا وێ ژ ئالیێ مرۆڤی ڤە ب تایبەت بۆ کارێن گرتنا جورد و مشك و مار و دوپشکا هاتەحەژێکرن، ئەڤرۆکە پشیك بوویە هەڤالەك بۆ مرۆڤی و مرۆڤ ژ دوستینیا پشیکێ هەست ب خۆشیەکێ دکەت.

پشیك ژ گیانەوەرێن شیردەرێن گۆشتخۆرێن زۆر بەربەلاڤ ل سەرتاسەری جیهانێ و ئەگەر یا کەهی نەبیت د شێن ل سەر مشك و خشۆك و بالندەیێن دەوروبەرا بژیت و نێزیك ١٢ سالا د ژیت، درێژاهییا وێ ژ (٤٠-٦٠ سم) و کیشا وێ (١- ٥ کگم) (ل گۆرەی جۆرێ وێ).

**جۆتبوون و زاوزێ:** پشتی جۆتبوونا نێر و مێ یان ب (٦٢- ٦٩) رۆژا دزیت و ٣- ٦ تێژکا دکەت.

دو جۆرێن پشیکا ل پارێزگەها دهۆکێ د هێنە دیتن:

- **پشیکا خۆمالی (پشیکا جادێ):**

پشیکەکا بەربەلاڤ و رەحەتە و خوارنا وێ ل سەر کیفك و گلێشخانە و بەرمایکێن مالانە و زۆر خەلك

فێر بوویە ژ دەرگەهێ دلۆڤانیێ پشیكا د مالێن خۆدا خودان دكەن و خوارن و ڤەخوارنێ ددەنێ.



پشیكا خۆمالی (پشیكا كۆلانێ)

- **پشیكا بیانی:**

مینا پشیكا شیرازی یا ئیرانی و پشیكا چاڤ شین و كەسك یا وانێ و پشیكا هەمەلایا و گەلەكێن دێ زۆربەی ژێدەرێن دەسخۆڤەهینانا وان ژ وەلاتێ تركیا و دەوروبەرانە، ئەڤ پشیكە د ناڤ مالان دا دهێتە خودانكرن و پارەكێ باش لێ د هێتەمەزاختن.



پشیكا شیرازی یا فارسی

## ٩. مریشك:

مریشكێن كوردی (خۆمالی) ل سەرتاسەری كوردستانێ و پارێزگەها دهۆكێ ب رەنگ و خولك و دێمێ خۆ بەرنیاسن، گەلەك ب ساناهییە بۆ خودانكرنێ، ب دمی بۆ خو ل خوارنێ دگەریێت و ئەردی هلدكۆلیت، لەورا چەند یا بەردای بیت بۆ وێ خۆشتر و ساخلەمترە، لێ ژ بەر پێدڤییا مالێ بۆ دەسڤەهینانا هێكا پێدڤییە خودان خوارنەكا باش بدەتێ دا ژ هێككرنی نەراوستیت، دیارە خەلك خۆشیێ ژ گۆشت و هێك و پەرێن وێ د بینیت و جیاوازیەكا بەرچاڤ ل گەل مریشكێن بازرگانی ئەوێن ل پرۆژا ب خوارنا ئالیكێ د هێنەخودان كرن هەیە و دهێتە بخودانكرن ل هەمی مالا ل گوند و كۆمەلگەها و بەرهەمێ وان دگەهتە بازێرێ دهۆكێ

مریشك ئەگەر یا ساخلەم بیت نێزیكی شەش سالا دژیت، پشتی هێككرنی ٢١ رۆژا ل سەر (١٠- ١٥) هێكا كورك دبیت و پشتی دەركەفتنا چیچەلۆكان خودان چ زەحمەتێ پێڤە نابەت چونكی مریشكا دەیك ب كارێ خودانكرنا چیچەلوكێن خۆ رادبیت.

## ١٠. دیكل:

دیكلێ كوردی (خۆمالی) ل گوند و كۆمەلگەهێن سەرب پارێزگەها دهۆكێ رەوش و رەونەقەكا زێدە هەیە ب تایبەت ل دەمێ بانگدانێ ل سپێدەهیێن زوی، یان خوارنا گۆشتێ وی، هەرەسا ل گەلەك جها بەریكانا شەرە دیكلانێ پێ دهێتەكرن.

كەلەخێ دیكلی بەرچاڤ و مەزنترە ژ یێ مریشكێ و لڤینا وی یا دیار و بەرچاڤە، هەروەسا كۆمركا دیكلی یا سۆر رەونەقەكی ددەتە جوانیا دیكلی و هەردەم بەرێ وی یێ ل شەرۆكینێ نە وەك مریشكێ یێ رەحەتە و دیكل چ جارا قەبوول ناكەت دیكلەكێ دی ل گەل وی د كۆلكی ڤە بیت و هەر دەمی ئێك دیت دێ شەری دگەل كەت و هندەك جارا ب دمی و تكێن دژوار د گەهتە كوشتنێ.

## ١١. عەلۆك:

ئەڤ گیانەوەرە ژ كۆما بالندایە و دهێتە هژمارتن ژ مەزنترین بالندەیێن ژ جۆرێن مریشكان ل دەڤەرا دهۆكێ دهێنەخودانكرن و كێشا وان یێن مێ دگەهیتە (٨-١٠كگم) یێن نێر (٩كگم)، درێژیا وی نێزیك ١

مەترە و نێزیك دەهـ سالان دژیت ل سەرتاسەری گوند و باژێرکێن پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەت دەڤەرا ئاکرێ و سێمێلی و زاخۆ ب خودان دکەن و پتریا پێویستی و ئەگەرێن بخودانکرنێ ژ بەر خودانکرنا وی یا ب ساناهی یە کو ژ مریشکێ پتر گۆشتی دەت، هەروەسا تایبەتمەندیا خوارنا گۆشتێ عەلۆکی یە و ل رێزبەندیا ئێکێ ل گەل گۆشتێ بەرخی ل سەر سفرێن دەولەمەند و حەز ژخۆکەرا دهێن، گۆشتێ عەلۆکی پر مفایە و بتامە و کێم بەزە و بێ پر ساخلەتێن خوارنێ یە وەك پرۆتین و ڤیتامین و گەلەك توخمێن دی، هەروەسا سالۆخەتەکا باش ل دەڤ چیچەلۆکێن عەلۆکی دا هەیە، ئەو ژی شیانێن مەزنبوونا ب لەز و بەروەخت و ب کێشەکا باش و ب کێمترین دەم و کێمترین خوارن.



سەر و ستوکورا عەلۆکی پەر پێڤەنینن و دشێت بۆ دووراتییەکا نێزیك بفریت، ژ بالندەیێن گیا و دان خۆرە، یا مێ ل بهارا داخوازا نێری دکەت، ژ (٨ – ١٥) هێکا دکەت، یا مێ دەمێ (٢٨) رۆژا سەر هێکێن خو کورك دبیت.

## ١٢. قاز و وەردەك :

ئەڤە ژ جۆرێ بالندا ل وان جهێن گەرکێن ئاڤێ هەین دژین و ب هندەك رێژێن کێم ل هندەك دەڤەرێن جودا جودا ل پارێزگەها دهۆکێ دهێتەخودانکرن، تایبەت ل دەڤەرێن ئێزدینشین و ل هندەك گوندێن دەڤەرا ئاکرێ و بەردەرەش و قەسرۆکێ، مەرەما



سەرەکی ژ خودانکرنا وان بۆ ب دەستڤەئینانا گۆشتی و هێکێ یە، لێ زۆر مەرەق سەر خوارنا گۆشت و هێکێن وان نینە و بازارێ کرین و فروتنا وان یێ کێمە.

## ١٣. کێرویشکا کەهی:

نها کێرویشك دهێتەهژمارتن ئێك ژ گیانەوەرێن دهێتەخودانکرن بۆ سەر سفرا مالێ وەکی مریشك و عەلۆك و ماسی و گۆشتێ دیتر، هەرچەندە تاکو سەدسالیا شازدێ کێرویشك ب شێوەکێ بەربەلاڤ نەهاتبوو خودانکرن، ئێکەمین کەس ب ڤەگوهاستن و بخودانکرنا وان رابووین بازرگانێن فینیقی بوون، بەری هزار سالا دەمێ ل کاروانێن خۆدا ل سەر دەریا سپی یا ناڤەراست خودانکرین د گەمیێن خۆدا بۆ خوارنا رۆژانە، و ئەڤرۆکە کێرویشك دهێتە بخودانکرن بۆ مفا وەرگرتن ژ گۆشت و پیرتێ وێ، هەروەسا ئێکە ژ گیانەوەرێن دل ڤەکەر ل ناڤ مالان. کێرویشك (٣-٦) سالا دژیت، درێژاهییا وێ نێزیك ٤٠ سم و کێشا وێ نێزیك ٢ کگم.

**جۆتبوون و زاوزێ:**

زۆربەی جارا جۆتبوون و زاوزێ ل هەیڤێن بهار و هاڤینا دەسپێدکەت، دەمێ ئاڤسبوونێ (٣٠) رۆژن، هەرجارەکێ ژ (٢- ٧) تێژکا دکەت، د شیاندایە سالێ ٤- ٥ جارا ئاڤسبیت و تێژکا بکەت.

دو جۆرێن سەرەکی یێن کێرویشکا یێن هەین:

- **كێرویشكا پیرت كورت:**
كو ب ساناهی دهێته بخودانكرن.

- **كێرویشكا پیرت درێژ:**
كو پێدڤی ب پاقژكرن و شەكرنەكا زێدە هەیە و ب زەحمەتن بۆ چاڤدانێ.



## ١٤. تاووس:

ژ بنەمالا بالندایە و خۆجهیا وی ژ وەلاتێ هندستانێ یە، نە بالندەكێ خۆجهێ كوردستانی یە لێ ژ كەڤندا و تاكو نها دەولەمەند و ماقویل و دەرەبەگا خودانكریە و ب پارە ژ بازرگان و ئاژەلدۆستان یان ژ باغچێن گیانەوەران كرینە.

بالندەكێ جوان و بەرنیاسە و جوانییا وی د كوریا وی یا درێژ دایە كو چەندین پەرێن كەسك و شینێن تەیسۆك و رەنگ كرییێن درێژە و ئەڤ پەرە ل تاوسێ



نێر جوانتر و درێژترن ژ یێ مێ، دەمێ نێری ب ڤێن سەرنجا مێ بۆ خۆ راكێشیت پەرێن خۆ بلند و قژ دكەت و سەر پشتا خۆ وەكی رێز دكەت.

تاوسێ نێر نێزیك ٣كگم و درێژاهیا وی ٢- ٢,٣٠ م لێ یا مێ ژ مێترێ كێمترە، تاووسێ ساخلەم ژ ١٠- ١٥ سالا دژیت و یا مێ هەر جارا هێكا بكەت ژ ٣-٥ هێكا دكەت.

## ١٥. كۆتر:

ب سەدەها هزار جۆرێن كۆترا ل جیهانێ هەنە، زەوق و خۆشیەك د خودانكرنا واندا هەیە و بازارێ كرین و فرۆتنا رۆژا نە ل سەركۆتری هەیە، تایبەت تەخا گەنج و سنێلا، باشترین بەلگە بۆ مە مەیدانا رۆژا ئەینی یێ یە ل دهۆكێ كو دێ بینی ب سەدەها گەنج و سنیلە كرین و فرۆتنا كۆترێ دكەن. دەمێ سەرەدانا بازارێن وێ بكەی دێ ب دەهان ناڤ و جۆرێن كۆترا بینی وەكی(كۆترا قەلاب وكۆترا ب بەرپێك وكۆترا هندی وكۆترا شەركەر وكۆترێن نانەو پوس بەر.... هتد).



باراپتر د ناڤ جڤاكی مەدا و ب تایبەت ل پارێزگەها دهۆكێ دا كۆتر د سندوقێن د هەلاویستی د بەر بانا را دهێتە بخودانكرن و خوارنا وان دان و دكاكە، هەروەسا شینكاتی ژی دخۆن. درێژاهیا كۆترێ ژ ١٥- ٧٠ سم ل دووڤ جۆرێ وێ.

بۆ بەرەڤ خۆ راكێشانا كۆترا نێر، كوترێ مێ چەندین پێرابوونا دكەت وەك ستو خواركرن و

پەرقژكرن و گاڤێن دوور و ڤیچكرنا كوریا خۆ،كۆترا مێ د سالێ دا ٥ پێنج جارا هێكا دكەت، هەر جارەكێ هێكەكێ یان دویا و یان نێر و مێ یان یا مێ بتنێ ١٢-٣٠ رۆژا ل سەر هێكا كورك دبن.

## ٢- گیانەوەرێن كویڤی ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ:

### پێشەكی

سامانێ گیانەوەرێن كویڤی ئێكە ژ سامانێن سرۆشتی و نەتەوەیی ل جیهانێ، گەلەك وەلات ب گیانەوەرێن وی هاتینەنیاسین وەكی ئوستralیا یاناڤدارە ب گیانەوەرێ كەنغەر و هندەك وەلاتان گیانەوەرێن خۆ كرینە درویشم بۆ خۆ.

گیانەوەرێن كویڤی درندانە و ب دەستێن مرۆڤان تووشی گرتن و كوشتن و ژناڤبرنێ و راهێلانێ بووینە، ب هەمی رێك و جۆر و شێوێن ژ ناڤبرنێ بكرە ژ دەست و بەر و خەنجەر و تیر و تڤەنگ و ئاگربەردان و تەلی و سویت ڤەدانێ......تا داویێ ژ رێكێن گرتنا گیانەوەران. و بێ دلۆڤانییەكا گران و ب هۆڤاتی سەرەدەری دگەل هاتییەكرن، ژ ناڤبرن و كوشتنا دایك و باب و تێژك و هێك و خەرزێن وانا ژبۆ مفا وەرگرتن ژ گۆشتی و بیستی و هریێ و شاخ و هەستی و هێكێن وان، ل گەلەك وەلاتان بازارێن رەش بۆ كڕین و فرۆتنا هریێ و پیستی شاخێن فیلا و پیستێ كێرویشك و رویڤی و خەزالا و پیستێ مارا هەنە.

كوردستان ژی ئێكە ژ وان وەلاتان كو گیانەوەرێن وێ یێن كویڤی بێ بەهر نەبووینە ژ ڤێ رەفتارێ، و مرۆڤی هەمی بزاڤ و رێك بۆ دەستڤەئینانا ڤان گیانەوەران بكارهینانە، چ ساخبن یان كوشتی، یان پیستێ وانبیت، و ئەم دشێن بێژین كو گەلەك گیانەوەرێن كوردستانێ یێن كێم بووین یان هەر نەمانە، ژبەر ڤێ دووڤ راهێلانێ بێ دلۆڤانیێ ب درێژاهیا دیرۆكێ، وەك بزنا كویڤی، بێهنفصینك، هرچ، رویڤی، كویشك، پلنگ، حەفتیار، قوربەشك، وەرشەك، كەو، سیسك، پۆر، كۆتر، مریشكێن ئاڤی، سیخور، ژویژی، كتكا كویڤی، بۆم، هەمی جۆرێن چویچك و زەروێلا و وداركۆكە و شركاك و گەلەك جۆرێن ماسیا و مێشێن هنگڤینی....هتد.

### ١. گیانەوەرێن كویڤیێن گۆشتخۆر ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ:

پارێزگەها دهۆكێ بەرنیاسە ب رووبەرەكێ بەرفرهێ ئاخ و ئاڤ و هەوای، پرە ژ چیا و گر و نهال و دەشت و مێرگ و كانیا، دەولەمەندە ب سەدان جۆرێن گژ و گیا و دەرامەتێن هەمەرەنگ، چ ل سەر ئەردی و چ دناڤ ئەردی و د ناڤ ئاڤێ دا، دگەل دا ئاڤ و هەوایەكێ گونجای هەیە كو پارێزگەهـ ببیتە جهێ هەبوون و مانا گەلەك گیانەوەرێن كویڤی مینا ئەڤێن ل خوارێ دیار:-

#### رویڤی:

**ناڤ ب عەرەبی: الثعلب الاحمر (الثعلب التركمانی)**

**ناڤ ب ئینگلیزی:** Red Fox

**ناڤێ زانستی:** Vulpes vulpes

گیانەوەرەكێ شیردەرە ل زۆربەی جهێن عیراقێ كو ژ جۆرێ (رویڤی یێ عەرەبی) و یێ هەرێما كوردستانێ ژ جۆرێ (روڤی یێ توركومانی) هەنە و پارێزگەها دهۆكێ ئێك ژ وان جهانە كو رویڤی تێدا د ژین و د مشەنە و هەمی دەمێن سالێ مرۆڤ د شێت ببینیت، نەمازە شەڤان و سپێدەهیان ب تایبەت ل چیا و دۆل و نهالێن تێر دار و بار و كەڤر و ل ناڤ گەنم و جەهـ و دەرامەتی ل ناڤ وەرزێن گوندور و شوتی و ترۆزی و خیار و باجانا دا. دیسان گەلەك جاران ل سپێدەهیان زوی و ب شەڤ پێكۆلێ دكەت كو جادەیان ببڕیت و دەرباز بیت ل دووڤ گەریانا قویتێ خۆ و دبنە ئارمانج بۆ ترومبێلان و دهێتە كوشتن.

گیانەوەرەكێ كویڤی یە و ل سەر رەنگێ سەی و چەقەل دچیت، لەشەكێ درێژ و زراڤ و دەست و پێ كورت ل سەر رەنگێ تاری و دەڤ و دفن گەلەك د زراڤ و گوە د درێژن و دوماهیا وان ب رەنگێ رەش

د هێن و کوریەکا درێژ و تژی پویرت و دوماهیا وێ سپی، گۆشت و دەرامەت خۆرە، ب تایبەت مریشك و چیچەلوك و مشك و مار و بەق و کێز و جورد و گوندور و شوتی و خیار و باجان و .....هتد دخۆت.

جۆتبوون و زاوزێ ل مەها کانوونا دووێ تاکو شواتێ دبیت و یا مێ ماوەیێ ٦٠ رۆژا ب ئاڤسی د مینیت و ٤- ٦ تیژکا د کەت.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری ٦٠-٩٠ سم

بلنداهیا ملا ژ ئەردی ٢٥-٤٠ سم

درێژاهیا پیێ پێن پاشی یێ ١٣-١٨ سم

درێژاهیا کوریێ ٣٠-٥٠ سم

کێش ٥- ١١ ککم

## هرچا گەور

**ناڤ ب عەرەبی، الدب الاسمر**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Brown Bear**

**ناڤێ زانستی ، Ursus arctos**

گیانەوەرەکێ شیردەرە، ل زۆربەی ئاقارێن ڤەدەر ژ گوند و کۆمەلگەهێن مرۆڤی ل کوردستانێ هەیە، تایبەت ل دەڤەرێن چیایی یێن ئاسێ ل پارێزگەها دهۆکێ وەکی چیایێ گارەی و مەتینی ژ جۆرێ (هرچا گەورە)، هرچەکا خودان کەلەخەکێ خوارێ مەزنە و کێشا هرچا نێر نێزیك (١٢٠-٣٠٠ ککم) و یا مێ نێزیك (٨٠-٢٠٠ ککم)، سەرێ وێ گەلەك مەزن و دو گوهێن گروڤر و کوری کورت و دەست و پێ ب تبلن وەکی مرۆڤی و نینوکێن تیژ و درێژ هەنە ( ٣-٥سم) و ل دەستا درێژتر ژ پیا ب ساناهی ب سەر دار و درەختان دکەڤیت و هەمی لەش ب پویرتەکێ تژی و درێژ و ستوور داپوشی یە، و هەر دەم سەر پێن پاشێ را دوەستیت و ل دەمێ برسی بیت یان هەست ب هێرشەکێ یان ترسەکێ بکەت گارگارێ دکەت.

زۆربەی خوارنا وێ ڤێقی و زەرزەواتە وەکی سێڤ و هرمیك و پتات و هنار و شوتی و گوندور، هەروەسا گۆشت و هنگڤین خۆرە، زۆربەی ژیانا خۆ د شکەفتادا دبەتە سەر و کێم جاران بۆ خوارنێ و ڤەخوارنێ دەردکەڤیت. هرچ وەکی مرۆڤی د شێن ل سەر پیان راوەستیت و ب رێڤە بچیت.





دەمێ جۆتبوون و زاوزێ ل مەها خزیرانی یە و ١٨٠- ٢٥٠ رۆژا ئاڤس دمینیت و هەر جارا ئاڤس بوونێ ٢-٣ تێشکا دکەت و هرچا مێ تنێ هەر ٣- ٤ سالا جارەکێ د زێن.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری ١٧٠- ٢٨٠ سم

بلنداهیا ملا ژ ئەردی ٩٠- ١١٠ سم

درێژاهیا پیێ پێن پاشی یێ ١٣-٣٠ سم

درێژاهیا کوریێ ٦-٢١ سم

کێش ١٢٠-٣٠٠ ککم

## پلنگ

**ناڤ ب عەرەبی، النمر الفارسی**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Persian Leopard (Tiger)**

**ناڤێ زانستی، panther pardus**

گیانەوەرەکێ شیردەرەێ گۆشت خۆرە، دبێژن ل زۆربەی دەڤەرێن کوردستانێ هەبوون، ژ کەڤندا ل چیایێن مەتینا و گارەی و گەلیێ بالندا و زاویتە

و گەلێ زاخۆ هاتییەدیتن، ب تایبەت بەری سالا (١٩٦٩)ێ، لێ نها دیتنا وی گەلەك یا ب زەحمەت بووی، ژبەر نەبوونا ئامیرەیێن پێشکەفتی بۆ دووڤچوونا وی، باوەری نە بوو کو پلنگ یێ هەی لێ ل ڤان دو سێ سالێن بووری ل چەندین دەڤەرێن جوداجودا ل هەرێما کوردستانێ هاتییە دیتن، لێ زۆربەی جاران پشتی هاتییەکوشتن، و چەندین راپورت بەر دەستێ مە هەنە کو پلنگ ل کوردستانێ زۆر یێ هەی و نها ل هندەك جهێن پاریزگەها دهۆکێ ژی پلنگ هاتییە دیتن، لێ ژ بەر فشارا نێچیرڤانا و مەترسییا ژ ناڤچوونا وان ئەم نەشێن ناڤێ جها بێژین.

ئەڤ پلنگێ ل کوردستانێ دژیت ژ جۆرێ پلنگێ فارسی یە(پلنگێ ئاسیەوی)Persian leopard و نها مەترسییا ژ ناڤچوونێ ل سەر ئاستێ جیهانی ل سەر ڤی گیانەوەری هەیە، سەر و کەلەخ دمەزن و پشتا وی و کێلەکێن وی ب رەنگێ زەرێ تاری و چەند بەرەڤ زکی ڤە بچیت سپی تر لێ دهێن، لەش هەمی نقچکێن رەشێن تاری نە وەك پنی پنی کو زانا د شێن ژیێ وی ژ ڤان پنییا بزانن و هەمی لەش ب ب پیرتەکێ نەرمێ رێخستی داپوشی یە، کوریا وی گەلەکا درێژە و بۆ پشتێ یا چەمیایە.

**شێوازێ ژیانێ:**

ل وان جهان دژیت یێ کو نێچیرا وی لێ هەبیت، وەکی چیا و کەڤرێن بلند، یان دۆل و نهالێن پەز و بزنا کویڤی و کێرویشك و چەندین گیانەوەرێن دی لێ هەین هەنە، هەروەسا بۆ لێگەریانا نێچیرا خۆ جار جار خۆ شوور دکەتە دەشت و نهالێن ڤەکری ژی.



زاوزێ و جۆتبوونا وی ل مەها شواتێ یە و ل هاڤینێ تێژکا ژ ١- ٦ تێژکا دکەت و دەمێ ئاڤسبوونێ ٣- ٤ مەهن.

درێژاهییا کەلەخی ل گەل سەری ١٠٠- ١٣٠سم.

بلنداهییا ملا ژ ئەردی ٤٥- ٧٨سم.

درێژاهییا پێیێن پاشی یێ ٢٦- ٢٧سم.

درێژاهییا کوریێ ٦٠-١١٠سم.

کێش ٤٠-٦٠کگم.

## گورگێ گەور

**ناڤ ب عەرەبی: الذئب الرمادی**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Gray Wolf**

**ناڤێ زانستی: Canis lupus**

خۆجهیا جوگرافی: ل زۆربەی جهێن سەر روویێ ئەردی ئەڤ گیانەوەرە یێ هەی، ژ جەمسەرێ باکوور تاکو هێلا پانیا ٢٠ و تایبەت ل دەڤەرێن مەکسیك باکوور و ئەلاسکا و کەنەدا و باشوورێ ئەفریکیا و باکوورێ ئاسیا و عیراق، هەرێما کوردستانێ ژی دهێتەهژمارتن ژ باشترین جهێ ژیانی بۆ ڤی جۆرێ گورگی ب تایبەت ئەوێ د بێژنێ گورگێ هندی.

**شێوازێ ژیانێ:**

بەربەلاڤترین گیانەوەرێن سەر روویێ ئەردی یە، دو شێوازێن ژیانێ یێن هەین، ئێك یێ خۆجهـ و یێ دووێ گەرۆك، پشکا خۆجهـ ل بهار و هاڤینانە چونکی تێشکا دکەت و ب خودانکرنا وان رادبیت و پشکا گەرۆك ل زڤستانا نە و زۆربەی جارا ب شەڤ هاتن و چوونێ دکەت و ل دەمی گەریانێ دا رۆژانە نێزیك ٢٠٠کم ب رێڤە دچیت و ب لەزاتییا ٨کم د دەم ژمێرەکێدا.

ئەڤ گورگە ژ گیانەوەرێن شیردەرە و بەرنیاسە ب کەلەخەکی ب هێز و گران، دەست و پێ ب هێز و تیر زەڤلەك و رەنگێ وی یێ گەورە، چەند بەرەڤ چیایی ڤە بچیت بیچپیچە سپی دبیت، چەند بەرەڤ دەشتێ ڤە بچیت رەنگێ گەورڤە دبیت و سەرێ وی یێ مەزنە و دفن و گوهـ درێژن، نێچیرێ دەمێ شەڤ دکەت، چونکی دیتنا وی شەڤێ زۆر یا ب

هێزە، هەروەسا بهیستن و هێزا غاردانێ هاریکارن بۆ نیچیرکرنێ، ژ دووراتیا ٢٠٠٠ میترا بێهنا بەرامبەری خۆ دهەلکێشیت، دەمێ دەستنیشانکرنا جهێ نێچیری ئاگەهداریا کۆمەکا گورگا دکەت دا دئێك دەمدا هێرشێ ببەنە سەر و ل دەمێ غاردانێ ل دووڤ نێچیرا خۆ چ دەنگ ژێ ناهێن چونکی ل سەرێ تبلێن دەست و پێیا د کەتە غار.



ژینگەها وی بریتی یە ژ چیا و دۆل و نهالێن تێر دار و بار و دشێن ل دەشت و بیابانان ژی بژیت، هەروەسا حەز و ڤیانا جهێن تێر کەڤرو تراش و گیا ژی دکەت.

**جۆتبوون و زاوزێ،** دەسپێکا بهارێ تاکو نیسانێ یە و دو هەیڤا(٦٠) رۆژا ئاڤس د بیت و ٤-٧ تێشکا د هینیت.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٩٠-١٥٠سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٦٥-٨٠سم).
درێژاهیا پێیێن پاشی یێ (٢٠-٢٧سم).
درێژاهیا کوریێ (٣٠-٥٠سم).
کێش (٢٠-٨٠کگم).

### سەیێ ئاڤی:

**ناڤ ب عەرەبی، القضاعة الاوراسیە(کلب الماء)،**
**ناڤ ب ئینگلیزی، Eurasian Otter**
**ناڤێ زانستی، Lutra lutra**

گیانەوەرەکێ شیردەرێ هشکئاڤی یە، زۆربەی ژیانا خۆ د ناڤ ئاڤێ و رووبار و چەم و بیستانان دا دبەتە سەر، ب تایبەت دەمێ ئاڤدانا برنج و هەبوونا گەرٍ و سکرێن ئاڤێ ل ناڤ بیستان و چەمان دا و خوارنا وی ماسیێن بچویکە، خودان کەلەخەکێ درێژ و دەست و پێ کورت چوار پێ هەنە، ناڤ تبلێن وی ب پەردەکێ دا پۆشینە بۆ هاریکرنا مەلەڤانییا و کوریەکا درێژ و پەحن و فرهە و ستوور هەیە، بۆ مەلەڤانیکرنێ و خۆ راگرتنێ ب کار دهینیت و پیرتێ لەشی یێ گەور و تەیسۆکە و ل بن زکی و ناڤ دەست و پیا ڤەبووی ترە.

سەرێ وی یێ گروڤرە و ناڤچاڤ دەرکەتی نە و دفن پەحن و فرهەیە ل گەل هەبوونا هندەك سمبێلێن درێژ و گوهێن وی د بچویکن ومەودایێ د ناڤ بەرا گوهـ و دفن و چاڤا یێ هەڤسەنگ و رێکە.

**بەلاڤبوونا جوگرافی،** ل زۆربەی ناوچێن ئاڤی ل سەرتاسەری عیراقێ ب تایبەت رووبار و گەرٍ و سکرێن ئاڤێ و ئەو خەلکێ ب شەڤێ کارێ ئاڤدانا دەرامەتی دکەن زۆر دبینن .

**جۆتبوون و زاوزێ،** ل مەهێن شوات و دەسپێکا بهارێ یە، دەمێ ئاڤسبوونێ ٦٠-٦٥ رۆژن و ٢- ٤ تێژکا دکەت.

درێژیا کەلەخی دگەل سەری (٦٠-٩٠سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٢٠-٣٢سم).
درێژاهیا پێیێن پاشی یێ (١١-١٤سم).
درێژاهیا کوریێ (٣٥-٤٧سم).
کێش (٦-١٧ کگم).

### تویری (چەقەل):

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی، ابن اوی الاسیوی(الواوی)**
**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی، Asiatic Jackal**
**ناڤێ زانستی ، Canidae aureus**

گیانەوەرەکە ل سەر رەنگێ گورگێ بچویك و کەلەخ زراڤ و لۆلەیی (اسطوانی) و مل چەمیای و تێر پویرتێ درێژ و درێژییتە سەر پشت و کوریێ و سەر بچویك و گوهـ درێژە، ژ رویڤی مەزنترە و پشتا وی یار رەش و گەورە وەکی بازنەکا رەش دۆرماندۆری لەشی و دفنا وی ژ یا سەی زراڤ ترە و وەکی رویڤی گۆشت و مریشك و چیچەلۆك خۆرە.

د ژینگەها دارستان و چیا و دەشت و دۆل و نهالا دا د ژیت، هەروەسا ل زەڤیێن چاندنێ و تێر دەرامەت و

لێڤێن رووبار و برك و گەرێن ئاڤێ، هەروەسا د شێت ل جهێن نیمچە بیابان ژی بژیت.

**جۆتبوون و زاوزێ:** دەستپێکا بهارێ یە، دەمێ ئاڤسبوونێ ٦٠ رۆژن و ٥- ٨ تێژکا دکەت.

دریژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٦٥-١٠٠سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٤٥-٥٠سم).
دریژاهیا پێیێن پاشی یێ (١٥-١٧سم).
دریژاهیا کوریێ (٢٠-٣٠سم).
کێش (٧-١٦کگم).

**قوربەشك:**

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی:** الغرير الاوراسي (غريرى الجبل)
**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی** Eurasian Badger
**ناڤێ زانستی:** Meles meles

گیانەوەرەکێ گۆشت خۆرە، کەلەخەکێ ب هێز و گرۆڤر و تێر گۆشت و بادای و دەست و پێ رەش و کورتن و ب هێزن و پویرتەکی گەور و چەند بەرەڤ دەست و پیا ڤە بچیت رەش و تاری تر لێ د هێن و خیچێن رەش ب سەر لەشێ وی دا دبۆرن، سەری وی یێ سپی یە و خیچەکا رەش ژ نیڤەکا سەر و چاڤ و گوهـ و بەرەڤ ستوی ڤە د چیت و هەردو گوها دگریت و ب شەڤ دەرد دکەڤیت و مالا خو د کونجێن ئاخێ دا چێدکەت.

ژینگەها تێدا د ژیت بتنێ تایبەت ل پاریزگەهێن دهۆك و هەڤلێر و سلێمانێ دژیت، ل چیا و نهالێن تێر دار و بار و زەڤیێن چاندنێ دا د ژیت.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل ئیلونێ و چریا ئێکێ یە و دەمێ ئاڤسبوونێ ٧ مەهن و ٢- ٤ تێژکا دکەت.



دریژاهیا کەلەخی دگەل سەری (٥٥-٧٥سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٣٠-٣٢سم).
دریژاهیا پێیێن پاشی یێ (٩-١١سم).
دریژاهیا کوریێ (١٢-٢٠سم).
کێش (٨- ١٨کگم).

**هەفتیار:**

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی ، الضبع المخطط**
**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی،** Striped Hyena
**ناڤێ زانستی،** Hyaena hyaena

کەلەخێ وی یێ چەمیایە، زۆر ب هێزە و سەرێ وی گەلەکێ مەزن و دفن رەش و پان و دو گوهێن دریژ و دۆرماندۆر دگەور و تاری نە، لەقلەقکێن دەڤی بۆ هەرشاندن و شکاندنا خوارنێ زۆر ب هێزن، دەستێن وێ دریژترن ژ پێن وی ئێکسم و کریت و درندەیە، کوری کورتە و تێر پویرتە، ژ زیها (خیچا پشتێ) پشتێ و بەرەڤ زکی پنی یان خیچێن رەشن، زۆربەی جارێ کارێ شەر و هێرشبرنێ دکەت نەخاسمە د ناڤ ژینگەهێ و ب شەڤێ دا و زۆربەی جارا ب تنێ



د ژیت، تنێ وەختێ جۆتبوونێ نەبیت و خوارنا وی ژ بەرمایکێ گیانەوەرێن گۆشتی و مری وەك کەڤل و سم و شاخ و هەستی و گۆشتێ گەڤنار.

**جۆتبوون و زاوزێ،** دەمێ بهارێ یە، دەمێ ئاڤسبوونێ ٩٠ رۆژن و ٣- ٥ تیژکا دکەت.

ژینگەها تێدا د ژیت ل زۆربەی ئاخا عیراق لێ پتریا وان ل چیا و دۆل و نهالا و سەروکانێن ئاڤێ و دەحل و پیش و پەلەخێن ئاسێ دا د ژیت.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٨٥-١٣٠سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٦٥-٨٠سم).
درێژاهیا پێیێن پاشی یێ (٢٢-٢٣سم).
درێژاهیا کوریێ (٢٥-٤٥سم).
کێش (٢٤-٥٥کگم).

**کتکا کویفی:**
**ناڤ ب عەرەبی، القط البری**
**ناڤ ب ئینگلیزی، wild cat**
**ناڤێ زانستی، Felis silvestris**

ئەڤ گیانەوەرە یێ مشەیە و پنی پنییە، وەك پشیکا کەهییە، لێ کەلەخێ وێ مەزنترە و کوریا وێ لۆلەیی یە و پێنج هێلێن رەش تێدانە، پویرتێ پشت و کوریێ درێژ و بۆش و سەر رەنگێ گەوری ڤە دچن، پنی پنییە، گەلەك خەتێن تاری و درێژ ژ ستوی و پشتێ بەرەڤ لەشی ڤە دچن، پتر کارێ شەری و نرەنرێ د کەت، تایبەت ب شەڤ پتر دهێتە دیتن ژ رۆژێ.

ئەڤ کتکا کویڤی گەلەك جارا ل گەل کتکا کەهی ل چولی جوت دبیت. جوتبوون و زاوزێ ل دەسپێکا بهارێ یە، دەمێ ئاڤس بوونێ ٩-١٠ حەفتی ( ٦٣- ٧٠) رۆژن و ٣- ٦ تێژکا دکەت.

**ژینگەها تێدا دژیت،** زۆربەی بیستان و چەم و لێڤێن رووبار و جهێن ئاسێ و تێر داروبار دژیت، خوارنا وێ گیانەوەرێ ژ کەلەخێ وێ بچویکترن وەکی سڤۆرە و مریشك و چیچەلۆك و کویسەلە و بەق.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٤٥-٧٥سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٢٥-٤٠سم).



درێژاهیا پێیێن پاشی یێ (١٢-١٤س).م
درێژاهیا کوریێ (٢٠-٣٨سم).
کێش (٣-٦کگم).

**وەرشەك:**
**ناڤ ب عەرەبی، القط الاحراش**
**ناڤ ب ئینگلیزی، Jungle cat**
**ناڤێ زانستی، Felis chaus**

ئەڤە ژ کتکا کویڤی مەزنترە و رەنگێ دفنا وێ یا ڤەبوویە و جوت گوهێن مەزن و دیار و قیچ و گورزەکێ مویێن رەش تێدایە و کوریا وێ یا کورت و زراڤ و دوماهیك رەنگێ رەش.

پویرتێ وێ نەرم و کورت و رەنگێ گەورە چەند بەرەڤ زکی ڤە دچیت ڤەبووی تر لێ د هێن و هندەك خیچێن رەش و گەور د ناڤ پویرتێ لەشیدا دبۆرن، چەند بەرەڤ زکی و پێ و دەستا ڤە بچیت تاری تر و دیار تر لێ دهێن.

**ژینگەهـ تێدا د ژیت،** ل پرانیا چیا و گر و نهالێن تێر درەخت و کەڤر و جهێن ئاسێ دژیت، خوارنا وێ گیانەوەرێ ژ کەلەخێ وێ بچویکترن وەکی سڤۆرە و مریشك و چیچەلۆك و کویسەلە وبەق.

**جوتبوون و زاوزێ،** وەرشەك ل هەیڤێن ئادار و نیسانێ دا جوت دبیت و دەمێ ئاڤسبوونێ نێزیکی(٧٠) رۆژانە، هەر جارێ (١- ٦) تێژکا دکەت.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٦٠-١٠٥سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٣٥- ٣٨سم).
درێژاهیا پێیێن پاشی یێ (١٤-١٧سم).
درێژاهیا کوریێ (٢٠-٢٨سم).
کێش (٧-١٦کگم).

**کویژکێ کەڤرا (کیژك):**
**ناڤ ب عەرەبی، الصنصارالصخور**
**ناڤ ب ئینگلیزی، Stone Marten**
**ناڤێ زانستی، Martes foina**

ل پرانیا وەلاتێن کویژك لێ هەی دو جۆرن، کویژکێ کەڤرا و کویژکی داروباری، پتر یێ سەر

كەڤرا یێ بەربەلاڤە، گیانەوەرەكێ گۆشتخۆرە درێژۆكە و كوربەكا نەرما درێژ یا هەی و دەست و پێ كورتن، لەشێ وی ب پویرتەكێ نەرم نخافتییە، چەند بەرەڤ زكی ڤە بچی تاریتر لێ دهێت، دگەل هەبوونا هندەك نقچێن سپی سەر لەشی.

ل سەرتاسەری هەرێما كوردستانی و تایبەت چیا و گەلی و دۆلێن سنووریێن بلند و ئاسێ و پر دار و بار ب تایبەت دارێن گویز و باهیڤ و بەڕوی و گوهیشكا دژیت.

خۆ د قورمێن دارا و ب تەحتە بەر و كەڤراڤە دڤەشێریت، شەڤێ ب دزیكیڤە خۆ دگەهینیتە رەخ ورویێن گوندا بۆ خوارنا كۆتر و دیكل و مریشك و كێرویشكان، لێ دەما یێ ئێمن بیت و مەترسی سەر نەبن ب رۆژ دەردكەڤیت، نێچیرا سڤۆرە و كێرویشك و مشك و جوردا د كەت، هەروەسا ئەكەر خوارنا وی یاب زەحمەت بیت د شێت گویز و گوهیشك و بەڕویا ژی بخۆت.

جۆتبوون و زاوزێ ل مەهێن تیرمەهـ و گولانێ یە، ٧- ٨ هەیڤا ئاڤس دبیت، بهار و نیسانێ تێژكا دكەت.

ل سەرتاسەری جیهانی زۆر بازار یێ ل سەر پیستی وی هەی لەورا نێچیرا وی یا بەردەوامە.

درێژاهیا وی: (٤٠- ٥٠سم).

درێژاهیا كوریا وی (٢٠- ٢٥سم).

كێش (١-٢كگم).

## ٢. گیانەوەرێن گیاخورێن كویڤی(صمدار):

### خەزال(مامز):

**ناڤ ب عەرەبی، الغزال**

**ناڤ ب ئینگلیزی،** Goitred Gazelle

**ناڤێ زانستی،** Gazella subgutturasa

گیانەوەرەكێ شیردەرە، سێ جۆرێن وان ل عیراقێ (ریمREEM و جوازی JOWAZI و دەشتی Dushty) هەنە، یا گرنگ ل دەڤ مە جۆرێ سێ یە كو دبێژنێ (خەزالا دەشتێ)، خۆجهیا وێ دەشتا



هەولێرێ و كەركووكێ یە، د كەڤندا ل دەشتێن پارێزگەها دهۆكێ وەك دەشتا سێمێلێ، سلێڤانەیی، پێشابیرێ، زاخۆ، قەسرۆك، شێخان و بەردەرەش ب رێژەكا بەرچاڤ هەبوون، ناڤەراستا سالێن هەشتیيان گەلەك جارا دهاتنە دیتن كو ئەفسەرێن سوپایێ عیراقێ ب هەلیكوپترا و ب تایبەت ل دەشتا سێمیلێ دگرتن و دكوشتن، نها ژی ب رێژەكا كێم ب تایبەت ل دەشتا بەردەرەش هەنە، ئەڤ جۆرێ خەزالێ یێ بەرنیاسە ب كەلەخەكێ لێكدای و حولی و بریقەدار و دگەل هەبوونا دەست و پێیێن زراڤ و ماسولكە شدیای و جۆتەكێ شاخێن درێژ و تیژ، ئەڤ جۆرێ خەزالا گیا و پیش و پەلەخ و دان و دكاك خۆرە.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل مەهێن تەباخ و ئیلولێ یە و دەمێ ئاڤسبوونێ ٥- ٦ هەیڤن، ل نیسان و گولانێ دزیت، زۆربەی جارا ئێك تێژك د هینیت.

### پەز و بەرانێ كیڤی:

**ناڤ ب عەرەبی، الكبش البری (الوعل الاحمر- الخروف البری)**

**ناڤ ب ئینگلیزی،** Wild Sheep

**ناڤێ زانستی،** Ovis ammon

ئەڤ جۆرێ گیانەوەری شیردەرە و د خۆجهیا خۆدا ل جهێن گەلەك بلند و ئاسێ و كەڤر و بەرێن مەزن ل بلنداهیێن بلند دا د ژین و پتریا خوارنا وان بەلگ و ڤیڤی و بەرهەمێ دارێن بلند و ئەوێن ل جهێن ئاسێ دا شین بن وەك كەزان و هورمیك و گوهیشك و گرسك و هژیر و....هتد.



ئەڤ گیانەوەرە د کەڤن دا گەلەك پێ مشەبوو، ل هەمی دەڤەرێن چیایی ل هەریما کوردستانی و ب تایبەت ل چیایێن دهۆکێ وەکی گارە و مەتین و گەلەك چیایێن دی، گەلەك جارا د کەتە بەر بیسێن نێچیرڤانا و دکوشتن و شاخێن وان یێن مەزن و درێژ و بادای و ستوور ب سەرەدەرێن خو ڤە د هەلاویستن وەك دەربرینەك ژ زیرەکیا نێچیرڤانی، چونکی کوشتنا وان یا ب زەحمەت بوو ژ بەر کو خۆ نا شۆرکەتە دەشتێ و جهێن راست و ب ساناهی.

نێر بەرنیاسە ب جۆتەکێ شاخێن درێژ و گروڤر و ستوور و شکەستی و چەمیای بۆ ژ ناڤدا بۆ پشتێ، درێژاهیا وان ژ(٨٠-٩٠) سم لێ ل گیانەوەرێ مێ چ شاخ نینن.

کەلەخێ وان گەلەك مەزنە و نێزیك(٤٥-٨٠کگم) و دەست و پێ د ستوور و پەحنن، بۆ خۆ گرتن و هاڤێتن ژ کەڤرێن بلند و مەزن هەروەسا د بێ دوینگ و هوری ژی نینە.

لەشێ مێ داپوشیە ب پویرتەکێ رەنگ پیڤازی سەر ب سور ڤە ل زڤستانان و ڤەبووی ل هاڤینان و بن زك رەنگێ سپی یە و ل نێری رەنگێ پویرتی سۆرێ ڤەبووی و سەرو چاڤ و پێشیا دەست و پییا و هەردو کێلەك ب خیچەکا ب رەنگێ رەشی و هندەك پنێن سپی ل پشتێ و زك سپی یە.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل دوماهیکا پاییزێ دەست پێ دکەت و دەمێ ئاڤسبوونێ (٦) هەیڤن و سالێ جارەکێ ل مەهێن نیسان و گولانێ دزین و زۆربەی جارا ئێك یان دو بەرخێن کویڤی دهینیت و زۆربەی جارا ل

شکەفتێن بلند و ئاسێ تێشکێن خو ددانیت.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (١٤٠-١٥٠سم).

بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٧٥-٨٢سم).

درێژاهیا کوریێ (١٠-١١سم).

کێش (٤٥- ٨٠کگم).

## نێری و بزنا کویڤی( بزنا چیایی):

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی، الماعز البری( العنز الجبلی، الوعل الجبلی)**

**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی،Wild Goat**

**ناڤێ زانستی،Capra aegagrus**

گیانەوەرەکێ شیردەرە لێ ژ بلی دەڤەرا بارزان نها زۆر یا ب زحمەتە ئەڤی جۆرێ بزنێ ببینی ب تایبەت ل چیایێن نێزیکی بازێرێ دهۆکێ بەلکو دبیت ب رێژەکا کێم نها ئەڤ جۆر ل چیایێن گارە و مەتینی و چیایێن سنووری ناڤبەرا کوردستانێ و ترکیا دا بێنە دیتن، ژبەر کو گەلەك زەرەر و زیان یاب ژینگەهێ کەفتی ژ لایەکی ڤە و نێچیرا بەردەوام ژ لایەکێ دی ڤە، هەژی ئاماژێ یە د کەڤن دا گەلەك ژ ڤان بزنا ل چییایێن پارێزگەها دهۆکێ و بازێرێ دهۆکێ بخۆ دهاتنە دیتن.

ئەڤ جۆرێ گیانەوەرێ د خۆجهیا خۆدا ل جهێن گەلەك بلند و ئاسێ و کەڤر و بەرێن مەزن ل بلنداهیێن بلند دا دژین و پتریا خوارنا وان بەلگ و ڤێڤی و بەرهەمێ دارێن بلند و ئەوێن ل جهێن ئاسێ دا شین دبن وەکی کەزان و هورمیك و گوهیشك و گرسك و هژیر و....هتد.



كەلەخێ نێر یێ وان گەلەكێ مەزنە و نێزیكی (٤٠-٩٥كگم) و نێر یێ بەرنیاسە ب دو شاخێن ستوور و درێژ و بادای و فرهە و پەحن ب سەر پشتێ دا درێژبووی هەنە و هندەك گرۆڤرك (بازنە) ل دۆرماندۆری شاخی هەنە، درێژاهیا وان د گەهیتە (٤٠-٦٠)سم و مێ بچویكترە ب كەلەخی ڤە ژ نێری و بەرنیاسە ب دو شاخێن بچویكتر ژ نێری و تیژ و باریك و بادانی نەك پەحن، كو درێژاهیا وان دگەهیتە (١٠-٢٠سم) و دەست و پێ د ستوور و پەحن بۆ خۆ گرتن و هاڤێتن ژ كەڤرێن بلند و مەزن.

لەش ب پویرتەكێ درێژ و گەوەرێ ڤەبووی داپوشی یە ل هاڤینا و ل زڤستانا گەورێ تاری و ل نێری هەبوونا هندەك خیچێن رەشێ تاری ل ستۆی و پشتێ و سەر پێیا و كێلەكا.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل پاییزا دەستپێ دكەت و دەمێ ئاڤسبوونێ (٦) هەیڤن و هندەك جارا دبیتە (٦,٥) هەیڤ و سالێ جارەكێ ل دوماهیكا نیسان و سەرێ گولانێ دا دزێن و زۆربەی جارا ئێك یان دو كارێن كویڤی دهینیت و زۆربەی جارا ل شكەفتێن بلند و ئاسێ تێشكێن خۆ ددانیت.

درێژاهیا كەلەخی ل گەل سەری (١٠٠-١٦٠سم).

بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٥٠-٩٠سم).

درێژاهیا كوریێ (١١-١٦سم).

كێش (٤٠-٩٥كگم).

**شفر:**

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی: الایل - الیحمور (ظبی الغیاض)**

**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی: European Roe Deer**

**ناڤێ زانستی: Capreolus capreolus**

گیانەوەرەكێ شیرەدەرێ سڤك و زراڤ و حولی یە و پویرتێ وی یێ كورت و نەرم و حولی یە و گەورێ ب سۆری ڤەیە، سەروچاڤ دگەورن و جۆت شاخێن درێژ و چەق چەق درێژاهیا وان (٢٣-٢٥)سم) ل نێری لێ چ شاخ ل مێ یا دا نینن.

سەر دوماهیك دهێن ب پارچەكا رەش ل سەر دەڤ و دفنا و لێڤ سپی نە و پویرتێ سەر و ستوێ نێری درێژە لێ ل مێ دا ل دەمێ جۆتبوونێ وەك كوریێ داڤەكا موی درێژ دبیت.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل مەها ئەیلولێ یە و دەمێ ئاڤسبوونێ (٩) مەهن و زۆربەی جاران ئێك تێژك یان كێم جارا جۆتەكی بینیت.

**ژینگەها جوگرافی:** دهێتە زانین كو ئەڤ گیانەوەرە ل سەر ئاستێ هەمی جیهانی مەترسییا ژ ناڤچونێ یا ل سەر هەی و ژ بەر كێم بوونا وی زۆر یێ ب زحمەتە بێنە دیتن بۆ زانین ل دەڤەرا بارزان ل سالا ٢٠١٣ چەندەك ب روون و ئاشكرایی هاتینە دیتن و وێنە بۆ هاتینە گرتن. ئەڤ گیانەوەرە د كەڤندا ل گەلەك جها ل پارێزگەها دهۆكێ هاتبوو دیتن و نها زۆر كێم بوویە و تاكو نهو نە هاتییە دیتن و ل سەرێ چیا و جهێن ئاسێ و تێر دارو بار و گژوگیا و بەر دهێتە دیتن، پتریا خوارنا وان بەلگ و فیقی و بەرهەمێ دارێن بلند و ئەوێن ل جهێن ئاسێ دا شین دبن وەكی دارمازی و بەرِوی و دار كەزان و هورمیك و گوهیشك و گرسك و هژیر و....هتد.

درێژاهیا كەلەخی ل گەل سەری (٩٠-١٣٥سم).

بلنداهیا ملا ژ ئەردی (٦٠-٧٥سم).

درێژاهیا كوریێ (٢-٣سم).

كێش (٢٠-٣٥كگم).

**بەرازێ كویڤی:**

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی: الخنزیر البری**

**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی: Wild Boar**

**ناڤێ زانستی: Sus scrofa**

گیانەوەرەكی شیرەدەرە خودان چوار دەست و پێ یە و سمدارە و (دو سم) هەنە ل هەر دەست و پێ یەكی و سەرێ وی ب ملیڤە نوسیایە ئانكو ستوكور نینە و لمبیسەكا(دفن) درێژ هەیە بۆ هەلكۆلینا ئەردی و هێرش كرنا سەر مرۆڤ و گیانەوەرا و خودان لەشەكێ ب هێز و مەزنە و تژی یە، دەست ژ پیا درێژترن و خودان سەرەكێ مەزن و شۆر و چەمیای بۆ

خوارێ و ل دەمێ ب ڕێڤەچوونێ پیچەكێ بلند دكەت و ڕەنگێ پویرتی ڕەشێ ب سۆرێ تاری ڤە و چەند بەرەڤ وەرزێ زڤستانێ ڤە دچیت پویرتێ وی بۆش و پتر لێ دهێت، ل گیانەوەرێ گەهشتی و مەزن دێ بینی قەفتەكا مویێ كەڤەرێ ڤەبووی و درێژ ل سەر پشتا وان ژ ستوی ڤە درێژ دبیت بۆ سەر پشتێ.

جۆتبوون ل وەرزێ پاییزی دبیت ژ چریا ئێكێ تا كانوونا ئێكێ و ماوەیێ ئاڤسبوونێ ٣ هەیڤن دشێت ٢-١٢ تیشكا بكەت و تێژكێن وان د بچویكن و پویرتەكێ نەرم و نازك و كورت یێ هەی، د سالا ئێكێ دا و تاكو ژیێ وان د بیتە ٦ هەیڤ شیرێ دەیكا خۆ دخون.

ژینگەها جوگرافییا وی ل سەرانسەری عیراقێ و كوردستانێ و پاریزگەها دهۆكێ ل وان جهێن كو زەڤیێن چاندنێ و گەڕ و رووبار و جۆبێن ئاڤێ و كژۆگیا و قەرەم و لەڤەن و شهـ و تەراتی لێ هەی دژیت، پتر ب شەڤی ب شێوەیێ كۆم كۆم ژ ١٠ بەرازێن نێر و مێ ژ جهێ خۆ دەردكەڤیت و یا ژ هەمیا مەزنتر ب عەمری ڤە (مێ) سەركێشیا وان دكەت و ل دۆرماندۆر یێن نێر پاراستنا وان دكەن، و زۆربەی ژیانا وی ل ناوچێن چیایی و ل بەر لێڤێن رووبارێن ئاسێ و ب زەحمەتە و ل نێزیكی زەڤیان ل دەمێ گەهشتنا دەرامەتی وەك باجان و پتات و سێڤ بن عەرد و سێڤ و خۆخ و گوندۆر و باجان ڕەشك.....هتد. بەراز زەرەرو زیانێن مەزن د گەهینیتە زەڤیێن چاندنێ و بەرهەمێ وان.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل چریا ئێكێ دەست پێ د كەت و دەمێ ئاڤسبوونێ (٥) هەیڤن و ژ ٦-٩ تێژكا ل دەستپێكا بهارێ دا دكەت و ئەگەر خوارن و گەش و هەوایەكێ گونجای هەبیت دەلیڤە هەیە سالێ دو جارا بزێت.

دریژاهییا كەلەخی ل گەل سەری (١٠٠-١٧٠سم).

بلنداهییا ملا ژ ئەردی (٨٥-٩٠سم).

درێژاهییا كوریێ (١٧-٣٠سم).

كێش (٨٠-١٣٠كگم).

## كێرویشكا كویڤی(كیڤرویشكا گەور):

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی، الارنب البری الاوروبی (الارنب البری)**

**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی،European Hare**

**ناڤێ زانستی،Lepus europaeus**

گیانەوەرەكێ شیردەرە، دهێتە نیاسین ب سەرەكێ بچویك و جۆت گوهێن درێژ و دوماهیك تیژ، و دوماهیكا وان ب ڕەنگێ ڕەش دهێن و پویرتەكێ درێژ و نەرم و ب ڕەنگێ گەور ڤەبووی و نێزكێی سپی و كورییەكا تێر پویرت و بەرەڤ ڕەشی ڤە ژ پشتێ ڤە و سپی ژ بنڤە و دەست و پێ كورتن.

ژینگەها جوگرافییا وی ل سەرانسەری عیراقێ و كوردستانێ و پاریزگەها دهۆكێ ل وان جهێن كو زەڤیێن چاندنێ و گەڕ و رووبار و جۆبێن ئاڤێ و كژۆگیا ژ لایەكی ڤە و ژ لایەكێ دی ڤە ل چیا و دۆل و نهال و زەڤیێن تێر پویش و پەلەخ دژیت، بۆ زانین كێرویشك ل گەل ژینگەها خۆ ڕەنگێ خو دگهۆڕیت، ئانكو دەمی پیش و پەلەخ ل دەشتی بیت ڕەنگێ وێ وەكی وێ ژینگەهێ لێ دهێت تاكو بشێن خۆ ب پارێزیت، ژ بەرهندی دێ بینی ل پێش چاڤێن مرۆڤی ژ ناڤ تراشەكێ یان قەفتەكا پیش و پەلەخی دەركەت و بازدا بێی تۆ هزر بكەی كو ئەڤە جهێ هەبوونا كێرویشكێ یە، خوارنا وان هەمی فێقی و دەرامەت و ڕهێن داری یە وەكی گوندۆر و باجان و سێڤ ..... هتد.

زاوزێ و جۆتبوونا وێ ل مەها كانوونا ئێكێ و تاكو كانوونا دووێ یە و یا مێ ٤٢-٤٣ رۆژا دمینیتە ئاڤس



و ژ ١-٧ تێشكا دكەت و شیان هەنە سالێ ٣-٤ جارا ئاڤس بیت.
درێژاهیا كەلەخی ل گەل سەری (٤٠-٦٨سم).
بلنداهیا ملا ژ ئەردی( ٩-١٨سم).
درێژاهیا كوریێ (٦-١٣سم).
كێش (٢-٦كگم).

## بنەمالا لەتكەرا (القوارض)

**سڤۆرە:**
**ناڤ ب زمانێ عەرەبی، السنجاب القوقازی (السنجاب الفارسی)**
**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی،Caucasian Squirrel**
**ناڤێ زانستی،Sciurus anomalus**

سڤۆرە ل زۆربەی وەلاتێن جیهانێ هەنە ب تایبەت ل وەلاتێن ئەفریكا باشوور و ئەمریكا و ئاسیا و زۆربەی وان رەنگێ گەورێ تاری و زەرێ ڤەبووی و سۆرێ سەرب گەوری ڤە یە و ل هندەك وەلاتا پتر تاری دبیت. كوردستان ژی ئێك ژ وان وەلاتانە كو یا پرە ژ سڤۆرا، ب تایبەت ل ناڤ زەڤیێن پری دار بەڕوی و ل زۆربەی وان چەم و بیستانا هەنە ئەوێن پری دار گویز و باهیڤ و خۆخ و حولیك و توی.



سڤۆرە گیانەوەرەكێ دهێتە نیاسین ب كوریەكا درێژ و تێر پویرت كو درێژاهیا وێ د گەهیتە ٥٠-٨٠٪ێ ژ كەلەخێ وی و پویرت یێ نەرم و نازك و تێرە و رەنگێ وی سۆرەكێ گەورە، چەند بەرەڤ پشتێ ڤە بچیت گەورتر لێ دهێن و چەند بەرەڤ زك و دەست و پیا ڤە بچیت سۆر ب سەر پرتەقالی ڤە دچیت و دەست كورتترن ژ پییان و یێ بەر نیاسە ب سڤك ب رێڤەچون و خو هاڤێشتنێ ل ناڤ بەرا و چەقێن دارا و ئەردی.

ژینگەها جوگرافیا وی ل سەرانسەری عیراقێ و كوردستانێ و پارێزگەها دهۆكێ هەنە، ب تایبەت ل وان جهێن كو چیا و دۆل و نهالێن پری دار بەڕوی و كاژ و مازی وگویز و باهیڤ، هەروەسا ل ناڤ چەم و بیستان و زەڤیێن پری دار فێقی، چونكی خوارنا وان هەمی فێقی و بەڕوی و دان و ڕهێن گیایە، لێ حەزا وان پتر ل سەر گویز و باهیڤ نە.

درێژاهیا كەلەخی ل گەل سەری (١٩٠-٢٥٠ملم).
درێژاهیا كوریێ (١٢٠-١٨٠ملم).
كێش (٣٠٠-٤٥٠گم).

**سڤورێ رەش:**

سڤورێ رەش ئێكە ژ گیانەوەرێن بنەمالا (قوارض) یێن شیردەرە، بەرنیاسە ب سڤكی و زیرەكی و رێك و پێكی و خودان كوریەكا درێژ و پری پویرت و دو چاڤێن دیار و گوهێن گرۆڤر و زۆربەی جارا ب سڤكی و بەزاتی ب سەر دارا دكەڤیت و دشێن ل سەر ئەردی و د ناڤ پیش و پەلەخی دا ژی ب بەزیت.

كێشا سڤورێ پێكەهشتی نێزیك(١٣٠-٤٨٠) گرام و یێن نوو ژ دایك بووی (٨-١٢) گرامە، یا مێ سالێ جارەكی یان دو جارا دزێن و هەرجارەكێ(٢-٦) تێشكا دهینیت و دەمێ ئاڤسبوونی(٣٦-٤٥) رۆژن.

تشتی سەیر و ئەنتیكە ل ڤێرێ ئەوە كو ل كوردستانێ ئەڤ جۆرێ سڤۆرەی یێ هەی لێ یێ كێمە، ب تایبەت ل دەڤەرا ئامێدیێ و سیلاڤ و قەدشێ



و دبیت ل چیاییێ گارەی و مەتینی و دەڤەرا بەرواری بالا هەبیت، ئەڤ جۆرێ سڤۆرەی تا نها ل کیشوەرێ ئاسیا نەهاتیە توومارکرن و چەند سڤۆرەك ژ وی رەنگی ل باغچێ گیانەوەرا ل دهۆکێ هەنە.

**زۆربوون و زاوزێ:** ل دوماهیکا زڤستانێ یە و دشێن سالێ دوجارا بزێن، دەمێ ئاڤسبوونێ ٦ هەفتەنە (٤٠-٤٥) رۆژ و سڤۆرە د شێن ٣-٦ تێژکا بینیت.

## سیخور:

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی: الشیهم ( الدعلج)**

**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی:** Indian Crested Porcupine

**ناڤێ زانستی:** Hystrix indica

مەزنترین جۆری گیانەوەرێن لەتکەرە (القوارض)، کەلەخەکێ مەزن و بەرچاڤ و ئاشکرا و تەمەت پشیکەکێ یە، زۆر یێ مشەیە و پویرتێ وی رەنگێ گەورێ تاری و داپۆشی یە ب چیخنێن (زلێن) تیژ و درێژ و ب رەنگێ رەش و سپی و ئەڤ چیخنە(زختك) باشتر ل دەمی هێرشکرنێ و بەرگری کرنێ ژ خۆ دەمێ خۆ قژ دکەت دیار دبن، ڤان چیخنا (زختکێن) تیژتر ژێ دەر دکەڤن و بژالە دبن ل دۆرماندۆری سیخورە و زەرەر و زیانێ پێ د گەهینیتە دوژمنێ خۆ.

ل گەل هەبوونا پویرتەکێ تژی و درێژ ل ل سەر سەری و ستۆی و ملا و هەبوونا خیچەکا رەنگێ سپی ل بن حەفکێ.

ژینگەها جوگرافیا وی ل سەرانسەری عیراقێ و کوردستانێ و پاریزگەها دهۆکێ ل وان جهێن کو چیا و دۆڵ و نهالێن پری کژوگیا و شینکاتی هەنە، هەروەسا ل ناڤ چەم و بیستان و زەڤیێن پری ڤێقی و شینکاتی و شەهدار کو پری ڤێقی و زەرزەوات و رهێن گیای هەنە.

**زۆربوون و زاوزێ:** جۆتبوون ل دەسپێکا بهارێ دەست پێ دکەت و دەمێ ئاڤسبوونێ ٦٠ رۆژن و د شێن ٢-٤ تێژکا بکەت، ب کێشەیا مشکەکی و ئێکسەر چچکێن دەیکا خو دمێژن و زلپتکێن وان ل دەمێ بوونێ د هاتینە.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٥٥٠-٨٥٠ملم).

درێژاهیا کوریێ (١١٠-١٣٠ملم).

کێش (١٠-٢٠کگم).

## مشکێ مالێ (مشکێ ناڤ خانیا)

**ناڤ ب زمانێ عەرەبی: الفأر المنزلی (فار البیوت)**

**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی:** House Mouse

**ناڤێ زانستی:** Mus musculus

گیانەوەرەکە کوریەکا درێژ دهێتەنیاسین بو تێر پویرتتر ژ مشکێن کویڤی و پویرت یێ نەرم و نازك و رەنگێ وی گەورەێ ڤەبوویە و چەند بەرەڤ زك و دەست و پیا ڤە بچیت ڤەبووی تر لێ دهێن و کەلەخ بچویك و سەرێ درێژ و دەر و دفن تیژ و دیار و بەرچاڤ و دو گوهێن کورۆڤر و چاڤ دیار.

ژینگەها جوگرافیا وی ل سەرانسەری عیراقێ و کوردستانێ و پاریزگەها دهۆکێ ل وان جهێن کو پتر مرۆڤ و هاتن و چوون و خوارن رێتن و هاڤێشتنا بەرمایکێێن خوارنی لێ هەی، وەکی سەر گویفك و زبلخانە و بەر دیوار و جهێ رێتنا خوارنێ و کۆگەهێن قویتی و کۆگەهێن ناڤ مالا یێن دان و دکاکی، هەروەسا ل بەر لێڤێن رووبار و جوبێن ئاڤی و گەرکێن ئاڤێ کو ژێدەرێن خوارنێ لێ هەنە.

**جۆتبوون و زاوزێ:** د هەمی وەرزێن سالێ دا مشك جۆتبوون و زاوزێ دکەن و دەمێ ئاڤسبوونێ ٢١ رۆژن و هەر جارەکێ ٧-١٠ تێژکا دکەت و د شیان دا هەیە سالێ (٨) جاران ئاڤس بیت و ب زێن.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٧٠-١٢٠ملم).

درێژاهیا کوریێ (٧٠-١٠٠ملم).

کێش (١٢-٣٠گم).



**جوردێ گەور:**
**ناڤ ب زمانێ عەرەبی: الجرذ البنی (الجرذ النرويجي)**
**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی: Brown Rat**
**ناڤێ زانستی: Rattus narvegicus**

گیانەوەرەکە دهێتە نیاسین ب کەلەخەکێ ب هێز و درێژ و دفنەکا نە درێژ و دیار و کوریەکا درێژ کو ژ درێژاهیا کەلەخی زێدەتر نە بیت و پویرتەکی تژی و رەق و زڤر و رەنگێ گەورێ تاری و تۆخ ل پشتێ و کێلەك و رەخا و پویرتێ بن زکی و دەست و پیا ڤەبووی ترە و هندەك جارا ڤی جوردی ب رەنگەکێ رەشێ تاری ژی د بینن، ئەڤی جوردی سەرەکێ مەزن و جوت گوهێن گروڤر و تیر پویرتێ نەرم و دو چاڤێن دیار هەنە.

**ژینگەها جوگرافیا وی:** ل سەرانسەری عیراقێ و کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ ل وان جهێن کو جهێ ئاکنجیبوونا خەلکی یە و ل دۆرماندۆری مال و بیستان و زەڤیێن دەرامەتی و ل بەر لێڤێن گەرکێن ئاڤێ و رووبارا کو دان و دکاك وەك خوارن بۆ لێ هەیە و یێ بەرنیاسە ب کۆلانا کەنالا ل بن ئەردی دا و ئاخێ ل بەردەرێ کونێن خۆ کۆم دکەت.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (١٩٠-٢٩٠ملم).

درێژاهیا کوریێ (١٧٠-٢٢٠ملم).

کێش (٢٥٠-٥٠٠گم).

## بنەمالا گیانەوەرێن کویڤی یێن مێشومۆرخۆر:

**ژویژی:**
**ناڤ ب زمانێ عەرەبی: قنفذ ابیض الصدر**
**ناڤ ب زمانێ ئینگلیزی: Southern White-breaated Hefgehog**
**ناڤێ زانستی: Erinaceus concolor**

دهێتەنیاسین ب کەلەخەکێ مام ناڤنجی و پویرتێ وی یێ گەورێ ڤەبووی و پری زلپتکێن تیژ و سەرێ گوروڤر و دفنەکا درێژ و سەرێ وێ رەش، هەروەسا بن زك و بن حەفك ب پیرتەکێ سپی گەورڤە داپۆشی یە.

ژینگەها جوگرافیا وی ل سەرانسەری عیراقێ و کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ ل وان جهێن کو چیا و دولّ و نهالێن پری دار و درەخت هەیین هەروەسا ل ناڤ زەڤیێن پری داروبار و ل زۆربەی چەم و بیستانان و زۆر یێ مرۆڤ دۆستە، لێ ل دەمێ مەترسیا هێرش برنێ ل سەر هەبیت خۆ تێك وەردکەت و هەمی زلپتکێن خۆ بۆ خو پاراستنێ ژ دوژمنی ڤیچ دکەت.

ل دەمێ زڤستانێن دوور و درێژ ژویژی بۆ ماوەیێ ٥-٦ مەها دچیتە د کریارا سربوونێ دا.



خوارنا ژویژی ل سەر مێش و مۆر و کرم و هێکێن هشکئاڤی و خشۆکانە، هەر وەسان ل سەر بالندێن بچویکە و باهرا پتر خوارنا خو ب شەڤ ب دەست خوڤە دهینیت.

**زاوزێ و جۆتبوون:** ل سالێ جارەکی و ب تایبەت ل وەرزێن بهار و هاڤینا جۆت بوون چێدبیت و دەمێ ئاڤسبوونێ ٣٠-٤٠ رۆژا ڤەدکێشیت، یا مێ د شێت سالێ جارەکێ تا دو جارا ئاڤس ببیت.

درێژاهیا کەلەخی ل گەل سەری (٢٥-٣٠سم).

کێش (٣٠٠-١٠٠٠گم).

**بزن مشك:**

گیانەوەرەکێ تەمەتی پشیکەکێ یە و چوار دەست و پێ هەنە و تبل و نینۆك درێژە و کوریا وی نێزیك مەترەکێ یە، ل دەشت و زەڤی و جهێن چەراندنا مەروماڵاتی دا دژیت و گوهانێن بزنا دمێژیت و ناڤێ وی ژ هندێ هاتیە.

ژینگەها جوگرافیا وی ل سەرانسەری عیراقێ

و کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ ل وان جهێن کو دهینە بکارئینان وەك جهێ بێهنڤەدان و مەخەل و شەڤینا تەرش و کەوالی.

## کۆما گیانەوەرێن خشۆك:

**ناڤ ب عەرەبی: الزواحف**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Reptiles**

ئەڤ جۆرێ گیانەوەرا و ل دووڤ ناڤێ وان کو خۆ ل سەر ئاخێ(ئەردی) دخشینن و هندەکا دەست و پێ پێڤە هەنە وەکی مارگیسك و کویسەلە، لێ هندەك د بێ دەست و پێ نە و خۆ ل سەر ئەردی دخشینن وەکی ماری، پتر ژ ۷۰۰۰ جۆرێن گیانەوەرێن خشۆکا ل سەر رووبێ ئەردی چ ل سەر ئاخێ یان د ناڤ ئاڤێ دا بژین هەنە و هەرێما کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ بێ بەهر نینە ژ ڤان جۆرە گیانەوەرا، بەلکو چەندین جۆر و رەنگ ژ ڤان خشۆکا هەنە و چەندین جۆر ب بوورینا سالا ئەو دەرد و ستەما ل ژینگەها کوردستانێ هاتییەکرن ژ تێکدان و کیمابارانکرن و سۆتنا ئاقار و کۆزو پاوانان بوویە ئەگەرێ ژ دەستدان و نەمانا گەلەك خشۆکان.

ئەڤێن ل خوارێ ژی هندەك نموونە نە ژ گیانەوەرێن ل پارێزگەها دهۆکێ هەین ژ کۆما گیانەوەرێن خشۆك:

### کویسەلە:

**ناڤ ب عەرەبی: السلحفاة**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Turtles**

دهێتە هژمارتن ژ کەڤنترین گیانەوەرێن سەر رووبێ ئەردی ب تایبەت ژ کۆما خشوکا، کویسەلێ ل کوردستانی ب رەنگەکێ گشتی ژ جۆرێ کویسەلێ دێمی یە هەرچەند هندەك ژ ژیانا خۆ دناڤ ئاڤێ دا دبەت و هندەك جارا د بێژنە ڤی کویسەلێ دێمی (کویسەلێ فیل) چونکی پێ و دەستێن وی د کورت و ستوور و ب تبلا دوماهیك دهێن ئانکو وەکی دەست و پێن فیلی نە، کویسەلێ کوردستانێ وەکی هەمی کویسەلێن جیهانێ یێن دێم ب کاڤلانەکی یان



کلۆخەکێ هەستی یێ رەق و قایم و هەمی لەشی داپوشی پێکدهێن کو پێکهاتییە ژ هەستی ستوور و کەڤنار و رەق و ئاسێ کو ل دەمێ هەبوونا ترس و ڤەشارتن ژ نەیار و درندە و هەر تشتەکێ نە چاڤەرێکری ل دۆرماندۆری وی خۆ د ڤی کاڤلانی دا ڤەدشێریت و دەما خۆ دبن ڤی کلۆخکی ڤە ڤەدشێریت چەندین درب و گرانی و هێز نەشێن کارتێکرنێ ل لەشێ وی بکەن و ل دەمێ چ مەترسی ل سەر نەبیت ب شێوەکێ ئازادانە سەر و دەست و پێ و لەش دیارن و دشێن ماوەکێ زۆر درێژ بژیت کو هندەك جارا دگەهیتە نیزیك ۱۵۰ سالان.

کویسەلێ کوردستانێ وەکی هەمی کویسەلێن دێمی ددان نینن، بەلکو دەڤەکێ درێژ و خۆش بۆ برین و پارچەپارچەکرنا خوارنێ هەیە، هەروەسا بۆ ب رێڤەچونێ زۆر یێ رەحەتە و هێدی هێدی ب رێڤە دچیت.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل دەمی زاوزێ بوونی یا مێ عەردی دکۆلیت و کۆرکەکێ چێدکەت بۆ دانانا تاکو ۱۷ هێکا و پشتی هێککرنێ وان هێکا بۆ دەمێ ۳-۸ هەیڤا ب جهـ دهێلیت و ئەو بخۆ هێکێ د شکێنن و دبنە تێژگ و دەردکەڤن و ژیانا خو دبەنە سەری، لێ هەردەم نێچیرەکا ب ساناهی نە بۆ بالندا و خشۆکێن دی وەکی ماری.

کویسەلە ل هەمی جیهانی دژیت، ل جهێن گەرم و سار و هشکاتی و شهدار و هندەك جۆرێن هەین د دەریا و زەریا دا دژین، لێ جیاوازییا دەست پێیا

دگەل ییێ دێمی هەنە كو شوینا تبلا وەكی پەحنكا دەستی نە بۆ مەلەڤانیكرنێ.
خوارنا كویسەلەی بریتی یە ژ گژوگیا و فێقی و زەرزەواتی كو ب دمێ خو یێ تیژ و خۆش دبریت و پرت پرت دكەت.

**كمكمە (مارگیسك):**

**ناڤ ب عەرەبی، الوزعة( أبو بریص)**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Gecko**

چەندین جۆرێن كمكما هەنە ل جیهانی كو د گەهنە نیزیك(٦٠٠) جۆرا و كوردستان و پاریزگەها دهۆكێ ئێك ژ ڤان پارچێن ئەردی یە كو چەند جۆرێن ڤان كمكما لێ هەنە، ژوانان جۆرێن دناڤ دار و بارا دا دژین، و ییێن ل جهێن خیز و ئاخ و كەڤر و تەحتە بەرا دژین، و ییێن ل بەر كاشخانكا و ناڤ مال و عومبار و جهێن دەرامەتی و گەلەك جهێن دی و دژین و تۆ دشێی ل جهەكێ بتنێ زێدەتر ژ چەندەكا ببینی.
دیتنا ڤان جۆرە گیانەوەرا پیچەكێ ب زەحمەتە، چونكی پتر ب شەڤ دەردكەڤن دەمێ ل دووڤ خوارنا خۆ د گەرن كو ل سەر مێش و مۆران د ژین.
دەست و پێێن وان ب چوار تبلێن درێژ ب دوماهیك دهێن كو خو ب هەمی تشتاڤە د گریت و درێژاهییا كمكمەی ژ (٧-١٥) سەنتیمرا نە .
ل دەمێ زاوزێ سالێ جارەكێ یا مێ هێكا(١-٣) هێكا دكەت و ئەڤ هێكە ب درێژاهییا (٢-٣) مەها د بنە تێژك.



**كمكمێ چاڤدێر:**

**ناڤ ب عەرەبی ، التنین المراقب**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Komodo Dragon-**

**ناڤێ زانستی ، Varanus komodoensis**

ئەڤ گیانەوەرە (كمكمە) ئێك ژ گیانەوەرێن خشۆكە، درێژیا وی نێزیكی (٤) میترانە و گۆشت خۆرە و مێش و مۆر و بالندە و خشۆك ومشك و مار و گەلەكێن دی و هندەك جاران فێقی ژی دخۆن.



**- ئەڤ وێنە ژ ئالیێ ئوسمان باجلۆری ڤە ل دەڤەرا بجیلی هاتییە گرتن**

گەلەك یا هەستیارە بۆ دۆرماندۆری خو و هێك كەرە و نیزیك ٣٠-٣٥ هێكا ل بن ئاخێ دا دكەت و ڤەدشێریت، ئەڤ خشۆكە ژ وان خێزانانە كو ل جیهانێ گەلەك یێ كێم و د بنیاتدا دا ل ئەندونیسیا خۆجهە و نها گەلەك كێم بوویە و ب زحمەت ل هندەك جها بێنە دیتن. و نها مەترسییا ژ ناڤچونێ ل سەر هەیە و د رێكەفتنا سایتس (رێكەفتنا جیهانی یا نەهێلانا بازرگانی كرن ب گیانەوەر و رووەكێن كویڤی) ل لیستا ئێك دا یە.
ل سالا (٢٠٠٧)ێ ل گوندەكێ ناحیا بجیلێ سەرب ڤەزا ئاكرێ ڤە ژ نشكەكێ ڤە ژ لایێ تیمەكێ رێڤەبەریا مینا ل دهۆكێ دەمێ كارێ رووپیڤێ دكر هاتە دیتن. لێ دووڤچونەكا بەردەوام ژ ئالیێ سازیێن زانستی ڤە بۆ نەهاتەكرن و نە هاتەتوومارکرن.

**مار:**

**ناڤ ب عەرەبی : الحية (الثعبان، الافعی)**

**ناڤ ب ئینگلیزی، snake**

مار ژ گیانەوەرێن خشۆکە و دەست و پێ پێڤە نینن و ل سەر زکی خۆ دخشینیت و ب هێزا گڤاشتنێن ماسۆلکێن زکی ب رێڤە دچیت، زۆربەی مارا دو کێلبێن درێژ و تیژ ب پەحنکا سەری یا دەڤی ڤە هەنە و ل دەمێ پێڤەدانێ ژەهر درژتە ڤان کێلبا و ب دوژمنێ خۆ ڤەددەت.

مارێن کوردستانێ سالێ جارەکێ کەڤلێ خۆ (پیست) دگهۆرن و ل هاڤینا جۆت دبن و زاوزێ د کەن و هەر جارێ (٥-١٢) هێکا دکەت و نێزیك ١٢-١٥ سالا دژین (تەمەنی) ئەگەر نە ئینە کوشتن.

چەندین جۆرێن مارا ل کوردستانێ و ب تایبەت ل پارێزگەها دهۆکێ هەنە وەکی (مارێ رەش، کورەمار، هەسپە مار، مارێ ئاڤی، تیرەمار، و مارێ جنجلوك، مارێ ب زەنگل و گەلەکێن دی) و هەر ئێك ژ ڤان جۆرە مارا رەنگ و درێژی و پانی و کێش و شێوازێ خوارن و هاتن و چون و رێژەیا پێڤەدانا دوژمنێ خۆ و مەترسیا وی ل سەر نێچیرا وی جیاوازە، بۆ نموونە مارێ رەش وەسا ژ باب و باپیرێن مە هاتییە زانین کو مرۆڤ دوستە و ب کەسێ ڤەنادەت، بتنێ ئەگەر هاتە ئازراندن یان تۆرەکرن د شێت بەرگریێ ژ خۆ بکەت، لێ هەسپە مار و کۆرەمار ب سەهم و هەیبەتن و دیتنا وان یا ب ترسە ژ بلی کو ژەهراوان ژی ل دەمێ پێڤەدانێ یا دژوارە.

زۆربەی مارێن هەرێما کوردستانێ سەرێ وان سێ گوشەیی نە، دو کێلبێن ب پەحنکا دەڤی ڤە هەین



کو ل دەمی پێڤەدانێ پری ژەهر دبن و درژیتە برینا نێچیرا خۆ.

بۆ ل دووڤ گەریانا خوارنا خۆ زۆربەی جاران مار ب شەڤ و ل دەمێ ڤێنکاتی دەردکەڤیت و خوارنا وان بریتی یە ژ مشك وبەق و جورد و بالندە و ...هتد، ب رۆژ ژی مار ێ ل جهێن نەپەنی و سیبەر نڤستی یە.

## کۆما گیانەوەرێن هشکئاڤی:

**ناڤ ب عەرەبی، البرمائيات**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Amphibians**

بریتی نە ژ گیانەوەرێن جۆرێ برپرەدار و پیستی وان ب پیلەکا (الحراشف) داپۆشی یە و د ژیانا خۆدا ل هشکی و د ناڤ ئاڤێ دا ژین و ل سەرتاسەری جیهانێ نیزیك ٣٢٠٠ جۆرێن ڤان گیانەوەرا هەنە، هەرێما کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ نموونەکا زۆر باشە بۆ دیتنا ڤان جۆرە گیانەوەران، وەکی بەق و خەجخەجۆك و .....هتد ، ئەڤ گیانەوەرە ل دەمێ جۆتبوونێ زۆربەی وان نێر و مێ پێکڤە قەستا ئاڤێ دکەن بۆ دانانا هێکا و هندە جۆر ل ناڤ جهێن شەهدار و تەر ژی ددانن، ئانکو ژ دەرڤەی ئاڤێ و ئەڤ هێکە پشتی دهێتە تروکاندن، گیانەوەرێن بچویك ژێ دەردکەڤن، ماوەیەکی دناڤ ئاڤێ دا ژیانا خۆ د بەنە سەری و پاشی پیچپیچە دەردکەڤنە سەر هشکاتیێ، زۆربەی وان درێژاهیيا وان نێزیك ١٥-٢٠ سم و کێشا وان نێزیك ٦٠گم.

ئەڤێن ل خوارێ ژی هندەك نموونە نە ژ گیانەوەرێن ل پارێزگەها دهۆکێ هەین ژ کۆما گیانەوەرێن هشکئاڤی:

**بەق:**

**ناڤ ب عەرەبی، الضفدع**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Frog**

ئێک ژ گیانەوەرێن هشکئاڤی یێن هێك و مەلەڤانیکەر د ناڤ ئاڤێ دا و ل دێمی یان ب رێڤەچوون یان ب لۆڤا ب رێڤە دچیت و هندەك جۆرێن وان

دشێن ب سەر دار و کێرات و لەڤەن و گژ و گیایێن ستوور ب سەرکەڤن.

**جۆتبوون و زاوزێ:** ل دەمێ بهارا یێن نێر ب شێوەکی کۆم کۆم، کۆم د بن و ب دەنگێن جوان سترانێن جۆرا و جۆر دبێژن داکو یێن مێ ب نك خۆڤە بکێشن و جۆتبوونێ ل گەل بکەن و ل دەمێ جۆتبوونێ یێ نێر یا مێ هەمبێز دکەت و ل پشتا وێ سویار دبیت تاکو یا مێ هێکا دکەت و هەردەم د ناڤ ئاڤێ دا دادنیت، پاشی یێ نێر ئێکسەرە وان هێکا د تروکینیت و ئەڤ هێکە تاکو دەردکەڤن یێن ل ناڤ تویرکەکێ شەمایی دا داکو ئاڤ نەبەت.

زۆربەی جۆرێن بەقا ل سەرانسەری جیهانێ د بەلاڤن و ل هەرێما کوردستانێ و دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ ب هەمی جۆرێن خۆڤە د ناڤ ئاڤێن کێم و بۆش و ل بەر لێڤێن رووبار و سەروکانی و گەرکێن ئاڤێ و ل ناڤ گژوگیایی دا دژین و ژ گیانەوەرێن گۆشت خۆرە، خوارنا وان زۆربەی جارا مێش و مۆر وتەڤنپیرك و کولی و مێری و مشەخۆرێن د ناڤ گەرکێن ئاڤێ دا یە کو ب رێکا ئەزمانێ خو یێ درێژ نێچیرێ دکەت، و ل زۆربەی دەمێ، سالێ ب تایبەت ل دوماهیکا بهار و هاڤینا دەردکەڤیت، ژ جۆرێن بەربەلاڤ ژی بەقا گەور و بەقا کەسك (بەقا سەیدا) و کێشا وان ل دووڤ جۆرێ وان جیاوازە.

درێژاهیا زۆربەی جۆرێن بەقا د ناڤبەرا ٥-١٠ سم و ناڤبەرا ٤-٥ سالا د ژین و دوژمنێ سەرەکی یێ بەقا گیانەوەرێن وەکی مار و بالندە و پشیك ...هتد.



- **خەجخەجۆك (بویکا بارانێ، بویکا ئاوێ، سەلەمەندەرێ کوردستانێ):**

**ناڤ ب عەرەبی: سمندل الماء**
**ناڤ ب ئینگلیزی: Newt**
**ناڤێ زانستی: Urmia Salamander (Neurergus crocatus)**
**Kurdistan Newt (Neurergud microspilotus)**

**جهـ** ل دەستپێکی وەکی زانایێن بایولوژی دیاردکەن کو دزڤریتە ڤە بۆ کوردستانێ و ب تایبەت ل باژێرێ ئورمیێ ل ئیرانێ و ژبەر هندێ ب ناڤێ ئورمیێ هاتییە ناڤکرن لێ ئەڤرۆکە زانایێن بایولوژی گرنگی یەك دایە ڤی گیانەوەری و نها مەترسیا ژ ناڤچونێ ل جیهانێ ل سەر هەیە و د ناڤ لیستا ژمارە (٢) یا کەفتنا ریسایتس دا یە (لیستا گیانەوەرێن مەترسییا ژ ناڤچونێ ل سەر هەی)، دهێتە زانین کو ل هەر چوار پارچێن کوردستانی ب زۆری دهێتە دیتن ب تایبەتی د سەروکانیا و رووبارێن ئاڤا تەزی و ئاڤێن نە گەلەك بۆش، پارێزگەها دهۆکێ ئێك ژ وان جهێن گرنگە بۆ دیتنا ڤی جۆرە گیانەوەری، لەورا پارێزگەها دهۆکێ بوویە جهێ سەرنجا راکێشانا زانایێن بایولوجی مینا زانایا بایولوژی یا ئیرانی (ئیلناز نەجەفی) ل زانکۆیا ئیجە یا تورکی، کو شیا بۆ ماوەیێ ٧ رۆژا ب رێبەریا رێکخراوا کوردستان بۆ پاراستنا مافێن ئاژەلی و ب هاریکاریا فەرمانگەها ژینگەها دهۆکێ شیاین چەندین جهان دەستنیشان کەن و ڤی گیانەوەری ببینن و توومارکەن، وەکی ئاڤ و ئاقارێ گوندێن تاژیکا و گەرەگو و گارەی و کای و رووبارێ بیاوا و قدش و چەندین جهێن پارێزگەها دهۆکێ، ژلی بارزان و حاجی ئومەران و گەلەکێن دی.

ئەڤ گیانەوەرە ژ گیانەوەرێن هشك ئاڤی یە لێ ژ خشۆکا دهێتە هژمارتن، چونکی دەما د ناڤ ئاڤێ دا نەبیت خۆ ل سەر ئەردی دخشینیت و ژ بنەمالا بەقا یە و باهرا پتر ژ ژیانا خۆ د ئاڤێ دا دبەتە سەری و کوریەکا درێژ و دو دەست و دو پێ و ل دەستا چوار تبل و ل پیا پێنج تبل هەنە، نێر نیزیکی (١٢-١٥سم) و



مێ (١٣-١٨سم)نە، مێ د شێت نێزیکی ٥٠٠ هێکا بکەت، و ل هەمی وەرزێ سالی، لێ باشترین دەم بهارە و یێ نێر بەرپرسیارە ژ کاری تروکاندنا هێکا.

زۆربەی گیانەوەرا رەنگێ رەش و پنیێن زەر لەش داپوشی یە و لەش هەردەم یێ تەر و نویسەکە و ژەهرەکێ دەردکەت داکو خۆ ژ دوژمنێن خۆ ب پارێزیت، لێ ل دەمێ دەستکرنێ زیانێ ناگەهینیتە مرۆڤی، لێ هەردەما مرۆڤی دەست کرێ و پشتی هینگێ کرە چاڤێن خۆ بێ شویشتن دێ زیانێ گەهینیتە چاڤێ مرۆڤی، خەجخەجۆك چەند پیرتریت پیستێ وی رەقتر و زڤرتر لێ دهێن و تاکو پتر ژ (٢٠) سالا وەکی مە دیتی دژیت.

چ سەلەمەندەر یێ ئاڤی بیت یان یێ دێمی، پێدڤی ب ئاڤ و شەهـ و تەراتیێ هەیە بۆ پاراستن ژ هشکبوونێ، لەورا هەردەم تو د شێی خەجخەجۆکان ل ئەردێن تەر و شهدار و گژوگیایێ پر ئاڤ و خوناڤ ببینی و چ جارا ل بەر حەتاڤ و گەرماتییا رۆژێ نابینی.

ژ خاسیەتێن ڤی گیانەوەری دەما تبلەك یان پارچەك ژ کوریا وی ژێڤەدبیت ب هەر ئەگەرەکێ بیت، پشتی بوورینا دەمی جارەکادی شین دبیت، خوارنا وی ژی گیانەوەرێن بچویکێن ناڤ ئاڤێ دانە وەکی مێش و مۆر و زیندەوەرێن بچویك و ب ئەزمانێ خۆ یێ درێژ دگریت کو یێ نویسەکە و پاشی ب پەحنکا دەڤێ خۆ دهێریت و دادعویریت، و وەکی زۆربەی خشۆك و هشکئاڤیا ل زڤستانێ سر دبیت.

## گیانەوەرێن بێ برِبرِە:

**ناڤ ب عەرەبی: اللافقريات**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Invertebrate**

٩٧٪ێ ژ گیانەوەرێن سەر روویێ ئەردی کو ل ناڤ دەریا و زەریادا دژین ژ ڤێ مالێ نە و دهێنە نیاسین ب گیانەوەرێن بێ برِبرِا پشتی و دابەش بن ل سەر چەندین بنەمالێن بچویکتر، وەك گیانەوەرێن ئیسفەنج و گیانەوەرێن کرمی و جومکداران و ئێك خانەیی و ......هتد.

## بەلاتینك:

**ناڤ ب عەرەبی: الفراشة**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Butterfly**

بەلاتینك دهێنە هژمارتن ئێك ژ جوانکەرێن سرۆشت و ژینگەهێ و دلخۆشکەرە بۆ دیتنا چاڤا، ژ گیانەوەرێن بنەمالا جومکدارێن بێ برِبرِی و ژ کلاسا مێش و مۆرێن چەنگ وپەرداردارە.

ل سەرتاسەری جیهانێ زیدەتر ژ ١٥٠٠٠٠ هزار جۆرێن بەلاتینکا هەنەو دابەشکری نە ل سەر دو کۆمێن مەزن، کۆما بەلاتینکێن رۆژێ کو ب رۆژ دەردکەڤن و چالاکن و جموجۆلەکا باش دکەن وکۆما بەلاتینکێن شەڤێ کو ب شەڤ دەردکەڤن و چالاکن.

هەمی وەلاتێن جیهانی و ل هەمی جهـ و ژینگەها د ژین ب تایبەت ل دەشت و بلنداهیا و کوردستان و پارێزگەها دهۆکێ ژی ئێك ژ وان ژینگەهێن هەرە باش و گونجایە بۆ ژین و ژیارا ب دەهان جۆرێن بەلاتینکا.

ل ناڤ سرۆشتی کوردستانێ دا ب دەهان جۆرێن بەلاتینکێن رەنگاورەنگ و جۆراوجۆر و بچویك و مەزن دهێنە دیتن، بگرە ژ بەلاتینکێ سپی و سۆرێ تاری و رەش و زەر و نقچك نقچك و بەلاتینکێن مەزن و بچویك...هتد.

هەمی لەش و چەنگێن بەلاتینکا ب هندەك پەرکێن بچویك داپۆشیاینە و ئەڤ پەرکە ل دەمی دەستکرنا بەلاتینکا هندەك تۆزێ ل سەر دەستی مرۆڤی د هێلن و ئەڤ پەرکە ب شێوەیێن جیاواز ل

دووڤ جۆر و رەنگێ بەلاتینکا داپۆشینە و رێکخستی نە و رەنگی دەتە بەلاتینکی ب شێوەیەکێ جوان.

بەلاتینك ژ گیانەوەرێن مفادارە ژ بۆ ژینگەهێ چونکی تۆزێ ل گەل خۆ د هەلگریت ژ گولەکێ بۆ گولەکا دی.

درێژی : ژ ٣مم تاکو ٢٥ سم.

ژیی: بەلاتینك د ناڤبەرا رۆژەکێ تاکو ٦ مەها و پتر دژیت.

ژ گیانەوەرێن هێککەرە و ژ ٥٠-١٠٠٠ هێکا ل سەر بەلگێن گژ و گیای و شینکاتێ دکەت.

خوارن: بەلاتینکێن بچویك و تێژك گژوگیای دخۆن لێ بەلاتینکێن گەهشتی پتر ئاڤرێژا ڤەدخۆن.

مەترسی: مەترسیەکا مەزن ژ ئالیێ بالندە و شیردەرێن بچویك ڤە ل سەر هەیە.

**شەیتانۆك:**

**ناڤ ب عەرەبی: الحلزون**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Snail**

ئێك ژ گیانەوەرێن بنەمالا نەرمۆکان - گیانەوەرێن نەرم و بێ هەستی کو پێکدهێن ژ کەلەخەکێ زۆر نەرم د ناڤ قەلپیچکەکێ (قەلغانەکێ) رەق دا، ڤێ قەلغانی ل دەمێ هەر مەترسییەك ل سەر هەبیت ژ ئالیێ دوژمناڤە ب کار دهینیت، هەروەسا ڤێ قەلغانی بۆ پاراستن ژ سەرما و گەرمێ ل هاڤین و زڤستانا ب کار دهینیت، دیسان ژ هشکاتیا دژوار و دەمێ هەست ب مەترسیێ د کەت دچیتە د ژوورڤەی قەلغانی و پەردەکا جیلاتینی ل بەر دەرگەهی دا



چێدکەت کو کەس نەزانیت یێ تێدا و یێ ساخە.

شەیتانۆکی دو جۆتێن هەستێپکەرا یێن هەین (جۆتەکێ درێژە و چاڤ ب دووماهیکێ ڤەنە بۆ دیتنێ و جۆتەك کورتە وەك دەست و پێ و دفن ب کاردهینیت بۆ هەست پێکرنا هەرتشتەکی ل بەرامبەر و ب رێڤەچوونێ و بێهنکرنێ و ل دەمێ ب رێڤەچوونێ هندەك ئاڤا نویسەك وەك گلیزی ژ لاشێ خو دەردکەت بۆ ب ساناهی ب رێڤەچوونێ و ل دەمێ زڤرینا ڤە ئەو ماددە وەك نیشان هشك د بیت و ب رێکا وی د زانین کیشکە مالا وی.

شەیتانۆك ل هەمی وەلاتێن جیهانێ هەنە و ب تایبەت ل کوردستانی و پاریزگەها دهۆکێ چەندین جۆر و رەنگ هەنە و زۆربەی زۆرا وان ل سەر ئەردی و ب داراڤە د چن و ل وان جهێن تەر و رێژا شەهێ زۆر لێ هەی وەکی بەر رووبار و زەڤیێن چاندنێ و دارستانێن تێر دار و گژ و گیا و شەهدار هەروەسا ل ناڤ باغچێن مالا ب مشە د هێنە دیتن ژ بەر رێژا شەهێ و تەراتیا گیا و هەبوونا گولا ل ناڤ باغچێن مالا دا.

درێژایی یا وی ژ ١-٥ سم و نیزیك ٥٠ گراما گرانی یە و سێکا گرانیا وان ژ قەلپیچکی یە.

**زاوزێ و جۆتبوون:** شەیتانۆك ژ وان گیانەوەرێن نێرەمۆکە، ئانکو هەمان دەم دا نێر و مێ یە لێ ل دەمی زاوزێ و جۆتبوونێ پێدڤی یە دو گیانەوەر بن، ئێك ببیتە نێر و یێ دی ببیتە مێ بۆ جۆتبوونێ و زۆربەی جارا سالێ ٥-٦ جارا زاوزێ د کەن و هەر جارێ (٥٠-٨٠) هێکا دکەن و هێکێن خۆ د ئاڤێ دا یان ل بن کەڤرەکی د دانن و پشتی جووتبوونێ هەر ئێك بەرڤ رێکا خۆ دچیت.

خوارنا شەیتانۆکا ل سەر ڤێقی و کەسکاتیێ چاندنێ یە، لەورا زۆر زەرەر و زیانێ د گەهینیتە خەلکی ژبەر تێکدان و خوارنا ڤێقی و زەرزەواتێن وان.

شەیتانۆك نێچیرەکا زۆر ب ساناهی یە بۆ مرۆڤی و لێدانا ترومبێلا و زۆربەی گیانەوەرێن وەك بالندە و خشۆك و لەتکەرا و بەقان و....هتد خوارنا وان ل سەر ڤان شەیتانۆکانە.

**كێفژاله:**

**ناڤ ب عەرەبی: السرطان**

**ناڤ ب ئینگلیزی: crab**

ژ بنەمالا جومكدارانە و پێنج جۆتێن پیا هەنە، جۆتێ پێشیێ یێ هاتییە گهۆرین بۆ دو كێلبا كو وەكی مەقەسەكێ یان موچینكەكی بۆ گرتنا نێچیرا خۆ و خوارنێ و بەرگری كرن ژ خۆ ب لەقدانا دوژمنێ خۆ بكار دهینیت و زكێ وی یێ بچویكە و لەشێ وی ب كاڤلانەكی ستوور داپوشی یە.

كێفژاله ل هەمی وەلاتێن جیهانی هەیە و دبیت پتر ژ ٣٥٠٠ جۆرا ل سەرتاسەری جیهانی هەبن و كوردستان ژی ئێك ژ وەلاتێن خوجهە بۆ دیتا كێڤژالا، ب تایبەت ل دۆرێن رووبار و كانیێن ئاڤێ و جهێن تێر گژوگیا و هەناسا خو دكەت ب وەرگرتنا ئوكسجینی د ناڤ ئاڤێ دا نەكو یێ ژ دەرڤە و هندەك جارا خۆ بلندكەتە جهێن هشك وەك سەربەر و كەڤرا و بن بەلگ و قورمێن دارا و د وی دەمی دا دیسان ئوكسجینی حەلیای د ناڤ ئاڤێ دا ئەوێ هەلگرتی ل گەل خۆ بەری ژ ئاڤێ ب دەركەڤیت بكار د ئینیت.

كێڤژاله د شێن ژ ناڤبەرا ٣- ١٢ سالا بژیت، ئەو ژی دمینتە ل سەر ئاڤ و هەوای و بارودۆخێن گونجای ل دۆرماندۆرێ وی ژ خوارن و ڤەخوارن و گەرم و سەرما و دوژمنكاریا مرۆڤی و گیانەوەرا ب تایبەت بالندەیێن گۆشتخۆر.

كێڤژاله ل سەر ماسیێن بچویك و بەق و كرم و هەمی زیندەوەرێن وەك مێش و مۆر د ناڤ ئاڤێ دا دژیت ب تایبەت ئەوێن مری و هەردو كێلابێن پێشیێ بۆ گرتنا نێچیرا خو ب كار دهینیت.

كێڤژاله ژ گیانەوەرێن هێككەرە و ب شێوەكێ بەر چاڤ و زۆر زێدە دبیت، ئانكو هندەك كێڤژالێن مێ دشێن تاكو ٤٠٠٠٠ هێكا د ئێك دەم دا بكەت لێ زۆربەیا وان ژ ئالیێ گیانەوەرێن دی ڤە دهینە خوارن.

**كولی:**

**ناڤ ب عەرەبی: الجراد**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Locust**

بریتییە ژ گیانەوەرەكێ بێ بربرە یێ كوچبەرێ درێژۆك كو جۆتەكێ پەر و جۆتەكێ پێێن درێژ و جۆتەكێ سمبێل و جۆتەكێ دەستێن كورت هەنە و شیانێن فرینا دوور نینە، لێ قۆناغ بۆ قۆناغێ بێهنا خۆ ڤەدەت، ب سەدان جۆرێن كولیا ل سەرتاسەری جیهانێ هەنە، وەكی كولیێن مەزن و بچویك و كەسك و ل گەلەك مللەتا بۆ خوارنا مرۆڤی ب كار دهێن.

هەرێما كوردستانێ و ب تایبەت پارێزگەها دهۆكێ ب زەڤی و دۆل و نهال و چیاێن خۆڤە باشترین نموونەیە بۆ دیتنا چەندەها جۆرێن كولی ب تایبەت كولی یێ بچوك و یێ مەزن و یێ كەسك(سەیدا).

كولی دهێنە هژمارتن خرابترین دوژمنێن دەرامەتی، ب تایبەت دەخل و دانی، نەمازە دەمێ ب كۆم كۆچبەریێ دكەن و ل دووڤ خوارنێ دگەرێن كو هندەك جارا پتری چەندین مەلیون كولیا پێكڤە دەست ب كاروانێ كۆچبەریێ د كەن، لەورا هندی دەرامەتێ بكەڤیتە بەر سینگێ وان دخۆن و د قوسینن و زەرەر و زیانێ پێ دگەهینن.

درێژاهیا هندەك ژ وان ١سم، وەكی كولیێ زەڤیا و یێ هندەكا د گەهیتە ٥سم وەكی كولیێ كۆچبەر و جۆتبوون و زاوزێ ل هاڤینێ دەست پێ د كەت و ل وەلاتێن، ڤێنك ل هەمی دەمێن سالێ، و هەر كولیەكا مێ(١٠-٩٠) هێكا دكەت.

ل دەمێ هاتنا دەرامەتی ب هەمی رێكا ب تایبەت رەشاندنا دەرمانێن قركەرێن مشەخۆرا جۆتیار هەول ددەن دەرامەتێ خو ژ كولی ب پارێزن.

**سەرتەشیك:**

**ناڤ ب عەرەبی: اليعسوب**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Dragonfly**

ئێكە ژ گیانەوەرێن بێ بربرا پشتێ یێن گۆشتخۆر، زۆر جوان و رەنگا و رەنگ و ل هەمی وەرزێن سالێ ب تایبەت ل بهار و هاڤینان ل سەر لێڤێن كانی و رووبار و ل سەر گولێن رەنگاورەنگ د هێنە دیتن، گیانەوەرەكی بێ دەنگێ نەرمە و دشێت بفریت و ب چەندین نمایشێن پەهلەوانی دشێت رابت و روینیت بێی كو ماندیبوون ل سەر دەست و پێ و پەرێن وی دیاربیت.

کوردستان و پارێزگەها دهۆکێ ئێکە ژ وان جهێن ب ساناهی سەرتەشیك لێ دهێته دیتن.

ئەڤ گیانەوەرە د ئاڤێ دا و ل سەر بەلگێن دارایێن هنداڤ و د ناڤ ئاڤێ دا نیزیك ٦٠٠ هێكا د كەت و هێك د ئاڤێ دا دتروكیت و تەشتەشیكەكا بچویك پەیدا دبیت.

سەرتەشیك دهێنە هژمارتن ژ باشترین نێچیرڤانێن مێش و مۆر و مشەخۆرا ل هنداڤی كانی و رووبارا.

درێژاهیا وان نێزیك ١٠سم و جۆتبوونا نیر و مێ ل دەمێ فرینێ ل هەوا یە و د شێن ١-٥ سالا بژیت، لێ زۆربەی تەشتەشیكێن گەهشتی و پیر ل پاییزا دمرن.

## خالخالۆك:

**ناڤ ب عەرەبی: الدعسوقة**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Ladybird**

گیانەوەرەكا جومكداری زۆر جوان و رەنگا و رەنگە و بەرچاڤە و ل سەرتاسەری جیهانێ ب تایبەت ل ناڤ بیستان و گولخانە و پاركێن گشتی و باغچێن مالا ب تایبەت ئەو جهێن گولێن جۆرا و جۆر لێ هەین د هێنە دیتن، گیانەوەرەكێ زۆر بەربەلاڤە و ب ساناهی د هێنە دیتن چونكی بارا پتر ب رەنگێ سۆر و زەر و پرتەقالی یە و نقچكێن رەش ل سەر پشتا وێنە و سەرێ وێ یێ رەش و جوانە، بۆ مرۆڤی و زەرەر و زیان بەخش نینە و زۆر یێ بەرنیاسە ژ ئالیێ زارۆكاڤە، هەروەسا ئێكە ژ پاراستنكەهێن سرۆشتی و ب تایبەت پاراستنا دار و درەخت و جۆرێن شینكاتی و ب تایبەت گولا، چونكێ خالخالۆك ل سەر وان مشەخۆر و مێش و مۆرێن بچویكێن زیانبەخش ئەوێن ل سەر بەلگ و گولێن دارودرەختی دژین دژیت و دخۆت، ئانكو هەمی دارودرەخت و شینكاتیا ژ مشەخۆرا پاقژ دكەت.

خالخالۆك بۆ دویراتیێن نێزیك د شێت بفریت، چونكی جۆتەكێ پەرا یێ هەی و ل وەرزێ زڤستانێ سر دبیت و ب شێوەیێ كۆمكۆم ئێكو دو تاكو بهارێ دگرن.



**جۆتبوون و زاوزێ:** ل بهارا ل دەمێ جۆتبوونێ یا مێ بێهنەكێ ژ لاشێ خۆ دەردئێخیت كو یێ مێ پێ بۆ جۆتبوونێ ئاگەهدار كەت و پشتی جۆتبوونێ دەست ب هێكرنێ دكەت و پشتی هێكرنێ ئێكسەر د مریت، هەژمارا هێكێن د كەت د ناڤبەرا ١٠٠-٣٠٠ هێكانە، ل سەر چەندین بەلگێن دارا یان گولا وەكی كۆم دكەت و هەر كۆمەكا هێكا نێزیكی ٥٠ هێكا بخۆڤە د گریت، پشتی بوورینا چەند هەفتەیەكا تێكێن جوان و رەنگاورەنگ ژ هێكا دەردكەڤن و رۆژ بۆ رۆژێ مەزن د بن تاكو د بنە خالخالۆكەكا گەهشتی.

درێژاهیا خالخالۆكێ ٤-١٠سم و نێزیك سالەكێ دژیت وپشتی هینگێ دمریت.

## مێش

**ناڤ ب عەرەبی: الذبابة**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Fly House fly**

بەربەلاڤترین جۆرێ گیانەوەرێ جومكدارە ل سەرتاسەری جیهانی ل سەر روویێ ئەردی و كارتێكرنێ ل هەمی گرێێن ژیانی د كەت، چ ژ ئالیێ نەرەحەتی و پێڤەدان و ئێشاندن و نە ئاراما خەلكی ب تایبەت ل دەمێ خوارنێ و نڤستنا مرۆڤی و چ ل دەمێ ڤەگوهاستنا چەندین نەخۆشیێن ترسناك و كوژەك مینا ڤەگوهاستنا نەخۆشیا تیفو و كولێرا و گەلەكێن دی.

ئێش و ئازارا دگەهیتە مرۆڤی ب رێكا لمبیسا وێ یا درێژ و تیژ كو ل دەمێ لەقدان و پێڤەدانێ بكار دهینیت و د ناڤ لەشی دا د بەتە خوارێ و خوینا مرۆڤی دمێژیت، هەروەسا مێژتنا ماددەیێ شەكرى د

ناڤ خوارنا مرۆڤی دا وەردگریت و پیس د کەت.

مێش د شێت بفریت و درێژاهیا وی نێزیکی ٦سم و ژیێ وێ نێزیك ٩٠ رۆژانە و دمریت، ئانكو زۆربەی مێشان ل زڤستانێ دمرن.

مێشا مێ هێکا دکەت و هەرجارێ نێزیکی ١٥٠ هێکا و زۆربەی جارا ل سەر خوارنا مرۆڤی د دانیت، و پشتی بوورینا ٨ دەمژمێرا ب هاریکاریا گەرماتیا دەوروبەرا د تروکن و مێشێن نوی پەیدادبن.

چەندین جۆرێن مێشا ل گۆرەی خوارنا وێ هەنە، وەکی مێشا ناڤ مالێ کو ل سەر خوینێ و ماددەیێن شەکری دژیت کو ژ خوارنێ وەردگرن و جۆرێ مێشا شین کو ل سەر پیساتیا گیانەوەرا د ژیت و مێشا کەرمۆز کو ل سەر مێشومۆرێن بچویك دژیت.

### مێشا هنگڤینی:

**ناڤ ب عەرەبی: النحلة**

**ناڤ ب ئینگلیزی: Bee**

ژکەڤندا مرۆڤی مێشا هنگڤینی بخودان کریە و مفا ژێ دیتیە ژ بۆ ب دەستڤەئینانا هنگڤینی، مێشا هنگڤینی ئێکە ژ گیانەوەرێن جومکدار ب شێوەیەکێ کۆم کو دبێژنێ (شلخا مێشێ) و جڤاکەکێ تێگەهشتی و رێکخستی و رێك و پێکە د رێڤەبرنا ژیانا خو دا بێ پەیدابوونا ئاریشە و ئاستەنگا.

شلخا مێشا هنگڤینی مالا خو د قورمێ دارەکێ دا یان ل بنە کەڤرەکی یان تەحتە بەرەکێ ئاسێ یان د دەرزە و پەڤەکا دوربە کەڤرەکی یان بەرەکی دا ل چیا و دۆل و نهالا د دانیت، و مرۆڤ شیایە ڤێ شلخێ ب دەست خوڤە بینیت و د ناڤ سەلەمیشکادا یان سندۆڤا دا ل مال یان ل ناڤ باخچە و بیستانا بخودان بکەت.

مێشا هنگڤینی بخۆ شانا خۆ و هێلیڤانکا خۆ چێکەت کو پێکهاتیە ژ سەدەها هزار شانێن شەش لای کو هەمی وەك ئێك نینن، هندی شانێن مەزن بۆ مێشێن شاژنانە و هندی شانێن بچویکن بۆ مێشێن رێنجەر و کارکەرانە و بۆ کۆمکرن و هەلگرتنا هنگڤینی نە.

ژیانا مێشا هنگڤینی زۆر یا رێکخستی و رێك و پێکە و هەر ئەندامەکێ خێزانی کاری خو یێ دیارکری هەیە، بۆ نموونە کارێ شاژنێ بتنێ هێك کرنە و کارێ مێشێن نێر بتنێ فساندنا شاژنێ یە و مێشێن دی کو د مێ نە هەمی رێنجبەر و کارکەرن ب هەمی کاروبارێن مالێ را دبن وەك پاقژکرنا شانێ و گهۆرینا بای و ئامادەکرنا خوارنا شاژنێ و کۆمکرن و هەلگرتنا هنگڤینی و دەرگەڤانی و پاسەوانیا شانێ.

درێژاهیا شاژنێ ٢٢مم و یا نێرا ٢٠ مم و یا کارکەر و رێنجبەرا ١٦ مم و ژێن شاژنێ نێزیك ٧ سالانە و یێ نێری ٤-٥ هەیڤانە و یێ کارکەر و رێنجبەرا ٦-٨ هەیڤن.

**جوتبوون و زاوزێ:** جووتبوونا نێر و مێ پتر ل بهارێ یە و ل دەمێ فرینا وان ل ئەسمانی و پشتی ڤساندنا نێری ئێکسەر دمریت و شاژن دێ دەست ب هێکرنێ کەت، پشتی بوورینا ١٠ رۆژا و هەر چرکەیەکێ هێکەکێ د کەت و د ژیێ خۆدا شاژن نێزیك مەلیون هێکا د کەت و هەر هێکەکێ د شانەکا جودادا ددانیت.

ل دەمێ پەقینا هێکی و دەرکەفتنا مێشەکا هنگڤینی یا نوی یا گەهشتی، شاژن پێدڤی ب ١٥ رۆژانە و یا نێر پێدڤی ب ٢٤ رۆژا نە و یا مێ (کارکەر) پێدڤی ب ٢١ رۆژانە.

خوارنا مێشا هنگڤینی ل سەر مێژتنا ئاڤ و خوناڤ و شریناهیا گولانە ب تایبەت پشکوژکێن گولا لێ مێشێن ژ نوی ژ دایك بووین ل سەر خوارنا شاژنێ د ژین ٣-٤ رۆژێن دەسپێکێ، ئەو مێشێن د بنە شاژن ل سەر هەمان خوارن د مینن لێ یێن دی وەك کارکەر و رێنجەرا خوارنا هنگڤینی و شریناهیا گولا دخۆن.

دوژمنێ سەرەکی یێ مێشا هنگڤینی بالندەیە، ب تایبەت کولکولی و زرکێتك و ستنگ و هرچ و ئەو بخۆ نە یا دوژمنە و ئەگەر هەست ب ترسێ نەکەت چ جارا ب کەسێ ڤەنادەت، لێ ل دەمێ پێڤەدانی ئەو دەرزیکا د کوریا وێ را بۆ پێڤەدانا دوژمنێ خۆ بکاردهینیت و پشتی هینگێ دمریت.

**زركێتك:**
**ناڤ ب عەرەبی: الزنبور**
**ناڤ ب ئینگلیزی: Hornet**

گیانەوەرەكی جومكداریێ بێ برپرەیە، بەربەلاڤە ل سەرانسەری جیهانێ و ل هەرێما كوردستانێ، ل پارێزگەها دهوكێ زۆر دهێنە دیتن چونكی ئاڤ و هەوایێن زۆر دگونجاینە بۆ گەشە و وەرار ڤی گیانەوەری، ئەڤ جومكدارە یێ بەرنیاسە ب پێڤەدانەكا دژوار و فرین و دەوردان ل دۆر نێچیرا خۆ ب تایبەت مرۆڤی دەما تۆرە دكەت و نارەوەستیت و رەحەت بیت تاكو پێڤەدەت و ل دەمێ پێڤەدانێ زركێتك دەرزیكا ب سەرێ كوریا خۆڤە ب كاردهینیت و دەرزیكا خۆ ژ دەست نادەت بەلكو د سەرێ كوریا وێ را دمینیت.

زۆربەی زركێتكا ب شێوەیەكێ كۆم د ئێك مال (شانە) دا دژین وەك مێشا هنگڤینی و ل بهارا شاژن دەست ب دروستكرنا مالا خۆ دكەت كو ژ هەڤیرێ دروستكری ژ خرڤەكرنا بەلگێن دارا و ب تفا خۆ تەر دكەت. دڤێ شانێ دا شاژن هێكا دكەت و پشتی دەركەتنا وان ژ هێكێ دبنە ڤۆزاحە (یرقە) و ئەو خوارنێ ددەتە وان

ل دەمێ هێك كرنێ بتنێ شاژن كارێ وێ هێكرنە، لێ كاركەر و رێنجبەر هەمی كریارێن ب رێڤەبرنا مالێ دكەن وەكی خوارن دروستكرن و پاقژكرنا مالێ (شانێ).

بارا پتر زركێتك شانا خۆ د ڤورمێن دارا یان ل سەر چەقەكێ دارێ یان ل سەر عەردی یان ل سەر تراشەكێ دروست دكەت و درێژاهیا شانا زركێتكێ نێزیك ٢-٣سم.

هەمی زركێتكێن نێر و مێ ل زڤستانا دمرن، بتنێ ئەو یێن مێ ئەوێن هاتینە فساندن نەبن كو ئەو ژی د ئامادەنە بۆ هێككرنێ ل هاڤینێ و زاوزێ و جووتبوون ل هەیڤا ٥-١٠ و باراپتر ل دوماهیكا هاڤینێ یە و ئەڤ هێكە دێ پەقن و نێر و مێ یێن نوی دەر د كەڤن و درێژیێ ب ژیانا خو دەن و ل دەستپێكێ بخو ل جهێ دروستكرنا مالێ (شانێ) دگەرن دا شاژن شانا خۆ دروستكەت و دماوەیێ (٣٠) رۆژان دا دبنە زركێتكێن دروست.

خوارنا زركێتكا گەهشتی مژینا ئاڤ و خوناڤ و شرینیا گولانە و شرینیا فێقی وەك سێڤ و هژیر و تری، لێ خوارنا زركێتكێن كاركەر ب مێش و مۆران ڤەددەت و هشك و هویر دكەت و دكەتە خوارنەكا نەرم و گرۆڤركری و ددەتە زركێتكێن بچویك. دوژمنێ سەرەكی یێ زركێتكێ بالندەنە.

**پێشوی:**
**ناڤ ب عەرەبی: البعوض (الناموس، البق)**
**ناڤ ب ئینگلیزی: Mosquito**

ژ گیانەوەرێن جومكداریێ بێ برپرەیە و پتری ٣٠٠ جۆرێن پێشیا ل سەرتاسەری جیهانێ هەنە و مەرج نینە ب پێڤەدانێ هەمی د زیان بەخش بن و ئێش و ئازارێ بگەهینیتە مرۆڤی، پێشویا مێ ب مرۆڤی ڤەددەت و خوارنا وێ خوینا مرۆڤی یە وخوینێ ژ مرۆڤی د مێژیت و جهێ پێڤەدانێ د ئارینیت كو مرۆڤ ب خورینیت و هەلگرا چەندین نەخۆشیانە وەلێ پێشویا نێر خوینمێژ نینە بەلكو شرینیا گولا دمێژیت.

لمبیسا پێشویا مێ یا تیژ و دژوارە بۆ كونكرنا پیستێ مرۆڤی و رێتنا تفا(لێك) خۆ بۆ ناڤ لەشی داكو خوینا وی نە هشك بیت تاكو پێشوی بمێژیت، بۆ سەرنجراكێشانا پێشویا نێر بۆ جۆتبوونێ، پێشویا مێ ب جۆتێ پەرێن خو دەنگەكی دكەت.

پێشویا مێ هێكا دكەت و د دانیتە دوان ئاڤ و ئاڤەرویێن راوەستیای، وەكی گەرێن ئاڤا راوەستیای و پشتی پەقینا هێكی و دەركەتنا پێشویەكا بچویك ب سەرئاڤێ دكەڤیت داكو هەناسێ بكەت، جۆتبوون پشتی دەركەفتنا وێ ژ ئاڤێ ب ٢-٤ رۆژانە و هەر پێشویەكا مێ ١٠٠-٣٠٠ هێكا دكەت.

درێژاهیا پێشویێ ٩مم تاكو ١,٣٠ سم و ژیێ پێشویا نێر ٥ رۆژن و یا مێ پترە.

**تەڤنپیرك (تەڤنەپیرك):**
**ناڤ ب عەرەبی: العنكبوت**
**ناڤ ب ئینگلیزی: Spider**

ژ گیانەوەرێن جومكداریێ بێ برپرە یە و بەربەلاڤە ل سەرتاسەری جیهانێ، چەندین جۆرێن مەزن و بچویك

هەنە و ماددەكێ ئاوریشمی ژ دەڤێ خۆ دەردئێخیت بۆ چێكرنا تەڤنێ خۆ و باراپتر ژ تەڤنپیركا دپەڤێن دیوار و قولاچك و بەرلێڤێن تەنگ دا د ژیت و دەما هەست ب هاتنا دوژمنكاریەكێ كر خۆ بۆ شەری ئامادەدكەت و نێچیرا خۆ ب دەست و پێ و سینگی لێكدەتە سەر ئێك كو نەهێلیت مالا وێ خرابكەت.

درێژاهیا تەڤنپیركا ژ ١٧-١٥ سم و ل دۆر گۆرەی جۆرێ وی، بۆ نموونە تەڤنپیركا مەزن دگەهیتە ٢٠سم.

تەڤنپیركا مێ د شێن ٢٠٠-١٠٠٠ هێكا بكەت و ئەڤ هێكە د بنە تەڤنەپیركێن نوی.

تەڤنپیرك ل سەر مێش و مۆر و مشەخۆر و گیانەوەرێن ژ خۆ بچویكتر دا ژیت.

## دوپشك:

**ناڤ ب عەرەبی، العقرب**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Scorpion**

گیانەوەرەكێ جومكدارە و گەلەك نێزیكی تەڤنپیركێ یە ژ ئالیێ شێوازێ ژیانا وی و زۆر ب تەحەمەل ل گەش و هەوایێن گەرم و سەرما و برس و تێهناتیێ و ل سەرتاسەری جیهانێ د هێنە دیتن، ژ وان وەلاتا هەرێما كوردستانێ و پارێزگەها دهۆكێ یە كو دوپیشكێن رەش و دوپیشكێن زەر و گەور دهێنە دیتن و دژۆرن.

چوار جۆتێن پێی هەنە، كو هەردوكێن پێشیێ دوماهیكا وان ب كێلبە یا دهێن و لەشێ دوپیشكی ژ دو پارچەیا پێك دهێن پارچەیا سەرو سینگ و پارچەیا زك و كوری.



دوپیشكی چەندین جۆتێن چاڤا هەنە و زۆربەی نێچیرا خو ب شەڤ ئەنجام دەت، نێچیرا خۆ ب دەست و پیا د گریت و ڤەدگڤێشیت و ب دەرزیكەكا تژی ژەهر كو ب سەرێ كوریێ ڤەیە پێڤەددەت و زۆربەی دوپیشكا ژەهر یا هەی و دژوارن ب تایبەت دوپیشكێن رەشێن دەشت و بیابان و ناڤ گژەبەران.

درێژاهیا دوپیشكا ژ جهەكی بۆ جهەكی و گۆرەی شێوازێ ژیانا وی یێ جیاوازە د ناڤبەرا ٢-٢٣ سم دا.

دوپیشك د شێن ٢-٨ سالا بژین لێ زۆربەی جارا ب لێدانا ترومبێل و هەرفینا ئاخ و كەڤر و رامالینا ئاخێ دمرن.

زاوزێ و جۆت بوون ل هەیڤا بهارێ یە و نێر و مێ پێكڤە جۆت دبن و ئێك و دو د دگرن، دوپیشك تێژككەرە و نە هێكك كەرە، خوارنا وان مێش و مۆر و كرم و تەڤنپیرك و مشەخۆرن.

## مێروی:

**ناڤ ب عەرەبی، النمل**

**ناڤ ب ئینگلیزی، Ant**

گیانەوەرەكێ جومكدارە و چەندین جۆرێن مێرویا ل سەرتاسەری جیهانێ هەنە لێ مێرویێن سۆر و رەش پتری هەمیا ل سەرتاسەری جیهانێ بەربەلاڤن، هەمی جۆرێن مێرویا ب شێوەیەكێ كۆم و رێكخستی دژین و هەمی جڤاكێن مالا مێرویا ژ سێ تەخێن مێرویا پێكدهێن كو شاژن (ئێكا ب تنێ یە و دگەل نێری جۆت دبیت و هێكا دكەت) و مێرویێن نێر پشتی جۆتبوونێ دمرن و یێن رێنجەر و كاركەر هەمی د مێ نە، لێ ب تنێ كارێ وان رێنجەریە وەكی (جەماندن و بەرهەڤكرنا خوارنێ و گێران و پرتپرتكرن و رائێخستن و زێرەڤانیا مالێ و بەرگریكرن و شەرڤانیا دوژمنا.......هتد)

مێروی گیانەوەرێن گۆشتخۆرن و نێچیرزانێن شارەزا و زیرەكن و خوارنا وان ژ كرم و هێك و مێش و مۆر و مشەخۆرانە، هەروەسا شەكرا دان و دكاكی د مێژن و د خۆن.

درێژاهیا مێرویا ل دووڤ جۆرێ كارێ وێ دیار د بیت ژ ٢مم – ٤سم و مێرویا رێنجبەر ٤ هەیڤا و یێ نێر ٤ رۆژا و یێ شاژن دوور نینە تاكو ٤٠ سالا بژیت.

# بالندە و پەرندە
# ل پارێزگەها دهۆکێ

**بەرهەڤکرن: ئیسماعیل تاها شاهین**

کوردستان ب گشتی و پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی، ژ بەر گەلەرەنگییا ژینگەهێن ب خوەڤە گرتین، ژ دەشت و چیا و کانی و رووبار و گەر و گۆلان، جهەکی گرنگە، بۆ ڤەحەواندنا گەلەك بالندەیان. دیسا ژ بەر کو دکەڤتە ل سەر رێك و رێبارا چۆن و هاتن و مشەختبوونا گەلەك جوونێن ڤان بالندەیان، چونکو دکەڤتە د ناڤبەرا کۆمەکا وەلاتێن سارێن ژووریێ ئەوروپا و ئاسیا و کۆمەکا وەلاتێن گەرمێن ئەفریکا و ئاسیادە. گەلەك جوون و رەنگێن بالندەیان ل چیا و دەشت و رووبار و گەر و گۆلێن پارێزگەهێ چ ب رێکا مشەختبوونێڤە، چ ژی وەك خوەجهـ لێ دئێنە دیتن. ڤێ دووماهیێ چێکرنا دو سکرێن مەزن ل پارێزگەهێ بوو هاندەرەك کو هەژمارا بالندەیێن هووئاڤ (الطیور الخواصة) لێ، بەر ب زێدەهییێڤە بچت و گەلەك جوونێن دی ژی قەست بکنێ و لێ بەرووەخت بئێورن و هندەك ژی تێژکان لێ بیننە دەر و خوەجهـ ببن.

پرانییا بالندەیێن پارێزگەهێ مشەختن، سالانە دو دانێن سالێ، د ناڤبەرا رۆژهلات و نیڤەکا ئەفریکا و کوردستانێدە، هندەك ژ سەرێ بهارێ دئێن و سەرێ پاییزێ بار دکن، و هندەك ژی بەرەڤاژی، سەرێ پاییزێ دئێن و دەستپێکا بهارێ بار دکن، و هەژمارەکا دی ژی، ب رێباری ژ دەستپێکا بهارێ هەتا نیڤەکا وێ، ژ رۆژهلات و نیڤەکا ئەفریکا قەستا وەلاتێن ژووریێ کوردستانێ و رۆژهلات و رۆژئاڤایا ئەوروپا دکن. کەتەکا کێم و ب قەتلازی، ژ وان بالندەیێن بهاران قەستا پارێزگەهێ دکن، ژ رۆژئاڤایا هندستانێ و نیڤەکا ئاسیا و رۆژهلاتا ئەوروپا دئێن، و بهار و هاڤینا خوە، ل دەڤ مە دبۆرینن، و پشتی تێژك ئینانە دەرێ (دووماهییا هاڤینێ و سەرێ پاییزێ) جارەکا دی ڤەدگەرنە وەلاتێن ژێ هاتین.

هژمارا بالندەیێن د سینوورێ پارێزگەها دهۆکێدە هاتینە دیتن، بێژە (٢٨٠) بالندەنە. پێکڤە ل سەر سێ جوونان دئێنە پشککرن: (خوەجهـ)، (مشەخت)، (رێبار). خوەجهـ ئەو بالندەنە، ئەوێن هەمی دەمێن سالێ دئێتە دیتن، و جهێ خۆ بەرنادن. مشەخت دەمەکی سالێ (ژ سەرێ پاییزێ و هەتا دووماهییا بهارێ، یان ژ نیڤا هەیڤا ئادارێ و پێدە هەتا سەرێ پاییزێ یان زووتر) ب تنێ ل جهەکێ - بۆ چەرێ یان بۆ تێژك ئینانە دەرێ - دمینن و پاشێ بار دکنە جهەکی دی. رێبار ژی ئەو یالندەنە، ئەوێن ب تنێ رێکا چۆن و هاتنا خۆ ب جهەکێ دئێخن و لێ نامینن. (٢٠٥) ژ بالندەیێن پارێزگەهێ مشەختن، (٣٠) ژێ خوەجهن،

(١٠٠٠) مێگاواتان.

٢- هێلێن ڤەگوهاستنا کارەبێ (11KV) بلندترین رێژەیا درێژیێ بۆ تۆرا بەلاڤکرنێ یا کو دگەهیتە ٣٤٤٠,٢ کیلومەتران پێکدئینن ب رێژەیا (٨١,٤٩٪)ێ ژ هەموو درێژیێن وێ، هێلێن (33KV) تنێ رێژەیا (٨,٦٧٪)ێ پێکدئینن کو ب درێژێ ژ هەموویان کێمترە.

٣- بکارئینان بۆ کارێن ناڤمالێ بلندترین رێژەیا بکارئینانا ووزا کارەبێ پێکدئینت کو ب رێژەیا (٨٠,٢٢٪)ێ یە، د دەمەکیدا کو بکارئینانێن دیتر تنێ پێنجێکا وێ ووزا کارەبێ ڤەدگریت یا بۆ مەرەمێن ئابووری هاتیەتەرخانکرن.

٤- قەزا دهۆکێ ل رێزبەندا ئێکێ دهێتن ژ لایێ هژمارا پشکداران و کۆژمەیێن دهێنەدان و رێژەیا وێ دگەهیتە پتر ژ (٣٠,٦٪)ێ ژ سەرجەم پشکدارێن مفای ژ تۆرا کارەبێ ل پارێزگەهێ دبینن و (٥٣,٨٣٪)ێ ژ کرێ یێن ب دەستڤەهاتی.

٥- رێژەیا بەرزەبوونا ووزەیا کارەبێ ل سەر ئاستێ پارێزگەهێ دەمێ دگەهیتە (٣٣,٩٨٪)ێ ژ سەرجەمێ ووزەیا پێدای ل پارێزگەها دهۆکێ.

٦- ل سەر ئاستێ بەهرا تاکەکەسی ژ ووزەیا کارەبێ قەزا دهۆکێ بلندترین رێژە توومارکریە کو دگەهیتە (٢٧٢٦) کیلوواتان، د دەمێ بەراوردکرنێدا دێ بینین نێزیکێ ناڤینێ جیهانی (٢٧٣٠) کلوواتە پترە ژ بەهرا تاکەکەسی ل پارێزگەهێ (١٥٢٢)کیلووات و هەرێمێ و عیراقێ و هندەك دەولەتێن هەرێمێ و یێن نوو پێکەهشتی ژی.

## راسپاردە:

١- پێدڤیاتیا کێمکرنا رێژەیا بەرزەبوونا کارەبێ (ژدەستدانا بێ مفایا کارەبێ) پارێزگەهێ و یەکەیێن کارگێرییێن گرێدای وێ ڤە، زێدەباری پێگیریکرن ب رێنمایی و شیرەتێن مەزاختنا کارەبێ.

٢- زێدەکرنا بەرهەمێ ووزەیا کارەبێ ب مەرەما زێدەکرنا بەهرا تاکەکەسی، داکو بگەهیتە ئاستێ ناڤینێ جیهانی و یێ دەڤەرا ئوسکوا و داکو چ نەبیت دگەل بەهرا تاکەکەسی ل دەولەتێن جیران وەکهەڤ لێ بهێت.

٣- گرنگیدان ب زێدەکرنا بەهرێن تەرخانکری بۆ کار و چالاکیێن ئابووری وەك (چاندنێ، پیشەسازی و کەرتێن بازرگانی).

## ژێدەر:

١. ابراهيم خشمان هسام ، نشوان شكري عبدالله ، اختيار الموقع الامثل لصناعة الاسمنت في محافظة دهوك (باستخدام تقنيات نظم المعلومات الجغرافية (GIS))، مجلة جامعة دهؤك للعلوم الانسانية والاجتماعية، المجلد ١٥ ، العدد ٢، كانون الاول ٢٠١٢ . ص ٢٦٢ .

٢. الموقع الرسمي للمديرية العامة لكهرباء محافظة دهؤك

٣. مصدق توڤی، کەهرەبا دهۆکێ، گۆڤارا دهۆك، سەرۆکاتیا بازێرڤانیا دهۆك، هژمار (٦) گولان ١٩٩٩، ص ص ٢٢ – ٢٣ .

٤. حكومة اقليم كوردستان العراق، وزارة الكهرباء، مديرية كهرباء محافظة دهؤك، بيانات غير منشورة ، ٢٠١٣ .

٥. حكومة اقليم كوردستان العراق، وزارة التخطيط، مديرية احصاء محافظة دهؤك، بيانات غير منشورة، ٢٠١٣.

٦. حكومة اقليم كوردستان العراق، وزارة التخطيط، خطة التنمية الاستراتيجية لاقليم كوردستان ٢٠١٢ - ٢٠١٦، اذار ، ٢٠١١ ، ص ٧٧.

٧. ويكبيديا ، الموسوعة الحرة الطاقة الكهربائيةwww.wikipeedia

٨. اميرة صالح الباز، تقرير حول دعم الكهرباء، مجلة المصري اليوم، جمهورية مصر العربية / عدد ٢٦ اب / اغسطس / ٢٠١٣ www.almasryalyoum.com

9. ESCWA, Statistical abstract of the ESCWA region, Issue 30 (2011) p103 .

# پێشکەفتنا تۆرا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆکێ

ئامادەکرن
م.هـ. ئەکرەم محەمەد تاهر - پ.هـ. ئیبراهیم خثمان هسام
زانکۆیا دهۆك - کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی
وەرگێران: دیان جەمیل

ڤەگوهاستن و هاتنوچوون دهێنە هژمارتن ژ گرنگترین وان چالاکیێن مرۆڤان هەر ژ دەستپێکا دیرۆکێ ل سەر رووبێ عەردی ئەنجامداین ڤێجا چ بۆ لێگەریانا خوارنێ بیت یان ژی ژبۆ مەرەمێن ڤەگوهاستن و جهگوهۆرینێ بیت ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی ژ ئەنجامێ تێکچوونا کاودانێن سەقایی یان نەبوونا خوارنێ و پەیدابوونا مەترسیێ ل سەر ژیانا وان[1]. پێدڤیا مرۆڤی ژبۆ بدەستڤەئینانا خوارنێ بوویە ئەگەر ئەو نێچیرێ بکەنە پیشەیێ خۆ یێ سەرەکی ل ژینگەهەکا سنووردار کری، ئەڤ پیشەیە بۆ ئەگەر ئەو ب پییان بەرەڤ جهـ و دەڤەرێن دوور بچن هەتا بشێن گیانەوەرەکی یان هەر تشتەکێ دی یێ ب کێر خوارنێ بهێت نێچیر بکەن.

دەمێ مرۆڤان بەرێ خۆ دایە پیشەیێ چاندنێ، ئێدی سرۆشتێ ژیانا وان ژ ژیانەکا بەرەلا هاتە گوهۆرین بۆ سیستەمەکێ جڤاکیێ باشتر و ژیانا وان پتر تەناهی و سەقامگیری ب خۆ ڤە دیت، ژیانا وان یا نوو بۆ ئەگەر ئەو هندەك رێکێن ڤەگوهاستنێ ب داهێنن ژ پێخەمەت هندێ بشێن کەلوپەلێن خۆ بۆ جهێن دوور ب ڤەگۆهێزن. ل دەستپێکێ وان هندەك جۆرێن گیانەوەران بکاردئینان ژبۆ ڤەگوهاستنا بەرهەمێن خۆ یێن چاندنێ[2]، ل دووڤ دا ئەڤ رێکە ل دووڤ پێدڤیێن وان یێن ژیانێ پێشکەفتن و هاتنە گوهۆرین. ئێك ژڤان رێکێن پێشکەفتی ژی داهێنانا ترۆمبێلان بوو، هەلبەت ڤێ داهێنانێ ژی مرۆڤ پالدان ئەو پتر گرنگیێ بدەنە رێکێن هاتنوچوونا ب ترۆمبێلان و بەرفرەهـ بکەن نەخاسم پشتی زێدەبوونا هژمارا وان و پێشکەفتنا پیشەسازیا دروستکرنا وان ل سەرانسەری جیهانێ.

دیرۆکا دروستکرنا رێکێن هاتنوچوونا ب ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆکێ (دەڤەرا ڤەکولین ژێ دگریت) بۆ سالێن بەری راگەهاندنا وێ وەك پارێزگەهـ ل سالا ۱۹٦۹ێ دزڤریت، ل وی دەمێ کو هێشتا قەزایەك بوو ب سەر پارێزگەها نەینەوا ڤە (ل وی دەمی دگوتنێ لیوا مووسل). چێکرن و ڤێرکرنا ئێکەم رێکا ڤێرکری ل دەڤەرێ دیرۆکا وێ ڤەدگەریتە سالا ۱۹۳۰ز. ئێدی ژ وێ سالێ و وێڤە، تۆرا رێکێن ڤەگوهاستنێ رۆژ بۆ رۆژێ بەرفرەهـ و درێژ دبوو هەتا گەهشتیە وی

ئاستێ ئەڤرۆکە ئەم دبینین (سالا ٢٠١٤). هەژی بیرئینانێ یە ئەڤ دیرۆکە هندێ ناگەهینیت کو ل وی دەمی ترۆمبێل ل دەڤەرێ هاتیە بکارئینان ژبەرکو بەری هینگێ چەندین رێکێن نەڤیرکری هەبوون و ژبۆ هاتنوچوونێ ژ لایێ ترۆمبێلان ڤە دهاتنە بکارئینان.

درێژاهیا رێکێن هاتنوچوونێ ل پارێزگەها دهۆکێ هەر ژ رۆژا ئێکەم رێکا ڤیرکری لێ هاتییە دروستکرن هەتا دوا رۆژا ئەڤ ڤەکۆلینە تێدا هاتیە ئەنجامدان، چەندین گوهۆڕین و پێشکەفتن ب خۆ ڤە دیتینە، هەلبەت ڤان گوهۆڕینان ژی پەیوەندی ب قۆناغێن دیرۆکی و ڕوودانـان ڤە هەبوو ب تایبەت ڕوودانێن سیاسی و کارگێری و لەشکەری. د خشتەیێ ژمارە (١) دا، پێشکەفتنا دیرۆکی یا تۆرا رێکێن هاتنوچوونێ یێن ڤیرکری ل پارێزگەهێ هاتییە دیارکرن.

**ژ داتایێن خشتەیی ژمارە (١) ئەڤ ڕاستیە بۆ مە دیار بین:**

١. د ڤی خشتەیی دا دیار دبیت کو دناڤ سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ و دەرڤەی سنوورێ وێ چەندین رێکێن ڤیرکری هەنە. ئەڤا داویێ وان یەکەیێن کارگێری ب خۆ دگریت یێن کو بەری هینگێ ژ دەرڤەی سنوورێ پارێزگەهێ بوون وپشتی هینگێ هاتینە سەر ب پارێزگەهێ ڤە، ل ڤیرێ ئەڤ چەندە دناڤبەرا ماوەیێن (١٩٩١-٢٠٠٢)ێ و (٢٠٠٣-٢٠١٤)ێ ب باشی خویا دکەت کو چ رێکێن ل دەرڤەی سنوورێ پارێزگەهێ هاتینەچێکرن تێدا نینن.

٢. هەر سێ یەکەیێن کارگێری (دهۆك، زاخۆ، و ئامێدی) د ماوەیێ بەری سالا ١٩٦٨یدا، هەرچەندە هینگێ ئەو سەر ب لیوا مووسل ڤەبوون و هێشتا

**خشتەیێ (١)**

**گرنگییا رێژەیی یا درێژیا رێکێن هاتنووچوونێ یێن ڤیرکری ژبۆ ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆکێ هەتا سالا ٢٠١٤**

| ماوە | یەکەیێن کارگێری | رێکێن دروستکری/کم | | | گشتی/ کم | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | دناڤ سنوورێ پارێزگەهێ دا | ٪ | دەرڤەی سنوورێ پارێزگەهێ دا | | |
| ــــ ١٩٦٨* | دهۆك- زاخۆ-ئامێدی | ١٧٧ | ١١,٠٨ | ٦٧ | ٢٤٤ | ١٢,٤ |
| ١٩٦٩-١٩٨٠ | دهۆك- زاخۆ- ئامێدی | ٣٧٧ | ٢٣,٦ | ٢٥٣ | ٦٣٠ | ٣٢ |
| ١٩٨١-١٩٩٠ | دهۆك- زاخۆ- ئامێدی – سێمێل | ١٨٢ | ١١,٣٩ | ٤٦ | ٢٢٨ | ١١,٦١ |
| ١٩٩١-٢٠٠٢ | دهۆك- زاخۆ- ئامێدی ـ سێمێل - ئاکرێ- شێخان | ٣٦٨ | ٢٣,٠٥ | - | ٣٦٨ | ١٨,٧٤ |
| ٢٠٠٣-٢٠١٤ | دهۆك- زاخۆ- ئامێدی ـ سمیل- ئاکرێ ـ شێخان- بەردەرەش | ٤٩٣ | ٣٠,٨٧ | - | ٤٩٣ | ٢٥,١١ |
| گشتی پارێکان/ کم | | ١٥٩٧ | ١٠٠ | ٣٦٦ | ١٩٦٣ | ١٠٠ |

المصدر اعتمادا على الملحق(١) في رسالة الماجستير، اكرم محمد طاهر، شبكة طرق النقل بالسيارات في محافظة دهوك، كلية العلوم الانسانية ، قسم الجغرافية، جامعة دهوك، ٢٠١٦.

* تنێ بۆ مەرەما ڤەکۆلینێ ئاماژە ب سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ یێ بەری دامەزراندنا وێ یا سالا ١٩٦٩ێ یێ ژ ڤەزایێن (دهوك، زاخۆ ، ئامێدی) پێکهاتی هاتیبەکرن

دهۆك نەبیوو پارێزگەهـ، رێژەیا (١١,٠٨٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ رێکێن ڤێرکری یێن دروستکری ل سەرجەمێ سنووری کارگێریێ وێ پارێزگەهێ د هەمی قوناغێن پێشکەفتنا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان پێکدئینا. لێ هەر د ڤی ماوەیی دا، ڤان هەر سێ یەکەیێن کارگێری ب تنێ رێژەیا (١٢,٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشت رێکێن ڤێرکری دناڤ سنوور و دەرڤەی سنووری پارێزگەهێ دا پێکدئینا.

٣. ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٦٨-١٩٨٠)ێ ل رێزا دووێ بوو ژ لایێ دروستکرنا رێکێن ڤێرکری دناڤ سنووری پارێزگەهێ دا ب رێژەیا (٢٣,٦٪)ێ و ئەڤ رێژەیە ب تنێ یا سێ یەکەیێن کارگێری (دهۆك – زاخۆ – ئامێدی) بوو کو پارێزگەها دهۆکێ یا وی دەمی ژێ پێکدهات .لێ هەر ئەڤ ماوەیە ل رێزا ئێکێ دهێت ژ لایێ دروستکرنا رێکێن ڤێرکری دناڤ سنوور و دەرڤەی سنووری پارێزگەهێ دا ب (٦٣٠) کیلومەتران کو دبیتە رێژەیا (٣٢٪)ێ، ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ هندێ دزڤریت کو ل وی دەمی عیراق د هندەك کاودانێن هەرە باش دا دەرباز دبوو و ڤێ پێشکەفتنێ پارێزگەها دهۆکێ ژی ب خۆڤە گرتبوو ب تایبەت ژ لایێ گەشەکرن و دروستکرنا رێکان ژبۆ مەرەمێن لەشکەری.

٤. ماوەیێ دناڤبەرا سالێن ٢٠٠٣- ٢٠١٤ێ ل رێزا ئێکێ و بلندترین ئاستێ گرنگی پێدانێ دهێت ژ لایێ دروستکرنا رێکێن ڤێرکری ڤە بۆ حەفت یەکەیێن کارگێری، ب ڤێ چەندێ رێکێن ڤێرکری دناڤ سنووری پارێزگەهێ دا دگەهنە (٤٩٣) کیلومەتران ب رێژەیا (٣٠,٨٧٪)ێ ژ رێکێن ڤێرکرێن سنووری ڤەکۆلینا مە ژێ دگریت، د هەمان دەمدا ل رێزا دووێ دهێت ژ لایێ سەرجەمێ گشتی یێ رێکێن ڤێرکری کو رێژەیا وێ دگەهیتە (٢٥,١١٪)ێ .

ل دووڤ داتایێن خشتەیێ ژمارە (١)، ئەم دشێن قوناغێن پێشکەفتنا تۆرا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سەر پێنج قوناغێن سەرەکی دابەش بکەین ئەوژی ب ڤی رەنگێ ل خوارێ:

## قۆناغا ئێکێ: رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەهێ بەری سالا ١٩٦٨

عیراق دهێتە هژمارتن بەردەوامیا دەشتا گزیرتا عەرەبی و لاندکا شارستانیەتێ، ژبەر هندێ هەر د کەڤن دا ڤی وەلاتی کونترۆل ل سەر هێلێن سەرەکی یێن پەیوەندی و ڤەگوهاستن و بازرگانیا سەر هشکاتی کریە. دیرۆکا هاتنوچوون و ڤەگوهاستنێ د ڤی وەلاتی را بۆ ب دەهان چەرخێن بەری نوکە دزڤریت، ئانکو بۆ وی ماوەیێ ئێکەم عەرەبانك د دیرۆکا مرۆڤایەتیێ دا ل سالا ٣٥٠٠ێ بەری زاینی هاتیە دروستکرن[٣].

هەرێما کوردستانا عیراقێ ژی وەکی پرەکا سەر هشکاتی یا گرنگ و پێکڤەگرێدەر بوو دناڤبەرا هەر چوار لایێن جیهانا کەڤن. ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت کو جهێ هەرێمێ کو ژ هەمی لایاڤە ب هشکاتییە، ژبەر هندێ ژی هەر ژ کەڤندا بوویە رێکەکا بازرگانی یا گرنگ دناڤبەرا رۆژهەلات و رۆژئاڤایی دا و د هەمان دا دەم دا بوویە ئێزگەهێ تێرابۆرین و بێهنڤەدانا کاروانییان[٤].

هەرێما کوردستانێ ب گشتی و پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی، ژبەر ئاریشەیا نەبوونا چ رێکێن هاتنوچوونێ یێن رێکخستی ل سەردەمێ ئوسمانییان و بەری شەرێ جیهانی یێ ئێکێ دنالی بەلکو بتنێ هندەك رێکێن کاروانی یێن ل سەر گیانەوەران و عەرەبانکان هەبوون و بۆرینا وان هندەك سنووردارکری بوو، ئەوژی ژبەر زالبوونا سرۆشتێ چیایی یێ دەڤەرێ و ئاسێبوونا و تەنگبوونا رێکان، هەر ژبەر ڤێ چەندێ ب تنێ گیانەوەر دشیان دڤان رێکێن نەخۆش و ئالۆز را دەرباز بن[٥]. دگەل هندێ ژی ئەڤ رێکێن نەخۆش و تەنگ خودان گرنگییەکا بازرگانی و ئابووری یا مەزن بوون و چەندین کاروانێن مەزن ل سەر ئاستێ ناڤخۆیی و هەرێمی تێرا دبۆرین[٦].

ل باکووری پارێزگەهێ، گەلیێ سەرێ ئامێدیێ لێ هەیە کو دکەڤیتە دناڤ چیایێن بەرواری بالا و هەردو هەرێمێن ل سەر گۆلا ئورمیێ و گۆلا وانێ پێکڤە

گرێدده‌ت، ئەوژی ب رێکا سێ رێرەوێن سەرەکی، ئێك ژ وان بەرەڤ گەلیێ سەری بەرەف باژێرێ جولەمێرگێ ب سەردکەڤیت هەتا دگەهیتە باژێرێ "باشکالا"، رێرەوێ دووێ ژی ئێکسەر بەرەڤ باژێرێ وانێ دچیت و د باژێرێ میرگەها "مەروانی" را دبۆریت، رێرەوێ سیێ ژی پشتی کو گەلیێ سەرێ ئامێدیێ دبریت بەرەڤ رۆژئاڤایی دچیت و بەرەڤ بلنداهیێن بەرواری بالا ل گەلیێ سەرەرو و رووبارێ خابووری سەردکەڤیت.

ژ لایێ باشووریڤە، چەندین رێـرەو هەنە کو دشیانێن وان دا هەبە هاتنوچوون دناڤبەرا ئامێدی و مووسلێ دا بێتە کرن رێکێن ئاکرێ و دهۆکێ را. ل وی دەمی، پتریا ڤان رێکان تووشی گرتنێ دبوون ژبەر بارینا بەفرێ و ئاڤرابوونان[7].

سەرەرای ڤێ چەندێ ژی، پارێزگەها دهۆکێ جهێ تێرابوورینا کاروانی و جهێ پێکڤەگرێدانا چەندین رێکان بوو. هەروەکی د سالنامەیا سالا ١٩٠٧ێ دا هاتی، دهۆك سەنتەرەکێ بازگانی یێ گرنگ بوو ژبۆ دەڤەرێن دەوروبەر کو دهاتە ناڤکرن ب (بەندەرێ کوردستان)، هەژی گوتنێ یە هەمی چوونە ناڤ و دەرکەفتنێن ناڤ باژێری ب رێکا کاروانێن هێستران بوون[8].

دەربارەی پەیدابوونا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان د ڤی ماوەیی دا، ل دەستپێکا هاتنا ئێکەم ترۆمبێل بۆ ناڤ ئاخا عیراقێ ل سالا ١٩٠٨ێ و د ماوەیێ شەرێ جیهانی یێ ئێکێ دا دناڤبەرا سالێن (١٩١٤- ١٩١٨)ێ و داگیرکرنا عیراقێ ژ لایێ هێزێن بەریتانی ڤە، هژمارەکا مەزن یا ترۆمبێلێن لەشکەری یێن بیانی ژبۆ مەرەمێن ستراتیژی هاتینە دناڤ عیراقێ دا، ئەڤ چەندە بوو ئەگەر هێزێن داگیرکەر ژ دل کاربکەن بۆ دروستکرن و ڤێرکرنا رێکێن هاتنوچوونێ ژ پێخەمەت ب سانەهی ئێخستنا کریارا ڤەگوهاستن و گەهاندنێ دناڤ وەلاتی دا[9]، ئەوژی ژبۆ هندێ بوو ئەو ب سانەهی بکەهنە دەڤەرێ و کونترۆلێ ل سەر بکەن، هەروسا ب ڤێ چەندێ ئەو شیان ل سەر لەشکەرێ ئوسمانی زاڵ ببن و ب تەمامی عیراقێ داگیر بکەن.

ل وی دەمی، لەشکەرێ بریتانی یێ دناڤ ئاخا عیراقێ دا هەمی پێدڤیێن خۆ ژ ترۆمبێل و عەرەبانێن عەسکەری ژ وەلاتێ هندێ دگەل خۆ ئینابوون، پشتی بریتانییان بریار دای دەست ب فرەهکرنا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل عیراقێ بکەن، دروستکرنا تۆرا رێکێن هاتنوچوونێ ل عیراقێ و باشوورێ کوردستانێ دەستپێکر[10]. هەر ل وی دەمێ زاراڤێ "رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان" ل عیراقێ هاتە بکارئینان کو دەربرین ژ وان رێکان دکرن یێن جۆرێن جودا جودا یێن ترۆمبێل و عەرەبانەیێن وی سەردەمی هاتنوچوون ل سەر دکر.

پشتی دابەشکرنا عیراقێ بۆ سەر چواردە لیوایان، ل وی دەمی دەڤەرا دهۆکێ قەزایەك بوو ب سەر لیوا مووسلێ ڤە و رووبەرێ وێ نێزیکی ٢٩٥٦٨ کم٢ ژ سەرجەمێ گشتی یێ لیوایێن عیراقێ کو نێزیکی ٢٣٥٧٣٣ کم٢ بوو. لیوا مووسل دهاتە هژمارتن دووەم مەزنترین ویلایەت ژ لایێ رووبەری ڤە و ژ ڤان قەزایان پێکدهات (مووسل، ئامێدی، زاخۆ، دهۆك، ئاکرێ، شنگال، شێخان، تەلەعفر) کو هژمارا وان نەهـ قەزا بوون[11].

سەرەرای کو رووبەرێ ڤێ لیوایێ گەلەك یێ مەزن بوو و پتریا عەردێ وێ ل هەرێما کوردستانێ بوو کو وی دەمی دگۆتێ دەڤەرا چیایی یان باکوورێ عیراقێ، لێ رێکێن وێ یێن هاتنوچوونێ گەلەك دپاشکەڤتی بوون، ئەگەرێ ڤێ پاشکەفتنێ ژی بۆ دو فاکتەران دزڤری: فاکتەرێ ئێکێ سرۆشتێ هەرێما کوردستانێ بوو کو ب رەنگەکی توپوگرافیا وێ تا رادەیەکێ مەزن بەرپرسیار بوو ژ نەدروستکرن و ڤێرکرنا رێکان، ژبەرکو دروستکرن و ڤێرکرنا رێکان ل دەڤەرێن ئاسێ پێدڤی ب وەختەکێ درێژ و تێچوونەکا مەزنن کو رەنگە چەند جاران پتر بیت ژ تێچوونا دروستکرنا هەمان رێکان ل دەڤەرێن دەشتێ[12]، فاکتەرێ مرۆڤایەتی ژی ئەوبوو کو دەستەلادرێن بەرپرسیار ژ دروستکرنا رێکان نەشیان ل هەمبەری ئاستەنگێن توپوگرافیا دەڤەرێ براوەستن چونکی ئەڤ چەندە ژی پێدڤی ب تێچوونێن دارایی یێن مەزن بوو[13].

ژبەرکو دەڤەرێن چیایی و نیمچە چیایی پتریا رووبەرێ پارێزگەهێ پێکدئینن، ڤێ چەندێ ب شێوەیەکێ نەرێنی بۆ ماوەیێ چەندین سالان کارتێکرن کرە سەر پێشکەفتنا رێکێن هاتنوچوونێ ل دەڤەرێ و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ڤەقەتیانەکا تەمام دناڤبەرا گوند و باژێران دا هەبیت. ژبەر نەبوونا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پتریا دەڤەرێن پارێزگەهێ خەلک نەچار کر وەک بەرێ ئەو گیانەوەران وەک ئامرازێن ڤەگوهاستنێ بکاربینن، هەر ئەڤ چەندە دبوو ئەگەر رێک بۆ ماوەیێ چەندین رۆژان یان حەفتیان ل وەرزێ زڤستانێ بێنە گرتن.

هەردیسان هەژاریا دەڤەرێ ب رێکێن هاتنوچوونێ وەل خەلکی دکر ئەو ب دەمێن درێژ و بۆ چەندین رۆژان زەحمەتا رێکێ بکێشن هەتا دگەهنە مەلبەندێ قەزایێ یان ناحیێ، زێدەباری ژناڤچوون و خوسارەتیا بەرهەمێن وان یێن ناخۆیی ب تایبەت ئەو متایێن زوو خراب دبن[١٤].

د ماوەیێ ڤێ ڤەکۆلینێ دا بۆ مە دیار دبیت کو رێکێن هاتنوچوونێ د ماوەیێ ڤێ قۆناغا دیرۆکی یا درێژ دا کو دهێتە نیاسین ب دەستپێکرنا ڤێرکرنێ، سەرەرای چاککرنا ڤان رێکان لێ د راستی دا هێشتا هندەک رێکێن نەڤێرکری یێن بێسەروبەر بوون و دپربوون ژ کەند و کۆر و تەقن و هەرِی و تەسان و یا ب زەحمەت بوو د هەمی وەرزێن سالێ دا هاتنوچوون سەر بێتەکرن ب تایبەت ل رۆژێن زڤستانێ و بارینا بارانێ.

جادا ناڤبەرا (مووسل – دهۆک –زاخۆ) دهێتە هژمارتن کەڤنترین رێکا دڤی ماوەیی دا هاتییە دروستکرن ژبۆ هاتنوچوونا ترۆمبێلان کو بەشەکە ژ رێکا نێڤدەولەتی و درێژیا وێ دگەهیتە ٥٥٤ کیلومەتران. ئەڤ رێکە ژ باژێرێ بەغدا دەستپێدکەت و بەرەڤ باژێرێن کەرکوک-هەولێر ڤە دهێت هەتا دگەهیتە باژێرێ مووسل. ڤێ رێکێ گرنگییەکا تایبەت هەیە ژبەرکو دهێتە هژمارتن خالا پێکڤەگرێدانا پارێزگەهێن هەرێمێن چیایی یێن بلند و نیمچە چیایی و دەشتی، ئانکو پارێزگەهێن هەرێما کوردستانێ دگەل پارێزگەهێن ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ گرێددەت. ژ لایێ دی ڤە دەرگەهەکێ سەرهشکاتی یێ گرنگە ژبۆ پێکڤەگرێدانا هەرێما کوردستانێ و عیراقێ دگەل کێشوەرێ ئەوروپا ب رێکا وەلاتێ تورکیا[١٥] ئەوژی ب هاریکاریا وێ پرا ئاسنی یا ل سالا ١٩٦٩ی ل دووڤ رێکەفتنەکێ دناڤبەرا ترکیا و عیراقێ دا هاتییە دروستکرن. ئەڤ پرە ب دووراتیا ١١ کیلومەتران دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ باژێرێ زاخۆ و درێژیا وێ نێزیکی ٢٢٠ مەتر و فرەهیا وێ نێزیکی ٨ مەترانە[١٦].

ئەڤ رێکە ژ باژێرێ مووسل درێژ دبیت بەرەڤ ئاراستێ باکووری هەتا دهێتە ناڤ باژێرێ دهۆکێ دا ئەوژی پشتی کو دناڤ دەشتا مووسل را دەرباز دبیت. پاشی دناڤ چیایێ بێخێر ل گەلیێ تەنگێ زاخۆ را دەربازدبیت و دناڤ دەشتا سندییان دا دەربازدبیت هەتا ل باژێرێ زاخۆ ب داویدهێت[١٧].

ئەڤ رێکە دهێتە هژمارتن ئێک ژ کەڤنترین رێکێن پشتی سالێن سیهان (١٩٣٠ز) ل سەدسالییا بیستێ هاتینە ڤێرکرن و ماوەیێ ڤێرکرنا وێ نێزیکی دەهـ سالان ڤەکێشایە و تنێ ئێک سایدە ب فرەهیا ١٣ مەتر و ١١٥ کیلومەتران ژ باژێرێ مووسل هەتا سنوورێ تورکیا[١٨]، لێ درێژیا ڤێ رێکێ تنێ د سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ دا نێزیکی ٦٣ کیلومەترانە. تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (١) بکە.

دیرۆکا هاتنا ترۆمبێلان بۆ ناڤ پارێزگەها دهۆکێ دا بۆ سالا (١٩١٨ز)ێ دزڤریت ئەوژی پشتی هاتنا هێزێن بریتانی بۆ دەڤەرێ، لێ ترۆمبێلێن ئاسایی ل دەستپێکێ هاتینە دناڤ باژێرێ زاخۆ دا ل سالێن سیهان ژ چەرخێ بیستێ و ل دەستپێکا سالێن چلان ئێکەم ترۆمبێلێن ب کرێ هاتییە سنوورێ ڤەکۆلینا مە ژێ دگریت ژ بۆ مەرەمێن ڤەگوهاستنا خەلکی دناڤبەرا باژێرێن مووسل و زاخۆ دا، پتریا جاران ئەڤ ترۆمبێلە ل وەرزێ زڤستانێ و دەمێ بارینا بەفرێ ب رێکێ ڤە ئاسێ دبوو[١٩].

ل دەستپێکا سالێن پێنجییان ژ چەرخێ بیستێ، وەلاتێ عیراقێ چەندین پێشکەفتن و گوهۆرینێن

**نەخشەیێ (١)**
**کەڤنترین رێکا ڤێرکری یا ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٣٠**




ژێدەر: پشتبەستن هاتیە کرن ل سەر:

١. معطیات ملحق(١) في رسالة الماجستیر، اکرم محمد طاهر

٢. حکومة أقلیم کوردستان العراق،وزارة التخطیط، الهیئة العلیا للإحصاء، مدیریة أحصاء دهوك،قسم Gis،بیانات غیر منشورة.

3. Kurdistan Region-Iraq. Map prepared by JHIC joints Humanitarian information Center. Duhok Governorate Base Map scale 1:500000.

بەرچاڤ دبوارێن ئابووری و سیاسی دا بخۆڤە دیتن، ژ گرنگترین ڤان پێشکەفتنان ژی دروستکرنا ئەنجومەنێ ئاڤاکرنێ بوو ژبۆ ڤێراگەهشتنا کاروانێ پێشکەفتنا ئابووری و جڤاکی ودانانا پلانەکا گەشەکرنێ یا ب هێز[٢٠]. ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ل سالا ١٩٥٠ێ هاتە پێشنیازکرن کو دڤێت ئێدی فرۆتنا نەفتێ بۆ خزمەتا گەشەکرنا ئابووری و جڤاکی ل عیراقێ بێتە بکارئینان، ب تایبەت پشتی کو ئێدی پارەیەکێ مەزن ژ فرۆتنا نەفتێ بدەستڤەدهات ئەوژی ژ ئەنجامێ رێکەفتنا نەفتێ ل سالا ١٩٥١ێ یا دناڤبەرا عیراقێ و کومپانیێن وەبەرهێنەر دا هاتییەگرێدان، زێدەباری زێدەبوونا بەرهەم ئینانا بەرهەمێ نەفتێ[٢١].

چاکبوونا بارێ دارایی و بدەستڤەئینانا (٥٠٪)ێ ژ داهاتێ نەفتێ ژلایێ حکومەتا عیراقێ ڤە بوونە ئەگەر ئەنجومەنێ ئاڤاکرنێ پتر شیانێن خۆ بمەزێخیت ژبۆ بجهئینانا پرۆژەیێن گەشەکرن و ئابووری ل وەلاتی و ل دەسپێکا وان ژی پرۆژەیێن کەرتێ هاتنوچوون و

ڤەگوهاستنێ ب تایبەت ژی رێك و پران[22]. ل وی دەمی هندەك ژ ڤان پرۆژەیان بەر ب پارێزگەها دهۆکێ ژی کەفتن لێ نە ل سەر ئاستێ پێدڤی، تەماشەی خشتەیێ ژمارە (1) بکە، و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ کۆمەکا فاکتەرێن سرۆشتی و مرۆڤایەتی دزڤری کو بەری نوکە مە ئاماژێ پێ کریە، زێدەباری کاودانێن ئێمناهی و سیاسی یێن پارێزگەهـ تێرا دبووری کو هەڤدەم بوون دگەل بزاڤا رزگاریخوازا کوردی و ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر ژ هەمی لایا ڤە پارێزگەهـ بێتە پشتگوهـ هاڤێتن.

ل دووڤ رێبازا پلانێن ئەنجومەنێ ئاڤاکرنێ بۆ سالێن (1951-1954)ێ، نێزیکی (15,8) ملیون دینارێن عیراقی بۆ کەرتێ ڤەگوهاستنێ هاتبوونە تەرخانکرن کو دبیتە رێژەیا (24,1%)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ پارەیی تەرخانکری بۆ ڤی پلانێ. هەروەسا د ماوەیێ سالێن دناڤبەرا (1954– 1959)ێ ئەڤ کۆژمە پتر لێ هات بۆ (68) ملیون دیناران کو دبوو رێژەیا (22,3%)ێ و ل سالێن (1961-1965)ێ ئەڤ کۆژمە گەهشتە (136,5) ملیون دیناران ب رێژەیا (24,1%)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ پارەیی تەرخانکری بۆ ڤی ئەنجومەنی کو نێزیکی (566,3) ملیون دینارێن عیراقی بوون. لێ دناڤبەرا سالێن (1965-1968)ێ ئەڤ کۆژمە هاتە کێمکرن بۆ (119) ملیون دیناران ژ سەرجەمێ گشتی یێ پارەیێ تەرخانکری بۆ ئەنجومەنی کو (820) ملیون دینار بوون. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (2) بکە.

هەرچەندە د ڤی ماوەیی دا کۆژمەکێ گەلەك مەزن هاتبوو تەرخانکرن ژ بۆ کەرتێ ڤەگوهاستنێ د پلان و رێبازێن گەشەکرنێ ل عیراقێ، لێ مخابن کۆژمەیەکێ گەلەك بچووك بۆ پارێزگەها دهۆکێ هاتبوو تەرخانکرن ب تایبەت ئەو پارەیێ بۆ ڤێرکرنا رێکان گەلەك یێ کێم بوو. بۆ نموونە پارێ تەرخانکری بۆ رێکا دناڤبەرا (دهۆك- ئامێدی) یێ دا کو ئەڤ رێکە هاتبوو ئاڤاکرن پشتی پارە هاتییە تەرخانکرن بۆ کەرتێ ڤەگوهاستن و هاتنوچوونێ، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (2) بکە. ئەگەرێ سەرەکی یێ دروستکرنا ڤێ رێکێ ل پارێزگەها دهۆکێ بۆ هندێ دزڤری کو پتریا وێ رێکێ دکەڤتە دناڤ سنوورێ قەزا ئامێدیێ دا و ل وی دەمی ئەڤ قەزایە سەر ب لیوا مووسل ڤەبوو، زێدەباری هندێ کو ڤێ رێکێ گرنگییەکا تایبەت هەبوو چونکی ئەڤ رێکە دناڤ چەندین دەڤەرێن گەشتوگوزاری را دەرباز دبوو وەك هاڤینگەهێن (ئاشەوا، سەرسنك، سیلاڤ، ئەرەدنا و سووارەتیکا). ئەڤ رێکە دهێتە هژمارتن دیارترین و گرنگترین رێکا ڤێرکی د ڤی ماوەیی دا. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (3) بکە.

**خشتەیێ (2)**

**گرنگیا رێژەیی یا تەرخانکرنا پارەی بۆ کەرتێ ڤەگوهاستنێ ل دووڤ پلانا گەشەکرنێ ل عیراقێ د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (1951-1968)**

| پلان | ماوە | پارەیێ گشتی/ ملیون دینار | پارەیێ کەرتێ ڤەگوهاستنێ/ملیون دینار | کەرتێ ڤەگوهاستنێ% |
|---|---|---|---|---|
| ئەنجومەنێ ئاڤاکرنێ | 1951-1954 | 65,5 | 15,8 | 24,1 |
| | -1955 1959 | 304,3 | 68 | 22,3 |
| پلانێن ئابووری | -1961 1965 | 566,3 | 136,5 | 24,1 |
| | -1965 1968 | 820 | 119 | 14,5 |

**ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر:**

1. ضياء باقر الموسوي، خطط ومنهاج التنمية في العراق للسنوات (1950-1980) مجلة النفط والتنمية، العدد 6، بغداد، 1981، ص ص94-99.
2. عبد الله شاتي عبهول، مجلس الاعمار في العراق (1950-1958)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة بغداد، 1983، ص ص82-85.

**خشتەیێ (٣)**

**درێژاهیێن رێکێن ترۆمبێلان و ساخلەتێن وان یێن هۆنەری یێن ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە دروستکرن بەری سالا ١٩٦٨**

| ناڤێ رێکێ | سال | درێژاهی /کم | فرەهی/م | ژمارا سایدان |
|---|---|---|---|---|
| ئیبراهیم خەلیل – زاخۆ | ١٩٦٨ | ٩,٣٢ | ١٣ | ئێك ساید |
| دووریانا ئەتریش- لالش –ئێسڤنێ | ١٩٦٦ | ٦,٣٨ | ١١ | ئێك ساید |
| ئالۆکا - فەیدیێ - جەمبور –دووریانا بەدریکێ | - | ١٣,٢٥ | ١٣ | ئێك ساید |
| بێتاس - گەلیێ زاخۆ | ١٩٦٨ | ١١,٦١ | ١٣ | ئێك ساید |
| دهۆك - زاویتە - سووارەتیکا –سەرسنك | ١٩٥٨ | ٤٠,٢٣ | ١٣ | ئێك ساید |
| دهۆك - گرشین - زاخۆ | ١٩٣٠ | ٤٨,٤٦ | ١٣ | ئێك ساید |
| رێکا نافخۆیی یا سەنتەرێ پارێزگەهێ | - | ١٢,٥٩ | ٢٥ | دوو ساید |
| زاویتە - بادێ - سندورێ - سکرێ دهۆك | ١٩٦٥ | ١١,٠٥ | ١١ | ئێك ساید |
| سەرسنك - قەدش - سیلاڤ –ئامێدی | ١٩٥٨ | ٢٤,٠٨ | ١٣ | ئێك ساید |
| گشتی یا رێکێن دروستکری / کم | | ١٧٦,٩٧ | | |

**ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر داتایێن پاشکۆیێ ئێکی یێ نامەیا ماستەرێ ئەکرەم محەمەد تاهر**

**ژ داتایێن ڤی خشتەیی ئەڤ راستیە بۆ مە دیار دبن:**

١. بۆ مە دیاردبیت کو پتریا رێکێن دڤی ماوەیی دا هاتینە دروستکرن ڤەدگەرن بۆ پشتی سالا ١٩٥٠ێ، ئانکو پشتی دامەزراندنا ئەنجومەنێ ئاڤاکرنێ. درێژترین رێك دگەهیتە ١٧٧ کیلومەتران.

٢. رێکا دناڤبەرا (دهۆك-زاخۆ) یانژی رێکا نێڤدەولەتی یا ژمارە (٢) کو ل سالا ١٩٣٠ێ هاتییە دروستکرن، گرنگترین رێك بوو ل پارێزگەها دهۆکێ کو درێژیا وێ نێزیکی ٤٨,٤٦ کیلومەترانە و رێکەکا ئێك سایدە ب فرەهیا ١٣ مەتران بتنێ.

٣. ل دووڤ دا رێکا دناڤبەرا (دهۆك- سەرسنك) و رێکا (سەرسنك- ئامێدی) دهێن کو ل سالا ١٩٥٨ێ هاتینە دروستکرن و هەردو ژی رێکێن ئێك سایدن، وان پێکڤە دگەهیتە ٦٤ کیلومەتران لێ فرەهیا وان نێزیکی ١٣ مەتران بتنێ یە. ئەڤ رێکە درێژترین رێك بوو ل پارێزگەها دهۆکێ و ژ لایێ گەشتوگوزاری ڤە گرنگیەکا مەزن هەبوو. لێ هەر ئێك ژ رێکێن (ئیبراهیم خەلیل- زاخۆ) و (بێتاس- گەلیێ زاخۆ) ل سالا ١٩٦٨ێ هاتینە ئاڤاکرن و رێکێن ئێك سایدن ب فرەهیا ١٣ مەتران.

٤. هندەك رێکێن دی یێن ئێك ساید هەبوون کو فرەهیا وان ژ ١١ مەتران نەدبۆری وەك رێکێن (ئەتروش-لالش-ئێسڤنێ) و ل سالا ١٩٦٦ێ هاتینە ئاڤاکرن و درێژاهیا وان ٦,٣٨ کیلومتربوون. هەروەسا رێکا (زاویتە-گەلیێ دهۆکێ) ئەوێ ل سالا ١٩٦٥ێ هاتییە ئاڤاکرن. تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٢) بکە.

٥. رێکا ناڤخۆیی یا سەنتەرێ پارێزگەها دهۆکێ دڤی ماوەیی دا هاتییە ئاڤاکرن و رێکەکا جووت سایدە ب فرەهیا ٢٥ مەتران.

نەخشەیێ (٢)

تۆرا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆكێ بەری سالا ١٩٦٨




ژێدەر: ژ كارێن ڤەكولەری یە ب پشتبەستن ل سەر

١. داتایێن خشتەیێ ژمارە ٣

٢. حكومة أقليم كوردستان العراق، وزارة التخطيط، الهيئة العليا للإحصاء، مديرية أحصاء دهوك،قسم Gis،بيانات غير منشورة.

3. Kurdistan Region-Iraq. Map prepared by JHIC joints Humanitarian information Center. Duhok Governorate Base Map scale 1:500000. Erbil, 2004.

## قۆناغا دووێ: پێشكەفتنا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەهێ د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن ١٩٦٩-١٩٨٠ دا:

ئەڤ قۆناغە دهێتە هژمارتن قۆناغەكا گرنگ یا پێشەكفتنا تۆرا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆكێ ب هەڤبەركرن دگەل قۆناغا بەری نوكە. پارێزگەها دهۆكێ د ڤێ ماوەیێ دا د هندەك كاودانێن ئابووری و سیاسی گوهۆرینێن كارگێری یێن گرنگ را دەربازبوو. ئەڤ پێشكەفتنە تا رادەیەكێ مەزن پالدەر بوون ژبۆ دروستكرن و پێشئێخستنا رێكێن ڤەگوهاستنێ. د ڤێ ماوەیێ دا دهۆك كو قەزایەك بوو سەر ب لیوا نەینەوا ڤە بوو سەنتەرێ پارێزگەها دهۆكێ و ل ڤێرێ گەلەك فاكتەر رێخوشكەربوون كو دهۆك ببیتە سەنتەرێ پارێزگەهێ، ژبەركو مەزنترین بازێر بوو دناڤ بازێرێن دەوروبەر دا، زێدەباری جهێ وێ یێ جوگرافی كو د نیڤەكا هەمی قەزایێن دی یێن پارێزگەهێ دا یە.

ئەڤ ماوەیە قۆناغەك گرنگ بوو د پێشكەفتنا پارێزگەهێ دا ژ هەمی لایا ڤە ب تایبەت لایەنێ ئابووری

و ژێرخانا ئابووری. دروستكرنا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ئێك ژوان خالێن گرنگ بوو یێن ل بەرچاڤ هاتینە وەرگرتن پشتی كو دهۆك ل رێكەفتی ٢٧ گولانا ١٩٦٩ێ ب بریارەكا كۆماری ژ لایێ حكومەتا عیراقێ ڤە بوویە پارێزگەهـ و ژ هەرسێ قەزایێن (دهۆك و ئامێدی و زاخۆ) پێكدهات[٢٣]. ژ ئەنجامێ ڤێ بریارێ، كاودانێن گەشەكرن و پێشكەفتنێ یێن باش د بوارێن پیشەسازی و ئابووری و خزمەتگوزاری دا هاتنە پێش[٢٤]، هەردیسان پێشكەفتنەكا مەزن د تۆرا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان پەیدابوو[٢٥]. ل دووڤ بەندێ ٨٦ ژ یاسایا پارێزگەهان یا ژمارە ١٥٩ ل سالا ١٩٦٩ێ دا هاتییە: ئەنجومەنێ پارێزگەهێ دەستەلات هەیە چەندین كارێن گرنگ ئەنجام بدەت، ژ وان كاران ژی ڤەكرن و دروستكرنا رێكێن هاتنوچوونێ. هەردیسان د ڤی ماوەیی دا پێشكەفتنەكا هەرە بەرچاڤ د لایەنێ كارگێری ژی هاتە پەیدابوو ب رەنگەكی چەندین رێڤەبەری یێن گشتی هاتنە ڤەكرن كو ئێك ژ وان ژی رێڤەبەریا رێكێن دهۆكێ بوو ل سالا ١٩٧٠ ب ناڤێ رێڤەبەریا كاری یا دهۆكێ. كارێن ڤێ رێڤەبەرییێ تا رادەیەكێ د سنووردارببوون و بتنێ د شیانێن وان دا هەبوو سەخبێریا رێكێن كەڤن بكەن، چونكی ئامیرێن وان گەلەك د كێم بوون و هژمارا كەسێن خودان شیان و تەكنیكی د ڤی بواری ژی د كێم بوون. تا سالا ١٩٧٥ێ ژی كاودانێن ڤێ رێڤەبەرییێ ب ڤی ئاوایی بوون.

ل سالا ١٩٧٢ێ، ڤێ رێڤەبەرییێ بریار دا ئێكەم كارگەها دروستكرنا ئەسفەلتی بدامەزرینت ژ پێخەمەت دابینكرنا پێدڤییێن پارێزگەهێ ژ كەرەستەیێ ڤیری. بەری ڤێ سالێ هەرێما كوردستانێ ب گشتی و پارێزگەها دهۆكێ ب تایبەتی چ كارگەهێن ب ڤی ئاوایی لێ نەبوون و حكومەتا ناڤەندی پێدڤییێن دەڤەرێن باكووری ژ ڤیری كو ئێك ژ وان پارێزگەها دهۆكێ بوو، ژ بەرهەمێ كارگەهێن پارێزگەها نەینەوا دابین دكرن.

د ڤی ماوەیی دا، رێكەفتنامەیا ١١ ئادارێ ل سالا ١٩٧٠ێ دناڤبەرا حكومەتا مەركەزی یا عیراقێ و بزاڤا رزگاریخوازا كوردی دا هاتە ئیمزاكرن ژپێخەمەت هندێ دۆزا كوردی ب شێوەیەكێ ئاشتیانە و دیموكراتی ل سەر بنیاتێ دانا دەستەلاتێ ئوتونومی (حوكمێ زاتی) بۆ كوردستانێ بێتە چارەسەكرن. ئەڤ رێكەفتنە بوو ئەگەر د وێ قوناغێدا هەرێما كوردستانێ رەنگە سەقامگیرییەكێ بخۆڤە ببینیت.

د ڤێ رێكەفتنێ دا چوار بەند هاتبوونە بەحسكرن، ژ وان بەندان: ڤەرەبووكرنا هەرێما كوردستانا عیراقێ و پارێزگەها دهۆكێ ژ وان وان خزمەتگوزارییێن بەری نوكە ژێ هاتییە بێبەهركرن د هەمی بواران دا یێن كو بەری هینگێ مافێ وێ هاتییە خوارن. د بەندێ ژمارە حەفت، برگەیا (أ) دا ژ رێكەفتنامەیێ هاتبوو: پێدڤییە دەستەكەكا تایبەتمەند بێتە پێكئینان ل دەڤەرێن كوردی و ب زووترین دەم كو كارێ ئەوە هەمی وان زیانێن بەر ب ڤان دەڤەران كەفتین و بودجەیەكا تایبەت بۆ بێتە تەرخانكرن، ئەڤ دەستەكە سەر ب وەزارەتا كاروبارێن باكووری ڤەبوو. د برگەیا (ب) دا هاتییە: پلانەكا ئابووری یا توكمە بێتە دانان بۆ سەرانسەری عیراقێ و تێدا كاودانێ، پاشكەفتی یێن دەڤەرێن كوردی تێدا ل بەرچاڤ بێنە وەرگرتن[٢٦]. سەرجەمێ كوژمەیێ گشتی بۆ پلانا گەشەپێدانا نەتەوەیی ل عیراقێ دناڤبەرا سالێن (١٩٧٠-١٩٧٤)ێ دا گەهشتە (١٩٣٢)ملیون دینارێن عیراقی، ژ ڤی كوژمەی نێزیكی ٢١٩,٣ ملیون بۆ كەرتێ ڤەگوهاستن و هاتنوچوونێ هاتنە تەرخانكرن كو دبیتە رێژەیا (١١,٤٪)ێ ژ سەرجەمێ گشتی یێ بودجەی. پەیرەوێ وەبەرهێنانێ ل سالا ١٩٧٥ێ نێزیكی (١٠٧٦) ملیون دیناربوون و نێزیكی (١٦٦) ملیون دینار بۆ كەرتێ ڤەگوهاستنێ ب رێژەیا (١٥,٤٪)ێ هاتنە تەرخانكرن. بودجەیێ تەرخانكری بۆ كەرتێ ڤەگوهاستن و هاتنوچوونێ د پلانا گەشەپێدانێ بۆ سالێن (١٩٧٦-١٩٨٠)ێ دا نێزیكی (١٠٢٦,٧) ملیون دیناربوون[٢٧]. زێدەباری ڤێ چەندێ، نێزیكی چوار ملیون دینارێن عیراقی یێن دی بۆ پلانا گەشەپێدانا نەتەوەیی بۆ پرۆژەیێن باكووری هاتنە تەرخانكرن و دەستەكا ئاڤاكرنێ ل باكووری هاتە راسپاردن بۆ دیاركرنا وان پرۆژەیێن بریارە ب ڤی

پارەیی پێ بێنە ئەنجامدان. ڕازیبوون هاتە كرن ب مەزاختنا كوژمەیێ (٢,٢٩٥,٠٠٠) دیناران ژبۆ كڕینا ئامیر و كەلوپەلان ئەوژی ل دووڤ ڕێكەفتنەكێ دگەل ئێكەتییا سوڤیەتا بەرێ، هەروەسا دروستكرنا ڕێكێن دەڤەرێن باكووری كو هندەك ژ ڤان ڕێكان دكەفتنە دناڤ سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ دا. سەرجەمێ گشتیێ ئەو پارەیێ بۆ دروستكرنا ڕێكێن پارێزگەهێ هاتیبە تەرخانكرن گەهشتە (١,٦٤٠٠٠٠)دینارێن عیراقی[٢٨].

پشتی هینگێ چەندین كارگەهێن دروستكرنا ئەسفەلتی ل پارێزگەها دهۆكێ هاتنە ڤەكرن ژ پێخەمەت دابینكرنا پێدڤیێن خۆ ژ كەرەستەیێ ڤیری، هژمارا كارگەهێن د ڤی ماوەیی دا هاتینە ئاڤكرن گەهشتنە (٩) كارگەهان كو شیانێن وان یێن بەرهەم ئینانێ د جودا جودا بوون[٢٩] ، تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٤) بكە.

ژ داتایێن ڤی خشتەیی بۆ مە دیاردبیت كو كارگەهێن ئەسفەلتی د شیانێن خۆ یێن دیزاینكرنێ و شیانێن بەرهەم ئینانا ڕاستەقینەدا د ژێكجودا بوون. سەرەرای ڤێ چەندێ ژی ڤان كارگەهان گرنگییەكا مەزن هەبوو چونكی بوونە ئەگەرێ دروستكرن یان دووبارە دانا پەیكەرێ ئەرتیكازی ژ وان ژی یێ ڕێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان. بەرهەمێن ڤان كارگەهان پەیوەندیەكا ڕاستەوخۆ ب ڤیركرنا ڕێكان ڤە هەبوو.

د ڤی ماوەیی دا، ڤێ پیشەسازیێ گرنگییەكا تایبەت هەبوو ژبەركو بۆ ئەگەرێ پێشكەفتن و دووبارە دانا بنیاتێ ئەرتیكازی ئەوژی كو پشتی هاتینە خرابكرن و ژناڤچوون ژ ئەگەرێ كاودانێن سیاسی و ئێمناهیێ یێن پارێزگەهـ د ماوەیێ بەری هینگێ ڕا تێرا بۆری ب تایبەت ڕێكێن ڤەگوهاستنا ترۆمبێلان. بەرهەمێ ڤان كارگەهان و نێزیكیا وان بۆ جهێ بكارئینانێ بوونە ئەگەرێ زێدەكرنا ڕێكێن ڤیركری، د ڤی ماوەیی دا سەرجەمێ گشتی یێ ڕێكێن ڤیركری گەهشتە (٣٧٧) كیلومەتران.

**خشتەیێ (٤)**

**هژمارا كارگەهێن ئەسفەلتی و شیانێن وان یێن بەرهەم ئینانێ ئەوێن دناڤبەرا سالێن ١٩٦٩-١٩٨٠ دا ل پارێزگەها دهۆكێ هاتینە ئاڤاكرن**

| ناڤێ كارگەهێ | دیرۆكا دروستكرنێ | شیانێن دیزاینكرنێ تەن/ دەمژمێر | شیانێن بەرهەم ئینانێ تەن/ دەمژمێر |
|---|---|---|---|
| لۆمانا | ١٩٧٢ | ٤٥ | ٤٠ |
| زاخۆ | ١٩٧٢ | ٤٥ | ٤٠ |
| سكرین | ١٩٧٧ | ٨٠ | ٥٠ |
| سكرین | ١٩٧٧ | ٨٠ | ٥٠ |
| بالندا | ١٩٧٨ | ٨٠ | ٥٠ |
| حۆجافا | ١٩٧٨ | ٨٠ | ٥٠ |
| بێكوفا | ١٩٧٨ | ٨٠ | ٥٠ |
| ئاكرێ | ١٩٧٨ | ٨٠ | ٥٠ |
| سەرتەنگ | ١٩٧٨ | ٨٠ | ٦٥ |

ژێدەر: ژ كارێن ڤەكۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر:

- خمی ناصر رشید، تقدیر و تحلیل دالة إنتاج معمل أسفلت سرطنك، رسالة ماجستیر، غیر منشورة، مقدمة الی قسم الاقتصاد، كلیة لإدارة والاقتصاد، جامعة دهوك، ١٩٩٩، ص٣٤.

ل سالا ١٩٧٥ێ رێڤەبەرییەکا تایبەت بۆ رێکان ل پارێزگەها دهۆکێ ژ رێڤەبەریا کاری هاتە ڤەکرن ئەوژی ژ پێخەمەت هندێ کارێ سەرەکی یێ ڤێ رێڤەبەریێ یێ تایبەت بیت ب پرۆژەیێن رێك و پران و فرەهکرنا تۆرێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان، ڤێ رێڤەبەریێ (١٤) پرۆژە ئەنجامدان کو (١٠) ژ وان تایبەت بوون بۆ رێکان و ب درێژاهیێن جودا جودا و کوژمەیێ (١٧,٥٢٧٠٠٠)دیناران لێ هاتە مەزاختن، هندەك ژ ڤان پرۆژەیان بۆ چاککرنا رێکێن بەری هینگێ بوو[٣٠]. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٥) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیی ژمارە (٥) راستیە بۆ مە دیار دبن،**

١. سەرجەمێ گشتی یێ رێکێن قیرکری د ڤی ماوەیی دا ل پارێزگەها دهۆکێ (٣٧٧)

**خشتەیێ (٥)**

**درێژاهیێن رێکێن ترۆمبێلان یێن قیرکری و ساخلەتێن وان یێن هۆنەری یێن ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە دروستکرن دناڤبەرا سالێن ١٩٦٩-١٩٨٠**

| ناڤێ رێکێ | سال | درێژاهی/کم | فرەهی/م | هژمارا سایدان |
|---|---|---|---|---|
| دێرەبوون- ئیبراهیم خەلیل | ١٩٧٨ | ١٥,٢٥ | ١٣ | ئێك ساید |
| سێمێل - سێجێ | ١٩٨٠ | ٦,٥٠ | ١٣ | ئێك ساید |
| زاویتە - کۆرێت گاڤانا - حۆجاڤا -مانگێش | ١٩٧٤ | ٢٧,٢٥ | ١٣ | ئێك ساید |
| بامەرنێ - ئەرەدنا - ئێنیشکێ - قەدش | ١٩٧٤ | ٨,٧٨ | ١٣ | ئێك ساید |
| باستکێ - ئاسیهێ | ١٩٧٤ | ١٢,٠٢ | ١٢ | ئێك ساید |
| بێگوڤا - کێستە | ١٩٧٨ | ٣,٤٧ | ١١ | ئێك ساید |
| مفرەق ئەتریش - شلیا -سەرێ کانیکا | ١٩٧٨ | ١٥,٨٥ | ١١ | ئێك ساید |
| مفرەق ئەتریش - نسرا - ربەتکێ - هەسنەکا | ١٩٧٨ | ٢٣,٦٢ | ١٢ | ئێك ساید |
| دێرەبون - فێشخابور - پرا سحێلە | ١٩٧٦ | ٧,٨٠ | ١٢ | ئێك ساید |
| مفرەق گرشین - دێرەبوون - پرا سحێلە | ١٩٧٦ | ٢٤,٩٢ | ١٣ | ئێك ساید |
| دووریانا باکرمان - هزار جۆت - شەرمن - باکرمان | ١٩٧٤ | ٢,٥٠ | ١٣ | ئێك ساید |
| هێزاوە - دەرکار - شەرانش | ١٩٧٨ | ١٩,٢٠ | ١١ | ئێك ساید |
| باجیکا - قەرەولا | ١٩٧٩ | ٣,٤٨ | ١٣ | ئێك ساید |
| زاخۆ - باتیفا - زرێزە - کانی ماسێ | ١٩٧٤ | ٨٢,٩٢ | ١٣ | ئێك ساید |
| بریفکا - بابیرێ - دیهێ - هەمزا - شرتێ | ١٩٧٨ | ٢٥,٥٩ | ١٢ | ئێك ساید |
| زاویتە - کۆرێت گاڤانا - بێنارینکێ - بێدول | ١٩٧٨ | ٤,٦٤ | ١٣ | ئێك ساید |
| زاویتە - بابلو - بێدول - ئەتریش - بلان - قەسرۆك | ١٩٧٦ | ٤٨,١١ | ١٣ | ئێك ساید |
| پرا شکەفتێ - دووریانا ئەتروش | ١٩٧٦ | ٩,٩٣ | ١٢ | ئێك ساید |
| ئامێدی - دێرەلۆك - بالندا | ١٩٧٩ | ٣٥,٤٣ | ١٣ | ئێك ساید |
| درێژاهیێن گشتی یێن رێکێن دروستکری/کم | | ٣٧٧,٢٦ | | |

ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر داتایێن پاشکۆیێ ئێکی یێ نامەیا ماستەرێ، ئەکرەم محەمەد تاهر.

کیلومەتربوون و هەمی ژی ئێك ساید بوون و فرەهییا وان دناڤبەرا (١١-١٣) مەتران دابوو.

٢. ئەڤ ماوەیە دهێتە نیاسین ب دەستپێکا گرنگیدانا تۆرێن رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆکێ چونکی تێدا (١٩) رێك ب درێژاهییێن جودا جودا هاتنە دروستکرن ب تایبەت پشتی رێکەفتنامەیا ١١ ئاداری.

٣. رێکا دناڤبەرا (زاخۆ- باتیفا- زرێزە- کانی ماسی) دهێتە هژمارتن درێژترین رێك کو ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە دروستکرن و وێ دگەهیتە ٨٢,٩٢ کم.

٤. ل دووڤ دا رێکا دناڤبەرا (زاویتە - بابلو - بێدول - ئەتریش- بلان- قەسرۆك) ل رێزا دووێ دهێت کو ل سالا ١٩٧٦ێ هاتییە دروستکرن و وێ دگەهیتە (٤٨,١١)کم، تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٣) بکە.

٥. پێنج رێکێن دی ژی هەنە کو درێژاهییێن وان دناڤبەرا (٢٠-٣٥) کیلومەترانە و ڤان رێکان ب خۆڤە دگریتن رێکا (ئامێدی- دێرەلۆك - بالندا)

**نەخشەیێ (٣)**

**تۆرا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان یێن ڤێرکری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ١٩٨٠**




ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر

١. داتایێن خشتەیێ ژمارە ٤

٢. حکومة أقلیم کوردستان العراق،وزارة التخطیط، الهیئة العلیا للإحصاء، مدیریة أحصاء دهوك،قسم Gis،بیانات غیر منشورة.

3. Kurdistan Region-Iraq. Map prepared by JHIC joints Humanitarian information Center. Duhok Governorate Base Map scale 1:500000.

٣٥ کم، رێکا (زاویتە - کۆرێت گاڤانا - حۆجاڤا - مانگێش) ٢٧,٢٥ کم، رێکا (بریفکا- بابیرێ- دیهێ - هەمزا - شرتێ)٢٥,٥٩ کم، رێکا (دوو‌ریانا گرشین- دێرەبون - پرا سحێلە) ٢٤,٩٢ کم، رێکا (دوو‌ریانا ئەتریش - نسرا - ربەتکێ - هەسنەکا) ٢٣,٦٢ کم.

٦. رێکێن دی ژی درێژاهیێن وان کێمترە ژ(١٢) رێکان و هژمارا وان ژی ١٢ رێکێن ڤێرکری نە.

سەرەرای زێدەبوونا رێکێن هاتنوچوونێ ل پارێزگەها دهۆکێ، هژمارا ترۆمبێلان ژی زێدە بوو، ل سالا ١٩٧٣ێ هژمارا ترۆمبێلێن توومارکی ل پارێزگەهێ بتنێ ٢١٤ ترۆمبێل بوون کو ژ وان ژی ٤٩ یێن تایبەت و ٧٥ یێن کرێ و ٩٠ بارهەلگر، لێ ل سالا ١٩٧٦ێ هژمارا وان گەهشتە ٧٧٥ ترۆمبێلان کو ژ وان ژی ١٤٤ یێن تایبەت و ٢٥١ یێن کرێ و ٣٨٠ بارهەلگر. ل سالا ١٩٧٩ێ هژمارا وان گەهشتە ١١٨٣ ترۆمبێلان کو ژ وان ژی ٢٦٠ یێن تایبەت و ٣١٠ یێن کرێ و ٦١٣ بارهەلگر. ل سالا ١٩٨٠ێ هژمارا وان گەهشتە ٢٠٥١ ترۆمبێلێن جودا جودا یێن تایبەت و کرێ و بارهەلگر. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٦) بکە.

ژ داتایێن ڤی خشتەیی بۆ مە دیاردبیت کو سالانە هژمارا ترۆمبێلان زێدەبوویە و ڤێ چەندێ رەنگڤەدان ل سەر درێژیێن رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەهێ کریە، زێدەباری لایەنی گەشتوگوزاری کو پارێزگەهـ یا پێ ناڤدارە. پێدڤییە ئەم رۆلێ فاکتەرێ سیاسی و لەشکەری ژی ژبیر نەکەین کو کاریگەرییەکا راستەوخۆ ل سەر زێدەبوونا درێژاهیا رێکان و فرەهبوونا تۆرا ڤەگوهاستنێ هەبوویە.

## قۆناغا سیێ: رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەهێ د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن ١٩٨١-١٩٩٠ دا:

ئەڤ قۆناغە یا هەڤدەم بوو دگەل شەرێ عیراق و ئیرانێ کو بۆ ماوەیێ نێزیکی هەشت سالان ڤەکێشابوو و پتریا داهاتێ عیراقی بۆ شەری دچوو ژبەرکو بودجەیەکا مەزن بۆ پێدڤیێن لەشکەری دهاتە تەرخانکرن و ب ڤی رەنگی بودجەیێ تەرخانکری بۆ پرۆژەیێن ئابووری و گەشەپێدانێ دهاتە کێمکرن ب تایبەت بودجەیێ تەرخانکری بۆ کەرتێ هاتنوچوون و ڤەگوهاستنێ[٣١].

د ڤی ماوەیی دا پتر گرنگی ب دروستکرنا رێکێن ل دەڤەرێن سەر سنوورێ کوردستانا عیراقێ دگەل وەلاتێ ئیرانێ دهاتە دان لێ ژبەرکو پارێزگەها دهۆکێ یا دوورە ژ سنوورێ دناڤبەرا عیراق و ئیرانێ دا، ژبەر

**خشتەیێ (٦)**

**هژمار و جورێ ترۆمبێلێن توومارکی ل پارێزگەها دهۆکێ و رێژەیا زێدەبوونا وان ل دووڤ سالان (١٩٧٣، ١٩٧٦، ١٩٧٩)**

| سال | جۆرێن ترۆمبێلان | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | تایبەت | کرێ | بارهەلگر | سەرجەم | رێژا زێدەبوونێ |
| ١٩٧٣ | ٤٩ | ٧٥ | ٩٠ | ٢١٤ | - |
| ١٩٧٦ | ١٤٤ | ٢٥١ | ٣٨٠ | ٧٧٥ | -٢٦٢,١ |
| ١٩٧٩ | ٢٦٠ | ٣١٠ | ٦١٣ | ١١٨٣ | -٥٢,٦ |
| ١٩٨٠ | - | - | - | ٢٠٥١ | -٧٣,٣ |

**ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر**

١. عبدالله غفور، جوکرافیای کوردستان، مطبعة وزارة التربية، ط٤، سنة٢٠٠٥، ص٣٩٩

٢. دهوك في أحضان الثورة، مصدر سابق، ص٨١

٣. نشوان شكري هروري، مصدر سابق، ص٣٠١ .

هندێ گرنگییەکا هوسا پێ نەهاتییە دان کو هەژی ئاماژەپێکرنێ بیت. ئەو رێکێن د ڤی ماوەیی دا هاتینە دروستکرن ب هەڤبەرکرن دگەل ماوەیێ بەری نوکە، گەلەك د کێم بوون ب ڕەنگەکی سەرجەمێ گشتی رێکێن هاتینە دروستکرن د ڤی ماوەیی دا بتنێ نێزیکی (١٨٢) کیلومەتران بوون. زێدەباری ڤێ چەندێ پتریا عەردێ پارێزگەهێ دکەڤیتە دەڤەرێن چیایی و بتنێ رێکێن لێ هاتینە دروستکرن ژی بۆ مەرەمێن لەشکەری بوون ژبەر هندێ دگوتنێ رێکێن لەشکەری. د خشتەیێ ژمارە (٧) دا ئەم دشێین تێبینییا گرنگترین رێکێن د ڤی ماوەیی دا هاتینە دروستکرن بکەین.

**ژ داتایێن ڤی خشتەیی ئەڤ ڕاستیە بۆ مە دیار دبن:**

١. هژمارا رێکێن دروستکری د ڤی ماوەیی دا بتنێ (١٢) رێك بوون و هەمی ژی د ئێك سايد بوون بتنێ رێکا (دووریانا بێسرێ - دووریانا پرا ئالوکا) نەبیت کو یا دو سايد بوو ل سالا ١٩٨١ێ هاتییە دروستکرن و درێژاهیا وێ نێزیکی (١٢,٥)کیلومەترا و فرەهیا وێ ژی نێزیکی (٤٠,٥) مەتران بوو.

٢. رێکا (پرا بالندا- ئاڤا مارك- سیدا- چەم جێ) دهێتە هژمارتن درێژترین رێك کو د ڤێ قۆناغێ دا

**خشتەیێ (٧)**

**درێژاهیێن رێکێن ترۆمبێلان یێن ڤێرکری و ساخلەتێن وان یێن هونەری یێن ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە دروستکرن دناڤبەرا سالێن ١٩٨١-١٩٩٠**

| ناڤێ رێکێ | سال | درێژاهی/کم | فرەهی/م | هژمارا سايدان |
|---|---|---|---|---|
| دووريانا بێسری-دووریاناپرا ئالۆکا | ١٩٨١ | ١٢,٥ | ٤٠,٥ | دوو سايد |
| دووريانا دوکەرێ – باتووفا | ١٩٨٢ | ٥,٦ | ١٣ | ئێك سايد |
| دووريانا خیزاڤا –کشان – شەڕانش | ١٩٨٥ | ٢٢,٢ | ١١ | ئێك سايد |
| کانی ماسێ – شمايلا – تروانش – پرا ئالۆکا | ١٩٨٨ | ٢٣,٦ | ١٣ | ئێك سايد |
| شرتێ – داودیە – بەندا – مانگێش | ١٩٨٤ | ١٧,٧ | ١٣ | ئێك سايد |
| شرتێ – بامەرنێ – سکرین – ئاشەوا | ١٩٨٤ | ١٦,٦ | ١٣ | ئێك سايد |
| ئاشەوا – گارە – بەرئاش | ١٩٨٩ | ١١,٥ | ١٢ | ئێك سايد |
| سەرسنکا دەرەکی– دووريانا ئێنیشکێ – قەدش | ١٩٨٩ | ١٢,٣ | ١٣ | ئێك سايد |
| پرا بالّندا – ئاڤا مارك – سەیدا – چەم جێ | ١٩٨٧ | ٢٧,١ | ١٢ | ئێك سايد |
| سێمێل – مسێریك | ١٩٨٨ | ٩,٢ | ١٣ | ئێك سايد |
| دووريانا سپینداری – چیایێ گارە | ١٩٨٨ | ١٥,٤ | ١٢ | ئێك سايد |
| ئاشەوا – سەرسنك | ١٩٨٧ | ٨,٢ | ١١ | ئێك سايد |
| درێژاهیێن گشتی یێن رێکێن دروستکری/کم | ١٨١,٩٤ | | | |

**ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر داتایێن پاشکۆیێ ئێکی یێ نامەیا ماستەرێ، ئەکرەم محەمەد تاهر.**

نەخشەیێ (٤)
تۆرا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان یێن ڤێركری ل پارێزگەها دهۆكێ ل سالا ١٩٩٠




ژێدەر: ژ كارێن ڤەكولەری یە ب پشتبەستن ل سەر

١. داتایێن خشتەیێ ژمارە ٧

٢. حكومة أقليم كوردستان العراق،وزارة التخطيط، الهيئة العليا للإحصاء، مديرية أحصاء دهوك، قسم Gis،بيانات غير منشورة.

3. Kurdistan Region-Iraq. Map prepared by JHIC joints Humanitarian information Center. Duhok Governorate Base Map scale 1:500000.

هاتبیتە دروستكرن ئەوا ل سالا ١٩٨٧ێ هاتییە دروستكرن، درێژاهیا وی دگەهیتە (٢٧,١) كیلومەتران. ژبلی ڤێ رێكێ دو رێكێن دی ژی د ڤی ماوەیی دا هاتینە ڤێركرن كو درێژاهیێن وان دناڤبەرا (٢٢-٢٣,٦) كیلومەتران دا بوون ئەوژی رێكا (دووریانا خیزاڤا - كەشان - شەرانش) و رێكا (كانی ماسێ - شمایلا - تروانش - پرا ئالوكا) بوون.

٣. كومەكا رێكێن دی ژی هەنە كو درێژاهیا وان ژ (١٠) كیلومەتران نابووریت وەك رێكا (سێمێل - مسێریك)، رێكا (ئاشەوا - سەرسنك) و رێكا (دووریانا دوكەرێ - باتووفا) و درێژاهیا وان دگەهیتە (٩,٢، ٨,٢، ٥,٥) كیلومەتران ل دووف ئێك. تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٤) بكە.

## قۆناغا چوارێ: پێشكەفتنا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەها دهۆكێ د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن ۱۹۹۱-۲۰۰۲ دا:

چ جوداهيیا هوسا مەزن دناڤبەرا ڤێ قۆناغێ و قۆناغێن بەری نوكە دا نينە ل دۆر دروستكرنا رێكێن هاتنوچوونێ ل پارێزگەها دهۆكێ، لێ تشتێ ئێكانە د ڤێ قۆناغێ دا راگەهاندنا حكۆمەتا هەرێما كوردستانا عيراقێ بوو ل سالا ۱۹۹۲ێ پشتی كو هەلبژارتن ل رێكەفتی ۱۹ گولانا ۱۹۹۲ێ هاتينە كرن[۳۲]. ئەڤ حكۆمەتە ژ ۱٦ وەزارەتان پێكدهات، ئێك ژ وان ژی وەزارەتا ڤەگوهاستن و گەهاندنێ بوو[۳۳] كو ب هەماهەنگی دگەل وەزارەتێن دی گرنگی ددا كەتوار و ئاريشەیێن تۆرا رێكێن ڤەگوهاستنێ ل هەرێما كوردستانێ. ڤێ وەزارەتێ چەندين رێكێ نوو دروستكرن و چەندين رێكێن بەری نوكە هاتينە دروستكرن و ژبەر كاودانێن سياسی خراب بووين، دووبارە چاككرنەڤە.

دەركەفتنا بريارا ئەنجومەنێ ئێمناهيێ يا ژمارە (۹۸٦) يا ناڤدار ب بريارا (نەفت بەرامبەر خوارنێ) ل رێكەفتی ۱۹۹٥/٤/۱٤ و ل سالا ۱۹۹٦ێ چوو د بوارێ بجهئينانێ دا، كاريگەرييەكا مەزن ل سەر كاودانێن ئابووری و جڤاكی و رەوشەنبيری يێن گشت پارێزگەهێن هەرێمێ هەبوو ب رەنگەكی د ڤێ بريارێ دا هاتبوو سەپاندن پێدڤييە (۱۳٪)ێ ژ داهاتێ نەفتێ د هەر قۆناغەكێ ژ قۆناغێن وێ كو هژمارا وان ۸ قۆناغ بوون، ژبۆ پارێزگەهێن هەرێما كوردستانێ بێتە تەرخانكرن. ڤێ بريارێ كاريگەری ل سەر پێشئێخستنا تۆرا رێكێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل سەرانسەری هەرێمێ ب گشتی و پارێزگەها دهۆكێ ب تايبەتی هەبوو. ئەڤ داهاتە دهاتە تەرخانكرن بۆ بجهئينانا پرۆژەیێن ئابووری و گەشەپێدانێ كو ژوان ژی پرۆژەیێن بەرفرەهكرن و دروستكرنا رێكێن ترۆمبێلان بوو[۳٤]. بەهرا پارێزگەها دهۆكێ نێزيكی (۲۳٪)ێ بوو ژ سەرجەمێ گشتی یێ داهاتێ تەرخانكری بۆ هەرێما كوردستانێ و ئەڤ داهاتە ل دووڤ رێژەيا ئاكنجيين پارێزگەهێن هەرێمێ دهاتە دياركرن[۳٥].

هەردیسان رێكخراوا "هابيتات" ژ لايێ خۆڤە رابوو ب دروستكرنا چەندين پرۆژەیێن رێكێن هاتنوچوونێ ل گوند و دەڤەران ب كوژمەیێن جودا جودا ل هەمی قەزايێن پارێزگەها دهۆكێ دناڤبەرا قۆناغێن (۱- ۸) دا ژ بريارا (۹۸٦). ڤێ رێكخراوێ شيا د ماوەیێ ڤان هەر هەشت قۆناغان دا (۱۱٦) پرۆژەیێن دروستكرنا رێكان ب (۱۰۸۹,٥) كيلومەتران بجهبينيت.

زێدەباری ڤێ چەندێ، هژمارا وان پرۆژەیێن هاتينە بجهئينان يان ژی د قۆناغا داویێ يا بجهئينانێ دا ل وی وەختی گەهشتبوونە (٤٠) پرۆژەيان ب (۲٥٦,۳) كيلومەتران، لێ هژمارا پرۆژەیێن د قۆناغا بجهئينانێ دا (۳٤) پرۆژە بوون ب (۱۹٦) كيلومەتران. زێدەباری وان پرۆژەیێن كرينە د پلانا خۆ دا كو ئەوژی (٤۲) پرۆژە بوون و د قۆناغێن جودا جودا يێن پلاندانان و ديزاينكرن و رازيبوونێ دا ب (٦۳٦,٦) كيلومەتران، لێ پتريا ڤان رێكێن، هاتينە دروستكرن رێكێن، گوندان بوون ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (۸) بكە.

**ژ داتايێن خشتەیێ ژمارە (۸) راستيە بۆ مە ديار دبن:**

۱. د ڤێ قۆناغێ دا (۱۹) پرۆژەیێن دروستكرن و ڤێركرنا رێكێن هاتنوچوونێ ل پارێزگەها دهۆكێ هاتينە ئەنجامدان ب درێژيا (۳٦۸,۳٤۳)كيلومەتران و هەمی ژی رێكێن ئێك سايد بوون.

۲. ژ سەرجەمێ ڤان رێكان، هەشت ژوان رێكان ب تايبەتمەنديێن نەباش بوون ژ لايێ فرەهيێ ڤە ژبەركو فرەهيیا وان ژ (۹,٥) مەتران نەدبۆری و رێكێن ئێك سايد بوون. لێ پێنج ژڤان رێكان خودان تايبەتمەنديێن باش بوون و فرەهيیا رێكا وان يا ئێك سايدی نێزيكی (۱۳) مەتران بوو.

۳. سێ ژڤان رێكان ژ (٤٠) كيلومەتران پتر بوو، درێژترين رێك يا (ئاميدی كوانێ - گەليێ ديرەشێ - گيزێ - بەليتێ) بوو ب درێژيا (٤۹,۳۲) كيلومەتران و ل دووڤ دا رێكا (دووريانا قەرەناس - كربدەو - دارەتو - بينيان - بشيريان) ب (٤٦,٦۲) و ئەڤ هەردو رێكە ل سالا ۱۹۹۹ێ هاتينە دروستكرن. تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٥) بكە.

**خشتەیێ (٨)**

**درێژاهیێن رێکێن ترۆمبێلان یێن ڤێرکری و ساخلەتێن وان یێن هونەری یێن ل پارێزگەها دهۆكێ هاتینە دروستکرن دناڤبەرا سالێن ١٩٩١-٢٠٠٢**

| ناڤێ رێکێ | سال | درێژاهی/کم | فرەهی/م | هژمارا سایدان |
|---|---|---|---|---|
| ئیسماعیل ئاڤا - خراب دێم | ٢٠٠١ | ١٠,٤٩ | ١٢ | ئێك ساید |
| مرێبا - خنس - ئاشکەفتیان | ٢٠٠٢ | ١٨,١٢ | ١٣ | ئێك ساید |
| زاخۆ - تاوکێ - لیڤو - سپێنداروك - دووریانا دوکەرێ | ١٩٩٨ | ٤٥,٨٠ | ١٣ | ئێك ساید |
| بازێ - چەم سیدا - خشخاش -تشیشێ | ١٩٩٤ | ٦,١٢ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| کانی ماسی - دۆرێ - سەر زێرێ | ١٩٩٨ | ٩,١١ | ١٢ | ئێك ساید |
| کومەلگەها ئازادی - گەلی گەرەگو - مێرگەتی | ١٩٩٩ | ٧,٦٧ | ١٣ | ئێك ساید |
| ئامێدی - ئامێدی نوو - هەڤندکا | ١٩٩٨ | ١١,٦٧ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| ئامێدی کوانێ - گەلی دێرەشێ - گیزێ - بەلیتێ | ١٩٩٩ | ٤٩,٣٢ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| دێرەلوك - هاریکا - هلۆرا | ٢٠٠١ | ٢١,٦٥ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| دووریانا کەلەکچی - کەلەکچێ | ١٩٩٨ | ٧,٠٣٣ | ١١ | ئێك ساید |
| مەهەت - زیلکان | ٢٠٠٠ | ١٥,٩٨ | ١١ | ئێك ساید |
| دووریانا خەلیکان - قەسروك | ١٩٩٣ | ٧,١١ | ١٣ | ئێك ساید |
| دووریانا قەرەناس - کریدەو - دارەتوو - بینیان - بشیریان | ١٩٩٩ | ٤٦,٦٢ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| بەردەرەش - دارەتوو | ١٩٩٩ | ٩,٥٤ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| چەم رەبەتکێ - بلمند - باکرمان - کشکاوە | ١٩٩٧ | ٢١,٥٧ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| دینارتە - ئامادا - سەر کەندال - بەخمە | ٢٠٠٢ | ٢٩,٨٥ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| سوارەتۆکا - سپیندارێ - سیارێ - چمانکێ - پرا شکەفت | ١٩٩٦ | ٣٧,٥١ | ١٢ | ئێك ساید |
| بلان - پرا ئەتروش | ٢٠٠٠ | ١٠,١٨ | ١٣ | ئێك ساید |
| بجیل - مزار بجیل | ١٩٩٧ | ٣,٠٠ | ١١ | ئێك ساید |
| درێژاهیێن گشتی یێن رێکێن دروستکری/کم | ٣٦٨,٣٤٣ | | | |

ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر داتایێن پاشکۆیێ ئێکی یێ نامەیا ماستەرێ، ئەکرەم محەمەد تاهر.

٤. هژمارا وان رێکێن درێژیا وان ژ (١٠) کیلومەتران نەدبۆری ب تنێ (٧) رێك بوون یێن دڤێ ڤۆناغێ دا هاتینە دروستکرن.

زێدەباری ڤێ چەندێ، هژمارا ترۆمبێلان ژی ل پارێزگەها دهۆكێ بەرەڤ زێدەبوونێ ڤە دچوو چونکی ئێدی ئاستێ گوزەراتی یێ خەلکی ژی بەرەڤ باشتر دچوو و دگەل کاروانێ پێشکەفتنێ بوون، هەردیسان ئەو پێشکەفتنا هەرە مەزن یا د پیشەسازیا ترۆمبێلان دا ب خۆ ڤە دیتی کو ل سەرانسەری جیهانێ ئێدی ب هژمارەکا مەزن دهێنە دروستکرن و فرێکرن بۆ بازارێن جیهانێ. خالا ژ هەمییان گرنگتر ژی بەرقەراربوونا کاودانێن سیاسی ل هەرێما کوردستانێ. هژمارا

نەخشەیێ (٥)
تۆرا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان یێن ڤێرکری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠٠٢




ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر:
١. داتایێن خشتەیێ ژمارە ٨
٢. حکومة أقلیم کوردستان العراق، وزارة التخطیط، الهیئة العلیا للإحصاء، مدیریة أحصاء دهوك،قسم Gis،بیانات غیر منشورة.
3. Kurdistan Region-Iraq. Map prepared by JHIC joints Humanitarian information Center. Duhok Governorate Base Map scale 1:500000.

ترۆمبێلێن توومارکری ل پارێزگەها دهۆکێ ل دوماهییا ڤێ قۆناغێ دگەهشتە ٣٢٩٠٣ ترۆمبێلێن جۆراوجۆر. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (٩) بکە.

**ژ داتایێن خشتەیێ ژمارە (٩) راستیە بۆ مە دیار دبن:**

١. زێدەبوونا هژماران ترۆمبێلان ب شێوەیەکێ مەزن ل داویا ڤێ قۆناغێ دا ب تایبەت سالا ٢٠٠٢ێ کو هژمارا وان دگەهشتە ٢١٣٦٣ ترۆمبێلێن جۆراوجۆر، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ئێدی هزر د هندێ دا بێتەکرن کو ل پاشەرۆژێ تۆرا رێکێن هاتنوچوونێ بێتە فرەهکرن و ئەم دێ تێبینییا ڤێ چەندێ ل دوماهییا ڤێ ڤەکۆلینێ بکەین.

٢. سالێن (١٩٩٨، ١٩٩٩، ٢٠٠٠) ئاراستەیەکێ نەرێنی د زێدەبوونا هژمارا ترۆمبێلێن توومارکری ل پارێزگەهێ هەبوو ب تایبەت ل سالا ٢٠٠٠ێ کو نێزیکی (١٦,٥) بوو ل دەڤەرا ڤی ڤەکۆلینێ.

٣. سالێن (٢٠٠١، ٢٠٠٢) بلندترین رێژە بەرەڤ ئاراستێ ئەرێنی یێ هژمارا ترۆمبێلان هاتییە توومارکرن ل دەڤەرێ کو نێزیکی (٤٨٨,٧، ٢٧٠,٢) بوو ل دووڤ ئێك.

خشتەیێ (٩)

هژمارا ترۆمبێلێن توومارکی ل پارێزگەها دهۆکێ و رێژەیا زێدەبوونا وان یا سالانە دناڤبەرا سالێن (١٩٩٦-٢٠٠٢)

| سال | سەرجەمێ گشتی یێ ترۆمبێلێن توومارکری | رێژا زێدەبوونێ |
|---|---|---|
| ١٩٩٦ | ١٢١٠ | - |
| ١٩٩٧ | ١٣٠٠ | ٧,٤ |
| ١٩٩٨ | ١١٠٥ | ١٥- |
| ١٩٩٩ | ١١٧٥ | ٦,٣ |
| ٢٠٠٠ | ٩٨٠ | ١٦,٥ |
| ٢٠٠١ | ٥٧٧٠ | ٤٨٨,٧ |
| ٢٠٠٢ | ٢١٣٦٣ | ٢٧٠,٢ |
| سەرجەمێ گشتی | ٣٢٩٠٣ | |

ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر

- حكومة اقليم كوردستان العراق، وزارة الداخلية، المديرية العامة للمرور في محافظة دهوك، شعبة الإحصاء، سجلات غير منشورة

## قۆناغا پێنجێ: پێشکەفتنا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان ل پارێزگەهێ د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن ٢٠٠٣-٢٠١٤ دا:

ئەڤ قۆناغە دهێتە هژمارتن گرنگرتین ئەو قۆناغا تۆرا رێکێن هاتنوچوونێ ل پارێزگەها دهۆکێ پێشکەفتن ب خۆ ڤە دیتی ب هەڤبەرکرن دگەل قۆناغێن بەری نوکە، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت کو د ڤێ قۆناغێ دا هەرێما کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی د سەقایەکێ سیاسی و ئابووریێ سەقامگیر دا دبۆری، زێدەباری وان گوهۆرینێن سیاسی و ئابووری یێن ل گشت عیراقێ پەیدابووین کو کاریگەرییەکا راستەوخۆ ل سەر گەشەکرن و پێشکەفتنا دەڤەرێ هەبوو د هەمی بواران دا ب تایبەت بوارێ ئاڤاکرنا ئەرتکازی ب شێوەیەکێ گشتی و کەرتی هاتنوچوونێ ب تایبەتی.

ئەڤ قۆناغە یا هەڤدەم بوو دگەل دەستپێکرنا داگیرکرنا عیراقێ ژ لایێ هێزێن ئەمریکی ڤە ل سالا ٢٠٠٣ێ و دروستکرنا ئەنجومەنێ فەرمانرەوایيا بەروەخت ژبۆ ب رێڤەبرنا وەلاتی، ڤی ئەنجومەنی چەندین بریارێن گرنگ دەرێخستن وەك بریارا دروستکرنا سندوقا ئاڤاکرن و گەشەپێدانێ ل عیراقێ ل سالا ٢٠٠٤ێ، هەردیسان ڤی ئەنجوومەنی بودجەیێ گشتی یێ عیراقێ دەستنیشانکر و تێدا بەهرا هەرێما کوردستانێ ژی ب رێژەیا (١٧٪)ێ هاتە جێگیرکرن و هەرێمێ ژی بەشەك ژ ڤی بودجەیی بۆ ئاڤاکرن و دروستکرنا رێکان تەرخانکر[٣٦].

د ڤێ قۆناغێ دا، پارێزگەها دهۆکێ چەندین گوهۆرین و پێشکەفتن د هەمی بواران دا ب خۆ ڤە دیتن و ئەگەرێ وێ ژی بۆ سەقامگیریا سەقایێ ئابووری و سیاسی یێ پارێزگەهێ دزڤری. سەرەرای چێکرنا هژمارەکا رێکێن نوو د ڤێ قۆناغێ دا، تەماشەی خشتەیێ ژمارە (١٠) بکە، رێڤەبەریا گشتیا رێکوپران ل پارێزگەهێ دەست ب نووژەنکرنا چەندین رێکێن کەڤن کر و فرەهکرن و هندەك ژ وان ژی کرنە رێکێن دو سایدی ب تایبەت رێکێن سەرەکی. سەرجەمێ گشتی یێ رێکێن د ڤێ قۆناغێ دا هاتینە دروستکرن گەهشتە (٤٠٩) کیلومەتران. تەماشەی خشتەیێ ژمارە (١٠) و نەخشەیێ ژمارە (٦) بکە.

خشتەیێ (١٠)
درێژاهیێن رێکێن ترۆمبێلان یێن ڤیرکری و ساخلەتێن وان یێن هونەری یێن ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینە دروستکرن دناڤبەرا سالێن ٢٠٠٢-٢٠١٤

| ناڤێ رێکێ | سال | درێژاهی/کم | فرەهی/م | هژمارا سایدان |
|---|---|---|---|---|
| قومری - سەرەرو - ئۆرە | ٢٠١٣ | ١٦,٠٨ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| خورینیێ - کانی باسکا - دووریانا بانێ | ٢٠٠٦ | ١٣,٢٧ | ١٣ | ئێك ساید |
| دهۆك- ئەڤریکێ - باعەدرێ | ٢٠١٢ | ٣٢,٨٧ | ٤٠,٥ | دوو ساید |
| مفرق گەلی خودێدا - باعەدرێ | ٢٠١١ | ٩,٤٩ | ١٣ | ئێك ساید |
| دووریانا باکرمان - دلیجان - ئامیان - بەردەرەش | ٢٠١٤ | ١٥,٤٢ | ١٣ | ئێك ساید |
| قەسرۆك - کندێ | ٢٠١٢ | ١٢,٠١ | ١٣ | ئێك ساید |
| بەردەرەش - کەلەك | - | ٣٥,٩٩ | ١٣ | ئێك ساید |
| روڤیا چەمە | ٢٠٠٣ | ١٨,٦١ | ١٣ | ئێك ساید |
| دارەتوو- کومەزەرد - گردەپان | ٢٠١٣ | ١٣,٥٥ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| پرا شکەفتێ - بلمباس - جەم رەبەتکی | ٢٠١٤ | ١٤,٠٣ | ١٣ | ئێك ساید |
| پیرەکەبرا - هەرن - جاربوت | ٢٠٠٩ | ١٤,٨٣ | ١٣ | ئێك ساید |
| دووریانا گرییش - گرییش ژورێ - ژێرێ | ٢٠٠٧ | ٥,٦٠ | ١١ | ئێك ساید |
| حەسەن ئاڤا - ئەرمشت - ئۆزمانا - مانگێش | ٢٠١٣ | ٣٦,٩٥ | ١٢ | ئێك ساید |
| کانی بەلاڤێ - بلیزان - بازێ - میسکا دەرگەلێ | ٢٠٠٤ | ٢٧,٣٢ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| ئورمانا - بناڤی –هدێنە | ٢٠٠٩ | ٨,٧٨ | ١١ | ئێك ساید |
| کانی ماسێ - مایێ - بێدهێ - ئورە | ٢٠١٤ | ٩,٧٧ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| دێمکا - صۆریا - شیلان - کشان | ٢٠١٠ | ٨,٢٨ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| لکان –بازێرە | ٢٠٠٨ | ١٠,١٠ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| باگێرات - خرابیا - خورینیێ | ٢٠١٠ | ١٣,٣٣ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| دهۆك- گەلی کورتکێی - پیرموس - رکاڤا | ٢٠٠٣ | ١١,٣٤ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| دووریانا وشتیان - کانی گولان - سیتکێ - شاریا | ٢٠٠٧ | ٢٨,٦٠ | ٩,٥ | ئێك ساید |
| دیرەبۆن - پرا سحیلا | ٢٠١٤ | ٦,١٣ | ١٣ | ئێك ساید |
| بجیل-سەرێ سادا | | ١٤,٢٦ | ١٣ | ئێك ساید |
| بەنداوا-تخلش-ئەلقوش | ٢٠١٤ | ١٣,٦٥ | ٣ | ئێك ساید |
| تەرجەلە –کەلەك | ٢٠٠٩ | ١٩,١١ | ٢٥,٥ | دوو ساید |
| درێژاهیێن گشتی یێن رێکێن دروستکری/کم | | ٤٠٩,٣٧ | | |

ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر داتایێن پاشکۆیێ ئێکێ، ناما ماستەرێ ، نیشان سورین موسیس.

**ژ داتایێن ڤی خشتەیی ئەڤ ڕاستییە بۆ مە دیار دبن:**

١. د ڤێ قۆناغێ دا (٢٥) پرۆژە هاتینە ئەنجامدان و ئەڤ چەندە بەلگەیە ل سەر پێشکەفتنا پەیدابووی د کەرتێ تۆرا رێکێن ڤەگوهاستنێ ل پارێزگەهێ کو رێکێن دروستکری دگەهشتە (٤٠٩,٣٧) کیلومەتران.

٢. هەروەکی د قۆناغێن بەری نوکە ژی دا، رێکێن ئێك ساید پتر ژ رێکێن دو ساید هاتینە دروستکرن. د ڤێ قۆناغێ دا بتنێ دو رێکێن دو ساید هاتینە ڤێرکرن ئەوژی رێکێن (دهۆك - ئەڤریکێ- باعەدرێ) و (تەرجەلە – کەلەك) ب درێژاهیێن (٣٢,٨٧، ١٩,١١) و ب فرەهیێن (٤٠,٥، ٢٥,٥). تەماشەی نەخشەیێ ژمارە (٦) بکە.

٣. ژ ڤان رێکان بتنێ (١٠) رێك د ئێك ساید بوون لێ تایبەتمەندیێن وان د باش بوون چونکی فرەهیا وان نێزیکی (١٣) مەتران بوون و ئەڤ چەندەژی تایبەتمەندییەکا باشە بۆ رێکێن ئێك ساید.

٤. فرەهیا (٩) رێکێن ئێك ساید نێزیکی (٩,٥) مەتران بوون و ئەڤ تایبەتمەندییە ژی تا رادەیەکی یا باشە لێ فرەهیا رێکا (بەنداوا- تلخش- ئەلقوش) نە ل سەر ئاستێ پێدڤییە کو بتنێ (٣) مەتر بوون.

٥. د ڤێ قۆناغێ دا (٣) رێك هاتینە دروستکرن کو درێژیا وان نێزیکی (٣٠) کیلومەترانە ئەوژی رێکێن (حەسەن ئاڤا - ئەرمشت - ئۆزمانا

**خشتەیێ (١١)**

**هژمارا ترۆمبێلێن توومارکی ل پارێزگەها دهۆکێ و ڕێژەیا زێدەبوونا وان یا سالانە دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٣-٢٠١٤)**

| سال | تایبەت | بارهەلگر | کرێ | چاندنێ | ئاڤاکرنێ | سەرجەمێ گشتی | ڕێژەیا زێدەبوونێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٣ | ١٤٧٩٧ | ٩٠٣٥ | ٢٧٠٠ | ٢٨٧ | ٢١٤ | ٢٧٠٣٣ | ٠ |
| ٢٠٠٤ | ٢٧٠٢٢ | ١١٥٢٦ | ٢٧٥٧ | ٢٨٧ | ٢١٤ | ٤١٨٠٦ | ٥٤,٦٤ |
| ٢٠٠٥ | ٣١٠٣٦ | ١٣٩١٨ | ٢٨٢٠ | ٢٨٨ | ٢١٤ | ٤٨٢٧٦ | ١٥,٤٧ |
| ٢٠٠٦ | ٣٤٤٧٥ | ١٥٨٠٤ | ٢٨٨٧ | ٢٩٨ | ٣٢٨ | ٥٣٧٩٢ | ١١,٤٢ |
| ٢٠٠٧ | ٣٥٨٦٢ | ١٦٧٦٢ | ٣٢٩٦ | ٣١٧ | ٣٦١ | ٥٦٥٩٨ | ٥,٢١ |
| ٢٠٠٨ | ٣٨٠٥٠ | ١٩٤٢٨ | ٣٦١١ | ٣٢٤ | ٣٧٦ | ٦١٧٨٩ | ٩,١٧ |
| ٢٠٠٩ | ٤٧٩١٨ | ٢٤١٥٢ | ٥١١٤ | ٣٦٧ | ٥٧٨ | ٧٨١٢٩ | ٢٦,٤٤ |
| ٢٠١٠ | ٥٩١٩٤ | ٣٣٩٠١ | ٨٠١٢ | ٦٧٢ | ٨٠٢ | ١٠٢٥٨١ | ٣١,٢٩ |
| ٢٠١١ | ٧٣٠٢٠ | ٤٠٢٠١ | ٩٥٧٨ | ٩٥١ | ١١١٦ | ١٢٤٨٦٦ | ٢١,٧٢ |
| ٢٠١٢ | ٨٥٥٧٨ | ٤٧٥٩٨ | ١١٥٨٤ | ١٣٧٨ | ١٦٠٩ | ١٤٧٧٤٧ | ١٨,٣٤ |
| ٢٠١٣ | ٩٦٠٩٩ | ٥٣٧٩٨ | ١٤٤٨٦ | ١٩٩٣ | ٢٢٠٢ | ١٦٨٥٧٨ | ١٤,٠٩ |
| ٢٠١٤ | ١٠٢٦٨٣ | ٥٧٩٣٨ | ١٧٣٨٨ | ٢٢٧٤ | ٢٥٣٨ | ١٨٢٨٢١ | ٨,٤٤ |
| سەرجەم | ٦٤٥٧٣٤ | ٣٤٤٠٦١ | ٨٤٢٣٣ | ٩٤٣٦ | ١٠٥٥٢ | ١٠٩٤٠١٦ | |

**ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر:**

- **حکومة اقليم كوردستان العراق، وزارة الداخلية، المديرية العامة للمرور في محافظة دهوك، شعبة الإحصاء، سجلات غير منشورة.**

- مانگێش) و ( بەردەرەش - کەلەك) و (دهۆك- ئەڤریکێ - باعەدرێ).

٦. پترین هژمارا رێکێن دروستکری د ڤێ قۆناغێ دا ل سالا ٢٠١٤ێ بوون کو هژمارا وان (٥) رێك بوون.

زێدەبوونا هژمارا ترۆمبێلان فشارەکا مەزن ل سەر رێکێن هاتنوچوونێ کریە و ئەڤ چەندە فاکتەرەکێ سەرەکی بوو کو حکومەت رابیت ب نویژەنکرن و فرەهکرنا تۆرا رێکێن ڤەگوهاستنێ چونکی قەرەبالغا هاتنوچوونێ و نەرێکوپێکی و تەنگیا رێکان گەلەك روودانێن دلتەزین پەیدادکەن، ژبلی ژدەستدانا گیانێ مرۆڤان، زیان دگەهیتە ئابووری وەلاتی ژی چونکی هژمارەکا مەزن یا ترۆمبێلان ژ کاردکەڤن و ئێدی بکێر هاژووتنێ ناهێن. د خشتەیێ ژمارە (١١) دا هژمارا ترۆمبێلێن تووماکری ب هەمی جۆرێن خۆ ڤە د ڤێ قۆناغێ دا دیار دکەت.

**ژ داتایێن خشتەیی ژمارە (١١) ئەڤ ڕاستییە بۆ مە دیار دبن:**

١. د هەمی سالێن ڤێ قۆناغێ دا دیاردبیت کو هژمارا ترۆمبێلان د زێدەبوونەکا بەردەوام دایە ب هەمی جۆرێن خۆ ڤە، لێ بلندترین رێژە ل سالا ٢٠٠٤ێ هاتیە تووماركرن کو دگەهشتە (٥٤,٦٤٪)ێ ب هەڤبەرکرن دگەل سالێن بەری هینگێ.

**وێنەیێ (١)**

**زێدەبوونا هژمارا ترۆمبێلان و جۆرێن وان ل پارێزگەها دهۆکێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٣-٢٠١٤)**




ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر داتایێن خشتەیێ ژمارە (١١).

٢. هژمارا ترۆمبێلێن توومارکی ل رێڤەبەریا هاتنوچوونا دهۆکێ دگەهیتە (٣٦٥٦٤٢) ب هەمی جۆرێن خۆ ڤە کو ئەڤەژی هژمارەکا مەزنە ئەگەر هەڤبەر بکەین دگەل هژمارا ئاکنجیێن پارێزگەها دهۆکێ ب رەنگەکی کو هەر ١ ترۆمبێل بۆ ٤ کەسان دکەڤیت. ئەگەر ئەم هوسا هزربکەین کو هەمی ترۆمبێلێن تووماکری ل رێڤەبەریێ بێنە دناڤ سنووری پارێزگەهێ دا، ل وی دەمی تۆرا رێکێن ڤەگوهاستنێ ل دهۆکێ تێرا ڤان هەمی ترۆمبێلان ناکەت.

٣. هەر پێنج سالێن داویێ (٢٠١٠- ٢٠١٤)ێ هژمارا ترۆمبێلان پتر ١٠٠٠٠٠ ترۆمبێلان بۆری یە ب هەمی جۆرێن خۆ ڤە، تەماشەی شێوەیێ ژمارە (١) بکە.

**نەخشەیێ (٦)**

**تۆرا رێکێن هاتنوچوونا ترۆمبێلان یێن ڤێرکری ل پارێزگەها دهۆکێ ل سالا ٢٠١٤**




ژێدەر: ژ کارێن ڤەکۆلەری یە ب پشتبەستن ل سەر:

١. داتایێن خشتەیێ ژمارە ١٢

٢. حکومة أقليم كوردستان العراق، وزارة التخطيط، الهيئة العليا للإحصاء، مديرية أحصاء دهوك، قسم Gis، بيانات غير منشورة.

3. Kurdistan Region-Iraq. Map prepared by JHIC joints Humanitarian information Center. Duhok Governorate Base Map scale 1:500000.

## ژێدەر:


١. احمد حبيب رسول، النقل والتجارة الدولية، جامعة بغداد، مطبعة الحوادث، ١٩٨١، ص١٣.
٢. عبد النافع عبد الموجود، الطرق البرية في المشرق العربي، مركز دراسات الوحدة العربية، بغداد، ايلول، ١٩٨١، ص١.
٣. محمد هاشم ذنون الحيالي، شبكة طرق السيارات الرئيسية بمحافظة نينوى (تحليل في التنظيم المكاني)،رسالة ماجستير ،غير منشور،مقدمة الى مجلس كلية التربية ،جامعة موصل ، ٢٠٠٦، ص٩.
٤. سفين جلال فتح الله ، موقع أقليم كوردستان العراق دراسة في جغرافية السياسية ، مطبعة شهاب ، اربيل ، ٢٠١٢ ،ص٢٠٥.
٥. احمد عبدالباقي واخرون ، جغرافية العراق والبلاد العربية ،مطبعة السعدي ،بغداد ١٩٥٤، ط٤، ص٨٥.
٦. نشوان شكري عبدالله ،النظام الحضري في محافظة دهوك ،مطبعة الحاج هاشم ،اربيل ،٢٠٠٩، ص٦٧.
٧. ابراهيم شريف ، الموقع الجغرافي للعراق وأثره حتى الفتح الاسلامي ،مطبعة شفيق ،بدون تاريخ ،ص ص١١٠-١١١.
٨. عبدالفتاح البوتاني ،دهوك في السالنامات العثمانية ، مجلة دهوك ،العدد ١،١٩٩٧، ص٦٢.
٩. محمد أزهر سعيد السماك وأخرون ،العراق دراسة أقليمية ،دار الكتب للطباعة ولنشر،جامعة الموصل،ج٢، ١٩٨٥ ص٤٢٩.
١٠. نادية طلعت سعيد ،طرق السيارات في محافظة أربيل ،دراسة في جغرافية النقل ،رسالة ماجستير (غير منشورة) ،كلية الاداب ،جامعة صلاح الدين ،٢٠٠٣،ص١٧.
١١. جاسم محمد الخلف ، محاضرات في جغرافية العراق الطبيعية والاقتصادية والبشرية ،١٩٥٩، ص٤٣٧.
١٢. شاكر خصباك،العراق الشمالي ،دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، مطبعة شفيق، بغداد ،١٩٧٣،ص٤٩٦.
١٣. خطاب صكار العاني، جغرافية العراق،مطبعة دارالحكمة ،بغداد، ١٩٩٠،ص٣٨٨.
١٤. محافظة دهوك ،دليل محافظة دهوك ،مطبعة الاديب،بغداد،١٩٨٦.
١٥. سعدي علي غالب،جغرافية النقل والتجارة،دار ابن الاثير للطباعة والنشر ، جامعة الموصل ،١٩٨٦، ص١٧٨-١٧٩.
١٦. سيف الدين عبدالقادر،جغرافية العراق العسكرية،مطبعة شفيق،بغداد،١٩٧٠،ص١٣٨.
١٧. جاسم محمد الخلف،محاضرات في جغرافية العراق الطبيعية والاقتصادية والبشرية،١٩٥٩،ص٣٣٩
١٨. محمد هاشم ذنون الحيالي، شبكة طرق السيارات الرئيسية بمحافظة نينوى (تحليل في التنظيم المكاني )، مصدر سابق ، ص١٢.
١٩. سعيد حجي صديق زاخويي، زاخو تاريخ وصور،مطبعة خاني ،دهوك،٢٠١١،ص ص٢٤٦-٢٤٧.
٢٠. هادي عبدالمحسن العنكبي ، واخرون ، التحليل الكمي للخصائص الاقتصادية لشبكة النقل البري في الانبار، مجلة المخطط والتنمية، العدد ٢٠،السنة ٢٠٠٩،
٢١. محمد أزهر سعيد السماك وأخرون ،العراق دراسة أقليمية ،المصدر السابق ، ص٣١٢.
٢٢. أيف بيروز، اديث وائي، (العراق) دراسة في علاقاته الخارجية وتطوراته الداخلية، ترجمة عبد المجيد القيسي، جـ١، ط١، الدار العربية للموسوعات، ١٩٨٩، ص٢٦٤.
٢٣. موسەدەق توفی ،ئیسماعیل بادی، بیداچوون فاضل عمر، ڕێبەری پارێزگەها دهوکێ، چاپخانا هاوار ، دهوك ،٢٠١٠، پ ٥١.
٢٤. هاشم خضير الجنابي،مدينة دهوك، دراسة في جغرافية المدن، مطبعة جامعة الموصل،١٩٨٥، ص٣.
٢٥. نشوان شكري هروري ، التركيب التجاري لمدينة دهوك ، دراسة في جغرافية المدن ، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك ،٢٠٠٦، ص٣٠١.
٢٦. مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية ، ثورة أيلول ١٩٦١-١٩٧٥ مع ملحق وثائقي، الجزء الثالث ،مطبعة وزارة التربية، أربيل،٢٠٠٢، ص٦١٩ .
٢٧. محمد هاشم ذنون الحيالي،المصدر السابق،ص١٩.

٢٨. مسعود البارزاني، المصدر السابق ،ص ص٦٨٢-٦٨٣.
٢٩. خمي ناصر رشيد، المصدر السابق،ص٣٢.
٣٠. محافظة دهوك ،دليل محافظة دهوك،دهوك في احضان الثورة، مطبعة الاديب البغدادية المحدودة ، ١٩٧٩ ، ص ص٨٢-٨٣.
٣١. نادية طلعت سعيد ،طرق السيارات في محافظة أربيل ،دراسة في جغرافية النقل ،المصدر السابق ،ص٤٠
٣٢. محمد إحسان، كوردستان ودوامة الحرب، دار الحكمة للطباعة والنشر والتوزيع، ط ١، ٢٠٠٠،ص١٢٢.
٣٣. محمد إحسان، كوردستان ودوامة الحرب، مطبعة وزارة التربية، ط٢ ،أربيل،٢٠٠١،ص٨٦.
٣٤. عبد العزيز طيب، تيلي أمين، القرار ٩٨٦ وتطبيقاته في كوردستان، مطبعة خبات، ط١،دهوك، ١٩٩٧،ص٣٩.
٣٥. نيجيرفان أحمد ، محمد جلال الدين نوري، الحركة العمرانية في محافظة دهوك في ظل القرار ٩٨٦،مطبعة خبات، دهوك، ٢٠٠١،ص٢.
٣٦. سيف الخياط، كيف حكموا العراق ، أوراق من دهاليز مجلس الحكم ، بدون ذكر سنة الطبع ومكان الطبع ، ص١٩٣.

# بنەمایێن گەشتیارییا خۆرستی ل پارێزگەها دهۆك

د. نیشان سورین موسیس
زانكۆیا دهۆك - كولیژا پەروەردا بنیات
وەرگێران: سالح سوفی

گەشتیاری (گەشت وگوزار) ئێكە ژ هۆیێن پەیوەندیا شارستانی و هزری و پێككوهورینا كەلتۆری و جڤاكی ل ناڤبەرا گەلان و ئالاڤەكە بۆ پەیداكرنا سەقایەكێ مشتی گیانێ تێككەهشتن و گەردەنئازاكرن و لێكنێزیكبوونا وان، هەروەسا پێگەهەكێ بلند د بیاڤێ كەرتێ ئابووری و موكمكرنا پەیوەندیێن نێڤدەولەتی و بەلاڤكرنا گیانێ ڤیان و ئاشتیێ دا هەیە.

پارێزگەها دهۆك ژی بنەمایێن گەشتیاری یێن خۆرستی و مرۆڤی هەنە و ئەو بنەما رەگەزێن سەرەكی یێن گەشت وگوزارێ نە، ئەڤە ژی ژ بەر وی جهێ وێ یێ جۆگرافیێ نەمازە و هەمەرەنگیا كێلەهی (روخسار) و دیمەنێن خۆرستی و مشەیی یا رووبەرێن ئاڤی و سیلاڤ و سامانێ رووەكی(شینكاتی) و ژیانا كووڤی و رەوشێن سەقایی یێن نەمازە یێن راكێشانا گەشتیاری ل دەڤەرێ هەبین.

ئەڤە سەرباری هەبوونا بنەمایێن مرۆڤی كو ب تەمامكەرێن بنەمایێن خۆرستی دهێنە هژمارتن، ژ وانا: رێ یێن ڤەگوهاستنێ، خەلكێ ئاكنجیێ دەڤەرێ، شوینوار، جهێن دیرۆكی و ئایینی، لایەنێن جڤاكی و كەلتۆری كو داب ونەریت و فیستەڤال و هەلكەڤت و جەژنێن نەتەوەیی و ئایینی و پیشەیێن دەستی و جلكێن فۆلكلۆری ب خۆڤە دگرن و ئەڤە هەمی پێكڤە دبنە ئەگەرێ وێ چەندێ داخوازی ل سەر دەڤەرێن گەشتیاریێن پارێزگەها دهۆك هەبیت و گەشتیار قەست بكەنێ.

**گەشتیاریا خۆرستی ل پارێزگەها دهۆك ڤان بنەمایێن خوارێ ب خۆڤە دگریت:**

## جهێ جۆگرافی Geographical Location:

پارێزگەها دهۆكێ دكەڤیتە دوورترین خالا باكوورێ رۆژئاڤایێ عیراقێ و رووبەرێ وێ ل دۆرێن ١٠,٧٢٥ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە و ب پارێزگەها رۆژئاڤایی یا هەرێما كوردستانا عیراقێ دهێتە هژمارتن و خودان جهەكێ ستراتیژیێ گرنگە ژ بەركو ب خالا ڤێككەهشتنا سێ پارچەیێن كوردستانێ (باكوور و باشوور و رۆژئاڤا) دهێتە هژمارتن[1]، ژ باكوور ڤە كۆمارا تركیا و ژ رۆژئاڤا ڤە كۆمارا عەرەبی یا سوری

توخیبێن وێ نە و سەنتەرێ پارێزگەهێ ٦٠ کیلۆمەتران ژ توخیبێن هەردوان دووره، هەروەسا ژ توخیبێ عیراقێ - ئیرانێ ژ لایێ رۆژهەلاتڤە ل دۆرێن ١٧٠ کیلۆمەتران دووره، ل دۆرێن ٤٦٠ کیلۆمەتران ل باکوورێ بەغدا و ٦٧ کیلۆمەتران ل باکوورێ مووسلە، ژ رۆژهەلاتڤە ژی نێزیکی ١٥٣ کیلۆمەتران دووری هەولێره[٢].

وێنەیێ گشتیێ پارێزگەها دهۆکێ وێنەیەکێ لاکێشەییێ نە رێك وپێکە و هێلا درێژیێ (-,٤٣°) رۆژهەلات د نیڤا پارێزگەهێ را دچیت و دکەتە نێزیکی دو نیڤان و ئەو هێل د سەنتەرێ پارێزگەهێ را دچیت و بلندترین پانییا وێ ل ناڤبەرا گوندێ نەمریکێ ل باشوور و خۆرکێ ل باکووره و ئەو پانی ل دۆرێن نێزیکی ٧٥ کیلۆمەترایه، هەروەسا بلندترین درێژاهییا وێ هێلێ ل ناڤبەرا گوندێ پێشابیرێ ل سەر رووبارێ دیجلە ل رۆژئاڤا و گوندێ مامیسێ یا نێزیکی توخیبێ تورکیایە ژ لایێ رۆژهەلاتڤە و ئەو درێژی نێزیکی ١٥٥ کیلۆمەترایە.

پارێزگەها دهۆك ل ناڤبەرا هەردو کڤانێن درێژیێ (٢٠ - -٤٢ °) و (١٠ - -٤٤ °) ل رۆژهەلات و هەردو بازنەیێن پانیێ (٤٠ - - ٣٦ °) و (٢٠ - -٣٧ °) ل باکووره، ب ڤێ درێژبوونا هێلێن درێژی و پانیێ و (بازنەیێن) پانیێ پارێزگەهـ دکەڤیتە دەڤەرا هوون یا باکوور[٣]، هەروەسا دکەڤیتە دەڤەرا ڤەگوهێز ل ناڤبەرا دەڤەرا پێلدار یا تۆپۆگرافییا وێ ژ بانی و گران پێکدهێت و دەڤەرا چیایێن بلند. گرنگییا جهێ جوگرافیێ پارێزگەهێ ژ وێ چەندێ ژی دیار دبیت

**نەخشەیێ (١)**

**جهـ**



کو خالا ڤێککەهشتنا ل ناڤبەرا پتریا پارێزگەهێن عیراقێ و باژێرێن وێ یە ژ لایەکی و جیهانا دەرڤە ژ لایەکێ دیڤە، ئەڤە ژی گرنگیيا سەنتەرێ پارێزگەها دهۆکێ و جهێ وێ یێ گەشتیاری زێدەتر لێ دکەت و ب سەنتەرەکێ گرنگ دهێتە ل قەلەمدان ژ بەرکو، ئێك: زۆربیا جهـ و دیمەنێن جیاواز لێ هەنە، دو: نێزیکی پارێزگەهێن ژووری یێن عیراقێ یە و جیاوازە ب سەنگا خەلکێ خۆ و بلندبوونا ئاستێ ژیاری و کەلتۆری و فێرکرنێ یێ خەلکێ وێ[٤]. بنێرە نەخشە ژمارە (١).

## کێلەهی (روخسار)ێن روویێ عەردی (مظاهر سطح الارض) Relief:

هەمەرەنگیيا کێلەهیێن روویێ خۆرستیێ عەردی، ب ئێك ژ دیارترین بنەمایێن جۆگرافی یێن خۆرستی دهێتە هژمارتن و ڤی بنەمای کاریگەرییەکا ئەکتیڤ ل سەر پەیدابوون و پێشکەڤتنا گەشت وگوزارێ ل هەر دەڤەرەکێ هەیە[٥]، کەسایەتییا تۆپۆگرافییا پارێزگەها دهۆکێ ژی ب هەمەجۆربیا مەزن یا کێلەهیێن روویێ عەردێ وێ و ب جوانییا دیمەنێن وێ یێن خۆرستی و زۆربیا ژێدەرێن وێ یێن ئاڤی دهێتە نیاسین، کو ئەڤە ب خۆ ژی دبیتە یەکەیەکا تۆپۆگرافییا کاملان ل هەرێما کوردستانێ یا دکەڤیتە دەڤەرێن باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتێ عیراقێ[٦]، کێلەهیێن روویێ عەردی یێ پارێزگەهێ ژی ب سەر ڤان هەر سێ پشکان دابەش دبن:

چیایێن پارێزگەهێ ب درێژبوونا خۆرستییا دو سرتێن چیایان دهێنە هژمارتن، سرتا ئێکێ سرتا چیایێن زاگرۆسە کو ژ ناڤ عەردێ کوردستانا ئیرانێ دەست پێ دکەت، سرتا دووێ ژی چیایێن تۆرۆس یێن گەلەك ئالۆز و ئاسێ نە کو ژ ناڤ عەردێ ترکیا دەست پێ دکەت و بەرەڤ باژێرێ شنگال درێژ دبیت هەتا دگەهیتە ناڤ ئاخا سوریا ژ لایێ وێ یێ باکوورێ رۆژئاڤا ڤە[٧] و رووبەرێ وێ ل دۆرێن ٢٣٧٢٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ئانکو بەرامبەری ٥٪ێ ژ سەرانسەرێ رووبەرێ عیراقێ[٨].

دەڤەرا چیایی یا ئاسایی ژی ب جهێ باژێرێ دهۆك دەست پێ دکەت کو جهەکێ نەمازەیە و ل کوژیێ باکوورێ رۆژهەلاتێ (دەشتا سێمێلێ) یە و ئەڤ ناڤە ژی ژ ناڤێ قەزا (سێمێلێ) هاتییە، دهۆك ل دەرییەکێ چیاییێ تەنگ ب ناڤێ (گەلیێ دهۆك)ە و ژ ڤی باژێری کو ب جهێن گەشیارییێن بالکێش دهێتە هژمارتن، نەخاسمە پشتی تمامکرنا چێکرنا سکر (بەنداڤ) و دەریاچەیا دهۆك ل سالا ١٩٩٠ێ دەڤەرا چیایێن بلند دەست پێ دکەت، هەروەسا دەمێ مرۆڤ ژ جهەکێ بلند دنێریتە جهێ دهۆك دیار دبیت کو ل ناڤ دو سرتێن درێژێن چیای دۆرماندۆردایە، ژ لایێ باکوور ڤە سرتا چیایێ بێخێرێ (چیایێ سپی)یە و بلندییا وێ ل دۆرێن ١٠٤٠ مەترایە ژ ئاستێ روویێ دەریایێ و ژ دو کۆپێن (کێلیا شەدایێ) و (کێلیا فرعینی) پێکدهێت و ژ لایێ باشوورڤە ژی سرتا چیایێن (زاوا) یان چیایێن شندۆخایە کو ل ناڤ خەلکی ب (چیایێ رەش) بەرنیاسە و بلندییا وێ سرتا چیای ل دۆرێن ٩٤٠ مەترایە و چیایێ(مام سین) ژی ل رۆژهەلاتێ یە، لێ لایێ رۆژئاڤا ب سەر دەشتەکا چاندنێ ڤەدبیت و هندەك بانی یێن کو وەکی دەشتێن بەرفرەهێن پێلدارن دکەڤنە لایێن رۆژئاڤا و باشوورێ باژێری و هەتا رووبارێ دیجلە درێژ دبن و بلندییا وان نێزیکی ٢٠٠-٦٠٠ مەترایە[٩]، هەروەکی ل دەشتێن سلێڤانەیی و سیتکی و سندی و د وێرێ را د گەلیێ زاخۆ را دەرباز دبیت ب درێژیا چیایێ بێخێرێ بۆ سەنتەرێ قەزا زاخۆ کو ئەو ژی جهەکێ گەشتیاریێ گرنگە ل نك پرا عەباسیکێ (پرا دەلال) یێ ل سەر رووبارێ خابوور ژ لایێ رۆژهەلاتڤە، پاشی ئەڤ هێلە بەرەڤ باکوورێ رۆژهەلات د رووبارێ خازری را درێژ دبیت هەتا دگەهیتە چیایێ باکرمان پاشی چیایێ ئاکرێ کو باژێرێ ئاکرێ ل بنیا وێ یا باشوورە و بلندترین خالا وێ چیای سەرێ کۆیا ئاکرییە و بلندییا وێ ١٥٤٨ مەترە[١٠].

ڤێ هێلێ ژی گرنگیيا خۆ یا فیزیۆگرافی و مرۆڤی هەیە و وەکی دەڤەرەکا ڤەگوهێزە، یان رۆهنتر بێژین توخیبەکێ ناڤبرە ل ناڤبەرا دەڤەرا چیایی و پێلدارێن ژێك جودا ژ لایێن خۆرستی و مرۆڤی ڤە، هەڤدەم

نەخشەیێ (٢)




دبیتە توخیبەکێ سەقایی، ئانکو نێزیکی هێلا بارانێ یا ٦٠٠ مللیمەترییە، ب ڤێ چەندێ ژی ئەو دەڤەر دبیتە دەستپێکا گۆهورینێ یا جۆرێ رووەکێ خۆرستی و پلا مشەبوونا وی رووەکی و جوونێن دەرامەتێن چاندنێ کو دشیاندایە ب ئاوایەکێ بەرفرەهـ د بیاڤێ پێشئێخستنا سامانێ گەشتیاری دا بێتە ب کار ئینان.

لێ توخیبێ باکوورێ ڤێ کەمەرێ بەرەڤ رۆژهەلات ب درێژیا گەلیێ (تانکزەرە) بەرفرەهـ دبیت و ل کنارێ راستێ یێ رووبارێ (گومل)ی ب داوی دهێت و دبێژنە ڤێ پشکێ چیایێ (تانغ دریا) و بلندیا وی نێزیکی ١٣٠٠ مەترایە، ب رەخ را ژی پشتەکا کەڤرین (تەحتی) ژ رۆژئاڤا بۆ رۆژهەلات دەرباز دبیت و رێیا دهۆك - ئامێدیێ تێرا دەرباز دبیت[١١]، ئەو پشتا کەڤرین ژ چیایێ گارە ٢١٦٠ مەترە یێ گەلیێ سەرسنکێ دکەڤیتە بنیا وی و ژ چیایێ پیرس ل قەزا ئاکرێ کو بلندیا وی ١٦٢٤ مەترە و ئێکە ژ جهێن گەشتیاری یێن جوان و چیایێ خێرێ کو بلندیا وی ١٤٧٠ مەترە ژ ئاستێ رووێ دەریایێ پێکدهێت[١٢].

ژ بلی ڤان، تایبەتمەندیا تۆپۆگرافیا پارێزگەها دهۆکێ ئەوە کو ژ چیایێن ئاسێ یێن بلند پێکدهێت و بلندیا وان ل ناڤبەرا ١٥٠٠-٣٥٠٠ مەترانە، هەر بۆ نموونە، چیایێ (سەرێ ئامێدیێ) کو ب بلندترین کۆپێن چیایی یێن پارێزگەهێ دهێنە هژمارتن و لێکبادانێن وی ب هژمارا کۆپێن وی نە و نشیڤی و ئەڤرازیێن بەرۆك و بەتەنێن وی گەلەك درکن، گەلەك جاران ژی ئەو ئەو لێکبادان نێزیکی ئێك دبن و قەبارێن وی یێن چیایی بەرفرەهـ دبن و دۆل ونهالێن ناڤبەرا وان گەلەك تەنگ و کوور دبن و نێزیکی هزار مەتران ژ ئاستێ چیای نزم دبن[١٣]، هەر بۆ نموونە، دۆلا مەزن یا ل ناڤبەرا هاڤینگەها سیلاڤێ و باژێرێ ئامێدیێ، دۆلا گەلیێ دیهێ ل ناحیا بامەرنێ، گەلیێ بالندا، چەلکێ و.. هتد.

ل داویــێ ژی پێدڤییە ئاماژێ بکەینە بانیا (گوڤەند) کو ژ لایێ خۆڕستی ڤە ئێکە ژ گرنگترین بانیێن دەڤەرێ و دکەڤیتە دوورترین خالا لایێ باکووری پارێزگەها دهۆك ل سەر توخیبێ عیراقێ ـــ ترکیا و بلندیا وێ بانیێ ل ناڤبەرا ٢١٠٠-٢٣٤٠ مەترایە کو ئەو ژی پێکهاتەکێ کەڤرییە و ب هندەك بەتەنێن رك هاتییە دۆرماندۆردان و ب زەحمەتە مرۆڤ بشێت ب ساناهی هەلباسکی وان ببیت، هەروەسا بەفر ژی ب درێژیا هەیڤێن زڤستانێ و بهارێ ل سەر کۆم دبیت[١٤] و دشیاندایە ژ لایێ گەشتیاریڤە بۆ هندەك چالاکی و یاریێن وەرزشی بێتە ب کار ئینان، هەر بۆ نموونە، بۆ گەڕیانێ و بەرێخۆدانا دیمەنێن جوانێن کەڤیێن بەفرێ و خۆخشاندنێ ل سەر بەفرێ و دەستکەڤرێ (هەلباسکێ- التسلق) ژ بەرکو رووبەرەکێ بەرفرەهـ ب خۆڤە دگریت و ب نشیڤی یێن رك دۆرماندۆردراینە، هەروەسا بۆ دەمبۆراندنێ ب دیتن و نێچیرکرنا گیاندار و تەیروتلۆرێن کووڤی[١٥].

بنێرە نەخشەیێ (٢).

## سەقا (ئاڤ وهەوا) Climate:

سەقا (مناخ) ب هەمی رەگەزێن خۆڤە فاکتەرەکێ سەرەکییە د چالاکیێن گەشتیاری و ئاراستەکرنا بزاڤا وێ دا، ڤێجا چ گەشتیاریا ناڤخۆیی یان دەرڤەیی بیت، خۆ ل سەر ئاستێ سەیران و دەمبۆراندنێ ژی[١٦]، ئەڤە ژی ژ بەرکو وان رەگەزان کاریگەرییێن ئێکسەر و نەئێکسەر د چالاکیێن گەشتیاری دا هەنە، هەر بۆ نموونە، هندەك رەگەزێن سەقای ل پارێزگەهێ ئەو ب خۆ رەگەزێن راکێشانا گەشتیاری نە و خۆشییەکا لەشی و دەروونی بۆ مرۆڤی (گەشتیاری) پەیدا دکەن ژ لایەکی[١٧]، ژ لایەکێ دیڤە ژی و ل بن سیبەرا سەقایێ گەشتاریێ گونجایێ دەڤەرێ، د شیاندایە شیانێن گەشتیاری یێن دی یێن خۆڕستی و مرۆڤی (چیا، دەریاچە، رووبار، دارستان، دیمەنێن خۆڕستی، جهێن شوینواری، رەوشەنبیری و شارستانی) بێنە ب کار ئینان کو ب فاکتەرێن باش بۆ وەرارا گەشتیاری دهێنە هژمارتن[١٨].

هندەك جاران سەقای دەست د دەسنیشانکرنا جهێن دەمبۆراندن و بێنڤەدانێن گەشتیاری دا هەیە، هەر بۆ نموونە، سەیرانگەهێن: زاویتە، سەرسنکێ، ئاشاوا، ئێنیشکێ، سیلاڤێ و یێن دی و پلەیێن گەرمیێ و سەمتا بای و بایێ هوین و بەفربارین و فاکتەرێن دی ل بەرچاڤ دهێنە وەرگرتن دەمێ جهـ و سازیێن گەشتیاری دهێنە دیزاینکرن[١٩]، جیاوازیا سەقایێ ڤێ دەڤەرا ڤەکۆلینێ ل سەر دکەین ئەوە کو سەقایێ وێ ل هاڤینێ یێ گەرم و هشکە و ل زڤستانێ ژی یێ سار و بارانییە، ئەڤە ژبلی هاڤینگەهێن سەرەکی یێن پارێزگەها دهۆکێ و فاکتەرێ سەرەکیێ کاریگەریا خۆ ل سەر پلەیێن گەرمیا پارێزگەهێ هەین تۆپۆگرافیایە، هەروەسا ژ بەرکو دەڤەر ژ ئاستێ دەریایێ بلندترە، پلەیێن گەرمیێ ژ تێکڕایا گشتی نزمترن دەمێ ئەو پلە دگەل پلەیێن پشکێن ناڤەڕاست و باشووری عیراقێ دهێنە هەڤبەرکرن و تێکڕایا پلەیا گەرمیا هاڤینێ ل گەرمترین هەیڤا وی وەرزی دگەهیتە نێزیکی ٣٢ پلەیا سەدی، ئەڤە ژ لایەکی، ژ لایەکێ دیڤە زۆری و هەمەرەنگیا رووەکێ خۆڕستی کاریگەریا خۆ ل سەر هیناتی و نزمبوونا پلەیێن گەرمیێ هەیە[٢٠]، ئەڤە سەرباری کاریگەریا بایێ ژ باکووری رۆژهەلات ڤە ژ ترکیا دهێت کو بایەکێ هوینە و دبیتە ئەگەرێ هوینبوونا سەقایێ وەرزێ هاڤینێ یێ پارێزگەهێ، لێ ل وەرزێ زڤستانێ، پارێزگەهـ ب هندەك لایەنێن هشکێن ئەوروپا کاریگەر دبیت ئەڤە سەرباری کاریگەریێن بایێ باکووری رۆژئاڤا یێ پلەیێن گەرمیێ نزم دکەت و دگەهینیتە دبن سفرێ دا، نەخاسمە ل پشکێن بلندێن دەڤەرێن چیایی و ئەڤ وەرزە بەرۆڤاژی دەڤەرێن دی یێن عیراقێ ب وەرزەکێ گەلەك سار دهێتە هژمارتن، پتریا جاران ژی تشتێ لێ دباریت بەفرە، نەخاسمە ل لایێن باکووری رۆژهەلاتێ پارێزگەهێ وەکی دەڤەرێن نێروە رێکان، بەرواری بالا، سرتا چیایێن: پیرسی، گارەی، مەتینا و چیایێن شەرانش و نزدۆرێ[٢١] و ئەڤە ب جهێن گرنگێن گەشتیاری دهێنە هژمارتن و هەر سال هەتا

دەمەكێ درێژ ب بەفرێ دنخاڤتینە و دشیاندایە بۆ یارێن گەشتیاری بێنە ب كار ئینان[22].

ژ ڤەكۆلینا هێلێن یەكسانێن گەرمیێ ل پارێزگەهێ (هەروەكی ویستگەهێن سەقایێ یێن پارێزگەهێ بۆ مە دیار دكەن)، هەردو وەرزێن هاڤینێ و زڤستانێ ب ئاوایەكێ رێژەیی ددرێژن، هەر بۆ نموونە، تێكرایێ پلەیا گەرمیێ ل وەرزێ زڤستانێ (5°) سەدییە، ئەڤە ل وی دەمێ تێكرایا پلەیا گەرمیێ ل هەردو وەرزێن ڤەگوهێزێن پاییزێ و بهارێ ژ (15°) سەدی نابۆریت، كو هەردو وەرز ب ئاوایەكێ رێژەیی دكورتن.

هەكە بنێرینە وان وێنەیێن هەردو پلەیێن بلندتر و نزمترێن گەرمیێ دیار دكەن، دێ بینین ل وەرزێ هاڤینێ پلا گەرمیێ ب ئاوایەكێ بەرچاڤ یا بلندە، ئەڤە ل وی دەمێ ل وەرزێ زڤستانێ سەرما هند یا شدیای نینە و ژ نەخشە و هێلێن یەكسانێن گەرمیێ دیار دبیت كو دەمێ ژ باشوورێ پارێزگەهێ بەرەڤ باكوور و باكوورێ رۆژهەلاتێ وێ بچین پلەیێن گەرمیێ نزم دبن، هەروەسا ئێك ژ تایبەتمەندیێن سەقایێ دەڤەرێ ئەوە كو ژێكجوداهییەكا بەرچاڤ د ناڤبەرا پلەیا گەرمێ یا شەڤێ و رۆژێ یا هاڤینێ هەیە و ئەو ژێكجوداهی ل وەرزێ زڤستانێ كێم دبیت، لێ دو فاكتەر كەلەژانا تەحرا هاڤینێ كێم دكەن، ئێك: ناڤنجییا شها رێژەیی كو ل هەیڤێن گەرمێن هاڤینێ نزمترین ئاست توومار دكەت و ل خزیرانێ دگەهیتە 33,11٪ێ ێ و ل تیرمەهێ ژی دگەهیتە 30,69٪ێ و ل تەباخێ ژی دگەهیتە 37٪ێ. دو: بایێ هوینێ چیای و دۆل و نهالان یێ پتریا جاران پشتی نیڤا شەڤێ دهێت و پلەیا گەرمیێ كێم دكەت و هەوایەكێ هوین ددەتە خەلكی و گەشتیارێن دەڤەرێ، ژ بەر هندێ، هەیڤێن هاڤینێ یێن پارێزگەهێ ب هەیڤێن گەشتیاری و سەیرانكرنێ دهێنە هژمارتن[23]، ژ بەر هندێ، شها رێژەیی (الرطوبة النسبية)، پشتی گەرمیێ، ژ لایێ گرنگیێ ڤە ب رەگەزێ سەقایی یێ دووێ دهێتە هژمارتن ژ بەركو رۆلەكێ گرنگ د دەستنیشانكرنا رحەتی و چالاكییا مرۆڤی دا هەیە، ئەڤە ژی ب رێیا، ئێك: كارلێكییا گەرمیێ دەستنیشان دكەت، دو: دگەل رەگەزێن دی یێن سەقای (گەرمێ و بای) ل گەلەك دەڤەرێن چیایی یێن پارێزگەهێ رەگەزێ ساخبوونەڤا سەقایی پێك دئینن و پێدڤییە ئەڤ جهە بێنە چاڤدان و ب ئاوایەكێ دۆمدرێژ د بیاڤێ گەشتیاریێ دا بێنە ب كار ئینان.

فەرە بێژین كو دەڤەرا ڤەكۆلین ل سەر دهێتە كرن ژ لایێ ژینگەهێ ڤە ب دەڤەرێن پاقژێن عیراقێ دهێتە هژمارتن و بنەمایێن وێ یێن خۆرستی بەرهنگاری پیسبوونا ژینگەهی و وێرانبوونێ نەبووینە، ژ بەركو دەڤەرەكا گەشتیارییە و پیشەسازیێن گرانێن بەرمایك و گازێن ژەهراوی یێن وان ژینگەهێ پیس دكەن كێم لێ هەنە، هەروەسا ژ بەر جهێ وێ یێ جۆگرافیێ نەمازە و سەقایێ وێ یێ هوین و تۆپۆگرافیا وێ یا بلند كو دبنە رێگر بەرامبەری گەهشتنا بایێ رۆژئاڤایی یێ تۆزەكیێ بیابانا عیراقێ (پارێزگەها ئەنبار) و دەڤەرا كەنداڤێ[24].

## ژێدەرێن ئاڤێ Water resource:

ژێدەرێن ئاڤی ل ڤێ دەڤەرا ڤەكۆلین ژێ دگریت ئێكە ژ رەگەزێن راكێشانا گەشتیاری و گرنگییەكا مەزن د پلاندانانا گەشتیاری دا هەیە ژ بەركو پەیوەندییەكا موكم دگەل گەلەك لایەنێن چالاكییا گەشتیاری و وەرار و پەیدابوونا گەشتیاریێ ڤە هەیە، پلەیا گرنگییا ڤێ ئاڤێ ژی ژ لایێ گەشتیاری ڤە پشتا خۆ ب گەلەك فاكتەران گەرم دكەت كو یێن ژ هەمیان گرنگتر ئەڤەنە: (تباب، كوالیتی، تایبەتمەندییا جهێن هەبوونا وان، رەوشێن پەیوەندی ب بكارئینانا وان ڤە هەی)[25] و ئاڤ ب خۆ ژی دبیتە فاكتەرێ راكێشانا گەشتیاری بۆ جهێ گەشتیاری، نەخاسمە هەكە ل وێ ژینگەها گەشتیاری خزمەت و كار ب ساناهیكرنێن گەشتیاری هەبن داكو وەك ژینگەهەكا گەشتیاری بێتە نیشادان ب ئاوایەكێ وەسا گەشتیار بشێن چالاكیێن خۆ یێن گەشتیاری یێن ئاڤی (مەلەڤانی، ئاڤپاشدانكانێ، نیچیرێ و.. هتد.) ئەنجام بدەن، ئەڤە سەربارى رۆلێ وێ د

خۆشکرنا سەقای دا دەمێ رووبەرێن ئاڤی دبەرفرەهـ بن یان بۆ ساخبوونەڤێ ژ هندەك نەخۆشییان دهێنە ب کار ئینان[26]، هەر بۆ نموونە (کانییێن کبریتی = کانیێن گۆگردی) ل گوندێ (گەرماڤا) کو پتر ژ دو کیلۆمەتران دووری سەنتەرێ بازێرێ دهۆکێ یە ل سەر رێیا کەڤنا دهۆك - زاویتەیە و دبیتە ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤا دەریاچەیا دهۆك و پشکەکا سکرێ مووسل یا ب رەخ توخیبێ وێ یێ باشووری رۆژهەلات ڤە، ئەڤە سەرباری ئاڤا هەردو رووبارێن دهۆك و هشکەرۆی، دیجلە و خابوور، زێ یێ مەزن و ئاڤێن بەفر و بارانێ کو ب گرنگترین ژێدەرێن سەرەکی یێن ئاڤا سەرعەرد و بنعەرد دهێنە هژمارتن[27].

ژێدەرێن ئاڤێ یێن پارێزگەها دهۆك ب سەر ڤان پشکان دا دهێنە دابەش کرن:

## ئێك: رووبار:

### أ- رووبارێ دهۆك:

رووبارێ دهۆك، پشتی پرۆژێ (چەم بەرەکات) ب ژێدەرێ سەرەکیێ دووێ یێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ بازێرێ دهۆك دهێتە هژمارتن، د هندەك رەوشان دا ژی دبیتە ژێدەرێ سەرەکی و ئێکانەیێ ئاڤا بازێری دەمێ پەمپێن (ئامیرێن ئاڤێ یێن) چەم بەرەکات یا دکەڤیتە رەخێ راستێ یێ دەریاچەیا سکرێ مووسل تووشی ژ کارکەڤتنەکا تەکنیکی دبن، د سەعەتەکێ دا تبابا ٢٠٠٠ مەترێن سێجایێن ئاڤێ ژ حەوزا رووباری بۆ دهۆك دهێنە پالدان و حەوز ژ هژمارەکا چەمان* (رووباران) پێك دهێت، لێ چەمێن سەرەکی چەمێ گەرماڤایە ب درێژیا (٢٩,٤٠٠ کم)ان یێ ژ باکووری رۆژئاڤا دزێت و چەمێ سندۆرێ یە ب درێژیا (١٠,٤٠٠کم)ان یێ ژ باکووری رۆژهەلات دزێت، کانیێن بەردەوام ژی یێن رێژەیەکا بلند یا کبریتێ تێدایە ئاڤێ ددەنە ڤان هەردو چەمان، ژ بەر هندێ، ب درێژیا سالێ ئاڤ ژ بەر دچیت و پشتی هەردو چەم دگەهنە ئێك، رووبارێ دهۆکێ پێکدئینن کو ئەڤە ژی د ناڤ بازێرێ دهۆك ڕا بەرەڤ باشوور دچیت و بازێری دکەتە دو پشك و پاشی بەرەڤ باشوورێ رۆژئاڤایێ بازێری دچیت و دگەهیتە رووبارێ هشکەرۆیێ ژ ڤێککەهشتنا گەلیێ بێسرێ و دۆلا هێتووتێ ل باشوورێ رۆژهەلاتێ بازێری پێك دهێت و دبنە ئێك رێژگەهـ و درژێتە ناڤ رووبارێ دیجلە ل باکوورێ بازێرێ مووسل ب دووریا نێزیکی ٣٠ کیلۆمەتران.

ژ لایێ باکوور ڤە سرتا چیایێ کەمەکا و بێسکێ و ژ رۆژهەلات ڤە گوندێ بادێ، چیایێ سپیرێز و ژ باشوور ڤە بازێرێ دهۆك و چیایێ سپی و ژ رۆژئاڤا ڤە سرتا چیایێ بێخێرێ توخیبێن حەوزێن وان رووبارێن ناڤبری نە[28].

رەهـەندێ گەشتیاری ژی د ڤی بیاڤی دا ژ ئەنجامدانا چالاکی و پێرابوونێن جودا جودا دیار دبیت، ژ وانا: مەلەڤانی: دشیاندایە کەسێن مەلەڤانییان د چەمێن گەرماڤا و سندۆرێ و کانیێن خۆڕستی دا دکەن بێنە دیتن کو رێژەیەکا بلند یا کبریتێ د وان چەم و کانییان دایە و ژ لایێ نوژداری ڤە ب کێر چارەکرنا گەلەك نەخۆشیێن پیستی و گەهـ و رۆماتیزمێ دهێن و دبنە جهێن باش بۆ پێشئێخستنا گەشتیاریا چارەکرنێ ژ نەخۆشییان ئەڤە ژ لایەکی، ژ لایەکێ دیڤە، دشیاندایە داروبار و گیا و شینکاتی و بیستانێن ل هەردو رەخێن رووبارێ دهۆك بێنە دیتن و ئەڤە ببنە ئەگەرێ وێ چەندێ گەشتیار ب ئاوایەکێ بەرفرەهـ قەست کەنێ، سەرباری هندێ، ئاڤا رووبارێ دهۆك د چەپ وچیر و نهالێن جودا جودا ڕا دچیت و دیمەنەکێ خۆڕستیێ جوان و دلڤەکەر پەیدا دکەت و بوویە ئەگەرێ بەلاڤبوون و ئەنجامدانا حەزا وێنەگرتن و ماسیگرتن و گەڕیانێ، هەروەسا ژ لایێ گەشتیاری ڤە گرنگیا ڤی رووباری د جهێ بازێرێ دهۆك ب خۆ دایە دەمێ رێژگەها وی د ناڤ بازێری ڕا بەرەڤ باشوورێ رۆژئاڤا دچیت، ئەڤە ژی بوویە ئەگەرێ خۆشبوونا پلەیا گەرمیێ سەقای، سەرباری ڤێ، بایەکێ هوین ژ دەرێ گەلیێ دهۆك دهێت، ڤێ ژی بازێرڤانییا دهۆك پالدایە ب پرۆژێ جوانکرنا ڤی رووباری ڕابیت و کۆمەلگەهەکا گەشتیاریا تمام هەر ژ چایخانە و گازینۆ و خوارنگەهێن تایبەت ب

خوارنێن سەرپێ و جهێن بێنڤەدانێ لێ ئاڤا بکەت، سەرباری ڤێ هەمیێ، هەر ب ئاڤا رووبارێ دهۆك دو سیلاڤ ل دەرێ گەلیێ دهۆك ل جهێن گەلەك بلند هاتینە چێ كرن و دیمەنێ دەڤەرێ جوانتر لێ كریە[٢٩].

## ب- رووبارێ دیجلە:

سەروكانیێن ڤی رووباری دكەڤنە باشوورێ رۆژهەلاتێ تركیا و ژ دو سەروكانیێن سەرەكی پێك دهێن ، یا ئێكێ: سەروكانییا رۆژئاڤا كو دبێژنێ دیجلە و ل باژێرێ ئامەدێ (دیاربەكرێ) ل باكوورێ دەریاچەیا (كوچەك)ە و ١٠٠٠-٢٠٠٠ مەتران ژ ئاستێ روویێ دەریایێ بلندترە[٣٠]، لێ سەروكانییا رۆژهەلات یا ئاڤێ ددەتە هژمارەكا چەمان كو یێن ژ هەمیان گرنگتر (باتمان سوو)یە یێ ژ چیایێن هەكاری دزێت و (كارزان جای) و (بۆتان سوو) و (هازر) ە یێ ژ چیایێن هنداڤی پشكا باشوورێ بەحرا وانێ دزێت، بلندییا حەوزا رۆژهەلاتێ یا دیجلەی ل ناڤبەرا ٢٠٠٠-٤٠٠٠ مەترایە و ل هندەك پشكان ژی نێزیكی ٥٠٠٠ هزار مەترایە ژ ئاستێ روویێ دەریایێ، پشتی سەروكانییا رۆژئاڤا دگەهیتە یا رۆژهەلات، رووبار بەرەڤ باشوور پاشی بەرەڤ رۆژهەلات دچیت و ل نك گوندێ پێشابیرێ دهێتە ناڤ توخیبێ عیراقێ[٣١].

درێژییا رووبارێ دیجلە هەر ژ ڤێكگەهشتنا هەردو رووباران و هەتا توخیبێ عیراقێ ـــ تركیا ١٠٠ كیلۆمەترە و رووبەرێ حەوزا رووبارێ دیجلە و چەمێن وی ب نێزیكی ٢٥٨ هزار كیلۆمەتر چوارگۆشە دهێتە تەخمین كرن و گەلەك باران و بەفر لێ دباریت و تێكرایا بارانبارینا سالانەیا ل سەر وێ حەوزێ ٨٠٠ (ملم)ە، هەروەسا ئاڤا سالانەیا درژێتە رووباری و هەمی پشكێن وی ب ٤٨,٧٠ ملیار مەترێن سێجا دهێتە تەخمین كرن[٣٢].

رێژگەها رووبارێ دیجلە تەنگ و كوور دبیت دەمێ دهێتە ناڤ توخیبێ پارێزگەهێ و كەڤر و تەحت و خاروڤیچی و سیلاڤ و شركێن ئاڤێ لێ مشە دبن، ئەڤە دگەل خورستێ دەڤەرێ دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا دیمەنێن دلڤەكەر و جهێن جوانێن وەسا كو گەلەك بنەماێن گەشتیاری بۆ راكێشانا گەشتیاران بۆ دەڤەرێ لێ هەبن، هەرچەندە گەلەك ژ وان دبەرنیاس نینن و د بیاڤێ گەشتیاری دا نەهاتینە ب كار ئینان.

هەروەسا ل ناڤ عەردێ پارێزگەهێ، رووبارێ دیجلە تێكەلی دو چەمێن دی یێن گرنگ دبیت كو ئەو ژی زێ یێ مەزن و خابوورن و هەردو ب رووبارێن هەردەمی یێن ئاڤا وان هەر دزەلیت دهێنە ل قەلەمدان و تبابەكا مەزن یا ئاڤا رووبارێ دیجلە كو نێزیكی ٥٦٪ێ یێ ژ كۆما ئاڤا وی رووباری ژ چەمێن دی دهێت و رێژا مایی ژی (ئانكو ٤٤٪)ێ ئەو ئاڤە یا ل ناڤ عەردێ تركیا دهێتە د ناڤ وی رووباری دا[٣٣].

## ج- رووبارێ خابوور:

رووبارێ خابوور ژ بلنداهیێن (شەریڤان مەهمەدان) و (دەریا نوداغ) یێ دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ تركیا دزێت و نێزیكی ٣٠٠-٣٥٠٠ مەتران ژ ئاستێ روویێ دەریایێ بلندترە، رووبەرێ گشتیێ حەوزا رووباری ٦٢٦٨ مەترێن چوارگۆشەیە، لێ درێژییا وی ل ناڤ عەردێ پارێزگەهێ ١٦٠ كیلۆمەترە و نزمی و بلنداهی یێن رك لێ هەنە، هەر بۆ نموونە، ٧٥٪ێ ژ رووبەرێ رووباری دەڤەرەكا چیایی یا ئاسێ یە و رووبەرێ مایی ژی دكەڤیتە عەردێ بانی یێ پارێزگەهێ، رووبارێ دیجلە ل باكوورێ گوندێ (جالیك) دهێتە ناڤ عەردێ عیراقێ و دۆلا (نهالا) وی هەتا دگەهیتە باژێرێ زاخۆ گەلەك یا ب چەپ وچیرە[٣٤].

ئاڤا نهالا (سەرەروو) ل باكوورێ چیایێ مەتینا ل رۆژهەلاتێ و ئاڤا دۆلا بانیا (سپنە)یا رۆژئاڤا ل باشوور دهێنە د ناڤ دا و پشتی دهێتە ناڤ توخیبی بەرەڤ رۆژئاڤا پاشی بەرەڤ باكوورێ رۆژئاڤا چەپ ددەت و رووبارێ (رووگەرم) درژێتە د ناڤدا و د ناڤ نهالەكا خاروڤیچ را دچیت هەتا ژ باژێرێ زاخۆ دەرباز دبیت، پاشی بەرەڤ رۆژئاڤا دچیت هەتا دگەهیتە رووبارێ (هیزل) ل دۆرێن نەهـ كیلۆمەتر و نیڤان ل رۆژئاڤایێ باژێرێ زاخۆ و ئاڤا هژمارەكا شیڤ و نهالان درژێتە د ناڤ دا، ژ وانا: نهالا شەرانش كو سیلاڤ

و سەیرانگەهەك لێ هەیە، نهالا بیجۆ، پشتی دگەهیتە هیزل رێژگەها وی بەرفرەهـ دبیت و ئاڤا وی بەزەکتر لێ دهێت هەتا درژێیتە رووبارێ دیجلەی ل باکوورێ گوندێ پێشابیرێ[٣٥].

فرەهیا رووبارێ خابوور ل دەمێ لەهی و لێمشتان ل ناڤبەرا ٢٧٠-٣٦٠ مەترایە و ئاڤا وی رێژەیا ٢,٢١٪ێ ێ ژ کۆما ئاڤا رووبارێ دیجلە پێك دئینیت و لەزاتیا ئاڤا رووباری ل نك باژێرێ زاخۆ دگەهیتە ١,٣٤ مەتران د چرکەیەکێ دا، ئەڤە ل وی دەمێ ئەڤ لەزاتییە د رەوشا مەزاختنا بلندا ئاڤێ دا دگەهیتە ٢,٣١ مەتران د چرکەیەکێ دا، هەروەسا پرا بەری (پرا دەلال) (کو ل ناڤ خەلکی ب پرا عەباسیکێ بەرنیاسە) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ باژێرێ زاخۆ و ل سەر رووبارێ خابووری یە ب ئێك ژ جهێن شوینواری و گەشتیارییێن گرنگ دهێتە ل قەلەمدان و گەشتیار ژ هەمی دەڤەرێن عیراقێ قەست دکەنێ[٣٦].

## د- رووبارێ زێ یێ مەزن:

زێ یێ مەزن (زێی بادینان) ب گرنگترین چەمێن رووبارێ مەزن دهێتە ل قەلەمدان، هەروەسا ئەو ئێکە ژ وان رێژگەهێن رووبارانە یێن د ناڤ عەردێ پارێزگەهێ را دەرباز دبن و ئەو رووبار ژ سرتەکا چیایی یا ئاسێ یا فرەئاراستەیا دکەڤیتە پشکێن بلندێن رۆژهەلاتێ حەوزا دیجلەی دزێت، کو ئەو ژی پشکەکە ژ بلنداهیێن (هەکاری) کو بلنداهیا وان ب پتر ژ ٤٠٠٠ هزار مەتران ژ ئاستێ رووبێ دەریایێ دهێتە تەخمین کرن[٣٧].

ل دەستپێکێ ئاڤا وی رووباری ژ باکوور بەرەڤ باشوور ل نك دۆلەکا چیایی یا تەنگ یا دکەڤیتە دەڤەرەکا بلنداهی و نزمی یێن رك لێ هەین دزەلیت و ئاڤا گەلەك دۆل و نهالان دهێتە سەر، پاشی بەرەڤ رۆژئاڤا پاشی جارەکا دی بەرەڤ باشوور چەپ ددەت و

نەخشەیێ (٣)



بەرەڤ نهالەكا تەنگ یا گەلەك ب چەپ وچیر دزەلیت، پاشی ل رۆژئاڤایێ گوندێ (چالی) یا دكەڤیتە باكوورێ قەزا ئامێدیێ دەربازی ناڤ توخیبێ عیراقێ دبیت[٣٨]، پشتی هنگی د كۆمەلگەها دێرەلوكێ را دەرباز دبیت و قەستا باشوورێ رۆژهەلات دكەت و چەمێ (روویێ شین) درژێتە د ناڤ دا[٣٩] و پشتی چەمێ (سپنە) یێ رۆژهەلات دگەهیتێ، بەرەڤ باشوورێ رۆژهەلات د ناڤ چیایێن شرین و پیرس دچیت و د دەڤەرا بارزان را دەرباز دبیت كو ئەو توخیبەكێ ناڤبرە ل ناڤبەرا توخیبێن پارێزگەهێ دگەل پارێزگەها هەولێر و دەڤەرەكە ب هاڤینگەهێن جوانێن (وەكی پیرس و گەلیێ زەنتە) یێن قەزا ئاكرێ ناڤدارە[٤٠].

درێژیا رووبـــارێ زێ یێ مـــەزن نێزیكی ٣٩٢ كیلۆمەتران و پانیا حەوزا وی نێزیكی ٥٨١٠ هزار كیلۆمەتر چوارگۆشەیە و ٦٤٪ێ ێ ژێ ئانكو نێزیكی ١٦٦٠٠ كیلۆمەترین چوارگۆشە ل دەرڤەی توخیبێن هەرێما كوردستانێ یە، لێ رووبەرێ مایی یێ زێ یێ مەزن د ناڤ عەردێ هەرێمێ دایە ژ وانا ژی ل پارێزگەها دهۆكە، مەزاختنا سالانەیا ئاڤا زێ یێ مەزن نێزیكی ٤٢٩ مەترێن سێجایە د چركەیەكێ دا، هەروەسا تێكرایا ئاڤا سالانەیا ل سالێن ١٩٦٠-١٩٩٠ ێ بۆ دهات ١٣,٨٣ ملیار مەترێن سێجا بوو[٤١]، ب دەهان چەمێن دی ژی هەنە ئاڤا وان ژ بلنداهیێن سرتا چیایێن (گارە، مەتینا، بەرواری بالا، شەرانش، ئاكرێ، پیرس) دزێت هەر بۆ نموونە، چەمێن: سپنە، گۆمل، شەرانش، نهنەك، مارسیس، بریشو (زەنتە) و كانی ماسێ، سەرباری هەردو چەمێن هیزل و روویێ شین یێن ژ باشوورێ كوردستانا تركیا دزێن[٤٢] بنێرە نەخشەیێ ژمارە (٣).

## دوو: دەریاچەیێن پارێزگەها دهۆك:

دەریاچەیێن دەستكردێن (دەستكارێن) ل دەڤەرا ڤەكۆلینێ هەین ب ژێدەرێن سەرەكی یێن ئاڤی دهێنە هژمارتن و بنەمایێن گەشتیاریێن مەزن بۆ كاركرنێ ل سەر بزاڤا گەشتیاری ل دەڤەرێ ب هەمی جۆرێن وێ ڤە هەنە، دهێتە تێبینی كرن ژی كو پتریا جاران دەریاچەیێن دەستكرد ل كوردستانێ ل دەڤەرێن چیایی و نیڤ چیایی دهێنە دانان ئەڤە ژی ب رێیا دانانا سكران ل وان دەڤەران، هەر بۆ نموونە سكرێن ل سەر هندەك چەمێن رووبارێ فورات و رووبارێن دی هاتینە دانان بووینە دەریاچە ل دەرێن چیایی یێن خۆرستەكێ دلڤەكەر هەین، هەر بۆ نموونە، هەردو دەریاچەیێن سكرێ دهۆك و مووسل، فەرە بێژین ژی ڤێ داویێ داخوازیا جیهانی و خۆجهی ل سەر دەڤەرێن گەشتیاری یێن ئاڤی زێدەبوویە و ئەو داخوازی نێزیكی ١٥٪ێ ێ ژ كۆما گەشتیاریا جیهانی بوویە[٤٣].

### أ- دەریاچەیا دهۆك:

ئەڤ دەریاچەیە نێزیكی دو كیلۆمەتران ل باكوورێ سەنتەرێ باژێرێ دهۆكێ یە ل دەرێ گەلیێ دهۆك ل سەر رووبارێ دهۆك پشتی هەردو چەمێن سندۆرێ و گەرماڤا دگەهنە ئێك، ئەڤە سەرباری سەروكانیێن دی یێن ئاڤێ ژ كانیێن كبریتی یێن ب درێژیا سالێ ئاڤا وان بەردەوامە[٤٤].

دەریاچەیا دهۆك رووبەرەكێ ئاڤییە و ژ ئاڤاكرنا سكرێ دهۆك پەیدا بوویە و ئاڤاكرنا وی سكری و پاشبەندێن وی ل سالا ١٩٩٠ ێ تمام بووینە، درێژیا سكری ٦١٣ مەتر و بلندیا وی ٦٤ مەترە، لێ بلندیا روویێ سەرڤەیێ ئاڤا سكری ٦٤٠ مەترە ژ ئاستێ روویێ دەریایێ و شیانا ڤەگرتنا ٥٢ ملیۆن مەترێن سێجایێن ئاڤێ هەیە، ژ وێ ژی ٤,٣٩ ملیۆن مەترێن سێجایێن عمبارا مرییە و رووبەرێ سكری ل دۆرێن ٦,٨ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە.

ئارمانجا سەرەكی ژ ئاڤاكرنا سكری ڤەگرتنا ئاڤا بەفر و بارانێیە ل هەردو وەرزێن زڤستانێ و بهارێ و بەردانا وێ یە ب ئاوایەكێ رێكخستی ل وەرزێ هشكێ هاڤینێ بۆ ئاڤدانا نێزیكی ١١ هزار دۆنەمێن عەردی ل هەردو دەشتێن مالتایێ و سێمێلێ، هەروەسا ب كارئینانا ئاڤا وێ یە بۆ خودانكرنا ماسییان ل ناڤ حەوزا سكری یا ئاڤا وێ رێژەیەكا بلند یا خوێ یا كبریتی تێدا هەی، دیسا بۆ ئاڤاكرنا گوندەكێ

گەشتیارییە ل رەخ ورویێن سکری، ئەڤە سەرباری ب کارئینانا ئاڤا وێ بۆ چاندنا گەلەك جۆرێن فێقی و جۆرێن گیای (زەرزەواتی) داكو ب درێژیا سالێ هەبن و بۆ خودانکرنا گیاندارێن چیایی و پەیداکرنا کاری ل جهـ و سازیێن گەشتیاری یێن دهێتە پێشبینی کرن ل دووڤ پلانان و ل دووڤ پێشنیارێن هەر ئێك ژ وەزارەتا ئاڤدانێ ب هەماهەنگی دگەل سازیا گشتیا گەشتیاری و سەفەرێ ل سالێن هەشتێ یێن سەدسالا بۆری پێشکێش کرین بێنە ئاڤاکرن، لێ پتریا وان پێشنیاران ژ بەر رەوشێن پەیوەندیدار ب ئێمناهی و سەربازی یێن ل دەمێن بۆری دەڤەر تێرا دەرباز بووی نەهاتنە ب جهـ ئینان، ژ بلی پرۆژێ سکری یێ ئاڤا ڤەخوارنێ ددەتە باژێرێ دهۆك و رەخ ورووبێن باژێری[٤٥].

پشتی سالا ١٩٩١ ێ دەریاچەیا سکرێ دهۆك بوویە ئێك ژ جهێن گەشتیارێن سەرەکی ل باژێرێ دهۆك، ئەڤە ژی ژ بەر جوانیا جهێ وێ و هویناتیا سەقایێ وێ و ژ بەر گەلەکیا ژێدەرێن وێ یێن ئاڤییە کو ئەو ژی رووبارێ دهۆك و هشکەرۆ و ژ بەر زۆریا ئاڤێن وێ یێن کانزایی یە، ل سەر ڤی بنواشەی، پێدڤییە ئەڤ سامانێ ژنگەهی بێتە ب کار ئینان و چاڤدان لێ بێتە کرن و بێتە پاراستن و ل سەر بنەمایێن هۆنەری بێتە ب کار ئێخستن ب ئاوایەکێ وەسا د خزمەتا وەرار و گەشەپێدانا گەشتیاریا دەڤەرێ دا بیت[٤٦].

نۆکە ل ڤی جهی گەلەك جهێن بێنڤەدانێ و گازینۆ و خوارنگەهێن خوارنێن سەرپێ و فرۆشگەهێن (کشکێن) ئەهلی ل هەردو رەخێن گەلی ل سەر رێیا دچیتە دەریاچەیێ هەنە، ئەڤە سەرباری سەیرانگەها گەلی و باخچە کو ئەڤە هەمی رحەتی و خۆشییەکێ بۆ سەیرانی و گەشتیاران پەیدا دکەن و چەندین جۆرێن خوارن و تەزیاتی و ڤەخوارنان پێشکێشی وان دکەن.

ل سەر ڤی بنەمایێ مە بەحس کری، وەسا دبینین، کو پێدڤییە پشتی پەیداکرنا پێکوهۆرەکێ دی بۆ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ باژێرێ دهۆك، ئاڤا ڤەگرتیا سکری ل هندەك جهان بێتە کێم کرن هەتا مرۆڤ بشێت بگەهیتە کانیێن کبریتی یێن گەرماڤا و ئەو کانی وەك جهەك بۆ ساخلەمبوونێ و بۆ چارەکرنێ ژ نەخۆشییان و وەك جهێن گەشتیاری یێن دەڤەرێ بێنە ب کار ئینان و پارکەکا گەشتیاری ل گزیرتێ ل نیڤا دەریاچەیێ (گرێ عەمێ) بێتە دانان و بەختەکا (گەمیەکا) گەشتیاری بێتە پەیدا کرن داکو ل گەریانێن ل نیڤا دەریاچەیێ بێتە ب کار ئینان و وەرزشێن ئاڤی بێنە کرن، وەکی ئاڤپاشدانکانێ (تجذیف) ل سەر ئاڤێ و مەلەڤانی و نێچیرێ و یاریێن دی یێن وەرزشی.

هەروەسا دشیاندایە وزەیا کارەبێ ژ ئاڤا سکرێ دهۆك ژ رەخێ دەرڤەیێ تۆنێلا ئاڤدانێ بێتە بەرهەم ئینان ئەڤە ژی پشتی ب کووریا نێزیکی ٣٠ مەتران ل بن رووبەرێ سەرڤەیێ ئاسایی یێ عەردی هەلکۆلان د ویستگەهی دا دهێتە کرن و دشیاندایە ل پاشەرۆژێ ٢,٦٠٠ میگاواتێن وزەیا کارەبێ ژێ بێنە بەرهەم ئینان[٤٧].

### ب- دەریاچەیا سکرێ مووسل:

دەریاچەیا مووسل رووبەرەکێ ئاڤییە ژ ئاڤاکرنا سکرێ مووسل پەیدا بوویە و دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ مووسل، هەروەسا ل باشوورێ رۆژئاڤایێ باژێرێ دهۆکە، ل دۆرێن ٣٦٠٠ مەتران درێژ و ١٣١ مەتران بلندە، لێ بلندیا ئاستێ سەرڤەیێ ئاڤا سکری دگەهیتە ٣٣٦ مەتران ل سەر ئاستێ رووییێ دەریایێ، شیانا بلندا سکری بۆ ڤەگرتنا ئاڤێ ١٢,٥ ملیار مەترێن سێجایە، لێ تبابا عمبارکرنێ دگەهیتە ١١,٤٣ مەترێن سێجایێن ئاڤێ و دشێت د چرکەیەکێ دا ٥٦٠٠ مەترێن سێجایێن ئاڤێ بمەزێخیت[٤٨].

ئارمانج ژ دانانا وی سکری کۆنترۆلکرنا ئاڤا رووبارێ دیجلە بوو بۆ پاراستنێ ژ مەترسییا لەهی و لێمشتان و بۆ ئاڤدانا عەردێن بەرفرەهێن چاندنێ و بەرهەمئینانا وزەیا کارەبێ بوو بۆ دەڤەرێن باکوورێ عیراقێ، هەروەسا بۆ چێکرنا دەریاچەیەکا دەستکرد بوو ل جهەکێ نیڤ چیایی یێ رووبەرێن بەرفرەهێن پارێزگەها دهۆك و مووسل ب خۆڤە دگریت و دبیتە

جهەکێ جوان و بالکێش و گەشتیار دێ شێت ب خۆشی و رحەتی دەمێ خۆ یێن ڤالا لێ ببۆرینیت و یاری یێن وەرزشی یێن ئاڤی و چالاکییێن دەمبۆراندنێ بکەت، ئەڤە سەرباری زێدەکرنا سامانێ ماسییان.

سکر و دەریاچەیا مووسل بنەمایێن راکێشانا گەشتیاری لێ هەنە و هەر کەسەك دشێت ب ساناهی بگەهیتێ، چونکی ل جهەکێ باشە ل سەر وێ دوریانا نێڤدەولەتیا عیراقێ ب ترکیاڤە گرێ ددەت ژ مووسل بۆ زاخۆ، ئەو دەریاچە دکەڤیتە لایێ چەپێ یێ رووبارێ دیجلە و ل دوێرێن حەفت کیلۆمەتران دووری رێیا گشتییە[٤٩].

هەرچەندە ژی دەریاچەیا سکرێ مووسل رووبەرەکێ مەزن هەیە کو نێزیکی ٦٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و عەردەکێ بەرفرەهێ پارێزگەها دهۆك ب خۆڤە دگریت ل سەر توخیبێ وێ دگەل پارێزگەها مووسل (نەینەوا)، لێ کارگێریا پارێزگەها دهۆك ئەو شیانێن خۆرستی بۆ چالاککرنا بزاڤا گەشتیاری ب کار نەئینایە، ژ بلی پرۆژێ چەم بەرەکات یێ بۆ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ باژێرێ دهۆك و دەوروبەرێن وێ و بۆ ئاڤدانا هندەك عەردێن چاندنێ ل دەردۆرێن دەریاچەیێ دهێتە ب کار ئینان، ژ بەر هندێ، پێدڤییە لایەنێن تایبەتمەند ل پارێزگەهێ هەماهەنگیێ دگەل وەزارەتا باژێرڤانی و گەشت وگوزارا هەرێما کوردستانێ بکەت و ب رژدی دەست ب دانانا پلانێن پێشێخستنا کەرتێ گەشتیاری ل دەڤەرێ بکەت، ئەڤە ژی ب رێیا پەیداکرنا شیانێن ماددی و کار ب ساناهیکرنێن پێدڤی بۆ دانانا کەلەك پرۆژەیێن گەشتیاری و خزمەتکاری و زێدەکرنا رووبەرێن کەسك و ب کارئینانا ئاڤا دەریاچەیێ بۆ خودانکرنا ماسییان و ئەنجامدانا هندەك یارییێن وەرزشی یێن ئاڤی و نێچیرێ و ئینانا بەختەکا(گەمیەکا) گەشتیاری بۆ ڤەگوهاستنا گەشتیاران و سەیرانکرنێ ل نیڤا دەریاچەیێ و.. هتد[٥٠].

## سێ: ئاڤا ژێرزەڤی (بنعەرد):

گرنگیا ئاڤا ژێرزەڤی ل دووڤ پێکهاتا وێ یا کیمیاوی یان ژی ل دووڤ جوداهیا پلەیا گەرمیا وێ یە، هەروەسا تەخا کەڤر و تەحتێن ئەو ئاڤ د ناڤ را دەرباز دبیت کاریگەریا خۆ ل سەر هەیە، لێ تشتێ گرنگ بۆ بابەتێ مە رۆلێ وێ ئاڤێیە د چالاکیا مرۆڤی دا، ژ وانا ژی چالاکییێن دەمبۆراندنێ و گەشتیاری، ئەڤە ژی ب رێیا دیاردا کانیێن کانزایی و کانییێن گەرمێن ل دەڤەرێن جودا جودا هەین و گرێدایی رەوشێن خۆرستی نە و ئەو رەوش ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی یێ پارێزگەهێ دهێتە گوهورین، هەروەسا ب کارئینانا ڤان ب ئاوایەکێ وەسا د خزمەتا بزاڤا گەشتیاری و وەرار و دانانا وان سازی و خزمەتان دا بیت یێن پەیوەندی ب ڤی جۆرێ گەشتیارێ ڤە هەین.

**دشیاندایە ژی ئاڤا ژێرزەڤیا پارێزگەهێ ل سەر ڤان جۆران بێتە دابەش کرن:**

### أ- سەروکانی و کانییێن ئاڤا تامخۆش (ئاڤا ڤەخوارنێ):

پارێزگەها دهۆك ب زۆری و مشەییا جهێن ئاڤا سەروکانی و کانییێن ئاڤا تامخۆش ناڤدارە و هەبوونا وان بووینە تەوەرێ سەرەکیێ ژیانا مرۆڤی هەتا پلەیەکا وەسا هەبوونا وان سەروکانییان بۆشاتیا ئاکنجییان ل پتریا دەڤەرێن پارێزگەهێ و جۆرێ ژیارا وان و بەرهەمێ وان یێ ئابووری دەستنیشان بکەت، هەروەسا هەتا پلەیەکێ ژی ئاکنجی گرێدایی دابەشبوونا جۆگرافیا وان ژێدەرێن ئاڤێ نە، هەروەسا جۆرێ ڤان ئاڤان ژی ب جۆرەکێ نایاب بۆ ب کارئینانا مرۆڤی دهێتە ل قەلەمدان و ژ باشترین جۆرێن ئاڤێ یە ل کوردستانێ ب تایبەتی و ل عیراقێ ب گشتی ژ بەرکو رێژەیەکا کێم یا خوێ یا حەلیای (ب رێژا ٢٤٠-٣٥٠ مللیگرام د لیترەکێ دا) د ناڤ ئاڤا وێ دا هەیە[٥١] و ئاڤەکا زەلالە و تبابەکا ناڤنجی یا ماددێن کیمیاوی و فیزیایی و بەکتریۆلۆجی تێدا هەنە و پتریا جاران ب کێر ڤەخوارنێ هەتا بۆ کاروبارێن ناڤمالێ و ب کارئینانێن پیشەسازی دهێت و ب سەدان ژ ڤان کانی و سەروکانییان هەنە و هەر ئەوون یێن ل باژێر و هاڤینگەهێن بەربەلاڤێن پارێزگەهێ هەین، هەر بۆ نموونە و یێن ژ هەمیان گرنگتر: ل بامەرنێ،

شەرمنێ، بازلان، سیارەتیکا، کانیا مالا، سەرسنکێ، قەدشێ، سولاڤێ، شەرانش، کانی زەرکێ، مەمێ یێ، میرا و.. هتد[٥٢].

**ب- کانیێن ئاڤێن کانزایی:**

گەلەك کانیێن کانزایی ل دەڤەرێن جودا جودایێن پاریزگەهێ هەنە و هژمارا وان ژ دەه کانییان زێدەترە، هندەك ژ وان ب کێر ڤەخوارنێ و چاندنێ هندەك ژی ب کێر خۆششتنێ و چارەکرنێ ژ نەخۆشییان دهێن، هەرچەندە ژی گەلەك ژ وان کانییان هەنە و ئاڤا وان یا بۆشە و سەخلەتێن کیمیاوی یێن تایبەت هەنە، لێ هەتا نوکە ل دەڤەرێ د وەرارا گەشتیارییا چارەکرنێ دا نەهاتینە ب کار ئینان، گرنگترین تایبەتمەندیا ڤان کانییان ژی ئەوە کو ئاڤا وان د پلەیەکا بلندا گەرمیێ دایە و ژ ٣٦ پلەیێن سەدی زێدەترە[٥٣]، هەروەسا زەنگینن ب ماددێن کبریتیدی (گۆگردی)، هەروەسا سویراتییا وێ ب رێژەیەکا بلندە، ئەڤە ژی ژ بەر تەخێن جپسون (گێچێ) و ئەنهاریدرایت CUSO ٤,٢H٢٥ و ماددێن نەفتی یێن د وان کەڤرێن وێ ئاڤێ ڤەدگریت[٥٤]، گرنگترین کانیێن کانزایی یێن ناڤدار یێن رێژەیەکا زۆر یا ماددێن کبریتید تێدا هەین کانیێن گەرماڤانە کو پتر ژ دو کیلۆمەتران دووری سەنتەرێ بازێرێ دهۆکێ نە ل سەر رێیا کەڤنا دهۆك - زاویتە و ئەو زێدەرێ سەرەکی یێ ئاڤا دەریاچەیا دهۆکێ یە[٥٥] و دشیاندایە بۆ چەند هێلەکان بێتە دابەش کرن:

١- شەرانش - مێرگاتیێ - زاخۆ.

٢- کانی ماسێ - هارینا - شیناڤا.

٣- ئەرەدنا - بێبادێ - بامەرنێ.

٤- سیلاڤێ - سەرێ ئامێدیێ - کانی سۆر.

٥- سیلاڤ و کانیێن ئاشاوا[٥٦].

سەرباری ڤێ ژی حەزکرنا خەلکی بۆ سەرەدانا جهێن زێدەرێن ئاڤا کانزایی ل پاریزگەهێ بۆ دەمبۆراندن و چارەکرنێ ژ نەخۆشییان ژ لایێ خەلکێ دەڤەرێ و دەرڤەی دەڤەرێ ل ئاستەکێ پێدڤی نینە، دبیت ئەڤە ژی ژ بەر کێمیا هەبوونا خزمەتگوزاریێن وەکی هۆیێن ڤەگوهاستن و حەواندن و کادرێن گەشتیاری و نوژداری یێن تایبەتمەند د ڤی بیاڤی دا بیت، هەروەسا ژ بەر کێمیا ژێرخانێن وەکی نەخۆشخانە و بنگەهێن ساخلەمیێ و خزمەتێن دی یێن گەشتیاری و لاوازیا هۆیێن راگەهاندنێ بیت بۆ ریکلامکرنێ بۆ ڤان جهان و لاوازیا رێکخستنا جهێن ئاڤا کانزایی بیت ل دووف پێدڤی و ب کارئینانا وێ ئاڤێ، ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ هندێ چاڤدان و ب کارئینانا ڤان جهێن گرنگێن گەشتیاری یا کێم بیت، ژ بەر هندێ، ڤەکۆلینا زێدەرێن ئاڤێ ل پاریزگەهێ و پۆلێنکرنا شیانێن وێ یێن گەشتیاری گرنگییەکا مەزن هەیە، ئەڤە ژی ژ بەر وێ پەیوەندییا موکم یا ل ناڤبەرا چالاکییا گەشتیاری ژ لایەکی و زێدەرێن ئاڤێ ژ لایەکێ دیڤە هەی[٥٧]. بنێرە نەخشەیێ ژمارە (٣).

## بەرگێ رووەکی (کەڤەرێ رووەکی- الغطاء النباتي):

بەرگێ رووەکی، ڤێجا چ رووەکێ خۆرستی بیت یان داروبار بن بۆ گەشتیاریێ هاتبنە چاندن، ژ بەر گەلەك ئەگەران، دبنە ئێك ژ پێکهاتێن گرنگێن گەشتیاری، ژ وانا: جوانی و گەشاتییەکا دلڤەکەر ددەنە ژینگەها خۆرستی، نەخاسمە ژی بۆ سەنتەرێن گەشتیاری و ئەڤ داروبارە هاریکاریێ د کێمکرنا تەحرا هاڤینێ و سرۆسەڤەما زڤستانێ دا دکەن، هۆسا سەقایەکێ ساخلەمێ لەشخۆشکەر ددەنە خەلکی و ژینگەهێ دپارێزن ب هەڤبەرکرن دگەل عەردێن دی یێن بێ داروبار، ئەڤە ژ بلی ئەڤ داروبارە دبنە زێدەرێن گەلەك پیشەسازیێن ڤەگوهێز، ژ وانا: پیشەسازیێن خوارنێ و پیشەسازیێن فۆلکلۆری یێن مللی، هەروەسا دبنە پەناگەهێن خۆرستی بۆ گەلەك گیاندار و بالندەیێن کووڤی کو ئەڤە ب خۆ ژی ئێکە ژ بنەمایێن گەشتیارییا خۆرستی[٥٨].

**بەرگێ رووەکی یێ پاریزگەهێ ژی ئەڤێن خوارێ ب خۆڤە دگریت:**

## ئێك: كەمەرا دارستانێن خۆرستی:

دارستانێن خۆرستی یێن پارێزگەهێ وەكی دارستانێن ل پشكێن دی یێن هەرێما كوردستانا عیراقێ، ژ خێزان و رەگەز و جۆرێن جودا جوداییێن داروبـاری پێك دهێن و پتریا دارێـن ل دارستانێن دەڤەرێ هەین ژ جۆرێ دارێن بەلگوەرینن و ب رەگەزێن سەرەكی یێن وان داستانان دهێنە هژمارتن و ٨٥٪ێ ژ رووبەرێ دارستانێن خۆرستی یێن هەرێما چیایی یا عیراقێ دنخێڤن، ژ ڤان جۆران ژی جۆرێ سەر ب رەگەزێ بەرووێ (دیندار، مازی، بەڕوی) و هەر جۆرەك ژ جۆرێن ژێگۆتی ژ لایێ گرنگیێ ڤە كاریگەرییێن خۆ یێن جودا جودا ل سەر داخوازیا گەشتیاری هەنە، ب ئاوایەكێ گشتی ژی دشێین بێژین كو هندی رووەكێ خۆرستی زۆرتر و بلندتر بیت، بۆ گەشتیاران و حەزێن وان بالكێشترە داكو ل وێرێ چالاكیێن خۆ یێن گەشتیاری ئەنجام بدەن، ژ بەر هندێ، گرنگیا دارستانان و كاریگەریا وان ل سەر كەرتێ گەشتیاریێ مەزنترە ژ وێ گرنگیا تراشۆك و شینكاتییێن كورت ل سەر وی كەرتی هەین[٥٩].

خێزان و جوینێن دی یێن وەكی گووز، سماق، كەزان، چنار، سپیندار (هەردو جۆرێن ستوونی و تابەلاڤ)، بیهۆك، بەناڤ، میتك(اس)، كاژ و رووەكێن مایی ژ ڤان جۆران ١٥٪ێ ێ ژ رووبەرێ دارستانێن خۆرستی یێن دەڤەرا چیایی یا عیراقێ پێك دئینن[٦٠].

دەڤەرێن خۆرستی یێن پارێزگەهێ ل دووڤ پێكهاتا جۆرێن وان بۆ سێ پشكان دهێنە دابەش كرن كو ئەو ژی ئەڤەنە:

### أ- دەڤەرا دارستانێن كاژان (برويتا):

كەمەرا ڤان دارستانان ل پارێزگەهێ ل ناڤبەرا هەردو هێلێن پانی یێ ٠٣٦,٥٠-٠٣٧ ل باكوور و هەردو هێلێن درێژیێ ٠٤٣,١٥-٠٣٧,٤٠ ل رۆژهەلات درێژ دبیت[٦١]، كو ئەڤە ژی وەكی شریتەكا زراڤە د رێیا خۆ دا گرێن نزمێن ل ناڤبەرا دهۆك و زاویتە و سەرسنك ل رۆژئاڤا هەتا گەلیێ ئەتریش ل رۆژهەلاتێ دسمیت و ئەڤ دارە ل سەر بلنداهییا نێزیكی ٦٠٠-١٢٠٠ مەتران و ب تێكڕایا بارانبارینا سالانەیا ٧٠٠ (ملم)ان شین دبیت، هەروەسا ل سەر كەمەرا ئاخا رەنگ خاكیا سۆر كو ل دەڤەرا زاویتە و رەخ وروێن وێ هەیە شین دبیت و رووبەرێ ڤان دارستانان ٥٠٠ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە[٦٢].

سەرباری كاژێن ل هەردو دەڤەرێن زاویتە و ئەتریش هەین، هندەك دارێن دی ژی دگەل دارستانێن برويتا هەنە، وەكی: كاژ (كاژا حەلەبی)، كاژا تكرا، (العدر) ، بندار (ارز اللبنانی)، ئەو جۆرێ كاژێن بۆ عید میلادان دهێنە ب كار ئینان، وەكی كاژایە لێ بەژنكورتە)، بەڕوی، مازی، كاژا ستوینی (بیلادی)، كەزان، گوهیشك، سماق.. هتد[٦٣]، لێ رووەكێ گیایی یێ ل دەڤەرێ هەی ژ جۆرێ چاتر، ئادارۆك (كول ئادار)، جاترك و.. هتد[٦٤].

### ب- دەڤەرا دارستانێن بەلگوەرین (بەڕوی):

پتریا رووەكێ خۆرستیێ ڤێ دەڤەرێ ژ دارستانێن بەرویان ب هەمی جۆرێن وێ ڤە پێكدهێت، كەمەرا درێژبوونا خۆرستییا ڤێ رووەكی ل دەڤەرێ ل بلنداهییەكا نێزیكی ٨٠٠-١٨٠٠ مەترایە ل سەر ئاستێ دەریایێ[٦٥]، ئەڤ دارستانە ب ئاوایەكێ خۆرستی ژ دووروترین خالا باكوور و باكوورێ رۆژهەلاتێ عەردێ پارێزگەهێ ل سەر توخیبێ سیاسی یێ عیراقێ دگەل هەر ئێك ژ تركیا و ئیرانێ د چارچۆڤێ بازنەیێن پانی یێن ٠٣٦,٥٥-٠٣٧,٢٠ ل باكوور و هێلێن درێژیێ ٠٤٢,٢٥-٠٤٤,١٠ ل رۆژهەلات درێژ دبن، دەڤەرێن دارستانێن بەرویێ هەر ژ باكوورێ پارێزگەهێ هەتا سەرسنكێ و ئامێدیێ و سیلاڤێ د سرتا چیایێن گارە و مەتینا ڕا بەرەڤ باكوورێ بازێرێ زاخۆ هەتا دەڤەرا كانی ماسێ و چیایێن شەرانش و بەرواری بالا و نێروە رێكان و چیایێن ئاكرێ درێژ دبن و ئەڤ دارستانە ل بلنداهیا ١٣٠٠ مەترانە ژ ئاستێ رووێ دەریایێ[٦٦].

فرەڕەنگیا دەڤەرا دارستانێن خۆرستی یێن پارێزگەها دهۆك ب ئاوایەكێ گشتی ژ لایێ ژینگەهێ ڤە نێزیكی دارستانێن ئەورۆپی - سیبری

یە و نە نێزیکی جۆرێ دارستانێن دەریا سپی یا ناڤینە هەرچەندە هندەك دارێن وان هەڤشێوێ دارێن چیایێن حەوزا رۆژهەلاتێ یا وێ دەریایێ نە و دارێن هەردەم کەسك ل ڤان دارستانان نینن[٦٧].

### ج- دەڤەرا دارستانێن دۆل و نهال و کنارێن رووباران:

ئەڤ دارستانە ب رەخ کنارێن رووباران و رەخ ورویێن جۆیێن مەزنێن ئاڤێ و دۆل و نهالێن چیایی و چەمێن رووبارێن سەرەکی یێن د دەڤەرێ را دچن هەنە، هەر بۆ نموونە، رووبارێ دیجلە و چەمێن وی (خابوور، زێ یێ مەزن، هیزل، رووبێ شین، کانی ماسێ)، دارێن ڤان دارستانان ب بلنداهیا ٦٠٠-١٥٠٠ مەتران ل سەر ئاستێ دەریایێ شین دبن و گەلەك حەز ژ ئاڤێ دکەن، بیهۆك ژی بلندترین دارە ل دەڤەرێ هەی[٦٨]، دگەل ڤان داران ژی دارێن گووزێ، چنارێ، سپیندار، و قوغا سپی و رەش یێن ب ئاوایەکێ بەرفرەهـ بۆ ئاڤاکرن و گەرمکرنێ دهێنە ب کار ئینان هەنە[٦٩]، ئەڤە سەرباری هەبوونا دارێن توییان، رویلێ، تڤسك (التین البری) و (التفاح البری) هەنە[٧٠]، رووبەرێ ڤان دارستانان ب ٨٠ هزار دۆنەمان دهێتە تەخمین کرن و ل پارێزگەهێن عیراقێ ب درێژیا هەردو رووبارێن دیجلە و فورات و چەمێن وان هەنە[٧١].

## دوو: کەمەرا گیای و ئستبێ تەڕ (شهدار):

ئەڤ کەمەرە بنی و بەتەنێن ژێری یێن چیایێن پارێزگەها دهۆك ب خۆڤە دگریت کو بلندیا ڤێ کەمەرێ ل ناڤبەرا ٣٠٠-٥٠٠ مەترانە ژ ئاستێ دەریایێ، ئەڤە ل وی دەمێ بلندترین توخیبێ ڤێ کەمەرێ ل هندەك جهێن چیایی نێزیکی ٨٠٠ مەترایە[٧٢]، هەر بۆ نموونە، ل پشکێن باشوورێ رۆژئاڤا و رۆژئاڤا کو ل دەستپێکا بەتەنێن باشوورێ چیایێن بازێرێ دهۆکێ نە، نەخاسمە یێن دکەڤنە هنداڤی حەوزا رووبارێ دهۆك و چیایێ ئاکرێ و... هتد.

ئەڤ دەڤەرە دکەڤیتە ل ناڤبەرا هەردو هێلێن پانیێ ٣٠٠-٥٠٠ ملم و گرنگترین شینکاتیێن وێ کەنگر، سەرکێن شەکرۆکا (ایتمول المتوح)، جەهداسی (شوفان)، بەیبین (کولیلکەکا زەر و سپییە) کو هاڤینێ پشکەکا وان وەکی ئیتمول و کەنگران دبنە هستری، هەروەسا ل توخیبێ ڤێ دەڤەرێ هندەك دارێن دەڤەرێن دارستانان هەنە و ل بلندیا چیا و گران شین دبن، لێ گیایێن چۆلی ل بەتەنێن نزم شین دبن و کەمەرا خۆڕستیا هەبوونا وان ژی دەڤەرێن بانی و گرانە کو ب راستی ژی ئەڤە دەڤەرەکا ڤەگوهێزە ل ناڤبەرا شینکاتیێن چیایی و گیایێن بیابانی و توخیبێ وێ یێ باشوور ژی گونجایە دگەل هێلا بارانێ یا ٢٠٠ ملم، ئەڤە ل وی دەمێ توخیبێ وێ یێ باکوور گونجایە دگەل توخیبێ باشوورێ دەڤەرا چیایی یا پارێزگەهێ[٧٣].

هەروەسا درێژبوونا خۆڕستیا ڤێ کەمەرێ د دەشتێن وەکی سندی و بامەڕنێ و سیتەك و دەشتێن دی را دبۆریت و ئەوێ سەرەدانا ڤێ دەڤەرێ بکەت هەکە بەرەڤ رۆژهەلات بچیت و قەستا باتیفا بکەت، ڤێ دیاردێ باش دێ بینیت، هەروەسا ئەو رێڤینگێ ژ سەنتەرێ بازێرێ دهۆك دەردکەڤیت و بەرەڤ ئامێدیێ دچیت، نەخاسمە هەکە د گەلیێ سیارەتیکا را دەرباز ببیت، دێ تێبینی کەت کو دەشتا بامەڕنێ ل سەر هێلا دەشتا سندی یە.

فەرە بێژین کو ئەڤ دەشتە ل وەرزێن بارانبارینێ دبنە دەڤەرێن کەسکێن گەهشتی و پڕ شینکاتی نەخاسمە ژی هەر ژ نیڤا وەرزێ پاییزێ هەتا داویا بهارێ و کەسکاتیا ڤی شینکاتی چەند هەیڤەکێن هاڤینێ ژی بەردەوام دبیت، نەخاسمە ل سەنتەرێن سەرەکی یێن گەشتیاریێ یێن پارێزگەهێ و ئەڤ دەشتە وەك چەروانێن خۆڕستی یێن باش مفا ژێ دهێتە وەرگرتن، ئەڤە سەرباری کو بۆ چاندنا گەلەك دەرامەتێن چاندنێ دهێنە ب کار ئینان.

هندی بەرەڤ باکوور و رۆژهەلاتێ ڤان دەشتان ژی بچین، دهێتە تێبینی کرن کو بەرگێ رووەکی هێدی هێدی دبیتە گیایەکێ بۆشتر و پیچەك درێژتر و

بلندییا عەردی زێدەتر لێ دهێت و باران پتر لێ دباریت، ئەڤە ل وی دەمێ ئەڤ بەرگە ژ لایێن باشوور و رۆژئاڤا وەکی رووەکێن بیابانی لێ دهێن[٧٤].

## ژیانا کووڤی (الحیاة البریة) :Wild life

بالندە و گیاندارێن کووڤی و ماسی یێن د رووبار و دەریاچەیان دا هەین، دبنە جهێ گرنگیپێدانا گەشتیاران و دبنە ئێك ژ بنەماینێن جۆگرافی یێن خۆرستی یێن کاریگەر د کەرتێ گەشتیاریێ دا، هەبوونا هژمارەکا زۆر یا بالندە و گیاندارێن کووڤی تشتەکێ باشە بۆ ئەوێن حەزا نێچیرێ هەین و بۆ خۆشیبرنێ ب دیتنا چەندین جۆرێن وان بالندە و گیانداران نەخاسمە ژی کو هندەك ژ وان ژ جۆرێن دەگمەن بن و جهێ پویتەدانا ڤەکۆلەرێن جیهانی بن[٧٥]. گەلەك دەولەت و هەرێم گرنگییەکا مەزن ددەنە گیاندار و بالندەیێن دەگمەن و رێکارێن پێدڤی بۆ پاراستنا وان ب کار دئینن و ل پارکێن نیشتمانی یێن پەرژانکری دهێنە خرڤەکرن و باش دهێتە پاراستن و ژ لایێ دەولەتێ ڤە دهێنە چاڤدان کو ئارمانج ژ دانانا وان پارکان پاراستنا جۆر و نفشێ وان گیاندارێن کووڤی و بالندەیێن دەگمەنە ژ بەرزەبوونێ و باشترکرنا جۆرێ وانە و رزگارکرنا وانە ژ مەترسییا قربوونێ و راهێلانا بەرەللا ژ بەرکو ئەڤ سامانە سامانەکێ نیشتمانییە وەکی ئەڤە ل دەولەتێن رۆژهەلاتێ ئەفریقیا و هندەك دەولەتێن ئەورۆپی هەین و دبنە جهێن باش بۆ راکێشانا گەشتیاران[٧٦].

دەڤەرا چیایی یا هەرێما کوردستانا عیراقێ، ژ وانا ژی دەڤەرا ڤەکۆلین ل سەر دهێتە کرن، هەرێما ئێکانەیە ل عیراقێ یا هەتا نۆکە هندەك ژیانا کووڤی یا دەگمەن لێ هەی، ئەڤە ژی ژ بەر جهێ وێ یێ جۆگرافی یە یێ دکەڤیتە چارچۆڤێ مشەختبوونا سالانەیا بالندەیان ژ باشوور بەرەڤ باکوور و ژ بەر هەڤسوویاتییا وێ یە دگەل کیشوەرێ ئەورۆپا، هەروەسا ژ بەر خۆرستێ هەمەرەنگێ رووییێ عەردییە کو هاریکارە بۆ پاراستنا ڤێ ژیانا کووڤی، ئەڤە سەرباری سەقایێ وێ و هەبوونا کەڤەرەکا تێر شینکاتی، رامانا ڤێ ژی ئەوە کو حەزا دیتنا گیاندارێن کووڤی ل ژینگەها وان یا خۆرستی هاریکارە بۆ راکێشانا هژمارەکا مەزن یا گەشتیاران بۆ هەرێمێ[٧٧].

سەرباری ڤێ چەندێ، ئەڤ سامانێ خۆرستیێ دشیاندایە ببیتە هۆکارەکێ نوو یێ گەشتیاری، گەڤا قربوونێ ل سەر پەیدا بوویە، ئەڤە ژی ژ بەر زۆرییا ب کارئینانا چەکێ ئاگرین بێی هندێ گرنگییا وی سامانی بۆ ئابوورێ نەتەوەیی بێتە زانین، سەرباری داربڕین و چەراندنا زێدە کو هەر ئەو داروبار و شینکاتی خوارنن بۆ گیاندارێن گیاخۆر و وان دپارێزن.

ژ بەر هندێ، پێدڤییە لایەنێن پەیوەندیدار دەملدەست مایێ خۆ د ڤێ مەسەلێ دا بکەن و ژیانا کووڤی یا مایی ژ قربوونێ بپارێزن و کارەکێ وەسا بکەن نفشێ ڤێ ژیانێ بێتە پاراستن و وەرار پێ بێتە دان و هندەك یاسا بۆ پاراستنا ژیانا کووڤی بێنە دەرئێخستن، داکو ببیتە ژێدەرەکێ باش بۆ گەشتیاری و ئابوورێ نەتەوەیی، نەخاسمە ژی کو ژیانا کووڤی ل پارێزگەهێ هندەك سەخلەتێن جیاواز هەنە و ل دەڤەرێن دی نینن، ژ وانا:

أ- بالندەیێن هەردەمی (ئەوێن مشەخت نابن): هندەك بالندەیێن خۆجهی نە ب درێژییا سالێ ل دەڤەرێ هەنە کو یێن ژ هەمیان گرنگتر ئەڤێن خوارێ نە: کەو، پۆڕ، تڤیرك (کەڤۆك)، سۆسك... هتد.

ب- بالندەیێن مشەخت: ئەو بالندەنە یێن ل وەرزەکێ دەستنیشانکری ل دەڤەرێ هەین، وەکی: کەتیك، زەرزێری، ئەلهۆ، نعاج الما ، قورت.. هتد.

ج- گیاندارێن کووڤی: هرچ، رووڤی، پەزکووڤی، مامز، گورگ، بەرازێ کووڤی، کێرویشك، پلنگێ پنیپنی، سڤۆرە، حەفتیار، سیخوڕ، ژیژی، دارکۆکە، نیڤر (گیڤر)[٧٨].

ژ یا بۆری دیار دبیت کو بنەماینێن بەردەستێن گەشتیارییا خۆرستی ل پارێزگەها دهۆك کو ئەو ب خۆ لایەنێن بەرچاڤکرنا گەشتیاری نە، وەکی

